




# مُعَالِمُ السُّنَّةِ النَّبَوِيَّةِ

## نیشکێ فەرمودەیێت پێغەمبەری

نیشکێ ﴿١٤﴾ چواردە ژێدەرێت سەرەکینە بێت فەرموودەیان

کۆمکرن
شێخ صالح أحمد الشامی

کرمانجیکرن
ب دەستویریا شێخ صالح أحمد الشامی
دکتۆر إسماعیل سگێری

بەرگێ ئێکێ



جزیری







# نیشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

نیشکێ «١٤» چواردە ژێدەرێت سەرەکینە ییێت فەرموودەیان


## کۆمکرن

شێخ صالح أحمد الشامي

## وەرگێران

ب دەستویریا شێخ صالح أحمد الشامي

دکتۆر ئیسماعیل سگێری


## بەرگێ ئێکێ


١٤٤٥ ٢٠٢٤





ناڤێ پەرتووکێ: نیڤشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

کۆمکرن: شێخ صالح أحمد الشامي

وەرگێران: ب دەستویریا (شێخ صالح أحمد الشامي)

(دکتۆر ئیسماعیل سگێری)

دیزاینا بەرگی: مللەت موحەممەد

رێکخستنا ناڤەرۆکێ: دلۆڤان عەساف

سەرپەرشتێ چاپێ: ئەواب ئەحمەد جزیری

سالا چاپکرنێ: ٢٠٢٤

تیراژ:١٠٠٠

هژمارا سپاردنێ: D-١٢٦٨٠١٢٣



کتێبخانا جزیری




دهوک - بەرامبەر پەیکەرێ ئەحمەدێ خانی

00964 750 458 88 06

Jeziry BookShop Jeziry BookShop




## بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشگۆتن

هەمی پەسن و سوپاسی بۆ خودایی و سلاڤ و سەلەوات ل سەر پێشاهی و رێبەر و خۆشڤی و رۆناهییا چاڤان و مەهدەرچییێ مە بن، موحەممەدی (ﷺ) و هۆگرێت وی و هەر کەسەکێ ب باشی رێکا وان بگریت هەتا رۆژا دویماهییێ.

ب راستی بهاترین زانست ئەوە پەیوەندی ب قورئانا پیرۆز و فەرموودەیێت پێغەمبەریڤە هەبیت، و هزار جار سوپاسی بۆ خودای، هاریکارییا من کر من خزمەت د ڤێ مەیدانێدا هەبیت، و ئەز شیام تەفسیرا ژیان بۆ موسلمانان بەردەست بکەم و وەرگێرانا کتێبا نافدار و بەربەلاڤ (رياض الصالحين) بکەم و بۆ وان چاپ بکەم و بەر دەست بکەم، و پشتی من ئەڤ کتێبە (معالم السنة النبوية) دیتی و پێشەکییا وێ خواندی بۆ من بوو مەرەق و من زێدە گرنگ زانی، ئەز ڤێ خزمەتێ ژی بکەم و کار تێدا بکەم و بۆ موسلمانێت ملەتێ خۆ و ب ئەزمانێ وان وەرگێرم و دانمە بەر دەستێ وان، بەلێ ئاستەنگ ئەڤەیە دێ چاوا دەستویریا خودانێ کتێبێ ب دەستخۆڤە ئینم من پەیوەندی ب (دار القلم) ڤە کر، دەستویرییێ ب دەنە من، چونکی وان ئەڤ کتێبە چاپکرییە، بەلێ پشتی دانوستاندنەکا درێژ ل گەل وان دەستویری نە دا من، پاشی خودێ وەسا حەزکر ئەز دکونگرەگێ بانگخوازیێدا ل ئستەنبولێ پشکداربووم، و ل ویرێ من ئێك نیاسی دیارەکر کو ئەو ل باژێرێ ریاز دژیت و گەلەکێ نێزیکی خودانێ کتێبێیە، و ژ ڤان دا من پشتی ب زڤریت ئەو سەرا خودانێ کتێبێ بدەت و ژێ بخوازیت دەستویرییێ بدەتە من، و ب راستی وەکی گۆتی پشتی چەند رۆژەکا ب واتسابی پەیوەندی ب منڤە کر و گۆتە من: ئەڤە شێخ صالح ب خۆ ب دەنگ و رەنگڤە ل گەل تەیە و داخوازا خۆ ئێکسەر لێ بکە و ب راستی د دلخوشیاندا روندك ژ چاڤێت من هاتن، هندی هند من مەرەق بوو ئەز ڤێ کتێبێ وەرگێرم پشتی سلاڤ و پسیارا رەوشی خودێ ژێ رازی بیت دەستویری دامن و ئیجازە

نامەژی ب هەمی کتێبێت خۆ دانە من و ب نامەکێ ئەو دەستویرنامە و ئیجازەنامە بۆ من ب واتسئابێ هتارت، خودێ ساخلەمیا وی باشکەت و ژێ رازی بیت، هەر چەندە پشتی ڤێ پەیوەندییێ من زانی ئەو ژی پێ هاتییە گرتن وەکی هەمی برایێت خۆ یێت زانا و راستیبێژ خودێ وی و هەڤالێت وی رزگار بکەت.

ب ڕاستی من کار کرییە هندی بشێم پێگیر بم ب وەرگێرانا دەقێ فەرموودەیێ بەلێ ب مەرجەکی مەرەم و مەبەست یا ئاشکرا بیت، و ئەگەر وەرگێران بخوازیت رۆنکرنەك یان تێبینییەك هەبیت، ئەو من یا د پەروازەیێدا ئاشکەرا کری، و هەلبەت بۆ وێ رۆنکرن و تێبینییێ ئەز پێ زڤریمە ژێدەرێت رەسەن و پشتبەستن ل سەر کری، و بەرامبەر ڤەگێرێ ئێکێ د زنجیرا فەرموودەیێدا من (ﷺ) دانایە، و دیارە شێخ صالحی پێداچۆن ل سەر چاپا ئێکێ کرییە، و هندە فەرموودە د مالپەرێ خۆدا هەر ب وان ژمارەیان ئینانینە، ب تایبەتی ئەو فەرموودەییێت لاواز داینە دیارکرن، من ژی ڤیایە ڤی مفایی بگەهینم و من د پەروازەیاندا ئینانینە و وەرگێراینە و ژ بەر ئەختوبارییا زانستی من د گەل فەرموودەیێت رەسەن نەدانانینە وەکی د چاپا ئێکێدا ئینانین.

هیڤیا من ژ خودێ ئەوە ئەز د وەرگێرانێدا سەرفەراز کربم و نەکەتبمە د شاشییاندا و خودێ ڤی کاری ژ من قەبویل بکەت و بکەتە د ترازییا خێرێت من و خەلکێ مالا من هەمیاندا و خویشك و برایێت من و زارۆکێت وان و مامۆستاییێت من و هەر کەسێ ب پەیڤەکێ ژی هاریکاری د ئەنجامدانا ڤی کاریدا کربیت و دویماهیك ئاخفتنا من حەمد و پەسن و سوپاسی هەر بۆ خودێ بن و سلاڤ و سەلەوات ل سەر خۆشتڤی (ﷺ) بن.

دکتور إسماعیل سگێری

... فليكن هذا خاتمة ما قد يُحتاج إليه مما اتّصل لي من أسانيد، ثم أقول: إنّني أجيز روايةَ ما لي من مؤلفات وأعمالٍ علميّة، وما يجوز لي روايتُه:

الأستاذ / إسماعيل سكيري ....................

بشرْطِهِ المعتبر عند أهل الحديث والأثر، وذلك على طريقة المحدِّثين من إباحة الرواية وتناقُلِها، وهي بطبيعة الحالِ ليستْ من باب إجازة الدِّراية أو التَّزكية العلميَّة، والفَرْقُ بينهما بيِّنٌ عند من يدرُس المصطَلَح.

وأوصي نفسي والمُجاز بتقوى الله، ومواصلةِ طَلَب العلم، والدَّعوةِ إلى الله بعِلْمٍ وحِكْمة، ولِيْنِ الجانب مع المسلمين، والتأليفِ بينهم، وتحقيقِ ما جاء الأمْرُ به من التَّراحُم والأُخُوَّة، والتحلّي بمَكارم الأخلاق. وأرجو ألّا ينْساني ووالديّ ومشايخي وذرّيتي من صالح دَعواته.

وصلى الله على محمَّد وعلى آلِه وصَحْبِه أجمعين.

المجيز: صالح بن أحمد الشامي

بتاريخ: ١٧/ربيع٢/١٤٤٤هـ

صالح بن أحمد الشامي

# كورتييا پێشەكييا دانەرى

كورتكرنەكا ب مفا بۆ پێشەكييا دانەرێ كتێبا (معالم السنة النبوية).

ئەڤ كتێبا بەركەفتى و بها گران ژ بەرهەڤكرن و دانانا زانايێ ناڤدار و پلە بلند: صالح ئەحمەدێ شامييە و بەرهەمێ بيست سالايە د بوارێ فەرموودەياندا و پشتى ڤان سالا گەهشتە ڤى بەرهەمى كو دبيتە نيڤشكێ چواردە ژێدەرێت رەسەن و ناڤدار و فەرموودەيێت پشتبەستكرى، و ئارمانجا سەرەكى ژ ڤێ كتێبێ هەروەكى د پێشەكييا كتێبێدا هاتى نێزيككرنا فەرموودەيێت پێغەمبەرينە (ﷺ) ب رەنگەكێ وەسا فێرخواز ب ساناهى ب سەر هەلببيت و ب ساناهى بگەهيتە هەمى فەرموودەيان و خواندنا ڤێ كتێبێ ببيتە خواندن و بەرچاڤئێخستنا چواردە ژێدەران ب رێكا لادانا فەرموودەيێت دوبارە كرى د وان هەر چواردە ژێدەراندا، و ئەو فەرموودە جارەكێ تنێ بهێنە ئينان، و مەبەستا دانەرى ب فەرموودا دوبارە ئەوە: يا ئێك صەحابى چەند جار ژێ بهێتە ڤەگێران وەكى فەرموودەيا (إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ) بوخارى تنێ حەفت جاران د جهێت جودا جودادا دوبارە كرييە و ئيمامێ موسلم ئينايە و خودانێت سونەنان و ئيبن حەببان و ئيبن خوزەيمە و ئيمامێ حاكم و ئيمام ئەحمەد و هەميان ژ عومەرى (رضي الله عنه) ڤەگوهازتييە، بەلێ ئەگەر هەر ئەڤ فەرموودە صەحابييەكێ دى ژ بلى عومەرى (رضي الله عنه) ڤەگێرابيت ئەو ناهێتە لادان و دوبارەكرى ناهێتە هەژمارتن و دێ ژمارەكا تايبەت بۆ هەبيت.

و ئەو ژێدەرێت نيڤشكێ وان د ڤێ كتێبێدا (معالم السنة النبوية) هاتى چواردە ژێدەرن و ئەو ژى ئەڤێت خوارێنە.

١ ـ مووەتتەئا ئيمام مالك.

٢ ـ موسنەدا ئيمام ئەحمەد.

٣ ـ جامعا صەحيح يا ئيمام بوخارى.

٤ ـ جامعا صەحيح يا ئيمام موسلم.

٥ ـ سونەنا ئيمام ئەبى داوود.

٦ ـ جامعا ئيمام ترمزى.

٧ ـ سونەنا ئيمام نەسائى.

٨ ـ سونەنا ئیبن ماجە.

٩ ـ سونەنا ئیمام دارەمی.

١٠ ـ سونەنا کوبرا یا ئیمام بەیهەقی.

١١ ـ صەحیحا ئیمام ئیبن خوزەیمە.

١٢ ـ صەحیحا ئیمام ئیبن حەببان.

١٣ ـ موستەدرەکا ئیمام حاکم.

١٤ ـ فەرموودەیێت ژێگرتی (الأحادیث المختارة) یا ئیمام مەقدسی.

و ئەڤ پرۆژە ئەڤ هەر چواردە ژێدەرێت فەرموودێ د شەش کتێبێت دانەریدا هاتینە کۆمکرن کو دبنە (٢٢) بەرگێت مەزن، ئەو ژی ئەڤەنە:

١ـ کۆمکەر د ناڤبەرا صەحیحاندا (الجامع بین الصحیحین).

٢ ـ زێدەیییێت سوننەنان ل سەر صەحیحان (زوائد السنن علی الصحیحین).

٣ ـ زێدەیییێت مووەتتەئێ و موسنەدێ ل سەر شەش کتێبان[(١)]. (زوائد الموطأ والمسند علی الکتب الستة).

٤ ـ زێدەیییێت سونەنا کوبرا یا بەیهەقی ل سەر شەش کتێبان، (زوائد السنن الکبری للبیهقي علی الکتب الستة).

٥ ـ زێدەیییێت ئیبن خوزەیمە و ئیبن حەببان و موستەدرەکێ ل سەر شەش کتێبان، (زوائد ابن خزیمة و ابن حبان والمستدرك علی الکتب الستة).

٦ ـ زێدەیییێت فەرموودەیێت ژێگرتی ل سەر شەش کتێبان (زوائد الاحادیث المختارة علی الکتب الستة).

---

(١) مەبەست ژ شەش کتێبان ئەون یێت ل دەڤ موسلمانان پەسەند و هەمی پشتبەستنێ ل سەر دکەن، ئەو ژی ئەڤەنە: سەحیحا بوخاری و سەحیحا موسلمی و سونەنا ترمزی و سونەنا نەسائی و سونەنا ئەبی داوود و سونەنا ئیبن ماجە.

## مفایێ ڤێ کتێبێ و ڤی پرۆژەیێ پیرۆز.

مفایێ ڤی پرۆژەی کەنگی دیار دبیت دەمێ ئەم بەرامبەر ئامارا ڤەگێریێت ڤان چواردە ژێدەران دراوەستین و دزانین ژمارا وان فەرموودەیان دبیتە (١١٤١٩٤) و پشتی لادانا فەرموودەیێن دوبارەکری ژمارەیا وان یا بوویە (٢٨٤٣٠) فەرموودە، و ئەگەر ئەم هەردو ژمارەیان دانینە بەرێك یا دووێ دبیتە چارێکا ژمارا ئێکێ، هۆسا دهێتە زانین ڤی پرۆژەی چەند دەم بۆ فێرخواز و ڤەکۆلەری و فەرموودەخوازی پەیدا کرییە و هێلایە، بەلێ ئەڤ ژمارە یا د شەش ژێدەر و (٢٢) بەرگاندا بەلاڤ بوو و ئەگەر بۆ ڤەکۆلەری یا ب ساناهی بیت بگەهیتە ڤەگێرا وی بڤێت ئەڤە بۆ خەلکێ نەبسپۆر نە یا ب ساناهییە، لەوا دانەری شێخ صالحێ شامی ڤیا پێنگاڤەکا دی باڤێت و پتر یا ب مفا بیت و ئەو پێنگاڤ ژی ئەڤە بوو ئەو چواردە ژێدەر بێت د شەش ژێدەراندا کۆم کرین کرنە د ئێك ژێدەردا و ئێکجار ڤەگێریێت دوبارە لادان. بۆ نموونە فەرموودەیا (الحَرْبُ خِدْعَةٌ) ئەڤ فەرموودە کۆمەکا سەحابان ڤەگێرایە ژ وان: ئەبو هورەیرە، و جابرێ کوڕێ عەبدوللایی، و ئیبن عەبباسی، و ئوبەیێ کوڕێ کەعبی، و دایکا مە موسلمانان عائیشایێ، (خودێ ژ هەمیان رازی بیت) ژ ڤان ڤەگێرا ئێك ب تنێ ژێگرتییە و یێت دی هێلاینە، هەرچەندە هندە ڤەگێریێت دی ڤەگێراینە بەلێ دا دوبارە نەبن ئێك ب تنێ ئینایە، چونکی ئارمانج ئەوە رامان یان فەرمان کرن ل سەر ئێك جار بهێتە گۆتن، و دیسا ئەو فەرموودەیێت رامانا وان وەکی ئێك یان نێزیکی ئێك، ئێك ژ وان ئینایە، دا ئەڤە هاریکار بیت قەوارێ پەرتۆکێ بچویك ببیت، و هژمارا فەرموودەیان کێم ببیت، و د ئەنجامدا ل سەر خواندەڤانی سڤك ببیت، و بۆ ژێگرتن و کورتکرنا وان فەرموودەیان پشتبەستن ل سەر دو پێڤەران کرییە.

**ئێك:** ئەو فەرموودە وان ئەحکام و فەرمانان هەمیان بگریت ئەوێت د بابەتاندا هاتین.

**دو:** وان هەمی رامانان بگریت ئەوێت د بابەتاندا هاتین.

**فەرموودەیێت حەسەن و لاواز د ڤێ کتێبێدا.**

و دانەری شێخ شامی کار کرییە فەرموودەیێت دورست و حەسەن ب تنێ د ڤێ کتێبێدا (معالم السنة النبوية) بینیت و فەرموودەییێت لاواز ژێ دویر کەت و نەئینیت د ڤان رەوشاندا نەبیت:

**ئێك**: د وێ فەرموودەیا لاوازدا رامانەك ژ رامانێت فەرموودەییێت دورست و هەلبژارتیدا هەبیت رامانا فەرموودەیا دورست رۆن و ئاشکەرا بکەت و هۆسا ئەڤ ئاشکراکرن و رۆنکرنە مەبەستە نە فەرموودە.

**دو**: ئەو فەرموودە ئەو بیت یا بەلاڤ بیت و ل سەر ئەزمانێ خەلکی بیت و د بابەتیدا چو فەرموودەییێت دی نەبن، دانەر وان فەرموودەیان دئینیت دا لاوازییا وان ئاشکەرا بکەت.

**سێ**: ئەگەر فەرموودەییێت دورست د بابەتیدا نەبن و بابەت گرێدای هاندان و ترساندنێ بیت د کارێت باشدا (فضائل الأعمال) د ڤێ رەوشێدا وان فەرموودەێت لاواز دئینیت چاڤلێکرن و پشتبەستن ب رێکا ئیمام ئەحمەد.

کورت و کرمانج هژمارا وان فەرموودەییێت لاواز و یێت حەسەن یێت دانەری د ڤێ کتێبێدا ئینایین گەلەك کێمن، یێت لاواز نێزیکی (٣٣) فەرموودەیانن و ئەو ژی نە ئەو لاوازییا مەزنە و د گەل هندێ ژی هاتینە نیشانکرن و لاوازییا وان هاتییە ئاشکراکرن و هژمارا فەرموودەیێت حەسەن دەهن و دبیت هندەك ژ وان هندەك لاواز دانن.

**رێژە و هژمارا فەرموودەیێت بوخاری و موسلمی.**

هەژییە بزانین هژمار فەرموودەییێت بوخاری و موسلمی د ڤێ کتێبێدا دگەهنە (٢١٣١) و هۆسا رێژەیا وان دبیتە ٥٥٪ ژ هژمارا فەرموودەییێت د ڤێ کتێبێدا.

**رێزبەندیکرن و رێکخستنا فەرموودەیان د ڤێ کتێبێدا**

دەستپێكا هەر بابەتەكێ فەرمووده‌یێت بوخاری و موسلمی ئینانە، پاشی فەرمووده‌یێت هەر چوار سونەنان، و دویفرا فەرمووده‌یێت موسنەدێ و ژێدەرێت دیتر ژ هەر چوارده ژێدەران.

و دویماهییا هەر فەرمووده‌یەكێ هێمایەك و ژمارەك هاتییە دانان، هێما بۆ دیاركرنا ژێدەری دزڤریت، و هژمار بۆ هژمارا فەرمووده‌ییێ د ژێدەریدا دزڤریت.

**جوداكرنا فەرمووده‌یێت بوخاری و موسلمی.**

و فەرمووده‌یێت بوخاری و موسلمی هەر ژ دەستپێكێ هاتینە جوداكرن و نیشان بۆ هاتینە دانان ئەو ئەڤ نیشانە هەر دەستپێكێ وان ئاشكەرا بكەت و ئەو نیشان ب ڤی رەنگینە: (ق) بۆ فەرمووده‌یا هەردو ل سەر ئێك (متفق) (خ) بۆ فەرمووده‌یا بوخاری و (م) بۆ فەرمووده‌یا موسلمی (خ) بۆ موعەلەقاتێت بوخاری ئەوێت بێ سەنەد ئینایین.

و فەرمووده‌یا دی یا نە د بوخاری و موسلمیدا دویماهییا وێ پلەیا وێ دیار دكەت كا یا دورستە یان یا حەسەنە و فەرمووده‌یێت بوخاری و موسلمی بەس ژمارا فەرموودێ دیار كرییە و نەگۆتییە كا كێ دی ژی ئەو فەرمووده ڤەگێرایە ژ زانایێت فەرمووده‌یان و هەر وەسا فەرمووده‌یێت هەرچوار سونەنان ژی دا پەراوێز (هامش) درێژ نەبن.

**هژمارا فەرمووده‌یێت ڤێ كتێبێ** (معالم السنة النبوية).

هژمارا فەرمووده‌یێت ڤێ كتێبێ دبنە (٣٩٢١) هەلبژارتی ژ هژمارا (١١٤١٨٤) فەرمووده‌یان و دبیت ئێك هەبیت ڤان كێم بزانیت، بەلێ ئەڤ هژمارە نێزیكی هژمارا فەرمووده‌یێت جامعا سەحیحا ترمزییە كو دبنە (٣٩٥٦) و ئاشكەرایە ئیمامێ ترمزی و خودانێت سونەنان كتێبێت خۆ ژ سەدان هزار فەرمووده‌یان یێت ژێگرتین و ئەبو داوود (رحمه الله) دبێژیت: من (٥٠٠٠٠٠) فەرمووده ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ بەر كرن ژ وان ئەڤ فەرمووده من ژێ گرتن یێت من د كتێبا خۆدا ئینایین كو دبنە (٥٢٧٤) فەرمووده.

**دەرئینانا فەرمووده‌یان و فەرمانا (حوكمێ) ل سەر هاتی:**

ل دویماهییا هەر فەرموودەیەکێ حوکمێ وێ هاتییە دیار کرن کا یا دورستە یان یا باشە (حەسنە) یان یا لاوازە و ژێدەرێت پشتبەست ل سەر هاتییە کرن بۆ دیارکرنا ڤان فەرمان و حوکمان ئەڤێت خوارێنە.

١ ـ (السنن الاربعة) تویژاندنا ناسرئەلددینێ ئەلبانی.

٢ ـ (سنن الدارمي) تویژاندنا مامۆستا حسێن سەلیم ئەسەدێ دارانی.

٣ ـ (مسند الامام احمد) تویژاندنا شوعەیب ئەرنائووتی.

٤ ـ (الموطأ) تویژاندنا عبدولقادر ئەرنائووتی.

٥ ـ (السنن الكبرى) یا بەیهەقی.

٦ ـ (صحیح ابن خزیمة) تویژاندنا دکتۆر موحەممەد موستەفایێ ئەعزەمی و ئەلبانی پشکداری د چەندەکاندا د گەل کرییە.

٧ ـ (صحیح ابن حبان) تویژاندنا شوعەیب ئەرنائووتی.

٨ ـ (المستدرك) ئیمامێ زەهەبی تێبینی ل سەر هندە فەرموودەیێت وێ داینە.

٩ ـ (الاحادیث المختارة) تویژاندنا دکتۆر عەبدولەلك بن دەهیش.

## ڤەکۆلین و پشکێت ڤێ کتێبێ

ئەڤ کتێبە هاتییە لێکڤەکرن ل سەر دەھ پشکان و مەبەستان و ئەو فەرموودەیێت ڤێ کتێبێ کو دبنە (٣٩٢١) ل سەر ڤان مەبەستان هاتینە لێکڤەکرن.

١ ـ مەبەستا ئێکێ: د ڕاستا بیروباوەراندا.

٢ ـ مەبەستا دووێ: د ڕاستا زانین و ژێدەرێت وێدا.

٣ ـ مەبەستا سێیێ: د ڕاستا پەرستناندا.

٤ ـ مەبەستا چوارێ: د ڕاستا فەرمانێت مالێدا.

٥ ـ مەبەستا پێنجێ: د ڕاستا هەوجەیییێت پێدڤیدا.

٦ ـ مەبەستا شەشێ: د ڕاستا سەرەدەری و معامەلەیاندا.

٧ ـ مەبەستا حەفتێ: د ڕاستا حاکمداری و کاروبارێت حوکمدارییێدا.

٨ ـ مەبەستا هەشتێ: د ڕاستا دلنەرمکەر و سنج و رەوشتاندا.

٩ ـ مەبەستا نەهێ: د ڕاستا دیرۆك و ژیاننامە و سەروەرییاندا.

١٠ ـ مەبەستا دەهێ: د ڕاستا فیتنەیاندا.

### هێما و زاراڤ

شوینا ناڤێ ژێدەری بهێتە نڤیسین و ئەڤە ببیتە ئەگەرێ درێژبوونا کتیبێ زانایێ شامی هندە هێما ب کورتی بۆ هەر ژێدەرکی دانانە کو ئەو ببنە نیشان ل سەر وی ژێدرێ مەبەستدار و ئەو ژی ئەڤەنە:

| هێما | ژێدەر |
|---|---|
| خ | بوخاری |
| م | موسلم |
| ق | ل سەر موتەفق (بوخاری و موسلم ل سەر ئێك) |
| خ | موعەلەقێت بوخاری |
| د | سونەنا ئەبو داوود |
| ت | سونەنا ترمزی |
| ن | سونەنا نەسائی |
| جه | سونەنا ئیبن ماجە |
| می | سونەنا دارەمی |
| حم | موسنەدا ئیمام ئەحمەد |
| ط | مومتتەئا ئیمام مالك |
| مه | سەحیحا ئیبن خوزەیمە |
| حب | سەحیحا ئیبن حەببان |
| ك | موستەدرەکا حاکمی |
| هق | سونەنا بەیهەقی |
| مخ | (الأحاديث المختارة) یا مەقدسی |
| ع | نیشان بۆ وێ فەرموودەیا عەبدوللایێ کوڕێ ئەحمەد ڤەگێرای و ئینایی. |

## ١. باب: اركان الإسلام و الإيمان

## بابەتێ: شەنگستێت ئیسلامێ و باوەرییێ

١ - (ق) عَن ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**بُنِيَ الْإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ**). [خ٨، م١٦].

**ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت گۆت: (پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئیسلام یا ل سەر پێنج شەنگستان هاتییە ئاڤاکرن، شەهدەیا ب خودێ کو ب راستی چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و ب راستی موحەممەد پێغەمبەر و ڤاسدێ خودێیە، و کرنا نڤێژان ب رەنگێ پێدڤی و بەردەوام، و دانا زەکاتێ، و چۆنا حەجێ، و رۆژیگرتنا رەمەزانێ).**

٢ - عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَأَصْبَحْتُ يَوْماً قَرِيباً مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ، وَيُبَاعِدُنِي من النَّارِ.

قَالَ: (**لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللهُ عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللهَ وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ البَيْتَ**).

ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الخَيْرِ: الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ المَاءُ النَّارَ، وَصَلاةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ**)، قَالَ: ثُمَّ تَلاَ ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾، حَتَّى بَلَغَ: {يَعْمَلُونَ} [السجدة:١٦، ١٧].

ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ**)؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلاَمُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الجِهَادُ**).

ثُمَّ قَالَ: (أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ) ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رسول اللهِ! فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ، قَالَ: (كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا). فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ فَقَالَ: (ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ! وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ، أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ؛ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلسِنَتِهِمْ). [ت٢٦١٦/ جه٣٩٧٣]

* صحيح.

و ژ مەعازی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز وەغەرەكێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووم (ﷺ) و ئەز نێزیكی وی بووم، من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ، كارەكی بۆ من بێژە من ببەتە بەحەشتێ و من ژ ئاگری دویربێخیت.

**گۆت: (تە پرسیارا تشتەكێ مەزن كر، و ئەو یا ب ساناهییە بۆ وی یێ خودایێ مەزن ل سەر ب ساناهی كربیت؛ تو خودێ بپەرێسی و چو شریك و هەڤكویڤان بۆ چێ نەكەی، نڤێژان ب رەنگێ پێدڤی و بەردەوام بكەی، و زەكاتێ بدەی، رەمەزانێ بگری، و بچییە حەجێ ئەگەر تە پێ چێ بیت).**

پاشی گۆت: **ئەز دەرگەهێت خێرێ نیشا تە نەدەم؟ رۆژی پارێزڤانییە (ژ ئاگری و گونەهان) و سەدەقە شوینوارێت گونەهێ ژێ دبەت هەروەكی ئاڤ ئاگری دڤەمرینیت، و نڤێژا مرۆڤی نیڤا شەڤێ. پاشی ئەڤ ئایەتە خواند ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾، هەتا گەهشتیە ﴿يَعْمَلُونَ﴾)**[1].

پاشی گۆت: **ئەرێ ئەز سەرێ كاری و ستوینا وی و گوپیتكا وی بۆ تە نەبێژم؟ من گۆت: بەلێ یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: سەرێ كاری ئیسلامە و ستوینا وی نڤێژە و گوپیتكا وی جیهادە)** پاشی گۆت: **(یا ئەڤە هەمی پێڤە رادبیت بۆ تە نەبێژم)؟** من گۆت: بەلێ ئەی

(١) رامانا ئایەتێ ب كورتی: ڤەوی تەنشتێت وان ناكەڤنە سەر نڤینان ئانكو كێم دنڤن، و رادبن شەڤنڤێژان دكەن و ب ترس و هیڤیڤە دوعایان ژ خودێ دكەن، و رزقێ مە داییە وان خێر و سەدەقەیان ژێ ددەن. كەس نوزانیت چ خەلات یێ بۆ وان هاتییە ڤەشارتن، چاڤێت وان پێ رۆن ببن و ب دیتنا وی شاد ببن، ژ بەر وان كار و كریارێت وان دكرن.

**پێغەمبەرێ خودێ. ئەزمانێ خۆ گرت و گۆت: (ئەڤی بەسکە)، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما دێ ل مە هێتە گرتن ل سەر ئاخفتنا ئەم دئاخڤین؟ گۆت: (تو ل دایکا خۆ بەرزەببی[1] ما تو هزرەکا دی دکەی نە یا مە گۆتی، ما چ خەلکی ل سەر ناڤچاڤان دهاڤێژیتە د جەهنەمێدا ئەنجام و دورینا ئەزمانێ وان نەبیت (ئانکو ئەو نەبیت یا ئەزمان دبێژیت).**

٣ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) سَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِيمَانُ؟ قَالَ: **(إِذَا سَرَّتْكَ حَسَنَتُكَ وَسَاءَتْكَ سَيِّئَتُكَ فَأَنْتَ مُؤْمِنٌ)**. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الإِثْمُ؟ قَالَ: **(إِذَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ شَيْءٌ فَدَعْهُ)**. [ك٣٣]

* قال الذهبي: على شرطهما.

[وانظر: ٣١٥ حديث ضمام بن ثعلبة.

وانظر: ٣٣٣٦ في «الطهور شطر الإيمان».

وانظر: ٤٩ في «الإسلام والإيمان والإحسان».

وانظر: ٦٧ في أركان الإسلام.

وانظر: ٣٥٦٠ في أركان الإيمان.

وانظر: ٣٣٣٢ في أفضل الأعمال].

**ژ ئەبی ئومامەی زەلامەکی پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) کر گۆت: باوەری چییە؟ گۆت: (ئەگەر باشییا تە تو دلخۆش کری و گونەها تە تو ئێشاندی ئەڤە تو باوەریداری) و گۆت: یا گونەه چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (ئەگەر تشتەك د دلێ تەدا هات و چۆ دلێ تە ل سەر نەراوەستا بهێلە).**

---

[1] - نفرینە بەلێ مەرەم پێ نەنفرینە بەلکی مەرەم پێ تۆرەئێخستنا وییە و گوهشینە چاوا ڤێ پسیارێ دکەت.

## ٢ . باب: الاخلاص والنية

## بابەتێ: دلسۆزی و ئنیەت

٤ - (ق) عن عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ هَاجَرَ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ**).

[خ٦٩٥٣ (١)/ م١٩٠٧]

وفي رواية للبخاري: (**إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى..**). [خ١]

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بوو دگۆت: (گەلی مرۆڤان ب راستی هەمی کار و کریار ب ئنیەتێنە، و ب راستی ئەو دێ بۆ مرۆڤی بیت کا چ ئنیەت ئینایە، ڤێجا یێ بۆ خودێ و پێغەمبەری مشەخت بووی، دێ مشەختبوونا وی بۆ خودێ و پێغەمبەری بیت، و هەر کەسێ مشەختبوونا وی بۆ دنیایێ بیت بگەهیتێ، یان بۆ ژنەکێ بیت مارەکەت، مشەختبوونا وی دێ بۆ وی تشتی بیت یێ بۆ مشەخت بووی).**

- **و د ڤەگێرەکا بوخاریدا هاتییە: (ب راستی هەمی کار و کریار ب ئنیەتانە، و ب راستی بۆ هەر مرۆڤەکی کا چ ئنیەت ئینایە دێ ئەو بیت).**

٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ! وَلكِنَّكَ قَاتَلْتَ لِأَنْ يُقَالَ جَرِيءٌ؛ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ.**

وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ. قَالَ: كَذَبْتَ! وَلكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ؛ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ.

وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللهُ عَلَيْهِ، وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ بِهِ، فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا. قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ. قَالَ: كَذَبْتَ! وَلكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ هُوَ جَوَادٌ؛ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ، ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ).
[م١٩٠٥].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت:

**(مرۆڤێ ئێکێ رۆژا قیامەتێ حسێبا وی دهێتە کرن، زەلامەکە یێ شەهید بووی، ئینا دەڤ و نیعمەتێت خۆ بۆ دانە نیاسین و وی ژی ل سەر خۆ ئاشکرا کرن، گۆت: تە چ ب ڤان نیعمەتان کر؟ گۆت: من بۆ تە شەڕ کر هەتا ئەز شەهید بوویم، گۆت: تو درەوا دکەی، بەلێ تە شەڕ کر دابێژن یێ ب وێرەکە (جەسارەتە)، و هاتە گۆتن، پاشی فەرمان پێ هاتە دان و ل سەر ناڤچاڤان هاتە راکێشان هەتا هاڤێتییە د ئاگریدا.**

**و زەلامەکە زانین وەرگرتی و زانین دای و قورئان خواندی ئینا دەڤ و نیعمەتێت خۆ بۆ دانە نیاسین و وی ژی ل سەر خۆ ئاشکرا کرن، گۆت: تە چ ب ڤان نیعمەتان کر؟ گۆت: من بۆ تە زانین وەرگرت و زانین دا و قورئان خواند، گۆت: تو درەوا دکەی، بەلێ تە زانین وەرگرت و زانین دا و قورئان خواند، دا بێژن، قورئانخوینە، و هاتە گۆتن، پاشی فەرمان پێ هاتە دان و ل سەر ناڤچاڤان هاتە راکێشان هەتا هاڤێتییە د ئاگریدا.**

**و زەلامەکە خودێ یا ل بەر دەستی بەرفرەھ کری و هەمی رەنگێت مالی یێت داینێ، ئینا دەڤ و نیعمەتێت خۆ بۆ دانە نیاسین و وی ژی ل سەر خۆ ئاشکرا کرن، گۆت: تە چ ب ڤان**

**نیعمەتان کر؟ گۆت: من چو رێك نەهێلاینە تو حەز کەی تێدا بهێتە مەزاختن ئەگەر من تێدا نەمەزاختبن، گۆت: تو درەوا دکەی، بەلێ تە کر،**

**دا بێژن، یێ مەردە، و هاتە گۆتن، پاشی فەرمان پێ هاتە دان و ل سەر نافچاڤان هاتە رلکێشان هەتا هاڤێتییە د ئاگریدا).**

٦ – عن أَبي كَبْشَةَ الْأَنْمَارِيِّ : أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**ثَلاَثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ، وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً فَاحْفَظُوهُ:**

**قَالَ: مَا نَقَصَ مَالُ عَبْدٍ مِنْ صَدَقَةٍ، وَلاَ ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلَمَةً فَصَبَرَ عَلَيْهَا إِلاَّ زَادَهُ اللهُ عِزّاً، وَلاَ فَتَحَ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ إِلاَّ فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ بَابَ فَقْرٍ**) أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا.

(**وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثاً فَاحْفَظُوهُ، قَالَ: إِنَّمَا الدُّنْيَا لِأَرْبَعَةِ نَفَرٍ: عَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ مَالاً وَعِلْماً، فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقّاً، فَهَذَا بِأَفْضَلِ الْمَنَازِلِ؛ وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ عِلْماً وَلَمْ يَرْزُقْهُ مَالاً، فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ، يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ بِعَمَلِ فُلاَنٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ، فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ. وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللهُ مَالاً وَلَمْ يَرْزُقْهُ عِلْماً، فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ ، بِغَيْرِ عِلْمٍ، لاَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَلاَ يَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَلاَ يَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقّاً، فَهَذَا بِأَخْبَثِ الْمَنَازِلِ. وَعَبْدٍ لَمْ يَرْزُقْهُ اللهُ مَالاً وَلاَ عِلْماً، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ فِيهِ بِعَمَلِ فُلاَنٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ، فَوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ**). [ت٢٣٢٥/ جه٤٢٢٨].

* حسن صحيح.

و ژ ئەبی کەبشەی، عەمرویێ کوڕێ سەعدێ ئەنماری (رضي الله عنه) کو وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (**سێ خسلەتان ئەز سویندێ ل سەر دخۆم، و ئەز دێ ئاخفتنەکێ بۆ هەوە بێژم ژ من وەرگرن و ژ بەر بکەن؛**

**مالێ چو بەندەیان ب سەدەقێ کێم نابیت، و ستەم ل بەندەیەکی ناهێتە کرن و سەبرێ ل سەر بکێشیت، ئەگەر خودێ عەزیزی و سەربلندییێ لێ زێدە نەکەت، و چو بەندە چو دەرگەهێت خوازۆکییێ ل خۆ ڤەناکەن، ئەگەر خودێ دەرگەهەکێ هەژارییێ لێ**

**نەڤەکەت. یان ژی ئاخفتنەکا وەکی ڤێ. و ئەز دێ ئاخفتنەکێ بۆ هەوە بێژم ژ من وەرگرن و ژ بەر بکەن: گۆت: ب راستی دنیا بۆ چار مرۆڤانە:**

**بەندەیەکی: خودێ مال و زانین ب رزقێ وی کربن، و ئەو پارێزکارییا خودایێ خۆ تێدا بکەت، و باشییێ پێ د گەل مرۆڤێت خۆ بکەت، و دزانیت خودێ حەقێ تێدا هەی ئەڤە خودان باشترین جهە.**

**و بەندەیەکی: خودێ زانین دابیتێ و مال نەدابیتێ، بەلێ د دلێ خۆدا یێ راستە، دبێژیت ئەگەر من مال هەبا، دا ئەز کارێ بێڤانی پێ کەم، ئەو ئنیەتا وییە، خێرا هەردوکان ئێکە.**

**و بەندەیەکی: خودێ مال دابیتێ و زانین نەدابیتێ، ڤێجا ئەو مالێ خۆ بێ زانین پویچ بکەت، و پارێزکارییا خودایێ خۆ تێدا ناکەت، و باشییێ پێ د گەل مرۆڤێت خۆ ناکەت، و نوزانیت خودێ حەقێ تێدا هەی ئەڤە خودان پیسترین جهە.**

**و بەندەیەکی: خودێ نە مال دابیتێ نە زانین، و ئەو دبێژیت: ئەگەر من مال هەبا ئەز دا کارێ بێڤانی پێ کەم، ئەو ئنیەتا وییە، گونەها هەردوکان ئێکە).**

٧ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ رَجُلاً غَزَا يَلْتَمِسُ الْأَجْرَ وَالذِّكْرَ، مَا لَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لا شَيْءَ لَهُ)، فَأَعَادَهَا ثَلاثَ مَرَّاتٍ يَقُولُ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لا شَيْءَ لَهُ)، ثُمَّ قَالَ: **(إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبَلُ مِنَ العَمَلِ إِلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ)**. [ن٣١٤٠]

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی ئومامەیێ باهلی گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: تو چ دبێژی زەلامەك جیهادێ بکەت خێر دڤێت و ناڤێ خۆ ژی دڤێت بۆ وی چ خێر هەیە؟ پێغەمبەری سلاڤێت خودێ ل سەر بن گۆت: (چو خێر بۆ وی نینە)، سێ جاران پرسیار دوبارە کر هەر پێغەمبەری سلاڤێت خودێ ل سەر بن گۆت: (چو خێر بۆ وی نینە) پاشی**

**گۆت: (ب ڕاستى خودێ ژ كاروكرياران چ ژێ قەبولناكەت ئەو نەبيت سپەهى بۆ هاتبيتە كرن و رازيبوونا وى پێ هاتبيتە داخوازكرن).**

.. - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّمَا يُبْعَثُ النَّاسُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ).** [جه٤٢٢٩]

* صحيح.

**ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستى رۆژا قيامەتێ خودێ دێ هەر ئێكى ل دويڤ ئنيەتا وى راكەت).**

÷ - عَنِ الضَّحَّاكِ بنِ قَيْسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ تعالى يَقُولُ: أَنا خَيْرُ شَرِيكٍ، مَنْ أَشْرَكَ بِي فَهُوَ لِشَرِيكي، يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَخْلِصُوا أَعْمَالَكُمْ للهِ، فَإِنَّ اللهَ لا يَقْبَلُ مِنَ العَمَلِ إِلاَّ مَا خَلَصَ، وَلا تَقُولوا: هَذا للهِ والرحِمِ، فَإِنَّه لِلرَّحِمِ، وَلَيْسَ للهِ مِنْهُ شَيْءٌ، ولا تَقُولُوا: هَذا للهِ وَلِوُجُوهِكم، فَإِنَّما هُوَ لِوُجُوهِكم، وَلَيْسَ للهِ فِيهِ شَيْءٌ).** [مخ٩٢/٨]

* إسناده حسن.

[وانظر: ١٥٩٣ (يبعث على ما مات عليه).

وانظر: ١٢٨، ١٢٩ (يبعثون على نياتهم).

وانظر: ٢١٠١، ٢١٠٢ في إخلاص العمل.

وانظر: ٣٦٨٧، جهاد ونية].

ژ زەحاكێ كوڕێ قەيسى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: ب راستى خودێ دبێژيت: **(ئەز باشترين هەڤپشكم هەر كەسێ هەڤپشكەكى د گەل من دانيت ئەو بۆ هەڤپشكێ منە، هەى گەلى مرۆڤان ژ دل كاران بۆ خودێ بكەن، ب راستى خودايێ هەر ب هێز و مەزن چو ژ كارى قەبويل ناكەت ئەو نەبيت يێ ژ دل بۆ وى هاتييە كرن، و نەبێژن ئەڤە بۆ خودێيە و بۆ مرۆڤانيێيە، ب راستى ئەو بۆ مرۆڤانيێيە، و ب راستى چو ژ وى كارى بۆ خودێ نينە، و نەبێژن ئەڤ كارە بۆ خودێيە و بۆ هەوميە ب راستى بۆ هەوميە و چو ژ وى بۆ خودايێ هەر ب هێز و مەزن نينە).**

## ٣ . باب: الاسلام يهدم ماقبله.

## بابەتێ: ئیسلام یا بەری خۆ دهەرفینیت.

١٠ – (م) عَن ابْنِ شُمَاسَةَ المَهْرِيِّ قَالَ: حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ العَاصِ وَهُوَ فِي سِيَاقَةِ المَوْتِ ، فَبَكَى طَوِيلاً وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إِلَى الجِدَارِ، فَجَعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ: يَا أَبَتَاهُ! أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِكَذَا؟ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِكَذَا؟ قَالَ: فَأَقْبَلَ بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: إِنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، إِنِّي قَدْ كُنْتُ عَلَى أَطْبَاقٍ ثَلاَثٍ :

لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضاً لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنِّي، وَلاَ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ قَدْ اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَقَتَلْتُهُ، فَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الحَالِ لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ.

فَلَمَّا جَعَلَ اللهُ الْإِسْلاَمَ فِي قَلْبِي، أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقُلْتُ: ابْسُطْ يَمِينَكَ فَلْأُبَايِعْكَ، فَبَسَطَ يَمِينَهُ، قَالَ: فَقَبَضْتُ يَدِي. قَالَ: **(مَا لَكَ يَا عَمْرُو)** ؟ قَالَ قُلْتُ: أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ قَالَ: **(تَشْتَرِطُ بِمَاذَا)** ؟ قُلْتُ: أَنْ يُغْفَرَ لِي، قَالَ: **(أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْإِسْلاَمَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ؟ وَأَنَّ الهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلِهَا؟ وَأَنَّ الحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ)**؟.

وَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَلاَ أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ، وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلأَ عَيْنَيَّ مِنْهُ إِجْلاَلاً لَهُ، وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ، لِأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلأُ عَيْنَيَّ مِنْهُ، وَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الحَالِ لَرَجَوْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ.

ثُمَّ وَلِينَا أَشْيَاءَ مَا أَدْرِي مَا حَالِي فِيهَا، فَإِذَا أَنَا مُتُّ، فَلاَ تَصْحَبْنِي نَائِحَةٌ وَلاَ نَارٌ، فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي؛ فَشُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ شَنّاً، ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ قَبْرِي قَدْرَ مَا تُنْحَرُ جَزُورٌ، وَيُقْسَمُ لَحْمُهَا، حَتَّى أَسْتَأْنِسَ بِكُمْ، وَأَنْظُرَ مَاذَا أُرَاجِعُ بِهِ رُسُلَ رَبِّي. [م١٢١].

**ژ ئیبن شوماسەیێ مەهری، گۆت: ئەم هاتینە دەڤ عەمرێ كوڕێ عاسی (رضي الله عنه) و ئەو ل بەر مرنێ بوو، گەلەك كرە گری و بەرێ خۆ وەرگێرا دیواری، كوڕێ وی دەست هاڤێتێ دگۆت: ئەرێ بابێ من ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مزگینی ب ڤێ نەدایە تە؟ ما**

پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مزگینی ب ڤێ نەدایە تە؟ بەرێ خۆ زڤراند و گۆت: باشترین تشت مرۆڤ بۆ خۆ بەرهەڤ بکەت: شەهدەدانە: کو چو خودێ و پەرستی پێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت، و موحەممەد پێغەمبەرێ وییە، و ئەز د سێ رەوشاندا (حالاندا) بۆریم، من خۆ دیت کەسێ ژ من پتر کەرب و کین بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەبوون، و چو تشت بۆ من خۆشڤیتر نەبوو ئەز بشێم وی بگرم و بکوژم و ئەگەر ئەز ل سەر ڤێ رەوشێ مربام دا ژ خەلکێ جەهنەمێ بم، و دەمێ خودێ ئیسلام کرییە د دلێ مندا، ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) من گۆت: دەستێ خۆ ڤەکە دا سۆز و پەیمانان بدەمە تە، دەستێ خۆ یێ راستێ ڤەکر من دەستێ خۆ کێشا، گۆت: **(تە خێرە یا عەمرو)؟** من گۆت: من ڤیا ئەز مەرجی بدانم، گۆت: چ مەرج بکەی؟ من گۆت: مەرجێ من، گونەهێت من بهێنە ژێبرن، گۆت: **(ما تە نەزانییە ب راستی ئیسلام یا بەری خۆ دهەرێڤیت، و مشەختیاتی یا بەری خۆ دهەرێڤیت، و حەج یا بەری خۆ دهەرێڤیت)؟**.

و کەس ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خۆشڤیتر نەبوو بۆ من، و کەس ژ وی د چاڤێت مندا مەزنتر نەبوو، و ئەز نەدشیام ژ مەزناتییا وی چاڤێت خۆ ب دیتنا وی تێر کەم، و ئەگەر ژ من بهێتە خواستن ئەز سالۆخەتا (وەسفا) وی بکەم ئەز نەشێم چونکی من چاڤێت خۆ ژ وی تێر نەکرینە، و ئەگەر ئەز ل سەر ڤێ رەوشێ و د ڤی کراسیدا مربامە هیڤییا من ئەو بوو ئەز ژ خەلکێ بەحەشتێ بام. پاشی هندەك تشت بۆ مە هاتنە دان، ئەز نوزانم کا ئەز تێدا یێ چاوا بووم؟ ڤێجا ئەگەر ئەز مرم بلا کەسێ گری دەنگ بلند و ئاگر د گەل من نەهێن، و ئەگەر هەوە ئەز ڤەشارتم ئاخێ پیچ پیچە باڤێنە سەر من، پاشی ل دۆر گۆڕێ من بمینن تەمەت ڤەکوشتنا

حێشترێ و گۆشتێ وێ دئێتە لێکڤەکرن دا سەبرێ من بهێت و دا بزانم دێ چاوا بەرسڤا قاسدێت خودایێ خۆ دەم[1].

---

[1] مەرەم پێ نەکیر و مونکیرن.

١١ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا تَرَكْتُ حَاجَّةً ولا دَاجَّةً إِلاَّ قَدْ أَتَيْتُ. قَالَ: (**أَلَيْسَ تَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ؟**) ثَلاثَ مراتٍ. قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَإِنَّ ذَلِكَ يَأْتِي عَلى ذَلِكَ**). [مخ٥/١٧٧٣].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من نە چو تشتێ هویر و نە یێ گر نەهێلایە من نەكربیت؟ ئینا گۆتێ: (ما تو شەهدە نادەی كو ب راستی چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و ب راستی موحەممەد پێغەمبەر و ڤاسدێ خودێیە) سێ جاران؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب (راستی ئەڤە دێ هێتە سەر وێ).**

٤ ـ باب: الاسلام نسخ الاديان السابقة.

**بابەتێ: ئیسلام دینێت بەری خۆ رادكەت**

١٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ! لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَـذِهِ الأُمَّةِ يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ، وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ؛ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ**). [١٥٣].

**ژ ئەبو هورەیرە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی كەمە یێ جانێ موحەممەدی د دەستێ ویدا كەس نینە ژ ڤێ ئوممەتێ جوهی بیت یان مەسیحی بیت گوه ل من ببیت پاشی بمریت و باوەری ب وێ نەئینابیت یا ئەز پێ هاتیم ئەگەر ئەو ژ خەلكێ ئاگری نەبیت).**

١٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): أَيُّ الأَدْيَانِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: (**الحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ**). [حم٢١٠٧]

* صحيح لغيره.

ژ ئيبن عەباس گۆت: ئێكى گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كيژ دين ل دەڤ خودێ خۆشڤيترە ؟ گۆت: (ئەو دينێ ڕوى وەرگێر ژ هەر بيروباوەرەكا لەنگ و لۆر و خوار و فێج و بەرێ خۆ ددەتە ڕێكا خودێ ب تنێ و دينێ ب سەهل و ساناهى).

٥ . باب: من مات على التوحيد دخل الجنة.

**بابەتێ: يێ ل سەر ئێك خوداپەرستييێ بمريت ئەو چۆ بەحەشتێ.**

١٤ - (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي، فَأَخْبَرَنِي . أَوْ قَالَ: بَشَّرَنِي . أَنَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً، دَخَلَ الجَنَّةَ). قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: (وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ). [خ١٢٣٧/ م٩٤].

**ژ ئەبى هورەيرە: (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئێك ژ خودايێ من هاتە دەڤ من و گۆتە من يان مزگينى دا من، هەركەسێ ژ ئوممەتا تە بمريت و چو هەڤپشك و هەڤال بۆ خودێ چێ نەكربن، ئەو چۆ بەحەشتێ)، من گۆت: خۆ ئەگەر زنا ژى كربيت ئەگەر دزى ژى كربيت؟ گۆت: (خۆ ئەگەر زنا ژى كربيت ئەگەر دزى ژى كربيت).**

١٥ - (ق) عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) . وَمُعاذٌ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ . قَالَ: (يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ) ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! قَالَ: (يَا مُعَاذُ) ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! ثَلاَثاً، قَالَ: (مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، صِدْقاً مِنْ قَلْبِهِ، إِلاَّ حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَفَلاَ أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا؟ قَالَ: (إِذاً يَتَّكِلُوا). وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذٌ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّماً . [خ١٢٨، م٣٢].

**ژ ئەنەسێ كورێ (ﷺ) گۆت: مەعاز پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو ل سەر حێشترێ گۆتێ: (ئەى مەعازێ كورێ جەبەلى)، گۆت: (ئەى مەعاز) گۆت: لەبێ دويڤ لەبێ و هاريكارى دويڤ هاريكاريێ يا پێغەمبەرێ خودێ ، گۆت: (نينە بەندەيەك ڕاست ژ**

**دلێ خۆ شەهدە بدەت كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و موحەممەد بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە، هەكە خودێ جەهنەمێ ل سەر وی حەرام نەكەت، گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ ئەز ڤێ بۆ خەلكی نەبێژم دا كەیفا وان بهێت؟ گۆت: دێ خۆ ب هیڤیا هندێڤە هێلن، وەختێ دا مریت مەعازی گۆت ژ ترسا گونەهێ).**[١].

١٦ - (ق) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رضي الله عنه قَالَ: بَيْنَا أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ (ﷺ) لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلاَّ أَخِرَةُ الرَّحْلِ، فَقَالَ: **(يَا مُعَاذُ)** ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: **(يَا مُعَاذُ)** ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ! ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: **(يَا مُعَاذُ)** ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: **(هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ)** ؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: **(حَقُّ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً)**. ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: **(يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ)** ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، فَقَالَ: **(هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ العِبَادِ عَلَى اللهِ إِذَا فَعَلُوهُ)** ؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: **(حَقُّ العِبَادِ عَلَى اللهِ أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ)**. [خ٥٩٦٧ (٢٨٥٦)/ م٣٠].

**و ژ مەعازێ كورێ جەبەلی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ سویار بووم، و چ ل ناڤبەرا من ویدا نە بوو دویماهیكا كورتانی نەبیت گۆت: (ئەی مەعاز)، من گۆت: لەبێ ل دویڤ لەبێ و هاریكاری ل دویڤ هاریكارییێ، پاشی بێهنەكێ چو و پاشی گۆت: (ئەی مەعاز)، من گۆت: لەبێ ل دویڤ لەبێ و هاریكاری ل دویڤ هاریكارییێ، پاشی بێهنەكێ چو و پاشی گۆت: (ئەی مەعاز)، من گۆت: لەبێ ل دویڤ لەبێ و هاریكاری ل دویڤ هاریكارییێ، گۆت، (ئەرێ تو دزانی حەقێ خودێ ل سەر بەندەیان چییە)؟ من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: (ب راستی حەقێ خودێ ل سەر بەندەیان ئەڤەیە: خودێ بپەرێسن و چو تشتان بۆ نەكەنە هەڤپشك) پاشی بێهنەكێ چو و پاشی گۆت: (ئەی مەعازێ كورێ جەبەلی) من گۆت: لەبێ ل دویڤ لەبێ و هاریكاری ل دویڤ هاریكارییێ، گۆت، (ئەرێ تو دزانی حەقێ بەندەیان ل سەر**

---

[١] كو بمریت و نەڤ زانینە ل دەڤ یا ڤەشارتی بیت.

**خودێ چییە ئەگەر وان ئەڤە كر)؟ من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: (حەقێ بەندەیان ل سەر خودێ ئەوە وان ئیزا نەدەت).**

١٧ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا الموجِبَتَانِ؟ فَقَالَ: **(مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ النَّارَ)**. [٩٣].

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: كۆچەرە عەرەبەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەی پێغەمبەرێ خودێ هەردو تشتێت واجبكەر چنە؟ گۆت: هەر كەسێ بمریت و چو هەڤپشك بۆ خودێ چێ نەكربن چۆ بەحەشتێ و هەر كەسێ مر و تشتەك بۆ كربیتە هەڤپشك چۆ جەهنەمێ).**

١٨ - عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ لَقِيَ اللهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً لَمْ تَضُرَّهُ مَعَهُ خَطِيئَةٌ، وَمَنْ مَاتَ وَهُوَ يُشْرِكُ بِهِ لَمْ يَنْفَعْهُ مَعَهُ حَسَنَةٌ)**. [حم٦٥٨٦].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (ﷺ) دبێژیت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بگەهیتە خودێ چو هەڤپشك بۆ چێ نەكربن چو گونەه د گەل زیانێ ناگەهیننێ و یێ بمریت و ئەو هەڤپشكان بۆ چێ دكەت چو خێر د گەل فێ مفای ناگەهیننە وی).**

١٩ - عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَنْ لَقِيَ اللهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، يُصَلِّي الخَمْسَ، وَيَصُومُ رَمَضَانَ، غُفِرَ لَهُ)**، قُلْتُ: أَفَلاَ أُبَشِّرُهُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(دَعْهُمْ يَعْمَلُوا)**. [حم٢٢٠٢٨، ٢١٩٩٤]

* صحيح.

**ژ مەعازێ كورێ جەبەلی (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ بگەهیتە خودێ و چو هەڤپشكان بۆ خودێ چێ نەكەت و پێنج**

**نڤێژان بکەت و رەمەزانێ بگریت گونەهێت وی هاتنە ژێبرن)، من گۆت: ئەرێ ئەز مزگینییێ نەدەمێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (بهێلە کار بکەن)**[1].

٦ . باب: من مات على الكفر دخل النار.

**بابەتێ: یێ ل سەر کوفرێ بمریت چۆ ئاگری.**

٢٠ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ابْنُ جُدْعَانَ، كَانَ فِي الجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُطْعِمُ المِسْكِينَ، فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ؟ قَالَ: (**لا يَنْفَعُهُ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْماً: رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ**). [م٢١٤].

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: من گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ کورێ جودعانی بەری ئیسلامەتییێ مرۆڤانی دگەهاند (ئانکو بۆ مرۆڤانییێ یێ باش بوو) و خوارن ددا، ئەرێ ئەڤە دێ مفایێ وی دەن؟ گۆت: مفایێ وی نادەن، ب راستی وی رۆژەکێ ژی نەگۆتییە ئەی خودا گونەهێت من رۆژا سزادانێ (یا قیامەتێ) ژێ ببە.**

٢١ - عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللهُ أَنْ يَغْفِرَهُ؛ إِلاَّ الرَّجُلُ يَقْتُلُ المُؤْمِنَ مُتَعَمِّداً، أَوْ الرَّجُلُ يَمُوتُ كَافِراً**). [ن٣٩٥٥].

* صحيح.

**ژ موعاویەی (﵁) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر گونەهەکا هەبیت من هیڤییە خودێ ژێ ببەت ئەو نەبیت کەسەکە باوەریدارەکی ژ قەستا بکوژیت یان کەسەك بمریت گاور).**

---

[1] دا پلەیێت خۆ بلند بکەن.

## ٧ ـ باب: حتى يقولوا: «لا إله إلا الله»

## بابەتێ: هەتا دبێژن: (لا إله إلا الله)

٢٠ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لا إله إلا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ، ويُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ: إلا بِحَقِّ الإِسلامِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ). [خ٢٥/ م٢٢].

**و ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (فەرمان یا ل من هاتییە كرن، ئەز شەرێ خەلكی بكەم[1] هەتا شەهدە بدەن بێژن: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ الله. وَأَنَّ مُحَمَّداً رسولُ اللَّهِ) و نڤێژان بكەن و زەكاتێ بدەن ئەگەر وەكر، وان خوینێت خۆ و مالێ خۆ ژ من پاراستن ب حەقێ موسلمانەتییێ نەبیت[2] و حسێبا وان[3] ل سەر خودێیە).**

---

[1] هەلبەت شەڕی نە كو كوشتنێ و د گەل وان ئەوێت دژی موسلمانەتییێ دراوەستن.

[2] ئانكو ئەو و مالێ وان د پاراستینە هندی ئەو چو نەكەن موسلمانەتی تشتەكی ل سەر دانیت، بۆ نموونە: یێ مالێ ئێكی پویچ كەت یان یێ ئێكی بریندار بكەت یان بكوژیت هنگی ب حەقێ ئیسلامێ ئەو و مالێ وی نە د پاراستینە، دڤێت تۆل ژێ بهێتە ڤەكرن.

[3] د نەپەنی و نهێنییا واندا.

## ٨ . باب: الزمن الذي لا يقبل فيه الإيمان

## بابەتێ: ئەو دەمێ باوەریئنان تێدا نەهێتە قەبویلكرن

٢٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (ثَلاَثٌ إِذَا خَرَجْنَ، لاَ يَنْفَعُ نَفْساً إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْراً: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدَّجَّالُ، وَدَابَّةُ الْأَرْضِ). [م١٥٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ تشت ئەگەر دەركەفتن[1] ئێدی باوەریئینانا كەسێ مفایی ناگەهینیتێ، ئەگەر بەری هینگێ باوەری نەئینابیت، یان ژی باشی و قەنجی د باوەرییا خۆدا نەكربیت، دەركەفتنا رۆژێ ژ رۆژئاڤایی و هاتنا دەجالی و دەركەفتنا گیانەوەرێ ژ عەردی دەردكەڤیت، د گەل خەلكی دئاخڤیت).**

## ٩ . باب: (الرَّحْمَانِ الرَّحِيمِ)

## بابەتێ: دلۆڤانێ پڕ دلۆڤین

٢٤ - (ق) عن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (جَعَلَ اللهُ الرَّحْمَةَ فِي مِائَةَ جُزْءٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءاً، وَأَنْزَلَ فِي الْأَرْضِ جُزْءاً وَاحِداً، فَمِنْ ذَلِكَ الجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الخَلْقُ، حَتَّى تَرْفَعَ الفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا، خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ). [خ٦٠٠٠/ م٢٧٥٢].

- زاد في رواية لهما: (فَلَوْ يَعْلَمُ الكَافِرُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللهِ مِنَ الرَّحْمَةِ لَمْ يَيْأَسْ مِنَ الجَنَّةِ، وَلَوْ يَعْلَمُ المُؤْمِنُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللهِ مِنَ العَذَابِ، لَمْ يَأْمَنْ مِنَ النَّارِ). [خ٦٤٦٩/ م٢٧٥٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (خودێ دلۆڤانی یا كرییە سەد پشك، نۆت و نەه پشك ل دەڤ خۆ پێت هێلاین، و پشكەك ب تنێ**

[1] ئەو ژی چونكی نیشانێت مەزنن پێت رۆژا نیشانێت قیامەتێ.

**یا کریە د عەردیدا، ب وێ پشکێ چێ کری دلۆڤانییێ ب ئێکدو دبەن، حەتا جانەوەر سمێ خۆ ژ بەر تێژکێ خۆ بلند دکەت ژ ترسا هندێ بهنگڤیت).**

- **و د ڤەگێرەکا واندا زێدە کرییە: (ب راستی خودێ سەد دلۆڤانی یێت هەین، دلۆڤانییەک ب تنێ د ناڤبەرا ئەجنەیان و مرۆڤان و جانەوەران و خشخشۆکێت د عەردیدا[1] یا ئینایە خوارێ، ب وێ دلێت وان دمیننە پێکڤە، و دلۆڤانییێ ب ئێکدو دبەن، و دەهبە پێ دلۆڤانییێ ب تێژکێ خۆ دبەت، و نۆت و نەهـ دلۆڤانی خودایێ مەزن یێت هێلاین، رۆژا قیامەتێ پێ دلۆڤانییێ ب بەندەیێت خۆ دبەت).**

٢٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَمَّا قَضَى اللهُ الخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ، فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ العَرْشِ: إِنَّ رَحْمَتِي غَلَبَتْ غَضَبِي**). [خ٣١٩٤/ م٢٧٥١].

- وفي رواية لهما: (**سَبَقَتْ غَضَبِي**). [خ٧٤٢٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دەمێ خودێ چێکری چێ کرین، د کتێبەکێدا نڤیسی، ئەو کتێب یا ل دەڤ وی ل سەر عەرشی: ب راستی دلۆڤانییا من گەلەکە و یا تەڤگرە[2] و کەرب و غەزەبا وی بەس بۆ گونەهکارانە)[3].**

- **و د ڤەگێرەکا هەردوواندا: (یا د بەری کەربا منڕا کری).**

٢٦ - (خ) عن أبي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي صَلاَةٍ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ: اللهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّداً، وَلاَ تَرْحَمْ مَعَنَا أَحداً، فَلَمَّا سَلَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ)، قَالَ لِلأَعْرَابِيِّ: (**لَقَدْ حَجَّرْتَ وَاسِعاً**). يُرِيدُ: رَحْمَةَ اللهِ. [خ٦٠١٠].

---

(١) وەکی ماران و دووپشکان و سپیە و کێچان.

(٢) موسلمان و گاوران و خراب و باشان و گوهدار و گونەهکاران دگریت.

(٣) دلۆڤانی و کەرب، هەردو ساخلەتێت خودێنە چو ب سەر چو ناکەڤن، و ئاخفتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مەرەم پێ مەجازە نە حەقیقەتە ئانکو دلۆڤانییا وی گەلەکە و یا بەرفرەهە و یا تەڤگرە.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو نڤێژەکێ و ئەم ژی د گەل وی رابووین کۆچەرە عەرەبەکی گۆت و ئەو د نڤێژێدا بوو یا خودێ دلۆڤانییێ ب من و موحەممەدی ببە و دلۆڤانییێ ب کەسێ دی د گەل مە نەبە، ئینا دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) سلاڤا ملان ڤەدای گۆتە کۆچەرە عەرەبی: (تە تشتێ بەرفرەه تەنگ کر) ئانکو: دلۆڤانییا خودێ.**

٢٧ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَصَبِيٌّ فِي الطَّرِيقِ، فَلَمَّا رَأَتْ أُمُّهُ الْقَوْمَ خَشِيَتْ عَلَى وَلَدِهَا أَنْ يُوطَأَ، فَأَقْبَلَتْ تَسْعَى وَتَقُولُ: ابْنِي ابْنِي! وَسَعَتْ فَأَخَذَتْهُ، فَقَالَ الْقَوْمُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا كَانَتْ هَذِهِ لِتُلْقِيَ ابْنَهَا فِي النَّارِ، قَالَ: فَخَفَّضَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: (**وَلاَ اللهُ عزّ وجل، لاَ يُلْقِي حَبِيبَهُ فِي النَّارِ**). [حم١٢٠١٨].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د گەل کۆمەکا هەڤالێت خۆ بوو و زارۆکەك د رێکێدا بوو ڤێجا دەمێ دایکێ ئەو مرۆڤ دیتین ترسییا زارۆکێ وێ بکەڤیتە بن پێیان ب بەرڤە چۆ و دگۆت کورێ کورێ من رێك ڤەکر و گەهشتێ و هەلگرت، ئینا وان مرۆڤان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە کورێ خۆ ناهاڤێتە د ئاگریدا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) بێ دەنگ کرن و گۆت: (و خودایێ هەر ب هێز و مەزن ژی خۆشڤییێ خۆ ناهاڤێتە د ئاگریدا).**

٢٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لِلَّهِ عزّ وجل مِائَةُ رَحْمَةٍ، وَإِنَّهُ قَسَمَ رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ أَهْلِ الْأَرْضِ فَوَسِعَتْهُمْ إِلَى آجَالِهِمْ، وَذَخَرَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ رَحْمَةً لِأَوْلِيَائِهِ، واللهُ عزّ وجل قَابِضٌ تِلْكَ الرَّحْمَةَ الَّتِي قَسَمَهَا بَيْنَ أَهْلِ الْأَرْضِ إِلَى التِّسْعَةِ وَالتِّسْعِينَ، فَيُكَمِّلُهَا مِائَةَ رَحْمَةٍ لِأَوْلِيَائِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [حم١٠٦٧٢،١٠٦٧٠]

* صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەبو هورەیرە (ڕەزیاللە) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ سەد دلۆڤانی پێت هەین و ب ڕاستی وی ئێك ب تنێ یا د ناڤبەرا خەلکێ عەردیدا لێکڤەکری و تێرا وان یا کری هەتا دویماهیا وان و نۆت و نەهـ پشکێت دلۆڤانییێ بۆ خودێناسان مرۆڤێت خۆ پێت هێلاین و خودایێ ب هێز و مەزن وێ پشکا د ناڤبەرا خەلکێ عەردیدا لێکڤەکری دێ کێشیت و دەتە د گەل نۆت و نەهان و دێ تمام کەت کەتە سەد دلۆڤانی بۆ وەلییێت خۆ ڕۆژا قیامەتێ).**

٢٠ - عَنْ أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ قَالَ: لا إِلهَ إِلا اللهُ، دَخَلَ الجَنَّةَ وَوَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَمَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، مِائَةً، كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ حَسَنَةٍ وأربعاً وعشرينَ حَسَنَةً)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذاً لا يَهْلِكُ مِنَّا أَحَدٌ؟ قَالَ: (بَلَى، إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَجِيءُ بِالحَسَنَاتِ لَوْ وُضِعَتْ عَلى جَبَلٍ أَثْقَلَتْهُ، ثُمَّ تَجِيءُ النِّعَمُ فَتَذْهَبُ بِتِلْكَ، ثُمَّ يَتَطَاوَلُ الرَّبُّ بَعْدَ ذَلِكَ بِرَحْمَتِهِ). [ك٧٦٣٨].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئەبی تەلحەیێ ئەنساری (ڕەزیاللە) ژ بابێ خۆ و ژ باپیرێ خۆ (ڕەزیاللە) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ بێژیت، (لا إله إلا الله) ئەو چۆ بەحەشتێ و بەحەشت بۆ هاتە نڤیسین، و هەر کەسێ سەد جاران بێژیت، (سبحان الله وبحمده) هزار و بیست و چوار خێر بۆ هاتنە نڤیسین)، گۆتن: هۆسا کەس ژ مە ژ ناڤ ناچیت؟! گۆت: (بەلێ ب ڕاستی ئێك ژ هەوە هند خێران دئینیت ئەگەر داننە سەر چیایەکی دێ بۆ گران بیت، پاشی دێ ڤەنجییێت خودێ[1] هێن دێ وان خێران هەمیان بەت، پاشی خودێ دێ کەرەمێ کەت و بۆریت و ب دلۆڤانییا خۆ بەندەی بەتە بەحەشتێ).**

---

[1] پێت نەهێنە هەژمارتن.

## ١٠ . باب: (ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ).

**بابەتێ: دوعا ژ من بكەن ئەز دێ بەرسڤا هەوە دەم.**

٣٠ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فِيمَا رَوَى عَنِ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ: **(يَا عِبَادِي! إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً، فَلاَ تَظَالَمُوا.**

**يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ؛ فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ.**

**يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ؛ فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ.**

**يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ؛ فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ.**

**يَا عِبَادِي! إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً؛ فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ.**

**يَا عِبَادِي! إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي.**

**يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ، مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئاً.**

**يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئاً.**

**يَا عِبَادِي! لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي؛ إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ.**

**يَا عِبَادِي! إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمَدِ اللهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ).** [م٢٥٧٧].

ژ ئەبی زەری، (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) ژ وێ یا ژ خودایێ خۆ یێ ب هێز و مەزن ڤەدگوهێزیت، گۆت: **(گەلی بەندەیێت من، من زۆرداری و ستەم ل سەر خۆ یا حەرام كری، و من د ناڤبەرا هەوەدا ژی یا حەرام كری، ڤێجا ستەمێ ل ئێك و دو نەكەن.**

**گەلی بەندەیێت من هوین هەمی د بەرزەنە، ئەو نەبیت یێ من راستەرێ كری، راستەرێكرنێ ژ من بخوازن دێ هەوە راستەرێ كەم.**

گەلی بەندەیێت من هوین هەمی د برسینە، ئەو نەبیت یێ من خوارن دایێ، خوارنێ ژ من بخوازن، دێ خوارنێ دەمە هەوە.

گەلی بەندەیێت من هوین هەمی رویسن، ئەو نەبیت یێ من جلك کرینە بەر، جلکان ژ من بخوازن، دێ جلکان کەمە بەر هەوە.

گەلی بەندەیێت من هوین ب شەڤ و رۆژ گونەهان دکەن، و ئەز هەمی گونەهان ژێ دبەم، داخوازا گونەهژێبرنێ ژ من بکەن، دێ گونەهێت هەوە ژێ بەم.

گەلی بەندەیێت من هوین ناگەهنە زیانا من هەتا زیانا من بکەن، و هوین ناگەهنە مفایێ من هەتا مفایی بگەهیننە من.

گەلی بەندەیێت من ئەگەر یێ ئێکێ و یێ دویماهییێ ژ هەوە، و مرۆڤ و ئەجنەیێت هەوە هەمی بهێنە سەر دلێ زەلامێ ژ هەوە هەمییان ژ خودێ ترستر، ئەڤە چو ژ ملکێ من زێدە ناکەت.

گەلی بەندەیێت من ئەگەر یێ ئێکێ و یێ دویماهییێ ژ هەوە، و مرۆڤ و ئەجنەیێت هەوە هەمی بهێنە سەر دلێ زەلامێ ژ هەوە هەمییان خرابتر، ئەڤە چو ژ ملکێ من کێم ناکەت.

گەلی بەندەیێت من ئەگەر یێ ئێکێ و یێ دویماهییێ ژ هەوە، و مرۆڤ و ئەجنەیێت هەوە هەمی ل دەشتەکێ ب تنێ راوەستن و داخوازێ ژ من بکەن، و ئەز هەر مرۆڤەکی داخوازا وی بدەمێ، ئەڤە چو ژ وێ یا ل دەڤ من کێم ناکەت، تەمەت وێ نەبیت یا دەرزیك کێم دکەت، ئەگەر بکەنە د دەریایێدا.

گەلی بەندەیێت من جزایێ هەوە بەس ل دویڤ کار و کریارێت هەویە، ئەز بۆ هەوە دپارێزم، پاشی ئەز دێ جزایێ ب دورستی دەمە هەوە، ڤێجا هەر کەسێ خێر دیت بلا سوپاسییا خودێ بکەت، و هەر کەسێ تشتەکێ دی دیت بلا لەومەییا خۆ پێڤەتر نەکەت)[1].

---

[1] - ئانکو بلا گازندا ژ خۆ پێڤەتر نەکەت.

## ١١ . باب: إن الله لا ينام.

## بابەتێ: خودێ نانڤیت.

٣١ - (م) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ، فَقَالَ: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل لاَ يَنَامُ وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ، يَخْفِضُ القِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ، وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ، حِجَابُهُ النُّورُ، لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ).

- وَفِي رِوَايَةِ: (حِجَابُهُ النار). [م١٧٩].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دناف مەدا رابوو پێنج پەیڤ بۆ مە گۆتن، گۆت: (ب راستی خودێ نانڤیت و نابیت بنڤیت[1] و ئەو رزقی كێم دكەت و زێدە دكەت و كارێ شەڤێ بەری یێ رۆژا دویڤدا بۆ دهێتە بلندكرن و كارێ رۆژێ بەری یێ شەڤا دویڤدا بۆ دهێتە بلندكرن رێگر ژ دیتنا وی رۆناهییە ئەگەر رۆناهی و نوورها وی بێتە ئاشكەراكرن دێ نوورها وی هندی چاڤێت وی دگرن ژ چێكرییێت وی سۆژیت).**

- **و د ڤەگێرەكێدا: (پەردا وی ئاگرە)**

[1] ئانكو: نڤستن د راستا ویدا نینە.

## ١٢ . باب: صفة الصبر وغيرها.

## بابەتێ: سالۆخەتێ بێهنفرەهییێ و غەیری وێ.

٣٢ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللهِ، يدْعُونَ لَهُ الوَلَدَ، ثُمَّ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ). [خ٧٣٧٨، (٦٠٩٩)/ م٢٨٠٤].

ژ ئەبو مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(كەس ژ خودێ ل سەر ئەزیەتا گوه لێ دبیت بێهنفرەهتر نینە، زارۆكان بۆ ددانن، پاشی ئەو وان ب سلامەت دئێخیت و نەخۆشییان ژێ ددەتە پاش و رزقێ وان ددەت).**

٣٣ - عن النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَا مِنْ قَلْبٍ إِلاَّ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، إِنْ شَاءَ أَقَامَهُ وَإِنْ شَاءَ أَزَاغَهُ).

وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (يَا مُثَبِّتَ القُلُوبِ! ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِينِكَ)، قَالَ: (وَالمِيزَانُ بِيَدِ الرَّحْمَنِ، يَرْفَعُ أَقْوَاماً، وَيَخْفِضُ آخَرِينَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ). [جه١٩٩].

ژ ئەبی نەواسێ كورێ سەمعانی (رضي الله عنه) دبێژیت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(دل نینە ئەگەر د ناڤبەرا دو تلیان نەبیت ژ تلێت خودایێ دلۆڤان ئەگەر ڤیا دێ راست كەت و ئەگەر ڤیا دێ خوار كەت).**

و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: **(هەی راگر و وەرگێرێ دلان دلێت مە ل سەر دینێ خۆ راگرە)**، و گۆت: **(ترازی یا د دەستێ خودایێ دلۆڤاندا هندەكان بلند دكەت و هندەكان نزم دكەت هەتا رۆژا قیامەتێ).**

٣٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (ما مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ، مِنْ أَجْلِ ذلِكَ حَرَّمَ الفَوَاحِشَ، ومَا أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ المَدْحُ مِنَ اللهِ). [خ٥٢٢٠ (٤٦٣٤)/ م٢٧٦٠]

- زاد في رواية لمسلم: (وَلَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ العُذْرُ مِنَ اللهِ، مِنْ أَجْلِ ذلِكَ أَنْزَلَ الكِتَابَ وَأَرْسَلَ الرُّسُلَ).

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی کەس وەکی خودێ ب گونەهێ پێ نەخۆش نینە لەوا کریار و گۆتنێت کرێت پێت حەرام کرین و کەس وەکی وی حەژ مەدحێ ناکەت)[1].**

- **و د ڤەگێڕا موسلمیدا زێدە هاتییە: (کەس حەژ نەهێلانا هێجەتان ناکەت وەکی خودێ لەوا کتێب ئینانە خوار و پێغەمبەر هنارتن)[2].**

٣٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَغَارُ، وَغَيْرَةُ اللهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللهُ**). [خ٥٢٢٣/ م٢٧٦١].

**ژ ئەبی هورەیرە، (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ پێ نەخۆش دبیت، و پێنەخۆشییا وی ئەڤەیە، مرۆڤ وی تشتی بکەت یێ خودێ ل سەر حەرام و نەدورست کری).**

١٣ . باب: مؤمن بالله وكافر بالكواكب.

**بابەتێ: باوەریداری ب خودێ و گاوری ب هەساران.**

٣٦ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ، عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: (**هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ**)؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (**أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ**). [خ٨٤٦/ م٧١].

**ژ زەیدێ کورێ خالدێ جوهەنی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ـ پشتی بارانەك ب شەڤ هاتی ـ رۆژا حودەیبییێ نڤێژا سپێدێ ل بەری مە کر، ڤێجا دەمێ خلاس**

---

[1] ئەو ژی د خێرا بەندەیاندانە دا پەسنا وی بکەن و بەرامبەر خێرا وان مەزن بکەت.

[2] دا بەندەیان هێجەت نەمینن.

بووی بەرێ خۆ دا خەلكی و گۆت: **(ئەرێ هوین دزانن خودایێ هەوە چ گۆت)؟** گۆتن: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن. گۆت: گۆت: **(نوكە هندەك ژ بەندەیێت من، خودان باوەرن ب من و هندەك گاورن، هندیكە یێ گۆتی ب خێر و كەرەما خودێ و ب دلۆڤانییا وی باران بۆ مە هات ئەو خودان باوەرە ب من و ب ستێران بێباوەرە، و هندیكە یێ گۆتی ب ڤێ ستێرێ و ب ڤێ ستێرێ باران بۆ مە هات ئەو ب من یێ بێباوەرە و ب ستێران خودان باوەرە).**

١٤ . باب: حلاوة الايمان وشعبه.

**بابەتێ: شرینییا باوەرییێ و پشكێت وێ.**

٣٧ - (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الْإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ للهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ). [خ١٦/ م٤٣].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(سێ تشتن هەر كەسێ ل دەڤ هەبن، وی شرینییا باوەریێ دیت[1]: خودێ و پێغەمبەرێ وی خۆشڤیتر بن بۆ وی ژ (هەر تشتەكی) غەیری وان، و حەز مرۆڤی بكەت بۆ خودێ نەبیت حەژێ نا كەت، و نەڤێت ب زڤریتە گاورییێ پشتی خودێ ژێ رزگار كری كا چاوا نەڤێت باڤێژنە د ئاگریدا).**

٣٨ - (م) عَنِ العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المطَّلِبِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ، مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً). [م٣٤].

ژ عەباسێ كورێ عەبدولموتەلبی (رضي الله عنه) كو وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(یێ ب خودێ رازی بیت خودان، و ب ئیسلامێ ئایین و ب موحەممەدی پێغەمبەر وی تامكرە باوەرییێ (باوەریا دورست ئینا).**

---

[1] ئانكو: دێ خۆشییا خۆ ب تاعەت و گوهدارییێ بینیت و ل سەر د گران نابن.

٣٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، وَالحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ)**. [خ٩/ م٣٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (باوەری شێست و تشتەك پشكە، و شەرم پشكەكە ژ باوەرییێ).**

## ١٥ . باب: حب النبي (ص) من الايمان.

## بابەتێ: ڤیانا پێغەمبەری (ﷺ) ژ باوەرییێیە.

٤٠ - (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)**. [خ١٥/ م٤٤].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە ب دورستی باوەرییێ نائینیت هەتا ئەز ل دەڤ خۆشڤیتر نەبم ژ بابێ وی و زارۆكێت وی و ژ مرۆڤان هەمیان).**

٤١ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِلاَّ مِنْ نَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! حَتَّى**
**أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ)**، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: فَإِنَّهُ الآنَ، وَاللهِ، لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(الآنَ يَا عُمَرُ)**. [خ٦٦٣٢ (٣٦٩٤)].

**ژ عەبدوللایێ كورێ هشامی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ) و وی دەستێ عومەرێ كورێ خەتتابی گرتبوو، ئینا عومەری گۆتێ: ب راست یا پێغەمبەرێ خودێ تو ل دەڤ من ژ هەمی تشتان خۆشڤیتری ژ من تێ نەبیت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نەخێر ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا تو باوەرییا دورست نائینی هەتا**

**ئەز دەفتە ژ تە خۆشڤیتر نەبم)، ئینا عومەری گۆتێ: ب راستی ئها نوكە و ب خودێ تو ژ دەڤ من ژ من خۆشڤیتری، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئها ڤێ گاڤێ یا عومەر)[1].**

٤٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مِنْ أَشَدِّ أُمَّتِي لِي حُبّاً، نَاسٌ يَكُونُونَ بَعْدِي، يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِي، بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ**). [م٢٨٣٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێ پتر هەمیان حەژ من دكەت ژ ئوممەتا من هندە كەسن دێ پشتی من هێن، ئێك ژ وان حەز دكەت مالێ خۆ و مالا خۆ بدەت بەس من ببینیت).**

٤٣ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِي أُحِبُّكُم أَهْلَ البَيْتِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ: (آللهِ) قال: الله، قال: (**فأعِدَّ لِلفَقْرِ تِجْفَافاً، فَإِنَّ الفَقْرُ أَسْرَعُ إِلَى مَنْ يُحِبُّنَا مِنَ السَّيْلِ مِنْ أَعْلى الأَكْمَةِ إِلى أَسْفَلِها**). [ك٧٩٤٤].

* قال الذهبي: على شرطهما.

[وانظر: ٣٣٥١ (المرء مع من أحب).

٣٢٦٠ حب الذي حُدَّ في الخمر.

٢٦٦٢ في حب ما كان يحبه (ﷺ)].

**ئەبی زەڕ (رضي الله عنه) هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ ئەز حەژ هەوە دكەم خەلكێ بنەمالێ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (تو ب خودێ كەی)؟، گۆت: ئەز ب خودێ كەم، ئینا گۆت: (ئەگەر تو حەژ من بكەی زری و كونزرییەكی بۆ خۆ بۆ هەژارییێ پەیداكە، ب راستی هەژاری بۆ یێ حەژ من دكەت لەزترە ژ ئاڤا جۆكێ بگەهیتە دویماهییا خۆ).**

[1] ئانكو: ژ نوی تە ئاخفتنا دورست و یا پێدڤی زانی و گۆت.

## ١٦ . باب: الامر بالمعروف والنهي عن المنكر.

## بابەتێ: فەرمانكرن ب باشییێ و پاشڤەلێدانكرن ب خرابییێ.

٤٤ – (خ) عَن النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَثَلُ القَائِمِ عَلَى حُدُودِ اللهِ وَالوَاقِعِ فِيهَا، كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ، فَأَصَابَ بَعْضُهُمْ أَعْلاَهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا، فَكَانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنَ المَاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ، فَقَالُوا: لَو أَنَّا خَرَقْنَا فِي نَصِيبِنَا خَرْقاً، وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا، فَإِنْ يَتْرُكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعاً، وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا، وَنَجَوْا جَمِيعاً**). [خ٢٤٩٣].

ژ نەعمانێ كورێ بەشیری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**مەتەلا وی یێ ل بەر تخویبێت خودێ راوەستایی و یێ كەفتییە تێدا، وەكی مەتەلا خەلكەكییە پشكێ د گەمییەكێدا بكێشن، هندەك بچنە سەری و هندەك بچنە بنی، و ئەوێت ل بنی ئەگەر هاتبانە ئاڤا ڤەخوارنێ د بەر یێت سەرڕا دبۆرین، گۆتن: ئەگەر ئەم كونەكێ د بارا خۆ ڤەكەین و یێت سەر خۆدا ئەزیەت نەدەین، ئەگەر وان هێلا یا وان ڤیای بكەن، ئەڤە هەمی د هیلاك چۆن، و ئەگەر دەستێت وان گرتن رزگار بوون، و هەمی رزگار بوون**).

٤٥ – (م) عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ بَدَأَ بِالخُطْبَةِ، يَوْمَ العِيدِ قَبْلَ الصَّلاَةِ، مَرْوَانُ، فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ، فَقَالَ: الصَّلاَةُ قَبْلَ الخُطْبَةِ، فَقَالَ: قَدْ تُرِكَ مَا هُنَالِكَ.

فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هذَا، فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ. سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ**). [م٤٩].

ژ تارقێ كورێ شهابی (ﷺ) گۆت: یێ ئێكێ دەست ب گۆتارخواندنێ بەری نڤێژكرنێ كری رۆژا جەژنێ مەروان بوو، زەلامەك ژێ رابوو و گۆتێ: نڤێژ بەری گۆتارێیە، ئینا گۆت: خەلك دێ گوهدانا گۆتارێ هێلیت ئەگەر مە گیرۆ كر[1].

ئینا ئەبو سەعیدی گۆت: هندیكە ئەڤەیە[2] یا ل سەر خۆ راكر[3] من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەر كەسێ ژ هەوە گونەهـ و خرابییەك دیت بلا ب دەستێ خۆ بگوهۆریت، ئەگەر نەشیا بلا ب ئەزمانێ خۆ بیت، ئەگەر نەشیا بلا ب دلێ خۆ بیت و ئەڤە لاوازترین باوەرییە).**

٦-٤ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي؛ إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ، يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ، وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ، يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لا يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ).** [م٥٠].

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نینە پێغەمبەرەك بەری من د ناڤ ملەتەكیدا هاتبیتە هنارتن، ئەگەر هاریكار و پشتەڤان و هەڤال نەبن رێكا وی دگرن و ل دویڤ فەرمانا وی دچن، پاشی دەستەكەكا خراب ل پاش وانڤە هاتن، وێ دبێژن یا نەكەن، و وێ دكەن یا فەرمانا وان پێ نەهاتییە كرن، هەر كەسێ جیهادێ ب دەستێ خۆ د گەل وان بكەت ئەو خودان ئیمانە و هەر كەسێ جیهادێ ب ئەزمانێ خۆ د گەل وان بكەت ئەو خودان ئیمانە و هەر كەسێ جیهادێ**

---

[1] یان پێشئێخستنا نڤێژێ ل سەر گۆتارخواندنێ مە یا هێلای و وەكی بەرێ نەمایە.

[2] ئانكو: ئەو زەلامێ ب ئەزمانی پاشڤەلێدان كری.

[3] ئانكو: ئەركێ خۆ ب جهـ ئینا.

**ب دلێ خۆ د گەل وان بکەت ئەو خودان ئیمانە و پشتی ڤێ دندکەك ژێ ژ ئیمان و باوەرییێ نینە).**

٤٧ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَيُّها النَّاسُ، مُرُوا بِالمَعْرُوفِ، وانْهَوْا عَنِ المُنْكَرِ، قَبْلَ أَنْ تَدْعُوا اللهَ فَلا يَسْتَجِيبُ لَكُمْ، وَقَبْلَ أَنْ تَسْتَغْفِروا فَلا يَغْفِرُ لَكُم. إنَّ الأَمْرَ بِالْمَعْرُوفِ والنَّهيَ عَنِ المُنْكَرِ لا يَرْفَعُ رِزْقاً، ولا يُقَرِّبُ أَجَلاً. وإنَّ الأَحْبَارَ مِنَ اليَهُودِ، وَالرُّهْبَانَ من النَّصَارى لَمَّا تَرَكُوا الأَمْرَ بِالمَعْرُوفِ والنَّهْيَ عَنِ المُنْكَرِ لَعَنَهُمُ اللهُ عَلى لِسَانِ أَنْبِيَائِهِم، ثُمَّ عُمُّوا بِالبَلاءِ).** [مخ١٣/٣٣٨، ٣٣٩].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (گەلی خەلکی فەرمانێ ب باشییێ بکەن و پاشڤەلێدانێ ژ گونەهێ بکەن بەری هوی دوعایان بکەن و ژ هەوە نەهێنە وەرگرتن و بەرسڤا هەوە نەهێتە دان، و بەری هوین داخوازا گونەهژێبرنێ بکەن و گونەهێت هەوە نەهێنە ژێبرن، ب راستی فەرمانکرن ب باشییێ و پاشڤەلێدانکرن ژ گونەهێ رزقی راناکەت، و مرنێ نێزیك ناکەت، و ب راستی دەمێ زانایێت جوهییان و عیبادەتکەرێت مەسیحییان فەرمانکرن ب باشییێ و پاشڤەلێدان ژ گونەهێ هێلاین خودێ لەعنەت ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەرێت وان ل وان کرن و پاشی بەلایێ ئەو هەمی گرتن).**

٤٨ - (ق) عَنْ أُسامة بن زيد قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يَقُولُ: **(يُجَاءُ بِالرَّجُلِ يَوْمَ القِيَامَةِ، فيُلْقى فِي النَّارِ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُهُ فِي النَّارِ، فَيَدُورُ كما يَدُورُ الحِمَارُ بِرَحاهُ، فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النَّارِ عَلَيْهِ فَيَقُولُونَ: أَيْ فُلاَنُ ما شَأْنُكَ؟ أَلَيْسَ كُنْتَ تَأْمُرُنَا بِالمَعْرُوفِ وَتَنْهَانَا عَنِ المُنْكَرِ؟ قَالَ: كُنْتُ آمُرُكُمْ بِالمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيهِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ المُنْكَرِ وَآتِيهِ).** [خ٣٢٦٧/ م٢٩٨٩].

**ژ ئەبی زەید ئوسامەیێ کورێ زەیدی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (رۆژا قیامەتێ دێ زەلامی ئینن، و دێ هاڤێژنە د ئاگریدا، رویڤیکێت وی دێ د ئاگریدا دەرکەڤن، و دێ ل دۆر رویڤیکێت خۆ زڤریت، هەرومکی کەر ل دۆر دستاری (ئاشی) دزڤریت، خەلکێ جەهنەمێ دێ لێ کۆم بن و دێ بێژنێ: تە خێرە بێڤان کەس؟! ما تە فەرمان ب باشییێ ل مە نەدکر، و پاشڤەلێدان ژ خرابییێ ل مە نەدکر؟ دێ بێژیت: بەلێ من فەرمان ب باشییێ ل هەوە دکر و من نەدکر، و من پاشڤەلێدان ژ خرابییێ ل هەوە دکر و من دکر).**

١٧ . باب: الإيمان والاحسان والاسلام.

**بابەتێ: باوەری و کاربنەجهی و ئیسلامەتییێ.**

٤٤ - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ، وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلاَمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الإِسْلاَمُ: أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ البَيْتَ، إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً**)، قَالَ: صَدَقْتَ.

قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ، يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَ: (**أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ، وَاليَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ**)، قَالَ: صَدَقْتَ.

قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ؟ قَالَ: (**أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ، فَإِنَّهُ يَرَاكَ**).

قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: (**مَا المَسْؤُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ**). قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَتِهَا؟ قَالَ: (**أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الحُفَاةَ العُرَاةَ، العَالَةَ، رِعَاءَ الشَّاءِ، يَتَطَاوَلُونَ فِي البُنْيَانِ**).

قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ، فَلَبِثْتُ مَلِيّاً، ثُمَّ قَالَ لِي: (**يَا عُمَرُ! أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ**)؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (**فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ، أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ**). [م٨].

ژ عومەرێ كورێ خەتتابی، (رضي الله عنه) گۆت: رۆژەكێ ئەم ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) د روینشتی بووین، زەلامەك ژ نیشكەكێڤە دەركەفت، جلكێت وی زێدە سپی بوون، و سەرێ وی زێدە یێ رەش بوو، نیشانێت سەفەرێ ل سەر نەدهاتنە دیتن، و كەسێ ژ مە نەدنیاسی، هات هەتا روینشتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) چۆكێت خۆ ئێخستنە چۆكێت وی و دەستێت خۆ دانانە سەر چۆكێت خۆ، و گۆت: یا موحەممەد، بێژە من ئیسلام چییە؟ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(موسلمانەتی ئەڤەیە تو شەهدەییێ بدەی كو ب راستی چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و ب راستی موحەممەد پێغەمبەر و قاسدێ خودێیە، و تو بەردەوام و ب رەنگێ پێدڤی نڤێژان بكەی، و زەكاتێ بدەی، و رەمەزانێ ب رۆژی بی، و بچییە حەجێ ئەگەر تە پێ چێ ببیت)**. گۆت: تو راست دبێژی.

گۆت: ئەم ژێ حێبەتی بووین، پسیارێ ژێ دكەت و راست ددانیت! گۆت: بێژە من كا ئیمان و باوەری چییە؟ گۆت: ((باوەری ئەڤەیە) **تو باوەرییێ ب خودێ و ملیاكەتێت وی و كتێبێت وی و پێغەمبەرێت وی و رۆژا قیامەتێ بینی، و تو باوەرییێ ب قەدەرێ بینی یا (بۆ تە) باش و (بۆ تە) خراب)**[1]. گۆت: تو راست دبێژی.

گۆت: بێژە من كاربنەجهی چییە؟ گۆت: **(كاربنەجهی ئەڤەیە تو خودێ بپەرێسی هەرومكی تو دبینی، و ئەگەر تو نەبینی ئەو تە دبینیت)**.

گۆت: بێژە من كا رۆژا قیامەتێ كەنگییە؟ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(یێ پرسیار ژێ دهێتە كرن ژ وی پتر ژێ نوزانیت یێ پرسیارا وێ دكەت)**[2]. گۆت: بۆ من بێژە كا نیشانێت وێ چنە؟ گۆت: (نیشانێت وێ ئەڤەنە): **(جارییێ سەروەر و خودانێ خۆ ببیت (یان كچ سەروەرییێ ل دایكا خۆ بكەت، و تو پێخواسێت رویسێت فەقیر و هەژار، شڤانێت پەزی ببینی، ئێك ئاڤاهی ژ یێ دی بلندتر چێ كەت)**[3].

---

(١) ئانكو: یا ب دلێ تە و یا نە ب دلێ تە.

(٢) ئانكو: یابەرزەیە كەس نوزانیت قیامەت كەنگییە ژ خودێ پێڤەتر.

(٣) ئانكو: ئاڤاهییان ل سەر ئێكدو بلند كەن.

**گۆت: پاشی چۆ، ئەز دەمەکێ درێژ مام، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە من: (ئەی عومەر تە زانی ئەو کی بوو)، من گۆت: خودێ و پێغەمبەر چێتر دزانن. گۆت: (ئەو جبریل بوو هاتە دەڤ هەوە دا ئایینێ هەوە نیشا هەوە بدەت)[1].**

٥٠ – عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: **(أَنْ يُسْلِمَ قَلْبُكَ للهِ عزّ وجل، وَأَنْ يَسْلَمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِكَ وَيَدِكَ)**. قَالَ: فَأَيُّ الْإِسْلَامِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(الْإِيمَانُ)**، قَالَ: وَمَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: **(تُؤْمِنُ بِاللهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ)**. قَالَ: فَأَيُّ الْإِيمَانِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(الهِجْرَةُ)**، قَالَ: فَمَا الهِجْرَةُ؟ قَالَ: **(تَهْجُرُ السُّوءَ)**. قَالَ: فَأَيُّ الهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(الجِهَادُ)**، قَالَ: وَمَا الجِهَادُ؟ قَالَ: **(أَنْ تُقَاتِلَ الكُفَّارَ إِذَا لَقِيتَهُمْ)**. قَالَ: فَأَيُّ الجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: **(مَنْ عُقِرَ جَوَادُهُ وَأُهْرِيقَ دَمُهُ)**، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ثُمَّ عَمَلَانِ هُمَا أَفْضَلُ الْأَعْمَالِ إِلَّا مَنْ عَمِلَ بِمِثْلِهِمَا: حَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ، أَوْ عُمْرَةٌ)**. [حم١٧٠٢٧].

* حديث صحيح.

**ژ عەمرێ کورێ عەبەسەی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئیسلام چییە؟ گۆت: (موسلمانەتی ئەڤەیە دلێ تە سپەهی بۆ خودێ بیت و موسلمان ژ ئەزمان و دەستێ تە ب سلامەت بن)، گۆت: پا کیژ کار د موسلمانەتییێدا باشترە؟ گۆت: (باوەری)، گۆت: و باوەری چییە؟ گۆت: (باوەری ئەڤەیە) (تو باوەرییێ ب خودێ و ملیاکەتێت وی و کتێبێت وی و پێغەمبەرێت وی و رۆژا قیامەتێ پشتی مرنێ بینی)، گۆت: کیژ کارێ باوەرییێ باشترە؟ گۆت: (مشەختیاتی)، گۆت: مشەختیاتی چییە؟، گۆت: (مشەختیاتی ئەوە) (ژ گونەهێ مشەخت ببی). گۆت: کیژ مشەختیاتی باشترە؟، گۆت: (جیهاد)، گۆت: و جیهاد چییە؟ گۆت: (جیهاد ئەوە) (شەرێ گاوران بکەی ئەگەر تە دیتن)، گۆت: پا کیژ جیهاد باشترە؟ گۆت: (یێ دەوارێ وی هاتە کوشتن و خوینا وی هاتە**

(١) ئانکو: پرسیار بۆ هەوە دکرن دا هوین بزانن.

**رێتن)**[١] و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(پاشی دو کار ژ هەمی کاران باشترن چو ناگەهیتە وان ئەو نەبیت یێ وەکی وان بکەت، ئەو ژی حەجا راست و دورستە و عومرەیە).**

## ١٨ . باب: الوسوسة وحديث النفس.

## بابەتێ: وەسوەسێ و ئاخفتنا دەروونی

٥١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: **(إِنَّ اللهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي ما حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، ما لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ).** [خ٥٢٦٩ (٢٥٢٨)/ م١٢٧].

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ یێ ل ئوممەتا من بۆری ژ وی تشتێ ئەو د دلێ خۆدا دبێژن هندی یێ نەئاخڤن و کار پێ نەکەن).**

٥٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَسَأَلُوهُ: إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، قَالَ: **(وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ)**؟ قالُوا: نَعَمْ، قَالَ: **(ذَاكَ صَرِيحُ الإِيمَانِ)** [م١٣٢].

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: هندەك كەس ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) هاتنە دەڤ و پرسیار ژێ کرن، ب راستی ئەم هندەك تشتان د دلێت خۆدا دبینن ئەم مەزن دبینین پێ باخڤین؟ گۆت: (ئەڤە ژی هەوە دیتییە)؟ گۆتن: بەلێ. گۆت: (ئەو باوەرییا دورستە)**[٢].

٥٣ - عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَحَدَنَا يَجِدُ فِي نَفْسِهِ، يُعَرِّضُ بِالشَّيْءِ، لَأَنْ يَكُونَ حُمَمَةً أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ، فَقَالَ: **(اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الوَسْوَسَةِ).** [د٥١١٢]

* صحيح.

---

(١) ئانکو: شەهید ببیت.

(٢) مادەم هوین نەکەنە کریار و ئاخفتن و مەزن بزانن.

ژ ئیبن عەباسی گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئێك ژ مە د دلێ خۆدا دبینیت تشتێ خراب دكەڤیتە سەر دلێ وی، ببیتە رەژوی بۆ وی خۆشترە ئەو پێ باخڤیت؟ ئینا گۆت: **(مەزناتی بۆ خودێ بیت، مەزناتی بۆ خودێ بیت، مەزناتی بۆ خودێ بیت، و سوپاس بۆ خودێ خرابییا شەیتانی كرییە د وەسواسێدا).**

١٩ . باب: قول الشيطان: من خلق الله.

**بابەتێ: گۆتنا شەیتانی: كێ خودێ چێ كرییە.**

٤٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا، مَنْ خَلَقَ كَذَا، حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ).**

[خ٣٢٧٦/ م١٣٤].

- وفي رواية لمسلم: **(لاَ يَزَالُ النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يُقَالَ: هَذَا، خَلَقَ اللهُ الْخَلْقَ، فَمَنْ خَلَقَ اللهَ؟ فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً، فَلْيَقُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ)**. وزاد في رواية: **(ورسله)**.

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(شەیتان دێ ئێتە ئێك ژ هەوە و دێ بێژیتێ كێ ئەڤە چێ كرییە؟ و كێ ئەڤە چێ كرییە؟ هەتا دبێژیتێ كێ خودێ چێ كرییە؟ ئەگەر گەهشتە ڤێ بلا داخوازا خۆ پاراستنێ بكەت و بێژیت: (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و بلا بەس كەت و ب دویماهی بینیت).**

- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: (بەردەوام خەلك پرسیارا ئێكدو دكەن حەتا دهێتە گۆتن: ئەڤە خودێ چێكری چێ كرن، پا كێ خودێ چێ كرییە؟ ڤێجا هەر كەسێ تشتەك ژ ڤێ دیت بلا بێژیت من باوەری ب خودێ ئینا)، و د ڤەگێرەكێدا زێدە كرییە: (و ب پێغەمبەرێت وی).**

## ٢٠ ـ باب: كتابة الحسنات والسيئات.

## بابەتێ: نڤیسانا خێر و گونەهان.

٥٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عزّ وجل قَالَ: **(إِنَّ اللهَ كَتَبَ الحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا وَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كامِلَةً، فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً).** [خ٦٤٩١/ م١٣١].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) ژ خودایێ خو یێ مەزن ڤەدگێریت: **(ب راستی خودایێ مەزن خێر و گونەه پێت داین (یان ئەمرێ ملیاکەتان یێ کری بنڤیسن یان یا بۆ ملیاکەتان ئاشکرا کری کا خێر و گونەهان چەوا بنڤیسن)، ڤێجا هەر کەسێ بکەتە دلێ خۆ خێرەکێ بکەت و نەکەت، خودێ دێ خێرەکا تمام بۆ وی ل دەڤ خۆ نڤیسیت، و ئەگەر کرە دلێ خۆ و کر ژی، خودێ دێ دەه خێران بۆ نڤیسیت، هەتا حەفت سەد ڤاتان و هەتا گەلەك ڤـــاتـــان، و ئەگەر کرە دلێ خۆ گونەهەکێ بکەت و نەکەت، خودێ دێ خێرەکا تمام بۆ وی ل دەڤ خۆ نڤیسیت، و ئەگەر کرە دلێ خۆ و کر ژی، خودێ دێ گونەهەکێ ب تنێ بۆ نڤیسیت).**

٥٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(يَقُولُ اللهُ: إِذَا أَرَادَ عَبْدِي أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ حَتَّى يَعْمَلَهَا، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا مِنْ أَجْلِي فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ).** [خ٧٥٠١/ م١٢٩].

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودێ دبێژیت ئەگەر بەندەیێ من ڤیا گونەهەکێ بکەت ل سەر نەنڤیسن هەتا دکەت، و ئەگەر کر وەکی وێ بۆ**

**بنڤیسین[١] و ئەگەر ژ ترسێت من نەكر بۆ خێرەكێ بنڤیسن، و ئەگەر ڤیا خێرەكێ بكەت و نەكر بۆ خێرەكێ بنڤیسن و ئەگەر كر دەه جار وەكی وێ هەتا حەفسەد ڤاتان بۆ بنڤیسن).**

٥٧ - عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْأَعْمَالُ سِتَّةٌ، وَالنَّاسُ أَرْبَعَةٌ: فَمُوجِبَتَانِ، وَمِثْلٌ بِمِثْلٍ، وَحَسَنَةٌ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَحَسَنَةٌ بِسَبْعِمِائَةٍ.**

**فَأَمَّا الْمُوجِبَتَانِ: فَمَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً دَخَلَ النَّارَ، وَأَمَّا مِثْلٌ بِمِثْلٍ: فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ حَتَّى يَشْعُرَهَا قَلْبُهُ، وَيَعْلَمَهَا اللهُ مِنْهُ، كُتِبَتْ لَهُ حَسَنَةً، وَمَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً كُتِبَتْ عَلَيْهِ سَيِّئَةً، وَمَنْ عَمِلَ حَسَنَةً فَبِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَمَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ فَحَسَنَةٌ بِسَبْعِمِائَةٍ.**

**وَأَمَّا النَّاسُ: فَمُوَسَّعٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا مَقْتُورٌ عَلَيْهِ فِي الْآخِرَةِ، وَمَقْتُورٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا مُوَسَّعٌ عَلَيْهِ فِي الْآخِرَةِ، وَمَقْتُورٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمُوَسَّعٌ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ**). [حم١٨٩٠٠].

* حديث حسن.

**ژ خورەیمێ كوڕێ فاتكی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كریار شەش جوینن، و خەلك چوار جوینن؛ (شەش كریار ئێك و دو) هەردو واجبكەرن[٢]، و (سێ و چوار) ئێك ب ئێكێ[٣] و (پێنجێ) خێرا ب دەهان و (شەش) خێرا ب حەفسەد ڤاتان.**

**هەردو واجبكەر ئەون؛ هەر كەسێ بمریت و چو هەڤپشك بۆ خودێ چێ نەكربن چۆ بەحەشتێ و هەر كەسێ مر و تشتەك بۆ كربیتە هەڤپشك چۆ جەهنەمێ، بەلێ ئەڤا ئێك ب ئێكێ هەر كەسێ بكەتە دلێ خۆ خێرەكێ بكەت و دلێ وی بێژیتێ و خودێ ڤێ ژێ بزانیت و تشتەك بۆ دورست ببیت نەشێت بكەت خودێ دێ بۆ خێرەكێ**

---

(١) ئانكو ب ئێكێ بۆ بنڤیسن.

(٢) هەردو سالۆخەتێت مرۆڤی دبنە بەحەشتێ و جەهنەمێ ئەو ژێ ئیسلام و گاورییە.

(٣) مەخسەد پێ خێرا كرییە د دلیدا و نەهاتییە كرن و گونەها كرییە د دلیدا و هاتییەكرن.

**نفیسیت، و بێ گونەهەکێ بکەت گونەهەك ب تنێ دێ ل سەر هێتە نفیسین، و بێ خێرەکێ بکەت دەهـ خێر دێ بۆ هێنە نفیسین، و بێ مەزاختنەکێ د رێیا خودێدا بەرزێخیت هەر خێرەك ب حەفتسەدانە.**

**و خەلك چوار جوینن: (ئێك) دنیا ل سەر بەرفرەهـ کرییە و قیامەت یا ل سەر بەرتەنگ کرییە (ئەو زەنگینێ گاورە) و (دو) ئاخرەت ل سەر بەرفرە هکرییە و دنیا ل سەر بەرتەنگ کرییە (ئەو باوەریدارێ هەژارە) و (سێ) دنیا و ئاخرەت ل سەر بەرفرەهـ کرییە (ئەو باوەریدارێ زەنگینە) و (چوار) دنیا و ئاخرەت ل سەر بەرتەنگ کرییە (ئەو گاورێ هەژارە)).**

٥٨ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ اللهَ لاَ يَظْلِمُ مُؤْمِناً حَسَنَةً، يُعْطَى بِهَا فِي الدُّنْيَا وَيُجْزَى بِهَا فِي الآخِرَةِ. وَأَمَّا الكَافِرُ فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِ مَا عَمِلَ بِهَا للهِ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الآخِرَةِ، لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُجْزَى بِهَا). [م٢٨٠٨].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ ستەمێ ل چو خودان باوەران د خێرەکا واندا ناکەت، د دنیایێدا پێ ددەتێ، و رۆژا قیامەتێ پێ خەلات دکەت، بەلێ بێ گاور خودێ رزقێ وی د دنیایێدا ب باشییێت وی ددەتێ، هەتا دگەهیتە رۆژا قیامەتێ و وی چو باشی نەمایی پێ بێتە خەلاتکرن).**

٥٩ - (ق) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: (مَنْ أَحْسَنَ فِي الإِسْلاَمِ لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا عَمِلَ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَمَنْ أَسَاءَ فِي الإِسْلامِ أُخِذَ بِالأَوَّلِ وَالآخِرِ). [خ٦٩٢١/ م١٢٠].

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەرێ دێ ل مە هێتە گرتن ئەوا مە بەری ئیسلامەتییێ کری؟ گۆت: (هەر کەسێ باشی د ئیسلامەتییێدا کربیت ئەوا بەری ئیسلامەتییێ کری لێ ناهێتە گرتن و بێ خرابی د ئیسلامەتییێدا کری یا ئێکێ و دویماهییێ دێ لێ هێتە گرتن).**

## ٢١ . باب: من عمل خيرا قبل ئيسلامه.

## بابەتێ: یێ بەری موسلبوونا خۆ باشی کرین.

٦٠ - (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: قلت: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الجَاهِلِيَّةِ، مِنْ صَدَقَةٍ، أَو عَتَاقَةٍ، وَصِلَةِ رَحِمٍ، فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَجْرٍ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَسْلَمْتَ عَلَى ما سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ**). [خ١٤٣٦/ م١٢٣]

- وفي رواية لهما: أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَعْتَقَ فِي الجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، ثُمَّ أَعْتَقَ فِي الإِسْلاَمِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ)... فَذَكَرَ نَحْوَهُ.[خ٢٥٣٨].

**ژ حەکیمێ کوڕێ حەزامی (رضي الله عنه) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ من بێژە هندە تشت بەری ئیسلامەتییێ من ب پەرستن یێت کرین ژ سەدەقەیان و ئازاکرنا بەندەیان و چاکییا مرۆڤانییێ، ئەرێ دێ بۆ من خێر هێتە نڤیسین؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (تو موسلمان بووی ل سەر وێ خێرا تە ل پێشییێ کری).**

- **و د ڤەگێڕەکا واندا: حەکیمێ کوڕێ حەزامی بەری موسلمانەتییێ سەد گەردەن (بەندە) ئازا کربوون و سەد حێشتر کربوونە خێر، ڤێجا دەمێ موسلمان بووی سەد حێشتر کرنە خێر و سەد کۆلە ئازا کرن و هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ... و وەکی ڤێ گۆت.**

## ٢٢ . باب الاقتصار على الفروض.

## بابەتێ: کرنا فەرزان ب تنێ

٦١ - (ق) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، ثَائِرَ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي اليوْمِ وَاللَّيْلَةِ**)، فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: (**لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ**)، قَالَ رَسُولُ اللهِ

(ﷺ): (**وَصِيَامُ رَمَضَانَ**)، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: (**لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ**)، قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الزَّكَاةَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: (**لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ**)، قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ**). [خ٤٦/ م١١]

- وفي رواية لهما: (**دَخَلَ الجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ**). [خ٦٩٥٦].

**ژ تەلحەیێ كورێ عوبەیدوللایی** (رضي الله عنه) **گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ** (ﷺ) **ژ خەلكێ نەجدێ بوو و یێ سەر ڤژ بوو، مە گوە ل دەنگێ وی هەبوو، بەلێ ئەم تێ نەدگەهشتین كا چ دگۆت، حەتا نێزیكی پێغەمبەرێ خودێ بووی** (ﷺ) **مە زانی یێ پرسیارا ئیسلامێ دكەت، پێغەمبەرێ خودێ** (ﷺ) **گۆت: (د شەڤ‌ەك و رۆژەكاندا پێنج نڤێژن). گۆت: ژ بلی ڤان ل سەر من هەنە؟ گۆت: (نە، ژ بلی تو سونەتان بكەی). پێغەمبەرێ خودێ** (ﷺ) **گۆت: (و رۆژیگرتنا هەیڤا رەمەزانێیە). گۆت: ژ بلی ڤێ ل سەر من هەیە؟ گۆت: (نە، ژ بلی تو رۆژییێت سونەت بگری). گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ** (ﷺ) **بۆ بەحسێ زەكاتێ كر. گۆت: ژ بلی ڤێ ل سەر من هەیە؟ گۆت: (نە، ژ بلی تو سەدەقەیان بدەی). زەلام چۆ دگۆت: ئەز ب خودێ كەمە نە ئەز ڤان ژێ كێم دكەم و نە ل سەر زێدە دكەم. پێغەمبەرێ خودێ** (ﷺ) **گۆت: (ب راستی سەرفەراز بوو ئەگەر راست بێژیت).**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: (چۆ بەحەشتێ ئەگەر راست بێژیت).**

## ٢٣ . باب الدين يسر

## بابەت: دین یێ ب ساناهییە.

٦٢ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ**).

[خ٣٩].

**و ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دین یێ ب ساناهییە و كەس نینە توندوتیژییێ د دینیدا بكەت و خۆ ب سەر دینی بێخیت، و ئەگەر دین ب سەر وێ نەكەڤیت دورستیخواز بن بێ كێمكرن و بێ زێدەكرن و خۆ راگرن و بمینن و د كاروبارێت خۆدا نافنجیخواز بن و ئەگەر هوین نەشیان كاری ب رەنگێ پێدڤی بكەن دویر نەكەڤن و نێزیكی كاری بن، و بلا دلێ هەوە ب خێرا كاری خۆش بیت دا بگەهنە خێرێ، هاریكارییێ ژ دەركەفتنا سپێدێ و ئێڤاری و پشكەكێ ژ دویماهییا شەڤێ بخوازن)[1].**

٦٣ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أَمَرَهُمْ، أَمَرَهُمْ مِنَ الأَعْمَالِ بِمَا يُطِيقُونَ، قَالُوا: إِنَّا لَسْنَا كَهَيْئَتِكَ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ اللهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَيَغْضَبُ حَتَّى يُعْرَفَ الغَضَبُ فِي وَجْهِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: (**إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللهِ أَنَا**). [خ٢٠].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ فەرمانا وان كربا، فەرمانا وان ب وان كاران دكر بشێن بكەن، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ ئەم نە وەكی تەینە بێ گۆمان خودێ گونەهێت تە یێت پێش و پاش یێت ژێ برین؟ تۆرە دبوو هەتا تۆرەبون ل سەروچاڤێت وی دیار دبوو پاشی دگۆت: (ب راستی خودێ ترستر و خودێ ناستر ژ هەوە ئەزم).**

٦٤ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ**). [حم٥٨٦٦].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ حەز دكەت دەستویرییێت وی بهێنە وەرگرتن كا چاوا نەڤێت نەگوهدارییا وی بهێتە كرن).**

٦٥ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ**). [حب٣٥٤/مخ١٢/٣٠٤]

* إسناده صحيح.

---

[1] **ئانكو: دا بگەهنە خێرێ بەردەوامییێ بدەنە كار و كریارێت خۆ.**

**ژ ئیبن عومەری (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ حەز دكەت دەستویرییێت وی بهێنە وەرگرتن، كا چاوا دڤێت فەرمانێت وی بهێنە وەرگرتن).**

٦٦ - عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ: خَرَجْتُ ذَاتَ يَوْمٍ لِحَاجَةٍ، فَإِذَا أَنَا بِالنَّبِيِّ (ﷺ) يَمْشِي بَيْنَ يَدَيَّ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَانْطَلَقْنَا نَمْشِي جَمِيعاً، فَإِذَا نَحْنُ بَيْنَ أَيْدِينَا بِرَجُلٍ يُصَلِّي، يُكْثِرُ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَتُرَاهُ يُرَائِي)** ؟ فَقُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَتَرَكَ يَدِي مِنْ يَدِهِ، ثُمَّ جَمَعَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَجَعَلَ يُصَوِّبُهُمَا وَيَرْفَعُهُمَا وَيَقُولُ: **(عَلَيْكُمْ هَدْياً قَاصِداً، عَلَيْكُمْ هَدْياً قَاصِداً، عَلَيْكُمْ هَدْياً قَاصِداً، فَإِنَّهُ مَنْ يُشَادَّ هَذَا الدِّينَ يَغْلِبْهُ)**. [حم٢٢٩٦٣].

* إسناده صحيح.

**ژ بورەیدەیێ ئەسلەمی (ﷺ) گۆت: رۆژەكێ بۆ هەوجەییەكێ ئەز دەركەفتم، من هند دیت پێغەمبەر (ﷺ) یێ ل بەری من دچیت، ئینا دەستێ من گرت و ئەم پێكڤە چۆین، مە هند دیت زەلامەك یێ ل بەری مە نڤێژێ دكەت و گەلەك سوجدە و ركوع دبرن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەرێ تو دبینی ئەڤە رویمەتییێ دكەت)؟**

**من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن، ئینا دەستێ من هێلا پاشی دەستێت خۆ كۆم كرن و نزم كرن و بلند كرن و دگۆت: (رێكا نافنجی[1] بگرن، رێكا نافنجی بگرن رێكا نافنجی بگرن، چونكی ب راستی كەس نینە توندوتیژییێ د دینیدا بكەت و خۆ ب سەر دینی بێخیت، و ئەگەر دین ب سەر وێ نەكەڤیت).**

## ٢٤ . باب الدين النصيحة.

## بابەتێ: دین شیرەتكرنە.

٦٧ - **(ق)** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. [خ٥٧/ م٥٦].

---

[1] - بێ كێماسی و بێ زێدەیی.

**ژ جەریرێ کورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: من پەیمان دا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب کرنا نڤێژێ و دانا زەکاتێ و شیرەتێ بۆ هەمی موسلمانان.**

٦٨ - (م) عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**الدِّينُ النَّصِيحَةُ**) قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: (**لِلَّهِ، وَلِكِتَابِهِ، وَلِرَسُولِهِ، وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَعَامَّتِهِمْ**). [م٥٥].

**ژ تەمیمێ کورێ ئەوسێ داری (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دین شیرەتە)، مە گۆت: بۆ کێ؟ گۆت: (بۆ خودێ[1] و قورئانا وی[2] و پێغەمبەرێ وی[3] و میرێت موسلمانان[4] و تەڤایا وان)[5].**

٢٥ . باب المسلم والمهاجر:

**بابەتێ: موسلمانی و مشەختی.**

٦٩ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللهُ عَنْهُ**). [خ١٠].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (موسلمان ئەوە یێ موسلمان ژ ئەزمان و دەستێ وی ب سلامەت بن، و مشەخت ئەوە یێ ژ تشتێ خودێ پاشڤەلێدان ژێ کری مشەخت ببیت).**

---

(١) - ب دورستی باوەرییێ پێ بینن کو یێ بێ شریك و بێ هەڤالە و هەژی هەمی باشناڤ و سالۆخەتێت بلندە و دڤێت پەرستن بۆ وی ب تنێ بیت.

(٢) - کو یا ژ دەڤ خودێ هاتی و رێز و رویمەتییا هەژی بدەنێ ژ خواندن و ژ بەرکرن و کارپێکرنێ.

(٣) - باوەرییا دورست پێ هەبیت کو دویماهی پێغەمبەرە و پێگرییا فەرمان و پاشڤەلێدانێت وی ب دورستی بهێتە کرن و حەژێکرن و گوهدارییا هەژی بۆ هەبیت.

(٤) - گوهدارییا وان ل سەر خێرێ بهێتە کرن و هاریکارییا وان بۆ باشییێ بهێتە کرن و جیهاد د گەل وان بهێتە کرن.

(٥) - بەرێ وان بۆ خێرێ و باشییێ بهێتە لێدان، و بەرێ وان ژ خرابییێ بهێتە وەرگێران.

٧٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى دِمَائِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ). [ت٢٦٢٧/ ن٥٠١٠].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (موسلمان ئەوە یێ موسلمان ژ ئەزمان و دەستێ وی ب سلامەتی بن، و باوەریدار ئەوە یێ خەلك ژ خوین و مالێ خۆ ژێ دئێمن بن).**

٧١ - عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ، وَالْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ السُّوءَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَبْدٌ لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ). [حم١٢٥٦١].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (باوەریدار ئەوە خەلك ژێ د ئێمن و پشتراست بن و موسلمان ئەوە یێ موسلمان ژ ئەزمان و دەستێ وی ب سلامەتی بن، و مشەخت ئەوە یێ ژ تشتێ گونەهـ مشەخت ببیت، و ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا بەندەیەك ناچیتە بەحەشتێ یێ جیرانێ وی ژ خرابی و خرابكارییا وی ئێمن نەبیت).**

## ٢٦ . باب: قل امنت بالله

## بابەتێ: بێژە من باوەری ب خودێ ئینا

٧٢ - (م) عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ الثَّقَفِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! قُلْ لِي فِي الإِسْلاَمِ قَوْلاً لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَداً بَعْدَكَ، قَالَ: (قُلْ: آمَنْتُ بِاللهِ فَاسْتَقِمْ). [م٣٨]. [وانظر: ٢٢٤٢].

**ژ سوفیانێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بۆ من ئاخفتنەكێ د ئیسلامێدا بێژە ئەز پرسیارا وێ ژ كەسێ دی ژ بلی تە نەكەم. گۆت: بێژە: (من ب دورستی باوەری ب ئێكینییا خودێ ئینا پاشی ل سەر ڤێ خۆ رابگرە و و بەردەوامبە).**

## ٢٧ . باب: ما يحب لنفسه.

## بابەتێ: یا بۆ خۆ دڤێت

٧٣ - (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ). [خ١٣/ م٤٥].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (کەس ژ هەوە ب دورستی باوەرییێ نائینیت هەتا وی خێر بۆ برایێ خۆ بڤێت کا چەوا بۆ خۆ دڤێت).**

٧٤ - وعَنْه، عَن النَّبِيّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِلنَّاسِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ، وَحَتَّى يُحِبَّ المَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ عزّ وجل). [حم١٣٨٧٥].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ وی ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (کەس ژ هەوە ب دورستی باوەرییێ نائینیت هەتا وی خێر بۆ برایێ خۆ بڤێت کا چاوا بۆ خۆ دڤێت و هەتا حەز موسلمانی بکەت و بۆ خودێ حەژێ بکەت).**

٧٥ - وعَنْه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَبْلُغُ العَبْدُ حَقِيْقَةَ الإِيْمَانِ، حَتَّى يُحِبَّ للنَّاسِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ مِنَ الخَيْرِ). [حب(٢٣٥) مخ(٢٥٢٥/٧)].

**و ژ وی ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چو بەندە ناگەهنە راستیيا باوەرییێ هەتا وی خێر بۆ خەلکی بڤێت کا چەوا بۆ خۆ دڤێت).**

## ٢٨ . باب: المنافقون وصفاتهم.

## بابەتێ: دوروی و سالۆخەتێت وان.

٧٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (آيَةُ المُنَافِقِ ثَلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ). [خ٣٣/ م٥٩].

- وزاد في رواية لمسلم: (وإِن صامَ وصَلَّى، وزَعَمَ أَنَّهُ مُسْلِمٌ).

ژ ئەبی هورەیرە خودێ ژێ رازی بیت گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نیشانا دوروی سێنە، ئەگەر ئاخفت درەو كر، و ئەگەر ژڤان دا ب جھ نەئینا، و ئەگەر باوەری پێ هاتە ئینان خیانەت كر).**

- و د ڤەگێرەكا موسلمیدا زێدە هاتییە: **(خۆ ئەگەر رۆژییان بگریت و نڤێژان بكەت و خۆ موسلمان دانیت).**

٧٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقاً خَالِصاً، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ). [خ٣٤/ م٥٨].

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمرێ كورێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چار تشتن هەر كەسێ ئەو تێدا بن ( ئانكو ل دەڤ هەبن)، ئەو دوروییەكێ تمامە و هەر كەسێ پشكەك ژ وان تێدا بیت، وی پشكەكا دورویاتییێ یا تێدا هەتا بهێلیت: ئەگەر باوەری پێ هاتە ئینان خیانەت كر، ئەگەر ئاخفت درەو كر، و ئەگەر پەیمان دا غەدرە كر، و ئەگەر د هەڤرك چۆ سەرداچۆ).**

٧٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ خَامَةِ الزَّرْعِ، يَفِيءُ وَرَقُهُ، مِنْ حَيْثُ أَتَتْهَا الرِّيحُ تُكَفِّئُهَا، فَإِذَا سَكَنَتِ اعْتَدَلَتْ، وَكَذَلِكَ الْمُؤْمِنُ يُكَفَّأُ بِالْبَلَاءِ. وَمَثَلُ الكَافِرِ كَمَثَلِ الأَرْزَةِ، صَمَّاءُ مُعْتَدِلَةٌ، حَتَّى يَقْصِمَهَا اللهُ إِذَا شَاءَ).

[خ٧٤٦٦ (٥٦٤٤)/ م٢٨٠٩].

- ولفظ مسلم: (مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الزَّرْعِ، لا تَزَالُ الرِّيحُ تُمِيلُهُ، ولا يَزَالُ الْمُؤْمِنُ يُصيبُهُ الْبَلاءُ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ شَجَرَةِ الأَرْزِ، لا تَهْتَزُّ حَتَّى تَسْتَحْصِدَ).

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(مەتەلا باوەریداری وەكی شینكاتییا دەستپێكێیە هەر جهێ با بگەهیتێ دێ خوار كەت[1] ڤێجا ئەگەر رابوو راست**

---

[1] ئانكو چەوا شینكاتی دەستپێكێ چەند رەوش د سەررا دبۆرن بەلێ ئەڤە بۆ هندێیە دویماهییێ دا باش بگەهیت هۆسا ئەڤ رەوشە د سەر باوەریداریرا ژی دبۆرن دا بگەهیت.

**بووڤە بەلا وی خوار دکەن[1] و مەتەلا گاوری وەکی دارا کاژێیە یا رەقە و راوەستایە حەتا خودێ دشکێنیت ئەگەر ڤیا).**

- و د بێژەیا موسلمیدا: **(مەتەلا باوەریداری وەکی شینکاتیێیە بەردەوام با (لێ ددەت) خوار دکەت (بەلێ رادبیتەڤە) و هۆسا بەردەوام بەلا و نەخۆشی دگەهنە باوەریداری، و مەتەلا دوروی وەکی دارا کاژێیە یا شەق راوەستایە و ناهژیێت هەتا دهێتە برین).**

٧٩ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ؛ تَعِيرُ إِلَى هَذِهِ مَرَّةً، وَإِلَى هَذِهِ مَرَّةً). [م٢٧٨٤].

[وانظر: ٣١٨٨ في كون الثناء على السلطان من النفاق. ٣٩١٢ في النفاق والكفر].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (مەتەلا دوروی مەتەلا کاڤرێ حەیرییە د ناڤبەرا دو پەزاندا (نوزانیت یا کیژکێیە) ب حەیریڤە جار بەرێ خۆ ددەتە ڤێ جار ددەتە یا دی).**

## ٢٩ . باب الخوف من النفاق.

## بابەتێ: ترس ژ دورویاتییێ

٨٠ - (خ) قَالَ إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ: مَا عَرَضْتُ قَوْلِي عَلَى عَمَلِي؛ إِلاَّ خَشِيتُ أَنْ أَكُونَ مُكَذِّباً.

وَقَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَدْرَكْتُ ثَلاَثِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ عَلَى نَفْسِهِ، مَا مِنْهُمْ أَحَدٌ يَقُولُ: إِنَّهُ عَلَى إِيمَانِ جِبْرِيلَ وَمِيكَائِيلَ.

وَيُذْكَرُ عَنِ الْحَسَنِ البصري: مَا خَافَهُ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ أَمِنَهُ إِلاَّ مُنَافِقٌ. [خ. الإيمان، باب ٣٦].

[وانظر: ٢٢٠٧ حديث حنظلة].

---

[1] ئانکو: نابیت باوەریدار هزر بکەت چونکی باوەریدارە نابیت نەخۆشی بگەهنێ، بەلکی چونکی باوەریدارە ئەو هەمی دەما یێ بەرئاتاف و بەلایە.

**ئیبراهیمێ تەمیمی دبێژیت: من ئاخفتنا خۆ و کریارا خۆ نە داینە بەرێك ئەگەر ئەز ژ خۆ نە ترسیابم ژ دوروییان بم.**

**و ئیبن ئەبی مەلیکە دبێژیت: ئەز یێ گەهشتیمە سیهان ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) هەمی ژ دوروییاتییێ ل سەر خۆ دترسیان و کەسێ ژ وان نەگۆتییە ئەز یێ ل سەر باوەرییا جبیریلی و میکائیلی.**

**و ژ حەسەنێ بەسری دهێتە ڤەگوهازتن: کەس ژ دوروییاتییێ ناترسیت باوەریدار نەبیت و کەس ژێ پشتراست نابیت دوروی نەبیت.**

٣٠. باب: البيعة.

**بابەتێ: پەیماندانێ (بەیعەتێ).**

٨١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: جَاءَتْ أُمَيْمَةُ بِنْتُ رُقَيْقَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تُبَايِعُهُ عَلَى الْإِسْلاَمِ، فَقَالَ: (**أُبَايِعُكِ عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكِي بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ تَسْرِقِي، وَلاَ تَزْنِي، وَلاَ تَقْتُلِي وَلَدَكِ، وَلاَ تَأْتِي بِبُهْتَانٍ تَفْتَرِينَهُ بَيْنَ يَدَيْكِ وَرِجْلَيْكِ، وَلاَ تَنُوحِي، وَلاَ تَبَرَّجِي تَبَرُّجَ الجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى**).

[حم٦٨٥٠].

* صحيح لغيره.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (رضي الله عنهما) گۆت: ئومەیمەیا کچا روقەیقایێ هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پەیمانێ ل سەر ئیسلامێ بدەتێ، ئینا گۆتێ: (ئەز پەیمانێ ژ تە وەردگرم تو چو تشتان بۆ خودێ نەکەیە هەڤپشك، و دزییێ نەکەی، و زینایێ نەکەی و بچویکێ خۆ نەکوژی و چو زارۆکان ژ بێ بەختی ب دویڤ زەلامێ خۆڤە نەنی، و پێکۆلتنێ ب دەنگێ بلند نەکەی و جوانییا خۆ ئاشکەرا نەکەی وەکی ئاشکەراکرنا سەر وەختێ نەزانینا بەرێ).**

٨٢ – وعَنْه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ لاَ يُصَافِحُ النِّسَاءَ فِي الْبَيْعَةِ. [حم٦٩٩٨].

* صحيح، وإسناده حسن.

**و ژ وی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەدچۆ دەستێ ژنان د وەرگرتنا پەیمانێدا.**

٨٣ - عن عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: مَا مَسِسْتُ فَرْجِي بِيَمِينِي مُنْذُ بَايَعْتُ بِهَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ). [حم١٩٩٤٣]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

[وانظر: ٣١٩٠ حديث ابن عمر.

٣٤٠٥ حديث عوف بن مالك.

٢٧٣١ من بايع إمامه لدنيا].

**و ژ عیمرانێ كوڕێ حوسەینی (رضي الله عنه) گۆت: ئەوە من پەیمان دایە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من دەستێ خۆ یێ راستێ نەكرییە شەرمگەها خۆ.**

## ٣١ . باب الثبات على الدين.

## بابەتێ: خۆراگرتن ل سەر دینی.

٨٤ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالْقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ**). [ت٢٢٦٠].

* صحيح.

[وانظر: ١١٤، ١١٥].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دەمەك دێ ب سەر خەلكیدا هێت یێ ژ وان بێهنا خۆ ل سەر دینێ خۆ فرەه بكەت[1] وەكی وییە یێ پەل د دەستێ خۆدا گرتی)[2].**

**[1] ئانكو خۆراگر بیت.**

**[2] ئانكو دێ یا ب زەحمەت بیت و نەخۆشیيا بینیت.**

## ٣٢ . باب: احفظ الله يحفظك.

### بابەتێ: فەرمانێت خودێ بپارێزە خودێ دێ تە پارێزیت.

٨٥ – عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَوْماً فَقَالَ: (**يَا غُلاَمُ، إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ، احْفَظِ اللهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الْأَقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ**). [ت٢٥١٦]

- زاد في رواية لأحمد: (**تَعَرَّفْ إِلَيْهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ... وَاعْلَمْ أَنَّ فِي الصَّبْرِ عَلَى مَا تَكْرَهُ خَيْراً كَثِيراً، وَأَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ، وَأَنَّ الفَرَجَ مَعَ الكَرْبِ، وَأَنَّ مَعَ العُسْرِ يُسْراً**). [حم٢٨٠١]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەبباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەز رۆژەكێ ل پشت پێغەمبەری بووم (ﷺ) گۆتە من: (هەی لاوۆ ئەز دێ هندەك پەیڤان نیشا تە دەم: تخویب و فەرمانێت خودێ بپارێزە، خودێ دێ تە (د دنیا و ئاخرەتێدا) پارێزیت، فەرمان و تخویبێت خودێ بپارێزە دێ خودێ ل بەرامبەر خۆ بینی[1] و ئەگەر تە ڤیا تشتەكی بخوازی، ژ خودێ ب تنێ بخوازە، و ئەگەر تە ڤیا هاریكارییێ[2] بخوازی ژ خودێ ب تنێ بخوازە، و بزانە ئەگەر مرۆڤ هەمی كۆم ببن دا مفایەكی ل تە بكەن، نەشێن چو مفایی بگەهیننە تە، ئەو نەبیت یا خودێ بۆ تە نڤیسی، و ئەگەر هەمی كۆم ببن دا زیانەكێ بگەهیننە تە، زیانا تە ناكەن ب وێ نەبیت یا خودێ بۆ تە نڤیسی، قەلەم هاتنە هەلگرتن و پەڕ هشك بوون)[3].**

---

[1] ئانكو: دێ پارێزیا وی بینی هەرجهێ تو لێ بی و زوی دێ ل تانا تە هێت.

[2] ئانكو: دێ پارێزیا وی بینی هەرجهێ تو لێ بی و زوی دێ ل تانا تە هێت.

[3] ئانكو: قەدەرا خودێ ب ڤی رەنگییە و گوهۆرین بۆ قەدەرا خودێ نینە و تشتێ د دەپێ پاراستیدا هاتییە نڤیسین دێ ئەو بیت و ژێ ناچیت.

- و د ڤەگێرا ئیمام ئەحمەدیدا زێدە کرییە: **(وەل خۆ بکە خودێ د بەرفرەهییێدا تە ب تاعەت و پەرستنان و دوعایان بنیاسیت، ئەو د بەرتەنگاڤییێدا دێ هاریکارییا تە کەت و بزانە بێهنفرەهی ل سەر ئەو تشتێ تە پێ نەخۆش خێرەکا مەز یا تێدا، و بزانە سەرکەڤتن یا د گەل بێنفرەهییێ و ب راستی هەر دلئێشی و خەمەکێ رابوونەك و دویماهییەك یا هەی، و ب راستی هەر تەنگاڤییەکێ بەرفرەهییەك ل دویڤە).**

٣٣ . باب عظم اجر الدعوة الى الله.

**بابەتێ: مەزناتییا خێرا گازییا بۆ خودێ.**

٨٦ - عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(وَاللهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِهُدَاكَ رَجُلاً وَاحِداً، خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ).** [د٣٦٦١].

* صحيح.

ژ ئەبی سەهلێ کوڕێ سەعدی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر خودێ ئێکی ب راستەرێکرنا تە (ل سەر دەستێ تە) راستەرێ بکەت بۆ تە ژ حێشترێت سۆر چێترە).**

٣٤ . باب زيادة الإيمان ونقصانه.

**بابەتێ: زێدەبوونا باوەرییێ و کێمبوونا وێ.**

٨٧ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ الإِيْمَانَ لَيَخْلَقُ فِي جَوْفِ أَحَدِكُمْ كَمَا يَخْلَقُ الثَّوْبُ الخَلَقُ، فَاسْأَلوا اللهَ أَنْ يُجَدِّدَ الإِيْمَانَ فِي قُلُوبِكُمْ).** [ك٥].

* قال الذهبي: رواته ثقات.

[وانظر: ٣٣٤٣].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری کوڕێ عاسی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی باوەری د دلێ ئێك ژ هەوەدا کەڤن دبیت هەر وەکی جلك کەڤن دبیت، ڤێجا دوعا ژ خودێ بکەن باوەرییێ د دلێت هەوەدا نوی کەت).**

## ٣٥ : باب افتراق هذه الأمة.

## بابەتێ: ژێکڤەبوونا ڤێ ئوممەتێ.

٨٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (افْتَرَقَتِ اليَهُودُ عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفَرَّقَتْ النَّصَارَى عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً). [د٤٥٩٦/ ت٢٦٤٠/ جه٣٩٩١].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جوهی ژێکڤەبوون بوونە حەفتێ و ئێك یان حەفتێ و دو پشك، و فەلە ژێکڤەبوون و بوونە حەفتێ و ئێك یان حەفتێ و دو پشك، و ئوممەتا من دێ ژێکڤەبن بۆ حەفتێ و سێ پشکان).**

٨٩ – وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَتَتَّبِعُنَّ سُنَّةَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، بَاعاً بِبَاعٍ، وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ، وَشِبْراً بِشِبْرٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ، لَدَخَلْتُمْ فِيهِ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! اليَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: (فَمَنْ، إِذاً)؟. [جه٣٩٩٤].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی هوین دێ ل دویف رێکا یێت بەری خۆ چن ڤایمە دویف ڤایمێ و گەز دویف گەزێ و بهۆست دویف بهۆستێ هەتا ئەگەر ئەو بچنە د کونا بزنمشکەکیڤە دێ د دویڤرا چنە تێڤە)، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ جوهی و فەلەیان؟ گۆت: (پا کی)؟.**

٩٠ – عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (افْتَرَقَتِ اليَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَوَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ، وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَإِحْدَى وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَوَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ! لَتَفْتَرِقَنَّ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ، وَثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ) قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ هُمْ؟ قَالَ: (الجَمَاعَةُ). [جه٣٩٩٢].

* صحيح.

**ژ عەوفێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جوهی ژێكڤەبوون بۆ حەفتێ و ئێك پشكان ئێك یا د بەحەشتێدا و حەفتێ یێت د ئاگریدا و فەلە ژێكڤەبوون بۆ حەفتێ و دو پشكان و حەفتێ و ئێك یێت د ئاگریدا و ئێك یا د بەحەشتێدا و ئەز ب وی كەسە یێ جانێ موحەممەدی د دەستێ ویدا ئوممەتا من دێ ژێكڤەبن بۆ حەفتێ و سێ پشكان پشكەك تنێ د بەحەشتێدایە و حەفتێ و دو د ئاگریدانە)، هاتە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو كینە؟ گۆت: (كۆمە)**[(١)].

٣٦ ـ باب تجديد أمر الدين.

**بابەتێ: نویكرنا كارێ دینی.**

٩١ – عَنْ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ فِيمَا أَعْلَمُ ـ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا**). [د٤٢٩١].

* صحيح.

**ژ ئەبی عەلقەمە ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) یا ئەز دزانم ژ پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ سەرێ هەر سەد سالان وی بۆ ڤێ ئوممەتێ دهنێریت دینێ وێ بۆ ڤەژینیت و نوی كەت)**[(٢)].

٩٢ – عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِأَقْوَامٍ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ**). [حم٢٠٤٥٤].

* صحيح لغيره.

---

(١) پێنج بۆچۆن یێت هەین كا مەبەست ب وێ كۆمێ كییە و ئەو كینە و چەندن و یا هێژاتر ئەوە ئەڤ كۆمە د دەستنیشانكری نینن و وەلاتێت وان ژی د دیاركری نینن، بەلێ رێكا راست دگرن و بەرنادەن و ل دویف رێكا راست دچن چەند نەخۆشی ژی ب سەری بهێن و پشتا حەقییێ ب چو رەنگان بەرنادەن، هیڤییا من ئەوە ئەم ژ وان بین.

(٢) مەبەست ب نویكرنێ ئەوە زڤراندن و ئاشكراكرنا رەونەقا دینی و جوانی و سپەهیاتییا وی و ساخكرنا تشتێ هاتییە بەرزەكرن و نەمایی و بەلاڤكرنا دینێ راست و دورست د ناڤ خەلكیدا، ئانكو: هشیاركرنا خەلكی د راستا ئیسلامێدا.

**ژ ئەبی بەكرەتە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ پاك و بلند پشتەڤانییا ڤی دینی ب هندە كەسان دكەت وان چو پشك و بار (ژ خێرێ) نینن).**

٣٧ . باب نقض عرى الدين.

**بابەتێ: نەمانا فەرمانێت دینی.**

٩٣ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لَتُنْقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، فَكُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، وَأَوَّلُهُنَّ نَقْضاً الحُكْمُ، وَآخِرُهُنَّ الصَّلَاةُ).

[حم٢٢١٦٠].

* إسناده جيد.

**ژ ئەبی ئومامەیێ باهلی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی فەرمانێت ئیسلامێ (چمبلێت) ئیسلامێ ئێك ئێكە و دویڤێك نامینن هەر گاڤا ئێك نەما خەلكی خۆ ب یا دویڤڕا گرت، و یا ئێكێ نەمینیت حوكمە و یا دویماهییێ نڤێژە).**

٣٨ . باب الوحي

**بابەتێ: وەحییێ.**

[انظر: في بدء الوحي: ٣٥٧٦.

وفي نزول الوحي ومدة ذلك: ٤٢٣ - ٤٢٦.

وفي ثقل الوحي: ٦٢٧].

٣٩ . باب: إحالات

**بابەتێ: بەرڤەگوهازتن.**

[انظر: في التوكل: ٥٩٤، ٣٤٠٩.

وفي التمائم: ٢٩١٢].

العقيدة

# بیروباوەر

الكتاب الثاني

الايمان بيوم الآخرة

# كتێبا دووێ

# باوەری ب رۆژا قیامەتێ

الفصل الاول: اشراط الساعة

## پشكا ئێكێ: نیشانێت قیامەتێ

١ . باب اجمال اشراط الساعة.

## بابەتێ: نیشانێت قیامەتێ ب گشتی.

[انظر: بشان الايمان بيوم الآخر: ٤٩]. [ **ل دۆر باوەرییا ب رۆژا دویماهییێ بەرێ خۆ بدە: ٤٩].**

٩٤ – (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لاَ يُحَدِّثُكُمْ بِهِ أَحَدٌ غَيْرِي: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَكْثُرَ الجَهْلُ، ويَكْثُرَ الزِّنَى، وَيَكْثُرَ شُرْبُ الخَمْرِ، وَيَقِلَّ الرِّجالُ، ويَكْثُرَ النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً القَيِّمُ الوَاحِدُ**).

[خ٥٢٣١ (٨٠)/ م٢٦٧١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز دێ بۆ هەوە ئاخفتنەكێ بێژم كەس پشتی من بۆ هەوە وێ ئاخفتنێ نەبێژیت، من گوه ل پێغبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ژ نیشانێت قیامەتێ زانین كێم ببیت و نەزانین بەلاڤ ببیت و ڤەخوارنا مەیێ زێدە دبیت، و زنا ئاشكەرا ببیت و ژن زێدە ببن و زەلام كێم ببن هەتا وەلێ دهێت زەلامەك ب تنێ ببیتە سەرپەرشتێ پێنجی ژنان).**

٩٥ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ العِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الهَرْجُ. وَهُوَ القَتْلُ القَتْلُ. حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ فَيَفِيضُ**). [خ١٠٣٦ (٨٥)/ م١٥٧م/العلم ١١].

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ گۆت: **(قیامەت رانابیت هەتا زانین رادبیت و پیڤەلەرز زێدە دبن و دەم نێزیکی ئێك دبیت و بەلا پەیدا دبن و کوشتن زێدە دبیت و هەتا مال د ناڤ هەوەدا زێدە دبیت ڤێجا سەردا دچیت).**

٩٦ - (خ) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ، فَقَالَ: (اعْدُدْ سِتاً بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ: مَوْتِي، ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ المَقْدِسِ، ثُمَّ مُوْتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الغَنَمِ، ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ المَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطاً، ثُمَّ فِتْنَةٌ لاَ يَبْقَى بَيْتٌ مِنَ العَرَبِ إِلاَّ دَخَلَتْهُ، ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وبَيْنَ بَنِي الأَصْفَرِ، فَيَغْدِرُونَ، فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غايَةً، تَحْتَ كُلِّ غايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفاً). [خ٣١٧٦].

ژ عەوفێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: غەزوا تەبووکێ ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو د گومبەتەکا پیستیڤە بوو ئینا گۆت: **(شەش تشتان نیشانێت بەری قیامەتێ بهەژمێرە: مرنا من، پاشی ڤەکرنا قودسێ، پاشی دەردەکێ کوژەك (وەبا) دێ کەڤیتە لەشێ هەوە مرینیت وەکی مرنا پەزی د جهێ خۆدا و دەملدەست، پاشی زێدەبوونا مالی هەتا هندێ، سەد دیناران دێ دەنە زەلامی دێ هەر مینیت نەرازی چونکی کێم دبینیت، پاشی بەلایەك چو مالێت عەربان نامینن ئەگەر نەچیتە تێدا پاشی پێکهاتنەك د ناڤبەرا هەوە و رۆمییاندا دێ هەبیت ئەو دێ پێکهاتنێ شکێنن ڤێجا دێ د بن هەشتێ ئالایانڤە هێنە هەوە هەر ئالایەکی دوازدە هزار کەس پێت د بنڤە).**

٩٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ سِتاً: الدَّجَّالَ، وَالدُّخَانَ، وَدَابَّةَ الأَرْضِ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَأَمْرَ العَامَّةِ، وَخُوَيْصَّةَ أَحَدِكُمْ). [م٢٩٤٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(لەزێ ل کاران بکەن بەری شەش نیشانێت قیامەتێ بهێن ڤێجا هوین مژویل ببن یان نەگەهن تۆبە بکەن، هاتنا دەجالی و**

**دەرکەفتنا دویکێلەکا مەزن و دەرکەفتنا گیانەوەرێ د گەل خەلکی دئاخڤیت و هەلاتنا رۆژێ ژ رۆژئاڤا و رابوونا قیامەتێ و تایبەتمەندییا ئێك ژ هەوە)**[1].

٩٨ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَدِيثاً لَمْ أَنْسَهُ بَعْدُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ أَوَّلَ الآيَاتِ خُرُوجاً، طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ عَلَى النَّاسِ ضُحًى، وأَيُّهُمَا مَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا، فَالأُخْرَى عَلَى إِثْرِهَا قَرِيباً**) [م٢٩٤١].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (رضي الله عنهما) گۆت: من فەرموودەیەك ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ بەر کر، هێژ من ژ بیر نەکرییە، من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی نیشانا ئێکێ یا قیامەتێ**[2] **هەلاتنا رۆژێیە ژ رۆژئاڤا و دەرکەفتنا گیانەوەرێ عەردی ل تێشتەگەهێ د گەل مرۆڤان باخڤیت و هەچییا بەری هەڤالا خۆ هات یا دی نێزیك دێ دویڤرا هێت).**

٩٩ - (م) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ الغِفَارِيِّ قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ، فَقَالَ: (**مَا تَذَاكَرُونَ**) ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، قَالَ: (**إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ**)، فَذَكَرَ الدُّخَانَ، وَالدَّجَّالَ، وَالدَّابَّةَ، وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ (ﷺ)، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَثَلاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ العَرَبِ. وَآخِرُ ذلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ اليَمَنِ، تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ. [م٢٩٠١].

**ژ حوزەیفەیێ کورێ ئەسیدێ غیفاری گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ب بەر مەڤە هات و ئەم دیتین ئەم د ناڤخۆدا دئاخڤین ئینا گۆت: هوین چ د ناڤخۆدا دبێژن؟ گۆتن ئەم بەحسێ قیامەتێ دکەین، گۆت: (ب راستی ئەو نارابیت هەتا هوین بەری وێ دەه نیشانان نەبینن)، و گۆت: ئاشکرابوونا دویکێلی و دەرکەفتنا گیانەوەرێ عەردی و هەلاتنا رۆژێ ل رۆژئاڤا و هاتنەخوارا عیسایێ کورێ مەریەمێ (ﷺ) و هاتنا یەئجووج و مەئجووجان و**

---

**(١) ئانکو: مرنا هەوە.**

**(٢) مەبەست نیشانێت مەزنن یێت پێشیيا قیامەتێ ب دەمەکێ کێم دهێن.**

**هاتنا سێ عەرددداچۆنان د عەردیداچۆنان عەرددداچۆنەك د عەردیداچۆنەك ل رۆژهەلاتی و عەرددداچۆنەك د عەردیداچۆنەك ل رۆژئاڤا و عەرددداچۆنەك د عەردیداچۆنەك ل گزیرتا عەرەبی و دویماهییا ڤان ئاگرەك دێ ژ یەمەنێ دەركەڤیت خەلكی بۆ كۆمگەها وان كۆم كەت.**

١٠٠ – عَنْ عِلْبَاءَ السُّلَمِيِّ قَالَ: قال رَسُولَ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى حُثَالَةِ النَّاسِ)**. [حم١٦٠٧١].

* إسناده صحيح.

**ژ عیلبائێ سەلەمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دبێژیت: (رۆژا قیامەتێ نارابیت ل سەر سەرێ بێخێرێت خەلكی نەبیت).**

١٠١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجاً طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ ضُحًى، فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالْأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا)**.

ثُمَّ قَالَ عَبْدُ اللهِ -وَكَانَ يَقْرَأُ الكُتُبَ-: وَأَظُنُّ أُولاَهَا خُرُوجاً طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا؛ وَذَلِكَ أَنَّهَا كُلَّمَا غَرَبَتْ أَتَتْ تَحْتَ العَرْشِ فَسَجَدَتْ، وَاسْتَأْذَنَتْ فِي الرُّجُوعِ، فَأُذِنَ لَهَا فِي الرُّجُوعِ، حَتَّى إِذَا بَدَا لِلَّهِ أَنْ تَطْلُعَ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَعَلَتْ كَمَا كَانَتْ تَفْعَلُ، أَتَتْ تَحْتَ العَرْشِ فَسَجَدَتْ، فَاسْتَأْذَنَتْ فِي الرُّجُوعِ، فَلَمْ يُرَدَّ عَلَيْهَا شَيْءٌ، ثُمَّ تَسْتَأْذِنُ فِي الرُّجُوعِ، فَلاَ يُرَدُّ عَلَيْهَا شَيْءٌ، ثُمَّ تَسْتَأْذِنُ، فَلاَ يُرَدُّ عَلَيْهَا شَيْءٌ، حَتَّى إِذَا ذَهَبَ مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَذْهَبَ، وَعَرَفَتْ أَنَّهُ إِنْ أُذِنَ لَهَا فِي الرُّجُوعِ لَمْ تُدْرِكِ المَشْرِقَ، قَالَتْ: رَبِّ مَا أَبْعَدَ المَشْرِقَ، مَنْ لِي بِالنَّاسِ، حَتَّى إِذَا صَارَ الْأُفُقُ كَأَنَّهُ طَوْقٌ اسْتَأْذَنَتْ فِي الرُّجُوعِ، فَيُقَالُ لَهَا: مِنْ مَكَانِكِ فَاطْلُعِي، فَطَلَعَتْ عَلَى النَّاسِ مِنْ مَغْرِبِهَا. ثُمَّ تَلاَ عَبْدُ اللهِ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًاۗ﴾ [الأنعام:١٥٨]. [حم٦٨٨١].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (رضي الله عنه) گۆت: من فەرموودەیەك ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ بەر كر، هێژ من ژ بیر نەكرییە، من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (**ب راستی نیشانا ئێكێ یا قیامەتێ**[1] **دەركەفتنا رۆژێیە ژ رۆژئاڤایا وێ و دەركەفتنا گیانەوەرێ عەردی ل تێشتەگەهێ د گەل مرۆڤان باخڤیت و هەچییا بەری هەڤالا خۆ هات یا دی نێزیك دێ دویڤرا هێت**).

پاشی عەبدوللایی گۆت: و ـ وی كتێب دخواندن ـ ئەز هزر دكەم نیشانا ئێكێ دەردكەڤیت هەلاتنا رۆژێیە ژ رۆئاڤایا وێ و ئەو ژی هەر گاڤا ئاڤا دبیت دهێتە بن عەرشی و سوجدێ دبەت و دەستویرییێ ب زڤرینێ دخوازیت ڤێجا دەستویری دێ بۆ هێتە دان هەتا خودێ ڤیا ل رۆژئاڤایا خۆ دەركەڤیت، ئەو دێ هەر وێ كەت یا وێ دكر دێ هێت بن عەرشی و سوجدێ بەت و دەستویرییێ ب زڤرینێ خوازیت و بەرسڤا وێ ناهێتە دان پاشی جارەكا دی دەستویرییێ ب زڤرینێ خوازیت بەرسڤ بۆ ناهێتە دان پاشی جارەكا دی دەستویرییێ دخوازیت بەرسڤا وێ ناهێتە دان هەتا شەڤ هندی خودێ ڤیای دچیت و رۆژ دزانیت ئەگەر دەستویری ژی ب زڤرینێ دایێ ناگەهیتە رۆژهەلاتێ دێ بێژیت یا رەبی رۆژهەلات چەندا دویرە، كی دێ رۆناهییێ دەتە خەلكی؟. هەتا ل ئاسۆی بنەجه بووی دێ بێژی یا گرۆڤرە دەستویری ب زڤراندنێ خواست دێ بۆ هێتە گۆتن: ل جهێ خۆ (ل رۆژئاڤاییێ) دەركەڤە، دێ ل رۆژئاڤاییێ ل سەر خەلكی هەلێت پاشی عەبدوللایی ئەڤ ئایەتە خواند. ( يوم يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنْفَعُ نَفْساً إِيْمَانُهَا لَم تَكُنْ آمَنَتْ من قَبْلُ أو كَسَبَتْ فِي إِيْمَانِهَا خَيْراً)[2].

---

[1] مەبەست نیشانێت مەزنن یێت پێشیا قیامەتێ ب دەمەكێ كێم دهێن.

[2] رامانا ئایەتێ ب كورتی: ئەو ل هیڤییا هندەك نیشان و ئایەتێت خودایێ تەنە [یێت رۆژا قیامەتێ، و ژ نوی باوەرییێ بینن]. رۆژا نیشانێت قیامەتێ دئێن ئێدی باوەرئینانا كەسێ مفایی ناگەهینیتێ، ئەگەر بەری هنگی باوەری نەئینابیت، یان ژی باشی و قەنجی د باوەرییا خۆدا نەكربیت.

١٠٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُمْطَرَ النَّاسُ مَطَراً لاَ تُكِنُّ مِنْهُ بُيُوتُ المَدَرِ، وَلاَ تُكِنُّ مِنْهُ إِلاَّ بُيُوتُ الشَّعْرِ)**. [حم٧٥٦٤].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژا قیامەتێ نارابیت هەتا بارانەکا زێدە بۆ خەلکی نەهێت، خانییێت ئاخێ و پێت بەرا ڤێ بارانێ ناراگرن و دێ تێ چیت، و خانییێت ژ موی چێ کرین تێ ناچیت و دێ راگرن).**

١٠٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الآياتُ خرزٌ منظوماتٌ في سلكٍ يَقطَعُ السلكُ فيتبعُ بعضُها بعضًا)**[1]. [حم٧٠٤٠][ك٨٤٦١].

* إسناده ضعيف.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نیشانێت قیامەتێ وەکی مۆریکێت ڤەهاندینە ب بەندکەکیڤە ڤێجا ئەگەر بەندك قەتیا ئێك ل دویڤ ئێکێ دێ هێت).**

١٠٤ ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: **(لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَتَسَافَدُوا فِي الطَّرِيقِ تَسَافُدَ الْحَمِيرِ)** قُلْتُ إِنَّ ذَاكَ لَكَائِنٌ؟ قَالَ: **(نَعَمْ لَيَكُونَنَّ)**. [حب٦٧٦٧].

اسناده صحيح.

---

(١) **دانەری د مالپەرێ خۆدا ئەڤ فەرمووده هەر ب وێ هەژمارێ ئینایە:** ١٠٣ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (تَكْثُرُ الصَّوَاعِقُ عِنْدَ اقْتِرَابِ السَّاعَةِ حَتَّى يَأْتِيَ الرَّجُلُ القَوْمَ فَيَقُولَ: مَنْ صَعِقَ تِلْكُم الغَدَاةَ؟ فَيَقُولُونَ: صَعِقَ فُلَانٌ وَفُلَانٌ). [حم١١٦٢٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمێ رۆژا قیامەتێ نێزیك دبیت برویسی دێ زۆر بن، هەتا زەلام دێ هێتە دەڤ کەسوکارێت خۆ و دێ بێژیت: برویسیێ ئەڤرۆ سپێدێ ل کێ ژ هەوە دایە؟ دێ بێژن برویسیێ یا ل فلانی و فلانی دای).**

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(قیامەت نارابیت هەتا خەلك زنایێ پێشچاڤان ل سەر رێكان نەكەن بێ شەرم وەكی كەرا)** (عەبدوللایێ كورێ عەمری ب حێبەتیڤە گۆت) ئەڤە ژی دێ چێ بیت؟! گۆت: **(بەلێ بێ گۆمان دێ چێ بیت).**

١٠٥ - عَنْ خَارِجَةَ بْنِ الصَّلْتِ البُرْجُمِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ المسْجِدَ فَإِذا القَوْمُ رُكُوعٌ، فَرَكَعَ، فَمَرَّ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ وَصَلَ إلى الصَّفِ، فَلَمَّا فَرَغَ سَأَلْتُهُ عَنْ قَوْلِهِ: صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُه؟ فَقَالَ: إِنَّهُ كَانَ يَقُولُ: **(لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُتَّخَذَ المَسَاجِدُ طُرُقاً، وَحَتَّى يُسَلِّمَ الرَّجُلُ عَلى الرَّجُلِ بِالمَعْرِفَةِ، وَحَتَّى تَتَّجِرَ المَرْأَةُ وَزَوْجُهَا، وَحَتَّى تَغْلُو الخَيْلُ وَالنِّسَاءُ، ثُمَّ تَرْخُصُ فَلا تَغْلُو إِلى يَوْمِ القِيَامَةِ)**. عبد الله هو ابن مسعود. [ك٨٥٩٨]

* قال الذهبي: صحيح.

[وانظر: ١٠٦.

وانظر: ٣٦٠٣ بشأن النار التي تحشر الناس.

وانظر: ٣٢٧٩ بشأن قرب الساعة.

وانظر: ٣٤٠٢ بشأن ضياع الأمانة

وانظر: ١١٢٩ بشأن التباهي في المساجد].

**ژ خاریجەیێ كورێ صەلتی یێ بورجەمی، گۆت: ئەز د گەل عەبدوللایی چۆمە د مزگەفتێڤە خەلك د ركووعێدا بوون ئەو ژی چۆ ركووعێ زەلامەك بۆری سلاڤ كرە سەر، ئینا عەبدوللایی گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی راست گۆت، پاشی چۆ د ناڤ رێزێدا، ڤێجا دەمێ ب دویماهی هاتی من پرسیارا ژ گۆتنا وی خودێ و پێغەمبەرێ وی راست گۆت كر؟ ئینا گۆت: ب راستی پێغەمبەری (ﷺ) دگۆت: (قیامەت نارابیت هەتا مزگەفت نەبنە رێك خەلك تێرا بچن و بهێن، و هەتا مرۆڤ سلاڤێ ژ نیاسین دكەتە مرۆڤی، و هەتا ژن**

**بازرگانیێ د گەل زەلامێ خۆ دكەت، و هەتا هەسپ و ژن گران دبن پاشی دێ ئەرزان بن و گران نابنەڤە هەتا رۆژا قیامەتێ).**

٢ ـ باب قتال فئتين دعواهما واحدة وظهور الدجالين.

**بابەتێ: شەڕێ دو كۆمان گازییا وان ئێكە، و ئاشكرابوونا دەجالان.**

١٠٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَقْتَتِلَ فِئَتَانِ، فَيَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ، دَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ؛ وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، قَرِيباً مِن ثَلاَثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللهِ).**

[خ٣٦٠٩ (٨٥)/ م١٥٧م/الفتن ١٧ و٨٤].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا دو كۆمێت مەزن ب شەڕ دچن و كوشتنەكا مەزن د ناڤبەرا واندا چێ دبیت و ئارمانجا وان ئێكە، و قیامەت نارابیت هەتا نێزیكی سیە دەجالێت درەوین دەردكەڤن هەر ئێك ژ وان دبێژیت ئەز پێغەمبەرێ خودێمە).**

١٠٧ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ كَذَّابِينَ).** [م٢٩٢٣].

**ژ جابرێ كوڕێ سەمورەیی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) گۆت: (ب راستی بەری رۆژا قیامەتێ درەوین پێت هەین).**

١٠٨ – عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ، وَحَتَّى يَعْبُدُوا الأَوْثَانَ، وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي ثَلاَثُونَ كَذَّابُونَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ، لاَ نَبِيَّ بَعْدِي).** [ت٢٢١٩].

* حديث صحيح.

ژ سەوبانی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(قیامەت نارابیت هەتا هندە هۆزێت ئوممەتا من نەگەهنە موشركان و هەتا بوتان نەپەرێسن و ب راستی سیه درەوین دێ ژ ئوممەتا من هەبن هەر ئێك ژ وان دبێژیت ئەز پێغەمبەرم و ب راستی ئەز دویماهی پێغەمبەرم و چو پێغەمبەر پشتی من نینن).**

٣ ، باب: كثرة القتل.

**بابەتێ: زێدە كوشتنێ.**

١٠٩ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لاَ يَدْرِي القَاتِلُ فِي أَيِّ شَيْءٍ قَتَلَ؟ وَلاَ يَدْرِي المَقْتُولُ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ قُتِلَ)** ؟. [م٢٩٠٨].

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا دەمەك دێ ب سەر خەلكیدا هێت كوژەك نوزانیت سەرا چ كوشت و كوشتی ژی نوزانیت سەرا چ هاتە كوشتن).**

١١٠ - (م) وعَنْه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْهَرْجُ)** قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ؟ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(الْقَتْلُ. الْقَتْلُ)**. [م١٥٧م/ فتن١٨].

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(قیامەت نارابیت هەتا هەرج زۆر نەبیت، گۆتن: و هەرەج چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ گۆت: گوشتنە كوشتنە).**

٤ . باب: خليفة يقسم المال ولا يعده.

**بابەت: خەلیفەك دێ پارەی لێكڤەكەت و ناهەلگریت.**

١١١ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ خَلِيفَةٌ يَقْسِمُ الْمَالَ وَلاَ يَعُدُّهُ)**. [م٢٩١٣، ٢٩١٤].

**ژ ئەبی سەعید و جابرێ كورێ عەبدوللایی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: (د دویماهییا زەمانیدا خەلیفەك دێ پاران ل سەر هەژییان بەلاڤكەت و بێ هەژمار و ناهەلگریت).**

٥ . باب: منعت العراق درهمها.

**بابەتێ: عیراقێ دەرهەمێ خۆ ڤەگرت.**

١١٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنَعَتِ العِرَاقُ دِرْهَمَهَا وَقَفِيزَهَا، وَمَنَعَتِ الشَّامُ مُدْيَهَا وَدِينَارَهَا، وَمَنَعَتْ مِصْرُ إِرْدَبَّهَا وَدِينَارَهَا، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ، وَعُدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ). شَهِدَ عَلَى ذَلِكَ لَحْمُ أَبِي هُرَيْرَةَ وَدَمُهُ. [م٢٨٩٦].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر عیراقێ دیناری خۆ و قەفیزا[1] خۆ نەدا[2] و شامێ مودیا[3] خۆ و دیناری خۆ نەدا و مسرێ ئیردەبێ[4] خۆ و دیناری خۆ نەدا و هوین زڤرین وەكی جارا ئێكێ هەوە دەست پێ كری و هوین زڤرین وەكی جارا ئێكێ هەوە دەست پێ كری و هوین زڤرین وەكی جارا ئێكێ هەوە دەست پێ كری[5]) گۆشتێ ئەبو هورەیرە و خوینا وی شەهدەیی ل سەر ڤێ چەندێ دایە.**

٦ . باب: رجل يسوق الناس بعصاه.

**بابەتێ: زەلامەك خەلكی ب چویڤێ خۆ دهاژۆت.**

١١٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ، حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ، يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ). [خ٣٥١٧/ م٢٩١٠].

---

(١) نامویرەكێ پیڤانێیە.

(٢) یان موسلمان بوون و زێرەسەر نەدان یان هاتنە داگیركرن و داگیركەران نەهێلان بگەهنە هەوە.

(٣) نامویرەكێ پیڤانێیە.

(٤) نامویرەكێ پیڤانێیە.

(٥) ئانكو چاوا دەستپێكێ ئیسلام یا غەریب بوو هۆسا هوین زڤرین وەكی جارا ئێكێ غەریب بوون.

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا زەلامەك ژ قەحتانییان رادبیت، خەلکی ب دارێ خۆ ب رێڤە ببەت (ئانکو هند دێ بن دەستێ وی بن و کا چاوا شڤان ب چویڤی پەزی دهاژۆت و دویڤ دچن وەسا ئەو دێ ب چویڤی خەلکی ب رێڤە بەت و دێ گوهدارییێ بۆ کەن و دویڤ چن).**

٧ ـ باب: غبطة اهل القبور.

**بابەتێ: خۆزیکرنا جهێ مرییان.**

١١٤ . ١١٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ، فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ!**). [خ٧١١٥ (٨٥)/ م١٥٧/ الفتن ٥٣].

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ)، ژ پێغەمبەرێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا زەلام د بەر گۆڕێ زەلامیڕا نەبۆریت و بێژیت خۆزی ئەز ل شوینا وی بام).**

١١٥ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، يَأْتِي الرَّجُلُ القَبْرَ فَيَضْطَّجِعُ عَلَيْه فَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي مَكَانَ صَاحِبِهِ، مَا بِهِ حُبُّ لِقَاءِ اللهِ إِلاَّ لِمَا يَرَى مِنْ شِدَّةِ البَلاءِ. [ك٨٤٠٢].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ) گۆت: دەمەك دێ ب سەر خەلکیدا هێت زەلام دێ هێتە سەر گۆڕی و دێ خۆ ل سەر درێژکەت و دێ بێژیت خۆزی ئەز شوینا خودانێ گۆڕی بام، وی نە ژ حەزا دیدارا خودێیە، بەلێ هندی هند نەخۆشییێت مەزن دبینیت.**

٨ ـ باب: قتال اليهود والترك.

**بابەتێ: شەڕێ جوهی و تورکان.**

١١٦ . ١١٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا اليَهُودَ، حَتَّى يَقُولَ الحَجَرُ وَرَاءَهُ اليَهُودِيُّ: يَا مُسْلِمُ! هـذَا يَهُودِيٌّ وَرَائِي فَاقْتُلْهُ**). [خ٢٩٢٦/ م٢٩٢٢].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا هوین شەرێ جوهیيان نەكەن و هەتا ئەو بەرێ جوهی ل پشت دبێژیت: ئەی موسلمان ئەڤە جوهییەكە ل پشت من بكوژە).**

١١٧ - (ق) وعَنْه رضي الله عنه: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلوا التُّرْكَ، صِغَارَ الأَعْيُنِ، حُمْرَ الوُجُوهِ، ذُلْفَ الأُنُوفِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمْ المَجَانُّ المُطْرَقَةُ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْماً نِعَالُهُمُ الشَّعْرُ**). [خ٢٩٢٨/ م٢٩١٢].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا هوین شەرێ توركان نەكەن چاڤ هویرن، ناڤچاڤ سۆرن و دفن پەتن و دێ بێژی ناڤچاڤێت وان مەتالێ تەختەكرییە[1] و قیامەت نارابیت هەتا هوین شەرێ ملەتەكی نەكەن پێلاڤێت وان ژ موینە).**

٩ ـ باب: تقوم الساعة و الروم اكثر الناس.

**بابەتێ: رۆژا قیامەتێ دێ رابیت و رووم (فەلە) ژ هەمی خەلكی پترن.**

١١٨ - (م) عَن المسْتَوْرِدِ القرشيِّ: أنه قالَ عندَ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ**). فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو: أَبْصِرْ مَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ، إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالاً أَرْبَعاً: إِنَّهُمْ لأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ، وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ، وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ، وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ، وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ: وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ المُلُوكِ. [م٢٨٩٨].

**ژ موستەوردێ قورەیشی و عەمرێ كوڕێ عاسی ل دەڤ بوو من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بوو دگۆت: (قیامەت دێ رابیت و روومی ژ هەمی خەلكی پترن)، عەمری گۆتێ:**

---

[1] نانكو: تژی گشتن.

**تە های ژ خۆ هەیە تو چ دبێژی[١] گۆت: ئەز وێ دبێژم یا من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بووی (ﷺ)، گۆت: ئەگەر تە ئەڤە گۆت چونکی ب راستی چار سالۆخەت یێت ل دەڤ وان هەین، ئەو نەرمترین کەسن د ئاتافێدا و لەزترینن د رابوونەڤەییێدا پشتی بەلایێ، و زویترینن د زڤرینەڤەیا شەڕیدا پشتی شکەستنێ، و باشترینن بۆ هەژاری و سێوی، و یا پێنجێ یا باشە و جوانە دویرترینن ژ ستەما میران (ئانکو حاکمدارێت وان ستەمێ ل وان ناکەن.**

**١٠ . باب عبادة غير الله.**

**بابەتێ: پەرستنا غەیری خودێ.**

١١٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلَيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ عَلَى ذِي الخَلَصَةِ**)، وَذُو الخَلَصَةِ: طَاغِيَةُ دَوْسٍ الَّتِي كَانُوا يَعْبُدُونَ فِي الجَاهِلِيَّةِ. [خ٧١١٦/ م٢٩٠٦].

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا قوینبانێت ژنێت دەوسییان[٢] ل دۆر بوتێ (ذو الخلصة) نەهێن بچن)[٣]. (ذو الخلصة): بوتێ دەوسییانە ئەوێ وان بەری ئیسلامێ دپەرست.**

١٢٠ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللاَّتُ وَالعُزَّى**)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ حِينَ أَنْزَلَ اللهُ: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ﴿٣٣﴾﴾ [التوبة] أَنَّ ذَلِكَ تَامّاً، قَالَ: (**إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللهُ رِيحاً طَيِّبَةً، فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَيَبْقَى مَنْ لاَ خَيْرَ فِيهِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ**). [م٢٩٠٧].

---

(١) ئانکو: پشتراستبە ژ ئاخفتنا خۆ؟!

(٢) دەوس: هۆزەکا یەمەنینە.

(٣) ئانکو دێ سەردا چن و گاور بن و زڤرنە پەرستنا بوتان.

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(قیامەت نارابیت هەتا لات و عوززا دهێنە پەرستن)**، ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من هزر دکر دەمێ ئەڤ ئایەتە (هو الذي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ على الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ)[1]. هاتییە خوارێ دێ یا گشتگیری هەمی دەم و جهان بیت، گۆت: **(ئەو دێ یا وەسا بیت (ئانکو سەرکەفتی بیت) هندی خودێ دڤێت پاشی دێ بایەکێ نەرم و خۆش هنێریت، هەر کەسێ تەمەت دندکەکا خەندەلکێ ژی باوەری د دلیدا هەی دێ مرینیت، دێ ئەو مینن یێت چو خێر د دلێ واندا نەی[2] ڤێجا دێ زڤرنە دینێ باب و باپیرێت خۆ)**.

١١ ـ باب: ريح تكون قرب يوم القيامة.

**بابەتێ: بایەک دێ هەبیت نێزیک رۆژا قیامەتێ.**

١٢١ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ يَبْعَثُ رِيحاً مِنَ الْيَمَنِ، أَلْيَنَ مِنَ الحَرِيرِ، فَلاَ تَدَعُ أَحَداً فِي قَلْبِهِ.** قَالَ أَبُو عَلْقَمَةَ: **مِثْقَالُ حَبَّةٍ.** وَقَالَ عَبْدُ العَزِيزِ: **مِثْقَالُ ذَرَّةٍ. مِنْ إِيمَانٍ إِلاَّ قَبَضَتْهُ).** [م١١٧].

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودێ دێ بایەکی ژ یەمەنێ ژ ئارمویشی نەرمتر هنێریت، ڤێجا کەسێ تەمەت** ـ ئەبو عەلقەمەی گۆت ـ **دندکەکێ،** ـ و عەبدلعەزیزی گۆت ـ **تەمەت مێری چوکەکێ) (یان تۆزکەکا د ناڤ تیرۆژکا رۆژێدا) باوەری د دلیدا هەبیت ئەگەر رحا وی نە ستینیت).**

---

[1] رامانا ئایەتێ ب کورتی: ئەو خودێ ئەوە یێ پێغەمبەرێ خۆ ب رێکا راستەرێکرنێ کو قورئانە و ب دینێ راست هنارتی، دا بکەتە سەرپشکا هەمی دینان، و ب سەر هەمی دینان بێخیت، بلا موشرکان پێ نەخۆش ژی بیت.

[2] نە ئیسلام و نە ئیمان و نە قورئان و نە راستی ...هتد .

## ١٢. باب: انحسار الفرات عن جبل من ذهب.

## بابەتێ: ئاشکراکرنا فوراتی چیایەکێ زێری

١٢٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُوشِكُ الفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئاً**). [خ٧١١٩/ م٢٨٩٤].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نێزیکە رویبارێ فورات دێ گەنجینەکا زێری ئاشکرا کەت[1] فێجا ئەگەر ئێك ژ هەوە ئامادەی ڤێ بوو بلا چو ژێ نەراکەت).**

١٢٣ - (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**يُوشِكُ الفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَإِذَا سَمِعَ بِهِ النَّاسُ سَارُوا إِلَيْهِ، فَيَقُولُ مَنْ عِنْدَهُ: لَئِنْ تَرَكْنَا النَّاسَ يَأْخُذُونَ مِنْهُ لَيُذْهَبَنَّ بِهِ كُلِّهِ، قَالَ: فَيَقْتَتِلُونَ عَلَيْهِ، فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ**) [م٢٨٩٥].

**ژ ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نێزیکە رویبارێ فورات دێ چیایەکی ژ زێری ئاشکرا کەت فێجا دەمێ خەلکی ئەڤە گوهـ لێ بوو دێ چنێ، فێجا ئەوێت ل دەڤ دێ بێژن ئەگەر مە هێلا خەلك ژێ ببەن دێ هەمییێ بەن، گۆت: دێ شەڕی ل سەر کەن فێجا هەر ژ سەدا نۆت و نەهـ دێ هێنە کوشتن).**

## ١٣ . باب: كثرة المال واخضرار ارض العرب.

## بابەتێ: زێدەیا پارەی و کەسکبوونا عەردێ عەرەبان.

١٢٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ المَالُ، فَيَفِيضَ، حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ المَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ، فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لاَ أَرَبَ لِي**). [خ١٤١٢ (٨٥)/ م١٥٧م/ زكاة ٦٠]

- زاد مسلم: (**وَحَتَّى تَعُودَ أَرْضُ العَرَبِ مُرُوجاً وَأَنْهَاراً**).

[1] ئاڤ نامینیت دێ ئەو گەنجینە ئاشکرا بیت.

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا پارە د ناڤ هەودا زێدە دبیت ڤێجا سەردا دچیت، هەتا خودانێ پارەی ب خەم دکەڤیت کی دێ سەدەقەیا وی ژێ وەرگریت و هەتا پێشکێش دکەت، ڤێجا ئەوێ بۆ هاتییە پێشکێشکرن دێ بێژیت: من پێدڤی پێ نینە).**

- و موسلمی زێدە کرییە: **(هەتا عەردێ عەرەبان دزڤریت دبیتە مێرگ و رویبار).**

١٢٥ - وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَعُودَ أَرْضُ العَرَبِ مُرُوجاً وَأَنْهَاراً، وَحَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ بَيْنَ العِرَاقِ وَمَكَّةَ لاَ يَخَافُ إِلاَّ ضَلاَلَ الطَّرِيقِ، وَحَتَّى يَكْثُرَ الهَرْجُ)** قَالُوا: وَمَا الهَرْجُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(القَتْلُ).** [حم٨٨٣٣]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ وی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا عەردێ عەرەبان دزڤریت دبیتە مێرگ و رویبار و هەتا سوار[1] د ناڤبەرا عیراقێ و مەکەهێدا[2] د چیت و ژ چو نەترسیت رێگران نەبیت و هەتا هەرەج زێدە دبیت، گۆتن: و هەرەج چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: کوشتنە).**

١٤ ـ باب: خروج النار من أرض الحجاز.

**بابەتێ: دەرکەفتنا ئاگرەکی ژ عەردێ حیجازێ**

١٢٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الحِجَازِ، تُضِيءُ أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى).** [خ٧١١٨/ م٢٩٠٢].

---

[1] ئانکو رێڤینگ.

[2] یان هەر جهەکێ دیدا بیت.

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژا قیامەتێ نارابیت هەتا ئاگرەك ژ عەردێ حیجازێ دەردكەڤیت ستۆیێت حێشتران ل بوصرا[1] رۆن دكەت).**

١٢٧ – عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (سَتَخْرُجُ نَارٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ . أَوْ مِنْ نَحْوِ بَحْرِ حَضْرَمَوْتَ . قَبْلَ يَوْمِ القِيَامَةِ تَحْشُرُ النَّاسَ)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (عَلَيْكُمْ بِالشَّامِ). [ت٢٢١٧].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئاگرەك بەری رۆژا قیامەتێ دێ ژ حەزرەمەوتێ یان ژ لایێ حەزرەمەوتێ[2] دەركەڤیت خەلكی كۆم كەتە سەرێك، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ وی دەمی تو چ فەرمان ل مە دكەی؟ گۆت: رێكا شامێ بگرن)[3].**

## ١٥ ـ باب: الخسف بالجيش الذي يؤم البيت.

## بابەتێ: د عەردیدابرنا لەشكەرێ ڤەستا كەعبێ دكەت.

١٢٨ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَغْزُو جَيْشٌ الكَعْبَةَ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ)، قَالَتْ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ، وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: (يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ).

[خ٢١١٨/ م٢٨٨٤].

---

[1] بازێرێ حورانە ل شامێیە.

[2] مەبەست پێ راستیا ئاگرییە یان ژی بەلایە.

[3] یان ژی رێكا خەلكێ وێ بگرن.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (لەشکەرەك دێ غەزوا کەعبێ کەت، ڤێجا دەمێ دگەهنە دەشتەکێ ژ عەردی، خودێ دێ سەر و بنێت وان خسفێ لێ کەت (د عەردیدا بەت).. گۆت: من گۆت چاوا خودێ دێ خەسفێ ل سەر و بنێت وان کەت، و خەلکێ سویکێت وان و یێت نە ژ وان یێت د گەل وان؟! ئینا گۆت: خودێ دێ خسفێ ل سەر و بنێت وان کەت، پاشی رۆژا قیامەتێ خودێ دێ هەر ئێکی ل دویڤ ئنیەتا وی راکەت).**

١٢٩ - (م) عَنْ أَمِّ سَلمةَ رضي الله عنها قَالتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَعُوذُ عَائِذٌ بِالبَيْتِ، فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ**)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهاً؟ قَالَ: (**يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ، وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ**). [م٢٨٨٢].

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (حەوینخوازەك دێ خۆ ب کەعبێ حەوینت ڤێجا دێ لەشکەرەکی هنێرنێ، دەمێ دگەهنە جهەکێ دەشت و فرەهـ دێ د عەردیدا چنە خوار)، ئینا من گۆت: و چاوا ئەوێت نە ژ دل د گەل هاتین و نەڤە نەڤێت؟ ئینا گۆت: (خودێ دێ خسفێ ل وی و وان پێکڤە کەت بەلێ رۆژا قیامەتێ دێ ل سەر ئنیەتا خۆ هێتە راکرن).**

## ١٦ . باب: ذكر ابن صياد.

## بابەتێ: بەحسێ کورێ صەیادی.

١٣٠ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُوْدٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَمَرَرْنَا بِصِبْيَانٍ فِيهِمُ ابْنُ صَيَّادٍ، فَفَرَّ الصِّبْيَانُ وَجَلَسَ ابْنُ صَيَّادٍ، فَكَأَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَرِهَ ذلِكَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (**تَرِبَتْ يَدَاكَ، أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ**) ؟ فَقَالَ: لاَ، بَلْ تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللهِ.

فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: ذَرْنِي يَا رَسُولَ اللهِ، حَتَّى أَقْتُلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنْ يَكُنِ الَّذِي تَرَى، فَلَنْ تَسْتَطِيعَ قَتْلَهُ**). [م٢٩٢٤].

ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) و ئەم د بەر بچویکانرا بۆرین و کورێ صەیادی د گەل وان بوو، ئینا بچویك رەڤین و کورێ صەیادی روینشت، هەروەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە پێ نەخۆش بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: **(دەستێت تە ب ئاخێ بکەڤن تو شەهدەییێ ددەی ئەز پێغەمبەرێ خودێمە)**؟ ئینا گۆت: نەخێر، بەلکی تو شەهدە ددەی ئەز پێغەمبەرێ خودێمە، ئینا عومەرێ کورێ خەتابی گۆت: بهێلە ئەی پێغەمبەرێ خودێ هەتا ئەز وی بکوژم، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: بهێلە **(یا عومەر ئەگەر ئەو ئەو بیت یێ تو دبینی تو نەشێی بکوژی)**.

١٣١ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجْنَا حُجَّاجاً، أَوْ عُمَّاراً، وَمَعَنَا ابْنُ صَائِدٍ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً، فَتَفَرَّقَ النَّاسُ، وَبَقِيتُ أَنَا وَهُوَ، فَاسْتَوْحَشْتُ مِنْهُ وَحْشَةً شَدِيدَةً مِمَّا يُقَالُ عَلَيْهِ. قَالَ: وَجَاءَ بِمَتَاعِهِ فَوَضَعَهُ مَعَ مَتَاعِي، فَقُلْتُ: إِنَّ الحَرَّ شَدِيدٌ، فَلَوْ وَضَعْتَه تَحْتَ تِلْكَ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَفَعَلَ، قَالَ: فَرُفِعَتْ لَنَا غَنَمٌ، فَانْطَلَقَ فَجَاءَ بِعُسٍّ، فَقَالَ: اشْرَبْ، أَبَا سَعِيدٍ، فَقُلْتُ: إِنَّ الحَرَّ شَدِيدٌ وَاللَّبَنُ حَارٌّ، مَا بِي إِلاَّ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَشْرَبَ عَنْ يَدِهِ ـ أَوْ قَالَ: آخُذَ عَنْ يَدِهِ ـ فَقَالَ: أَبَا سَعِيدٍ! لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آخُذَ حَبْلاً، فَأُعَلِّقَهُ بِشَجَرَةٍ، ثُمَّ أَخْتَنِقَ مِمَّا يَقُولُ لِيَ النَّاسُ، يَا أَبَا سَعِيدٍ! مَنْ خَفِيَ عَلَيْهِ حَدِيثُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَا خَفِيَ عَلَيْكُمْ، مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! أَلَسْتَ مِنْ أَعْلَمِ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(هُوَ كَافِرٌ)** وَأَنَا مُسْلِمٌ؟ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(هُوَ عَقِيمٌ لاَ يُولَدُ لَهُ)** وَقَدْ تَرَكْتُ وَلَدِي بِالمَدِينَةِ؟ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ يَدْخُلُ المَدِينَةَ وَلاَ مَكَّةَ)** وَقَدْ أَقْبَلْتُ مِنَ المَدِينَةِ وَأَنَا أُرِيدُ مَكَّةَ؟

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ: حَتَّى كِدْتُ أَنْ أَعْذِرَهُ. ثُمَّ قَالَ: أَمَا وَاللهِ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ، وَأَعْرِفُ مَوْلِدَهُ وَأَيْنَ هُوَ الآنَ. قَالَ: قُلْتُ لَهُ: تَبّاً لَكَ سَائِرَ اليَوْمِ. [م٢٩٢٧].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: ئەم بۆ حەجێ یان عومرێ دەركەفتین و كورێ صائدی ژی د گەل مە بوو، ئەم ل جهەكی روینشتین خەلك بەلاڤە بوون و ئەز و ئەو ب تنێ ماین، بێهنا زێدە پێ نەهات ژ بەر ئەوا ل سەر دهاتە گۆتن، گۆت: تشتێت خۆ ئینان دانانە د گەل تشتێت من، من گۆتێ: گەرم یا دژوارە ئەگەر تشتێت خۆ ببەیە بن دارا هەنێ، گۆت: وەكر، گۆت. هندە پەز بۆ مە ئاشكەرا بوو، چۆ دەڤ پەزی و هات پەرداغەكی مەزن یێ شیری ئینا، گۆتە من: ئەی بابێ سەعیدی ڤەخۆ، من گۆتێ: ب راستی گەرم یا دژوارە و شیر ژی یێ گەرمە، من چو نینە ژ بلی من نەڤێت شیری ژ دەستێ وی ڤەخۆم یان ژ دەستێ وی وەرگرم، ئینا گۆت: ئەی بابێ سەعیدی من كرە دلێ خۆ ئەز كنفەكێ هەلگرم و ب دارەكێڤە گرێدەم پاشی خۆ بكوژم ژ بەر وان ئاخفتنێت خەلك ل سەر من دبێژن، ئەی بابێ سەعیدی یێ حەدیسا پێغەمبەری لێ بەرزە بووی و بۆ ئاشكرا نەبووی ل هەوە ئەنساران بەرزە نابیت ما تو ب حەدیسا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ خەلكی زاناتر نینی، ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەگۆتییە: **(دەجال گاورە)** و ئەز موسلمانم، ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەگۆتییە: ئەو **(یێ خرشە زارۆك نابن)** و من كورێ خۆ یێ هێلایە ل مەدینێ، ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەگۆتییە: **(ئەو نەدچیتە مەكەهێ نەدچیتە مەدینەیێ)** و ئەز یێ ژ مەدینەیێ هاتیم و دێ قەستا مەكەهێ كەم، بابێ سەعیدی گۆت: هەتا نێزیك بوو ئەز باوەر ژێ بكەم و دەستویرییا وی قەبویل بكەم، پاشی گۆت: بەلێ ب خودێ كەمە ئەز دەجالی دنیاسم و ئەز جهێ بوونا وی دزانم و ئەز دزانم ڤێ گاڤێ ئەو ل كیرێیە، گۆت: ئینا من رۆژێ هەمییێ گۆتێ نەمان و ناڤچۆن بۆ تە بیت.

## ١٧ ـ باب: ما يكون من فتوحات قبل الدجال.

## بابەتێ: سەركەفتنان بەری هاتنا دەجالی.

١٣٢ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ، عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةٍ، قَالَ: فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ المغْرِبِ، عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الصُّوفِ، فَوَافَقُوهُ عِنْدَ أَكَمَةٍ، فَإِنَّهُمْ لَقِيَامٌ وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَاعِدٌ، قَالَ: فَقَالَتْ لِي نَفْسِي: ائْتِهِمْ، فَقُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ لاَ يَغْتَالُونَهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: لَعَلَّهُ نَجِيٌّ مَعَهُمْ، فَأَتَيْتُهُمْ فَقُمْتُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ، قَالَ: فَحَفِظْتُ مِنْهُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، أَعُدُّهُنَّ فِي يَدِي، قَالَ: (**تَغْزُونَ جَزِيرَةَ العَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللهُ، ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللهُ، ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفتَحُهُ اللهُ**).

قَالَ: فَقَالَ نَافِعٌ: يَا جَابِرُ! لاَ نَرَى الدَّجَّالَ يَخْرُجُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ. [م٢٩٠٠].

**ژ نافعێ كورێ عوتبەیی (ﷺ) گۆت: ئەم د غەزوەكێدا د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ) ملەتەك ژ لایێ رۆژئاڤایێڤە هاتنە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) جلكێت هرییێ ل بەر بوون، ل دەڤ چیاكەكێ بچویك یان گركەكێ ئاخێ گەهشتنێ و ئەو ژ پیانڤە بوون و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ روینشتی بوو، گۆت: دلێ من گۆتە من هلۆ د ناڤبەرا واندا روینەخوارێ ئەو وی نەكوژن، گۆت: پاشی من گۆت بەلكی یێ نهێنییەكێ بۆ دبێژیت، ئەز چۆم د ناڤبەرا وی و واندا روینشتم، گۆت: من چار پەیڤ ژ وی ژ بەر كرن ئەز وان د دەستێ خۆدا دهەژمێرم گۆت: (هوین دێ غەزوا جەزیرا عەرەبی كەن و خودێ دێ ل سەر دەستێ هەوە ڤەكەت، پاشی دێ غەزوا فاس كەن و خودێ دێ ل سەر دەستێ هەوە ڤەكەت، پاشی دێ غەزوا رۆمێ كەن و خودێ دێ ل سەر دەستێ هەوە ڤەكەت، پاشی غەزوا دەجالی كەن و خودێ دێ هەوە ب سەر ئێخیت و كوشتنا وی دێ ل سەر دەستێ هەوە بیت)، گۆت: ئینا نافعی گۆت: ئەی جابر: ئەم دەجالی نابینین هەتا رۆم نەهێتە ڤەكرن.**

## ١٨ . باب: خروج الدجال و نزول عيسى.

## بابەتێ: دەرکەفتنا دەجالی و هاتنەخوارا عیسایی.

١٣٣ - (ق) عَن ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قال: قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) في النَّاسِ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: (**إِنِّي لأُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَ نُوحٌ قَوْمَهُ، وَلكِنِّي أَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ، وَأَنَّ اللهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ**). [خ٣٣٣٧ (٣٠٥٧)/ م١٦٩ و١٦٩م].

**ژ کورێ عومەری (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو ناڤ خلکی و پەسنا خودێ ب وی تشتێ هەژی وی کر، پاشی بەحسێ دەجالی کر، ئینا گۆت: (ب راستی ئەز هەوە ژێ دترسینم و چو پێغەمبەر نینن ملەتێ خۆ ژێ نەترساندبیت، و ب سویند نووحی ملەتێ خۆ پێ ژێ تراسندی، بەلێ ئەز بۆ هەوە ئاخفتنەکێ د ویدا دبێژم چو پێغەمبەران ئەو نەگۆتییە ملەتێ خۆ، هوین دزانن ب راستی ئەو ژ چاڤەکی کۆرەیە، و ب راستی خودایێ هەوە نە یێ کۆرەیە).**

١٣٤ - (ق) عَنْ عقبةَ بنِ عمرٍو أَبي مسعود الأَنصاري؛ أَنه قال لِحُذَيْفَةَ: أَلاَ تُحَدِّثُنَا مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ قالَ: إِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**إِنَّ مَعَ الدَّجَّالِ إِذَا خَرَجَ ماءً وَنَاراً، فَأَمَّا الَّذِي يَرَى النَّاسُ أَنَّهَا النَّارُ فَمَاءٌ بَارِدٌ، وَأَمَّا الَّذِي يَرَى النَّاسُ أَنَّهُ ماءٌ بَارِدٌ فَنَارٌ تُحْرِقُ، فَمَنْ أَدْرَكَ مِنْكُمْ فَلْيَقَعْ فِي الَّذِي يَرَى أَنَّهَا نَارٌ، فَإِنَّهُ عَذْبٌ بَارِدٌ**). [خ٣٤٥٠/ م٢٩٣٤، ٢٩٣٥].

**ژ عوقبەیێ کورێ عەمری، بابێ مەسعودێ ئەنساری وی گۆتە حوزەیفەی: ئەرێ ئەوا تە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر دەجالی گوه لێ بووی بۆ مە نابێژی؟ گۆت: (ب راستی من گوه ل وی بوو دگۆت: ب راستی ئەگەر دەجال دەرکەفت ئاڤ و ئاگر یێ د گەل، ڤێجا ئەوا خەلك دبینیت ئاگرە، ئاڤەکا سارە، و ئەوا خەلك دبینیت ئاڤە، ئەو ئاگرە**

**دسۆژینیت، و ئەگەر ئێك ژ هەوە گەهشتێ بلا بكەڤیتە د ئەوا خەلك دبینیت ئاگر، ئەو ئاڤەكا خۆش و شرینە).**

١٣٥ - (م) عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ، فَخَفَّضَ فِيهِ وَرَفَّعَ، حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ عَرَفَ ذَلِكَ فِينَا، فَقَالَ: (**مَا شَأْنُكُمْ**) ؟ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً، فَخَفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَّعْتَ، حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَقَالَ: (**غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي عَلَيْكُمْ؛ إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ، فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ؛ وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نفْسِه، وَاللهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ. إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ، عَيْنُهُ طَافِئَةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بِعَبْدِ العُزَّى بْنِ قَطَنٍ، فَمَنْ أَدْرَكَهُ مِنْكُمْ؛ فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الكَهْفِ. إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّامِ وَالعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِيناً وَعَاثَ شِمَالاً، يَا عِبَادَ اللهِ! فَاثْبُتُوا**).

قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا لَبْثُهُ فِي الأَرْضِ؟ قَالَ: (**أَرْبَعُونَ يَوْماً، يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ**) قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! فَذَلِكَ اليَوْمُ الَّذِي كَسَنَةٍ، أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلاَةُ يَوْمٍ؟ قَالَ: (**لاَ، اقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ**).

قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا إِسْرَاعُهُ فِي الأَرْضِ؟ قَالَ: (**كَالغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ، فَيَأْتِي عَلَى القَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ، فَيُؤْمِنُونَ بِهِ، وَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ، فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ، وَالأَرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ، أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُراً، وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعاً، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ. ثُمَّ يَأْتِي القَوْمَ، فَيَدْعُوهُمْ، فَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ، فَيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ، لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ مِنْ أَمْوَالِهِمْ، وَيَمُرُّ بِالخَرِبَةِ فَيَقُولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ، فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُها كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ. ثُمَّ يَدْعُو رَجُلاً مُمْتَلِئاً شَبَاباً، فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ، فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الغَرَضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ، يَضْحَكُ.**

**فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ، إِذْ بعثَ اللهُ المَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ المَنَارَةِ البَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعاً كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، فَلاَ يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلاَّ مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ، فَيَطْلُبُهُ حَتَّى**

يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ. ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللهُ مِنْهُ، فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الجَنَّةِ. فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللهُ إِلَى عِيسَى: إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَاداً لِي، لاَ يَدَانِ لأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ، فَحَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ.

وَيَبْعَثُ اللهُ يَأْجُوجَ ومَأْجُوجَ، وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ، فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ، فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا، وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ. وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، حَتَّى يَكُونَ رأْسُ الثَّوْرِ لأَحَدِهِمْ خَيْراً مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ اليَوْمَ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ، فَيُرْسِلُ اللهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ، فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ.

ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الأَرْضِ، فَلاَ يَجِدُونَ فِي الأَرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلاَّ مَلأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللهِ، فَيُرْسِلُ اللهُ طَيْراً كَأَعْنَاقِ البُخْتِ، فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللهُ مَطَراً لاَ يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلاَ وَبَرٍ، فَيَغْسِلُ الأَرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ، ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ: أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ، وَرُدِّي بَرَكَتَكِ، فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ العِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ، وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا، وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ، حَتَّى أَنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الإِبِلِ لَتَكْفِي الفِئَامَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ البَقَرِ لَتَكْفِي القَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الغَنَمِ لَتَكْفِي الفَخِذَ مِنَ النَّاسِ. فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللهُ رِيحاً طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الحُمُرِ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ). [م٢٩٣٧].

ژ نەواسێ كورێ سەمعانی (رضي الله عنه) گۆت: رۆژەكێ سپێدێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەحسێ دەجالی كر، سڤك دانا و مەزن كر هەتا مە هزر كری یێ د ناڤ دارقەسپانڕا، ڤێجا دەمێ ئەم ئێڤاری چۆینە دەڤ، ل مەئینا دەر، ئینا گۆت: **(هەوە خێرە)؟** مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە سپێدێ بەحسێ دەجالی كر، و تە سڤك دانا و مەزن كر هەتا مە هزر كری یێ د ناڤ دارقەسپانڕا ڤەشارتییە، گۆت: **(تشتێ ئەز پتر ل سەر هەوە دترسم نەدەجالە: ئەگەر دەركەفت و ئەز د ناڤ هەوەدابم، ئەز دێ شوینا هەوە بەرسڤا وی دەم، و ئەگەر دەركەفت و ئەز د ناڤ هەوەدا نەبم، هەر مرۆڤەك بەرسڤدەرە و بەلگەزانێ خۆیە،**

**و خودێ پشتی من پارێزەرێ هەر موسلمانەکییە. ئەو گەنجەکێ سەر خەلەکێ چاڤ بلۆقە، هەروەکی ئەز وی وەکی عەبدولعوززایێ کورێ قەتەنی ددانم، ئەگەر ئێك ژ هەوە گەهشتێ بلا سەرێ سۆرەتا کەهف پێڤە بخوینیت، ئەو دێ ل رێکەکێ د ناڤبەرا شامێ و عیراقێ دەرکەڤیت، رەخێ راستێ دێ خرابییێ بەلاڤ کەت و رەخێ چەپێ دێ خرابییێ بەلاڤ کەت، گەلی بەندەیێت خودێ خۆ راگرن).**

مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دێ چەند مینیتە د عەردیدا؟ گۆت: **(چل رۆژان؛ رۆژەك هندی سالەکێیە، و رۆژەك هندی هەیڤەکێیە و رۆژەك هندی حەفتییەکێیە، و رۆژێت دی وەکی رۆژێت هەوەنە)**، مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو رۆژا هندی سالەکێ نڤێژێت رۆژەکێ بەسی مەنە؟ گۆت: **(نەخێر، دەمێ وێ حسێب بکەن)**[1].

مە گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ عەردی چەند زوی ڤەدگریت؟ گۆت: **(وەکی بارانەکێ هەرەبای ل پاش خۆ هێلا بیت (ڤێجا هەر بباریت)، دێ هێتە دەڤ هندەکان دێ داخوازییا وان کەت، دێ باوەرییێ پێ ئینن، و دێ گوهێ خۆ دەنێ، دێ فەرمانا عەوری کەت دێ بارانێ بارینیت، و دێ فەرمانا عەردی کەت شین بیت، دێ شین بیت، و پەزێ وان دێ زڤڕیت درێژتر ژ پشتا حێشترا ژ هەمیان درێژتر و گوهان مەزنتر و کێلەك درێژتر[2] پاشی دێ هێتە دەڤ هندەکێت دی، دێ داخوازا وان کەت، دێ ئاخفتنا وی زڤڕینن، دێ وان هێلیت و باران دێ ژ وان هێنە بڕین، و تشتەك ژ مالێ وان نامینیتە د دەستێ واندا، و ئەو (دەجال) دێ د بەر کاڤلیڕا چیت دێ بێژتێ خزینێت خۆ دەربێخە، دێ خزینێت وی دویڤڕا چن وەکی نێرەمێشێت هنگڤینی، پاشی دێ گازی زەلامەکی د کاملانا گەنجینێدا کەت، و دێ شیری دانیتێ و دێ کەتە دو پارچە و ب دویراتییا د ناڤبەرا تیرێ و**

---

[1] ئانکو: هەر بیست و چار دەمژمێران دێ پێنج نڤێژان کەن.

[2] ئانکو: دێ پەزێ وان زڤڕیت تێر خواری و ڤەخواری و پڕ گۆشت و شیر.

ئارمانجێدا هەردو كەرێت وی دێ ژێك دویر ئێخیت، پاشی دێ گازیكەتێ دێ رابیت و ناڤچاڤێت وی كەش دكەن و دكەتە كەنی.

د ڤێ ناڤبەرێدا، ئەو یێ هۆسا دێ خودێ عیسایێ كوڕێ مەریەمایێ (ﷺ) هنێریت و دێ ل منارا سپی ل رۆژهەلاتا دیمەشقێ هێتە خوار دو كراسێت بۆیاغكری یێت ل بەر و دەستێت خۆ یێت دانایە سەر پەڕێت دو ملیاكەتان ئەگەر سەرێ خۆ چەماند دێ خوەژێ هێتە خوار و ئەگەر بلند كەت وەكی دندكێت لۆلۆیێ دێ راوەستن، گاوران رێك نینە كەسەك ژ وان نینە بێهنا عیسای بگەهیتێ ئەگەر نەمریت، و بێهنا وی (یا خۆش) هندی چاڤێت وی ڤەتره دكەن دچیت، دێ ل دەجالی گەرییێت هەتا ل بەر دەرگەهێ شارێ لود (بازێركەكە دكەڤیتە نێزیك قودسێ) دگەهیتێ، دێ وی كوژیت، پاشی عیسا (ﷺ) دێ هێتە دەڤ هندەك كەسان خودێ ژ دەجالی یێت پاراستین، دێ سەر و چاڤێت وان ڤەمالیت و دێ بەحسێ پلەێت وان د بەحەشتێدا كەت، ڤێجا ئەو یێ هۆسا دێ خودێ وەحییێ بۆ عیسای (ﷺ) هنێریت: من هندەك بەندە یێت داین كەس نەشێت شەڕێ وان بكەت، ڤێجا بەندەیێت من ب چیایێ (طور) بپارێزە[1].

و خودێ دێ یەئجووج و مەئجووجان دەرئێخیت و ئەو ژ هەمی جهێت بلند ب لەز دادكەڤن[2]. دەستپێكا وان دێ ل سەر دەریا تەبەرییەڕا چیت دێ ئاڤا وێ هەمییێ ڤەخۆن، و یێت دویماهییێ دێ هێن دێ بێژن: دەمەكی ئاڤ ل ڤێرێ هەبوو، و عیسا (سلاڤێت خودێ ل سەر بن) و هەڤالێت وی دێ ئاسێ بن[3]، هەتا سەرێ گای ل دەڤ ئێك ژ وان چێتره ژ سەد دینارێت هەوە ئەڤرۆ، پێغەمبەرێ خودێ عیسا (ﷺ) و هەڤالێت وی خودێ ژ وان رازی بیت دێ هەوارا خۆ بەنە دەڤ خودێ، خودێ دێ كرمێت دكەڤنە

---

(١) ئانكو: ژ رێكا وان راكە و ببە طور.

(٢) هندی هند گەلەكن، ژ هەمی رێكان دئێن، دا خرابییێ بكەن.

(٣) دێ گرانی كەڤیتە د ناڤ واندا.

دفنێت پەزی و حێشتران ل سەر یەئجووج و مەئجووجان ئینیتە خوارێ هەمی پێکڤە دێ مرن، پاشی پێغەمبەرێ خودێ عیسا (ﷺ) و هەڤالێت وی خودێ ژ وان رازی بیت دێ هێنە خوارێ، جهێ بهۆستەکێ ژ عەردی نابینن ئەگەر گەنیاتی و بێهنا وان یا پیس پڕ نەکربیت، پێغەمبەرێ خودێ عیسا (ﷺ) و هەڤالێت وی خودێ ژ وان رازی بیت دێ هەوارا خۆ بەنە دەڤ خودێ، خودێ دێ هندەك بالەفڕان وەکی ستۆیێت حێشترێت خەرەسانییان هنێریت، دێ وان هەلگرن و دێ هاڤێژنە وی جهێ خودێ حەز کری، پاشی خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بارانەکێ هنێریت نە خانییێ ئاخێ نە یێ هرییێ و موی نامینیت ئیلا دێ ڤەگریت[1] دێ عەردی شۆت هەتا وەکی ڤۆدیکێ لێ دکەت، پاشی دێ بێژیتە عەردی فێقییێ خۆ دەربێخە، و بەرەکەتا خۆ بزڤڕینە، وێ رۆژێ کۆمەکا مرۆڤان ژ هنارەکێ دخۆن و خۆ ددەنە بەر سیبەرا وێ، و خودێ دێ بەرەکەتێ ئێخیتە شیری، هەتا حێشترەکا ب شیر و نێزیك زای، تێرا کۆمەکا بۆش ژ مرۆڤان دکەت، و پەزەکا ب شیر و نێزیك زای، تێرا بابکەکی (بنەمالەکێ) ژ خەلکی دکەت، و ئەو یێت هۆسا د ڤێ رەوشێدا دێ خودێ بایەکێ خۆش هنێریت دێ وان د بن بنکەفشێت وانڕا گریت و دێ جانێ هەر خودان باوەرەکی و هەر موسلمانەکی کێشیت، و خرابێت خەلکی دێ مینن دێ ل بەرامبەر ئێك چنە نڤینا ئێك وەکی کەران (و هەروەکی چونە)، دێ قیامەت ل سەر ڤان رابیت).

---

(١) ئانکو: د هەمی تشتاندا دچیتە خوارێ.

## ١٩ ـ باب: قصة الجساسة.

## بابەتێ: سەرهاتییا جەساسی.

١٣٦ – (م) عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ـ أُخْتِ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ، وَكَانَتْ مِنَ المهَاجِرَاتِ الأُوَلِ ـ قَالَتْ: سَمِعْتُ نِدَاءَ المنَادِي، مُنَادِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، يُنَادِي: الصَّلاَةَ جَامِعَةً، فَخَرَجْتُ إِلَى المسْجِدِ، فَصَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَكُنْتُ فِي صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِي تَلِي ظُهُورَ القَوْمِ.

فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) صَلاَتَهُ، جَلَسَ عَلَى المِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقَالَ: **(لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ)**، ثُمَّ قَالَ: **(أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ)** ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: **(إِنِّي، وَاللهِ! مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلاَ لِرَهْبَةٍ، وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ، لأَنَّ تَمِيماً الدَّارِيَّ، كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيّاً، فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ، وَحَدَّثَنِي حَدِيثاً وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ. حَدَّثَنِي: أَنَّهُ رَكِبَ فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، مَعَ ثَلاَثِينَ رَجُلاً مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ، فَلَعِبَ بِهِمُ المَوْجُ شَهْراً فِي البَحْرِ، ثُمَّ أَرْفَؤُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِي البَحْرِ حَتَّى مَغْرِبِ الشَّمْسِ، فَجَلَسُوا فِي أَقْرُبِ السَّفِينَةِ، فَدَخَلُوا الجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعْرِ، لاَ يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ، مِنْ كَثْرَةِ الشَّعْرِ، فَقَالُوا: وَيْلَكِ! مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الجَسَّاسَةُ، قَالُوا: وَمَا الجَسَّاسَةُ؟ قَالَتْ: أَيُّهَا القَوْمُ! انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ. قَالَ: لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلاً فَرِقْنَا مِنْها أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا سِرَاعاً، حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ، فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقاً، وَأَشَدُّهُ وِثَاقاً، مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ مَا بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالحَدِيدِ. قُلْنَا: وَيْلَكَ! مَا أَنْتَ؟ قَالَ: قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِي، فَأَخْبِرُونِي مَا أَنْتُمْ؟ قَالُوا: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ العَرَبِ، رَكِبْنَا فِي سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ، فَصَادَفْنَا البَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ، فَلَعِبَ بِنَا المَوْجُ شَهْراً، ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ، فَجَلَسْنَا فِي أَقْرُبِهَا، فَدَخَلْنَا الجَزِيرَةَ، فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعْرِ، لاَ يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعْرِ؟ فَقُلْنَا: وَيْلَكِ! مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ: أَنَا الجَسَّاسَةُ، قُلْنَا: وَمَا الجَسَّاسَةُ؟ قَالَتِ: اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِي الدَّيْرِ، فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ، فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعاً، وَفَزِعْنَا مِنْهَا، وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً. فَقَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ:**

أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا، هَلْ يُثْمِرُ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، قَالَ: أَما إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لاَ تُثْمِرَ. قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ، قُلْنَا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِيهَا مَاءٌ؟ قَالُوا: هِيَ كَثِيرَةُ المَاءِ، قَالَ: أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ. قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ عَيْنِ زُغَرَ، قَالُوا: عَنْ أَيِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ: هَلْ فِي العَيْنِ مَاءٌ؟ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ العَيْنِ؟ قُلْنَا لَهُ: نَعَمْ، هِيَ كَثِيرَةُ المَاءِ، وَأَهْلُهَا يَزْرَعُونَ مِنْ مَائِهَا. قَالَ: أَخْبِرُونِي عَنْ نَبِيِّ الأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ؟ قَالُوا: قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ، قَالَ: أَقَاتَلَهُ العَرَبُ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ؟ فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ العَرَبِ وَأَطَاعُوهُ، قَالَ لَهُمْ: قَدْ كَانَ ذَلِكَ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، وَإِنِّي مُخْبِرُكُمْ عَنِّي: إِنِّي أَنَا المَسِيحُ، وَإِنِّي أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِي فِي الخُرُوجِ، فَأَخْرُجُ فَأَسِيرُ فِي الأَرْضِ، فَلاَ أَدَعُ قَرْيَةً إِلاَّ هَبَطْتُهَا فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ، فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَيَّ، كِلْتَاهُمَا، كُلَّما أَرَدْتُ أَن أَدْخُلَ وَاحِدَةً، أَوْ وَاحِداً مِنْهُمَا، اسْتَقْبَلَنِي مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتاً، يَصُدُّنِي عَنْهَا، وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلاَئِكَةً يَحْرُسُونَهَا).

قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِي المِنْبَرِ: (هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ، هَذِهِ طَيْبَةُ). يَعْنِي: المَدِينَةَ. (أَلاَ هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ)؟ فَقَالَ النَّاسُ: نَعَمْ، (فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِي حَدِيثُ تَمِيمٍ، أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِي كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ وَعَنِ المَدِينَةِ وَمَكَّةَ، أَلاَ إِنَّهُ فِي بَحْرِ الشَّامِ أَوْ بَحْرِ اليَمَنِ، لاَ بَلْ مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ مَا هُوَ، مِنْ قِبَلِ المَشْرِقِ مَا هُوَ) وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى المَشْرِقِ. قَالَتْ: فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [م٢٩٤٢].

**ژ فاتمایا كچا قەیسی خویشكا زەحاكێ كوڕێ قەیسی و ئەو ژ مشەختێت ئێكێ بوو، گۆت: من گوهـ ل گازیكەری بوو گازیكەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی دكەت وەرنە نڤێژا ب جەماعەت، ئەز دەركەفتم چۆمە مزگەفتێ من نڤێژ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، و ئەز د ریزا ژناندا بووم ئەوا ل پشت زەلامان، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا خۆ تمام كری، ل سەر مینبەرێ روینشتە خوارێ و ئەو یێ دكەتە كەنی، و گۆت: (بلا هەر ئێك د جهێ خۆ یێ نڤێژێدا بیت)، پاشی گۆت: (هوین دزانن بۆچی من هوین**

**كۆم كرینە)؟** گۆتن: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: **(ئەز ب خودێكەمە من هوین كۆم نەكرینە بۆ شرینكرنا تشتەكی و تراسندنێ ژ تشتەكی، بەلێ من هوین كۆم كرن چونكی تەمیمێ داری مرۆڤەكێ فەلە بوو و یێ هاتی بەیعێ بدەت و موسلمان بوو، و ئاخفتنەك بۆ من كر د گەل وێ دهێت یا من بۆ هەوە ژ دەجالێ كۆرە دگۆت، بۆ من گۆت ئەو ل گەمییەكێ سویار بوون د گەل سیه زەلامان ژ لەخمییان و جوزامییان[1] پێلان هەیڤەكێ ئەو د دەریایێدا ئینان و برن، پاشی خۆ گەهاندنە گزیرتەكێ د دەریایێدا هەتا رۆژ ئاڤا بووی روینشتنە د گەمییكا بچویكدا و پێ چۆنە د ناڤ گزیرتێدا، گیانەوەرك كەفتە پێشییا وان یێ پڕ موی بوو، ژ بەر زێدە موییان بەروپشتێت وی نەدهاتنە زانین، گۆتنێ: نەخۆشی بۆ تە بیت، تو چی؟! گۆت: ئەز جەساسەمە، مە گۆتێ جەساسە چییە؟ گۆت: گەلی مرۆڤان هەرنە دەڤ وی زەلامێ د دێرێڤە ب راستی ئەو زێدە یێ ژ دەنگ و باسێت هەوە خەریبە، گۆت دەمێ ناڤێ زەلامەكی بۆ مە ئینایی، ئەم ژێ ترساین كو ئەو شەیتان بیت، گۆت: ئەم ب لەز چۆین هەتا چۆینە د دێرێڤە، مرۆڤەك تێڤە بوو مەزنترین مرۆڤ ب كەلەخێڤە و ب هێزترین قەیدوزنجیرڤە مە دیتی ئەو بوو، دەستێت وی ب ستۆیێ ویڤە و د ناڤبەرا چۆكێت وی هەتا گۆزەكێت وی ب ئاسنیڤە د گرێدای بوون، مە گۆتێ: وەی بۆ تە تو كی؟! گۆت: هوین ب سەر من هەل بوون، ئەز دێ بۆ هەوە بێژم، ڤێجا بێژنە من هوین كینە؟ گۆتن: ئەم هندە مرۆڤین ژ عەرەبان، ئەم ل گەمییەكا دەریای سویار بووین دەریا دژوار بوو و پێلێت وێ دژوار بوون و بلند بوون و پێلان هەیڤەكێ ئەم ئیناین و برین هەتا مە خۆ گەهاندییە گزیرتا تە ڤێ، ئەم چۆینە د گەمییەكا بچویكتردا و هاتین گزیرتێ مە گیانەوەرەكێ پڕ پویرت و موی دیت مرۆڤ بەروپشتێت وی ژێك نوزانیت هندی هندی پویرتی هەی، مە گۆتێ: وەی بۆ تە، تو چی؟! گۆت: ئەز جەساسەمە، مە گۆتێ: جەساسە چییە؟ گۆت: هەرنە دەڤ ڤی زەلامێ د دێرێڤە**

---

[1] دو هۆزێت یەمەنییانن.

ب راستی ئەو زێدە پێ خەریبی بەحسێ هەومیە، و ئەم ب لەز هاتینە دەڤ تە، و ئەم ژێ ترساین و ئەم پشت راست نەبووین كو ئەو شەیتان بیت، ئینا گۆت: كا بۆ من بەحسێ دارڤەسپێت بیسان[1] بكەن مە گۆت: تە دڤێت چ ژێ بزانی؟ گۆت: ئەز پرسیارا هەوە دكەم ئەرێ دارڤەسپێت وێ فێقی ددەن؟ مە گۆتێ: بەلێ، گۆت: نێزیكە فێقی نەدەن، گۆت: بەحسێ دەریاكا تەبەرییێ بۆ من بكەن، گۆت: مە گۆتێ تو دخوازی چ ژێ بزانی؟ گۆت: ئەرێ ئاڤ تێدا هەیە؟ مە گۆت: گەلەك ئاڤ یا تێدا، گۆت، نێزیكە ئاڤا وێ بچیت، نەمینیت، گۆت: بۆ من بەحسێ كانییا زوغەر[2] بكەن مە گۆتێ: تو دخوازی چ ژێ بزانی؟ گۆت: ئاڤ د كانییا وێ هەیە و خەلكێ وێ چاندنێ ب ئاڤا كانییێ دكەن؟ مە گۆت: بەلێ ئاڤا وێ گەلەكە و خەلكێ وێ چاندنێ ل بەر ئاڤا وێ دكەن، گۆت: بەحسێ پێغەمبەرێ نەخواندەواران بكەن وی چ كر؟ گۆتن: پێ ل مەكەهێ دەركەفتی و چۆیە مەدینەیێ، گۆت: عەرەب شەرێ وی دكەن؟ مە گۆت: بەلێ، گۆت: وی چ د گەل وان كر؟ مە گۆتێ: ئەو ب سەر وان عەرەبان كەڤت یێت نێزیكی وی، و گوهدارییا وی كرن، گۆت: ئەڤە بوویە؟ مە گۆتێ: بەلێ، گۆت ئەو بۆ وان باشترە گوهدارییا وی بكەن، و ئەز دێ بەحسێ خۆ بۆ هەوە كەم، ئەز دەجالێ كۆرەمە و نێزیكە دەستویرییا من بهێتە دان ئەز دەركەڤم، ڤێجا ئەز دێ دەركەڤم ل عەردی گەرییێم ئەز د چل شەڤاندا چو گوندان ناهێلم نەچمێ ژ بلی مەكەهێ و مەدینەیێ ئەو ل سەر من د حەرامكرینە، هەر گاڤا من ڤیا بچمە د ئێك ژ واندا دێ ملیاكەتەك پێشوازییا من كەت و شیرێ رویس پێ د دەستدا، و رێ ل من دگریت و ل سەر هەر رێكەك و دەرگەهەكێ وان ملیاكەتەك پێ هەی دپارێزیت.

(فاتیمایێ) گۆت: و دەستێ خۆ ل كێلەكا خۆ دا و گۆت: **(ئەڤە تیبەیە ئەڤە تیبەیە ئەڤە تیبەیە)** - ئانكو مەدینەیە - **(ئەرێ من ئەڤە بۆ هەوە نەگۆتبوو)**؟ خەلكی گۆت: بەلێ،

---

[1] گوندەكە ل سورییێ نێزیكی نوردنێیە.

[2] گوندەكە ل شامێ یا كێم شینكاتییە.

**گۆت: (ئەز ب ئاخفتنا تەمیمی خۆش بووم ب راستی ئەو د گەل وێ هات یا من بۆ هەوە گۆتی ئەو ناهێتە د ناڤ مەکەهـ و مەدینەییێدا بزانن دەجال یێ د دەریایا شامێدا یان د دەریایا یەمەنێدا بەلکی لایێ رۆژهەلاتێ)** و بەرێ دەستێ خۆ دا رۆژهەلاتێ (فاتیمایێ) گۆت: من ئەڤە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ بەر کر.

٢٠ ـ باب: نزول عيسى.

**بابەتێ: هاتنەخوارا عیسایی.**

١٣٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَماً مُقْسِطاً، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ المَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ).** [خ٢٢٢٢، م١٥٥].

- زاد في رواية لهما: **(حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الوَاحِدَةُ خَيْراً مِنَ الدُّنْيَا وَما فِيهَا)**. ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴿١٥٩﴾﴾ [النساء]. [خ٣٤٤٨].
- وفي رواية لهما: **(كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ، وَإِمامُكُمْ مِنْكُمْ)**. [خ٣٤٤٩].

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) دبێژیت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستیدا نێزیکە کورێ مەریەمایێ د ناڤ هەوەدا بهێتە خوار و حەکەمکێ دادپەروەر بیت، ڤێجا دێ خاچێ شکێنیت و بەرازی کوژیت و زێرسەرێ (جزییێ) ناوەرگریت و ناراکەت[1] و مال دێ فویرییێت و زێدە بیت هەتا کەس پارەی ناوەرگریت).**

---

[1] چونکی ژ بلی ئیسلامێ ژ خەلکی قەبویل ناکەت.

- **و د ڤەگێرەکا هەردوویاندا زێدە هاتییە: (هەتا سوجدەیەکا ب تنێ (ل دەڤ) باشترە ژ دنیایێ و تشتێ تێدا)**[1]، پاشی ئەبو هورەیرە دبێژیت ئەگەر هەوە بڤێت بخوینن: ﴿وَإِنْ من أَهْلِ الْكِتَابِ إلا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قبل مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عليهم شَهِيدًا﴾[2].
- **و د ڤەگێرەکا هەردوویاندا: (هوین دێ چاوا بن و رەوشا هەوە دێ یا چاوا بیت[3]، ئەگەر عیسایێ کورێ مەریەمایێ هاتە خوارێ د ناڤ هەوەدا و پێشنڤێژێ هەوە هەر ژ هەوە بیت)[4].**

١٣٨ - عَنْ مُجَمِّعِ بْنِ جَارِيَةَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(يَقْتُلُ ابْنُ مَرْيَمَ الدَّجَّالَ بِبَابِ لُدٍّ)**. [ت٢٢٤٤].

* صحيح.

**ژ موجەمەعێ کورێ جارییەیێ ئەنساری دبێژیت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (کورێ مەریامایێ دێ دەجالی ل دەرگەهێ لودد کوژیت)**[5]

١٣٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ ـ يَعْنِي: عِيسَى ـ وَإِنَّهُ نَازِلٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ، رَجُلٌ مَرْبُوعٌ، إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ، بَيْنَ مُمَصَّرَتَيْنِ، كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ، وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ، فَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَيَدُقُّ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيُهْلِكُ اللهُ**

---

(١) چونکی وی دەمی کەس سەدەقەیان وەرناگریت و رێکا نێزیکبوونا خودێ ب تنێ عەبداندنا وییە.

(٢) ئانکو: چو کەس ژ خودانێت کتێبان - مەخسەد جوهی و فەلەنە - نامینن باوەرییێ ب عیسایی نەئینن بەری مرنا وی دەمێ دنێتە خوارێ بۆ کوشتنا دەجالی، و رۆژا قیامەتێ ل سەر هەمییان دێ بیتە شاهد کو وی یێ گەهاندی ئەو بەندەیێ خودێیە و پێغەمبەرە.

(٣) ئانکو: هوین ل دەڤ خودێ ب بهانە.

(٤) ئانکو: ئەو دێ نڤێژێ ل دویڤ هەوە کەت یان دێ حوکمی ب شەریعەتێ هەوە کەت.

(٥) جهەکە نێزیکی قودسێ.

فِي زَمَانِهِ المِلَلَ كُلَّهَا إِلاَّ الإِسْلاَمَ، وَيُهْلِكُ المَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ يُتَوَفَّى فَيُصَلِّي عَلَيْهِ المُسْلِمُونَ). [د٤٣٢٤].

* صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د ناڤبەرا من و ویدا ـ ئانكو عیسایی ـ چو پێغەمبەر نینن و ب راستی ئەو دێ ژ عەسمانی هێتە خوار ڤێجا وی بنیاسن ئەو زەلامەكێ ناڤنجییە نەیێ كورتە و نەیێ درێژە و بەر ب سۆروسپیاتییێڤەیە و دو جلكێت زەر یێت ل بەر هەروەكی چپك ژ سەرێ وی دكەڤن، هەرچەندە تەڕاتی نەگەهشتییێ[1]، دێ شەڕێ خەلكی سەرا ئیسلامێ كەت، و دێ خاچێ شكێنیت و بەرازی كوژیت و جزیێ راكەت و ناوەرگریت[2]، و دێ دەجالی كوژیت، و دێ چل سالان مینیتە د عەردیدا پاشی دێ مریت و خەلك دێ نڤێژێ ل سەر كەن).**

٢١ . باب: طلوع الشمس من مغربها.

**بابەتێ: هەلاتنا ڕۆژێ ژ ڕۆژئاڤایا خۆ.**

١٤٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَقُومُ السَّاعةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ فَرَآهَا النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ، فَذلِكَ حِينَ: ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾[الأنعام:١٥٨]. وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلاَنِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا فَلاَ يَتَبَايَعَانِهِ، وَلاَ يَطْوِيَانِهِ. وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ فَلاَ يَطْعَمُهُ. وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهُوَ يَلِيطُ حَوْضَهُ فَلاَ يَسْقِي فِيهِ. وَلَتَقومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلاَ يَطْعَمُهَا). [خ٦٥٠٦ (٨٥)، م١٥٧ و٢٩٥٤].

---

[1] هندی هند بژوین و پاقژە دێ بێژی ژ نوی سەرێ خۆ یێ شویشتی.

[2] ئانكۆ: ئیسلامێ پێڤەتر ژ كەسێ قەبویل ناكەت.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا رۆژ ژ رۆژئاڤاییێ دەردكەڤیت ڤێجا ئەگەر دەركەڤت و خەلكی دیت هەمی دێ باوەرییێ ئینن ئەڤە ئەو دەمە یێ** ﴿لاَ يَنفَعُ نَفْساً إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْراً﴾[1] **قیامەت دێ رابیت و دو زەلامان جلكێت خۆ یێت د ناڤبەرا خۆدا رائێخستین بەلێ نافرۆشنە ئێكدو و ناپێچن ژی، و قیامەت دێ رابیت و زەلامی حێشترا خۆ یا ل بەر زانێ یا دۆتی بەلێ ناڤەخۆت، و قیامەت دێ رابیت و ئەو یێ بركا خۆ سەخبێر دكەت بەلێ ئاڤدانێ ناكەت، و قیامەت دێ رابیت و وی پارییێ خۆ یێ بلندكری بەر دەڤێ خۆ بەلێ ناخۆت).**

٢٢ ـ باب: تقارب الزمان.

**بابەتێ: نێزیكبوونا دەمی.**

١٤١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ** الزَّمَانُ، فَتَكُونَ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَيَكُونَ الشَّهْرُ كَالجُمُعَةِ، وَتَكُونَ الجُمُعَةُ كَاليَوْمِ، وَيَكُونَ اليَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونَ السَّاعَةُ كَاحْتِرَاقِ السَّعَفَةِ الخُوصَةِ). [حم١٠٩٤٣]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا دەم نێزیكی ئێك نەبیت[2]، ڤێجا سال دێ وەكی هەیڤێ لێ هێت، و هەیڤ دێ وەكی حەفتییێ بیت و حەفتی دێ وەكی رۆژێ بیت و رۆژ دێ وەكی بیستەكێ بیت و بیستەك دێ وەكی سۆتنا پەرێ بەلگێ دارقەسپێ بیت).**

---

(١) راڤەكرنا ئایەتێ ب كورتی: رۆژا نیشانێت قیامەتێ دئێن ئێدی باوەرئینانا كەسێ مفایی ناگەهینتێ، ئەگەر بەری هنگی باوەری نەئینابیت، یان ژی باشی و قەنجی د باوەرییا خۆدا نەكربیت

(٢) یان دێ بێ بەرەكەت بیت یان ژ بەر تكنولوجیا هەڤچەرخ دویر دێ نێزیك بن یان راستی شەڤ و رۆژ دێ كورت بن یان دەمەك دێ هێت هندی هند دخوشن ئاگەهـ ژ درێژیا دەمی نینە یان هەر هندێ بەلێ زوتر دچن.

## ٢٣ ـ باب: سماع كلام السباع وغيرها.

## بابەتێ: گوهلێبونا ئاخفتنا دەهبە و غەیری وان.

١٤٢ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الْإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ، وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا أَحْدَثَ أَهْلُهُ مِنْ بَعْدِهِ**). [ت٢١٨١].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا قیامەت نارابیت هەتا دەهبە د گەل مرۆڤان دئاخڤن و هەتا زەلام د گەل رەخێ قامچیا خۆ د ئاخڤیت[1] و قەیتانا شمكا وی د گەل دئاخڤیت[2] و رانێ وی بۆ دئاخڤیت كا مالا وی د پشت ویرا چ كرییە)[3].**

## ٢٤ ـ باب: دابة الارض.

## بابەتێ: گیانەوەرێ عەردی.

١٤٣ – عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ حُذَيْفَةَ، فَذَكَرْتُ الدَّابَّةَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ رضي الله عنه: إِنَّهَا تَخْرُجُ ثَلاثَ خَرَجَاتٍ فِي بَعْضِ البَوَادِي ثُمَّ تَكْمُنُ، ثُمَّ تَخْرُجُ فِي بَعْضِ القُرَى حَتَّى يُذْعَرُوا وَحَتَّى تُهْرِيقَ فِيهَا الأُمَرَاءُ الدِّمَاءَ ثُمَّ تَكْمُنُ، قَالَ: فَبَيْنَمَا النَّاسُ عِنْدَ أَعْظَمِ المسَاجِدِ وَأَفْضَلِهَا وَأَشْرَفِها ـ حَتَّى قُلْنَا: المسْجِدُ الحَرَامُ، وَمَا سَمَّاهُ ـ إِذِ ارْتَفَعَتِ الأَرْضُ وَيَهْرُبُ النَّاسُ، وَيَبْقَى عَامَّةٌ مِنَ المسْلِمِينَ يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَنْ يُنْجِيَنَا مِنْ أَمْرِ اللهِ شَيْءٌ، فَتَخْرُجُ فَتَجْلُو وَجُوهَهُمْ حَتَّى تَجْعَلَها كَالْكَواكِبِ الدُّرِّيَّةِ وَتَتْبَعُ النَّاسَ جِيْرَانٌ فِي الرِّبَاعِ شُرَكَاءُ فِي الأَمْوالِ وَأَصْحَابٌ فِي الإِسْلامِ. [ك٨٤٩١].

* قال الذهبي: على شرطهما.

---

(١) كا وی چ ب دەستێ خۆ ب وێ قامچیێ كرییە.

(٢) كا ئەو ب پێیان چۆیە كیڤە.

(٣) و ئەڤە ل دەڤ خودێ یا ب ساناهییە كا چەوا فەرمان ل گۆشتێ چێلێ كر د سەرهاتییا ئیسرائیلییاندا باخڤیت و ئاشكرا بكەت كوژەك كییە هۆسا هەمی تشت ل دەڤ خودێ ب ساناهینە.

ژ توفەیلی (ﷺ) گۆت: ئەم ل دەڤ حوزەیفەی د روینشتی بووین و بەحسێ گیانەوەرێ عەردی هاتە کرن، ئینا حوزەیفەی (ﷺ) گۆت: ئەو گیانەوەر دێ سێ دەرکەفتنان دەرکەڤیت، ل هندە دەشتان پاشی دێ بەرزە بیت، پاشی دێ ل هندە گوندان دەرکەڤیت هەتا د ترسن و هەتا میر خوینێ بۆ درێژن، پاشی دێ بەرزە بیت، گۆت: د دەمەکیدا خەلك یێ ل دەڤ مەزنترین و بهاترین و بەرزترین مزگەفت - هەتا مە گۆت مەبەست مزگەفتا کەعبێیە و ناڤ نەکر - عەرد دێ بلند بیت و خەلك (یێت نەموسلمان) دێ رەڤن، و گشت موسلمان دێ مینن و دێ بێژن: ب راستی چو مە ژ کارێ خودێ رزگار ناکەت، ڤێجا دێ ئەو گیانەوەر دەرکەڤیت دێ سەروچاڤێت وان رۆن و برسقی کەت هەتا وەکی ستێرێت گەش لێ دهێن و خەلك دبنە ئێك ژ سێیان جیرانن د ئێك کراسدا هەڤپشکن د مالاندا و هەڤالن د ئیسلامەتیێدا.

١٤٤ - عَنْ أَبِي هريرة: أنَّ رسول الله (ﷺ) قَالَ: (تَخرُجُ الدَّابَّةُ ومعَها خاتمُ سُلَيْمانَ بنِ داودَ، وعَصا موسى بنِ عمرانَ، عليهِما السَّلامُ، فتجلو وجهَ المؤمنِ بالعَصا، وتخطِمُ أنفَ الكافرِ بالخاتمِ، حتَّى أنَّ أَهْلَ الحواءِ ليجتَمعونَ، فيقولُ هذا: يا مؤمِنُ! ويقولُ هذا: يا كافِرُ)(١)

[ت٣١٨٧/ جه٤٠٦٦].

* ضعيف.

---

(١) شێخ سالحی نەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ نینایە: ١٤٤ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (تَخْرُجُ الدَّابَّةُ فَتَسِمُ النَّاسَ عَلَى خَرَاطِيمِهِمْ، ثُمَّ يَغْمُرُونَ فِيكُمْ حَتَّى يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ البَعِيرَ، فَيَقُولُ: مِمَّنْ اشْتَرَيْتَهُ؟ فَيَقُولُ: اشْتَرَيْتُهُ مِنْ أَحَدِ المخَطَّمِينَ). وقَالَ يُونُسُ بْنُ مُحَمَّدٍ: (ثُمَّ يُعَمَّرُونَ فِيكُمْ). وَلَمْ يَشُكَّ، قَالَ: فَرَفَعَهُ. [حم٢٢٣٠٨].

* إسناده صحيح. [وانظر: ٢٣، ٩٧ - ٩٩].

ژ نەبی نومامەی (ﷺ) دگەهینیتە پێغەمبەری (ﷺ) دبێژیت: (گیانەوەر دێ دەرکەڤیت و دێ خەلکی نیشان کەت ل سەر دفنێت وان، پاشی دێ ژییەکێ درێژ د ناڤ هەوەدا بەن، هەتا ئێك حێشترەکێ دکریت دێ بێژیت: تە ژ کێ کرییە؟ دێ بێژیت: من یا ژ ئێکێ دفن نیشانکری کری) و یونسێ کورێ موحەممەدی گۆت: (پاشی دێ عەمر درێژ بن). و ب گۆمان نە کەفت و بلندکر.

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (گیانەوەر دێ دەرکەڤیت و گوستیرکا سولەیمانێ کورێ داوودی و چویڤێ مووسایێ کورێ عیمرانی (سلاڤ ل سەر هەردویان بن) یێ د گەلدا، دێ سەروچاڤێت باوەریداری ب چویڤی رۆن و سپی کەت و دفنا گاوری ب گوستیرکێ نیشان کەت، هەتا خەلکێ ل سەر ئاڤێ ئاکنجی بووین دێ کۆم بن و دێ بێژن: ئەڤە باوەریدارە و ئەڤە گاورە).

٢٥ ـ باب:ما جاء بشان ياجوج وماجوج.

بابەتێ: ئەو تشتێ د راستا یەئجووج و مەئجووجاندا هاتی.

١٤٥ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (تُفْتَحُ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، فَيَخْرُجُونَ كَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾[الأنبياء:٩٦] فَيَعُمُّونَ الأَرْضَ، وَيَنْحَازُ مِنْهُمْ الْمُسْلِمُونَ، حَتَّى تَصِيرَ بَقِيَّةُ الْمُسْلِمِينَ فِي مَدَائِنِهِمْ وَحُصُونِهِمْ، وَيَضُمُّونَ إِلَيْهِمْ مَوَاشِيَهُمْ، حَتَّى إِنَّهُمْ لَيَمُرُّونَ بِالنَّهَرِ فَيَشْرَبُونَهُ حَتَّى مَا يَذَرُونَ فِيهِ شَيْئاً، فَيَمُرُّ آخِرُهُمْ عَلَى أَثَرِهِمْ، فَيَقُولُ قَائِلُهُمْ: لَقَدْ كَانَ بِهَذَا المَكَانِ مَرَّةً، مَاءٌ! وَيَظْهَرُونَ عَلَى الأَرْضِ، فَيَقُولُ قَائِلُهُمْ: هَؤُلاَءِ أَهْلُ الأَرْضِ قَدْ فَرَغْنَا مِنْهُمْ، وَلَنُنَازِلَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَهُمْ لَيَهُزُّ حَرْبَتَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ مُخَضَّبَةً بِالدَّمِ، فَيَقُولُونَ: قَدْ قَتَلْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ! فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذْ بَعَثَ اللهُ دَوَابَّ كَنَغَفِ الجَرَادِ، فَتَأْخُذُ بِأَعْنَاقِهِمْ فَيَمُوتُونَ مَوْتَ الجَرَادِ، يَرْكَبُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً. فَيُصْبِحُ الْمُسْلِمُونَ لاَ يَسْمَعُونَ لَهُمْ حِسّاً، فَيَقُولُونَ: مَنْ رَجُلٌ يَشْرِي نَفْسَهُ، وَيَنْظُرُ مَا فَعَلُوا؟ فَيَنْزِلُ مِنْهُمْ رَجُلٌ قَدْ وَطَّنَ نَفْسَهُ عَلَى أَنْ يَقْتُلُوهُ، فَيَجِدُهُمْ مَوْتَى، فَيُنَادِيهِمْ: أَلاَ أَبْشِرُوا! فَقَدْ هَلَكَ عَدُوُّكُمْ، فَيَخْرُجُ النَّاسُ، وَيُخْلُونَ سَبِيلَ مَوَاشِيهِمْ، فَمَا يَكُونُ لَهُمْ رَعْيٌ إِلاَّ لُحُومُهُمْ، فَتَشْكَرُ عَلَيْهَا؛ كَأَحْسَنِ مَا شَكِرَتْ مِنْ نَبَاتٍ أَصَابَتْهُ قَطُّ). [جه٤٠٧٩]

* حسن صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ گۆت: **(دێ رێك ل یەئجووج و مەئجووجان هێتە ڤەکرن ڤێجا دێ دەرکەڤن هەر وەکی خودایێ هەر بلند گۆتی: ﴿من کل حَدَبٍ يَنْسِلُونَ﴾ ئەو ژ هەمی جهێت بلند ب لەز دادکەڤن[1]، دێ عەردی هەمییێ گرن و پڕ کەن، و موسلمان دێ خۆ ژ وان پارێزن هەتا موسلمانێت مایین د باژێر و کەلهێت خۆدا کۆم دبن و پەزێت خۆ ژی دێ د گەل خۆ دانن، هند گەلەکن هەتا ئەو د بەر رویبارێرا دچن دێ ئاڤا رویباری ڤەخۆن و تشتەکی تێ ناهێلن، هەتا یێ دویماهییێ د دویڤ وانرا دهێت ڤێجا ئێك ژ وان دێ بێژیت ب راستی جارەکێ ئاڤ ل ڤێرێ هەبوو، و دێ ب سەر یێت عەردی کەڤن و ئێك ژ وان دێ بێژیت: ئەڤە ئەم ژ خەلکێ عەردی ب دویماهی هاتین، دێ چینە شەڕێ خەلکێ عەسمانی هەتا ئێك ژ وان دێ رما خۆ هەژینیت هاڤێتە عەسمانی دێ زڤریت ب خوینێ سۆرکری[2] دێ بێژن: ب راستی مە خەلکێ عەسمانا کوشت، و د دەمەکیدا ئەو دێ د هۆسا بن، خودێ دێ کرمەکی ئەوێ دکەڤیتە بن دفنێت حێشتران هنێریت دێ پاتکێت وان گریت ڤێجا دێ مرن مرنا کولییان[3] هەتا هندەك دکەڤنە سەر هندەکان، موسلمان دێ وەلێ هێن گوهـ ل دەنگێ وان نابن، دێ بێژن: کی هەیە رحا خۆ بفرۆشیت بەرێ خۆ بدەتێ کا وان چ کر؟ زەلامەك ژ وان دێ هێتە خوارێ خۆ بەرهەڤ کری بهێتە کوشتن، ڤێجا دێ بینیت د مرینە، دێ گازی وان کەت مزگینی ل هەوە دژمنێ هەو ژ ناڤ چۆ و نەما، ڤێجا خەلك دێ دەرکەڤن و پەزێ خۆ دێ بەردەن، و پەزێ وان چەرە نابیت بخۆن هەر گۆشتێ خۆ نەبیت[4] دێ پێ قەلەو بن قەلەوییەکا باشتر ب شینکاتی قەلەو دبیت).**

---

[1] هندی هند گەلەکن. ژ شەمی ریکاں سێن، ب: حرابییێ بکەں.

[2] هەلبەت ئەڤە بۆ ئەزموونکرنا وانە.

[3] ئانکو: ب هژمارەکا زۆر.

[4] و ئەڤە ژی ب فەرمانا خودێ چونکی پەز گۆشتی ناخۆت بەلێ چونکی چەرە نینە هەر گۆشتێ وان دێ بیتە خوارنا وان و خودێ ل سەر هەمی تشتان خودان شیانە.

١٤٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ يَحْفِرُونَ كُلَّ يَوْمٍ، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا فَسَنَحْفِرُهُ غَداً، فَيُعِيدُهُ اللهُ أَشَدَّ مَا كَانَ. حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ مُدَّتُهُمْ، وَأَرَادَ اللهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلَى النَّاسِ، حَفَرُوا، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا، فَسَتَحْفِرُونَهُ غَداً، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى، وَاسْتَثْنَوْا، فَيَعُودُونَ إِلَيْهِ، وَهُوَ كَهَيْئَتِهِ حِينَ تَرَكُوهُ، فَيَحْفِرُونَهُ وَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ فَيُنْشِفُونَ الْمَاءَ، وَيَتَحَصَّنُ النَّاسُ مِنْهُمْ فِي حُصُونِهِمْ، فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ عَلَيْهَا الدَّمُ الَّذِي اجْفَظَّ. فَيَقُولُونَ: قَهَرْنَا أَهْلَ الْأَرْضِ، وَعَلَوْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ! فَيَبْعَثُ اللهُ نَغَفاً فِي أَقْفَائِهِمْ، فَيَقْتُلُهُمْ بِهَا).

قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ دَوَابَّ الْأَرْضِ لَتَسْمَنُ وَتَشْكَرُ شَكَراً مِنْ لُحُومِهِمْ) واللفظ لابن ماجه. [ت٣١٥٣/ جه٤٠٨٠].

* صحيح.

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی یەئجووج و مەئجووج هەر رۆژ دێ دیوارێ بەرسینگێ وان ژ لایێ زیلقەرنەینی هاتییە دانان کۆلن هەتا نێزیك بووین تیرۆژکا رۆژێ ببینن، ئەوێ ل سەر سەرێ وان دێ بێژیت: بزڤرن سوبەهی دێ کۆلین، ڤێجا خودێ دێ ژ یا بەرێ ب هێزتر و موکمتر زڤرینیت هەتا دگەهنە دەمێ خۆ و خودێ ڤیا وان د سەر خەلکیڕا بهنێریت دێ کۆلن هەتا نێزیك دبن تیرۆژکا رۆژێ دبینن ئەوێ ل سەر سەرێ وان دێ بێژیت: بزڤرن سوبەهی ب ئانەهییا خودێ دێ کۆلین، گۆت: ب ئانەهییا خودێ، ڤێجا دێ زڤرنەڤێ وەکی وێیە دەمێ هێلاین ڤێجا دێ کۆلن و دێ دەرکەڤنە ناڤ خەلکی دێ ئاڤێ ڤەخۆن و دێ هشککەن، و خەلك د کەلهێت خۆدا دێ خۆ ژ وان پارێزن و ئەو دێ تیرێت خۆ هاڤێژنە عەسمانی دێ زڤرن خوین پێڤە، دێ بێژن: مە خەلکێ عەردی بن دەست کرن و ئەم ب سەر خەلکێ عەسمانی ژی کەفتین، خودێ دێ کرمێ دفنا حێشتران هنێریت دێ پشت پاتکا سەرێ وان گریت و دێ وان پێ کوژیت).

**پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من و کارێ من د دەستێ ویدا و گیانەوەرێت عەردی دێ قەلەو بن ژ گۆشتێ خۆ)[1].**

## ٢٦ : باب المهدي.

## بابەتێ: مەهدی.

١٤٧ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود، عَن النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ، لَطَوَّلَ اللهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ، حَتَّى يَبْعَثَ فِيهِ رَجُلاً مِنِّي . أَوْ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي .، يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي، وَاسْمَ أَبِيهِ اسْمَ أَبِي، يَمْلأُ الْأَرْضَ قِسْطاً وَعَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ ظُلْماً وَجَوْراً**). [د٤٢٨٢/ ت٢٢٣٠].

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر چو ژ دنیایێ نەمابیت رۆژەك نەبیت، خودێ وێ رۆژێ دێ درێژکەت هەتا زەلامەکی تێدا دهنێریت ژ منە یان ژ خەلکێ مالا منە نافێ وی وەکی نافێ منە و نافێ بابێ وی وەکی نافێ بابێ منە، عەردی دێ تژی عەدل و داپەروەری کەت هەروەکی تژی زولم و ستەم بوویی).**

١٤٨ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**الْمَهْدِيُّ مِنْ عِتْرَتِي، مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ**). [د٤٢٨٤/ جه٤٠٨٦].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمێ (رضي الله عنها) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (مەهدی ژ مرۆڤێت من یێت تایبەتن ژ نفشێ فاتمایێ).**

(١) چونکی یەئجووج و مەئجووج چەرە نەهێلایە و دێ ژ گۆشتێ خۆ خۆن.

١٤٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَخْرُجُ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: السُّفْيَانِيُّ، فِي عُمْقِ دِمَشْقَ، وَعَامَّةُ مَنْ يَتْبَعُهُ مِنْ كَلْبٍ، فَيَقْتُلُ حَتَّى يَبْقِرَ بُطُونَ النِّسَاءِ وَيَقْتُلَ الصِّبْيَانَ، فَتَجْمَعَ لَهُمْ قَيْسُ فَيَقْتُلُها حَتَّى لا يَمْنَعَ ذَنَبٌ تَلْعَةً، وَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي فِي الحَرَّةِ فَيَبْلُغُ السُّفْيَانِيَّ، فَيَبْعَثُ إِلَيْهِ جُنْداً مِنْ جُنْدِهِ فَيَهْزِمُهُمْ، فَيَسِيرُ إِلَيْهِ السُّفْيَانِيُّ بِمَنْ مَعَهُ حَتَّى إِذَا صَارَ بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ فَلا يَنْجُو مِنْهُمْ إِلاَّ الْمُخْبِرُ عَنْهُمْ**). [ك٨٥٨٦].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەلامەك ل رەخێ دیمەشقێ دێ دەركەڤیت دبێژنێ سوفیانی، و پترییا ل دویڤ دچن ژ هۆزا كەلبیانە دێ كوشتنێ كەت هەتا زكێ ژنان دێ دڕینیت و زاڕۆكان كوژیت، هۆزا قەیسییان دێ بۆ كۆم بن دێ وان كوژیت هەتا كوشتنەكا مەزن دئێخیتە د ناڤدا و زەلامەك ژ خەلكێ مالا من ل حورەیا مەدینەیێ دێ دەركەڤیت دێ گەهیتە سوفیانی و دێ هندە سەربازان ژ سەربازێت خۆ بۆ هنێریت دێ وی شكێنن، ڤێجا سوفیانی و د گەل وان یێت د گەلدا ماین دێ بۆ وی دەركەڤن و دێ چن هەتا دگەهنە جهەكێ دەشت و بەرفرەه ژ عەردی خودێ دێ وان د عەردیدا بەت و كەس ژ وان رزگار نابیت ئەو نەبیت یێ دەنگ و بەحسێ وان لێ خەبەر دایی).**

١٥٠ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي المَهْدِيُّ، يَسْقِيهِ اللهُ الغَيْثَ، وَتُخْرِجُ الأَرْضُ نَبَاتَهَا، وَيُعْطِي المَالَ صِحَاحاً، وَتَكْثُرُ المَاشِيَةُ، وَتَعْظُمُ الأُمَّةُ، يَعِيشُ سَبْعاً أَوْ ثَمَانِياً**). يَعْنِي حِجَجاً. [ك٨٦٧٣].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دویماهییا ئوممەتا من دێ مەهدی دەركەڤیت خودێ دێ بارانێ دەتێ و عەرد دێ شینكاتییا خۆ**

**دەرئێخیت و پارەی وەکی ئێك دێ دەت، و پەز دێ مشە بیت و ئوممەت دێ مەزن بیت، حەفت یان هەشت سالان دێ ژیت).**

٢٧ . باب المسخ والخسف بين يدي الساعة.

**بابەتێ: گوهرین و د عەردداچوون بەری رۆژا قیامەتێ**

١٥١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ**). [حب٦٧٥٩].

* إسناده حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا عەردداچۆن و گوهراندن وەرگێراندن[1] و بەرباراندن د ئوممەتا مندا چێ دبن).**

٢٨ . باب رفع القرآن.

**بابەتێ: قورئان بلندبوونێ**

١٥٢ . عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: (يُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللَّهِ فَيُرْفَعُ إِلَى السَّمَاءِ، فَلَا يُصْبِحُ فِي الْأَرْضِ آيَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ وَلَا مِنَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَلَا الزَّبُورِ، وَيُنْتَزَعُ مِنْ قُلُوبِ الرِّجَالِ فَيُصْبِحُونَ وَلَا يَدْرُونَ مَا هُوَ). [ك٨٥٤٤].

قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: شەڤ دێ ب سەر کتێبا خودێدا هێت و دێ بۆ عەسمانی هێتە بلندکرن و ئایەتەك نە ژ قورئانێ نە ژ تەوراتێ نە ژ ئنجیلی نە ژ زەبوورێ د**

**[1] گوهراندن وەرگێرانا وێنەی ژ رەنگەکی بۆ ئێکێ کەشەفرێت.**

**عەردیدا نامینیت و دێ ژ دلێ زەلامان هێنە کێشان، ڤێجا دێ سپێدە ل وان بیت و ئەو نوزانن ئەو چییە.**

٢٩ ـ احالات.

**ناراستەکرن.**

[انظر في قرب الساعة: ٣٢٧٩.

وانظر من علامات الساعة اتباع الأمم السابقة: ٨٤٣.

وانظر بشأن الدابة: ٢٣، ٩٧- ٩٩].



## الفصل الثاني: صفات القيامة

## پشکا دووێ: سالۆخەتێت قیامەتێ.

### ١ . باب: قيام الساعة على شرار الناس.

### بابەتێ: رابوونا قیامەتێ ل سەر خرابێت مرۆڤان.

١٥٣ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُوْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ عَلَى شِرَارِ النَّاسِ**). [م٢٩٤٩].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت ل سەر سەرێ خرابێت مرۆڤان نەبیت).**

١٥٤ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ: اللهُ، اللهُ**). [م١٤٨].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا ئەللاه ئەللاه د ئەردیدا نەهێتە گۆتن).**

١٥٥ - عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ أَسْعَدَ النَّاسِ بِالدُّنْيَا لُكَعُ ابْنُ لُكَعٍ**). [ت٢٢٠٩].

* صحيح.

**ژ حوزەیفەیێ یەمانی، (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا مرۆڤێ ژ هەمیان ب دنیایێ دلخۆشتر بێخێر کورێ بێخێری نەبیت).**

٢ ـ باب : الصور ومابين النفخين.

**بابەتێ: بووقێ و یا د ناڤبەرا هەردو پفاندا.**

١٥٦ – **(ق)** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ما بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ)**، قالَ: أَرْبَعُونَ يَوْماً؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قالَ: أَرْبَعُونَ شَهْراً؟ قالَ: أَبَيْتُ، قَالَ: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: **(ثُمَّ يُنْزِلُ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ ماءً، فَيَنْبُتُونَ كما يَنْبُتُ البَقْلُ، لَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلاَّ يَبْلَى، إِلاَّ عَظْماً وَاحِداً وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الخَلْقُ يَوْمَ القِيَامَةِ)**

[خ٤٩٣٥، (٤٨١٤)/ م٢٩٥٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(د ناڤبەرا هەردو پفكرنێت بووقێدا چلن).** گۆتن ئەی ئەبو هورەیرە، چل رۆژن؟ گۆت: من نەڤێت دەستنیشان بكەم، گۆتن چل هەیڤن؟ گۆت: من نەڤێت دەستنیشان بكەم، گۆتن چل سالن؟ گۆت: من نەڤێت دەستنیشان بكەم، گۆت: **(پاشی دێ خودێ ئاڤەكێ ژ عەسمانان بارینیت دێ شین بن هەرومكی كەسكاتی شین دبیت، نینە تشتەك ژ مرۆڤی ئەگەر پویچ نەبیت، هەستیكەكێ ب سەرێ كەلێژیێڤە نەبیت (دبێژنێ: عجب الذنب) و ژ وی رۆژا قیامەتێ مرۆڤ دێ شین بن).**

١٥٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الصُّورُ قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ)**.

[د٤٧٤٢/ ت٢٤٣٠/ مي٢٨٤٠].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت **(بووق شاخەكە پف دكەنێ).**

١٥٨ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**كَيْفَ أَنْعَمُ، وَصَاحِبُ القَرْنِ قَدْ التَقَمَ القَرْنَ، وَاسْتَمَعَ الإِذْنَ، مَتَى يُؤْمَرُ بِالنَّفْخِ؛ فَيَنْفُخُ**)، فَكَأَنَّ ذَلِكَ ثَقُلَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ لَهُمْ: (**قُولُوا: حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ، عَلَى اللهِ تَوَكَّلْنَا**). [ت٢٤٣١].

* صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز چاوا دێ خۆشییێ بەم، و خودانێ بووقێ، دەڤێ خۆ یێ ب بووقیڤە نای، و گوهێ وی یێ ل دەستویردانێ، کا دێ کەنگی فەرمانا وی ب پفکرنێ هێتە کرن، دا پفکەتێ)**. هەروەکی ئەڤە یا گران بوو ل سەر هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا گۆتە وان: بێژن: **(خودێ بەسی مەیە و ئەو باشترین پارێزەرە)**.

١٥٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ طَرْفَ صَاحِبِ الصُّورِ مُذْ وُكِّلَ بِه مُسْتَعِدٌّ، يَنْظُرُ نَحْوَ العَرْشِ مَخَافَةَ أَنْ يُؤْمَرَ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْهِ طَرْفُهُ، كَأَنَّ عَيْنَيهِ كَوْكَبَانِ دُرِّيَّانِ**). [ك٨٦٧٦].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی چاڤێت خودانێ بووقێ زلن نادانیتە سەرێك و د بەرهەڤن ئەڤە پێ هاتییە سپاردن بەرێ خۆ ددەتە لایێ عەرشی ژ ترسا هندێ فەرمانا وی بهێتە کرن هێژ بەرێ چاڤێ خۆ نەزڤراندی، دێ بێژی چاڤێت وی دو ستێرێت گەشن)**.

باب: صفة الشمس والقمر.

**بابەتێ: سالۆخەتێ رۆژێ و هەیڤێ.**

١٦٠ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الشَّمْسُ وَالقَمَرُ مُكَوَّرَانِ يَوْمَ القِيَامَةِ**). [خ٣٢٠٠].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(رۆژ و هەیڤ رۆژا قیامەتێ د پێچاینە و رۆناهی ژ وان یا کێشایە)**.

## ٤ ـ باب: الأرض يوم القيامة.

## بابەتێ: عەرد ل رۆژا قیامەتێ.

١٦١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**يَقْبِضُ اللهُ الأَرْضَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا المَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ**).

[خ٧٣٨٢، (٤٨١٢)/ م٢٧٨٧].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (رۆژا قیامەتێ خودێ دێ عەردی كۆمكەتە سەرێك و نامینیت و عەسمانی ب هێزا[1] خۆ وەردبێچیت و ناهێلیت پاشی دێ بێژیت: ئەز شاهم[2] كانێ شاهێت عەردی).**

١٦٢ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ [إبراهيم:٤٨]، فَأَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟! فَقَالَ: (**عَلَى الصِّرَاطِ**). [م٢٧٩١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ گۆتنا خودێ ﴿يوم تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غير الأرض وَالسَّمَاوَاتُ﴾[3]. وێ رۆژێ خەلك دێ ل كیرێ بن، ئینا گۆت: (دێ ل سەر پرا سیراتێ بن).**

## ٥ ـ باب: في الحشر.

## بابەتێ: بەحسێ كۆمكرنێ.

١٦٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاَثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ، وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلاَثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ. وَتَحْشُرُ**

---

(١) یان ب دەستێ خۆ یێ راستێ و بێی چاوایيكرن.

(٢) ئانكو: بەس ئەزم خودان كانێ خودانێت عەردی.

(٣) رامان ب كورتی: رۆژا ئەڤ ئەردە ب ئەردەكێ دی، و ئەسمان ب هندەك ئەسمانێت دی دئێنە گوهۆڕین.

بِقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قالُوا، وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا). [خ٦٥٢٢/ م٢٨٦١].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خەلك ب سێ رەنگان یان ل سەر سێ جوینان دێ کۆم بن[1]، هیڤیدارن[2] و ب ترسن[3]، دو ل سەر حێشترەکێ[4] و سێ ل سەر حێشترکێ و چار ل سەر حێشترەکێ و دەھ ل سەر حێشترەکێ و یێت مایی ژ وان (کو جوینێ سێیێنە) ئاگرەك[5] دێ وان کۆم کەت نیڤرۆ د گەل وانە ل کیرێ ل وان نیڤرۆ بوو و ب شەڤ د گەل وانە ل کیرێ شەڤ ل وان بوو و سپێدێ د گەل وانە ل کیرێ سپێدە ل وان بوو ئێڤاری د گەل وانە ل کیرێ ئێڤار ل وان بوو).**

١٦٤ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً**). قَالَتْ عائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ فَقَالَ: (**الأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يُهِمَّهُمْ ذَاكِ**). [خ٦٥٢٧/ م٢٨٥٩].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هوین رۆژا قیامەتێ دێ پێخواس و رویس و نەسونەتکری هێنە کۆمکرن)، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ زەلام و ژن پێکڤە! دێ بەرێ خۆ دەنە ئێکدو؟ گۆت: (ئەی عائیشا کراسێ ئەو تێدا ژ هندێ مەزنترە ئەو وێ خەمێ بخۆن).**

---

[1]- هەلبەت ئەڤە بەری قیامەتێ ب دەمەکێ کێم.

[2]- ئەون یێت ب هیڤی، نە وان ترس ل سەرە و نە ب خەم دکەڤن، ئەڤە جوینێ ئێکێنە.

[3]- ژ ئاگری دترسن و دیسا دترسن خودێ ل وان نەبۆریت بەلێ دویماهییێ ئەو ژی دێ رزگار بن، و ئەڤە جوینێ دووێنە.

[4] پێکڤە یان ب نۆبانە.

[5] ژ یەمەنێ دێ دەرکەڤیت.

١٦٥ - (ق) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً**، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿**كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ**﴾ [الأنبياء:١٠٤]، **فَأَوَّلُ مَنْ يُكْسى إِبْرَاهِيمُ**). [خ٣٤٤٧، م٢٨٦٠].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو شیرەت و وەعزەك ل مە كر و گۆت: (گەلی مرۆڤان ب راستی هوین پێخواس و رویس و نەسونەتكری دێ ل دەڤ خودێ كۆم بن، پاشی ئەڤە خواند:** ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾[1]**. بزانن یێ ئێكێ ژ جێكرییان رۆژا قیامەتێ ب جلك دكەڤیت ئیبراهیمە).**

١٦٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالِمِينَ مِقْدَارَ نِصْفِ يَوْمٍ مِنْ خمسِينَ ألفِ سنةٍ، يُهَوَّنُ ذلكَ عَلَى المُؤمنينَ كَتَدَلِّي الشَّمْسِ لِلغُروبِ إلى أَنْ تَغْرُبَ**). [حب٧٣٣٣].

* إسناده صحيح على شرط البخاري.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خەلك دێ قەدەری نیڤ رۆژاقیامەتێ[2] ژ پێنجی هزار سالان بەرامبەر خودێ راوەستن، ئەڤە دێ ل سەر باوەریداران سڤك بیت وەكی رۆژ بۆ ئاڤابوونێ دادكەڤیت هەتا ئاڤا دبیت).**

---

(1) ئانكو: جارا ئێكێ مە ئەو چاوا چێ كربوون، وەسا ئەم دێ وان زڤرینینەڤە ئانكو كا مە چاوا ئەو ژ زكێت دەیكێت وان، پێخواس و رویس و نەسونەتكری دان، رۆژا قیامەتێ ژی وەسا ئەم دێ وان زڤرینینەڤە ، و ئەڤە پەیمانەكە ل سەر مە دڤێت ب جه بێت ، و ئەم دێ هەر ب جه ئینین.

(٢) نیڤ رۆژ دبیتە (٥٠٠) سال، چونكی هەر رۆژەك هینگێ ل دەڤ خودێ تەمەت (١٠٠٠) سالێت مەیە یێت ئەم دهەژمێرین، هەروەكی ئەڤ چەندە د قورئانێدا هاتی: (وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ) ئانكو: ب راستی هزار سالێت هەوە، رۆژەكە ل دەڤ خودێ.

٦ ـ باب: صفة ارض المحشر.

**بابەتێ: سالۆخەتێ عەردێ كۆمگەهێ (مەحشەرێ).**

١٦٧ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ القِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ، كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ**). قالَ سَهْلٌ أَوْ غَيْرُهُ: لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ [خ٦٥٢١/ م٢٧٩٠].

ژ سەهلێ كورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(رۆژا قیامەتێ مرۆڤ ل سەر عەردەكێ سپیتالە[1] وەكی نانا ئارەكێ پاك و بێ بێژك دێ كۆم بن).**

سەهلی یان ئێكێ دی گۆت: چ نیشان و شوینوار كەسێ لێ نینن[2].

٧ ـ باب اهوال يوم القيامة.

**بابەتێ: ئازار و نەخۆشییێت رۆژا قیامەتێ.**

١٦٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قالَ: (﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ۝٦﴾ [المطففين]، **حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ في رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ**).

[خ٤٩٣٨/ م٢٨٦٢].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (﴿يوم يَقُومُ الناس لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ مرۆڤ رۆژا قیامەتێ ب فەرمانا خودێ دێ ژ گۆڕان رابن (و دێ ل مەیدانا حەشرێ مینن) هەتا ئێك ژ وان حەتا نیڤا گوهێت خۆ دچیتە د خوها خۆڕا).**

[1] سپییێ ب سەر سۆریڤە.

[2] ئانكو: دەشتە و بێ نیشانە بێی گرە بێژی گرێ هە یان بەرێ هە یان رێكا هە.

١٦٩ - (م) عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ، حَدَّثَنِي المِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنَ الخَلْقِ، حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ).**

قَالَ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ: فَوَاللهِ مَا أَدْرِي مَا يَعْنِي بِالمِيلِ؛ أَمَسَافَةَ الأَرْضِ، أَمِ المِيلَ الَّذِي تُكْتَحَلُ بِهِ العَيْنُ؟

قَالَ: **(فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي العَرَقِ: فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ العَرَقُ إِلْجَاماً).**

قَالَ: وَأَشَارَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ. [م٢٨٦٤].

**ژ سولەیمێ كوڕێ عامری گۆت: میقدادێ كوڕێ ئەسوەدی گۆتە من: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (رۆژ، رۆژا قیامەتێ دێ نێزیكی مرۆڤان بیت هەتا تەممەت میلەكی نێزیكی وان دبیت).**

**سولەیمێ كورێ عامری ژ میقدادی ڤەگێرایی، گۆت: ئەز ب خودێ كەم، ئەز نوزام مەخسەد ب میلی چییە؟ ئەرێ میلێ پیڤانا عەردییە یان كلچیڤكێ كلییە یێ چاڤی پێ كل ددەن.**

**و گۆت: (و مرۆڤ هەر ئێك تەممەت كار و كریارێت خۆ یێ د خوها خۆدا، هندەك ژ وان هەتا گۆزەكێت خۆ، و هندەك ژ وان هەتا چۆكێت خۆ، و هندەك ژ وان هەتا سەر كماخێت خۆ، و هندەك ژ وان خوه ب دورستی دێ دەڤێ وان گریت).**

**و گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئیشارەت كرە دەڤێ خۆ.**

## ٨ ـ باب: الشفاعة والمقام المحمود.

## بابەتێ: مەهدەرێ و جهێ پەسنكری.

١٧٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا نَهْسَةً، ثُمَّ قَالَ: **(أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذلِكَ؟ يَجْمَعُ**

اللهُ النَّاسَ الأَوَّلِينَ وَالآخَرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمُ البَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الغَمِّ وَالكَرْبِ مَا لاَ يُطِيقُونَ وَلاَ يَحْتَمِلُونَ، فَيَقُولُ النَّاسُ: أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلاَ تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: عَلَيْكُمْ بِآدَمَ.

فَيَأْتُونَ آدَمَ عليه السلام، فَيَقُولُونَ لَهُ: أَنْتَ أَبُو البَشَرِ، خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ المَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ، أَلاَ تَرَى إِلَى ما قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ.

فَيَأْتُونَ نُوحاً، فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ، إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَقَدْ سَمَّاكَ اللهُ عَبْداً شَكُوراً، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي عزّ وجل قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، ولَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ.

فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ، أَنْتَ نَبِيُّ اللهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ كُنْتُ كَذَبْتُ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ –فَذَكَرَهُنَّ أَبُو حَيَّانَ فِي الحَدِيثِ– نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسى.

فَيَأْتُونَ مُوسى، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسى، أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، فَضَّلَكَ اللهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلا تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْساً لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسى.

فَيَأْتُونَ عِيسى، فَيَقُولُونَ: يَا عِيسى، أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، وَكَلِمَتُهُ أَلقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي المَهْدِ صَبِيّاً، اشْفَعْ لَنَا، أَلاَ تَرَى إِلَى ما نَحْنُ فِيهِ؟ فَيَقُولُ عِيسى: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ اليَوْمَ غَضَباً لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ قَطُّ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ –وَلَمْ يَذْكُرْ ذَنْباً– نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ (ﷺ).

فَيَأْتُونَ مُحَمَّداً (ﷺ)، فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ! أَنْتَ رَسُولُ اللهِ، وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، وَقَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ العَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِداً لِرَبِّي عزّ وجل، ثُمَّ يَفْتَحُ اللهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئاً لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي، ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ! ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ: أُمَّتِي يَا رَبِّ! أُمَّتِي يَا رَبِّ! فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ! أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ البَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الجَنَّةِ، وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ، ثمَّ قالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنَّ مَا بَيْنَ المِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ، أَوْ: كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى).

[خ٤٧١٢ (٣٣٤٠)/ م١٩٤]

- والذي في مسلم: (بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرٍ).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل مێڤاندارییەکێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) زەند پێشکێشی وی کر و وی حەژێ دکر لەقەك لێدا و گۆت: (رۆژا قیامەتێ ئەز سەرداریێ خەلکیمە، هوین دزان ئەو ژ چییە؟ خودێ پێت دەستپێکێ و پێت دویماهییێ دێ ل عەردەکی کۆم کەت، راگر دێ وان راگریت و گازیکەر دێ وان گولێ کەت و رۆژ دێ نێزیکی وان بیت، و هند خەم و کۆڤان دێ بۆ خەلکی چێ بیت خۆ ل بەر نەگرن، خەلك دێ بێژن: هوین نابینن یا هوین تێدا و یا هوین گەهشتینێ؟ هوین بەرێ خۆ نادەنێ ئێك بەرڤانی و مەهدەرێ ل دەڤ خودایێ هەوە بۆ هەوە بکەت؟ هندەك خەلك دێ بێژنە ئێکدو: بابێ هەوە ئادەمە.**

**و دێ هێنە دەڤ و دێ بێژن: یا ئادەم تو بابێ مرۆڤانی، خودێ ب دەستێ خۆ تو پێ چێ کری، و روح یا دایە تە، و فەرمانا ملیاکەتان کر بۆ تە چۆنە سوجدەیێ و تو ل بەحەشتێ ئاکنجی کری، تو بۆ مە بەرڤانی و مەهدەرێ ل دەڤ خودایێ خۆ ناکەی؟ ما تو یا ئەم تێدا و یا ئەم گەهشتینێ نابینی؟ دێ بێژیت: ب راستی خودایێ من تۆڕەبوونەکێ پێ تۆڕە بووی وەکی وێ تۆڕەبوونێ نەبوویە و وەکی وێ تۆڕەبوونێ نابیت، و وی نەهیا**

**من ژ خوارنا دارێ کربوو و من نەگوهدارییا وی کر، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، هەرنە دەڤ ئێکێ دی، هەرنە دەڤ نووحی.**

دێ هێنە دەڤ نووحی و دێ بێژن: ئەی نووح تو پێغەمبەرێ ئێکێ بووی بۆ خەلکێ عەردی، و خودێ ناڤێ تە یێ کرییە بەندەیێ شوکردار، ما یا ئەم تێدا و یا ئەم گەهشتینێ تو نابینی؟ تو بەرەڤانی و مەهدەرێ ل دەڤ خودایێ خۆ بۆ مە ناکەی؟ دێ بێژیت: ب راستی خودایێ من تۆرەبوونەکێ یێ تۆرە بووی وەکی وێ تۆرەبوونێ نەبوویە و وەکی وێ تۆرەبوونێ نابیت، و من دوعایەك هەبوو من ل ملەتێ خۆ کر[1]، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، هەرنە دەڤ ئێکێ دی، هەرنە دەڤ ئیبراهیمی.

**دێ هێنە دەڤ ئیبراهیمی دێ بێژن: ئەی ئیبراهیم تو پێغەمبەرێ خودێ و خۆشتڤییێ وی یێ خۆسەری ژ خەلکێ عەردی، بەرەڤانی و مەهدەرێ بۆ مە ل دەڤ خودایێ خۆ بکە، ما یا ئەم تێدا تو نابینی؟ دێ بێژیتە وان: ب راستی خودایێ من تۆرەبوونەکێ یێ تۆرە بووی وەکی وێ تۆرەبوونێ نەبوویە و وەکی وێ تۆرەبوونێ نابیت، و ب راستی من سێ درەو کربوون[2]** ـ ئەبو حەیانی ئەو د فەرکودەیدا ئینانینە ـ **ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، هەرنە دەڤ ئێکێ دی، هەرنە دەڤ مووسای.**

**دێ هێنە دەڤ مووسای، دێ بێژن: ئەی مووسا تو پێغەمبەرێ خودێیی، و خودێ تو ب نامێت خۆ و ب ئاخفتنا خۆ ب سەر خەلکی یێ ئێخستی، بەرەڤانی و مەهدەرێ بۆ مە ل**

---

[1]- ئانکو دەمێ گۆتی: ﴿رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الارْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾. خودێوۆ کەتێ ژ گاوران نەهێلە، ل سەر روییێ عەردی.

[2] (ئەو سێ تشتێت وی دترسێت خودێدا درەو دانایین ئەڤەنە: ئێك: دەمێ گۆتی: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾، ئەز یێ نەساخم، دو: دەمێ گۆتی: ﴿بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا﴾. نەخێر مەزنێ وان ڤی یێ وەکری، سێ: دەمێ د راستا ژنا خۆ سارایێدا گۆتی: خویشکا منە، و وی ئەڤە درەو دانان د گەل کو د راستییا خۆدا نەدرەون بەلێ چونکی د وێنەیێ درەوێدا یێت هاتین ژ ترسێت خودایێ خۆدا درەو دانان.

**دەڤ خودایێ خۆ بکە، ما یا ئەم تێدا تو نابینی؟ دێ بێژیتە وان: ب راستی خودایێ من تۆڕەبوونەکێ بێ تۆڕە بووی وەکی وێ تۆڕەبوونێ نەبوویە و وەکی وێ تۆڕەبوونێ نابیت، و ب راستی من ئێکێ کوشتی فەرمانا من ب کوشتنا وی نەهاتبوو کرن[1]، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، هەرنە دەڤ ئێکێ دی، هەرنە دەڤ عیسای.**

**دێ هێنە دەڤ عیسای دێ بێژن: یا عیسا تو پێغەمبەرێ خودێیی و ب پەیڤا وی (ببە) تو بێ جهێ بووی، کو ئاراستەی مەریەمێ کربوو، و تو جانەکی ژ وی، و د لاندکێدا تو د گەل خەلکی دئاخفتی. بەرەڤانی و مەهدەرێ بۆ مە ل دەڤ خودایێ خۆ بکە، ما یا ئەم تێدا تو نابینی؟ دێ بێژیتە وان: ب راستی خودایێ من کەربگرتنەکێ بێ کەربگرتی بووی وەکی وێ کەربگرتی نەبوویە و وەکی وێ کەربگرتی نابیت،** ـ و بەحسێ چو گونەهان نەکر ـ ، **ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، ئەز ژ خۆ دترسم، هەرنە دەڤ ئێکێ دی، هەرنە دەڤ موحەممەدی سلاڤێت خودێ ل سەربن.**

**و دێ هێنە دەڤ موحەممەدی سلاڤێت خودێ ل سەر بن و دێ بێژن: یا موحەممەد تو پێغەمبەرێ خودێ و دویماهی پێغەمبەری و ب راستی خودێ گونەهێت تە یێت پێش و پاش یێت ژێ برین. بەرەڤانی و مەهدەرێ بۆ مە ل دەڤ خودایێ خۆ بکە، ما یا ئەم تێدا تو نابینی؟ ئەز دێ چم دێ هێمە بن عەرشی و دێ بۆ خودایێ خۆ چمە سوجدەیێ پاشی دێ خودێ هاریکارییا من ل سەر حەمدەکرن و باش پەسنکرنا خۆ کەت وەسا هاریکارییا کەسێ بەری من نەهاتییە کرن، پاشی دێ هێتە گۆتن: سەرێ خۆ بلندکە بخوازە دێ بۆ تە هێتە دان و بەرەڤانی و مەهدەرێ بکە دێ بەرەڤانییا تە هێتە قەبویلکرن، دێ سەرێ خۆ بلندکەم و دێ بێژم ئوممەتا من ئەی خودا، ئوممەتا من ئەی خودێ[2]، دێ هێتە گۆتن: ئەی موحەممەد یێت حسێب ل سەر نە ژ ئوممەتا خۆ د دەرگەهێ راستێڕا ببە بەحەشتێ و ئەو پشکدارێت خەلکینە د دەرگەهێت دیڕا یێت ماین[3]، پاشی گۆت: ئەز ب**

---

[1] ئەو مرۆڤێ قیبتی بوو دەمێ مووسای کولەك لێ دایی و هاتییە کوشتن و مەرەما وی کوشتنا وی نەبوو: ﴿فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ﴾.

[2]- ئانکو: ئوممەتا من رزگارکە.

[3] ئەو حەفتێ هزارن بێ حسێب دچنە بەحەشتێ.

**وی کەمە یێ جانێ من د دەستیدا مابەینا هەردو رەخێت دەرگەهەکی ژ دەرگەهێت بەحەشتێ هەروەکی مابەینا مەکەهێ و بوسرایێیە)**[1].

- و د ڤەگێرا موسلمیدا: **(د ناڤبەرا مەکەهێ و هەجەرێیە)**[2].

١٧١ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**شَفَاعَتِي لِأَهْلِ الكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي**).

[د٤٧٣٩/ ت٢٤٣٥].

* صحيح.

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مەهدەرا من (بەرەڤانییا من) رۆژا قیامەتێ بۆ خودان گونەهێت مەزنە ژ ئوممەتا من).**

١٧٢ - عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي، فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يُدْخِلَ نِصْفَ أُمَّتِي الجَنَّةَ، وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ؛ فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ، وَهِيَ لِمَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً**).

[ت٢٤٤١/ جه٤٣١٧].

* صحيح.

ژ عەوفێ کورێ مالکێ ئەشجەعی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئێك ژ دەڤ خودایێ من (ئانکو: ملیاکەتەك) هاتە دەڤ من و ئەز ب دلێ خۆ کرم د ناڤبەرا نیڤ ژ ئوممەتا من بچنە بەحەشتێ و د ناڤبەرا مەهدەرکرنێدا، من مەهدەرکرن هەلبژارت و ئەو بۆ وییە یێ بمریت و هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەت).**

---

(١) بازێرەکە ل سوریایێ ئەڤرۆ دبێژنێ ئەسکی شام.

(٢) هەجەر یا ل بەحرەینێ.

## ٩ . باب:إخراج بعث النار.

## بابەتێ: جوداكرنا خەلكێ جەهنەمێ.

١٧٣ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَقُولُ اللهُ: يَا آدَمُ! فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا، وَتَرَى النَّاسَ سَكْرَى وَمَا هُمْ بِسَكْرَى، وَلكِنَّ عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ**). فَاشْتَدَّ ذلِكَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّنَا ذلِكَ الرَّجُلُ؟ قَالَ: (**أَبْشِرُوا، فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفاً وَمِنْكُمْ رَجُلاً، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ**). قَالَ: فَحَمِدْنَا اللهَ وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: (**وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنِّي لأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ، إِنَّ مَثَلَكُمْ فِي الأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الحِمَارِ**). [خ٦٥٣٠ (٣٣٤٨)/ م٢٢٢].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**خودایێ هەر بلند دێ بێژیت: ئەی ئادەم[1]، دێ بێژیت: لەبێ ل دویڤ لەبێ و هاریكاری ل دویڤ هاریكارییێ یا خودێ و خێر هەمی ژ دەڤ تەیە، دێ بێژیت: جەهنەمییان بهنێرە و جوداكە، دێ بێژیت: و جەهنەمی چەندن؟ گۆت: هەر ژ هزاران نەهسەد و نۆت و نەهن، ئها هنگی بچویك پیر دبن و هەمی ئاڤس و گرانە، بەردهاڤێژن، و دێ مرۆڤان بینی سەرخۆشن، و ئەو ب خۆ نە د سەرخۆشن، بەلێ ئیزایا خودایێ تە یا گرانە**)[2].

---

(١) ئەڤە چونكی هەمی دویندەها وینە و ئەو بابێ هەمیانە .

(٢) ئەڤە ئیشارەتە بۆ ڤێ ئایەتێ: ﴿يوم تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وما هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾. ئانكو: رۆژا هوین بیڤەلەرزا قیامەتێ دبینن: هەمی دایین و ماك، ساڤاشیرێ خۆ ژ بیر دكەن و دهێلن، و هەمی ئاڤس و گرانە، بەردهاڤێژن، و دێ مرۆڤان بینی سەرخۆشن، و ئەو ب خۆ نە د سەرخۆشن، بەلێ ئیزایا خودایێ تە یا گرانە.

**گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما کی ژ مە دێ ئەو ئێك بیت؟! گۆتی (دلخۆش ببن، ب راستی ئێك ژ هەوەیە و هزار ژ یەئجووج و مەئجووجان، پاشی گۆت: ئەز ب وی کەمە یێ جان و کارێ من د دەستێ ویدا ئەز هیڤی دکەم هوین چارێکا خەلکێ بەحەشتێ بن)،** ئینا مە (ژ کەیفادا) گۆت: الله أكبر، ئینا گۆت: **(ئەز هیڤی دکەم هوین سێکا خەلکێ بەحەشتێ بن)،** ئینا مە (ژ کەیفادا) گۆت: الله أكبر، ئینا گۆت: **(ئەز هیڤی دکەم هوین نیڤا خەلکێ بەحەشتێ بن)،** ئینا مە (ژ کەیفادا) گۆت: الله أكبر، ئینا گۆت: **(و هوین بەرامبەر خەلکی چو نینن، وەکی موییەکێ رەش نەبیت ل پشتا گایەکێ سپی یان وەکی موییەکێ سپی نەبیت ل پشتا گایەکێ رەش).**

١٠ ـ باب: فكاك المسلمين بعدتهم من غيرهم.

**بابەتێ: خلاسکرنا موسلمانان ب هەژمارا وان ژ یێت نە ژ وان.**

١٧٤ – (م) عَنْ أَبِي مُوسَى قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، دَفَعَ اللهُ عزّ وجل إِلَى كُلِّ مُسْلِمٍ يَهُودِيّاً أَوْ نَصْرَانِيّاً، فَيَقُولُ: هذَا فِكَاكُكَ مِنَ النَّارِ). [م٢٧٦٧].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دەمێ بوو رۆژا قیامەتێ خودێ دێ هەر موسلمانەکی جوییەکی یان فەلەکی دەتە ڤێ و دێ بێژیت: ئەڤە خلاسکەرێ تەیە ژ ئاگری)**[1].

١٧٥ ـ عن أَنَسِ بن مَالِكٍ، قال: قال رسول اللهِ ﷺ: (إِنَّ هذه الْأُمَّةَ مَرْحُومَةٌ عَذَابُهَا بِأَيْدِيهَا فإذا كان يَوْمُ الْقِيَامَةِ دُفِعَ إلى كل رَجُلٍ من الْمُسْلِمِينَ رَجُلٌ من الْمُشْرِكِينَ فَيُقَالُ هذا فِدَاؤُكَ من النَّارِ). [مه٤٩٩٢].

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەڤ ئوممەتە یا دلۆڤانیپێبرییە**[1] **و ئیزایا وێ یا د دەستێ واندا**[2] **ڤێجا ئەگەر بوو رۆژا قیامەتێ هەر**

---

[1] ئانکو قوربانە بۆ تە شوینا تە بچیتە جەهنەمێ و تە ژێ رزگار کەت.

**زەلامەكی ژ موسلمانان دێ زەلامەك ژ هەڤپشكچێكەران دەنە ڤێ و دێ بێژنێ: ئەڤە قوربانییێ (خلاسكەرێ) تەیە ژ ئاگری).**

## ١١ : باب: الحساب وقصاص المظالم.

## بابەتێ: پرسین و تۆلڤەكرنا مافخوارنان.

١٧٦ - (ق) عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ المازِنِيّ قالَ: بَيْنَما أَنَا أَمْشِي مَعَ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما آخِذٌ بِيَدِهِ، إذ عَرَضَ رَجُلٌ فَقَالَ: كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) في النَّجْوَى؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ يُدْنِي المُؤْمِنَ، فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ، فَيَقُولُ: أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ أَيْ رَبِّ! حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ، وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ، قَالَ: سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ اليَوْمَ، فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ. وَأَمَّا الكَافِرُ وَالمُنَافِقُ، فَيَقُولُ الأَشْهَادُ:** ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [هود:١٨]).

[خ٢٤٤١/ م٢٧٦٨].

**ژ سەفوانێ كوڕێ موحریزێ مازنی، (رحمه الله) گۆت: د دەمەكیدا ئەز د گەل ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) دچۆم من دەستێ وی گرتبوو، زەلامەك ئاشكرا بوو ئینا گۆت: تە چاوا گولێ بوویە ژ پێغەمبەری (ﷺ) د پستەپستكرنێدا دگۆت؟ ئینا گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (خودان باوەر رۆژا قیامەتێ ژ خودایێ خۆ دێ هێتە نێزیككرن[٢] هەتا ستر و دلۆڤانییا خۆ ددانیتە سەر[١] و دێ گونەهێت وی پێ دەتە گۆتن**

---

[١] رۆژا قیامەتێ خودێ دێ دلۆڤانییێ پێ بەت.

[٢] ئیزایا وان ئەوە ئەوا ئەو ب دەستێ خۆ ب سەرێ ئێكدو دئینن د دنیاییێدا، یان ژ ئیزایا وان ژ ئەگەرێ وێیە یان وان ب دەستێت خۆ د دنیاییێدا كرین.

[٣] نێزیكییا قەدری و قیمەتێ نە نێزیكییا جهی و مەسافەتێ، چونكی خودێ ژ جهی و مەسافەتێ یێ پاك و پاقژە.

**و ئاشكراكرن، دێ بێژیت: تو ڤێ گونەهێ دزانی، تو ڤێ گونەهێ دزانی؟ دێ بێژیت بەلێ یا خودێ ئەز دزانم، خودێ دێ بێژیت: ب راستی من د دنیایێدا ل سەر تە ستارەكر و ڤەشارت[٢] و ئەز ئەڤرۆ بۆ تە ژێ دبەم[٣]. بەلێ پا گاور و دوڕوی[٤] دیدەڤان و بەرهەڤ[٥]** ﴿هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا على رَبِّهِمْ ألا لَعْنَةُ اللهِ على الظَّالِمِينَ﴾[٦].

١٧٧ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا خَلَصَ المُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا، أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) بِيَدِهِ! لأَحَدُهُمْ بِمَسْكَنِهِ فِي الجَنَّةِ أَدَلُّ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا)**.[خ٢٤٤٠].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر باوەریدار ژ ئاگری رزگار بوون[٧]، دێ ل دەڤ پرەكێ هێنە راوەستاندن د ناڤبەرا بەحەشتێ و جەهنەمێدا دێ تۆلڤەكرنێ ژ ئێكدو كەن ل سەر هندە مافان د ناڤبەرا واندا بوون د دنیایێدا هەتا دهێنە پاككرن و مافێت خۆ ل سەر ئێكدو رادكەن، دێ دەستویرییا وان**

---

[١] ئانكو ب دلۆڤانییا خۆ نەپەنی خەلكێ مەحشەرێ دكەت ب رەنگەكی نە كەس ببینیت و نە كەسێ گوه لێ ببیت.

[٢] ئانكو من ڤەشارت و كەس پێ نەحەساند.

[٣] ژ دلۆڤانییا خودێ د دنیایێدا كەس پێ نەحەساند دا شەرمزار نەبیت، و قیامەتێ ژی حسێبا وی ب تنێ كر و كەس پێ نەحەساند و بۆ ژێ بر، بەلێ ژ بەر دو ئەگەران دا بەر روییێ وی: دا بزانیت چو ل بەر خودێ بەرزە نابیت و یا دی دا هەست ب دلۆڤانییا خودێ بكەت و بزانیت ئەگەر ب دلۆڤانییا خودێ نەبا ئەو نەدچۆ بەحەشتێ.

[٤] د باوەرییێدا دوڕوی.

[٥] ژ ملیاكەت و پێغەمبەران و ژ ئەجنە و مرۆڤان.

(٦) ئانكو: و شاهد [ژ ملیاكەت و پێغەمبەران] دێ بێژن: ئەڤەنە درەو ژ كیسێ خودێ دكرن، بزانن! ب راستی لەعنەتا خودێ ل ستەمكاران بیت.

[٧] ژ پرا سیراتێ دەرباز بوون.

**هێتە دان بچنە بەحەشتێ، و ئەز ب وی كەمە یێ جان و كارێ موحەممەدی ( ) د دەستێ ویدا ئێك ژ وان پتر ب مالا خۆ یا بەحەشتێ دكەڤیت ژ مالا خۆ یا دنیایێ).**

١٧٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أَتَدْرُونَ مَا المُفْلِسُ**) ؟ قَالُوا: المفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ، فَقَالَ: (**إِنَّ المُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي، يَأْتِي يَوْمَ القِيَامَةِ بِصَلاَةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا، وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا، فَيُعْطَى هذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ، قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ، أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ**). [م٢٥٨١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هوین دزانن مفلس و رەپەرویت كییە)؟ گۆتن: مفلس و رەپەرویت د ناڤ مەدا ئەوە یێ نە دەرهەمەك هەی و نە متا، گۆت: (ب راستی مفلس و رەپەرویت ژ ئوممەتا من ئەوە یێ رۆژا قیامەتێ ب نڤێژێ و رۆژییێ و زەكاتێ دهێت، و دهێت و خەبەر پێت گۆتینە ڤی، و ژ بێبەختی ب ناموسێ یێ ل سەر ڤی ئاخفتی، و مالێ ڤی یێ خواری، و خوینا ڤی یا رێتی و ئەڤە یێ قوتای، ڤێجا دێ ژ خێرێت وی دەنە ڤی، و ژ خێرێت وی دەنە ڤی، و ئەگەر خێرێت وی نەمان بەری ئەو ئەوا ل سەر خۆ بدەت، دێ ژ گونەهێت وان هێنە هەلگرتن و هاڤێژنە سەر پێت وان، پاشی دێ هاڤێژنە د ئاگریدا).**

١٧٩ - (م) وعَنْه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لَتُؤَدُّنَّ الحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ القِيَامَةِ، حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ القَرْنَاءِ**). [م٢٥٨٢].

**ژ وی (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هوین رۆژا قیامەتێ دێ مافان دەنە خودانێت وان، هەتا تۆلێت گیسكا كۆچ دێ ژ گیسكا ب شاخ هێنە ڤەكرن).**

١٨٠ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَضَحِكَ فَقَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ) ؟ قَالَ: قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (مِنْ مُخَاطَبَةِ العَبْدِ رَبَّهُ. يَقُولُ: يَا رَبِّ! أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: يَقُولُ: بَلَى. قَالَ: فَيَقُولُ: فَإِنِّي لا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلاَّ شَاهِداً مِنِّي. قَالَ: فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ اليَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيداً، وَبِالكِرَامِ الكَاتِبِينَ شُهُوداً. قَالَ: فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، فَيُقَالُ لأَرْكَانِهِ: انْطِقِي، قَالَ: فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ، قَالَ: ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الكَلاَمِ. قَالَ: فَيَقُولُ: بُعْداً لَكُنَّ وَسُحْقاً، فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ). [م٢٩٦٩].

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) کرە کەنی. ئینا گۆت: **(هوین دزانن ئەز بۆچی دکەنم)؟** گۆت: مە گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: **(ژ ئاخفتنا بەندەیی د گەل خودایێ خۆ، دێ بێژیت: ئەی خودایێ من ما تە ئەز ژ ستەمێ ئێمن نەکریمە؟ گۆت: دێ بێژیت: بەلێ، گۆت: دێ بێژیت: پا ئەز ب راستی چو شاهدا قەبویل ناکەم ژ من نەبیت، دێ بێژیت: تو بەسی ئەڤرۆ شاهد بی ل سەر خۆ، و ملیاکەتێت ب بها و کارنڤیس، ڤێجا خودێ دێ دەڤێ وی گریت و مۆر کەت، و دێ بێژیتە ئەندامێت وی باخڤن، گۆت: دێ ئەندامێت وی ب کریارێت وی ئاخڤن، پاشی دێ رێك پێ هێتە دان باخڤیت، دێ بێژیت: دویراتی: بۆ هەوە بیت و ناڤچۆن من ئەڤ جەدەلە ژ بەر هەوە دکر)**[1].

١٨١ - عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلاَهُ؟). [ت٢٤١٧/ مي٥٥٤].

* صحيح.

(١) دا هوین رزگار ببن.

**و ژ ئەبی بەرزەی، نەزلێ كورێ عوبەیدێ ئەسلەمی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێت چو بەندەیان ناهێن و بچن[1]، هەتا پرسیار ژ وی نەئێتە كرن، ژ ژیێ وی كا د چدا بۆراندییە، و ژ زانینا وی كا چ كار پێ كرییە، و ژ مالێ وی كا ژ كیرێ ئینایە و د چدا مەزاختییە، و ژ لەشێ وی كا د چدا كەڤنار كرییە)[2].**

١٠٨٢ - عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ**). [ت٣٣٣٨].

* صحيح بما قبله.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ پرسین (ب درێژی و هویرك) د گەل هەتە كرن ئەو هاتە ئیزادان.)**

١٠٨٣ - عن عَائِشَةَ قالت: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنِ الحِسَابِ اليَسِيرِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا حِسَابُ اليَسِيرُ؟ فَقَالَ: (**الرَّجُلُ تُعْرَضُ عَلَيْهِ ذُنُوبُهُ، ثُمَّ يُتَجَاوَزُ لَهُ عَنْهَا، إِنَّهُ مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ هَلَكَ. وَلاَ يُصِيبُ عَبْداً شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا؛ إِلاَّ قَاصَّ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ**).[حم٢٥٥١٥] [ك١٩٠].

* إسناده قوي. وقال الذهبي: على شرط مسلم.

[وانظر: ٣١٤ من نوقش الحساب يهلك.

وانظر: ٣٢٢٤ أول ما يقضى في الدماء.

وانظر: ٣١٤٦ في التحلل من المظالم].

---

[1] ئانكو چو مرۆڤ نە بۆ بەحەشتێ نە بۆ جەهنەمێ دچن هەتا ئەڤ پرسیارە ژێ نەهێنە كرن.

[2] هەروەكی دەمێ ئەو یێ گەنج یێ ب هێز و نوی بوو، بەلێ ئەڤ نویاتییە كەڤن دبیت هەروەكی جلكێ نوی كەڤن دبیت.

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من پرسیارا پرسین و حسێبا سڤك ژ پێغەمبەری (ﷺ) کر، من گۆتێ: پرسینا سڤك چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ ئینا گۆت: (مرۆڤی گونەهێت وی بۆ بهێنە نیشادان پاشی ژ وان بۆ ژێ بهێتە بۆرین. ب راستی یێ هویرك پرسین د گەل هاتە کرن ئەو ژ ناڤ چۆ (د هیلاك چۆ) و ستریەك و بلندتر ناگەهنە بەندەیی ئەگەر خودێ پێشڤە گونەهێت وی ژێ نەبەت).**

## ١٢ . باب المرور على الصراط.

## بابەتێ: چۆنا ل سەر سیراتێ.

١٨٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ القِيَامَةِ؟ فَقَالَ: **(هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ)**، قالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(هَلْ تُضَارُّونَ فِي القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ لَيْسَ دُونَهُ سَحَابٌ)**، قالُوا: لاَ، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ كَذلِكَ، يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ، فَيَقُولُ: مَنْ كانَ يَعْبُدُ شَيْئاً فَلْيَتَّبِعْهُ، فَيَتْبَعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ، وَيَتْبَعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ القَمَرَ، وَيَتَّبِعُ مَنْ كانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ، وَتَبْقَى هـذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا، فَيَأْتِيهِمُ اللهُ فِي غَيْرِ الصُّورَةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللهِ مِنْكَ، هذَا مَكانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا، فَإِذَا أَتَانَا رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللهُ فِي الصُّورةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ رَبُّنَا فَيَتْبَعُونَهُ، ويُضْرَبُ جِسْرُ جَهَنَّمَ)**.

قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ، وَدُعَاءُ الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ! سَلِّمْ سَلِّمْ، وَبِهِ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، أَمَا رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ)** ؟ قالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلاَّ اللهُ، فَتَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، مِنْهُمُ المُوبَقُ بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمُ المُخَرْدَلُ، ثُمَّ يَنْجُو، حَتَّى إِذَا فَرَغَ اللهُ مِنَ القَضَاءِ بَيْنَ عِبَادِهِ، وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ مِنَ النَّارِ مَنْ أَرَادَ أَن يُخْرِجَ، مِمَّنْ كانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَمَرَ المَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِعَلاَمَةِ آثَارِ**

**السُّجُودِ، وَحَرَّمَ اللهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ مِنِ ابْنِ آدَمَ أَثَرَ السُّجُودِ، فيُخْرِجُونَهُمْ قَدْ امْتُحِشُوا، فيُصَبُّ عَلَيْهِمْ ماءٌ يُقَالُ لَهُ: ماءُ الحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الحِبَّةِ في حَمِيلِ السَّيْلِ.**

**وَيَبْقى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا، وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا، فاصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ، فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو اللهَ، فَيَقُولُ: لَعَلَّكَ إِنْ أَعْطَيْتُكَ أَنْ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، فَيَقُولُ: لاَ، وَعِزَّتِكَ! لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، فَيَصْرِفُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ. ثُمَّ يَقُولُ بَعْدَ ذلِكَ: يَا رَبِّ! قَرِّبْنِي إِلَى بَابِ الجَنَّةِ، فَيَقُولُ: أَلَيْسَ قَدْ زَعَمْتَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، وَيْلَكَ ابْنَ ادَمَ مَا أَغْدَرَكَ! فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو، فَيَقُولُ: لَعَلِّي إِنْ أَعْطَيْتُكَ ذلِكَ تَسْأَلُنِي غَيْرَهُ، فَيَقُولُ: لاَ، وَعِزَّتِكَ! لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ، فَيُعْطِي اللهَ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهُ، فَيُقَرِّبُهُ إِلَى بَابِ الجَنَّةِ، فَإِذَا رَأَى ما فِيهَا سَكَتَ ما شَاءَ اللهُ أَنْ يَسْكُتَ. ثُمَّ يَقُولُ: رَبِّ أَدْخِلْنِي الجَنَّةَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَوَلَيْسَ قَدْ زَعَمْتَ أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهُ، وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ! ما أَغْدَرَكَ!**

**فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! لاَ تَجْعَلْنِي أَشْقَى خَلْقِكَ، فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو حَتَّى يَضْحَكَ، فَإِذَا ضَحِكَ مِنْهُ أَذِنَ لَهُ بِالدُّخُولِ فِيهَا، فَإِذَا دَخَلَ فِيهَا قِيلَ: تَمَنَّ مِنْ كَذَا، فَيَتَمَنَّى، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: تَمَنَّ مِنْ كَذَا، فَيَتَمَنَّى، حَتَّى تَنْقَطِعَ بِهِ الأَمانِيُّ، فَيَقُولُ لَهُ: هذَا لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ).**

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَذلِكَ الرَّجُل آخِرُ أَهْلِ الجَنَّةِ دُخُولاً.

قَالَ عطاء: وأَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ جالِسٌ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ لاَ يُغَيِّرُ عَلَيْهِ شَيْئاً مِنْ حَدِيثِهِ، حتَّى انتهى إلى قَوْلِهِ: (**هذَا لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ**). قالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**هذَا لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ**). قالَ أَبُو هُرَيْرَةَ حَفِظْتُ: (**مِثْلُهُ مَعَهُ**). [خ٦٥٧٣، ٦٥٧٤ (٨٠٦)/ م١٨٢].

- ولفظ مسلم -وهو رواية عند البخاري-: (**فَيُضْرَبُ الصِّراطُ بين ظَهرانَيْ جهنَّم، فأكونُ أنا وأمتي أولَ مَنْ يُجِيزُ، ولا يتكلمُ يومئذٍ إلا الرُّسُلُ ودعوى الرسل يومئذٍ: اللّهم! سلِّمْ سَلِّم..**). [خ٨٠٦].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: هندەك خەلكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەرێ ئەم دێ خودایێ خۆ رۆژا قیامەتێ بینین؟ ئینا گۆت: **(ما هوین ب دیتنا رۆژێ، عەور ل بەر نەبیت ب گۆمان دكەڤن؟**[1]**، ما هوین ب دیتنا هەیڤا چاردە شەڤی، عەور ل بەر نەبیت ب گۆمان دكەڤن؟)**[2]، گۆتن: نەخێر ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(ب راستی رۆژا قیامەتێ ژی وەسایە**[3]**، ڤێجا خودێ دێ بێژیت: هەر كەسێ تشتەك د دنیایێدا پەرستن بۆ دكر بلا ل دویڤ بچیت، ڤێجا هندەك ژ وان دێ ب دویڤ رۆژێ كەڤن، و هندەك ژ وان دێ ب دویڤ هەیڤێ كەڤن، هندەك دێ ب دویڤ بوت و سەنەمان كەڤن. و ئەڤ ئوممەتە دێ مینیت و دوروییێت وان ژی یێت د گەل وان، ڤیجا خودێ دێ ل سەر سالۆخەتەكێ ئەو نەنیاسن دێ هێتە دەڤ وان (هاتنەكا لایقی وی و بێ چاوایی) و دێ بێژیت: ئەز خودایێ هەوەمە، دێ بێژن: خودێ، مە ژ تە بپارێزیت: ئەڤە جهێ مەیە و ئەم ژ جهێ خۆ ناچین هەتا خودایێ مە بۆ مە نەهێت، و ئەگەر خودایێ مە هات ئەم دێ نیاسین، ڤێجا خودێ دێ ب وی سالۆخەتی هێت یێ ئەو دنیاسن و دێ بێژیت: ئەز خودایێ هەوەمە، دێ بێژن: تو خودایێ مەیی و دێ ب بەرڤە چن، و خودێ دێ پرەكێ ل سەر جەهنەمێ دانیت (كو پرا سیراتێیە یا ئاشكەرا).**

پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز یێ ئێكێمە ل سەر دەرباز دبم، و دوعایا پێغەمبەران وێ رۆژێ: یا خودێ سلامەتییێ بدە، یا خودێ سلامەتییێ بدە، و جەهنەمێ چنگال یێت هەین وەكی ستریا سەعدانن**[4]**، ما هەوە سترییێت سەعدان نەدیتینە)؟**، گۆتن: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(ئەو چنگال وەكی سترییێ سەعدانێنە، بەلێ كەس نوزانیت چەندێ مەزنە خودێ نەبیت دێ خەلكی ب كریارێت وان كێشیت و رەڤینیت، ژ وان یێت**

---

(١) یان زەحمەت بۆ هەوە ب دیتنا رۆژێ، عەور ل بەر نەبیت چێ دبیت؟.

(٢) یان زەحمەت بۆ هەوە ب دیتنا هەیڤا چاردە شەڤی عەور ل بەر نەبیت چێ دبیت؟.

(٣) ئانكو هوین چاوا د دنیایێدا رۆژێ و هەیڤێ دبینن هۆسا دێ خودایێ خۆ بینن.

(٤) سترییەكێ نیاسە ل نەجدێ یێ هەی و چەرمێ حێشتران شین دبیت.

ب كارێ خۆ د هیلاك چۆی، و پێت پارچە پارچە كری، پاشی دێ رزگار بیت، هەتا حوكمێ خودێ د ناڤبەرا بەندەیاندا ب دویماهی دهێت، و ڤیا ژ ئاگری دەربێخیت پێ دڤێت دەربێخیت، ژ وان یێ شەهدە دایی چو خودایێت راست و دورست و هەژی پەرستنێ نینن خودێ نەبیت، دێ فەرمانا ملیاكەتان كەت ئەو وان دەربێخن، ئەو دێ وان ب نیشانێت وان ب شوینوارێت سوجدەیان نیاسن و خودێ ل سەر ئاگری یێ حەرام كری ئەو شوینوارێت سوجدەیان ژ كورێت ئادەمی بخۆت، ڤێجا دێ وان دەرئێخن و ئەو پێت سۆتی و رەش بووین، دێ ئاڤەك ل وان هێتە كرن دبێژنێ ئاڤا ژیانێ، دێ شین بن شینبوونا دندكێ د ناڤ ئاخێ و خیزێ جۆكێ ئینایی.

و زەلامەك دێ مینیت بەرێ وی یێ ل جەهنەمێ، دێ بێژیت: یا خودێ ب راستی بێهنا وێ ئەز ژەهردام، و گورپیا وێ ئەز سۆتم، بەرێ من ژ جەهنەمێ وەرگێرە، ڤێجا بەردەوام دێ دوعا ژ خودێ كەت، (خودێ) دێ بێژیتێ: ئەگەر من ئەڤە دا تە، دبیت تو داخوازەكا دی ژ من بكەی؟ دێ بێژیت: نەخێر ئەز ب مەزناتییا تەكەمە ئەز چو تشتێ دی ژ تە ناخوازم، (خودێ) دێ بەرێ وی ژ جەهنەمێ وەرگێریت، پاشی دێ بێژیت: ئەی خودێ من نێزیكی دەرگەهێ بەحەشتێ بكە، (خودێ) دێ بێژیتێ ما تە رژد نەگۆتبوو (بریار نەدابوو) چو داخوازێت دی ژ من نەكەی؟ وەی بۆ تە هەی كورێ ئادەمی تو چەند یێ بێ نەختوباری، بەردەوام دێ دوعایان كەت، ئەگەر من دا تە دبیت تو داخوازەكا دی ژ من بكەی، دێ بێژیت: نەخێر ئەز ب مەزناتییا تەكەمە ئەز چو داخوازێت دی ژ تە ناكەم، دێ سۆز و پەیمانان دەتە خودێ ئەو چو داخوازێت دی ژێ نەكەت، (خودێ) دێ وی نێزیكی دەرگەهێ بەحەشتێ كەت، ڤێجا ئەگەر بەحەشت دیت دێ بێ دەنگ بیت هندی خودێ ڤیای بێ دەنگ بیت، پاشی دێ بێژیت خودێوۆ من ببە بەحەشتێ، پاشی (خودێ) دێ بێژیتێ: ما تو یێ رژد نەبووی تو چو داخوازێت دی ژ من نەكەی؟ وەی بۆ تە ئەی كورێ ئادەمی، تو چەند یێ بێ ئەختوباری.

**ڤێجا دێ بێژیت، ئەی خودێ من نەکە خەمگینترین چێکرییێت خۆ، ڤێجا بەردەوام دێ دوعا کەت هەتا خودێ ژێ رازی دبیت ڤێجا ئەگەر ژێ رازی بوو دەستویری دێ بۆ هێتە دان بچیتە د بەحەشتێدا، و ئەگەر چۆ تێدا دێ بێژنێ ژ ڤێ بخوازە و دێ خوازیت هەتا خۆزییێت وی ب دویماهی دهێن (خودێ) دێ بێژیتێ: یا تە خواستی بۆ تە و هندی وێ ژی د گەل وێ. ئەبو هورەیرە گۆت: ئەڤە دویماهی کەسە دچیتە بەحەشتێ).**

عەتائی گۆت: ئەبو سەعیدێ خودری د گەل ئەبو هورەیرە یێ روینشتی بوو و چو ژ ئاخفتنا وی ڤەنەگەراند هەتا گەهشتییە گۆتنا خۆ: **(ئەڤە بۆ تە و هندی وێ ژی د گەل وێ)**، ئەبو سەعیدی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەڤە بۆ تەیە و دەهـ جاران وەکی وێ)**، ئەبو هورەیرە گۆت: من **(هندی وێ)** ژبەر کرییە.

- و بێژەیا موسلمی و ئەو ڤەگێرەکە ل دەڤ بوخاری: **(و پرا سیراتێ دێ دانندە سەر نیڤا جەهنەمێ و ئەز و ئوممەتا خۆ پێت ئێکێینە د سەرڕا دەرباز دبین، و وێ رۆژێ کەس نائاخڤیت پێغەمبەر نەبن و دوعایا پێغەمبەران ئەوە یا خودێ سلامەتییێ بدە سلامەتییێ).**

١٨٥ – عن أَنَسٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) أَنْ يَشْفَعَ لِي يَوْمَ القِيَامَةِ، فَقَالَ: **(أَنَا فَاعِلٌ)**، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! فَأَيْنَ أَطْلُبُكَ؟ قَالَ: **(اطْلُبْنِي أَوَّلَ مَا تَطْلُبُنِي عَلَى الصِّرَاطِ)**، قَالَ: قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلْقَكَ عَلَى الصِّرَاطِ؟ قَالَ: **(فَاطْلُبْنِي عِنْدَ المِيزَانِ)**، قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلْقَكَ عِنْدَ المِيزَانِ؟ قَالَ: **(فَاطْلُبْنِي عِنْدَ الحَوْضِ، فَإِنِّي لاَ أُخْطِئُ هَذِهِ الثَّلاَثَ المَوَاطِنَ)**. [ت٢٤٣٣].

* صحيح.

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) من داخواز ژ پێغەمبەری کر (ﷺ) رۆژا قیامەتێ بەرەڤانییێ بۆ من بکەت، ئینا گۆت: **(دێ کەم)**، گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ

**ئەز ل كیرێ ل تە بگەرییم؟ گۆت: (ل سەر پرا سیراتێ ل من بگەرە)، من گۆت: ئەگەر من تو ل سەر پرا سیراتێ نەدیتی؟ گۆت: (ل دەڤ ترازیییێ ل من بگرە)، من گۆت: پا ئەگەر من تو ل دەڤ ترازیییێ نەدیتی؟ گۆت: (ل دەڤ كانییا كەوسەرێ ل من بگرە ب راستی ئەز ئێك ژ ڤان جهان خەلەت ناكەم).**

١٨٦ - عن أبي سَعِيدٍ قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ، عَلَى حَسَكٍ كَحَسَكِ السَّعْدَانِ، ثُمَّ يَسْتَجِيزُ النَّاسُ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدُوجٌ بِهِ، ثُمَّ نَاجٍ، وَمُحْتَبَسٌ بِهِ، وَمَنْكُوسٌ فِيهَا).** [جه٠٢٨٠٤].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدی (ﷺ) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پرا سیراتێ دێ داننە سەر نیڤەكا جەهنەمێ ل سەر هندە ستریان (چەنگالان) وەكی ستریێت دارا سەعدانن[1]، پاشی دێ فەرمان ل خەلكی هێتە كرن د سەرڕا بچن، ڤێجا یێ هەی رزگار دبیت و ب سلامەتی، و هندەك ریچیایی پاشی رزگار دبیت، و رێ لێ گرتی و سەرنشیڤكری ل سەر).**

١٨٧ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: إِنَّ خَلِيلِي (ﷺ) عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّ دُونَ جِسْرِ جَهَنَّمَ طَرِيقاً ذَا دَحْضٍ وَمَزِلَّةٍ، وَإِنَّا نَأْتِي عَلَيْهِ وَفِي أَحْمَالِنَا اقْتِدَارٌ.

وفي لفظ: وَفِي أَحْمَالِنَا اضْطِمارٌ. أَحْرَى أَنْ نَنْجُوَ عَنْ أَنْ نَأْتِيَ عَلَيْهِ وَنَحْنُ مَوَاقِيرُ. [حم٢١٤١٦].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەبی زەڕ (ﷺ) گۆت: خۆشتڤیێ من (ﷺ) شیرەت ل من كر ل سەر پرا سیراتێ رێكەكا هەی یا حلیسۆك و تەحسۆكە و ئەم بهێینە سەر و بارێ مە یێ ناڤنجی.**

---

(١) دارەكە حێشتر پێ ڤەلەو دبن.

**و دبێژەیەكێدا گۆت: و بارێ مە یێ سڤك هەژیترە ئەم رزگار ببین و ئەم بهێینە سەر و بارێ مە یێ گران.**

١٨٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ [الحديد:١٢] قَالَ: يُؤْتَوْنَ نُورَهُمْ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ، مِنْهُمْ مَنْ نُورُهُ مِثْلُ الجَبَلِ، وأَدْنَاهُمْ نُوراً مَنْ نُورُه عَلى إِبْهَامِهِ، يَطْفَأُ مَرَّةً وَيَقِدُ أُخْرَى. [ك٣٧٨٥].

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودایێ ب هێز و مەزندا ﴿يَسْعَى نُورُهُمْ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ دبێژیت: ل دویف كریارێت وان رۆناهییا وان ددەنە وان، ڤێجا ژ وان یێ هەی رۆناهییا وی هندی چیایە و یێ رۆناهییا وی ژ هەمیان كێمتر رۆناهییا وی یا ل سەر تبلا وی یا بەرانی (یا پێ) جار دڤەمریت و جار هەل دبیت.**

### ١٣ ـ باب: ما جاء في الحوض.

### بابەتێ: چ د راستا ئاڤا كەوسەرێدا هاتییە.

١٨٩ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قال: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، ماؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ اللَّبَنِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهَا فَلاَ يَظْمَأُ أَبَداً).** [خ٦٥٧٩/ م٢٢٩٢].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بركا من[1] ڤۆناغا هەیڤەكێیە[2]، ئاڤا وێ ژ شیری سپیترە و بێنا وێ ژ یا مسكێ خۆشترە و گۆزكێت وێ وەكی ستێرێت عەسمانینە (زۆرن) یێ ژێ ڤەخۆت ئەو چو جار تێنی نابیت).**

---

[1] بركا ئاڤا كەوسەرێ.

[2] درێژی و پانی هندی ئێكە.

١٩٠ - (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنِّي عَلَى الحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وَسَيُؤخَذُ نَاسٌ دُونِي، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي، فَيُقَالُ: هَلْ شَعَرْتَ ما عَمِلُوا بَعْدَكَ؟ واللهِ ما بَرِحُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ**). [خ٦٥٩٣/ م٢٢٩٣].

**ژ ئەسمائا كچا ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەز یێ ل سەر بركا ئاڤا كەوسەرێ هەتا بەرێ خۆ بدەمێ كا كی ژ هەوە دێ هێتە ئاڤێ ل دەڤ من، و دێ هندە خەلكێ نێزیكی من هێنە پاشئێخستن، ڤێجا ئەز دێ بێژم ئەی خودا ئەو ژ منە و ئوممەتا منە دێ هێتە گۆتن تە نەزانییە وان پشتی تە چ كرییە، ئەز ب خودێ كەمە بەردەوام دێ پاشڤە زڤرن).**

١٩١ - (م) عَنْ عائشة قَالتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ، وَهُوَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ أَصْحَابِهِ: (**إِنِّي عَلَى الحَوْضِ أَنْتَظِرُ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، فَوَاللهِ لَيُقْتَطَعَنَّ دُونِي رِجَالٌ، فَلأَقُولَنَّ: أَيْ رَبِّ مِنِّي وَمِنْ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، مَا زَالُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ**). [م٢٢٩٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) و ئەو د نیڤا هەڤالێت خۆدا بوو دگۆت: (ب راستی ئەز ل سەر بركا كەوسەرێ چاڤەرێ دكەم كا كی ژ هەوە دێ هێتە ئاڤێ ل دەڤ من، ئەز ب خودێ كەمە هندەك نێزیكی من دێ هێنە ڤەگرتن، ڤێجا ئەز دێ بێژم ئەی خودا ئەو ژ منە و ژ ئوممەتا منە، دێ بێژیت: ب راستی تو نوزانی كا وان پشتی تە چ كرییە، و بەردەوام دێ پاشڤە زڤرن).**

١٩٢ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا آنِيَةُ الحَوْضِ؟ قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا؛ أَلاَ فِي اللَّيْلَةِ المُظْلِمَةِ المُصْحِيَةِ، آنِيَةُ الجَنَّةِ مَنْ شَرِبَ مِنْهَا لَمْ يَظْمَأْ آخِرَ مَا عَلَيْهِ، يَشْخُبُ فِيهِ مِيزَابَانِ مِنَ الجَنَّةِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ لَمْ يَظْمَأْ، عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ، مَا بَيْنَ عَمَّانَ إِلَى أَيْلَةَ، مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضاً مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ العَسَلِ**). [م٢٣٠٠].

**ژ ئەبی زەڕی (ﷺ) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئامانێت برکا کەوسەرێ چنە؟ گۆت: (ئەز ب وی کەمە یێ جانێ موحەممەدی د دەستیدا ئامانێت وێ پترن ژ ستێر و هەسارێت وێ، بزانن د شەڤەکا تاریدا و هەیڤ تێدا نە، ئەو ئامانێت بەحەشتێنە یێ ئاڤێ ژێ ڤەخوت ئەو تێهنی نابیت و تێهناتی ناگەهیتێڤە، ئاڤا وێ دەردکەڤیت و دهێت و دو بۆتك ژ بەحەشتێ دهێنێ، یێ ژێ ڤەخوت تێهنی نابیت، درێژیا وێ هندی پانیا وێیە د ناڤبەرا عەمان[١] و ئەیلەدا[٢] ئاڤا وێ ژ شیری سپیترە و ژ هنگڤینی شرینترە).**

١٤ : باب ما جاء في العرض.

**بابەتێ: چ د پێشبەرییێدا هاتیە.**

١٩٣ – عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعَرِيِّ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُعرَضُ النَّاسُ يومَ القيامةِ ثلاثَ عرضاتٍ: فأمَّا عَرضتانِ، فجدالٌ، ومعاذيرُ، وأمَّا العَرضَةُ الثَّالثةُ، فعندَ ذلِكَ تطيرُ الصُّحفُ في الأيدي، فآخِذٌ بيَمينِهِ، وآخذٌ بشِمالِهِ**)[٣]. [ت٢٤٢٥م/ جه٤٢٧٧].

* ضعيف

[وانظر: ٩٧٨].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژا قیامەتێ مرۆڤ دێ سێ پێشبەرێ پێشبەری خودایێ خۆ بن، دو پێشبەر گەنگەشە و**

---

(١) نوکە پایتەختێ ئوردنە.

(٢) بازێرکەکە دکەڤیتە شامێ نوکە کاڤلن و نەیێ ئاڤایە.

(٣) شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینایە: ١٩٣ - (ق) عَنْ جُنْدُبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الحَوْضِ). [خ٦٥٨٩/ م٢٢٨٩].

ژ جوندبی (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: و ئەز ل پێشییا هەوەمە ل سەر کانییا کەوسەرێ.

**پەسندکرن و عوزر خواستنە[1] ئەڤە، و یا سێیێ هنگی کتێبێت کریاران ب لەز دکەڤنە د دەستاندا ڤێجا یێ هەی ب دەستێ راستێ وەردگریت و یێ هەی ب دەستێ چەپێ وەردگریت).**

## ١٥ ـ باب: الميزان وحديث البطاقة.

## بابەتێ: ترازییێ و بەحسێ کارتێ.

١٩٤ – عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُؤوسِ الخَلاَئِقِ يَوْمَ القِيَامَةِ، فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلاً، كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ البَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئاً؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لاَ، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ؟ فَيَقُولُ: لاَ، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، فَإِنَّهُ لاَ ظُلْمَ عَلَيْكَ اليَوْمَ، فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَيَقُولُ: احْضُرْ وَزْنَكَ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! مَا هَذِهِ البِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ؟ فَقَالَ: إِنَّكَ لاَ تُظْلَمُ، قَالَ: فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كَفَّةٍ وَالبِطَاقَةُ فِي كَفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ البِطَاقَةُ، فَلاَ يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللهِ شَيْءٌ**).

[ت٢٦٣٩/ جه٤٣٠٠].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی رۆژا قیامەتێ خودێ دێ مرۆڤەکی ژ ئوممەتا من پێش چاڤێت خەلکی هەمییێ رزگارکەت، ڤێجا دێ نۆت و نەه تۆمار (سجل) ل سەر بەلاڤ بن، هەر ئێك هندە هندی چاڤ ڤەترە بکەن، پاشی (خودێ) دێ بێژیتێ: تو تشتەکی ژ ڤان نەدورست ددانی؟**

---

[1] پێشبەرییا ئێکێ بەرهڤانییێ ژ خۆ دکەن و هێجەتان دگرن و یا دووێ کار و کریارێت خۆ پەسند دکەن و داخوازا لێبۆرین عوزر ڤەخواستنێ دکەن.

**ملیاکەتێت من یێت نڤیسکار و پارێزەر ستەمەك ل تە کرییە؟ دێ بێژیت: نەخێر ئەی خودایێ من، (خودێ) دێ بێژیتێ: ئەرێ تە دەستویرییەك هەیە؟[1] دێ بێژیت: نەخێر ئەی خودا، (خودێ) دێ بێژیت: بەلێ تە خێرەکا هەی[2] ئەڤرۆ ستەم ل تە ناهێتە کرن، کارتەکێ دێ دەرئێخن ل سەر نڤیسییە:** (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، **(خودێ) دێ بێژیت: کا بارێ خۆ بینە[3] دێ بێژیت: ئەی خودا ئەڤ کارتە چییە بەرامبەر ڤان تۆماران، (خودێ) دێ بێژیت: ب راستی ستەم ل تە ناهێتە کرن، ڤێجا دێ تۆماران دانن د رەخەکیدا و کارتێ کەنە د رەخەکیدا، دێ تۆمار سڤك بن و کارت گران بیت، چو تشت ب سەر ناڤێ خودێ ناکەڤن و زکرێ خودێ ب سەر هەمی گونەهان دکەڤیت).**

١٦ ـ باب أول الأمم حسابا.

**بابەتێ: ئوممەتا ئێکێ پرسین د گەل دئێتە کرن.**

١٩٥ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (نَحْنُ آخِرُ الْأُمَمِ، وَأَوَّلُ مَنْ يُحَاسَبُ، يُقَالُ: أَيْنَ الْأُمَّةُ الْأُمِّيَّةُ وَنَبِيُّهَا؟ فَنَحْنُ الْآخِرُونَ الْأَوَّلُونَ). [جه٤٢٩٠].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەم دویماهی ئوممەتین و یێت ئێکێینە پرسین د گەل دئێتە کرن، دێ هێتە گۆتن: کا ئوممەتا نەخواندەوار و پێغەمبەرێ وان، ڤێجا ئەم دویماهیکین و یێت ئێکێینە)[4].**

---

(١) ئانکو بێژی ئەڤە بێ دەستی بوو یان نە ب من بوو یان ب خەلەتیڤە بوو عوزرا خۆ ڤەخوازی.

(٢) نەو خێر جهێ عوزرێ بگریت.

(٣) هەر نۆت و نەهـ تۆماران.

(٤) ئانکو: بەراهییا هەمیان دێ چینە بەحەشتێ.

## ١٧ ـ باب: اهل الفترة.

## بابەتێ: ئەوێت گازییا ئیسلامەتییێ نەگەهشتییێ.

١٩٦ - عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ؛ أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (أَرْبَعَةٌ يَوْمَ القِيَامَةِ: رَجُلٌ أَصَمُّ لاَ يَسْمَعُ شَيْئاً، وَرَجُلٌ أَحْمَقُ، وَرَجُلٌ هَرِمٌ، وَرَجُلٌ مَاتَ فِي فَتْرَةٍ، فَأَمَّا الْأَصَمُّ فَيَقُولُ: رَبِّ! لَقَدْ جَاءَ الْإِسْلاَمُ وَمَا أَسْمَعُ شَيْئاً، وَأَمَّا الْأَحْمَقُ فَيَقُولُ: رَبِّ! لَقَدْ جَاءَ الْإِسْلاَمُ وَالصِّبْيَانُ يَحْذِفُونِي بِالبَعْرِ، وَأَمَّا الهَرِمُ فَيَقُولُ: رَبِّي! لَقَدْ جَاءَ الْإِسْلاَمُ وَمَا أَعْقِلُ شَيْئاً، وَأَمَّا الَّذِي مَاتَ فِي الفَتْرَةِ فَيَقُولُ: رَبِّ مَا أَتَانِي لَكَ رَسُولٌ، فَيَأْخُذُ مَوَاثِيقَهُمْ لَيُطِيعُنَّهُ، فَيُرْسِلُ إِلَيْهِمْ أَنِ ادْخُلُوا النَّارَ. قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ دَخَلُوهَا لَكَانَتْ عَلَيْهِمْ بَرْداً وَسَلاَماً). [حم١٦٣٠١].

* حديث حسن، وإسناده ضعيف.

**ژ ئەسوەدێ كورێ سەریعی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژا قیامەتێ چار دێ هجەتان گرن: مرۆڤەكێ كەڕ گوه ل چو نابیت، و مرۆڤەكێ ساویلك، و مرۆڤەكێ دانعەمر، و مرۆڤەك مربیت و گازییا ئیسلامێ نەگەهشتبیتێ، هندی یێ كەڕە دێ بێژیت: خودایێ من ئیسلام هات و من گوه ل چو نەدبوو، و هندی یێ ساویلكەیە دێ بێژیت: خودایێ من ئیسلام هات و زاڕۆكان پشكل دهاڤێتنە من، و یێ دانعەمر دێ بێژیت: ئیسلام هات و ئەز چو تێ نەدگەهشتم[1] و هندیكە یێ مری و گازییا ئیسلامێ نەگەهشتییێ دێ بێژیت: خودایێ من، چو پێغەمبەر بۆ من نەهاتینە، خودێ دێ پەیمانێت وان ژ وان وەرگریت ئەو گوهدارییا خودێ بكەن[2]، خودێ دێ هنارتییەكی هنێریتە دەڤ وان و فەرمانا وان كەت هەرنە د ئاگریدا، گۆت: ئەز ب وی كەمە یێ جانێ موحەممەدی د دەستێ ویدا ئەگەر چۆبانە تێدا دا ئاگر بۆ وان سار و سلامەتی بیت).**



---

(١) من فام و عەقل نەمابی.

(٢) هەر فەرمانەكا ل وان بكەت دێ رازی بن.

## الفصل الثالث: احاديث في الجنة والنار.

## پشکا سێیێ: فەرمودەیێت بەحەشتێ و جەهنەمێ.

### ١ . باب حجب الجنة بالمكاره.

### بابەتێ: بەحەشت ب نەخۆشییان هاتییە نافبڕکرن.

١٩٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ، وَحُجِبَتِ الجَنَّةُ بِالمكارِهِ**).. [خ٦٤٨٧، م٢٨٢٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جەهنەم ب دلخوازییان یا هاتییە پەرجانکرن، و بەحەشت ب نەخۆشییان یا هاتییە پەرجانکرن)[1].**

١٩٨ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ**). [م٢٨٢٢].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەحەشت یا دۆرپێچکرییە ب نەخۆشییان و جەهنەم یا دۆرپێچکرییە ب دلخوازییان).**

١٩٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لَمَّا خَلَقَ اللهُ الجَنَّةَ وَالنَّارَ، أَرْسَلَ جِبْرِيلَ إِلَى الجَنَّةِ، فَقَالَ: انْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَجَاءَهَا وَنَظَرَ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعَدَّ اللهُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهِ، قَالَ: فَوَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالمَكَارِهِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا، فَانْظُرْ إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهَا، فَإِذَا هِيَ قَدْ حُفَّتْ بِالمَكَارِهِ، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خِفْتُ أَنْ لاَ يَدْخُلَهَا أَحَدٌ.**

[1] هەرکەسێ ل وی پەرجانی بدەت دێ چیتە تێدا.

قَالَ: اذْهَبْ إِلَى النَّارِ، فَانْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لِأَهْلِهَا فِيهَا، فَإِذَا هِيَ يَرْكَبُ بَعْضُهَا بَعْضاً، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدْخُلَهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالشَّهَوَاتِ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لاَ يَنْجُوَ مِنْهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا). اللفظ للترمذي.

[د٤٧٤٤/ ت٢٥٦٠/ ن٣٧٧٢].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمێ خودێ بەحەشت و جەهنەم چێکرین، جبریل هنارتە بەحەشتێ، و گۆتێ: بەرێ خۆ بدەیێ و تشتێ من تێدا بۆ خەلکێ وێ بەرهەڤ کری، گۆت: هاتە بەحەشتێ و بەرێ خۆ دایێ و ئەوا خودێ بۆ خەلکێ وێ تێدا بەرهەڤ کری، گۆت: زڤری دەڤ خودێ و گۆت: ئەز ب هێزا تە سویند دخۆم، کەسێ گوه لێ نابیت[1] و نەچیتێ[2] دێ فەرمان لێ هێتە کرن، ڤێجا دێ ب نەخۆشییان هێتە دۆرپێچکرن، گۆت: بزڤرە بەحەشتێڤە بەرێ خۆ بدەیێ و یا من بۆ خەلکێ وێ تێدا بەرهەڤ کری، گۆت: زڤریڤە بەحەشتێ دیت یا ب نەخۆشییان هاتییە دۆرپێچکرن، ئینا زڤری و گۆت: ئەز ب هێزا تە سوین دخۆم ئەز دترسم کەس نەچیتێ)[3].**

**گۆت: (هەرە جەهنەمێ بەرێ خۆ بدەیێ و کا من چ بۆ خەلکێ وێ تێدا بەرهەڤ کرییە، بەرێ خۆ دایێ ل ئێك و دو سویار دبیت، ئینا زڤری و گۆت: ئەز ب هێزا تە سویند دخۆم نینە کەسەکێ گوه لێ ببیت[4] و بچیتێ[5] فەرمان لێ کر و ب دلخوازییان دۆرپێچ کر و**

---

(١) کا چەندا خۆش و چ خەلات و خۆشی بۆ خەلکێ وێ تێدانە.

(٢) ئانکو: دێ ئێکا هند کەت بچیتێ و ژ دەستێت خۆ نەبەت.

(٣) هندی هند یا ب زەحمەتە و رێکا وێ یا پڕ ئاستەنگە.

(٤) کا چەندا دژوار و ب ئازار و نەخۆشییە.

(٥) ئانکو :دێ ئێکا هند کەت نەچیتێ.

**گۆت: بزڤرەیێ، زڤرییێ، ئینا گۆت: ئەز ب هێزا تەكەمە ئەز دترسم كەس ژێ رزگار نەبیت و كەسەك نەمینیت نەچیتێ).**

٢ ـ باب رؤية الانسان مقعده من الجنة والنار.

**بابەتێ: مرۆڤ جهێ خۆ ل بەحەشتێ و جەهنەمێ ببینیت.**

٢٠٠ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لاَ يَدْخُلُ أَحَدٌ الجَنَّةَ، إِلاَّ أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ لَوْ أَسَاءَ، لِيَزْدَادَ شُكْراً، وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ، إِلاَّ أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ لَوْ أَحْسَنَ، لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً). [خ٦٥٦٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(كەس ناچیتە بەحەشتێ ئەگەر جهێ خۆ ل جەهنەمێ نەبینیت ئەگەر خرابی كربا، دا زێدەتر سوپاسییا خودێ بكەت و دلخۆشتر بیت، و كەس ناچیتە جەهنەمێ ئەگەر جهێ خۆ ل بەحەشتێ نەبینیت ئەگەر باشی كربا، دا بۆ ببیتە پەشێمانی و پتر بێتە ئێشاندن).**

٣ ـ باب: قرب الجنة والنار:

**بابەتێ: نێزیكییا بەحەشتێ و جەهنەمێ.**

٢٠١ – (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعود رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (الجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ، وَالنَّارُ مِثْلُ ذلِكَ). [خ٦٤٨٨].

ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بەحەشت بۆ ئێك ژ هەوە ژ قەیتانا پێلاڤا وی نێزیكترە و جەهنەم ژی هەر هند)**[1].

---

(١) ئانكو خێر ب سانهی دێ تە بەنە بەحەشتێ و كرنا گونەهان ژی و دویڤچۆنا دلخوازییان ب ساناهی دێ تە بەنە جەهنەمێ نە خێرێ كێم بزانە بكەی و نە گونەهێ كێم بزانە خۆ ژێ بدەیە پاش.

٢٠٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَا رَأَيْتُ مِثْلَ النَّارِ نَامَ هَارِبُهَا، وَلاَ مِثْلَ الجَنَّةِ نَامَ طَالِبُهَا). [ت٢٦٠١].

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من نەدیتییە وەكی جەهنەمێ یێ ژێ ب رەڤیت بنڤیت(١)، و نەوەكی بەحەشتێ داخوازكەرێ وێ بنڤیت)(٢).**

٤ ـ باب: تحاجت الجنة والنار.

**بابەتێ: هەڤڕكییا بەحەشتێ و جەهنەمێ.**

٢٠٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (تَحَاجَّتِ الجَنَّةُ وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالمُتَكَبِّرِينَ وَالمُتَجَبِّرِينَ، وَقَالَتِ الجَنَّةُ: ما لِي لاَ يَدْخُلُنِي إِلاَّ ضُعَفَاءُ النّاسِ وَسَقَطُهُمْ؟ قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ منْ عِبَادِي، وَقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ: فَلاَ تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ: قَطٍ قَطٍ قَطٍ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلاَ يَظْلِمُ اللهُ مِنْ خَلْقِهِ أَحَداً، وَأَمَّا الجَنَّةُ: فَإِنَّ اللهَ عزّ وجل يُنْشِئُ لَهَا خَلْقاً). [خ٤٨٥٠ (٤٨٤٩)/ م٢٨٤٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بەحەشت و جەهنەم د هەڤڕك چۆن، جەهنەمێ گۆت: ئەز یا هاتیمە تایبەتكرن ب خۆمەزنكەر و حەڤدژمنان، و بەحەشت دێ بێژیت: من خێرە كەس ناهێتە من لاوازێت مرۆڤان و شكەستییێت وان نەبن ؟(٣)، خودایێ پاك و بلند گۆتە بەحەشتێ: تو دلۆڤانییا منی ئەز ب تە دلۆڤانییێ ب**

---

(١) چونكی یێ ژ جەهنەمێ برەڤیت و بترسیت نانڤیت و بێ ئاگەه و غافل نابیت.

(٢) و یێ بەحەشت بڤێت و بەحەشتێ بخوازیت نانڤیت، نڤستن نە دەرگەهـ ڤوتان و رێگرتنا بەحەشتێیە و نەخواستنا وێیە بەلكی بەحەشت ب كار و كریاران دهێتە خواستن.

(٣) ئانكو شكەستی د چاڤێت خەلكیدا ژ بەر لاوازییا وان یان هەژارییا وان.

**وی دبەم یێ من بڤێت ژ بەندەیێت من، و گۆتە جەهنەمێ: تو ئیزایا منی ئەز ب تە وی ئیزا ددەم یێ من بڤێت ژ بەندەیێت من، و یا هەردوکان دڤێت تژی ببن، هندیکە جەهنەمە تژی نابیت هەتا خودێ پێ خۆ نەکەتە تێدا هینگێ دێ بێژیت: بەسە بەسە بەسە، وی دەمی دێ تژی بیت و دێ گەهیتە ئێکدو ل سەر وان یێت تێدا و خودێ ستەمێ ل کەسێ ناکەت ژ چێکرییێت خۆ، و هندی بەحەشتە خودایێ هەر ب هێز و مەزن هندەکان بۆ چێ دکەت).**

٥ . باب: عامة أهل الجنة وعامة أهل النار.

**بابەتێ: پترییا خەلکێ بەحەشتێ و پترییا خەلکێ جەهنەمێ.**

٢٠٤ - (ق) عَنْ أُسَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (قُمْتُ عَلَى بَابِ الجَنَّةِ، فَكانَ عامَّةَ مَنْ دَخَلَهَا المَسَاكِينُ، وَأَصْحَابُ الجَدِّ مَحْبُوسُونَ، غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ، وَقمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ). [خ٥١٩٦/ م٢٧٣٦].

ژ ئوسامەی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەز د دەرگەهێ بەحەشتێدا راوەستام پرانییا ئەوێت چۆینە تێڤە ئێخسیر و فەلەندەرن[1] و خودانێت بەختی و زەنگینییێ د ڤەگرتینە[2] بەلێ زەنگینێت خەلکێ جەهنەمێ فەرمانا وان بۆ جەهنەمێ یا هاتییە دان. و ئەز د دەرگەهێ جەهنەمێدا راوەستام، هەمی ئەوێت چۆینە تێڤە ژن بوون).**

٢٠٥ - (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (اطَّلَعْتُ فِي الجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). [خ٣٢٤١].

**ژ عیمرانێ کورێ حوسەینی خودێ** (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) **گۆت: (من بەرێ خۆ دا بەحەشتێ من دیت بارا پتر خەلکێ وێ هەژارن، و من بەرێ خۆ دا جەهنەمێ من دیت بارا پتر خەلکێ وێ ژنن).**

[1] نەڤە نیشانە هەژار دێ بەری زەنگینان چنە بەحەشتێ.

[2] و حسێبا وان هێژ خلاس نەبوویە وەکی هەژاران دا بچنە بەحەشتێ.

٢٠٦ – (م) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ المجَاشِعِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ فِي خُطْبَتِهِ: **(أَلاَ إِنَّ رَبِّي أَمَرَنِي أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا عَلَّمَنِي يَوْمِي هَذَا، كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْداً حَلاَلٌ، وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ، وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَاناً. وَإِنَّ اللهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ، عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ؛ إِلاَّ بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ.**

وقَالَ: **إِنَّمَا بَعَثْتُكَ لأَبْتَلِيَكَ وَأَبْتَلِيَ بِكَ، وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَاباً لاَ يَغْسِلُهُ المَاءُ، تَقْرَؤُهُ نَائِماً وَيَقْظَانَ. وَإِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أُحَرِّقَ قُرَيْشاً، فَقُلْتُ: رَبِّ! إِذاً يَثْلَغُوا رَأْسِي فَيَدَعُوهُ خُبْزَةً. قَالَ: اسْتَخْرِجْهُمْ كَمَا اسْتَخْرَجُوكَ، وَاغْزُهُمْ نُغْزِكَ، وَأَنْفِقْ فَسَنُنْفِقُ عَلَيْكَ، وَابْعَثْ جَيْشاً نَبْعَثْ خَمْسَةً مِثْلَهُ، وَقَاتِلْ بِمَنْ أَطَاعَكَ مَنْ عَصَاكَ.**

قَالَ: **وَأَهْلُ الجَنَّةِ ثَلاَثَةٌ: ذو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ. وَرَجُلٌ رَحِيمٌ رَقِيقُ القَلْبِ لِكُلِّ ذِي قُرْبَى وَمُسْلِمٍ. وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذو عِيَالٍ.**

قَالَ: **وَأَهْلُ النَّارِ خَمْسَةٌ: الضَّعِيفُ الَّذِي لاَ زَبْرَ لَهُ، الَّذِينَ هُمْ فِيكُمْ تَبَعاً لاَ يَتْبَعُونَ أَهْلاً وَلاَ مَالاً، وَالخَائِنُ الَّذِي لاَ يَخْفَى لَهُ طَمَعٌ، وَإِنْ دَقَّ إِلاَّ خَانَهُ، وَرَجُلٌ لاَ يُصْبِحُ وَلاَ يُمْسِي إِلاَّ وَهُوَ يُخَادِعُكَ عَنْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ**). وَذَكَرَ البُخْلَ أَوِ الكَذِبَ، (**وَالشِّنْظِيرُ الفَحَّاشُ**).

[م٢٨٦٥].

- زاد في رواية: (**وَإِنَّ اللهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلاَ يَبْغِي أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ**).

**ژ عەیازێ كورێ حیمارێ موجاشعی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژەكێ د گۆتارا خۆدا گۆت: (ب راستی خودایێ من فەرمان ل من كر ئەز وێ نیشا هەوە بدەم یا هوین نەزانن ژ وێ یا ئەڤرۆ نیشا من دای؛ هەر مالەكێ من دابیتە بەندەیەكی بۆ وی**

**حەلاله[١] و من بەندەیێت خۆ هەمی ژ نەراستی و خرابییێ ڤەدەر یێت چێکرین، و شەیتان ب ئاوازێت خۆ هاتنە وان و بەرێ وان ژ دینێ وان وەرگێرا و فەرمانا وان کرن ئەو وی بۆ من بکەنە هەڤپشك یێ من چو نیشان و بەلگە پێ نەئینانە خوارێ، و خودێ بەرێ خۆ دا خەلکێ عەردی[٢] کەرب ژ وان ڤەبوون عەرەبێ وان و عەجەمێ وان[٣] کێمەك نەبن ژ ئیسرائیلییان[٤].**

**و (خودایێ من) گۆت: ب راستی مە تو یێ هنارتی دا تە بجەرببینین[٥] و (ملەتێ تە) ب تە بجەرببینین[٦] و من کتێبەك بۆ تە ئینا خوار ئاڤ نەشۆت[٧] نڤستی و هشیار دێ خوینی[٨] و خودێ فەرمانا من یا کری ئەز (گاورێت) قورەیشییان ژ ناڤ ببەم، من گۆت: خودایێ من هۆسا دێ سەرێ من شکێنن و وەکی سەوکا ڤەکری هێلن. گۆت: وان دەربێخە هەروەکی وان تو دەرئێخستی و جیهادێ د گەل وان بکە دێ هاریکارییا تە کەین، و مەزاختنێ بکە دێ شوینێ دەینە تە، و لەشکەرەکی بهنێرە (بچویك بیت مەزن بیت) دێ پێنج جارا هندی وان ملیاکەتان هنێرن، و ب وان ئەوێت گوهدارییا تە دکەن شەرێ وان بکە ئەوێت نەگوهدارییا تە دکەن.**

---

(١) نابیت کەس حەرام بکەت و هشیار بن حەلالێ من دایە هەوە حەرام نەکەن.

(٢) بەری هنارتنا پێغەمبەرێ مە (ﷺ).

(٣) ژ بەر گاوری و شیرکا وان دکر.

(٤) ژ جوهی و فەلان ئەوێت پشتی پێغەمبەر (ﷺ) هاتی باوەری پێ ئینایین و دینێ خۆ هێلایین.

(٥) کا دێ بێهنا خۆ ل سەر ئەزیەتا ملەتێ خۆ فرەهـ کەی.

(٦) کا دێ گاورییێ کەن یان دێ باوەرییێ ئینن.

(٧) ئانکو نە بەس د بەرپەراندایە هەتا ب ئاڤێ بهێتە شویشتن، بەلکی یا د سینگاندا یان مەرەم پێ هەر دێ مینیت و کتێب نینە وێ پویچ کەت و نەسخ کەت.

(٨) ئانکو ل سەر دلێ تەیە و ناچیت.

و گۆت: خەلكێ بەحەشتێ سێنە: خودان دەستهەلاتدارەكێ دادپەروەر و سەركەفتی، و زەلامەكێ دلۆڤان و دلنازك بیت بۆ هەر مرۆڤەكێ خۆ و هەر موسلمانەكی، و دلپاكەكێ دلپاكخوازێ خودان بچویك[1].

و خەلكێ جەهنەمێ پێنجن: لاوازێ عەقل و فام نەی وی ژ تشتێ خراب بدەنە پاش ئەوێت د گەل هەوە و دویڤ گۆمانان دكەڤن و نە خیزانا حەلا داخوازا وانە و نە مالێ حەلال و خائینێ تەماعییا وی نەهێتە ڤەشارتن و چاوا بیت چەند هویر بیت هەر دێ خیانەتێ كەت، و زلامەك سپێدە لێ نابیت و ئێڤار لێ نابیت ئەگەر خاپاندنا تە ل سەر مال و مالا خۆ نەكەت، و بەحسێ چرویكی یان درەوینی و سنج خرابێ ئەزمان پیس كر. و ئەبو غەسانی د حەدیسا خۆدا بەحسێ بمەزێخە ئەز دێ شوینێ دەمە تە نەكر).

- و د ڤەگێڕەكا دیدا زێدە كرییە: (ب راستی خودێ وەحی بۆ من هنارت، خۆ بشكێنن، دا كەس خۆ ل سەر كەسێ مەزن نەبینیت و كەس دەست درێژییێ ل سەر كەسێ نەكەت، و كەس خۆ ل سەر كەسێ مەزن نەكەت).

٦ ـ باب: في نعيم الجنة وعذاب النار.

بابەتێ: خۆشییا بەحەشتێ و ئازارا جەهنەمێ.

٢٠٧ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا، مِنْ أَهْلِ النَّارِ، يَوْمَ القِيَامَةِ، فَيُصْبَغُ فِي النَّارِ صَبْغَةً، ثُمَّ يُقَالُ: يَا ابْنَ آدَمَ! هَلْ رَأَيْتَ خَيْراً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ، وَاللهِ! يا رَبِّ! وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْساً فِي الدُّنْيَا، مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ! هَلْ رَأَيْتَ بُؤْساً قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لاَ وَاللهِ! يَا رَبِّ! مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلاَ رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ). [م٢٨٠٧].

(١) د گەل هەوجەییا خۆ ژی خازۆكییێ ناكەت.

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژا قیامەتێ یێ ژ هەمیان ب خۆشیتر ژ خەلكێ دنیایێ ژ جەهنەمیان دێ ئینن، دێ جارەكێ وی د جەهنەمێ هەلینن، پاشی دێ بێژنێ: هەی كوڕێ ئادەمی ئەرێ جارەكێ تە خۆشییەك دیتییە؟ ئەرێ جارەكێ خۆشییەك ب سەر تەدا هاتییە؟ دێ بێژیت: ئەز ب خودێ كەممە نەخێر ئەی پەروەردگارێ من. و یێ ژ هەمیان پتر نەخۆشی برین ژ خەلكێ دنیایێ ژ بەحەشتییان دێ ئینن، و دێ جارەكێ وی د بەحەشتێ هەلینن، پاشی دێ بێژنێ: هەی كوڕێ ئادەمی ئەرێ جارەكێ تە نەخۆشییەك دیتییە؟ ئەرێ جارەكێ گرانییەك ب سەر تەدا هاتییە؟ دێ بێژیت: ئەز ب خودێ كەممە نەخێر، نە من جارەكێ نەخۆشییەك دیتییە، و نە جارەكێ گرانییەك ب سەر مندا هاتییە).**

٧ ـ باب: ينادي خلود فلا موت:

**بابەتێ: دێ هێتە گازیكرن هەر مانە و مرن نینە.**

٢٠٨ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يُؤْتَى بِالمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ، فَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تعْرِفُونَ هَذا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، هذَا المَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ. ثُمَّ يُنَادِي: يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هـذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، هـذَا المَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ، فَيُذْبَحُ. ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ﴾ وهؤُلاءِ فِي غَفْلَةٍ أَهْلُ الدُّنْيَا. ﴿وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ [مريم:٣٩] ).

[خ٤٧٣٠/ م٢٨٤٩].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دێ مرنێ ل سەر رەنگێ بەرخەكێ رەشسپیتالە ئینن و دێ گازیكەرەك گازیكەت: گەلی خەلكێ بەحەشتێ، دێ ستۆیێت خۆ بلندكەن و بەرێ خۆ دەنێ، دێ بێژیت: هوین دزانن ئەڤە چییە؟ دێ بێژن بەلێ ئەڤە مرنە، و هەمیان ئەو دیت، پاشی دێ گازیكەت: گەلی خەلكێ**

جەهنەمێ، دێ ستۆیێت خۆ بلندكەن و بەرێ خۆ دەنێ، دێ بێژیت: هوین دزانن ئەڤە چییە؟ دێ بێژن بەلێ ئەڤە مرنە، و هەمیان ئەو دیت، دێ هێتە ڤەكوشتن، پاشی دێ بێژیت: گەلی خەلكێ بەحەشتێ هەرمانە و مرن نینە، و گەلی خەلكێ جەهنەمێ هەرمانە و مرن نینە، پاشی خواند: ﴿وَأَنْذِرْهُمْ يوم الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ﴾(١) و ئەڤە خەلكێ دنیایێ یێت د بێ ئاگەهیییێدا ﴿وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾).

٨ ـ باب لكل انسان منزلان.

**بابەتێ: هەر مرۆڤەكی دو جە یێت هەین.**

٢٠٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ لَهُ مَنْزِلاَنِ: مَنْزِلٌ فِي الْجَنَّةِ، وَمَنْزِلٌ فِي النَّارِ، فَإِذَا مَاتَ، فَدَخَلَ النَّارَ، وَرِثَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْزِلَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ١٠﴾ الآية [المؤمنون]). [جه٤٣٤١].

* صحیح.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە نینە ئەگەر دو جە نەبن، جەهەك ل بەحەشتێ، و جەهەك ل جەهەنەمێ، ڤێجا ئەگەر مر و چۆ جەهەنەمێ جهێ وی دێ گەهیتە خەلكێ بەحەشتێ ئەڤە یە گۆتنا خودێ: ﴿أُولَئِكَ هُمْ الْوَارِثُونَ﴾)(٢).



(١) [هەی موحەممەد] تو وان ژ رۆژا كەسەرێ و زێدەپەشێمانییێ بترسینە [رۆژا خراب ل سەر خرابییا خۆ پەشێمان دبیت، و باش ل سەر كێمییا باشییا خۆ پەشێمان دبیت]، رۆژا حسێب ب دویماهی دئێت [رۆژا بەحەشتی دچنە بەحەشتێ و دۆژەهی دچنە دۆژەهێ]، و بەلێ ئەو [ژ ڤێ رۆژێ] د بێ ئاگەهن، و باوەرییێ پێ نائینن.

(٢) ئانكو: ئەڤەنە ئەوێت بەحەشت ب وێرسی دگەهیتێ.

## الفصل الرابع: عذاب أهل النار.

## پشکا چارێ: ئیزایا خەلکێ جەهنەمێ.

### ١ ـ باب: شدة نار جهنم.

### بابەتێ: دژوارییا ئاگرێ جەهنەمێ

٢١٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**نَارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءاً مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ**). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً، قَالَ: (**فُضِّلَتْ عَلَيْهِنَّ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءاً، كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا**). [خ٣٢٦٥، م٢٨٤٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئاگرێ هەوە[1] پشکەکە ژ حەفتێ پشکێت ئاگرێ جەهنەمێ، هاتە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو تنێ بەس بوو، گۆت: ئەو شێست و نەه پشکان زێدەترە هەر ئێك ژ وان وەکو گەرما ئاگرێ هەوە یێ دنیایێیە).**

٢١١ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مسعودٍ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ، مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا**). [م٢٨٤٢].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وێ رۆژێ[2] دێ جەهنەمێ ئینن، حەفتێ هزار هەڤسار پێت هەین، و هەر هەڤسارەکی حەفتێ هزار ملیاکەت دکێشن).**

---

(١) یێ دنیایێ یێ هوین بۆ هەوجەییان ب کار دئینن.

(٢) مەرەم پێ رۆژا قیامەتێیە

٢١٢ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) إِذْ سَمِعَ وَجْبَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(تَدْرُونَ مَا هَذَا)** ؟ قَالَ: قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: **(هَذَا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ فِي النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفاً، فَهُوَ يَهْوِي فِي النَّارِ الآنَ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى قَعْرِهَا)**. [م٢٨٤٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) دەمێ گوه ل دەنگێ کەتنەکێ بووی، ئینا گۆت: هوین دزانن ئەڤە چییە؟ مە گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: (ئەڤە بەرەك بوو حەفتێ سال بوون هاڤێتییە د جەهنەمێدا ژ نوی ڤێ گاڤێ گەهشتە بنێ جەهنەمێ، هەوە گوه ل دەنگێ کەتنا وی بوو).**

٢ . باب قول النار هل من مزيد.

**بابەتێ: دەمێ جەهنەم دبێژیت: ژ بلی ڤان هێژ هەنە.**

٢١٣ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ تَزَالُ جَهَنَّمُ تَقُولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ العِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ، فَتَقُولُ: قَطِ قَطِ وَعِزَّتِكَ، وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ)**.

[خ٦٦٦١، (٤٨٤٨)/ م٢٨٤٨].

- وزاد في رواية لهما: **(وَلاَ تَزَالُ الجَنَّةُ تَفْضُلُ، حَتَّى يُنْشِىءَ اللهُ لَهَا خَلْقاً، فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الجَنَّةِ)**. [خ٧٣٨٤].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەردەوام جەهنەم دێ بێژیت: هێژ هەنە هێژ ماینە هەتا خودایێ خودان هێز پێ خۆ دکەتە**

**تێدا[1] جەهنەم دێ بێژیت: بەسە بەسە و دێ کۆم بیتەڤە سەرێك و هندەك گەهیتە یا دی ب سەر خەلکێ خوڤە).**

- و د ڤەگێرەکا هەردوکاندا زێدە هاتییە: **(و هندە جھ ل بەحەشتێ دێ ڤالا مینن هەتا خودێ هندەك چێکرییان بۆ چێ دکەت و وان دبەتە جهێ مایی ل بەحەشتێ).**

٣ . باب: حال الكافر في النار.

**بابەتێ: رەوشا گاوری د جەهنەمێدا.**

٢١٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ضِرْسُ الكَافِرِ، أَوْ نَابُ الكَافِرِ، مِثْلُ أُحُدٍ. وَغِلَظُ جِلْدِهِ مَسِيرَةُ ثَلاَثٍ).** [م٢٨٥١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ددانێ کورسی یان ددانێ بەرێ دەڤی یێ گاوری (د جەهنەمێدا) تەمەت چیایێ ئوحودێیە و ستویراتییا پیستێ وی ڤویناغا سێیانە)[2].**

٤ . باب: اهون أهل النار عذابا.

**بابەتێ: یێ ئیزایا وی ژ خەلکێ جەهنەمێ سڤکتر.**

٢١٥ - (ق) عَن النعمانِ بْنِ بشير قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ القِيَامَةِ لَرَجُلٌ، تُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَةٌ، يَغْلِي مِنْهَا دِمَاغُهُ).** [خ٦٥٦١/ م٢١٣].

ژ نەعمانێ کورێ بەشیری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: **من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو** (ﷺ) دگۆت: **(یێ ئیزایا وی رۆژا قیامەتێ ژ هەمیان سڤکتر زەلامەکە دێ پەلەکی دانن بن پێت وی مەژییێ وی ژ بەر وی پەلی دکەلیت).**

---

(١) و کەس وەکی خودێ نینە چاوا دێ کەتە تێدا و ب چ رەنگ نەڤە پەیوەندی ب مەڤە نینە یا پەیوەندی ب مەڤە ئەم باوەرییێ بینن و ئەم دەڤی نەبادەین (تەئویل نەکەین).

(٢) سێ رۆژان یان سێ شەڤان.

٢١٦ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**يَقُولُ اللهُ تَعَالَى لأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً يَوْمَ القِيَامَةِ: لَوْ أَنَّ لَكَ ما في الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَكُنْتَ تَفْتَدِي بِهِ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هذَا، وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ: أَنْ لاَ تُشْرِكَ بِي شَيْئاً، فَأَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تُشْرِكَ بِي**).[خ٦٥٥٧ (٣٣٣٤)/ م٢٨٠٥].

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودایێ هەر بلند، رۆژا قیامەتێ دێ بێژیتە یێ ئیزایا وی ژ هەمیان سڤکتر ئەگەر هەر تشتێ د دنیایێدا هەی یێ تە با، دا پێش خۆڤە دەی و کەیە قوربانی خۆ؟. دێ بێژیت: بەلێ، دێ بێژیت: من کێمتر ژ ڤێ ژ تە دڤیا و تو د پشتا ئادەمیدا بووی تو چو شریکان بۆ من چێ نەکەی و تە ئەڤە نەکر هەتا تە شریک بۆ من چێکرین)**.

٥ ـ باب: قوم ارتدوا على ادبارهم.

**بابەتێ: هندەک پێت سەردا چۆین.**

٢١٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذَا زُمْرَةٌ، حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ** رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ، فَقَالَ: هَلُمَّ، فَقُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: إِلَى النَّارِ وَاللهِ، قُلْتُ: وَمَا شَأْنُهُمْ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ القَهْقَرَى. ثُمَّ إِذَا زُمْرَةٌ، حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ، فَقَالَ: هَلُمَّ، قُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: إِلَى النَّارِ وَاللهِ، قُلْتُ: مَا شَأْنُهُمْ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ القَهْقَرَى، فَلاَ أُرَاهُ يَخْلُصُ مِنْهُمْ إِلاَّ مِثْلُ هَمَلِ النَّعَمِ). [خ٦٥٨٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(د دەمەکیدا ئەز یێ نڤستی بووم، من هند دیت کۆمەکا مرۆڤانە هەتا من ئەو نیاسین، زەلامەک د ناڤبەرا من و واندا دەرکەفت[1]، و گۆتە وان: دێ وەرن، من گۆتێ: بۆ کیرێ؟ گۆت: بۆ جەهنەمێ ب خودێ، من گۆت: و وان خێرە وان چ کرییە؟ گۆت: ئەو پشتی تە پێت سەردا چۆین و پشت و پشت زڤرین، پاشی من هند دیت کۆمەکا دی یا مرۆڤانە هەتا من نیاسین، زەلامەک د**

[1] مەبەست ملیاکەتەک ل سەر خولکێ زەلامان.

**ناڤبەرا من و واندا دەركەفت[1]، و گۆت: وەرن، من گۆت: بۆ كیڤە؟ گۆت بۆ جەهنەمێ ب خودێ، من گۆت: ما وان چ كرییە؟. گۆت ب راستی ئەو پشتی تە پێت سەردا چۆین و پشت و پشت زڤرین، و ئەز هزر ناكەم كەس ژ وان رزگار ببیت و بگەهیتە گەڕا ئاڤێ ئەو نەبیت وەكی حێشترێت بەرزە و بێ شڤان نەبن)[2].**

## ٦ ـ التحذير من النار

## بابەتێ: ترساندن ژ ئاگری

٢١٨ - عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَخْطُبُ فَقَالَ: (**أَنْذَرْتُكُمُ النَّارَ، أَنْذَرْتُكُمُ النَّارَ، أَنْذَرْتُكُمُ النَّارَ**)، فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى لَوْ كَانَ فِي مَقَامِي هَذَا لَسَمِعَهُ أَهْلُ السُّوقِ، حَتَّى سَقَطَتْ خَمِيصَةٌ كَانَتْ عَلَيْهِ عِنْدَ رِجْلَيْهِ. [مي٢٨٥٤].

* إسناده جيد.

ژ نوعمانێ كوڕێ بەشیری (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) گۆتار ددا و دگۆت: **(من هوین ژ جەهنەمێ تراساندن و من گۆتە هەوە چەندا دژوارە و ب چ دێ خۆ ژێ پارێزن، من هوین ژ جەهنەمێ تراساندن و من گۆتە هەوە چەندا دژوارە و ب چ دێ خۆ ژێ پارێزن، من هوین ژ جەهنەمێ تراساندن و من گۆتە هەوە چەندا دژوارە و ب چ دێ خۆ ژێ پارێزن)**، ئەگەر پێغەمبەر ل ڤی جهێ ئەز لێ با دا یێ سویكێ گوه ل دەنگێ وی بیت[3]، گۆت: بەردەوام بوو هەتا جلكەكێ نەخشكری ژ سەر ملێت وی كەفتییە بەر پێت وی.



---

[1] مەبەست ملیاكەتەك ل سەر خولكێ زەلامان.

[2] و ئەڤە ژی گەلەك د كێمن، رامان: ئەو كێم دێ رزگار بن.

[3] هند دەنگێ خۆ بلند كر و هند دوبارە كر.

الفصل الخامس: صفة الجنة وبيان اهلها

## پشكا پێنجێ: سالۆخەتێ بەحەشتێ و دیاركرنا خەلكێ وێ

### ١ ـ باب: أول من يقرع باب الجنة.

### بابەتێ: یێ ئێكێ دەرگەهێ بەحەشتێ دقوتیت.

٢١٩ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَنَا أَكْثَرُ الأَنْبِيَاءِ تَبَعاً يَوْمَ القِيَامَةِ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يَقْرَعُ بَابَ الجَنَّةِ)**.

- وفي رواية: **(أَنَا أَوَّلُ شَفِيعٍ فِي الجَنَّةِ، لَمْ يُصَدَّقْ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ مَا صُدِّقْتُ، وَإِنَّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيّاً مَا يُصَدِّقُهُ مِنْ أُمَّتِهِ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ)**. [م١٩٦].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(رۆژا قیامەتێ دویچۆیێت من ژ یێت هەمی پێغەمبەران پترن، و ئەز یێ ئێكێمە دەرگەهێ بەحەشتێ (بۆ ڤەكرنێ) دقوتم).**

- **و د ڤەگێرەكێدا: (ئەز بەرڤانێ ئێكێمە د بەحەشتێدا، و باوەری ب چو پێغەمبەران نەهاتییە ئینان وەكی باوەری ب من هاتییە ئینان، و ژ پێغەمبەران یێ هەی كەسێ ژ ملەتێ وی باوەری پێ نەئینایە زەلامەك ب تنێ نەبیت).**

### ٢ ـ نعيم الجنة لم يخطر على قلب بشر

### خۆشییێت بەحشتێ نەكەفتینە ل سەر دلێ چو مرۆڤان.

٢٢٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): **(يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ: مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، ذُخْراً، بَلْهَ مَا أُطْلِعْتُمْ**

عَلَيْهِ). ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ [السجدة]. [خ٤٧٨٠ (٣٢٤٤)/ م٢٨٢٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودایێ مەزن گۆت: من تشتێ چو چاڤان نەدیتی و چو گەهان گوه لێ نەبووی و نەکەفتییە سەر دلێ چو مرۆڤان یا بۆ بەندەیێت خۆ یێت قەنج بەرهەڤ کری، ئەگەر هەوە بڤێت بخوینن: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ ما أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جزاءً بِما كَانُوا يعْمَلُونَ﴾[1].**

٣ ـ باب: شجرة في الجنة ظلها مئة عام.

**بابەت: دارەکا ل بەحەشتێ سیبەرا وێ ڤۆناغا سەد سالانە.**

٢٢١ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَشَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عامٍ لاَ يَقْطَعُهَا)**. [خ٦٥٥٢/ م٢٨٢٧].

**ژ سەهلێ کورێ سەعدی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی دارەکا ل بەحەشتێ سویار سەد سالان ل بن سیبەرا وێ دچیت تمام ناکەت).**

٤ ـ باب: سوق الجنة.

**بابەتێ: سویکا بەحەشتێ.**

٢٢٢ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَسُوقاً، يَأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمَالِ فَتَحْثُو فِي وُجُوهِهِمْ وَثِيَابِهِمْ، فَيَزْدَادُونَ حُسْناً وَجَمَالاً، فَيَرْجِعُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ وَقَدِ ازْدَادُوا حُسْناً وَجَمَالاً، فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ: وَاللهِ! لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْناً وَجَمَالاً، فَيَقُولُونَ: وَأَنْتُمْ، وَاللهِ! لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْناً وَجَمَالاً)**. [م٢٨٣٣].

---

[1] رامان ب کورتی: کەس نوزانیت چ خەلات یێ بۆ وان هاتییە ڤەشارتن، چاڤێت وان پێ رۆن ببن و ب دیتنا وی شاد ببن، ژ بەر وان کار و کریارێت وان دکرن.

و ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی سویکەکا ل بەحەشتێ هەی هەمی خوتبا دێ هێنێ، بایێ ژۆری دێ هێت و ل نافچاڤ و جلکێت وان دەت، دێ جوانتر و ماقویلتر لێ هێن، دێ زڤڕنە دەڤ هەڤژینێت خۆ، و ئەو جوانتر و ماقویلتر بێت لێ هاتین، هەڤسەرێت وان دێ بێژنێ: ب خودێ هوین پێت جوانتر و ماقویلتر لێ هاتین، ئەو دێ بێژن: و هوین ژی ب خودێ پێت جوانتر و ماقویلتر لێ هاتین).**

٥ ـ باب صفة خيام الجنة.

**بابەتێ: سالۆخەتێ خیڤەتێت بەحەشتێ.**

٢٢٣ - (ق) عَنْ أَبِي موسى الأَشْعَرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ فِي الجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا سِتونَ مِيلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الآخَرِينَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمْ المؤْمِنُونَ. وَجَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ كَذَا، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا. وَمَا بَيْنَ القَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ). [خ٤٨٧٩، ٤٨٨٠/م١٨٠، ٢٨٣٨].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خیڤەتەکا بەرفرەه یا ل بەحەشتێ، فرەهیا وێ شێست میلن[1]، هەر قولاچەکا وێ خەلکەك یێ لێ کەسێ دی نابینن، باوەریدار ل سەر دگەڕن. و دو باغچەیێت ژ زیڤی، ئامان و هەر تشتێ تێدا، و دو باغچەیێت ژ زێڕی، ئامان و هەر تشتێ تێدا، و چو نامینیت ئەو خودایێ خۆ ببینن ژ بلی عەبایێ مەزناتییێ یێ ل بەر دێمێ خودێ د بەحەشتا عەدندا).**

[1] هەر میلەك دبیتە شەش هزار گەزن و ب پێڤەرێ ڤێ گاڤێ دبیتە (١٨٤٨ مەتر.

٦ ـ باب: ما في الدنيا من انهار الجنة.

**بابەتێ: ئەو رویبارێت د دنیایێدا ژ رویبارێت بەحەشتێ.**

٢٢٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**سَيْحَانُ وَجَيْحَانُ، وَالفُرَاتُ وَالنِّيلُ، كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الجَنَّةِ**). [م٢٨٣٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سەیحان و جەیحان و فورات و نیل هەمی ژ رویبارێت بەحەشتێنە)[1].**

٧ ـ باب: نهر الكوثر.

**بابەت : رویبارێ کەوسەرێ.**

٢٢٥ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا عُرِجَ بِالنَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى السَّمَاءِ، قَالَ: (**أَتَيْتُ عَلَى نَهَرٍ حافَتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ مُجَوَّفاً، فَقُلْتُ: ما هذَا يا جِبْرِيلُ؟ قالَ: هذَا الكَوْثَرُ**). [خ٤٩٦٤ (٣٥٧٠)].

- وفي رواية قالَ: (**هـذَا الكَوْثَرُ الَّذي أَعْطَاكَ رَبُّكَ، فَإِذَا طِينُهُ -أَوْ طِيبُهُ- مِسْكٌ أَذْفَرُ**). [خ٦٥٨١].

[وانظر: ٨١٥].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عەسمانان هاتییە بلندکرن، گۆت: (ئەز هاتمە سەر رویبارەکی رەخێت وی گومبەتکێت لوئلوئێ فرەھ بوون، ئینا من گۆت: ئەڤە چییە ئەی جبریل؟ گۆت: ئەڤە کەوسەرە).**

---

(١) زانایان پتر ژ مەبەستەکێ ب ڤێ چەندێ دیار کرییە، ئێك: بنەتارێ ئێکێ یێ وان ژ بەحەشتێیە، یان مەرەم پێ وەکهەڤیکرنە (تەشبیهکرن) کا چاوا بەحەشت یا خۆش و ب بەرەکەتە ئەڤ رویبارە هۆسا ئاڤا وان یا خۆشە و ب بەرەکەتن.

- **و د ڤەگێرەكێدا دبێژیت: (ئەڤە كەوسەرە یا خودایێ تە دایە تە من هۆ دیت ئاخا وێ یان بێهنا وێ ئەو مسكە یا بێهنا وێ دڤڕیت).**

٨ . باب: أبواب الجنة.

**بابەتێ: دەرگەهێت بەحەشتێ.**

٢٢٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللهِ، نُودِيَ مِنْ أَبْوَابِ الجَنَّةِ: يَا عَبْدَ اللهِ هـذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بابِ الرَّيَّانِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ)**.

فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللهِ، مَا عَلَى مَنْ دُعِيَ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ: **(نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ)**.

[خ١٨٩٧/ م١٠٢٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ جۆتەكێ تشتان (هەر تشتێ هەبیت) د رێكا خودێدا بدەت، دەرگەهێت بەحەشتێ دێ گازیكەنێ: یا بەندەیێ خودێ، تە خێرا ل ڤێرێ هەی، ڤێجا یێ خودان نڤێژ بیت ل دەرگەهێ نڤێژان دێ هێتە گازیكرن، و یێ خودان جیهاد بیت، ل دەرگەهێ جیهادێ دێ هێتە گازیكرن، و یێ خودان رۆژی ل دەرگەهێ رەیان دێ هێتە گازیكرن، و یێ خودان سەدەقە، ل دەرگەهێ سەدەقەیان دێ هێتە گازیكرن).**

**ئەبو بەكری (رضي الله عنه) گۆت: دایك و بابێت من قوربانی تە بن یا پێغەمبەرێ خودێ یێ هاتە گازیكرن ل هەر دەرگەهەكێ هەبیت چو زیان ڤێ ناكەڤیت. ئێك هەیە ژ هەمی دەرگەهانڤە بهێتە گازیكرن؟ گۆت: (بەلێ، و ئەز هیڤی دكەم تو ژ وان بی).**

٩ ـ باب: صفة الزرع.

## بابەت: رەوشا چاندنا بەحەشتێ.

٢٢٧ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَوْماً يُحَدِّثُ، وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ البَادِيَةِ: (أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ فِي الزَّرْعِ، فَقَالَ لَهُ: أَلَسْتَ فِيمَا شِئْتَ؟ قَالَ: بَلَى، ولكِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَزْرَعَ، قَالَ: فَبَذَرَ، فَبَادَرَ الطَّرْفَ نَبَاتُهُ وَاسْتِوَاؤُهُ وَاسْتِحْصَادُهُ، فَكَانَ أَمْثَالَ الجِبَالِ، فَيَقُولُ اللهُ: دُونَكَ يَا ابْنَ آدَمَ، فَإِنَّهُ لاَ يُشْبِعُكَ شَيْءٌ). فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: وَاللهِ لاَ تَجِدُهُ إِلاَّ قُرَشِيّاً أَوْ أَنْصَارِيّاً، فَإِنَّهُمْ أَصْحَابُ زَرْعٍ، وَأَمَّا نَحْنُ فَلَسْنَا بِأَصْحَابِ زَرْعٍ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ (ﷺ). [خ٢٣٤٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: رۆژەكێ پێغەمبەر (ﷺ) دئاخفت و زەلامەك ژ خەلكێ دەشتێ ل دەڤ وی بوو، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (زەلامەكێ خەلكێ بەحەشتێ دەستویری بۆ چاندنێ ژ خودایێ خۆ خواست، ئینا گۆتێ: ما نە هەر تشتێ تە دڤێت تو یێ تێدا؟ گۆت: بەلێ، بەلێ من دڤێت چاندنێ بكەم، گۆت: تۆڤ هاڤێت د چاڤهەلاندنەكێدا شین بوو و گەهشت و هاتە دورین و بەرهەم وەكی چیایان بوو، خودێ دێ بێژیتێ: دێ راكە ئەی كوڕێ ئادەمی ب راستی چو تە تێر ناكەت)[1]، ئینا كۆچەرە عەرەبی گۆت: ئەز ب خودێ كەمە تو وی نابینی یان قورەیشییە یان ئەنسارییە (خەلكێ مەدینێ) ئەو خودانێت چاندنێنە، هندی ئەمین ئەم نە خودانێت چاندنێینە ئینا پێغەمبەری (ﷺ) كرە كەنی.**

١٠ ـ باب: أول زمرة تدخل الجنة.

## بابەتێ: دەستەكا ئێكێ دچنە بەحەشتێ.

٢٢٨ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، لاَ يَبُولُونَ وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، وَلا يَتْفِلُونَ وَلاَ يَمْتَخِطُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ المِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ –

---

[1] مەبەست ئەو نینە بەحەشت وی تێر ناكەت، بەلێ مەبەست ئەوە مرۆڤی د سەر تێراتیێرا ژی هەر دڤێت.

الأَلَنْجُوجُ، عُودُ الطِّيبِ - وَأَزْوَاجُهُمْ الحُورُ العِينُ، عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَم، سِتُّونَ ذِرَاعاً فِي السَّمَاءِ). [خ٣٣٢٧، (٣٢٤٥)/ م٢٨٣٤].

**ژ ئەبی هورەیرە، (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەستەکا ئێکێ دچنە بەحەشتێ یێ ل سەر وێنێ هەیڤا چاردەشەڤی، پاشی یێت دویڤرا وەکی ستێرا ژ هەمیان گەشتر ل عەسمانی، نە دمیزن و نە دچنە دەستنڤێژا ستویر و نە تف دکەن و نە کف دکەن. شەهێت وان زێرن و خوها وان مسکە، و ئامانێ وان یێ بخویریێ ئەو ب خۆ بخویرە، پەری یێت جاڤ گر هەڤسەرێت وانن، هەمی یێت ل سەر چێکرنا ئێك زەلامی وێنێ بابێ خۆ ئادەمی شێست گەزان د بلندن).**

١١ ـ باب: يدخل الجنةسبعون الفا على صورة القمر.

**بابەتێ: حەفتێ هزار ل سەر وێنێ هەیڤێ دێ چنە بەحەشتێ.**

٢٢٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي زُمْرَةٌ هُمْ سَبْعُونَ أَلْفاً، تُضِيءُ وُجُوهُهُمْ إِضَاءَةَ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ**). وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ الأَسَدِيُّ يَرْفَعُ نَمِرَةً عَلَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! اجْعَلْهُ مِنْهُمْ**)، ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: (**سَبَقَكَ عُكَّاشَةُ**). [خ٦٥٤٢ (٥٨١١)، م٢١٦].

**ژ ئەبی هورەیرە، (ﷺ) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (دەستەکا ئێکێ دچنە بەحەشتێ حەفتێ هزارن روییێت وان رۆناهییێ ددەن وەکی رۆناهییا هەیڤێ).**

**ئینا عوکاشەیێ کورێ موحصەنی رابی و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ من دوعا ژ خودێ بکە ئەز ژ وان بم، گۆت: (تو ژ وانی) پاشی زەلامەك ژ خەلکێ مەدینەیێ رابوو و**

**گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دوعا ژ خودێ بکە ئەز ژ وان بم، گۆت: (عوکاشەی د بەری تە راکر).**

١٢ ـ باب: يدخلون الجنة سبعون الفاً بغيرِ حسابٍ.

**بابەتێ: حەفتێ هزار بێ حسێب و بێ ئیزا دێ چنە بەحەشتێ**

٢٣٠ - (م) عَنْ عِمْرَانَ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ): (**يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفاً بِغَيْرِ حِسَابٍ**) قَالُوا: وَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**هُمُ الَّذِينَ لاَ يَكْتَوُونَ وَلاَ يَسْتَرْقُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ**). [م٢١٨].

ژ عیمرانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ گۆت: **(حەفتێ هزار مرۆڤ ژ ئوممەتا من بێ حسێب و بێ ئیزا دێ چنە بەحەشتێ)**، گۆتن: ئەو کینە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟، گۆت: **(ئەو ئەون یێت داخکرنێ نەکەن و پێڤەخواندنا خەلەت و نەزانان ب کەسێڤە نەخوینن، و داخوازا پێڤەخواندنا خەلەت و نەزانان ژ کەسێ نەکەن و پشتا خۆ ب خودایێ خۆ گەرم دکەن).**

١٣ ـ باب: هذه الامة نصف اهل الجنة.

**بابەت ئەڤە ئوممەتە نیڤا خەلکێ بەحەشتێنە.**

٢٣١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مَسْعُودٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) في قُبَّةٍ، فَقَالَ: (**أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الجَنَّةِ**) ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قالَ: (**أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الجَنَّةِ**) ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قالَ: (**أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الجَنَّةِ**) ؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ! إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَذلِكَ أَنَّ الجَنَّةَ لاَ يَدْخُلُهَا إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ في أَهْلِ الشِّرْكِ إِلاَّ كَالشَّعْرَةِ البَيْضَاءِ في جِلْدِ الثَّوْرِ الأَسْوَدِ، أَوْ كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ في جِلْدِ الثَّوْرِ الأَحْمَرِ**).

[خ٦٥٢٨/ م٢٢١].

ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: ئەم ل مالەکا گرۆڤر ژ چادران د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) گۆت: **(هوین د رازینە هوین چارێکا خەلکێ بەحەشتێ بن)؟** مە گۆت: بەلێ، گۆت: **(هوین د رازینە هوین نیڤا خەلکێ بەحەشتێ بن)؟** مە گۆت: بەلێ. گۆت: **(ئەز ب وی کەمە یێ جانێ موحەممەدی د دەستێ ویدا، ئەز هیڤی دکەم هوین نیڤا خەلکێ بەحەشتێ بن، ئەو ژی چونکی کەس ناچیتە بەحەشتێ موسلمان نەبیت، و هوین بەرامبەر خودان هەڤپشکان چۆ نینن، وەکی موییەکێ سپی نەبیت ل پیستێ گایەکێ رەش یان وەکی موییەکێ رەش نەبیت ل پشتا گایەکێ سۆر)**.

١٤ ـ باب أهل الغرف

**بابەتێ: خودانێت ژۆران**

٢٣٢ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ أَهْلَ الجَنَّةِ يَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ، كما تَتَرَاءَوْنَ الكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الغابِرَ فِي الأُفُقِ مِنَ المَشْرِقِ أَوِ المَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ ما بَيْنَهُمْ)**. قالوا: يَا رَسُولَ اللهِ، تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: **(بَلَى، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ!** رِجالٌ آمَنُوا بِاللهِ وَصَدَّقُوا المُرْسَلِينَ). [خ٣٢٥٦/ م٢٨٣١].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی بەحەشتی خودانێت ژۆرێت سەر خۆدا دبینن هەروەکی ستێرێت گەش ئەڤێت ل دویماهییا عەسمانی ل رۆژهەلاتی یان ل رۆژئاڤایی دبینن هندی جوداهی د ناڤبەرا واندا یا هەی)**. گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو جهێت پێغەمبەرانە ئەو نەبن کەس ناگەهیتێ؟ گۆت: **(بەلێ، ئەز ب وی کەمە یێ رحا من د دەستیدا هندەك زەلام دێ گەهنێ باوەری یا ب خودێ ئینای و پێغەمبەر راست دەرئێخستینە)**[1].

---

(١) ئانکو: باوەر ژ پێغەمبەران کرینە.

٢٣٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ فِي الجَنَّةِ غُرْفَةً يُرَى ظَاهِرُهَا مِنْ بَاطِنِهَا وَبَاطِنُهَا مِنْ ظَاهِرِهَا**)، فَقَالَ أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ: لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**لِمَنْ أَلاَنَ الكَلاَمَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَبَاتَ لِلَّهِ قَائِماً وَالنَّاسُ نِيَامٌ**). [حم٦٦١٥/ ك٢٧٠].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری. (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ژۆرەك یا د بەحەشتێدا هەی ل دەرڤە ناڤا وێ دئێتە دیتن و ژ ناڤدا دەرڤەیا وێ دئێتە دیتن). ئەبو مووسایێ ئەشعەری گۆتێ: بۆ کێنە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (بۆ وینە یێ ئاخفتنا خێرێ باخڤیت (سنج باش بیت) و خوارنێ بدەت[1] و یێ ب شەڤ و خەلکێ نڤستی رابیت شەڤنڤێژان بکەت)[2].**

## ١٥ ـ باب: تسبيح أهل الجنة.

## بابەتێ: تەسبیحکرنا (سبحان الله) گۆتنا خەلکێ بەحەشتێ.

٢٣٤ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَأْكُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ، وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ وَلاَ يَمْتَخِطُونَ وَلاَ يَبُولُونَ، وَلَكِنْ طَعَامُهُمْ ذَاكَ جُشَاءٌ كَرَشْحِ المِسْكِ، يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالحَمْدَ، كَمَا يُلْهَمُونَ النَّفَسَ**). [م٢٨٣٥].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (خەلکێ بەحەشتێ دێ تێدا خۆن و ڤەخۆن و نە دچنە دەستئاڤا ستویر و نە کف دکەن و نە دمیزن، بەلێ خوارنا وان دێ بیتە برك و بێهنا وێ وەکی بێهنا مسکێیە کا چاوا بێهنا خۆ دهەلکێشن وەسا دێ (خودێ ژ کێم و کاسییان پاك کەن و مەزن دانن) تەسبح و تەکبیرا خودێ کەن).**

[1] ئانکو: یێ مەرد و ناندەھ بیت.

[2] ئانکو: یێ بەردەوام بیت ل سەر.

## ١٦ . باب: دوام نعيم أهلِ الجنةِ.

## بابەتێ: بەردەوامییا خۆشییێت بەحەشتێ.

٢٣٥ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**يُنَادِي مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا أَبداً، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلاَ تَمُوتُوا أَبَداً، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا أَبَداً، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلاَ تَبْأَسُوا أَبَداً**)، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عزّ وجل: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [الأعراف:٤٣]. [م٢٨٣٧].

**ژ ئەبی سەعیدی و ئەبی هورەیرە (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر خەلكێ بەحەشتێ چۆنە بەحەشتێ گازیكەرەك دێ گازیكەت: ب راستی یا بۆ هەوە هەی هوین هەر بژین و ئێدی نەمرن و هوین هەر د ساخلەم بن و نەساخ نەبن و هوین هەر د گەنج بن و پیر نەبن، و هوین هەر د خۆشییاندا بن و ئێدی نەخۆشییان نەبەن). و ئەڤەیە گۆتنا خودێ هەر ب هێز و مەزن: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1].**

## ١٧ . باب: اقوام أفئدتهم كأفئدةِ الطيرِ.

## بابەتێ: هندە كەسن دلێت وان وەكی یێت بالندانە.

٢٣٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**يَدْخُلُ الجَنَّةَ أَقْوَامٌ أَفْئِدَتُهُمْ مِثْلُ أَفْئِدَةِ الطَّيْرِ**). [م٢٨٤٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هندە كەس دێ چنە بەحەشتێ دلێت وان وەكی یێت بالندەیانە)[2].**

---

[1] رامان ب كورتی: گازی وان هاتەكرن: ئەو بەحەشتا نوكە هوین تێدا ئەو بەحەشتە ئەوا هەوە ب كار و كریارێت خۆ گەهاندییە خۆ.

[2] هندی هند د نازك و ب ترسن و ب هیڤیا خودێڤەنە و پشت راستێت وینە.

١٨ ـ باب: الخارجون من النار بالشفاعة.

**بابەتێ: ئەوێت ب مەهدەرێ ژ جەهنەمێ دەردكەڤن.**

٢٣٧ . ٢٣٧ - (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بِشَفَاعَةِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) فَيَدْخُلُونَ الجَنَّةَ، يُسَمَّوْنَ الجَهَنَّمِيينَ). [خ٦٥٦٦].

**ژ عیمرانێ كورێ حوصەینی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خودێ دێ هندەك كەسان ب مەهدەرا موحەممەدی (ﷺ) ژ جەهنەمێ دەرئێخیت و بەتە بەحەشتێ دێ بێژنێ جەهنەمی).**

١٩ ـ باب: إخراج الموحدين من النار.

**بابەتێ: دەرئێخستا خودێپەرێسان ژ ئاگری.**

٢٣٨ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ : أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، يَقُولُ اللهُ: مَنْ كانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَخْرِجُوهُ، فَيَخْرُجُونَ قَد امْتُحِشُوا وَعَادُوا حُمَماً، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ كما تَنْبُتُ الحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ ـ أَوْ قَالَ: حَمِيَّةِ السَّيْلِ ـ وقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): أَلَمْ تَرَوْا أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً). [خ٦٥٦٠ (٢٢)، م١٨٤].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر خەلكێ بەحەشتێ چۆنە بەحەشتێ و خەلكێ جەهەنەمێ چۆنە جەهەنەمێ، خودێ دێ بێژیت: یێ تەممەت دندكا خەندەلكێ باوەری د دلیدا هەبیت ژ جەهنەمێ دەربێخن، ڤێجا دێ دەرئێخن و یێت هاتینە سۆتن و بووینە رەژی، و دێ هاڤێژنە د ئاڤا ژیانێدا، ڤێجا دێ شین بن كا چاوا تۆڤ د خیزێ جۆكا ئاڤێدا ئینایدا شین دبیت (زوی و تەڕ) یان گۆت: د دژواریيا هاتنا جۆكێدا)، و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ( ما هوین نابینن دەستپێكێ زەر و خوار دەردكەڤیت)[1].**

---

[1] ئانكو: ئەو شتل چاوا دەستپێكێ یا زەر و خوارە و پاشی ب رەوش دكەڤیت هۆسا ئەوێن ژ جەهنەمێ ژی دەردكەڤن دەستپێكێ د سۆتی و لاوازن، بەلێ پشتی دهاڤێژنە د ئاڤا ژیانێدا وەكی وی تۆڤی زوی شین دبن و ب هێز دكەڤن.

٢٣٩ – وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَمِنُوا، فَمَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ لِصَاحِبِهِ فِي الْحَقِّ يَكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا بِأَشَدَّ مُجَادَلَةً لَهُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ فِي إِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّارَ.

قَالَ: يَقُولُونَ: رَبَّنَا، إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَحُجُّونَ مَعَنَا فَأَدْخَلْتَهُمُ النَّارَ؟ قَالَ فَيَقُولُ: اذْهَبُوا فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ، فَيَأْتُونَهُمْ، فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ، لاَ تَأْكُلُ النَّارُ صُوَرَهُمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النَّارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ إِلَى كَعْبَيْهِ، فَيُخْرِجُونَهُمْ فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا، ثُمَّ يَقُولُ: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ دِينَارٍ مِنَ الْإِيمَانِ، ثُمَّ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ نِصْفِ دِينَارٍ، حَتَّى يَقُولَ: مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ).

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْ بِهَذَا فَلْيَقْرَأْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ [النساء].

قَالَ: (فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا فَلَمْ يَبْقَ فِي النَّارِ أَحَدٌ فِيهِ خَيْرٌ، قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ اللهُ: شَفَعَتِ الْمَلاَئِكَةُ وَشَفَعَ الْأَنْبِيَاءُ وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ، وَبَقِيَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، قَالَ: فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ ـ أَوْ قَالَ: قَبْضَتَيْنِ ـ نَاسٌ لَمْ يَعْمَلُوا لِلَّهِ خَيْراً قَطُّ، قَدْ احْتَرَقُوا حَتَّى صَارُوا حُمَماً، قَالَ: فَيُؤْتَى بِهِمْ إِلَى مَاءٍ يُقَالُ لَهُ مَاءُ الْحَيَاةِ، فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ، فَيَخْرُجُونَ مِنْ أَجْسَادِهِمْ مِثْلَ اللُّؤْلُؤِ، فِي أَعْنَاقِهِمْ الْخَاتَمُ: عُتَقَاءُ اللهِ، قَالَ: فَيُقَالُ لَهُمْ: ادْخُلُوا الْجَنَّةَ، فَمَا تَمَنَّيْتُمْ أَوْ رَأَيْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ لَكُمْ عِنْدِي أَفْضَلُ مِنْ هَذَا، قَالَ: فَيَقُولُونَ: رَبَّنَا وَمَا أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ فَيَقُولُ: رِضَائِي عَلَيْكُمْ فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ أَبَداً). [حم١١٨٩٨].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**و ژ وی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمێ رۆژا قیامەتێ باوەریدار ژ جەهنەمێ رزگار بوون و پشتراست بوون، جرەبرا ئێك ژ هەوە ژ هەڤالێ خۆ ل سەر مافەکێ وی یێ دنیایێ ژ جرەبرا وی ب هێزتر نینە ژ باوەریدان د گەل خودایێ خۆ بۆ برایێت خۆ یێت چۆینە جەهنەمێ.**

**گۆت: دێ بێژن: خودایێ مە برایێت مەنە نڤێژ د گەل مە دکرن، و رۆژی د گەل مە دگرتن، و حەج د گەل مە دکرن، و تە یێت برینە جەهنەمێ، گۆت: دێ بێژیت: یێت هوین بنیاسن دەربێخن، دێ هێنە دەڤ وان دێ وان ب سەروچاڤان نیاسن، ئاگر سەروچاڤان (جهێت دەستنڤێژێ) ناخۆت، هندەکا ژ وان ئاگری هەتا نیڤا لنگێ وی یێ سۆتی و هندەکا ژ وان هەتا گۆزەکێ، دێ وان دەرئێخن، و دێ بێژن: خودایێ مە، مە ئەو درئێخستن یێت تە فەرمانا مە کری، پاشی دێ بێژیت: وان دەربێخن یێت تەمەت کێشا دینارەکێ باوەری د دلایدا بیت، پاشی یێت تەمەت کێشا نیڤ دیناری د دلیدا بیت، هەتا دبێژیت: یێت تەمەت گرانییا پرتا ژ هەمیان بچویکتر د دلیدا بیت).**

ئەبو سەعیدی گۆت: یێ باوەر نەکەت بلا ڤێ ئایەتێ بخوینیت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِنْ تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ من لَدُنْهُ أَجْرًا عَظِيماً﴾[1].

**گۆت: دێ بێژن: خودایێ مە، مە ئەو دەرئێخستن یێت تە فەرمانا مە کری، و کەس د جەهنەمێدا نەمایە خێر تێدا هەبیت، گۆت: پاشی خودێ دێ بێژیت: ملیاکەتان بەرەڤانی کر، و پێغەمبەران بەرەڤانی کر، و باوەریداران بەرەڤانی کر، و دلۆڤانترێ دلۆڤانان یێ مای، ڤێجا دێ مستەکێ ژ جەهنەمێ یان دو مستان ژ خەلکەکێ چو باشی بۆ خودێ نەکرین هەلگریت و یێت هاتینە سۆتن هەتا بووینە رەژی دێ ئینە دەڤ ئاڤەکێ دبێژنێ ئاڤا ژیانێ، وێ ئاڤێ دێ ل وان کەن، ڤێجا دێ شین بن شینبوونا دندکێ د ناڤ ئاخ و**

(١) رامان ب کورتی: بێ گۆمان خودێ تەمەت دندکەکێ نەوا د ناڤ تیرۆژکا رۆژێدا ستەمێ ل کەسێ ناکەت، ئەگەر ئەو دندك باشی بیت خودێ چەندجارکی لێ دکەت، و دێ خەلاتەکێ مەزن دەتێ.

**خێزێ جۆکێ ئێنایی. دێ ژ لەشێت خۆ دەرکەڤن وەکی لوئلوئان و گوستیرک د ستۆیێت واندا ئازاکرییێت خودێنە، گۆت: دێ بۆ هێتە گۆتن: هەرنە د بەحەشتێدا، ئەو تشتێ هوین بخوازن یان ببینن بۆ هەوەیە و هەوە ژ ڤێ باشتر ژی یا ل دەڤ من هەی، گۆت: دێ بێژن: خودایێ مە ما چ ژ ڤێ باشتر هەیە؟!. گۆت: دێ بێژیت: رازیبوونا من و ئەز ژ هەوە نەرازی نابم هەت هەتا).**

٢٠ ـ باب: آخر من يدخل الجنة.

**بابەتێ: دویماهی کەس دچیتە بەحەشتێ.**

٢٤٠ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجاً مِنْهَا، وَآخِرَ أَهْلِ الجَنَّةِ دُخُولاً، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حَبْواً، فَيَقُولُ اللهُ: اذْهَبْ فادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا، فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى، فَيَقُولُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا ملأَى، فَيَقُولُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الجَنَّةَ، فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا ـ أَوْ: إِنَّ لَكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أَمْثَالِ الدُّنْيَا ـ فَيَقُولُ: أَتَسْخَرُ مِنِّي ـ أَوْ: تَضْحَكُ مِنِّي ـ وأَنْتَ المَلِكُ!**). فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، وَكَانَ يُقَالُ: ذَلِكَ أَدْنَى أَهْلِ الجَنَّةِ مَنْزِلَةً. [خ٦٥٧١/ م١٨٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئەز دزانم دویماهی جەهنەمییێ ژێ دەردکەڤیت، و دویماهی بەحەشتییێ دچیتە بەحەشتێ، زەلامەکە ل سەر چەنگ و لەپان ژ جەهنەمێ دەردکەڤیت، خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بێژیتێ: هەرە، هەرە بەحەشتێ، دێ هێتێ، دێ هزرکەت یا تژییە، دێ زڤڕیت، دێ بێژیت: یا خودێ من دیت یا تژییە، خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بێژیتێ: هەرە، هەرە بەحەشتێ، دێ هێتێ، دێ هزرکەت یا تژییە، دێ زڤڕیت، دێ بێژیت: یا**

**خودێ من دیت یا تژییە، خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بێژیتێ: هەرە، هەرە بەحەشتێ، هندی دنیایێ و دەھ جار هندی وێ بۆ تە. یان ژی دەھ جاران هندی دنیایێ بۆ تە. دێ بێژیت: تو ترانان ب من دکەی؟ یان تو ب من دکەیە کەنی و تو خودایی)؟**
**گۆت: من دیت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کرە کەنی هەتا ددانێت بەرێ دەڤێ وی دیار بووین، و دگۆت: ئەڤە ئەوە یێ جهێ وی ژ هەمیان کێمتر ژ بەحەشتییان.**

٢٤١ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ أَرْبَعَةٌ فَيُعْرَضُونَ عَلَى اللهِ، فَيَلْتَفِتُ أَحَدُهُمْ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ إِذْ أَخْرَجْتَنِي مِنْهَا فَلاَ تُعِدْنِي فِيهَا، فَيُنْجِيهِ اللهُ مِنْهَا**).
[م١٩٢].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چوار دێ ژ جەهنەمێ دەرکەڤن دێ پێشبەری خودێ هێنە کرن، ئێک ژ وان دێ زڤریت و بێژیت: ئەی خودا مادەم تە ئەز ژێ دەرئێخستم من نەڤەگەرینەڤە تێدا، ڤێجا خودێ دێ وی ژێ رزگارکەت).**

### ٢١ ـ باب رضوان الله على أهل الجنة.

### بابەتێ: رازیبوونا خودێ ژ خەلکێ بەحەشتێ.

٢٤٢ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ لأَهْلِ الجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَما لَنَا لاَ نَرْضَى وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا ما لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذلِكَ، قالُوا: يَا رَبِّ، وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوانِي، فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَداً**).
[خ٦٥٤٩/ م٢٨٢٩].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بێژیتە خەلکێ بەحەشتێ: گەلی بەحەشتییان، دێ بێژن:**

**لەبێ ل دویڤ لەبێ و هاریكاری ل دویڤ هاریكارییێ یا خودێ و خێر هەمی یا د دەستێت تەدا، دێ بێژیت، هوین رازیبوون؟ دێ بێژن، ما بۆ ئەم رازی نابین یا خودایێ مە و تە ئەو دا مە یا تە نەدایە چو چێكرییێت خۆ، دێ بێژیت، ئەرێ یا ژ ڤێ چێتر ئەز نەدەمە هەوە؟ دێ بێژن، ما چ ژ ڤێ چێترە؟ دێ بێژیت، ئەز ژ هەوە رازیبم و چۆ جاران ژ هەوە تۆرە نەبم).**

٢٢ ـ باب: رؤية المؤمنين ربهم سبحانه في الآخرة.

**بابەتێ، دیتنا باوەریدارن خودایێ خۆ رۆژا قیامەتێ.**

٢٤٣ - (م) عَنْ صُهَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، قَالَ: يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: تُرِيدُونَ شَيْئاً أَزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا؟ أَلَمْ تُدْخِلْنَا الجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: فَيَكْشِفُ الحِجَابَ، فَمَا أُعْطُوا شَيْئاً أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عزّ وجل). [م١٨١].

و ژ سوهەیبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دەمێ خەلكێ بەحەشتێ چۆنە بەحەشتێ خودایێ مەزن دێ بێژیت، هەوە تشتەك دڤێت ئەز ل هەوە زێدەكەم؟ دێ بێژن، ما تە روییێت مە سپی نەكرن؟ ما تە ئەم نەبرینە بەحەشتێ و تە ئەم ژ ئاگری رزگار كرین؟ پەردە دێ هێتە راكرن، چو تشت نەدایە وان شرینتر ژ بەرێخۆدانا وان بۆ خودایێ وان).**

٢٣ ـ باب: درجات الجنة.

**بابەتێ، پلەیێت بەحەشتێ.**

٢٤٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ). [ت٢٥٢٩].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە، (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سەد پلە یێت د بەحەشتێدا د ناڤبەرا دو پلەیاندا قۆناغا سەد سالانە).**

٢٤٥ - عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَالفِرْدَوْسُ أَعْلاَهَا دَرَجَةً، وَمِنْهَا تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنَّةِ الأَرْبَعَةُ، وَمِنْ فَوْقِهَا يَكُونُ العَرْشُ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ فَسَلُوهُ الفِرْدَوْسَ). [ت٢٥٣١].

* صحيح.

ژ عوبادێ كورێ (صامت)ی، (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بەحەشت سەد پلەیە د ناڤبەرا هەر دو پلەیاندا هندی مابەینا عەرد و عەسمانانە و فیردەوس یا ژ هەمیان بلندترە، ژ وێ خودێ هەر چوار رویبارێت بەحەشتێ دەردئێخیت و د سەر وێدا عەرشێ خودێیە، و ئەگەر هەوە داخوازا بەحەشتێ ژێ كر، داخوازا فیردەوسێ ژێ بكەن).**

٢٤ . باب: ما جاء في الجنة واهلها.

**بابەتێ: كا چ د راستا بەحەشتێ و خەلكێ وێدا هاتییە.**

٢٤٦ - عن سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لَوْ أَنَّ مَا يُقِلُّ ظُفُرٌ مِمَّا فِي الجَنَّةِ بَدَا، لَتَزَخْرَفَتْ لَهُ مَا بَيْنَ خَوَافِقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ اطَّلَعَ فَبَدَا أَسَاوِرُهُ، لَطَمَسَ ضَوْءَ الشَّمْسِ كَمَا تَطْمِسُ الشَّمْسُ ضَوْءَ النُّجُومِ). [ت٢٥٣٨].

* صحيح.

ژ سەعدێ كورێ (وقاص)ی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر هندی یا نوینۆك هەلدگریت ژ بەحەشتێ هاتبا دیتن دا د ناڤبەرا عەسمانان و عەردیدا كەشخە بیت و ئەگەر زەلامەك ژ خەلكێ بەحەشتێ دیار ببا و بازنكێت وی دەركەفتبان دا رۆناهییا وی، رۆناهییا رۆژێ ژێ بەت هەروەكی رۆژ رۆناهییا ستێران ژێ دبەت).**

٢٤٧ – عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَوْضِعُ سَوْطٍ فِي الجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا**). [جه٤٣٣٠].

* صحيح.

**ژ سەهلێ كوڕێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جهێ قامچییەكی ژ بەحەشتێ ژ دنیایێ و تشتێ تێدا چێترە).**

٢٤٨ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُبْعَثُ أَهْلُ الجَنَّةِ عَلى صُورَةِ آدَمَ، فِي مِيْلادِ ثَلاثٍ وثَلاثِينَ سَنَةٍ، جُرْداً مُرْداً مُكَحَّلِينَ، ثُمَّ يُذْهَبُ بِهِمْ إِلَى شَجَرَةٍ فِي الجَنَّةِ، فيُكتبونَ فِيها، لا تَبْلَى ثِيَابُهُمْ، وَلا يَفْنَى شَبَابُهُم**). [مخ٧/٢٧١٦]

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی، (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ دێ خەلكێ بەحەشتێ ل سەر رەنگێ ئادەمی هنێریت، ژییێ وان سیه و سێ سال، د بێ موی و بێ ریه و كلدایی، پاشی دێ بەنە دەڤ دارەكا بەحەشتێ و دێ ژێ ب جلك ئێخن ب هندە جلكان، نە جلكێ وان كەڤن دبیت و نە گەنجاتییا وان ب دویماهی دهێت).**



## ١ ـ باب: الايمان بالقدر خيره وشره.

## بابەتێ: باوەری ب قەدەرێ باشییا وێ و خرابییا وێ.

٢٤٩ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ). [ت٢١٤٤].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو بەندە باوەرییێ نائینن هەتا باوەرییێ ب قەدەرێ دئینن یا (بۆ) باش و یا ( بۆ) خراب[1]، و هەتا بزانیت ئەوا گەهشتییە وی نە ئەو بوو نەگەهیتە وی، و یا نەگەهشتییە وی نە ئەو بوو بگەهیتە وی).**

٢٥٠ – عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ: يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، بَعَثَنِي بِالحَقِّ، وَيُؤْمِنُ بِالمَوْتِ، وَيُؤْمِنُ بِالبَعْثِ بَعْدَ المَوْتِ، وَيُؤْمِنُ بِالقَدَرِ). [ت٢١٤٥/ جه٨١]

* صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو بەندە باوەرییێ نائینن نائینیت هەتا باوەرییێ ب چواران نەئینیت؛ شەهدە بدەت چو خودایێت راست و دورست و هەژی پەرستنێ نینن خودێ نەبیت و ئەز موحەممەد پێغەمبەرێ ویمە و ئەز یێ ب حەقییێ هنارتیم و باوەری ب مرنێ هەبیت و ب رابوونەڤەیا پشتی مرنێ و باوەری ب قەدەرێ هەبیت).**

---

[1] ئانكو: یا ب دلێ وی بیت و یا نە ب دلێ وی بیت.

٢٥١ – عَن عَبْدِ اللهِ بْنِ فَيْروز الدَّيْلَمِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَقُلْتُ لَهُ: وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنَ القَدَرِ، فَحَدِّثْنِي بِشَيْءٍ لَعَلَّ اللهَ أَنْ يُذْهِبَهُ مِنْ قَلْبِي، فقَالَ: لَوْ أَنَّ اللهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَاوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ، عَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ، وَلَوْ رَحِمَهُمْ كَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْراً لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ، وَلَوْ أَنْفَقْتَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً فِي سَبِيلِ اللهِ، مَا قَبِلَهُ اللهُ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالقَدَرِ، وَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَلَوْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا لَدَخَلْتَ النَّارَ.

قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ حُذَيْفَةَ بْنَ اليَمَانِ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: ثُمَّ أَتَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فَحَدَّثَنِي عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) مِثْلَ ذَلِكَ. [د٤٦٩٩/ جه٧٧].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ فەیروزێ دەیلەمی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز هاتمە دەڤ ئوبەیێ كوڕێ كەعبی، من گۆتێ: تشتەكێ كەتییە د دلێ مندا ژ قەدەرێ بۆ من تشتەكێ بێژە هیڤی ژ خودێ دكەم ژ سەر دلێ من ببەت، گۆت: ئەگەر خودێ خەلكێ ل عەسمانێت خۆ و خەلكێ ل عەردێ خۆ ئیزا بدەت ئەو دێ ئیزا دەت و وی ستەم ل وان نەكرییە (بەندەیێت وینە و چێكرییێت وینە) و ئەگەر دلۆڤانییێ پێ ببەت دلۆڤانییا وی كەرەمە ژ وی و ژ كریارێت وان چێترە، و ئەگەر تو هندی چیایێ ئوحودێ زێری د رێكا خودێدا بدەی خودێ ژ تە وەرناگریت هەتا تو باوەرییێ ب قەدەرێ دئینی، و بزانی یا گەهشتییە تە نەئەو بوو نەگەهیتە تە، و یا نەگەهشییە تە نەئەو بوو بگەهیتە تە. و ئەگەر تو ل سەر غەیری ڤێ مری دێ چییە جەهنەمێ.**

**گۆت: پاشی هاتمە دەڤ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی ژی هەر وەكی وی بۆ من گۆت، پاشی هاتمە دەڤ حوزەیفەیێ یەمانی، هەر وەكی وی بۆ من گۆت، پاشی هاتمە دەڤ زەیدێ كوڕێ سابتی هەر وەكی وێ بۆ من ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت.**

٢٥٢ – عن عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ أنه قال لِابْنِهِ: يَا بُنَيَّ إِنَّكَ لَنْ تَجِدَ طَعْمَ حَقِيقَةِ الْإِيمَانِ حَتَّى تَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللهُ الْقَلَمَ، فَقَالَ لَهُ: اكْتُبْ، قَالَ: رَبِّ، وَمَاذَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ)**. يَا بُنَيَّ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَنْ مَاتَ عَلَى غَيْرِ هَذَا فَلَيْسَ مِنِّي)**.
[د٤٧٠٠/ ت٢١٥٥، ٣٣١٩].

* صحيح.

**ژ عوبادەیێ كوڕێ (صامت)ی (رضي الله عنه) وی گۆتە كوڕێ خۆ: ئەی كوڕێ من ب راستی تو تاما دورست یا باوەرییێ نابینی هەتا بزانی یا گەهشتییە تە نە ئەو بوو نەگەهیتە تە، و یا نەگەهشتییە تە نە ئەو بوو بگەهیتە تە، ب راستی من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (تشتێ ئێكێ خودێ چێ كری پێنڤیس بوو، ئینا گۆتێ بنڤیسە، گۆت: چ بنڤیسم، گۆت بنڤیسە تشتێ بۆ هەمی تشتا هاتییە نڤیسین هەتا قیامەت رادبیت). ئەی كوڕێ من، من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ لێ بوو دگۆت: (یێ ل سەر غەیری ڤێ بمریت ئەو نە ژ منە).**

## ٢ ـ باب: بدء الخلق

## بابەتێ: دەستپێكا چێكرنێ.

٢٥٣ – (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ)**. [م٢٩٩٦].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ملیاكەت یێت ژ ڕۆناهییێ چێ بووین و ئەجنە ژ گوڕییەكا بێ دویكێلا ئاگری یێت چێ بووین و ئادەم ژ وێ یێ هاتییە چێكرن یا بۆ هەوە هاتییە گۆتن (كو ژ ئاخێ چێ بووی هەروەكی د قورئانێدا هاتی).**

٢٥٤ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لَمَّا صَوَّرَ اللهُ آدَمَ فِي الجَنَّةِ تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ يَتْرُكَهُ، فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ، يَنْظُرُ مَا هُوَ، فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقاً لاَ يَتَمَالَكُ )**. [م٢٦١١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمێ خودێ ئادەم د بەحەشتێدا چێ كری تێدا هێلا هندی خودێ ڤیای بهێلیت، ئینا شەیتان ل دۆر زڤری و بەرێ خۆ دایێ كا ئەو چییە، ڤێجا دەمێ دیتی خودان هناڤە (زكە) زانی ئەو یێ ب چێكرنەكێ هاتییە چێكرن خۆ ناراگریت).**

٢٥٥ - عن أبي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الْأَرْضِ، فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الْأَرْضِ: جَاءَ مِنْهُمْ الْأَحْمَرُ، وَالْأَبْيَضُ، وَالْأَسْوَدُ، وَبَيْنَ ذَلِكَ، وَالسَّهْلُ وَالحَزْنُ، وَالخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ)**. [د٤٦٩٣/ ت٢٩٥٥].

* صحيح.

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ ئادەم ژ مستەكا ئاخێ یێ چێ كری ژ هەمی عەردی هاتییە وەرگرتن، لەوا كورێت ئادەمی ل دویڤ عەردی هاتن ژ وان یێ سۆر و یێ سپی و یێ رەش و د ناڤبەرا واندا و یێ ب ساناهی و یێ نەرم و یێ ب زەحمەت و یێ هشك و یێ سنج خراب و یێ سنج باش و خۆش هاتن).**

٢٥٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لَمَّا خَلَقَ اللهُ آدَمَ وَنَفَخَ فِيهِ الرُّوحَ، عَطَسَ، فَقَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ، فَحَمِدَ اللهَ بِإِذْنِهِ، فَقَالَ لَهُ رَبُّهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ يَا آدَمُ! اذْهَبْ إِلَى أُولَئِكَ المَلاَئِكَةِ ـ إِلَى مَلإٍ مِنْهُمْ جُلُوسٍ ـ فَقُلْ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، قَالُوا: وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ بَنِيكَ بَيْنَهُمْ. فَقَالَ اللهُ لَهُ وَيَدَاهُ مَقْبُوضَتَانِ: اخْتَرْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، قَالَ:**

اخْتَرْتُ يَمِينَ رَبِّي ـ وَكِلْتَا يَدَيْ رَبِّي يَمِينٌ مُبَارَكَةٌ ـ ثُمَّ بَسَطَهَا فَإِذَا فِيهَا آدَمُ وَذُرِّيَّتُهُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ مَا هَؤُلَاءِ؟ فَقَالَ: هَؤُلَاءِ ذُرِّيَّتُكَ، فَإِذَا كُلُّ إِنْسَانٍ مَكْتُوبٌ عُمْرُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، فَإِذَا فِيهِمْ رَجُلٌ أَضْوَؤُهُمْ ـ أَوْ مِنْ أَضْوَئِهِمْ ـ قَالَ: يَا رَبِّ! مَنْ هَذَا؟ قَالَ: هَذَا ابْنُكَ دَاوُدُ قَدْ كَتَبْتُ لَهُ عُمْرَ أَرْبَعِينَ سَنَةً، قَالَ: يَا رَبِّ! زِدْهُ فِي عُمْرِهِ، قَالَ: ذَاكَ الَّذِي كَتَبْتُ لَهُ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، فَإِنِّي قَدْ جَعَلْتُ لَهُ مِنْ عُمْرِي سِتِّينَ سَنَةً، قَالَ: أَنْتَ وَذَاكَ. قَالَ: ثُمَّ أُسْكِنَ الجَنَّةَ مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ أُهْبِطَ مِنْهَا، فَكَانَ آدَمُ يَعُدُّ لِنَفْسِهِ، قَالَ: فَأَتَاهُ مَلَكُ المَوْتِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: قَدْ عَجَّلْتَ، قَدْ كُتِبَ لِي أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ: بَلَى وَلَكِنَّكَ جَعَلْتَ لِابْنِكَ دَاوُدَ سِتِّينَ سَنَةً، فَجَحَدَ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ، وَنَسِيَ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ. قَالَ: فَمِنْ يَوْمِئِذٍ أُمِرَ بِالكِتَابِ وَالشُّهُودِ). [ت٣٣٦٨]

* حسن صحيح.

[وانظر: ٢٠٩٠ ذكر العرش.

وانظر: ٣٥٤١ في خلق آدم].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دەمێ خودێ ئادەم چێ کری و رح دایێ بێهنژی، ئینا گۆت: (الحمد لله) و سوپاسییا خودێ ب دەستویرییا وی کر، خودایێ وی گۆتێ: خودێ دلۆڤانییێ ب تە ببەت، ئەی ئادەم هەرە دەڤ ملیاکەتان ل دەڤ کۆمەکا وان بێژێ (السلام علیکم) گۆتنێ: (وعلیکم السلام ورحمة الله)، پاشی زڤری دەڤ خودایێ خۆ ئینا گۆتێ: ئەڤە سلاڤا تەیە و سلاڤا کوڕ و کچێت تەیە د ناڤبەرا خۆدا. خودێ گۆتێ: و دەستێت وی د مچیایی بوون، ژێ بگرە تە کیژ ژ هەردویان دڤێت، گۆت: من دەستێ راستێ یێ خودایێ خۆ ژێ گرت ، و هەردو دەستێت خودایێ من یێت راستێنە و د پیرۆزن، پاشی ڤەکر دویندەها ئادەمی تێدا بوون، ئینا گۆت: ئەڤە کینە یا خودێ؟ گۆت: ئەڤە دویندەها تەنە و هەر مرۆڤەکی ژییێ وی یێ ل سەر ئەنیا وی نڤیسیە، زەلامەك ژ**

**هەمیان گەشتر دبیت یان پێ ژ هەمیان گەشتر دبیت، گۆت: ئەی خودێ ئەڤە كییە؟ گۆت: ئەڤە كورێ تە داوودە و چل سال ژی بێت بۆ هاتینە نڤیسین، گۆت: ئەی خودێ ژیێ وی بۆ زێدەكە، گۆت: ئەو یێ بۆ هاتیە بێت هاتینە نڤیسن، گۆت: من ژ ژیێ خۆ شێست سال دانە وی، گۆت: تو و یا تە دڤێت. گۆت: پاشی هاتە ئاكنجیكرن د بەحەشتێدا هندی خودێ ڤیایی پاشی ژێ ئینا خوار، و ئادەمی ژیێ خۆ د هەژمارت، گۆت: ملیاكەتێ مرنێ هاتە دەڤ ئادەمی گۆتێ: تە لەز كر خودێ هزار سال بێت بۆ من نڤیسین، گۆت: بەلێ هند یێ دایە تە، بەلێ تە شێست سال بێت داینە داوودی، بەلێ پەسەند نەكر و دویندەها وی ژی پەسند ناكەت و ژ بیر كر و دویندەها وی ژی ژ بیر دكەت گۆت: ژ وی دەمی وەرە فەرمان ب شاهد و نڤیسینێ هاتییە كرن)**

٣ . باب: الشيطان وفتنة الناس.

**بابەتێ: شەیتانی و سەردابرنا خەلكی.**

٢٥٧ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً، يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، فَيَقُولُ: مَا صَنَعْتَ شَيْئاً. قَالَ: ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ، قَالَ: فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ أَنْتَ). [م٢٨١٣].

ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(شەیتان عەرشێ خۆ ددانیتە سەر ئاڤێ پاشی پارچە پارچە لەشكەرێ خۆ دهنێریت[1] ڤێجا یێ پتر ژ هەمیان نێزیكتر بۆ وی یێ سەردابرنا وی مەزنتر بیت، ئێك ژ وان دێ هێت بێژیت من ئەڤە و ئەڤە كر دێ بێژیت: تە چو نەكرییە، گۆت: پاشی ئێك ژ وان دێ هێت و بێژیت: من نەبەردا و من**

[1] دا خەلكی سەردا ببەن و بەرزە بكەن.

**نەهێلا هەتا من د ناڤبەرا وی و ژنا ویدا ژێکڤە کری، گۆت: دێ وی نێزیکی خۆ کەت و بێژیت: تو یێ باشی).**

٢٥٨ – (م) وعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ). [م٢٨١٢].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی شەیتان یێ بێ هیڤەییە نڤێژکەر ل گزیرتا عەرەبی وی بپەرێسن، بەلێ بێ هیڤی نەبوویە نەڤیانێ بێخیتە د ناڤبەرا واندا و دلێت وان ژ بەرێك ببەت).**

٢٥٩ – عَنْ سَبْرَةَ بْنِ أَبِي فَاكِهٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ قَعَدَ لِابْنِ آدَمَ بِأَطْرُقِهِ، فَقَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: تُسْلِمُ وَتَذَرُ دِينَكَ وَدِينَ آبَائِكَ وَآبَاءِ أَبِيكَ؟ فَعَصَاهُ فَأَسْلَمَ. ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الهِجْرَةِ، فَقَالَ: تُهَاجِرُ وَتَدَعُ أَرْضَكَ وَسَمَاءَكَ، وَإِنَّمَا مَثَلُ الْمُهَاجِرِ كَمَثَلِ الفَرَسِ فِي الطِّوَلِ؟ فَعَصَاهُ فَهَاجَرَ. ثُمَّ قَعَدَ لَهُ بِطَرِيقِ الجِهَادِ فَقَالَ: تُجَاهِدُ، فَهُوَ جَهْدُ النَّفْسِ وَالمَالِ، فَتُقَاتِلُ فَتُقْتَلُ، فَتُنْكَحُ المَرْأَةُ وَيُقْسَمُ المَالُ؟ فَعَصَاهُ فَجَاهَدَ).

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ، كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ عزّ وجل أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، وَمَنْ قُتِلَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ عزّ وجل أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، وَإِنْ غَرِقَ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ، أَوْ وَقَصَتْهُ دَابَّتُهُ كَانَ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الجَنَّةَ). [ن٣١٣٤].

* صحيح.

[وانظر: ٣٧٧٧ في إسلام شيطان النبي (ﷺ).

وانظر: ١٨٧١، ٣٤٠٨ في أن الشيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم].

**ژ سەبرەیێ کوڕێ فاکهی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی شەیتان بۆ کوڕێ ئادەمی د رێکێت ویدا روینیت، ڤێجا بۆ د رێکا ئیسلامێدا روینشت و گۆت: دێ موسلمان بی و دینێ خۆ و دینێ بابێت خۆ و بابێت بابێ خۆ هێلی! نەگوهداریا وی کر و موسلمان بوو، پاشی بۆ د رێکا وی یا مشەختبوونێدا روینشت و گۆت: دێ مشەخت بی و عەردێ خۆ و عەسمانێ خۆ هێلی؟! و ب راستی مەتەلا مشەختی وەکی مەتەلا هەسپێ گرێدایە[1]، نەگوهداریا وی کر، پاشی بۆ ل سەر رێکا جیهادێ روینشت و گۆت: دێ جیهادێ کەی و جیهاد وەستیانا دەروونیە و مالییە، و دێ شەڕی کەی و دێ هێیە کوشتن، ڤێجا دێ ژنا تە هێتە مارەکرن و مال دێ هێتە لێکڤەکرن، نەگوهداریا وی کر.**

**ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ ب راستی ئەڤە کر (نەگوهداریا شەیتانی کر موسلمان بوو و مەشەخت بوو و جیهاد کر). مافێ وییە ل سەر خودایێ ب هێز و مەزن وی ببەتە بەحەشتێ، و یێ هاتە کوشتن مافێ وییە ل سەر خودایێ ب هێز و مەزن وی ببەتە بەحەشتێ، و ئەگەر د ئاڤێدا خەندقی مافێ وییە ل سەر خودایێ ب هێز و مەزن وی ببەتە بەحەشتێ، و ئەگەر دەوراێ وی ئەو ئێخست و مر مافێ وییە ل سەر خودایێ ب هێز و مەزن وی ببەتە بەحەشتێ).**

٤ ـ باب: خلق الادمي في بطن امه.

**بابەتێ: چێکرنا مرۆڤی د زکێ دایکێدا.**

٢٦٠ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهْوَ الصَّادَقُ المصْدُوقُ: (إِنَّ خَلْقَ أَحَدِكُمْ يُجْمَعُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يوماً وَأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يَكونُ مُضْغَةً مِثْلَهُ، ثُمَّ يُبْعَثُ إِلَيْهِ الملَكُ، فَيُؤْذَنُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، فَيَكْتُبُ: رِزْقَهُ، وَأَجَلَهُ، وَعَمَلَهُ،

---

(١) کا هەسپێ گرێدای چەندێ ئازادە ئەو هندێ ئازادە.

وَشَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ، ثُمَّ يَنْفُخُ فِيهِ الرُّوحَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ حَتَّى لاَ يَكُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُ النَّارَ. وَإِن أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، حَتَّى مَا يَكُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إِلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا). [خ٧٤٥٤ (٣٢٠٨)، م٢٦٤٣].

ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ مە گۆت و ئەو راستگۆیێ راستدەرئێخە (ژ لایێ وەحییێڤە): **ئێك ژ هەوە چێكرنا وی د زكێ دایكا خۆدا چل رۆژان چپك دمینیت، پاشی هندی وی دەمی دێ بیتە خوینپارە (خوینەكا هشك) پاشی هندی وی دەمی دێ بیتە گۆشتپارە (پارچەكا گۆشتی هندی پارییەكی) پاشی ملیاكەت دێ بۆ هێتە هنارتن، و رحێ كەتە تێدا، و ئەمرێ وی ب چار پەیڤان دئێتە كرن: ب نڤیسینا رزقێ وی، و عەمرێ وی، و كارێ وی، و كا یێ كەیف نەخۆشە یان یێ دلخۆشە، ئەز ب وی كەمە یێ چو پەرستییێت راست و دورست ژ بلی وی نەی، ئێك ژ هەوە دێ كار و كریارێت خەلكێ بەحەشتێ كەت هەتا نافبەرا وی و بەحەشتێ ژ گەزەكێ پێڤەتر نەمینیت، دێ كتێبا وی ب سەر وی كەڤیت، دێ كار و كریارێت خەلكێ جەهنەمێ كەت، دێ چیتە جەهنەمێ، ئێك ژ هەوە دێ كار و كریارێت خەلكێ جەهنەمێ كەت هەتا نافبەرا وی و جەهنەمێ ژ گەزەكێ پێڤەتر نەمینیت، دێ كتێبا وی ب سەر وی كەڤیت، دێ كار و كریارێت خەلكێ بەحەشتێ كەت، دێ چیتە بەحەشتێ).**

٢٦١ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ اللهَ وَكَّلَ بِالرَّحِمِ مَلَكاً، يَقُولُ: يَا رَبِّ نُطْفَةٌ، يَا رَبِّ عَلَقَةٌ، يَا رَبِّ مُضْغَةٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ خَلْقَهُ قَالَ: أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟ شَقِيٌّ أَمْ سَعِيدٌ؟ فَمَا الرِّزْقُ وَالأَجَلُ؟ فَيُكْتَبُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ). [خ٣١٨/ م٢٦٤٦].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن ملیاكەتەك یێ كرییە بەرپرسێ مالبچویكی[1] دێ بێژیت: ئەی خودا چپكە، ئەی خودا، پارچە خوینە، ئەی خودا، پارچە گۆشتە، ڤێجا دەمێ خودێ ڤیا چێكرنا وی تمامكەت، ملیاكەت دێ بێژیت: یێ نێرە یان یێ مێیە؟ یێ دلنەخۆشە یان یێ دلخۆشە؟ و كا رزق و دویماهیكا وی (ژیان و مرن) چەندە؟[2] د زكێ دایكێدا دێ هێنە نڤیسین).**

٥ ـ باب: كتابة الاجال والارزاق.

**بابەتێ: نڤیسینا رزق و دویماهیكان.**

٢٦٢ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: اللَّهُمَّ! مَتِّعْنِي بِزَوْجِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ، وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّكِ سَأَلْتِ اللهَ لآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ، وَآثَارٍ مَوْطُوءَةٍ، وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ، لاَ يُعَجِّلُ شَيْئاً مِنْهَا قَبْلَ حِلِّهِ، وَلاَ يُؤَخِّرُ مِنْهَا شَيْئاً بَعْدَ حِلِّهِ، وَلَوْ سَأَلْتِ اللهَ أَنْ يُعَافِيَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ، وَعَذَاب فِي القَبْرِ، لَكَانَ خَيْراً لَكِ)**. قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! القِرَدَةُ وَالخَنَازِيرُ هِيَ مِمَّا مُسِخَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل لَمْ يُهْلِكْ قَوْماً، أَوْ يُعَذِّبْ قَوْماً، فَيَجْعَلَ لَهُمْ نَسْلاً، وَإِنَّ القِرَدَةَ وَالخَنَازِيرَ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ)**. [م٢٦٦٣].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی، (رضي الله عنه) گۆت: ئوم حەبیبە گۆت: ئەی خودا ژیێ هەڤژینێ من و بابێ من ئەبی سوفیانی و برایێ من موعاویەی بۆ من درێژكە ب وان دلخۆش ببم، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (تە داخواز ژ خودێ كر بۆ هندە ژیێت دەستنیشانكری و شوینوارێت ل سەر جۆیی و ئەرزاقێت لێكڤەكری، چو تشت ژ وان لەز لێ ناهێتە كرن بەری دەمێ وان، و چو تشت ژ وان ناهێنە گیرۆكرن پشتی دەمێ**

(١) بۆ چاڤدێری و پارستنێ، ڤێجا دەمێ دەستپێكێ بچویك چێ دبیت.

(٢) نەڤە پرسیارن ژ ملیاكەتی.

**وان، و ئەگەر تە داخواز ژ خودێ كربا تە ژ ئاگرێ جەهنەمێ و ژ ئیزایا گۆڕێ سلامەت بكەت بۆ تە باشتر بوو).**

گۆت: زەلامەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مەیموینك و بەراز ئەون یێت خودێ گوهارتین؟ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن چو ملەت ژ ناڤ نەبرینە یان ملەتەك ئیزا دابیت و دویندەهێ بدەتە وان، و ب راستی مەیموینك و بەراز بەری وان (ئیسرائیلییان) هەبوون).**

٦ ـ باب: كل مولود یولد على الفطرة.

**بابەتێ: هەمی بچویكەك ل سەر ئیسلامێ دبن.**

٢٦٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (ما مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كما تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ)، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا﴾الآيَةَ [الروم: ٣٠].

[خ١٣٥٩ (١٣٥٨)/ م٢٦٥٨].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نینە بچویك ببیت ئەگەر ل سەر ئیسلامێ نەبیت، ڤێجا دایبابێت وی دێ وی كەنە جوهی یان فەلە یان ئاگرپەرێس، هەروەكی گیانەوەر ژ گیانەوەرێ ساخ و سەلیم و بێ كیماسی دبیت و ما هوین كیماسییەكێ ژێ دبینن، (پاشی هوین گوهێت وێ دروی دكەن ژێ كێم دكەن).**

**پاشی ئەبو هورەیرە ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿فِطْرَةَ اللهِ التي فَطَرَ الناس عليها لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ ذلك الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾[1].**

---

(١) رامانا ئایەتێ ب كورتی: دینێ خودێیە، ئەوێ خودێ مرۆڤ ل سەر دایین. دایی و چێكرییێ خودێ گوهۆڕین بۆ نینە، ئەڤەیە دینێ ڕاست و دورست، بەلێ باراپتر ژ مرۆڤان ڤێ ڕاستییێ نوزانن.

٧ . باب: الله اعلم بما كانوا عاملين.

**بابەتێ: خودێ چێتر دزانیت کا ئەو دا چ کار کەن.**

٢٦٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ أَوْلَادِ المشْرِكِينَ، فَقَالَ: (**اللهُ، إِذْ خَلَقَهُمْ، أَعْلَمُ بِمَا كانُوا عَامِلِينَ**). [خ١٣٨٣/ م٢٦٦٠].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە کرن ل سەر زارۆکێت هەڤپشکچێکەران[1]؟ گۆت: (دەمێ خودێ ئەو چێکرین ئەو زاناترە کا دا چ کار کەن).**

٨ . باب: جف القلم بما انت لاق.

**بابەتێ: قەلەم هشك بوو ب وی تشتێ بگەهیتە تە.**

٢٦٥ - (ق) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُعْرَفُ أَهْلُ الجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**). قَالَ: فَلِمَ يَعْمَلُ العَامِلُونَ؟ قَالَ: (**كُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَوْ لِمَا يُيَسَّرُ لَهُ**). [خ٦٥٩٦/ م٢٦٤٩].

**ژ عیمرانێ کورێ (حصین)ی گۆت: زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ خەلکێ بەحەشتێ و خەلکێ جەهنەمێ ژێك دهێنە نیاسین؟ گۆت: (بەلێ)، گۆت: پا بۆچی کارکەر کار دکەن؟ گۆت: (هەر ئێك ژ هەوە بێ رێدایی و رێخۆشکرییە بۆ وی تشتێ بۆ هاتییە چێکرن. یان بۆ هاتییە ساناهیکرن).**

٢٦٦ - (م) عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّئَلِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عِمْرَانُ بْنُ الحُصَيْنِ: أَرَأَيْتَ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ اليَوْمَ وَيَكْدَحُونَ فِيهِ، أَشَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى عَلَيْهِمْ مِنْ قَدَرِ مَا سَبَقَ؟ أَوْ فِيمَا يُسْتَقْبَلُونَ بِهِ مِمَّا أَتَاهُمْ بِهِ نَبِيُّهُمْ، وَثَبَتَتِ الحُجَّةُ عَلَيْهِمْ؟ فَقُلْتُ: بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ، وَمَضَى عَلَيْهِمْ. قَالَ فَقَالَ: أَفَلاَ يَكُونُ

---

[1] ئەوێت مرین بەری بالغ ببن.

ظُلْماً؟ قَالَ: فَفَزِعْتُ مِنْ ذَلِكَ فَزَعاً شَدِيداً، وَقُلْتُ: كُلُّ شَيْءٍ خَلْقُ اللهِ وَمِلْكُ يَدِهِ، فَلاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ.

فَقَالَ لِي: يَرْحَمُكَ اللهُ! إِنِّي لَمْ أُرِدْ بِمَا سَأَلْتُكَ إِلاَّ لأَحْزُرَ عَقْلَكَ، إِنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ مُزَيْنَةَ أَتَيَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ مَا يَعْمَلُ النَّاسُ الْيَوْمَ، وَيَكْدَحُونَ فِيهِ، أَشَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى فِيهِمْ مِنْ قَدَرٍ قد سَبَقَ، أَوْ فِيمَا يُسْتَقْبَلُونَ بِهِ مِمَّا أَتَاهُمْ بِهِ نَبِيُّهُمْ، وَثَبَتَتِ الْحُجَّةُ عَلَيْهِمْ؟ فَقَالَ: (**لاَ، بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى فِيهِمْ وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللهِ عزّ وجل:** ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨﴾[الشمس] ). [م٢٦٥٠].

**ژ ئەبی ئەسوەدێ دوئەلی (رحمه الله) گۆت: عیمرانێ کورێ (حصین)ی (رضي الله عنه) گۆتە من کا بێژە من ئەو کارێ خەلك ئەڤرۆ دکەن و خۆ تێدا دوەستینن تشتەکە ل سەر هاتییە نڤیسین و قەدەرا هەروهەر ل سەر وان یا بۆری یان ژی دێ ڤی کاری کەن د دەمێ پێشییا وان ژ وی یێ پێغەمبەرێ وان پێ هاتی و هەروهەر ل سەر وان نەیا نڤیسییە و بەلگە ل سەر وان ب هاتنا پێغەمبەری (ﷺ) بنەجە بوو؟ من گۆت: بەلکی تشتەکە ل سەر وان هاتییە نڤیسین و یا بۆری، گۆت: ئینا گۆت: ما ئەڤە نە ستەمە؟ گۆت: ئەز ژ ڤی ترسیام ترسیانەکا دژوار و من گۆت: هەمی تشت چێکرییێت خودێنە و یێت د دەستێ ویدا و پرسیار ژێ ناهێتە کرن کا ئەو چ دکەت و پرسیار دێ ژ وان هێتە کرن. ئینا گۆت: خودێ دلۆڤانییێ ب تە ببەت من ژ ڤێ پرسیارا من ژ تە کری چو نەدڤیا ئەو نەبیت ئەز عەقلێ تە هەلسەنگینم کا تو چەندێ زانایی، دو زەلام ژ موزەینە هاتنە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتن ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ تو دبینی ئەڤا خەلك ئەڤرۆ دکەن و خۆ بۆ دەوەستینن تشتەکە ل سەر هاتییە نڤیسین و قەدەرا هەروهەر ل سەر وان یا بۆری یان ژی دێ ڤی کاری کەن د دەمێ پێشییا وان ژ وی یێ پێغەمبەرێ وان پێ هاتی و هەروهەر ل سەر وان نەیا نڤیسییە و بەلگە ل سەر وان ب هاتنا پێغەمبەری (ﷺ) بنەجە بوو؟**

**ئینا گۆت: (نەخێر بەلكی تشتەكە ل سەر وان هاتییە نڤیسین و یا بۆری و راستییا ڤێ ژی یا د كتێبا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا؛ ﴿وَنَفْسٍ وما سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾)[1].**

٢٦٧ – (م) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ قَالَتْ: دُعِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى جَنَازَةِ صَبِيٍّ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! طوبَى لِهَذَا، عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الجَنَّةِ! لَمْ يَعْمَلِ السُّوءَ وَلَمْ يُدْرِكْهُ. قَالَ: **(أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ، يَا عَائِشَةُ إِنَّ اللهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلاً، خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ).** [م٢٦٦٢].

**ژ عائیشایێ دایكا موسلمانان (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جەنازێ زارۆكەكێ خەلكێ مەدینەیێ هاتە داخوازكرن (دا نڤێژێ ل سەر بكەت) ئینا من گۆت: خۆزیكێت وی چویچكەكە ژ چویچكێت بەحەشتێ، گونەه نەكرینە و گونەه نەگەهشتییێ، گۆت: (تو وێ هزرێ دكەی ئەی عائیشا و وەسا نینە، ب راستی خودێ خەلكەك بۆ بەحەشتێ پێت چێكرین و ئەو د پشتێت بابێت خۆدا بوون و بۆ جەهنەمێ خەلكەك پێ چێ كری و ئەو د پشتا بابێت خۆدا بوون).**

٢٦٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل خَلَقَ خَلْقَهُ فِي ظُلْمَةٍ، فَأَلقَى عَلَيْهِمْ مِنْ نُورِهِ، فَمَنْ أَصَابَهُ مِنْ ذَلِكَ النُّورِ اهْتَدَى، وَمَنْ أَخْطَأَهُ ضَلَّ، فَلِذَلِكَ أَقُولُ: جَفَّ القَلَمُ عَلَى عِلْمِ اللهِ).** [ت٢٦٤٢].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (رضي الله عنهما) دبێژیت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (خودایێ هەر ب هێز و مەزن چێكرییێت خۆ (ژ ئەجنە و مرۆڤان) د**

---

[1] و سویند ب نەفسێ، و یێ نەفس بێ كێم و كاسی چێ كری و دای. و پاشی قەنجی و خرابی نیشا دای.

**تاریاتییەکێدا چێ کرینە[1] و ژ رۆناهییا خۆ[2] ب سەر واندا بەردا یێ ئەو رۆناهی گەهشتێ و ژێ گرت ئەو راستەرێ بوو، و یێ ژێ نەگرت ئەو سەردا چۆ، ژ بەر هندێ ئەز دبێژم نڤیسان د فەرمانا خودێدا ب دویماهی هات).**

٢٦٩ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾ [هود:١٠٥]، سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! فَعَلَى مَا نَعْمَلُ؟ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، أَوْ عَلَى شَيْءٍ لَمْ يُفْرَغْ مِنْهُ؟ قَالَ: (**بَلْ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، وَجَرَتْ بِهِ الْأَقْلَامُ، يَا عُمَرُ! وَلَكِنْ كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ**). [ت٣١١١].

* صحيح.

**ژ عومەرێ کورێ خەتابی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ﴾[3]، من پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پا ئەم ل سەر چ بنیات کار دکەین، ل سەر تشتەکێ ب دویماهی هاتی یان ل سەر تشتەکێ ب دویماهی نەهاتی؟ گۆت: (بەلکی ل سەر تشتەکێ ب دویماهی هاتی و هاتییە نڤیسین ئەی عومەر بەلێ هەر ئێك یێ رێدایی و رێخۆشکرییە بۆ وی تشتێ بۆ هاتییە چێکرن).**

٢٧٠ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّهُ لَمَكْتُوبٌ فِي الكِتَابِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَمَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّهُ لَمَكْتُوبٌ فِي الكِتَابِ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمَاتَ فَدَخَلَهَا**). [حم٢٤٧٦٢، ٢٤٧٦٧].

---

(١) تاریاتییا دمرووںان و حەژێکرنا دلخوازییان و فەرمانکرنا ب گونەهان.

(٢) رۆناهییا باوەری و زانین و گوهداری و کاربنەجهی و باشییێ.

(٣) رامانا ئایەتێ ب کورتی: ڤێجا هندەك ژ وان بەخت رەش و بەرنیزانە، و هندەك ژێ بەختەوەر و کەیفخۆشن

* إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح.

[وانظر: ١٦٦٢ (لا أدري ـ وأنا رسول الله ـ ما يفعل بي)].

ژ عائیشایێ، (رضي الله عنها) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مرۆڤ یێ هەی كارێ خەلكێ بەحەشتێ دكەت و ئەو د دەپێ پاراستیدا نڤیسییە ژ خەلكێ جەهنەمێیە، ڤێجا بەری مرنا خۆ دێ خۆ گوهۆریت و دێ كار ب كارێ خەلكێ جەهنەمێ كەت و دێ مریت دێ چیتە جەهنەمێ، و مرۆڤ یێ هەی كارێ خەلكێ جەهنەمێ دكەت و ئەو د دەپێ پاراستیدا نڤیسییە ژ خەلكێ بەحەشتێیە ڤێجا بەری مرنا خۆ دێ خۆ گوهۆریت و دێ كار ب كارێ خەلكێ بەحەشتێ كەت و دێ مریت دێ چیتە بەحەشتێ).**

٩ ـ باب: كل شيئ بقدر.

**بابەتێ: هەمی تشت ب قەدەرێنە.**

٢٧١ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ. قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى المَاءِ)**.
[م٢٦٥٣].

ژ عەمرێ كورێ عاصی، (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ب راستی خودێ پێنجی هزار سالان بەری عەسمانان و عەردی چێ كەت قەدەرا هەمی چێكرییان (د دەپێ پاراستیدا) نڤیسی بوو و عەرشێ وی ل سەر ئاڤێ بوو).**

٢٧٢ – (م) عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ قَالَ: أَدْرَكْتُ نَاساً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَقُولُونَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ. قَالَ: وَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ، حَتَّى العَجْزُ وَالكَيْسُ، أَوِ الكَيْسُ وَالعَجْزُ)**. [م٢٦٥٥].

**ژ تاووسی، (رحمه الله) گۆت: ئەز گەهشتمە هندە كەسان ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆتن هەمی تشت ل دویڤ قەدەرێنە و من گوهـ ل عەبدوللایێ كوڕێ عومەری بوو دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەمی تشت ل دویڤ قەدەرێنە هەتا نەشیان[1] و چالاكی[2] یان چالاكی و نەشیان).**

٢٧٣ – عَنْ أَبِي خِزَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرَأَيْتَ رُقًى نَسْتَرْقِيهَا، وَدَوَاءً نَتَدَاوَى بِهِ، وَتُقَاةً نَتَّقِيهَا، هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ شَيْئاً؟ قَالَ: (**هِيَ مِنْ قَدَرِ اللهِ**).
[ت٢٠٦٥، ٢١٤٨/ جه٣٤٣٧].

* حديث حسن.

[وانظر: ٨١٥].

**ژ ئەبی خوزامەی ژ بابێ خۆ گۆت: من پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ كر (ﷺ) من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ**
**تو بێژی ئەو پێڤەخواندنا ئەم دكەین، و دەرمانێن ب كار دئینین، و تشتێ خۆ پێ دپارێزین، دێ تشتەكی ژ قەدەرا خودێ دەنە پاش؟ گۆت : (ئەو ژ قەدەرا خودێیە).**

٢٧٤ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا بَعَثَنِي فِي حَاجَةٍ لَمْ تَتَهَيَّأْ إِلاَّ قَالَ: (**لَوْ قُضِيَ لَكَانَ، أَوْ لَوْ قُدِّرَ لَكَانَ**). [حب٧١٧٩].

* إسناده صحيح على شرطهما.

---

(١) یان ب رامانا گشتی یان نەشیانا كرنا ئەركان و گیرۆكرنا وان.
(٢) دژی نەشیانێیە چالاكی بۆ كرنا كارێ خێرێ و گیرۆنەكرنا وی.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: من دەھ سالان خزمەتا پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) کر و ئەز نەھنارتیمە ھەوجەیییەکێ و چێ نەببا ئەگەر نەگۆتبا: (ئەگەر فەرمان دابا دا چێ بیت یان ئەگەر نڤیسابا دا چێ بیت).**

٢٧٥ – عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، رُقًى كُنَّا نَسْتَرْقِي بِهَا، وَأَدْوِيَةٌ كُنَّا نَتَدَاوَى بِهَا هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ تَعَالَى؟ قَالَ: (**هُو مِنْ قَدَرِ اللهِ**). [ك٨٧، ٧٤٣١].

* قال الذهبي، على شرطهما.

**ژ حەکیمێ کوڕێ حیزامی (رضي الله عنه) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پێڤەخواندنن مە ب خۆڤە دخواندن و دەرمانن مە خۆ پێ دەرمان دکرن ئەڤە تشتەکی ژ قەدەرا خودایێ بلند رادکەن؟ گۆت: (ئەو ژ قەدرا خودێیە).**

## ١٠ . باب: تصريف الله تعالى القلوب.

## بابەتێ: وەرگێرانا خودێ بۆ دلان.

٢٧٦ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: (**إِنَّ قُلُوبَ بَنِي آدَمَ كُلَّهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ، كَقَلْبٍ وَاحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشَاءُ**)، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): (**اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ القُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ**). [م٢٦٥٤].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ عاصی (خودێ ژ وان رازی بیت) وی گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (صلى الله عليه وسلم) دگۆت: (ب راستی دلێت مرۆڤان ھەمی یێت د ناڤبەرا دو تلێت خودایێ دلۆڤاندا، وەکی دلەکینە، چاوا بڤێت وەسا وەردگێریت)، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (ئەی ئەوێ دلان وەردگێری، دلێ من ل سەر دینێ خۆ موکوم بکە).**

٢٧٧ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: (**يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ**)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! آمَنَّا بِكَ، وَبِمَا جِئْتَ بِهِ، فَهَلْ تَخَافُ عَلَيْنَا؟ قَالَ: (**نَعَمْ، إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ إِصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ، يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ**). [ت٢١٤٠/جه٣٨٣٤]

* صحيح.

**ژ ئەنەسی، (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەلەك دگۆت: (هەی راگر و وەرگێڕێ دلان دلێ من ل سەر دینێ خۆ رابگرە)، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مە باوەری ب تە و تشتێ تو پێ هاتی ئینا ما تو ژ مە دترسی؟ گۆت: (بەلێ ب راستی هەمی دل یێت د ناڤبەرا دو تلاندا ژ تلێت خودێ چاوا بڤێت وەسا وەردگێڕیت).**

**١١ ـ باب: ما قدر على ابن ادم من الزنا.**

**بابەتێ: ل سەر مرۆڤان ژ زینایێ هاتییە نڤیسین.**

٢٧٨ – (**ق**) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ما رَأَيْتُ شَيْئاً أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَى، أَدْرَكَ ذلِكَ لاَ مَحَالَةَ، فَزِنَى العَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَى اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ، وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي، وَالفَرْجُ يُصَدِّقُ ذلِكَ كُلَّهُ أَوْ يُكَذِّبُهُ**). [خ٦٢٤٣/ م٢٦٥٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من چو تشت نەدیتینە گونەهێت بچویك پێ دیار ببن ژ وێ گۆتنا ئەبو هورەیرە ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتی: (خودێ بارا مرۆڤی ژ زنایێ ل سەر نڤیسییە چارە نینە هەر دێ گەهیتێ[1]، زنایا چاڤان بەرێخۆدانە، و زنا ئەزمانی ئاخفتنە، و دل حەز دکەت و دخوازیت، و شەرمینگەهـ مەرەما وان کاران[2] یان راست دەرئێخیت یان درەو دردئێخیت).**

(١) ئانکو: مرۆڤ نینە تشتەکی ژ رێخۆشکەرێت زنایێ نەکەت چ بەرێخۆدانا حەرام بیت، چ هەر تشتەکێ دی یێ حەرام بیت.

(٢) ڤان ئەندامێت لەشی.

## ١٢ ـ باب: حجاج آدم و موسى.

## بەلگەئینانا ئادەم و مووسایێ ل سەر ئێكدو.

٢٧٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسى، فَقَالَ لَهُ مُوسى: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا وأَخْرَجْتَنَا مِنَ الجَنَّةِ، قَالَ لَهُ آدَمُ: يَا مُوسى اصْطَفَاكَ اللهُ بِكَلاَمِهِ، وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ فَحَجَّ آدَمُ مُوسى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسى**)، ثَلاَثاً. [خ٦٦١٤ (٣٤٠٩)/ م٢٦٥٢].

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عليهما السلام عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى؛ قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلاَئِكَتَهُ، وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِهِ، ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الأَرْضِ؟ فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ، وَأَعْطَاكَ الأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ، وَقَرَّبَكَ نَجِيّاً، فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَاماً. قَالَ آدَمُ: فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾ [طه:١٢١]؟** قَالَ: نعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلاً كَتَبَهُ اللهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً)؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى**).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئادەم و مووسا بەلگەییێت خۆ ل دەڤ خودایێ خۆ ل سەر ئێكدو گۆتن[1]، مووسای گۆت: ئەی ئادەم تو بابێ مەیی یێ تە ئەم ئێخستینە د زیان و بێ بارییێدا و تە ئەم ژ بەحەشتێ دەرئێخستین، ئادەمی گۆتێ: ئەی مووسا خودێ تو بۆ ئاخفتنا خۆ هەلبژارتی و ب دەستێ خۆ تەورات بۆ تە نڤیسی، تو گازندا ژ من دكەی ل سەر كارەكی خودێ ب چل سالان بەری من چێكەت ل سەر من**

---

[1] ئەڤە دبیت دەمێ رحا وان گەهشتییە ئێك ل عەسمانا، یان د ژیانا مووسایدا و خودێ نیشا دا، یان د ژیانا ویدا خودێ ئینا خەونا وی و خەونێت پێغەمبەران راستینە.

**نڤیسی؟![1] ئادەم ب سەر مووسای كەفت)، ئەڤ ئاخفتنە (ئادم ب سەر مووسای كەفت) پێغەمبەری (ﷺ) سێ جاران دوبارە كر.**

- **و د ڤەگێڕا موسلمیدا هاتییە: (ئادەم و مووسا بەلگەیێت خۆ ل دەڤ خودایێ خۆ گۆتن، ئادەم شیا مووسا و ب سەر كەفت، مووسای گۆت: تو ئادەمی ئەوێ خودێ تو ب دەستێ خۆ چێ كری و رح ئێكسەر دایە تە، و فەرمانا ملیاكەتان كر بۆ تە چۆنە سوجدەیێ و تو ل بەحەشتێ ئاكنجی كری پاشی تە خەلك ب گونەها خۆ ژێ درئێخستنە عەردی، ئادەمی گۆت: تو مووسایی یێ خودێ ب نامەیێت خۆ و ب ئاخفتنا خۆ هەلبژارتی و تەورات دایە تە یا دیارەكرنا هەمی تشتی تێدا (ژ وان چێرۆكا من) و تو بۆ ئاخفتنا خۆ نێزیكی خۆ كری، تە ب چەندێ دیت خودێ تەورات نڤیسیە بەری ئەز بێمە چێكرن؟ مووسای گۆت: ب چل سالان، ئادەمی گۆت: تە تێدا دیت ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾ گۆت بەلێ، گۆت: تو گازندێ ژ من دكەی ل سەر كارەكی من كری خودێ بەری من چێ كەت ب چل سالان ل سەر من نڤیسی، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئادەم شیا مووسای و ب سەر وی كەفت).**

١٣ ـ باب: العمل بالخواتيم.

**بابەتێ: كریار دویڤ یێت دویماهیكێنە دویماهیك د باش بن خراب بن ئەوە.**

٢٨٠ – (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) التَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا، فَلَمَّا مالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلى عَسْكَرِهِ، وَمالَ الآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) رَجُلٌ، لاَ يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً وَلاَ فَاذَّةً إِلاَّ اتَّبَعَهَا يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ، فَقَالُوا: ما أَجْزَأَ مِنَّا اليَوْمَ أَحَدٌ كما أَجْزَأَ فُلاَنٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ).

---

[1] هەروەكی ئەڤە د تەوراتێدا هاتی.

فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ القَوْمِ: أَنَا صَاحِبُهُ، قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ كُلَّمَا وَقَفَ وَقَفَ مَعَهُ، وَإِذَا أَسْرَعَ أَسْرَعَ مَعَهُ، قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحاً شَدِيداً، فَاسْتَعْجَلَ المَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ، قَالَ: **(وَما ذَاكَ)** ؟ قَالَ: الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنِفاً أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذلِكَ، فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ، فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ، ثُمَّ جُرِحَ جُرْحاً شَدِيداً، فَاسْتَعْجَلَ المَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ فِي الأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عِنْدَ ذلِكَ: **(إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الجَنَّةِ، فِيما يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهْوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيما يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهْوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ)**. [خ٢٨٩٨/ م١١٢].

**ژ سەهلێ کوڕێ سەعدێ ساعدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤشکچێکەر گەهشتنە ئێك و شەڕ کرن، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زڤرییە چەپەرێ خۆ، و یێت دی ژی زڤرینە چەپەرێ خۆ، و زەلامەك د ناڤ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێدا (ﷺ) هەبوو نە کەسێ ژ وان ڤەدەر بوویی و نە یێ ب تنێ مایی نەهێلان و ب دویڤ دچۆ و ب شیرێ خۆ ددانایێ، ئینا گۆتن: کەسێ ژ مە تێرا خۆ نەکرییە وەکی فلانی کری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەلێ ئەو ژ خەلکێ جەهنەمێیە)، زەلامەکی ژ وی خەلکی گۆت: ئەز دێ د گەل بم و گۆت: د گەل وی دەرکەفت هەر گاڤا راوەستابا د گەل رادوەستا و ئەگەر لەز کربا د گەل لەز دکر، گۆت: ئەو زەلام بریندار بوو برینەکا گران، ئینا لەز ل مرنێ کر دەستکێ شیرێ خۆ دانا عەردی و سەرێ وی دانا د ناڤبەرا هەردو چچکێت سینگێ خۆدا پاشی خۆ ب سەر شیرێ خۆ دادا و خۆ کوشت، ئەو زەلام دەرکەفت چۆ دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئەز شەهدەیێ ددەم ب راستی تو پێغەمبەرێ خودێیی، گۆت: (و ئەڤە ژ بەر چ)؟ گۆت: ئەو زەلامێ بەری نوکە تە گۆتی ژ خەلکێ جەهنەمێیە و خەلکی ئەڤە مەزن دیتی، من گۆت: ئەز دێ بۆ هەوە راستیا وی ئینم ئەز دویڤڕا چۆم پاشی برینەکا گران بریندار بوو و لەز ل مرنێ کر و دەستکێ**

**شیرێ خۆ دانا عەردی و سەرێ وی دانا د ناڤبەرا هەردو چچکێت سینگێ خۆدا پاشی خۆ ب سەر دادا و خۆ کوشت، ئینا ل ڤێرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەلام یێ هەی کاری ب کارێ خەلکێ بەحەشتێ دکەت هەروەکی یا دیار بۆ خەلکی و ئەو ژ خەلکێ جەهنەمێیە و زەلام یێ هەی کاری ب کارێ خەلکێ جەهنەمێ دکەت هەروەکی یا دیار بۆ خەلکی و ئەو ژ خەلکێ بەحەشتێیە).**

٢٨١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ. وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ الزَّمَنَ الطَّوِيلَ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ يُخْتَمُ لَهُ عَمَلُهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ).** [م٢٦٥١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی زەلام یێ هەی دەمەکێ درێژ کاری ب کارێ خەلکێ بەحەشتێ دکەت پاشی دێ کارێ وی ب کارێ خەلکێ جەهنەمێ ب دویماهی هێت[1]، و ب راستی زەلام یێ هەی دەمەکێ درێژ کاری ب کارێ خەلکێ جەهنەمێ دکەت پاشی دێ کارێ وی ب کارێ خەلکێ بەحەشتێ ب دویماهی هێت)[2].**

٢٨٢ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ البُرْهَةَ مِنْ عُمُرِهِ بِالعَمَلِ الَّذِي لَوْ مَاتَ عَلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فَمَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ البُرْهَةَ مِنْ عُمُرِهِ بِالعَمَلِ الَّذِي لَوْ مَاتَ عَلَيْهِ دَخَلَ النَّارَ، فَإِذَا كَانَ قَبْلَ مَوْتِهِ تَحَوَّلَ فَعَمِلَ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمَاتَ فَدَخَلَ الجَنَّةَ).** [حم١٣٦٩٥].

- وزاد في رواية في أوله: **(لاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَعْجَبُوا بِأَحَدٍ، حَتَّى تَنْظُرُوا بِمَ يُخْتَمُ لَهُ)** [حم١٢٢١٤].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

---

(١) ئانکو دویماهییا ژیانا خۆ دێ کارێ خەلکێ جەهنەمێ کەت و دێ چیتە جەهنەمێ.

(٢) و دێ چیتە بەحەشتێ.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی مرۆڤێ هەی دەمەكێ درێژ ژ ژیێ خۆ كار دكەت ب كارەكی ئەگەر ئەو ل سەر بمریت دێ چیتە بەحەشتێ، بەلێ بەری بمریت دێ خۆ گوهۆریت و دێ كاری ب كارێ خەلكێ جەهنەمێ كەت و دێ مریت و دێ چیتە جەهنەمێ، و ب راستی مرۆڤێ هەی دەمەكێ درێژ ژ ژیێ خۆ كار دكەت ب كارەكی ئەگەر ئەو ل سەر بمریت دێ چیتە جەهنەمێ، بەلێ بەری بمریت دێ خۆ گوهۆریت و دێ كاری ب كارێ خەلكێ بەحەشتێ كەت و دێ مریت و دێ چیتە بەحەشتێ).**

- و د ڤەگێڕەكا خۆدا زێدە كرییە: **(چو ل سەر هەوە نینە هوین ب كارێ كەسێ[1] حێبەتی نەبن و نەهێنە خاپاندن هەتا بەرێ خۆ بدەنێ كا دێ ب چ ب دویماهی هێت).**

١٤ ـ باب: یموت الانسان حیث كتب له.

**بابەت: مرۆڤ دێ ل وی جهی مریت یێ بۆ هاتییە نڤیسین.**

٢٨٣ – عَنْ مَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا قَضَى اللهُ لِعَبْدٍ أَنْ يَمُوتَ بِأَرْضٍ، جَعَلَ لَهُ إِلَيْهَا حَاجَةً). [ت٢١٤٦].

* صحيح.

ژ مەتەرێ كوڕێ عوكامسی، (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر خودێ ڤیا بەندەیەكی ل جهەكی بمرینیت دێ هەوجەییەكێ بۆ ئێخیتە وی جهی).**

---

(١) چ یێ باش بیت یان یێ خراب.

**١٥ ـ باب: الرضا بالقضاء.**

**بابەتێ: رازیبوون ب تشتێ نڤیسی.**

٢٨٤ – عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مِن سعادةِ ابنِ آدمَ رِضاه بما قَضى اللهُ له، ومِن شقاوةِ ابنِ آدمَ تَرْكُه استخارةَ اللهِ، ومِن شقاوةِ ابنِ آدمَ سَخَطُه بما قضى اللهُ له.)**[١].
[ت٢١٥١]

* ضعيف.

[وانظر: ٣٤٠٦].

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەقاصی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژ بەختەوەرییا مرۆڤییە ب تشتێ خودێ بۆ نڤیسی پێ رازی ببیت، و ژ دلئێشییا مرۆڤییە داخوازكرنا خێرێ ژ خودێ بهێلیت و ژ دلئێشییا مرۆڤییە ب تشتێ خودێ بۆ نڤیسی تۆرە ببیت و نەرازی بیت).**

**١٦ ـ باب: لا یرد القدر الا الدعاء.**

**بابەتێ: چو قەدەرێ نازڤرینیت دوعا نەبیت.**

٢٨٥ – عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ يَرُدُّ القَضَاءَ إِلاَّ الدُّعَاءُ، وَلاَ يَزِيدُ فِي العُمْرِ إِلاَّ البِرُّ).** [ت٢١٣٩].

* حسن.

**ژ سەلمانی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو قەدەرێ نازڤرینیت دوعا نەبیت و چو ژی (عومری) درێژ ناكەت باشی نەبیت[١]).**

---

﴿(١)﴾ ـ **شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینا یە:** ٢٨٤ – عن أبي العَلاَءِ بْنِ الشِّخِّيرِ، حَدَّثَنِي أَحَدُ بَنِي سُلَيْمٍ وَلاَ أَحْسَبُهُ إِلاَّ قَدْ رَأَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ): (أَنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَبْتَلِي عَبْدَهُ بِمَا أَعْطَاهُ، فَمَنْ رَضِيَ بِمَا قَسَمَ اللهُ لَهُ بَارَكَ اللهُ عزّ وجل لَهُ فِيهِ وَوَسَّعَهُ، وَمَنْ لَمْ يَرْضَ لَمْ يُبَارِكْ لَهُ). [حم٢٠٢٧٩]

* إسناده صحيح. [وانظر: ٣٤٠٦].

**ژ ئەبی عەلائێ كورێ شیخخیری (رضي الله عنه) گۆت: ئێك ژ خەلكێ بەنی سەلیم گۆتە من و ئەز هزر ناكەم وی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەدیتبیت: ب راستی خودایێ بلند پڕ خێر و بەرەكەت بەندەیێ خۆ ب تشتێ دایێ دجەرببینیت، ڤێجا یێ ب وێ یا خودێ بۆ نڤیسی رازی بوو خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بۆ بەرەكەتێ ئێخیتێ و بەرفرەه كەت، و یێ رازی نەبوو بەرەكەتێ بۆ نائێخیتێ.**

٢٨٦ – عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: لا ينفع الحذر من القدر، ولكن الله يمحو بالدعاء ما يشاء من القدر. [ك٣٣٣٢].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هشیاری مفای قەدەرێ ناكەت بەلێ خودێ ب دوعایێ یا بڤێت ژ قەدەرێ ژێ دبەت.**

## ١٧ . باب: الوقوع في الهرم.

## بابەتێ: كالبوونێ.

٢٨٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَن النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مُثِّلَ ابْنُ آدَمَ، وَإِلَى جَنْبِهِ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ مَنِيَّةً، إِنْ أَخْطَأَتْهُ الْمَنَايَا وَقَعَ فِي الْهَرَمِ حَتَّى يَمُوتَ**). [ت٢١٥٠].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ كورێ شیخیری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (رەوشا مرۆڤی نۆت نەھ بەلایێت كوژەك ب رەخ وی و دۆرماندۆرێت وینە[2] ئەگەر ئەو بەلایێت كوژەك نەگەھشتنە و ب چو ژ وان بەلایان نەمر دێ كەڤیتە د پیر و كالیییدا ھەتا دمریت).**

## ١٨ . باب: النهي عن الخوض في القدر.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا تێكڤەدانا قەدەرێ.

٢٨٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَنَحْنُ نَتَنَازَعُ فِي الْقَدَرِ، فَغَضِبَ، حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، حَتَّى كَأَنَّمَا فُقِئَ فِي وَجْنَتَيْهِ الرُّمَّانُ، فَقَالَ: (**أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ، أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ؟ إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الْأَمْرِ، عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ، أَلاَّ تَتَنَازَعُوا فِيهِ**). [ت٢١٣٣].

* حسن.

---

(١) **باشییا د گەل دایبابان و كەس و كاران (صلة الرحم).**

(٢) **ل ڤێرێ ھژمارە نە مەبەستارە ئانكو یێت د ناڤ كۆمەكا بێ ھەژمار یا بەلایێت كوژەكدا.**

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ مە و ئەم یێ جرێ ل سەر قەدەرێ دکەین، ئینا تۆرە بوو هەتا سەروچاڤێت وی سۆر بووین هەروەکی هنار ب هەردو روییێت ویڤە پەڤاندی، گۆت: (ئەرێ فەرمانا هەوە ب ڤێ (جرەبرا د قەدەرێدا) هاتییە کرن یان ئەز ب ڤێ بۆ هەوە هاتیمە هنارتن، ب راستی یێت بەری هەوە هاتنە ژ ناڤبرن دەمێ ل سەر ڤێ د هەڤرك چۆین، ئەز سویند دخۆم و ل سەر هەوە دکەمە ئەرك ئەز سویند دخۆم و ل سەر هەوە دکەمە ئەرك هوین ل سەر قەدەرێ هەڤرك نەچن)[١].**

٢٨٩ – عَنْ عبدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى أَصْحَابِهِ وَهُمْ يَخْتَصِمُونَ فِي القَدَرِ، فَكَأَنَّمَا يُفْقَأُ فِي وَجْهِهِ حَبُّ الرُّمَّانِ مِنَ الغَضَبِ، فَقَالَ: (**بِهَذَا أُمِرْتُمْ، أَوَ لِهَذَا خُلِقْتُمْ؟ تَضْرِبُونَ القُرْآنَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ، بِهَذَا هَلَكَتِ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ**).

قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو: مَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِمَجْلِسٍ تَخَلَّفْتُ فِيهِ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِذَلِكَ المجْلِسِ، وَتَخَلُّفِي عَنْهُ. [جه٨٥].

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەرکەفتە دەڤ هەڤالێت خۆ و ئەو یێ هەڤرکییێ د قەدەرێدا دکەن، وەلێهات هەروەکی ژ تۆرەبوونێ هنار د روییێ ویدا پەڤاندی، گۆت: (فەرمانا هەوە ب ڤێ هاتییە کرن، هوین بۆ ڤێ هاتینە چێکرن هوین هندە قورئانێ ب هندەکا دی رەد بکەن، ب راستی ب ڤێ ملەتێت بەری هەوە ژ ناڤ چۆن).**

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: (چو جارا دلێ من نەچۆیە هندێ ئەز ل جڤاتەکا پێغەمبەری (ﷺ) ئامادە نەبم وەکی من پێ خۆش بووی ل ڤێ جڤاتێ ئامادە نەبوویم).**

---

[١] چونکی قەدەر نهێنییەکە ژ نهێنییێت خودێ و دویڤچۆنا نهێنییا خودێ دورست نینە و دویڤچۆنا زێدە د ڤی بابەتێدا دویر نینە مرۆڤی بێخیتە د خەلەتییێت مەزندا ژ وان قەدەرێ پەسند نەکەت یان ژێ بگەهیتە هندێ بێژیت مرۆڤ یێ ب خۆ نینە.

٢٩٠ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ وَهُوَ عَلى المِنْبَرِ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ يَزَالُ أَمْرُ هَذِهِ الأُمَّةِ مُوَائِماً – أَوْ مُقَارِباً – مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا فِي الوِلْدَانِ والقَدَرِ)**. [حب٦٧٢٤/ ك٩٣].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) و وی ل سەر مینبەرێ دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەردەوام کارێ ڤێ ئوممەتێ دێ د گەلێك بن (موافقی ئێك بن) یان نێزیکی هەڤ بن هندی ئەو د بچویکێت گاوراندا و د قەدەرێدا نەئاخڤن).**

## ١٩ ـ باب: ماجاء في المكذبين بالقدر.

## بابەتێ: کا چ د راستا واندا هاتییە ئەوێن قەدەرێ درەو ددانن.

٢٩١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(القَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ، إِنْ مَرِضُوا فَلاَ تَعُودُوهُمْ، وَإِنْ مَاتُوا فَلاَ تَشْهَدُوهُمْ)**. [د٤٦٩١].

* حسن.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(قەدەری[1] ئاگرپەرێسێت ڤێ ئوممەتێنە، ڤێجا ئەگەر نەساخ بوون سەرا نەدەن و ئەگەر مرن ل جەنازێ وان ئامادە نەبن).**

٢٩٢ – عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ لِابْنِ عُمَرَ صَدِيقٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ يُكَاتِبُهُ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَكَلَّمْتَ فِي شَيْءٍ مِنَ القَدَرِ، فَإِيَّاكَ أَنْ تَكْتُبَ إِلَيَّ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي أَقْوَامٌ يُكَذِّبُونَ بِالقَدَرِ)**. [د٤٦١٣].

* حسن.

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عومەری هەڤالەکێ خەلکێ شامێ هەبوو نامە بۆ دهنارتن، ئینا عەبدوللایێ کورێ عومەری بۆ نڤیسی: من یا زانی تە د راستا قەدەرێدا تشتەك یێ**

[1] ئەوێت باوەرییێ ب قەدەرێ نەئینن و دبێژن مرۆڤ کریارێت خۆ چێ دکەت و خودێ دەست تێدا نینە.

**گۆتی، هشیاربی نامەیان بۆ من نەنڤیسی، ب ڕاستی من یا گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بووی (ﷺ) دگۆت: (هندەك كەس ژ ئوممەتا من دێ دەرکەڤن باوەرییێ ب قەدەرێ نائینن).**

٢٩٣ - عَنْ طَاوس قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما وَمَعَنَا رَجُلٌ مِنَ القَدَرِيَّةِ فَقُلْتُ: إِنَّ أُناساً يَقُولُونَ: لا قَدَرَ، قَالَ: أَوَفِي القَوْمِ أَحَدٌ مِنْهُمْ؟ قُلْتَ: لَوْ كَانَ مَا كُنْتَ تَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: لَوْ كَانَ فِيْهِمْ أَحَدٌ مِنْهُمْ لَأَخَذْتُ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ قَرَأْتُ عَلَيْهِ آيَةَ كَذَا وَكَذا ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ٤﴾ [الإسراء].		[ك٣٣٧٢].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ تاووسی گۆت: ئەز ل دەڤ ئیبن عەباسی بووم (خودێ ژ وان ڕازی بیت) و زەلامەك ژ وان یێت قەدری د گەل مە بوو، من گۆت: خەلكەك یێ هەی دبێژن قەدەر نینە، گۆت: ئەرێ ئێك ژ وان ل ڤێرێ هەیە؟ من گۆت: ئەگەر هەبیت دێ چ لێ كەی؟ گۆت: ئەگەر ئێك ژ وان د ناڤدا هەبیت دا سەرێ وی گرم و فلان ئایەتێ و فلان ئایەتێ پێڤە خوینم. ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ، لَتُفْسِدُنَّ فِي الْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا﴾[1].**



**(١) ڕامانا ئایەتێ ب كورتی: و مە ئیسرائیلی د تەوراتێدا ئاگەهداركرن كو ب ڕاستی هوین دێ دوجا خرابییێ د عەردیدا كەن و ب ڕاستی ب خرابی و ستەما خۆ هوین دێ ب سەر خەلكی كەڤن سەركەڤتنەكا گەلەك مەزن..**

# المقصد الثاني

# العلم ومصادره

# مەبەستا دووێ

# زانین و ژێدەرێت وێ

## ١ . باب الفقه في الدين.

## بابەتێ: تێگەهشتن د دینیدا.

٢٩٤ - (ق) عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللهُ يُعْطِي، وَلَنْ تَزَالَ هذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللهِ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ**). [خ٧١/ م١٠٣٧].

**و ژ موعاویەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ خودێ خێر و باشی بۆ بڤێت دێ تێگەهشتنێ د دینیدا دەتێ و ئەز بەس لێكڤەكەرم[1] و خودێیە ددەت و كۆمەك ژ موسلمانان دێ ل سەر ئایینێ خودێ راگرتی بن و ئەوێت نە د گەل وان و بەروڤاژی وان چو زیانێ ناگەهیننە وان هەتا فەرمانا خودێ دهێت)[2].**

٢٩٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ**) [جه٢٢٠].

* صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ خودێ باشی بۆ بڤێت دێ تێگەهشتنێ د دینیدا دەتێ).**

٢٩٦ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**النَّاسُ مَعَادِنُ، فَخِيَارُهُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا**). [حم١٤٩٤٥].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

---

(١) ئەو تشتێ ئەز ددەمە هەوە نە ژ منە بەلكی ب فەرمانا خودێیە ئەز ل سەر هەوە بەلاڤ دكەم و یێ ددەت هەر خودێ ب تنێیە.

(٢) ئانكو هەتا فەرمان ب رۆژا قیامەتێ دهێت.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی مرۆڤ خودان ئەسل و بنیاتن[1]، باش و بژارەیێت وان د جاهلییەتێدا باش و بژارەنە د ئیسلامەتیییێدا ئەگەر د ئیسلامێدا شارەزا ببن و فەرمانێت ئیسلامێ بزانن).**

٢٩٧ - عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: أَصْحَابُ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذَا جَلَسُوا كَانَ حَدِيثُهُمْ يَعْنِي الفِقْهَ، إِلاَّ أَنْ يَقْرَأَ رَجُلٌ سُورَةً، أَوْ يَأْمُرَ رَجُلاً بِقِرَاءَةِ سُورَةٍ. [ك٣٢٢].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: هەڤالێت پێغەمبەرێ (ﷺ) ئەگەر روینشتبانە خوارێ ئاخفتنا وان زانین بوو ئەو نەبیت زەلامەك سۆرەتەكێ بخوينيت يان فەرمانا زەلامەكی بهێتە كرن سۆرەتەكێ بخوينيت.**

## ٢ . فضل العلم والتعليم.

## بابەتێ: قەدرێ زانین و فێربوونێ.

٢٩٨ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ مِنَ الهُدَى وَالعِلْمِ، كَمَثَلِ الغَيْثِ الكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضاً: فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ، قَبِلَتِ المَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الكَلأَ والعُشْبَ الكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ، أَمْسَكَتِ المَاءَ، فَنَفَعَ اللهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللهِ، ونَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْساً، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ).** [خ٧٩/ م٢٢٨٢].

---

(١) وەكی زێری و زیڤی و كا چەوا زێر و زیڤ نەوەكی ئێكن هۆسا مرۆڤ ژی نەوەكی ئێكن، یێ بنیاتێ وی یێ باش بیت چێتر وی ژی دێ د باش بن و هەروەسا بەروڤا ژیژی.

**و ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (مەتەل و نموونەیا هنارتنا من ژ لایێ خودێڤە ژ راستەرێییێ و زانینێ وەكی بارانەكێیە عەردەكی بگریت، هندەك ژێ خۆش عەرد بیت ئاڤێ ڤەخۆت، و گیا و چەرەكێ زێدە شین كەت، و هندەك ژێ هشكە عەرد بیت ئاڤێ ڤەگریت، خودێ پێ مفای بگەهینیتە خەلكی، ژێ ڤەخۆن و پێ ئاڤدانێ بكەن و پێ بچینن، و هندەك عەردێ دی ژێ بگریت، حلیسە و دەشتە عەرد بیت، نە ئاڤێ ڤەگریت و نە چەرەی شین كەت، ئەڤە مەتەلا وییە یێ د دینێ خودێدا شارەزا بووی، و ئەوا خودێ ئەز پێ هنارتیم مفا گەهاندبیتێ، ڤێجا فێر ببیت و فێر بكەت، و مەتەلا وی یێ بەرێ خۆ ژێ وەرگێریت و راستەرێییا خودێ ئەوا ئەز پێ هاتیمە هنارتن نەوەرگریت).**

٢٩٩ - عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّهُ لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، حَتَّى الحِيتَانِ فِي البَحْرِ). [جه٢٣٩].

* صحيح.

**ژ ئەبی دەردائی (ﷺ) گۆت من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (و ب راستی هەر تشتەكێ د عەرد و عەسماناندا هەی هەتا ماسی د دەریایێدا داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ زانای دكەن).**

٣٠٠ - عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (خَيْرُ مَا يُخَلِّفُ الرَّجُلُ مِنْ بَعْدِهِ ثَلَاثٌ: وَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ، وَصَدَقَةٌ تَجْرِي يَبْلُغُهُ أَجْرُهَا، وَعِلْمٌ يُعْمَلُ بِهِ مِنْ بَعْدِهِ). [جه٢٤١].

* صحيح.

[وانظر: ١٦٣٨].

**ژ ئەبی قەتادەیی، (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (باشترین تشت مرۆڤ پاش خۆ بهێلیت سێنە: كورەك یان كچەكا باش دوعا بۆ بكەت و سەدەقەكا بەردەوام خێرا وێ بگەهیتێ و زانینەك پشتی وی كار پێ بهێتە كرن).**

٣٠١ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ غَدَا إِلى المَسْجِدِ لا يُرِيْدُ إلاَّ لِيَتَعَلَّمَ خَيْراً أَوْ يُعَلِّمَهُ، كَانَ لَهُ أَجْرُ مُعْتَمِرٍ تَامِّ العُمْرَةِ، فَمَنْ رَاحَ إِلَى المَسْجِدِ لا يُرِيْدُ إلاَّ لِيَتَعَلَّمَ خَيْراً أَوْ يُعَلِّمَهُ، فَلَهُ أَجْرُ حَاجٍ تَامِّ الحِجَّةِ**). [ك٣١١].

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

**ژ ئەبی ئومامەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ سپێدێ بچیتە مزگەفتێ و چو نەڤێت ئەو نەبیت خێرەكێ فێر ببیت یان خێرەكێ فێركەت خێرا وی هندی یا عومرەكەركییە عومرە تمام كری، یێ ئێڤاری بچیتە مزگەفتێ و چو نەڤێت ئەو نەبیت خێرەكێ فێر ببیت یان خێرەكێ فێركەت خێرا وی هندی یا حەجییەكییە حەج تمام كری).**

٣٠٢ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْهُومَانِ لا يَشْبَعَانِ: مَنْهُومٌ فِي عِلْمٍ لا يَشْبَعُ، وَمَنْهُومٌ فِي دُنْيا لا يَشْبَعُ**). [ك٣١٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دو زێدە دلخواز تێر نابن دلخوازێ زانینێ تێر نابیت و دلخوازێ دنیایێ تێر نابیت).**

٣٠٣ - عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَضْلُ العِلْمِ خَيْرٌ مِنْ فَضْلِ العِبَادَةِ، وَخَيْرُ دِيْنِكُمُ الوَرَعُ**). [ك٣١٧].

**ژ حوزیفەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خێرا زانینێ ژ پەرستنێ مەزنترە و باشترین دینێ هەوە هشیارییە)[1].**

٣ ـ باب بلغوا عني ولو آية.

**بابەتێ: ژ من بگەهینن خۆ ئایەتەك بیت.**

٣٠٤ – (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ**). [خ٣٤٦١].

و ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ژ من بگەهینن خۆ ئەگەر ئایەتەك بیت، و ژ ئیسرائیلییان ڤەگوهێزن و چو بەرتەنگی ل سەر هەوە نینە و هەر کەسێ درەوەکێ ژ ڤەستا ب ناڤێ من من بکەت بلا جهێ خۆ ل جەهنەمێ بگریت).**

٣٠٥ – عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**نَضَّرَ اللهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ لَيْسَ بِفَقِيهٍ**). [د٣٦٦٠/ت٢٦٥٦/ جه٢٣٠/ مي٢٣٥].

* صحيح.

**ژ زەیدێ کورێ سابتی (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (خودێ مرۆڤەکی حال خۆش کەت تشتەك ژ مە گوه لێ بیت، ژبەر بکەت هەتا بگەهینیت، دبیت هەلگرێ زانینێ بگەهینیتە ئێکێ ژ خۆ زاناتر و دبیت زانین هەلگرە بەلێ نەییێ زانا بیت).**

٣٠٦ – عَنْ مُعَاوِيَةَ القُشَيْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الغَائِبَ**).[جه٢٣٤]

* صحيح.

---

(١) بەردەوام د زێرڤانێدابی و ب چو رەنگا نەحەقییێ تێکەلی حەقییێ نەکەی.

**ژ موعاویەیێ قوشەیری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هۆ بلا یێ حازر بگەهینیتە یێ نەحازر).**

٣٠٧ - عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تَسْمَعُونَ، وَيُسْمَعُ مِنْكُمْ، وَيُسْمَعُ مِمَّنْ سَمِعَ مِنْكُمْ**). [د٣٦٥٩].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: هوین (زانینێ) ژ من گوه لێ دبن و ژ هەوە دهێتە گوهلێبوون و ژ وان دهێتە گوهلێبوون یێت ژ هەوە گوه لێ بووین (رامان ئەوە گوهدانا زانینێ بكەن و بگەهینن).**

## ٤ ـ باب اثم الكذب على النبي (ﷺ).

## بابەتێ: گونەها وی یێ درەوێ ل پێغەمبەری ( ) بكەت.

٣٠٨ - (ق) عَنْ علي قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تَكْذِبُوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَلِجِ النَّارَ**). [ خ١٠٦/ م١ مقدمة].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (درەوێ ب نافێ من نەكەن، ب راستی ئەوێ درەوێ ب نافێ من بكەت دێ چیتە جەهنەمێ).**

٣٠٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ**). [خ١١٠/ م٣ مقدمة].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ درەوەكێ ژ قەستا ل سەر من بكەت بلا جهێ خۆ ل جەهنەمێ بگریت).**

٣١٠ - (م) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثاً، وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ، فَهُوَ أَحَدُ الكَاذِبَيْنِ**). [المقدمة: باب (١)/ جه٣٩].

**و ژ سەمورەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ حەدیسەکێ ژ من ڤەگوهێزیت و بزانیت ئەو درەوە، ئەو ئێك ژ درەوینانە).**

٥ . باب: الاغتباط بالعلم.

## بابەتێ: حەزکرنا (حەسویدییەکا تایبەت) وەرگرتنا زانینێ.

٣١١ - (ق) عَنْ عَبدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الحِكْمَةَ فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا)**

[خ٧٣/ م٨١٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (حەسویدی نەیا دورستە د دو خاسلەتاندا نەبیت[1]، مرۆڤەکی خودێ مال دابیتێ، خودێ وی ب سەر مەزاختنا وی مالی د جهێ ویدا و حەقییێدا ب شیان و دل بێخیت، و مرۆڤەکی خودێ تێگەهشتن و شارەزایی دابیتێ ئەو کار پێ بکەت و نیشا غەیری خۆ بدەت).**

٦ . باب: التعليم بطرح السؤال.

## بابەتێ: فێرکرنا چەوانییا پرسیارکرنێ.

٣١٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا، وَهِيَ مَثَلُ المُسْلِمِ، حَدِّثُونِي مَا هِيَ)**، فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ البَادِيَةِ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَاسْتَحْيَيْتُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَخْبِرْنَا بِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(هِيَ النَّخْلَةُ)**. قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَحَدَّثْتُ أَبِي بِمَا وَقَعَ فِي نَفْسِي، فَقَالَ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي كَذَا وَكَذَا.

[خ١٣١ (٦١)/ م٢٨١١].

---

[1] زانا دبێژن: دو رەنگێت حەسویدییێ یێت هەین ئێك: تو حەز بکەی خۆشییا غەیری تە نەمینیت، ئەڤە یا حەرامە ل سەر بۆچۆنا هەمی زانایان، و یا دووێ یا مەجازییە، تو حەز بکەی ئەو خۆشی بگەهیتە تە ژی و خۆشییا وی هەر بمینیت و نەچیت، و مەرەما حەدیسێ نەڤ رەنگەیە و نەڤە نەیا حەرامە.

ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) **گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دارەك ژ داران یا هەی بەلگێت وێ ناوەرن، و ئەو وەكی موسلمانییە بێژنە من ئەو كیژ دارە)؟** ڤێجا هزرا خەلكی چۆ دارێت دەشتێ، و كەفتە دلێ من ئەو دارقەسپە، عەبدوللایی گۆت: من شەرم كر بێژم، گۆتن ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو كیژكە بۆ مە بێژە؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەو دارقەسپە)**، عەبدوللایی گۆت: من ئەو تشتێ هاتییە هزرا من بۆ بابێ خۆ گۆت: ئینا گۆتە من: ئەگەر تە گۆتبا دا بۆ من خۆشتر بیت ژ هندێ و من فلان تشت و فلان تشت هەبان.

٧ - باب: الجلوس لاستماع العلم.

**بابەتێ: روینشتن بۆ گوهدانا زانینێ.**

٣١٣ - (ق) عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي المَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ، إِذْ أَقْبَلَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا: فَرَأَى فُرْجَةً فِي الحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ: فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ: فَأَدْبَرَ ذَاهِباً. فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاَثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللهِ فَآوَاهُ اللهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللهُ عَنْهُ)**

[خ٦٦/ م٢١٧٦].

ژ ئەبی واقدێ لەیسی (رضي الله عنه) گۆت: دەمەكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مزگەفتێ یێ روینشتی بوو و خەلك د گەل بوون، سێ كەس هاتن، دو هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئێك چۆ، هەردو ل هنداڤ سەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) راوەستان، ئێكی ژ وان جهەك دیت لێ روینشتە خوارێ و یێ دی ل پشت وان روینشتە خوارێ بەلێ یێ سێیێ زڤری چۆ، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خلاس بووی، گۆت: **(ئەز بۆ هەوە**

**بەحسێ هەرسێ كەسان نەكەم؟ هندیكە ئێك ژ وان بوو خۆ گەهاندە خودێ، خودێ ژی گەهاندە خۆ، و هندیكە یێ دی بوو شەرم كر خۆ د ناڤڕا كەت، خودێ ژی دلۆڤانی پێ بر و گونەهێت وی ژێ برن، و هندیكە یێ دی بوو بەرێ خۆ وەرگێرا خودێ ژی دلۆڤانی پێ نەبر).**

٨ ـ باب: التثبت من العلم.

**بابەتێ: دویڤچوون د زانینێدا**

٣١٤ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَنَّهَا كَانَتْ لاَ تَسْمَعُ شَيْئاً لاَ تَعْرِفُهُ، إِلاَّ رَاجَعَتْ فِيهِ حَتَّى تَعْرِفَهُ، وأَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ**)، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: أَوَ لَيْسَ يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ⑧﴾[الانشقاق]، قَالَتْ: فَقَالَ: (**إِنَّمَا ذَلِكَ العَرْضُ، وَلكِنْ: مَنْ نُوقِشَ الحِسَابَ يَهْلِكْ**).　　　　[خ١٠٣/ م٢٨٧٦].

**ژ عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) وێ چو تشت گوه لێ نەدبوون و نەزانیبا هەكە زڤرین ل سەر نەكربا هەتا بزانیت و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ هویرك پرسین د گەل هاتە كرن ئەو هاتە ئیزادان)، عائیشایێ گۆت: ما خودێ نابێژیت: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾[(١)] گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەو بەس بەرچاڤئێخستنە بەلێ یێ گەنگەشا پرسینێ د گەل هاتە كرن ئەو ژ ناڤ چوو).**

٣١٥ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِي (ﷺ) فِي المَسْجِدِ، دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ، فَأَنَاخَهُ فِي المَسْجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَالنَّبِيُّ (ﷺ) مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، فَقُلْنَا: هذَا الرَّجُلُ الأَبْيَضُ المتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: ابْنَ عَبْدِ المطَّلِبِ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (**قَدْ أَجَبْتُكَ**)، فَقَالَ الرَّجُلُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي المسْأَلَةِ، فَلاَ تَجِدْ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ،

---

**(١) دێ حسێبەكا سڤك د گەل ئێتە كرن.**

فَقَالَ: (**سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ**) ؟ فَقَالَ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ، آللهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ! آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الخَمْسَ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ! آللهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ: (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ! آللهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ النَّبِي (ﷺ): (**اللَّهُمَّ نَعَمْ**). فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ، أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ. [خ٦٣].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: د دەمەكیدا ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مزگەفتێ د روینشتی بووین، زەلامەك ل سەر حێشترەكێ هات و حێشترا خۆ ل مزگەفتێ دانا، پاشی گرێدا، پاشی گۆت: كی ژ هەوە موحەممەدە؟ و پێغەمبەر (ﷺ) یێ د ناڤ واندا پالدای بوو، مە گۆت ئەو زەلامێ سپی یێ پالدایی، ئینا زەلامی گۆتێ: تو كورێ عەبدولموتەلبی؟ گۆت: (من گوه ل تە بوو بێژە)، وی زەلامی گۆت: ئەز دێ پرسیارێ ژ تە كەم و پرسیارێ ل سەر تە گران كەم ڤێجا ژ من تۆرە نەبە، ئینا گۆت: (تشتێ تە دڤێت پرسیار بكە)، گۆت: ئەز تە ب خودایێ تە و خودایێ یێت بەری تە ددەمە سویندێ ئەرێ خودێ تو بۆ خەلكی هەمیان هنارتییە؟ ئینا گۆت: (ئەز ب خودێ كەمە بەلێ)، گۆت: ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ ئەرێ خودێ فەرمانا تە كرییە ئەم پێنج نڤێژان د شەڤەك و رۆژەكێدا بكەین؟ گۆت: (ئەز ب خودێ كەمە بەلێ)، گۆت: ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ ئەرێ خودێ فەرمانا تە كرییە ئەم هەیڤا رەمەزانێ ژ سالێ ب رۆژی بین؟ گۆت: (ئەز ب خودێ كەمە بەلێ)، گۆت: ئەز تە ب خودێ ددەمە سویندێ ئەرێ خودێ فەرمانا تە كرییە تو زەكاتێ ژ زەنگینێت مە وەرگری و ل سەر هەژارێت مە لێكڤەكەی؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەز ب خودێ كەمە بەلێ). زەلامی گۆت: من باوەری ب وی تشتێ تو پێ هاتی ئینا و ئەز هنارتییێ یێت پشت خۆمە ژ ملەتێ من و ئەز زومامەیێ كورێ سەعلەبەمە ژ بەنی سەعدێ بەنی بەكر.**

٩ . باب: ما يكره من كثرة السؤال.

**بابەتێ: نەباشە گەلەك پرسیار بهێنە كرن.**

٣١٦ - (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ أَعْظَمَ المسْلِمِينَ جُرْماً، مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ، فَحُرِّمَ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ**). [خ٧٢٨٩/ م٢٣٥٨].

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وقاص (رضي الله عنه) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی موسلمانێ گونەها وی یا ژ هەمیان مەزنتر ئەوە یێ پرسیارا تشتەكێ نەحەرامكری بكەت فێجا ژ بەر پرسیارا وی بێتە حەرامكرن).**

٣١٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ سُؤَالُهُمْ واخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُم عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ**). [خ٧٢٨٨/ م١٣٣٧ و١٣٣٧م].

- ولفظ مسلم: (**بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ**).
- وزاد مسلم في أوله: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الحَجَّ فَحُجُّوا**) فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثاً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ**)، ثُمَّ قال: (**ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ...**).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من بهێلن هندی ئەز چو ئەمر و نەهیان (فەرمان پاشڤەلێدانان) ل هەوە نەكەم، ب راستی یێت بەری هەوە گەلەك پرسیاركرنا وان[1] و ژێكجودابوونا وان د گەل پێغەمبەرێت وان ئەو برنە هیلاكێ، فێجا ئەگەر من پاشڤەلێدانا هەوە ژ تشتەكی كر و هوین ژێ دانە پاش خۆ ژێ دویر بێخن و**

---

(١) وەكی پرسیارا وان بۆ دیتنا خودێ و دویڤچۆنا وان بۆ ڤەكوشتنا چێلێ.

**خۆ ژێ بدەنە پاش، و ئەگەر من فەرمانا هەوە ب تشتەکی کر هندی هوین دشێن ژێ بکەن).**

- و د بێژەیا موسلمیدا: **(ژ بەر گەلەك پرسیارێت وان).**
- و موسلمی دەستپێکا وێ زێدە کرییە: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ): خوتبە بۆ مە خواند و گۆت: **(گەلی مرۆڤان ب راستی خودێ حەج یا ل سەر هەوە فەرز کری حەجێ بکەن)**، ئینا زەلامەکی گۆت: هەر سال ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ پێغەمبەر بێ دەنگ بوو هەتا سێ جاران پرسیارا خۆ دوبارە کری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر من گۆتبا بەلێ دا فەرز بیت و هوین نەدشیان)**، پاشی گۆت: **(من بهێلن هندی ئەز چو ئەمر و نەهیان (فەرمان و پاشڤەلێدانان) ل هەوە نەکەم).**

٣١٨ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا، فَلَمَّا أُكْثِرَ عَلَيْهِ غَضِبَ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ: (**سَلُونِي عَمَّا شِئْتُمْ**) ؟ قَالَ رَجُلٌ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ: (**أَبُوكَ حُذَافَةُ**). فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: (**أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ**). فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللهِ عزّ وجل. [خ٩٢/ م٢٣٦٠].

ژ ئەبی مووسای (ﷺ) گۆت: پرسیارا هندە تشتان ژ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە کرن ب دلێ وی نەبوون، ڤێجا دەمێ زێدە پرسیار کرین، تۆرە بوو پاشی گۆتە خەلکی، **(ژ تشتێ هەوە دڤێت پرسیارێ ژ من بکەن)**، زەلامەکی گۆت: بابێ من کییە؟ گۆت: **(بابێ تە حوزافەیە)**، ئێکێ دی رابوو گۆت: بابێ من کییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ ئینا گۆت: **(بابێ تە سالمە ئازاکرییێ شەیبەیی)**، ڤێجا دەمێ عومەری ئەو دیت یا ل سەر روییێ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی ئەم تەوبێ ب بال خودایێ هەر ب هێز و مەزن دکەین.

٣١٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، لاَ تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَخْبَرْتُكُمْ بِهِ**)، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ حُذَافَةَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**أَبُوكَ حُذَافَةُ بْنُ قَيْسٍ**)، فَرَجَعَ إِلَى أُمِّهِ فَقَالَتْ: وَيْحَكَ! مَا حَمَلَكَ عَلَى الَّذِي صَنَعْتَ، فَقَدْ كُنَّا أَهْلَ جَاهِلِيَّةٍ، وَأَهْلَ أَعْمَالٍ قَبِيحَةٍ؟ فَقَالَ لَهَا: إِنْ كُنْتُ لَأُحِبُّ أَنْ أَعْلَمَ مَنْ أَبِي مَنْ كَانَ مِنَ النَّاسِ. [حم١٠٥٣١].

* صحيح، وإسناده حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی یێت بەری هەوە ژ ناڤ چۆن چونکی گەلەك پرسیار دکرن[1] و ژ بەر ژێکجودابوونا وان د گەل پێغەمبەرێت وان و هوین پرسیارا چو تشتان ژ من ناکەن ئەگەر ئەز بەرسڤا هەوە نەدەم)، ئینا عەبدوللایێ کورێ حوزافەی گۆت: بابێ من کییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (بابێ تە حوزافەیێ کورێ قەیسیە)، زڤری دەڤ دایکا خۆ، دەیکا وی گۆتێ: وەی بۆ تە چ تو پالدایە ئەوا تە کری؟ ئەم خەلکێ نەزانینێ بووین و خەلکێ کارێت خراب بووین، ئینا گۆتێ: من دڤیا ئەز بزانم کی بابێ منە ژ وی خەلکی.**

## ١٠ ـ باب: الاقتصاد في الموعظة.

## بابەتێ: ئابۆری د شیرەتێدا ئانکو: ناڤنجی بیت و درێژ نەبیت.

٣٢٠ – (ق) عَنْ أَبِي وائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مسعودٍ يُذَكِّرُ النَّاسَ فِي كُلِّ خَمِيسٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمنِ، لَوَدِدْتُ أَنَّكَ ذَكَّرْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنْ ذَلِكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، وَإِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بِالْمَوْعِظَةِ، كَمَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَخَوَّلُنَا بِهَا، مَخَافَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا.

[خ٧٠ (٦٨)/ م٢٨٢١].

(١) وەکی پرسیارا وان بۆ دیتنا خودێ و دویڤچۆنا وان بۆ ڤەکوشتنا چێلێ.

**ژ ئەبی وائلی، گۆت: ئیبن مەسعودی هەمی پێنج شەمبان جارەكێ دەرس بۆ مە دگۆت، زەلامەكی گۆت: یا بابێ عەبدولرەحمانی مە حەز دكر تە هەرۆژ دەرس بۆ مە گۆتبا، گۆت: ب راستی تشتێ من ژ هندێ ددەتە پاش، من نەڤێت ئەز بێزارییێ بۆ هەوە چێكەم، و ب راستی ئەز چاڤدێرییا هەوە ب دەرسێ دكەم، هەروەكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چاڤدێرییا مە پێ دكر، ترسا هندێ بێزاری مە بگریت.**

٣٢١ - (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: حَدِّثِ النَّاسَ كُلَّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ أَبَيْتَ فَمَرَّتَيْنِ، فَإِنْ أَكْثَرْتَ فَثَلَاثَ مِرَارٍ، وَلاَ تُمِلَّ النَّاسَ هذَا الْقُرْآنَ، وَلاَ أُلفِيَنَّكَ تَأْتِي القَوْمَ وَهُمْ فِي حَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِهِمْ، فَتَقُصُّ عَلَيْهِمْ، فَتَقْطَعُ عَلَيْهِمْ حَدِيثَهُمْ فَتُمِلُّهُمْ، وَلكِنْ أَنْصِتْ، فَإِذَا أَمَرُوكَ فَحَدِّثْهُمْ وَهُمْ يَشْتَهُونَهُ، فَانْظُرِ السَّجْعَ مِنَ الدُّعَاءِ فَاجْتَنِبْهُ، فَإِنِّي عَهِدْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَأَصْحَابَهُ لاَ يَفْعَلُونَ إِلاَّ ذلِكَ. يَعْنِي: لاَ يَفْعَلُونَ إِلاَّ ذلِكَ الاِجْتِنَابَ.　　[خ٦٣٣٧].

**ژ عیكریمەیی، ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەر ئەینییێ جارەكێ بۆ خەلكی باخڤە، و ئەگەر تە نەڤیا و تە پتر ڤیا دو جاران، و ئەگەر تە زێدە ڤیا سێ جاران، و بێزارییێ بۆ خلكی ژ قورئانێ دورست نەكە، و ئەز تە نەبینم تو بهێیە دەڤ هندەكان و ئەو یێت د ئاخفتنەكێدا ژ ئاخفتنێت خۆ ڤێجا تو سەرهاتییەكێ بۆ بێژی و ئاخفتنا وان ببڕی، ڤێجا ب ڤێ چەندێ تو وان بێزار بكەی، بەلێ خۆ بێ دەنگ بكە، ئەگەر وان ژ تە خواست بۆ باخڤە و وان بڤێت، و بەرێ خۆ بدێ سەجەعێ[1] خۆ ژێ بدە پاش، ب راستی من پێغەمبەر (ﷺ) و هەڤالێت وی یێت د نیاسین ڤێ ناكەن ئەڤ خۆدانەپاشە نەبیت[2].**

---

(١) ئاخفتنا پەیڤێت وێ ب ئێك پیت ب دویماهی دهێت.

(٢) ئانكو خۆ ژ سەجەعێ د ئاخفتنا خۆدا ددەنە پاش.

## ١١ ـ باب: كیفیة الدعوة الى الله تعالى.

## بابەتێ: چاوا دێ بانگخوازییا رێكا خودێ كەی.

٣٢٢ - (ق) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، حِينَ بَعَثَهُ إِلَى اليَمَنِ: (**إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْماً أَهْلَ كِتَابٍ، فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى: أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ**). [خ١٤٩٦ (١٣٩٥)/ م١٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە مەعازێ كورێ جەبەلی دەمێ هنارتییە یەمەنێ: (تو دێ چییە دەڤ هندەك مرۆڤان ژ خودانێت كتێبان، داخوازا وان بۆ شەهدەییێ بكە، كو چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت، و ئەز پێغەمبەرێ خودێمە، ئەگەر وان بۆ ڤێ گوهێ خۆ دا تە، نیشا وان بدە خودێ پێنج نڤێژ د هەر شەڤەك و رۆژەكاندا ل سەر وان یێت فەرز كرین، ئەگەر وان بۆ ڤێ گوهێ خۆ دا تە، نیشا وان بدە خودێ، زەكات ل سەر وان یا فەرز كری، ژ زەنگینێ وان دێ هێتە وەرگرتن و ل سەر هەژارێ وان هێتە زڤراندن، ئەگەر وان بۆ ڤێ گوهێ خۆ دا تە، هشیاری مالێ وان یێ ب قەدر و بهاگرانبە[1] و خۆ ژ دوعایا ستەملێكری بپارێزە، ب راستی چ پەردە د ناڤبەرا وێ و خودێدا نینن).**

٣٢٣ - عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ، فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَاناً. [جه٦١]

* صحيح.

---

(١) ئانكو دەمێ زەكاتێ ژ وان وەردگری خۆ ژ مالێ ب قەدر و بهاگران بپارێزە.

**ژ جوندبێ کورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ) و ئەم لاوێت سنێل (نێزیکی بالغبوونێ) بووین، ڤێجا ئەم فێری باوەرییێ بووین (بیر و باوەرێت مە دورست بوون) بەری ئەم فێری قورئانێ ببین پاشی ئەم فێری قورئانێ بووین ڤێجا باوەرییا مە پێ زێدە بوو .**

**١٢ . باب: تعليم النساء.**

**بابەتێ: فێرکرنا ژنان.**

٣٢٤ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! ذَهَبَ الرِّجَالُ بِحَدِيثِكَ، فَاجْعَلْ لَنَا مِنْ نَفْسِكَ يَوْماً نَأْتِيكَ فِيهِ، تُعَلِّمُنَا مِمَّا عَلَّمَكَ اللهُ، فَقَالَ: (**اجْتَمِعْنَ فِي يَوْمِ كَذَا وَكَذَا، فِي مَكَانِ كَذَا وَكَذَا**)، فَاجْتَمَعْنَ، فَأَتَاهُنَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَعَلَّمَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَهُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: (**مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ بَيْنَ يَدَيْهَا مِنْ وَلَدِهَا ثَلَاثَةً، إِلَّا كَانَ لَهَا حِجَاباً مِنَ النَّارِ**)، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: يَا رَسُولَ اللهِ! اثْنَيْنِ؟ قَالَ: فَأَعَادَتْهَا مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: (**وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ وَاثْنَيْنِ**).

[خ٧٣١٠ (١٠١)/ م٢٦٣٣].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: ژنەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئاخفتنا تە هەمی بۆ زەلامان چۆ، رۆژەکێ ژ دەمێ خۆ بۆ مە دانە تێدا بهێینە دەڤ تە ژ یا خودێ نیشا تە دای تو نیشا مە بدەی، گۆت: (بێڤان و بێڤان رۆژێ کۆم ببن)، کۆم بوون، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ وان و ژ یا خودێ نیشا دای نیشا وان دا، پاشی گۆت: (نینە ژنەك ژ هەوە سێ زارۆکێت وێ بمرن ئەگەر بۆ ژ ئاگری نەبنە پەردە)، ژنەکێ ژ وان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ و دو ژی؟ و دو جار ئاخفتنا خۆ دوبارە کر پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (و دو ژی و دو ژی و دو ژی).**

## ١٣ . باب: قبض العلم.

## بابەتێ: هەلکێشانا زانینێ.

٣٢٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْن عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبِضُ العِلْمَ انْتِزَاعاً يَنْتَزِعُهُ مِنَ العِبَادِ، وَلكِنْ يَقْبِضُ العِلْمَ بِقَبْضِ العُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِماً، اتَّخَذَ النَّاسُ رُؤُوساً جُهَّالاً، فَسُئِلُوا، فَأَفْتَوا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا**). [خ١٠٠/ م٢٦٧٣].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی خودێ ب ژێبرنێ زانینێ د ناڤ خەلکیدا راناکەت کو ژ خەلکی بهەلکێشیت، بەلێ دێ زانینێ ب مرنا زانایان هەلکێشیت هەتا چو زانا نەمینن، خەلك دێ سەرۆکێت نەزان گرن و دێ پرسیار ژێ هێنە کرن، و بێی بزانن دێ بەرسڤێ و فەتوا دەن، ب ڤێ چەندێ دێ سەردا چن و خەلکی ژی سەردا بەن).**

٣٢٦ - عَنْ زِيَادِ بْنِ لَبِيدٍ قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) شَيْئاً فَقَالَ: (**ذَاكَ عِنْدَ أَوَانِ ذَهَابِ العِلْمِ**)، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَيْفَ يَذْهَبُ العِلْمُ وَنَحْنُ نَقْرَأُ القُرْآنَ، وَنُقْرِئُهُ أَبْنَاءَنَا، وَيُقْرِئُهُ أَبْنَاؤُنَا أَبْنَاءَهُمْ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ؟ قَالَ: (**ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ زِيَادُ! إِنْ كُنْتُ لأَرَاكَ مِنْ أَفْقَهِ رَجُلٍ بِالْمَدِينَةِ؛ أَوَلَيْسَ هَذِهِ اليَهُودُ وَالنَّصَارَى يَقْرَؤُونَ التَّوْرَاةَ وَالإِنْجِيلَ لاَ يَعْمَلُونَ بِشَيْءٍ مِمَّا فِيهِمَا؟**). [جه٤٠٤٨].

* صحيح.

**ژ زیادێ کوڕێ لەبیدی** (رضي الله عنه) **گۆت: پێغەمبەری** (ﷺ) **بەحسەك کر، و گۆت: (و ئەڤە دەمێ زانین دچیت و نەمینیت)** من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چاوا زانین نامینیت و ئەم یێ قورئانێ دخوینین و ب زارۆکێت خۆ ددەینە خواندن و زارۆکێت مە ب زارۆکێت خۆ ددەنە خواندنێ هەتا رۆژا قیامەتێ؟! پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(تو ل دایکا خۆ بەرزە**

**ببی[1]، من تو زەلامێ ژ هەمیان تێگەهشتیتر د مەدینەیێدا ددیتی، ما ئەڤە جوهی و فەلە نینن تەورات و ئنجیلێ دخوینن کار ب چو یا د واندا ناکەن).**

٣٢٧ - عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَدْرُسُ الإِسْلاَمُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لاَ يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلاَ صَلاَةٌ وَلاَ نُسُكٌ وَلاَ صَدَقَةٌ! وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللهِ عزّ وجل فِي لَيْلَةٍ، فَلاَ يَبْقَى فِي الأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ: الشَّيْخُ الكَبِيرُ وَالعَجُوزُ يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الكَلِمَةِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا).**

فَقَالَ لَهُ صِلَةُ: مَا تُغْنِي عَنْهُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَهُمْ لاَ يَدْرُونَ مَا صَلاَةٌ وَلاَ صِيَامٌ وَلاَ نُسُكٌ وَلاَ صَدَقَةٌ؟

فَأَعْرَضَ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ رَدَّهَا عَلَيْهِ ثَلاَثاً كُلَّ ذَلِكَ يُعْرِضُ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِ فِي الثَّالِثَةِ، فَقَالَ: يَا صِلَةُ، تُنْجِيهِمْ مِنَ النَّارِ، ثَلاَثاً. [جه٤٠٤٩]

* صحيح.

**ژ حوزەیفەیێ کورێ یەمانی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (موسلمانەتی نامینیت هەروەکی نەخشێ جلکی دچیت و نەمینیت هەتا نەهێتە زانین، نە رۆژی نە نڤێژ و نەحەج و نە زەکات چییە، و دێ شەڤەك ب سەر قورئانێدا هێت ئایەتەك ژێ د عەردیدا نامینیت و هندە کۆم ژ خەلکی دێ مینن پیرەمێر و دان عومر دێ بێژن: ئەم گەهشتینە بابێت خۆ دگۆت: (لَا إِلَهَ إلا الله) و ئەم ژی دبێژین).**

**(ربعییێ کورێ حەراشی یێ ئەڤ فەرمووده ژ حوزەیفەی ڤەگێرای) گۆت: صیلەیێ (کورێ زوفەری ژ تابعینان بوو) گۆت: (لَا إِلَهَ إلا الله) چو فایدێ وان ناکەت و چو ژ وان نادەتە پاش و ئەو نەزانن نە نڤێژ و نە رۆژی و نە حەج و نە زەکات چییە.**

(١) نفرینە بەلێ مەرەم پێ نەنفرینە بەلکی مەرەم پێ تۆرەکرنا وییە و گوهشینە چاوا ڤێ پرسیارێ دکەت.

**حوزەيفە بەرێ خۆ ژێ وەرگێرا و بەرسڤا وى نەدا پاشى سێ جار ئەڤە دوبارە كر هەر حوزەيفەى بەرێ خۆ ژێ وەردگێرا پاشى جارا سێيێ بەرێ خۆ دايێ و گۆت: ئەى (صلة) بەلێ ئەو دێ وان ژ ئاگرى رزگار كەت و ئەڤە سێ جاران گۆت.**

١٤ . باب: سماع الصغير وتعليمه.

**بابەتێ: گوهدانا بچويكى و فێركرنا وى.**

٣٢٨ - (ق) عَنْ مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ قَالَ: عَقَلْتُ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ) مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِي . وَأَنَا ابْنُ خَمْسِ سِنِينَ . مِنْ دَلْوٍ. [خ٧٧/ م٣٣م/ مساجد ٢٦٥].

[وانظر: ٨٥، ٢٦٣٨].

**ژ مەحمودێ كورێ رەبيعى (رضي الله عنه) گۆت: من ژ پێغەمبەرى (ﷺ) ژبەر كرييە فرەك ژ دەڤێ خۆ ژ دۆلكەكى هاڤێتە ناڤچاڤێت من و ژيێ من پێنج سال بوون.**

١٥ . باب: لم يخص آل البيت بالعلم.

**بابەتێ: خەلكێ مالا پێغەمبەرى (ﷺ) ب زانينێ تايبەت نەكرينە.**

٣٢٩ - (ق) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: مَا عِنْدَنَا كِتَابٌ نَقْرَؤُهُ؛ إِلاَّ كِتَابُ اللهِ غَيْرَ هذِهِ الصَّحِيفَةِ، قَالَ: فَأَخْرَجَهَا، فَإِذَا فِيهَا أَشْيَاءُ مِنَ الجِرَاحَاتِ وَأَسْنَانِ الإِبِلِ، قَالَ: وَفِيهَا: **(المَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثاً، أَوْ آوَى مُحْدِثاً، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ. وَمَنْ وَالَى قَوْماً بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ. وَذِمَّةُ المُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِماً فعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ).** [خ٦٧٥٥ (١١١)/ م١٣٧٠].

■ وفي رواية للبخاري: عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ رضي الله عنه: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِنَ الوَحْيِ إِلاَّ مَا فِي كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: وَالَّذِي فَلَقَ الحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، مَا أَعْلَمُهُ إِلاَّ فَهْماً يُعْطِيهِ اللهُ رَجُلاً فِي القُرْآنِ، وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ، قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ: العَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وأَنْ لاَ يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ. [خ٣٠٤٧].

**ژ عەلییێ کورێ ئەبو تالبی (ﷺ) گۆت: چو کتێب نینن بخوینین کتێبا خودێ نەبیت، و یا د ڤێ دەفتەرێدا، و دەرێخست: هندە تشت ژ فەرمانێت خوینێ و ژیێ حێشتران[١] تێدا بوو و تێدا هاتییە: (مەدینە یا ب رێز و رویمەتە[٢] ل جیاکێ عەیرێ هەتا جیاکێ سەور، ڤێجا هەر کەسێ تشتەکی نوی د ڤی دینێ تێدا بکەت یان خرابکارەکی تێدا بحەوینیت[٣]، لەعنەتێت خودێ و یێت ملیاکەتان و یێت خەلکی هەمیان ل سەر وی بن، رۆژا ڤیامەتێ خودێ نە تەوبەیێ ژێ ڤەبویل دکەت نە بەدەلێ، و هەر کەسێ خۆ بکەهینیتە نەئازاکەرێت[٤] خۆ لەعنەتێت خودێ و یێت ملیاکەتان و یێت خەلکی هەمیان ل سەر وی بن، رۆژا ڤیامەتێ خودێ نە تەوبەیێ ژێ ڤەبویل دکەت نە بەدەلێ. پەیمان و بەختێ موسلمانان ئێکە یێ ژ هەمیان کێمتر ددەت[٥] و هەر کەسێ پەیمانا بەختدانا موسلمانەکی بشکێنیت، لەعنەتێت خودێ و یێت ملیاکەتان و یێت خەلکی هەمیان ل سەر وی بن، رۆژا ڤیامەتێ خودێ نە تەوبەیێ ژێ ڤەبویل دکەت نە بەدەلێ).**

■ **و د ڤەگێرا بوخاریدا هاتییە: ژ جوحفەی (ﷺ) گۆت: من گۆتە عەلی (ﷺ) تشتەك ژ وەحییێ ل دەڤ هەوە هەیە ڤورئان نەبیت؟ ئینا گۆت: ئەز ب**

---

(١) ئەوێت بۆ خوینێ دهێنە دان.

(٢) وەکی رێز و حورمەتا مەکەهێ.

(٣) ئانکو پشتەڤانییا وی بکەت و ب خرابییا وی رازی بیت.

(٤) ئانکو ئازاکەرێ خۆ ب ئازاکەرێ خۆ نەدانیت و ئێکی ل شوینێ دانیت.

(٥) ئانکو هەر موسلمانەکێ بەختێ خۆ دا ئێکی و پەیمانا ئێمنییێ دایێ وەکی ئێکە چو ژ هەژاران بیت یان ژ ماقویلان بیت.

وی كەمە یێ دندك كەر كری و شین كری و جان (گیان یان مرۆڤ) چێ كری ئەو نەبیت تێگەهشتنەك خودێ دابیتە مرۆڤەكێ د قورئانێدا و یا د ڤێ دەفتەرێدا، من گۆتێ و چ د وێ دەفتەرێدایە؟ گۆت: خوین (ئانكو فەرمانێت خوینێ) و ئازاكرنا ئێخسیری (ئانكو فەرمانێت پێڤە گرێدایی) و موسلمان ب گاوری نەهێتە كوشتن.

٣٣٠ - (م) عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: سُئِلَ عَلِيٌّ: أَخَصَّكُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِشَيْءٍ؟ فَقَالَ: مَا خَصَّنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِشَيْءٍ لَمْ يَعُمَّ بِهِ النَّاسَ كَافَّةً؛ إِلاَّ مَا كَانَ فِي قِرَابِ سَيْفِي هَذَا، قَالَ: فَأَخْرَجَ صَحِيفَةً مَكْتُوبٌ فِيهَا: (**لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ سَرَقَ مَنَارَ الأَرْضِ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَهُ، وَلَعَنَ اللهُ مَنْ آوَى مُحْدِثاً**). [م١٩٧٨].

ژ ئەبی توفەیلی (ﷺ) گۆت: پرسیار ژ علی (ﷺ) هاتە كرن: ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ هوین ب تشتەكی تایبەت كرینە؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەم ب چو تایبەت نەكرینە و خەلك هەمی پێ گشت نەكربن ئەو د كاڤلانكێ ڤی شیرێ مندا نەبیت گۆت: پەڕەك دەرێخست تێدا نڤیسی بوو: (**لەعنەتێت خودێ ل وی بن یێ نە بۆ خودێ ڤەدكوژیت، و لەعنەتێت خودێ ل وی بن یێ نیشانێت تخوبێت عەردان بدزیت، و لەعنەتێت خودێ ل وی بن یێ لەعنەتا ل بابێ خۆ بكەت[1] و لەعنەتێت خودێ ل وی بن یێ خرابكارەكی بحەوینیت[2]**).

٣٣١ - عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ: أَخْبِرْنَا عَنْ مَسِيرِكَ هَذَا، أَعَهْدٌ عَهِدَهُ إِلَيْكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، أَمْ رَأْيٌ رَأَيْتَهُ؟ فَقَالَ: مَا عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِشَيْءٍ، وَلَكِنَّهُ رَأْيٌ رَأَيْتُهُ. [د٤٦٦٦].

* صحيح الإسناد.

---

(١) وان كاران بكەت لەعنەت ل بابێ وی بهێنە كرن.

(٢) ئانكو پشتەڤانییا وی بكەت و بەرەڤانییێ ژێ بكەت د سەر خرابییا ویڕا.

**ژ قەیسێ کورێ عوبادەیی (ﷺ) گۆت: من گۆتە عەلی کا بۆ مە بێژە ئەڤ دەرکەفتنا تە فەرمانەکە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل تە کرییە یان ژی دیتنەکە تە دیتی؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چو فەرمان ل من نەکرینە، بەلێ ئەڤە دیتنەکە من دیتی.**

## ١٦ ـ باب: كراهة سؤال اهل الكتاب.

## بابەتێ: نەباشییا پرسیارکرنا خودان کتێبان (جوهی و فەلان).

٣٣٢ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الكِتَابِ يَقْرَؤُونَ التَّوْرَاةَ بِالعِبْرَانِيَّةِ، وَيُفَسِّرُونَهَا بِالعَرَبِيَّةِ لأَهْلِ الإِسْلامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ، وَقُولُوا**: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا﴾ الآيَةَ [البقرة:١٣٦] ). [خ٤٤٨٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: خودان کتێبان تەورات ب عیبرانی دخواند و ب عەرەبی بۆ موسلمانان راڤە دکر ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نە باوەر ژ خودان کتێبان بکەن نە درەوین بدانن و بێژن: ﴿آمَنَّا بِاللَّهِ وما أُنْزِلَ إِلَيْنا﴾)**[1].

٣٣٣ - (خ) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الكِتَابِ عَنْ شَيْءٍ وَكِتَابُكُمُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَحْدَثُ، تَقْرَؤُونَهُ مَحْضاً لَمْ يُشَبْ، وَقَدْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ أَهْلَ الكِتَابِ بَدَّلُوا كِتَابَ اللهِ وَغَيَّرُوهُ، وَكَتَبُوا بِأَيْدِيهِمُ الكِتَابَ، وَقَالُوا: هُوَ مِنْ عِنْدِ اللهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً؟ أَلاَ يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ العِلْمِ عَنْ مَسْأَلَتِهِمْ؟ لاَ وَاللهِ، مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلاً يَسأَلُكُمْ عَنِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ.

[خ٧٣٦٣ (٢٦٨٥)].

**ژ ئیبن عەباس (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هوین چاوا پرسیارا تشتەکی ژ خودان کتێبان دکەن و کتێبا هەوە نویترە و هوین زەلال دخوینن و تێکەل نەبوویە (نەهاتییە گوهۆرین) و وێ کتێبێ (قورئانێ) گۆتە هەوە وان کتێبا خودێ یا بەدل کری و گوهۆری و ب دەستێت خۆ کتێب یا نڤیسی و گۆتن ئەو (یا وان نڤیسای) ئەڤە ژ دەڤ خودێیە دا ب**

[1] رامان ئەڤەیە: مە باوەری ب خودێ هەیە، و ب وێ یا بۆ مە ئینایییە خوارێ.

**بهایەكێ كێم بفرۆشن، ئەرێ ما ئەوا ژ زانینێ بۆ هەو هاتی هەوە ژ پرسیاركرنا وان نادەتە پاش، ب خودێ مە زەلامەك ژی ژ وان نەدیتییە پرسیارا هەوە ژ وێ بكەن یا بۆ هەوە هاتییە خوارێ.**

٣٣٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) يُحَدِّثُنَا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ حَتَّى يُصْبِحَ، مَا يَقُومُ إِلاَّ إِلَى عُظْمِ صَلاَةٍ. [د٣٦٦٣]

* صحيح الإسناد.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ مە بەحسێ ئیسرائیلیان دكر هەتا سپێدە دبوو و نەرادبوو (ئانكو سوحبەتا ل سەر وان نەدبڕی) بۆ نڤێژا فەرز نەبیت.**

٣٣٥ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عن النبي (ﷺ) قَالَ: (**حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، حَدِّثُوا عَنِّي وَلاَ تَكْذِبُوا**). [حم١١٥٣٦].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (و ژ ئیسرائیلییان ڤەگوهێزن و چو بەرتەنگی ل سەر هەوە نینە، ژ من ڤەگوهێزن و درەوێ نەكەن).**

١٧ ـ باب: يحدث القوم بما تبلغهم عقولهم.

**بابەتێ: ئەو دێ بۆ خەلكی هێتە گۆتن عەقلێ وان قەبویل بكەت.**

٣٣٦ – (خ) عَنْ علي رضي الله عنه قَالَ: حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ، أَتُحِبُّونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللهُ وَرَسُولُهُ. [خ١٢٧].

**عەلی (رضي الله عنه) گۆت: وێ بێژنە خەلكی یا تێ بگەهن ما هەوە دڤێت ئاخفتنا خودێ و پێغەمبەرێ وی درەو بهێتە دانان.**

٣٣٧ – (م) عن عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَا أَنْتَ بِمُحَدِّثٍ قَوْماً حَدِيثاً لاَ تَبْلُغُهُ عُقُولُهُمْ؛ إِلاَّ كَانَ لِبَعْضِهِمْ فِتْنَةً. [مقدمة مسلم].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: نینە تو ئاخفتنەكێ بۆ هندەكان بێژی و نەگهیتە عەقلێ وان (ئانكو تێ نەگەهن) ئەگەر بۆ هندەكان نەبیتە گرفت (گۆمان).**

٣٣٨ – (م) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ، مَعَ مَا نَطَقَ بِهِ الْقُرْآنُ مِنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ [يوسف:٧٦]. [مقدمة مسلم].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە كر ئەم هەر ئێكی ل جهێ وی دانین[١] د گەل وێ یا قورئانێ گۆتی: ﴿وَفَوْقَ كل ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾[٢].**

## ١٨ . باب: الرحلة في طلب العلم.

## بابەتێ: وەغەركرنێ ب زانین خواستنێ.

٣٣٩ – (م) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي نَطْلُبُ العِلْمَ فِي هَذَا الحَيِّ مِنَ الأَنْصَارِ، قَبْلَ أَنْ يَهْلِكُوا، فَكَانَ أَوَّلُ مَنْ لَقِينَا أَبَا اليَسَرِ، صَاحِبَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). وَمَعَهُ غُلاَمٌ لَهُ، مَعَهُ ضِمَامَةٌ مِنْ صُحُفٍ،... وذكر الحديث. [م٣٠٠٦].

**ژ عوبادەیێ كوڕێ وەلیدێ كوڕێ عوبادەیێ كوڕێ (صامت)ی (رضي الله عنه) گۆت ئەز و بابێ خۆ دەركەفتین چۆینە ڤی تاخێ ئەنساران داخوازا زانینێ بكەین بەری بمرن و وەغەركەن، ڤێجا یێ ئێكێ مە دیتی ئەبو یەسر بوو هەڤالێ پێغەمبەری (ﷺ) و خزمەتكارێ وی د گەل بوو بەرملەكێ كتێبا د گەل بوو ...... و حەدیس گۆت.**

---

[١] ئانكو قەدر و بهایێ وان بزانن و هەر ئێكی رێزا هەژی بدەینێ.

[٢] رامان ب كورتی: د سەر هەر زانایەكیڕا یێ ژێ زاناتر و شارەزاتر هەیە ئانكو هەمی وەكی ئێك نینن.

٣٤٠ - (م) عن عَبْدِ اللهِ بْنِ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: لاَ يُسْتَطَاعُ العِلْمُ بِرَاحَةِ الجِسْمِ. [م٦١٢/١٧٥].

**ژ عەبدوللایێ کورێ یەحیایێ کورێ ئەبی کەسیری گۆت: زانین ب ئارامییا لەشی ناهێتە وەرگرتن.**

٣٤١ - عَنْ كَثِيرِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً مَعَ أَبِي الدَّرْدَاءِ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا الدَّرْدَاءِ! إِنِّي جِئْتُكَ مِنْ مَدِينَةِ الرَّسُولِ (ﷺ) لِحَدِيثٍ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، مَا جِئْتُ لِحَاجَةٍ.

قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَطْلُبُ فِيهِ عِلْماً سَلَكَ اللهُ بِهِ طَرِيقاً مِنْ طُرُقِ الجَنَّةِ، وَإِنَّ المَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضاً لِطَالِبِ العِلْمِ، وَإِنَّ العَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، وَالحِيتَانُ فِي جَوْفِ المَاءِ، وَإِنَّ فَضْلَ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ عَلَى سَائِرِ الكَوَاكِبِ، وَإِنَّ العُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَاراً وَلاَ دِرْهَماً، وَرَّثُوا العِلْمَ، فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ).** [د٣٦٤١/ ت٢٦٨٢/ جه٢٢٣/ مي٣٥٤]

* صحيح.

**ژ کەسیرێ کورێ قەیسی گۆت: ئەز د گەل ئەبی دەردائی ل مزگەفتا دیمەشقێ یێ روینشتی بووم، زەلامەك هاتە دەڤ و گۆت: ئەی ئەبی دەرداء ئەز ژ باژێرێ پێغەمبەری (ﷺ) بۆ حەدیسەکێ یێ هاتیمە دەڤ تە، و من یا زانی تو ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەدگێری ئەز بۆ چو هەوجەییا نەهاتیمە دەڤ تە، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر کەسێ رێکەکێ بگریت، داخوازا زانینەکێ تێدا بکەت، خودێ دێ بۆ وی رێکەکێ پێ ب ساناهی کەت بۆ چۆنا بەحەشتێ. و ب راستی ملیاکەت پەرێت خۆ ژ**

**فرینێ دراوەستینن بۆ زانینخوازی[1] چونكی د رازینە ژ كارێ ئەو دكەت، و ب راستی هەر تشتەكێ د عەرد و عەسماناندا هەی هەتا ماسی د ئاڤێدا داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ زانای دكەن، و قەدرێ زانای ل سەر عیبادەتكەری وەكی قەدرێ هەیڤێیە ل سەر ستێرێت دی، و ب راستی زانا میراتگرێت پێغەمبەرانە، و ب راستی پێغەمبەران چو دینار و درهەم بۆ میراتگران ل پاش خۆ نەهێلاینە، بەلكو زانین بۆ میراتگران یێت هێلاین، ڤێجا یێ وەرگرت، پشك و بارەكا گەلەك گەهشتێ).**

٣٤٢ – عَنْ أَبِي العَالِيَةِ قَالَ: إن كُنَّا نَسْمَعُ الرِّوَايَةَ بِالبَصْرَةِ عَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَمْ نَرْضَ حَتَّى رَكِبْنَا إِلَى المدِينَةِ، فَسَمِعْنَاهَا مِنْ أَفْوَاهِهِمْ. [مي٥٨٣]

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی عالیەیی (رضي الله عنه) گۆت: مە ڤەگێر ل بەسرا ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گوه لێ دبوو و ئەم رازی نەدبووین هەتا ئەم سویار ببایین چۆباینە مەدینەیێ مە ژ دەڤێت وان گوه لێ ببا.**

٣٤٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ: أَنَّ رَجُلاً مَنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) رَحَلَ إِلَى فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَهُوَ بِمِصْرَ، فَقَدِمَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَمُدُّ لِنَاقَةٍ لَهُ، فَقَالَ: مَرْحَباً، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ آتِكَ زَائِراً، وَلَكِنْ سَمِعْتُ أَنَا وَأَنْتَ حَدِيثاً مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَكَ مِنْهُ عِلْمٌ، قَالَ: مَا هُوَ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا.. [مي٥٩٠].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ بورەیدەی، (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گەشت كر بۆ دەڤ فوزالەیێ كورێ عوبەیدی و ئەو ل مسرێ بوو، هاتە دەڤ و ئەو یێ**

[1] ژ فرینێ دراوەستن و دهێنە خوارێ دا گوهێ خۆ بدەنە زانینێ.

**سەرێ حێشترەکا خۆ دکێشیت، گۆتێ: ب خێرهاتی، گۆت: ئەز سەرەدانکەر نەهاتیمە دەڤ تە، بەلێ من و تە حەدیسەکا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوە لێ بووی هیڤی دکەم زانینەك ژێ ل دەڤ تە هەبیت گۆت: کیژکە؟ گۆت ئەڤە و ئەڤە.**

٣٤٤ – عَنِ الحَارِثِ بْنِ مُعَاوِيَةَ الكِنْدِيِّ: أَنَّهُ رَكِبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه يَسْأَلُهُ عَنْ ثَلاَثِ خِلاَلٍ، قَالَ: فَقَدِمَ المدِينَةَ فَسَأَلَهُ عُمَرُ رضي الله عنه: مَا أَقْدَمَكَ؟ قَالَ: لِأَسْأَلَكَ عَنْ ثَلاَثِ خِلاَلٍ، قَالَ: وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: رُبَّمَا كُنْتُ أَنَا وَالمرْأَةُ فِي بِنَاءٍ ضَيِّقٍ فَتَحْضُرُ الصَّلاَةُ فَإِنْ صَلَّيْتُ أَنَا وَهِيَ كَانَتْ بِحِذَائِي، وَإِنْ صَلَّتْ خَلْفِي خَرَجَتْ مِنَ البِنَاءِ، فَقَالَ عُمَرُ: تَسْتُرُ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بِثَوْبٍ، ثُمَّ تُصَلِّي بِحِذَائِكَ إِنْ شِئْتَ. وَعَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العَصْرِ؟ فَقَالَ: نَهَانِي عَنْهُمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ). قَالَ: وَعَنِ القَصَصِ، فَإِنَّهُمْ أَرَادُونِي عَلَى القَصَصِ؟ فَقَالَ: مَا شِئْتَ، كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَمْنَعَهُ، قَالَ: إِنَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَنْتَهِيَ إِلَى قَوْلِكَ، قَالَ: أَخْشَى عَلَيْكَ أَنْ تَقُصَّ فَتَرْتَفِعَ عَلَيْهِمْ فِي نَفْسِكَ، ثُمَّ تَقُصَّ فَتَرْتَفِعَ حَتَّى يُخَيَّلَ إِلَيْكَ أَنَّكَ فَوْقَهُمْ بِمَنْزِلَةِ الثُّرَيَّا، فَيَضَعَكَ اللهُ تَحْتَ أَقْدَامِهِمْ يَوْمَ القِيَامَةِ بِقَدْرِ ذَلِكَ. [حم١١١]

* إسناده حسن.

**ژ حارسێ کورێ موعاویەیێ کیندی ئەو سویار بوو چۆ دەڤ عومەرێ کورێ خەتابی پرسیارا سێ سالۆخەتان ژێ بکەت، گۆت: هاتە مەدینەیێ عومەری (رضي الله عنه) گۆتێ: ج تو ئینایە؟ گۆت: دا پرسیارا سێ سالۆخەتان ژ تە بکەم، گۆتێ. و ئەو چنە؟ گۆت: دبیت ئەز و ژنەك د ئاڤاهییەکێ تەنگڤە بین و دەمێ نڤێژێ بهێت و ئەگەر من نڤێژ کر و ئەو راستا من بیت و ئەگەر پشت من بکەت ئەو ژ ئاڤاهی دەرکەڤت، عومەری گۆت: جلکەکێ د ناڤبەرا خۆ و وێدا بکە ستارە پاشی بلا راستا تە بکەت ئەگەر تە بڤێت، و ژ کرنا دو رکعەتێت پشتی ئێڤاری؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز یێ ژێ دایمە پاش، و گۆت: و ژ گۆتنا چیرۆکان؟ ئەو چیرۆکان ژ من داخواز دکەن، گۆت: یا تە بڤێت، هەروەکی نەڤیا نەهێلیت، گۆتێ: من دڤیا ئەز ئاخفتنا تە وەرگرم؟ گۆت: ئەز ژ تە دترسم تو چیرۆکان بێژی و تو خۆ ل سەر وان بلند بکەی و پاشی چیرۆکان بێژی و بلند**

ببی هەتا تو هزر بكەی تو یێ ل سەر وان وەكی جهێ ستێرا پێروییێ (الثریا) پاشی رۆژا قیامەتێ خودێ تەمەتی وێ تە بێخیتە بن پێت وان.

## ١٩ . باب: التليم بالعمل المشاهد وبالمقايسة.

## بابەتێ: فێركرن ب تشتێ بەرچاڤ و ب قیاسێ (حسێبكرنا تشتەكی ب تشتەكێ دی).

[انظر: في تعليم كيفية الوضوء: ٩.

وفي تعليم كيفية الغسل: ١٩١٧.

وفي بيان أوقات الصلاة: ١٠٣٣.

وفي بيان كيفية الصلاة: ١١٨٩، ١١٩١.

وفي بيان الحج: ١٩٠٢.

وانظر في القياس: ١٧٦، ١٨٣٨، ١٨٢٩، ٢٠٢٢، ٢٥١٨].

## ٢٠ . باب: من العلم قول: لا اعلم.

## بابەتێ: ژ زانینێیە بێژیت: ئەز نوزانم.

٣٤٥ - عَن ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنَّ الَّذِي يُفْتِي النَّاسَ فِي كُلِّ مَا يُسْتَفْتَى لَمَجْنُونٌ. [مي١٧٦].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: یێ بەرسڤا خەلكی ژ هەر پرسیارەكا ژێ دهێتە كرن بدەت ئەو یێ دینە.**

٣٤٦ - عَن ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ عَنْ مَسْأَلَةٍ، فَقَالَ: لاَ عِلْمَ لِي بِهَا، فَلَمَّا أَدْبَرَ الرَّجُلُ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: نِعْمَ مَا قَالَ ابْنُ عُمَرَ، سُئِلَ عَمَّا لاَ يَعْلَمُ فَقَالَ: لاَ عِلْمَ لِي بِهِ. يعني: نفسه. [مي١٨٤، ١٨٦].

* إسناده حسن.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) زەلامەكی پرسیارا وی ژ پرسەكێ كر، گۆت: من زانین پێ نینە، ڤێجا دەمێ وی زەلامی پشتا خۆ دایێ، ئیبن عومەری گۆت: ئیبن عومەری باش گۆت دەمێ پرسیار ژ تەشتەكێ نەزانیت ژێ هاتییە كرن گۆت من زانین پێ نینە مەبەستا وی ئەو ب خۆیە.**

٣٤٧ – عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: لاَ أَدْرِي نِصْفُ العِلْمِ. [مي١٨٥].

* إسناده صحيح.

**ژ شەعبی (رحمه الله) گۆت: ئەز نوزانم نیڤا زانینێیە.**

٣٤٨ – عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَا أُبَالِي سُئِلْتُ عَمَّا أَعْلَمُ أَوْ مَا لاَ أَعْلَمُ، لِأَنِّي إِذَا سُئِلْتُ عَمَّا أَعْلَمُ قُلْتُ: مَا أَعْلَمُ، وَإِذَا سُئِلْتُ عَمَّا لاَ أَعْلَمُ، قُلْتُ: لاَ أَعْلَمُ. [مي١٨٨].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن سیرینی (رحمه الله) گۆت: من خەم نینە پرسیار ژ تشتێ ئەز دزانم و نەزانم ژ من بهێتە كرن، ئەگەر پرسیار ژ تشتێ ئەز دزانم ژ من هاتە كرن یا ئەز دزانم دێ بێژم، و ئەگەر پرسیار ژ تشتێ ئەز نەزانم ژ من هاتە كرن دێ بێژم ئەز نوزانم.**

## ٢١ ـ باب: المثبت مقدم على النافي.

## بابەتێ: بنەجهكری پێشیا نەفیكەرییە

٣٤٩ – (خ) قَالَ الحُمَيْدِيُّ: هَذَا كَمَا أَخْبَرَ بِلاَلٌ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى فِي الكَعْبَةِ. وَقَالَ الفَضْلُ: لَمْ يُصَلِّ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِشَهَادَةِ بِلاَلٍ. [خ. الشهادات، باب ٤].

**حومەیدی (رحمه الله) گۆت: ئەڤە هەروەكی بیلالی گۆتی: پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژا د كەعبێڤە كری و فەزلی گۆت: نەكرییە، خەلكی شەهدەییا بیلالی وەرگرت.**

## ٢٢ ـ باب: طلب العلم لغير الله.

## بابەتێ: خواستنا زانینێ بەلێ نە بۆ خودێ ونە د رێیا وێدا.

٣٥٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ تَعَلَّمَ عِلْماً مِمَّا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللهِ عزّ وجل، لاَ يَتَعَلَّمُهُ إِلاَّ لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضاً مِنَ الدُّنْيَا، لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الجَنَّةِ يَوْمَ القِيَامَةِ)**. يَعْنِي: رِيحَهَا. [د٣٦٦٤/ جه٢٥٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ زانینەكێ ژ وان یێت رازیبوونا خودایێ هەر ب هێز و مەزن پێ دهێتە خواستن فێر ببیت، و فێر نابیت بۆ هندێ نەبیت دا متا و پەرتالەك ژ دنیایێ بگەهیتێ، وێ رۆژا قیامەتێ بێهنا بەحەشتێ نەدیت).**

٣٥١ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَعَلَّمُوا العِلْمَ لِتُبَاهُوا بِهِ العُلَمَاءَ، وَلاَ لِتُمَارُوا بِهِ السُّفَهَاءَ، وَلاَ تَخَيَّرُوا بِهِ المَجَالِسَ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ، فَالنَّارُ النَّارُ)**. [جه٢٥٤].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (ﭬ) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (فێری زانینێ نەبن دا خۆ پێ ل دەڤ زانایان مەزن و ڤەبە بكەن و نە دا پێ د گەل ساویلكان باخڤن یان جرەبرێ پێ د گەل بكەن و نە دا پێ ل دیوانا روینن، و یێ ئەڤە كر[1] جهێ وی ئاگرە و جهێ وی ئاگرە).**

---

[1] ب ڤێ نیەتێ زانین خواست.

٣٥٢ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ جِدَالُ الْمُنَافِقِ عَلِيمِ اللِّسَانِ**). [حب ٨٠].

* إسناده على شرط البخاري.

**ژ عیمرانێ کورێ (حصین)ی، (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تشتێ ژ هەمیان پتر ئەز ل سەر ئوممەتا خۆ ژێ دترسم جڕەبڕا دورویێ ئەزمان زانا).**

٣٥٣ – عن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ لِيُجَارِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ، أَوْ لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، أَوْ يَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ، أَدْخَلَهُ اللهُ النَّارَ**). [ت٢٦٥٤].

* حسن.

[وانظر: ٣٤٤].

**ژ کەعبێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (یێ زانینێ بخوازیت دا خۆ پێ د گەل زانایان شاهی و قەبە بکەت یان دا پێ د گەل ساویلکان باخڤیت و جڕەبڕێ پێ د گەل بکەت یان دا بەرێ خەلکی پێ بدەتە خۆ، خودێ دێ بەتە جەهنەمێ).**

## ٢٣ ـ باب: التعليم بضرب المثل.

## بابەتێ: فێرکرنێ ب رێکا ئینانا نموونەیان.

٣٥٤ – عَنِ الحَارِثِ الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ اللهَ أَمَرَ يَحْيَى بْنَ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ يَعْمَلَ بِهَا، وَيَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهَا، وَإِنَّهُ كَادَ أَنْ يُبْطِئَ بِهَا.**

**فَقَالَ عِيسَى: إِنَّ اللهَ أَمَرَكَ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ لِتَعْمَلَ بِهَا، وَتَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهَا، فَإِمَّا أَنْ تَأْمُرَهُمْ، وَإِمَّا أَنْ آمُرَهُمْ؟**

فَقَالَ يَحْيَى: أَخْشَى إِنْ سَبَقْتَنِي بِهَا أَنْ يُخْسَفَ بِي أَوْ أُعَذَّبَ، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي بَيْتِ المَقْدِسِ، فَامْتَلأَ المَسْجِدُ وَقَعَدُوا عَلَى الشُّرَفِ، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ أَعْمَلَ بِهِنَّ، وَآمُرَكُمْ أَنْ تَعْمَلُوا بِهِنَّ:

أَوَّلُهُنَّ: أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَإِنَّ مَثَلَ مَنْ أَشْرَكَ بِاللهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْداً مِنْ خَالِصِ مَالِهِ بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، فَقَالَ: هَذِهِ دَارِي، وَهَذَا عَمَلِي، فَاعْمَلْ وَأَدِّ إِلَيَّ، فَكَانَ يَعْمَلُ وَيُؤَدِّي إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يَرْضَى أَنْ يَكُونَ عَبْدُهُ كَذَلِكَ؟

وَإِنَّ اللهَ أَمَرَكُمْ بِالصَّلاَةِ، فَإِذَا صَلَّيْتُمْ فَلاَ تَلْتَفِتُوا، فَإِنَّ اللهَ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِوَجْهِ عَبْدِهِ فِي صَلاَتِهِ، مَا لَمْ يَلْتَفِتْ.

وَآمُرُكُمْ بِالصِّيَامِ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ فِي عِصَابَةٍ مَعَهُ صُرَّةٌ فِيهَا مِسْكٌ، فَكُلُّهُمْ يَعْجَبُ أَوْ يُعْجِبُهُ رِيحُهَا، وَإِنَّ رِيحَ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ المِسْكِ.

وَآمُرُكُمْ بِالصَّدَقَةِ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَسَرَهُ العَدُوُّ، فَأَوْثَقُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ، وَقَدَّمُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَقَالَ: أَنَا أَفْدِيهِ مِنْكُمْ بِالقَلِيلِ وَالكَثِيرِ، فَفَدَى نَفْسَهُ مِنْهُمْ.

وَآمُرُكُمْ أَنْ تَذْكُرُوا اللهَ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرَجَ العَدُوُّ فِي أَثَرِهِ سِرَاعاً، حَتَّى إِذَا أَتَى عَلَى حِصْنٍ حَصِينٍ، فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ مِنْهُمْ، كَذَلِكَ العَبْدُ، لاَ يُحْرِزُ نَفْسَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ إِلاَّ بِذِكْرِ اللهِ).

قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (وَأَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ، اللهُ أَمَرَنِي بِهِنَّ: السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ، وَالجِهَادُ، وَالهِجْرَةُ، وَالجَمَاعَةُ، فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الجَمَاعَةَ قِيدَ شِبْرٍ؛ فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلاَمِ مِنْ عُنُقِهِ، إِلاَّ أَنْ يَرْجِعَ، وَمَنْ ادَّعَى دَعْوَى الجَاهِلِيَّةِ فَإِنَّهُ مِنْ جُثَا جَهَنَّمَ). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ؟ قَالَ: (وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ، فَادْعُوا بِدَعْوَى اللهِ الَّذِي سَمَّاكُمُ المُسْلِمِينَ المُؤْمِنِينَ، عِبَادَ اللهِ). [ت٢٨٦٣، ٢٨٦٤].

* صحيح.

ژ حارسێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودێ فەرمان ل یەحیایێ کورێ زەکەرییای ب پێنج پەیڤان کر، ئەو کار پێ بکەت و فەرمانێ ل ئیسرائیلییان ژی بکەت کار پێ بکەن و نێزیك بوو گیرۆ بکەت.**

**ئینا عیسای گۆت: ب راستی خودێ فەرمان ب پێنج پەیڤان یا ل تە کری دا کار پێ بکەی و فەرمانێ ل ئیسرائیلییان ژی بکەی کار پێ بکەن، ڤێجا یان تو فەرمانا وان پێ بکە یان ئەز دێ فەرمانا وان کەم.**

**یەحیای گۆت: ئەز دترسم ئەگەر تە د بەری منڕا کر و تە گۆتن خودێ من د عەردیدا ببەت، یان بێمە ئیزادان، ئینا خەلك کۆم کرن و مزگەفت پڕ بوو و ل سەر جهێت بلند[1] روینشتن[2] و گۆت: خودێ فەرمانا من ب پێنج پەیڤان یا کری ئەز کار پێ بکەم و فەرمانێ ل هەوە دکەم هوین ژی کار پێ بکەن.**

**یا ئێکێ ژ وان: هوین پەرستنا خودێ بکەن و چو هەڤپشکان بۆ چێ نەکەن، و ب راستی مەتەلا وی یێ هەڤپشکان بۆ خودێ چێ کەت وەکی زەلامەکییە بەندەیەکی (عەبدەکی) ژ خۆسەرێ مالێ خۆ ب زێری یان ب زیڤی بکریت و بێژیتێ ئەڤە خانییێ منە و ئەڤە کارێ منە ڤێجا شۆل بکە و داهاتی بدە من، و وی کار دکر و داهات ددا ئێکێ دی نە خودانێ خۆ، ما کی ژ هەوە یێ رازییە بەندەیێ وی یێ هۆسا بیت؟!.**

**و ب راستی خودێ فەرمان ب نڤێژێ ل هەوە کرییە، ڤێجا ئەگەر هەوە نڤێژ کر نەزڤرن، خودێ بەرێ خۆ ددەتە روییێ بەندەیێ خۆ د نڤێژێدا هندی ئەو نەزڤرینیت.**

**و ئەز فەرمانێ ب رۆژییێ ل هەوە دکەم، ب راستی مەتەلا رۆژیگری وەکی مەتەلا زەلامەکییە د ناڤ کۆمەکا مرۆڤاندا بیت و تویرکەك ڤێ بیت مسك تێدا بیت هەمی پێ**

---

(١) ج د مزگەفتێڤە یان دەرڤەی مزگەفتێ.

(٢) چونکی گەلەك بوون و جە د مزگەفتێڤە نەکر.

**حێبەتی ببن و حەژێ بکەن یان ب بێهنا وێ حێبەتی ببن و حەژێ بکەن، و ب راستی بێهنا (دەڤێ) رۆژیگری ل دەڤ خودێ ژ بێهنا مسکێ خۆشتر و ب بهاترە.**

**و فەرمانا هەوە ب سەدەقەیێ دکەم، و ب راستی مەتەلا یێ سەدەقێ ددەت وەکی مەتەلا زەلامەکییە دژمنێ وی ئەو ئێخسیر کربیت و دەستێت وی ب ستۆیێ ویڤە گرێدابن و ئینابیت پێش دا سەرێ وی لێ بدەن، و ئەو زەلام بێژیت: ئەز ب کێمێ و گەلەکێ دێ فدییێ پێشڤە دەم، و فدی پێشڤە دا و رزگار کر[١].**

**و فەرمانا هەوە دکەم هوین زکرێ خودێ بکەن، ب راستی مەتلا یێ زکری دکەت وەکی مەتەلا زەلامەکییە دژمن ب لەز دویڤرا دەرکەفتبن هەتا هاتی گەهشتییە کەلهەکا ئاسێ و خۆ ژ وان بپارێزیت هۆسا بەندە خۆ ژ شەیتانی ناپارێزیت ب زکرێ خودێ نەبیت).**

پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(و ئەز فەرمانا هەوە ب پێنجان دکەم خودێ فەرمانا من ب وان کرییە: ب گوهداری و ب گوهدانێ[٢] و ب جیهادێ (د رێکا خودێدا) و ب مشەختبوونێ[٣] و ب کۆمێ[٤]، ب راستی یێ تەمەت بهۆستەکێ ژ کۆما موسلمانان دویر دکەڤیت وی رستکا ئیسلامێ ژ ستۆیێ خۆ ئێخست هەتا جارەکا دی دزڤریتڤە کۆما موسلمانان، و هەر کەسێ داخوازییا کارێت نەزانینێ[٥] بکەت ئەو ب سەر چۆکان کەفتە د جەهنەمێدا)**، ئینا زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ خۆ ئەگەر نڤێژان بکەت و رۆژییان ژی بگریت؟ گۆت: **(خۆ ئەگەر نڤێژان بکەت و رۆژییان ژی بگریت، داخوازییێ بۆ خودێ بکەن[٦] ئەوێ هوین کرینە موسلمان و باوەریدار بەندەیێت خودێ).**

---

(١) هۆسا سەدەقە خودانێ خۆ ژ ئاگرێ جەهنەمێ رزگار دکەت.

(٢) بۆ حاکمدارێ دادپەروەر.

(٣) ئەڤە واجب بوو بەری ڤەکرنا مەکەهێ، ڤێ گاڤێ رەنگەکێ دی ژ مشەختبوونێ هەیە ئەو ژی ئەڤەیە: ژ تشتێ خودێ پاشڤەلێدان ژێ کری مشەخت ببی و وەلاتێ خۆ بۆ جیهادێ بهێلی.

(٤) ئانکو: کۆما موسلمانان.

(٥) هەر کارەکێ هاتییە حەرامکرن ژ کارێت جاهلییەتێ.

(٦) ئەو کارێت خودێ پێ خۆش و فەرمانا هەوە پێ کری.

٣٥٥ – عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً صِرَاطاً مُسْتَقِيماً، وَعَلَى جَنْبَتَيِ الصِّرَاطِ سُورَانِ فِيهِمَا أَبْوَابٌ مُفَتَّحَةٌ، وَعَلَى الْأَبْوَابِ سُتُورٌ مُرْخَاةٌ، وَعَلَى بَابِ الصِّرَاطِ دَاعٍ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ ادْخُلُوا الصِّرَاطَ جَمِيعاً وَلاَ تَتَعَوَّجُوا، وَدَاعٍ يَدْعُو مِنْ فَوْقِ الصِّرَاطِ، فَإِذَا أَرَادَ يَفْتَحُ شَيْئاً مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ قَالَ: وَيْحَكَ لاَ تَفْتَحْهُ، فَإِنَّكَ إِنْ تَفْتَحْهُ تَلِجْهُ.** وَالصِّرَاطُ: الْإِسْلاَمُ، وَالسُّورَانِ: حُدُودُ اللهِ تَعَالَى، وَالْأَبْوَابُ الْمُفَتَّحَةُ: مَحَارِمُ اللهِ تَعَالَى، وَذَلِكَ الدَّاعِي عَلَى رَأْسِ الصِّرَاطِ: كِتَابُ اللهِ عزّ وجل، وَالدَّاعِي فَوْقَ الصِّرَاطِ: وَاعِظُ اللهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُسْلِمٍ). والللفظ لأحمد. [ت٢٨٥٩، حم١٧٦٣٤]

* حديث صحيح، وإسناده حسن.

**ژ نەواسێ کورێ سەمعانێ ئەنساری (ڕەزای خودێ لێ بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ مەتەلەك دیار کر ڕێکەکا ڕاست دانایە، و ل سەر هەردو ڕەخێت ڕێکێ دو دیوار پێت هەین، دەرگەهێت ڤەکری د وان دیواراندا پێت هەین، و ل سەر وان دەرگەهان پەردەیێت بەردایی پێت ل سەر، و ل سەر دەرگەهێ ڕێکێ گازیکەرەك یێ هەی گازی دکەت، دبێژیت: گەلی خەلکی هەمی وەرنە د ڕێکێدا و خۆ خوار نەکەن (ڕاست وەرن) و گازیکەرەك د نیڤا ڕێکێدا گازی دکەت، ڤێجا ئەگەر ئێکی ژ وان ڤیا تشتەکی ژ وان دەرگەهان ڤەکەت بێژیت: وەی بۆ تە نەڤەکە، ب ڕاستی ئەگەر تە ڤەکر دێ چییە تێدا، و ڕێکا ڕاست ئیسلامە، و هەردو دیوار تخوبێت خودێنە، و ئەو دەرگەهێت ڤەکری حەرامکرییێت خودێنە، و گازیکەرێ ل سەرێ ڕێکێ (قورئانە) کتێبا خودایێ هەر ب هێز و مەزن، و گازیکەرێ ل سەر ڕێکێ شیرەتکارێ خودێیە د دلێ هەر موسلمانەکیدا).**

٢٤ ـ باب: القصص.

**بابەتێ: چیرۆکان.**

٣٥٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَقُصُّ عَلَى النَّاسِ؛ إِلاَّ أَمِيرٌ، أَوْ مَأْمُورٌ، أَوْ مُرَاءٍ**). [جه٣٧٥٣/ مي٢٨٢١].

* صحيح.

**ژ عەبدوللايێ كورێ عەمرى (خودێ ژ وان رازى بيت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس چيرۆك و شيرەتان بۆ خەلكى نابێژيت ئەمير (فەرماندار) نەبيت يان فەرمانپێكرى يان رويمەتكار).**

٣٥٧ – عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**لاَ يَقُصُّ؛ إِلاَّ أَمِيرٌ أَوْ مَأْمُورٌ، أَوْ مُخْتَالٌ**). [د٣٦٦٥].

* حسن صحيح.

[وانظر: ٣٤٤].

**ژ عەوفێ كورێ مالكێ ئەشجەعى، (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (كەس چيرۆك و شيرەتان بۆ خەلكى نابێژيت ئەمير (فەرماندار) نەبيت يان فەرمانپێكرى يان دفن بلند).**

## ٢٥ ـ باب: الحكمة ضالة المؤمن.

**بابەتێ: ئاخفتنا راست و دورست موسلمان دخوازيت.**

٣٥٨ – عن أبي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الحُبُلِيِّ قَالَ: لَيْسَ هَدِيَّةٌ أَفْضَلَ مِنْ كَلِمَةِ حِكْمَةٍ تُهْدِيهَا لِأَخِيكَ.

[مي٣٦٢].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبى عەبدولرەحمانێ حوبولى دبێژيت: چو ديارى ژ پەيڤەكا راست و دورست باشتر نينن تو ب ديارى پێشكێشى برايێ خۆ بكەى.**

٣٥٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الكلِمةُ الحِكمةُ ضالَّةُ المؤمِنِ، فحيثُ وجدَها فَهوَ أحقُّ بِها)**[1]. [ت٢٦٨٧/ جه٤١٦٩].

* ضعيف جداً.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پەیڤ ئاخفتنا راست و دورست داخوازا باوەریدارییە[2]، هەر جهێ لێ ببینیت ئەو هەژیترە ل دویڤ بچیت و وەرگریت).**

## ٢٦ . باب: مجالس العلم.

## بابەتێ: جڤاتێت زانینێ.

٣٦٠ - عَـن ابْـنِ عَبَّـاسٍ قَـالَ: مَـا اجْتَمَـعَ قَـوْمٌ فِي بَيْـتٍ مِـنْ بُيُـوتِ اللهِ، يَتَـذَاكَرُونَ كِتَـابَ اللهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ؛ إِلاَّ أَظَلَّتْهُمُ المَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا، حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَبْتَغِي بِهِ العِلْمَ، سَهَّلَ اللهُ طَرِيقَهُ مِنَ الجَنَّةِ، وَمَنْ أَبْطَأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ. [مي٣٦٨].

* إسناده صحيح.

[وانظر: ٢٩٧، ٣٣٣٤].

---

(١) **شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ نینایە:** ٣٥٩ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً، فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الحِكْمَةَ فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا). [خ٧٣/ م٨١٦].

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: حەسویدی نەیا دورستە د دو خاسلەتاندا نەبیت، (زانا دبێژن دو رەنگێت حەسویدییێ یێت هەین، ئێك: تو حەز بکەی خۆشییا غەیری تە نەمینیت، ئەڤە یا حەرامە ل سەر بۆچۆنا هەمی زانایان، و یا دووێ یا مەجازییە، تو حەز بکەی ئەو خۆشی بگەهیتە تە ژی و خۆشییا وی هەر بمینیت و نەچیت، و مەرەما حەدیسێ ئەڤ رەنگەیە و ئەڤە نەیا حەرامە)، مرۆڤەکی خودێ مال دابیتێ، خودێ وی ب سەر مەزاختنا وی مالی د جهێ ویدا و حەقییێدا ب شیان و دل بێخیت، و مرۆڤەکی خودێ تێگەهشتن و شارەزایی دابیتێ ئەو کار پێ بکەت و نیشا غەیری خۆ بدەت.**

(٢) **وەکی تشتێ وی یێ بەرزەیە کا چاوا ل دویڤ دچیت هۆسا ئەو ل ئاخفتنا راست و دورست دگەریێت و دخوازیت.**

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: نینە هندەك كەس د مالەكێدا ژ مالێت خودێدا كۆم ببن، كتێبا خودێ ل بیرا خۆ بینن، و د ناڤبەینا ئێكدودا بخوینن (ئانكو ئێك بخوینیت و راوەستیت، یێ دی هەر وێ بخوینیت) ئەگەر ملیاكەت ب پەرێت خۆ سیبەرێ ل وان نەكەن هەتا ئەو دچنە د ئاخفتنەكا دیدا، و هەر كەسێ رێكەكێ بگریت داخوازا زانینەكێ تێدا بكەت، خودێ دێ بۆ رێكەكێ پێ ساناهی كەت بۆ بەحەشتێ و هەر كەسێ كار و كریارێت وی ئەو گران و گیرۆ كر، نەسەب و بنەمالا وی ب لەز نائێخن (ئانكو یێ كار و كریار و خێرێت وی د كێم بن و وی نەگەهیننە پلەیێت چاك و باشان، بلا خۆ ب هیڤیا بنەمال و مالباتێڤە نەهێلیت ئەو وی پێش نائێخن).

٢٧ . باب: مذاكرة العلم والسؤال عنه.

**بابەتێ: پێكڤە خواندنا زانینێ و پرسیاركرن ژێ.**

٣٦١ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: تَذَاكَرُوا الحَدِيثَ، فَإِنَّ الحَدِيثَ يُهَيِّجُ الحَدِيثَ.

[مي٦١٧ . ٦٢٠].

* إسناده صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: د ناڤبەرا ئێكدودا حەدیسان بێژن (حەدیسان ل ئێك بزڤرینن) ب راستی حەدیس حەدیسێ دئینیت.

٣٦٢ – عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَ: كَانَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ رَجَاءٍ يَجْمَعُ صِبْيَانَ الكُتَّابِ يُحَدِّثُهُمْ يَتَحَفَّظُ بِذَاكَ.

[مي٦٢٩].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەعمەشی (رحمه الله) گۆت: ئیسماعیلێ كورێ رەجائی زارۆكێت مەكتەبێ (ئەڤێت قورئانێ دخوینن) كۆم دكرن و حەدیس بۆ دگۆتن ب ڤێ چەندێ وی حەدیس ژ بەر دكرن.**

٣٦٣ - عن مُحَمَّدِ بْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ الحَارِثُ بْنُ يَزِيدَ العُكْلِيُّ، وَابْنُ شُبْرُمَةَ، وَالقَعْقَاعُ بْنُ يَزِيدَ، وَمُغِيرَةُ، إِذَا صَلَّوْا العِشَاءَ الْآخِرَةَ، جَلَسُوا فِي الفِقْهِ، فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَهُمْ إِلاَّ أَذَانُ الصُّبْحِ.

[مي٦٣٥].

* إسناده صحيح.

**ژ موحەممەدێ كورێ فوزەیلی ژ بابێ خۆ (رحمه الله) گۆت: حارسێ كورێ یەزیدێ عوكلی و ئیبن شوبرومە و قەعقاعێ كورێ یەزیدی و موغیرە ئەگەر نڤێژا عەیشا كربان بۆ فقهی دروینشتنە خوارێ (پرسێت فقهی ژ ئێكدو دكرن) و چو ئەو ژێكڤەنەدكرن بانگێ سپێدێ نەبا.**

٣٦٤ - عن عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قال: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ آفَةً، وَآفَةُ العِلْمِ النِّسْيَانُ [مي٦٤٦، ٦٤٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی، (رضي الله عنه) گۆت: هەر تشتەكی دەردێ خۆ یێ هەی و دەردێ زانینێ ژبیركرنە.**

٣٦٥ - عن عَلِيٍّ قال: تَذَاكَرُوا هَذَا الحَدِيثَ وَتَزَاوَرُوا، فَإِنَّكُمْ إِنْ لَمْ تَفْعَلُوا يَدْرُسْ. [مي٦٥٠].

* إسناده صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: ڤێ حەدیسێ ل بیرا خۆ بینن و ل بیرا ئێكدو بینن و سەرا ئێكدو بدەن ب راستی ئەگەر هوین وەنەكەن دێ چیت و نامینیت.**

٣٦٦ – عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَضَعُ فِي رِجْلَيَّ الكَبْلَ، وَيُعَلِّمُنِي القُرْآنَ وَالسُّنَنَ.

[مي٥٧٠].

* إسناده صحيح.

**ژ عیکریمەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) کەلامچە دکرە پێت من و قورئان و حەدیس نیشا من ددان.**

**٢٨ . باب: ما جاء في كتمان العلم.**

**بابەتێ: تشتێ د ڤەشارتنا زانینێدا هاتی.**

٣٦٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلجَمَهُ اللهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ القِيَامَةِ)**. [د٣٦٥٨/ ت٢٦٤٩/ جه٢٦١، ٢٦٦].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ پرسیارا زانینەکێ ژێ بهێتە کرن و ئەو ڤەشێریت، دێ رۆژا قیامەتێ ب هەڤسارەکی ژ ئاگری هێتە سەرهەڤسارکرن).**

٣٦٨ – عن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: وَاللهِ! لَوْلاَ آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى، مَا حَدَّثْتُ عَنْهُ. يَعْنِي: عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ). شَيْئاً أَبَداً، لَوْلاَ قَوْلُ اللهِ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَتَيْنِ [البقرة:١٧٤]. [جه٢٦٢]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرەی (رضي الله عنه) دگۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر دو ئایەت د کتێبا خودێدا نەبان من چو تشت ژێ نەڤەدگوهازتن، ئانکو ژ پێغەمبەری (ﷺ)، ئەگەر گۆتنا خودێ نەبا ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ ما أَنْزَلَ الله من الْكِتَابِ﴾ هەتا دویماهییا هەردو ئایەتان[1].**

**٢٩ ـ باب: ما جاء في المراء والجدال.**

**بابەتێ: تشتێ د جڕەبڕ و ڤاویشکێشییێدا هاتی.**

٣٦٩ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ؛ إِلاَّ أُوتُوا الجَدَلَ**)، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ۝٥٨﴾ [الزخرف:٥٨]. [ت٣٢٥٣/ جه٤٨].

* حسن.

**ژ ئەبی ئومامەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو ملەت پشتی راستەرێیا ئەو ل سەر بەرزە نەبووینە ئەگەر جڕەبڕ پێ نەهاتبیتە دان، پاشی ئەڤ ئایەتە خواند : ﴿ما ضَرَبُوهُ لك إلا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾)[2].**

٣٧٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**المِرَاءُ فِي القُرْآنِ كُفْرٌ**). [د٤٦٠٣].

* حسن صحيح.

---

[1] **هەردو ئایەت ئەڤەنە** ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُولَٰئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا النَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٧٤) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ﴾ **و رامانا وان ب کورتی: ئەڤەیە: ب ڕاستی ئەو کەسێت ئەوا خودێ د کتێبێدا ئینایییە خوار ڤەدشێرن و ئەرزان دفرۆشن، ئەڤە ژ ئاگری پێڤەتر چو یێ دی ناخۆن، و ڕۆژا قیامەتێ خودێ ب دلۆڤانی وان نائاخێڤیت، و گونەهێت وان ژێ نابەت، و ئیزایەکا دژوار دێ دەتە بەر وان. و ئەڤەنە، ئەوێت ڕاستەرێیی داینە ب گۆمراییێ، و گونەه ژێبرن داینە ب ئیزایێ، چەند بێنا وان یا فرەهە ل سەر ئاگری، ئانکو چەند بێنفرەهـ و ڕکۆیینە ل سەر وان کار و کریارێت بەرێ وان ددەتە ئاگرێ دۆژەهێ.**

[2] **رامان ب کورتی: وان ئەڤ نموونەیە بۆ تە نەئینا ئەگەر بۆ جڕەبڕ و گەنگەشەیێ نەبیت، نێ ئەو ملەتەکێ زێدە چیڕدرێژ و جڕکێشن.**

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (گۆمان د قورئانێدا[1] گاورییە).**

٣٧١ – عن عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ قَالَ: مَنْ جَعَلَ دِينَهُ غَرَضاً لِلْخُصُومَاتِ، أَكْثَرَ التَّنَقُّلَ.

[مي ٣١٢]

* إسناده صحيح.

[انظر: ٢٨٨، ٢٨٩، ٤٤٤].

**ژ عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی (رحمه الله) گۆت: یێ دینێ خۆ بكەتە ئارمانجا هەڤركی و جرەبرێ دێ گەلەك ڤەگوهازتنێ كەت[2].**

## ٣٠ ـ باب: بذل العلم لاهله.

## بابەتێ: زانین بۆ خەلكێ وێ بهێتە گۆتن.

٣٧٢ – عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ قَالَ: لاَ تُحَدِّثِ البَاطِلَ الحُكَمَاءَ فَيَمْقُتُوكَ، وَلاَ تُحَدِّثِ الحِكْمَةَ لِلسُّفَهَاءِ فَيُكَذِّبُوكَ، وَلاَ تَمْنَعِ العِلْمَ أَهْلَهُ فَتَأْثَمَ، وَلاَ تَضَعْهُ فِي غَيْرِ أَهْلِهِ فَتُجَهَّلَ، إِنَّ عَلَيْكَ فِي عِلْمِكَ حَقّاً، كَمَا أَنَّ عَلَيْكَ فِي مَالِكَ حَقّاً. [مي ٣٩٠].

* إسناده صحيح.

**ژ كەسیرێ كورێ مورەیی (رحمه الله) گۆت: ئاخفتنا پویچ بۆ حیكمەتدار و شارەزایان نەبێژە دێ ژ تە تۆرە بن و ژ تە دویر كەڤن و حیكمەتێ و ئاخفتنا راست و دورست بۆ ساویلكان نەبێژە دێ تە درەوین دانن و زانینێ ژ خەلكێ وێ نەڤەگرە دێ گونەهكار بی و نەئێخەنە د خەلكێ وێدا ڤەدرێ تە ناهێتە زانین، ب راستی د زانینا تەدا مافێ ل سەر تە هەی كا چاوا د مالێ تەدا ماف ل سەر تە هەیە.**

---

(١) كو ئاخفتنا خودێیە.

(٢) ئانكو راگرتی و بنەجه نامینیت، چونكی جرەبڕ و گەنگەشە گۆمانان دورست دكەن.

## ٣١ - باب: التسوية في العلم.

## بابەتێ: وەكئێكی د زانینێدا.

٣٧٣ - عَن ابْنِ مَيْسَرَةَ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحداً مِنَ النَّاسِ، الشَّرِيفُ وَالوَضِيعُ عِنْدَهُ سَوَاءٌ، غَيْرَ طَاوُسٍ، وَهُوَ يَحْلِفُ عَلَيْهِ. [مي٤١٧].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی مەیسەرەیی (ﷺ) گۆت: من چو مرۆڤ نەدیتینە ما قویل و هەژار ل دەڤ وی وەكی ئێك بن ژ بلی تاووسی و ئەو سویندێ ل سەر ڤێ دخۆت.**

٣٧٤ - عَن الزُّهْرِيِّ قَالَ: كُنَّا نَكْرَهُ كِتَابَةَ العِلْمِ، حَتَّى أَكْرَهَنَا عَلَيْهِ السُّلْطَانُ، فَكَرِهْنَا أَنْ نَمْنَعَهُ أَحَداً. [مي٤١٨].

* إسناده صحيح.

**ژ زوهری (ﷺ) گۆت: مە نەدڤیا زانین بهێتە نڤیسین هەتا حوكمداری ئەم نەچاركرین بنڤیسین. مە ژی نەڤیا ئەم رێگرییێ ل كەسێ بكەین.**

٣٧٥ - عن ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَلَّمُوا مُحَمَّداً - ابن سيرين - فِي رَجُلٍ - يَعْنِي: يُحَدِّثُهُ - فَقَالَ: لَوْ كَانَ رَجُلاً مِنَ الزِّنْجِ لَكَانَ عِنْدِي وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مُحَمَّدٍ فِي هَذَا سَوَاءً. [مي٤١٩].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن عەونی (ﷺ) گۆت: د گەل موحەممەدی - ئیبن سیرینی - ئاخفتن، زەلامەكێ حەدیسان بۆ بێژیت: ئینا گۆت: ئەگەر زەلامەك ژ زنجییان بیت ل دەڤ من ئەو و عەبدوللایێ كورێ موحەممەدی (مەبەست كورێ خۆیە) د ڤێ چەندێدا وەكی ئێكن.**

## ٣٢ ـ باب اختلاف العلماء.

## بابەتێ: نەلێکییا زانایان.

٣٧٦ – عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: قلت لِعُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ: لَوْ جَمَعْتَ النَّاسَ عَلَى شَيْءٍ؟ فَقَالَ: مَا يَسُرُّنِي أَنَّهُمْ لَمْ يَخْتَلِفُوا، قَالَ: ثُمَّ كَتَبَ إِلَى الْآفَاقِ ـ أو: إِلَى الْأَمْصَارِ ـ لِيَقْضِ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا اجْتَمَعَ عَلَيْهِ فُقَهَاؤُهُمْ. [مي٦٥٢].

* إسناده صحيح.

**ژ حومەیدی (رحمه الله) گۆت: من گۆتە عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی (رحمه الله) ئەگەر تە خەلك ل سەر تشتەکی کۆمکربان، ئینا گۆت: من پێخۆش نینە نەلێکی د ناڤبەرا واندا نەبوویە، حومەیدی گۆت: پاشی بۆ لایان یان بۆ وەلاتان نڤیسی بلا هەر ملەتەك حوکمی ب وێ بکەت یا زانایێت وان ل سەر کۆم بووین.**

٣٧٧ – عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: كَانَ سَلاَّمٌ يَذْكُرُ عَنْ أَيُّوبَ ـ السَّخْتِيَانِيِّ ـ قَالَ: إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَعْرِفَ خَطَأَ مُعَلِّمِكَ فَجَالِسْ غَيْرَهُ. [مي٦٦٧].

* إسناده صحيح.

**ژ سەعیدێ کورێ عامری (رحمه الله) گۆت: سەلامی ژ ئەیووبی ڤەدگێرا دگۆت: ئەگەر تە دڤێت خەلەتییا سەیدایێ خۆ بزانی ل دەڤ ئێکێ دی روینە.**

## ٣٣ـ باب: من كره الراي والقياس.

## بابەتێ: بێ حەژ بۆچۆن و قیاسێ نەكری.

٣٧٨ – عَن أَبِي بَكْرٍ الْهُذَلِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: شَهِدْتُ شُرَيْحًا وَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ مُرَادٍ، فَقَالَ: يَا أَبَا أُمَيَّةَ، مَا دِيَةُ الْأَصَابِعِ؟ قَالَ: عَشْرٌ عَشْرٌ. قَالَ: يَا سُبْحَانَ اللهِ! أَسَوَاءٌ هَاتَانِ؟ جَمَعَ بَيْنَ الْخِنْصِرِ وَالْإِبْهَامِ. فَقَالَ شُرَيْحٌ: يَا سُبْحَانَ اللهِ! أَسَوَاءٌ أُذُنُكَ وَيَدُكَ؟ فَإِنَّ الْأُذُنَ يُوَارِيهَا الشَّعْرُ وَالْكُمَّةُ وَالعِمَامَةُ، فِيهَا نِصْفُ الدِّيَةِ، وَفِي الْيَدِ نِصْفُ الدِّيَةِ. وَيْحَكَ: إِنَّ السُّنَّةَ سَبَقَتْ قِيَاسَكُمْ، فَاتَّبِعْ وَلَا تَبْتَدِعْ، فَإِنَّكَ لَنْ تَضِلَّ مَا أَخَذْتَ بِالْأَثَرِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ الْهُذَلِيُّ: فَقَالَ لِي الشَّعْبِيُّ: يَا هُذَلِيُّ، لَوْ أَنَّ أَحْنَفَكُمْ قُتِلَ وَهَذَا الصَّبِيُّ فِي مَهْدِهِ، أَكَانَ دِيَتُهُمَا سَوَاءً؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَيْنَ الْقِيَاسُ! (1).　　[مي٢٠٤].

* إسناده ضعيف.

---

(١) شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینا یە: ٣٧٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ أَحْدَثَ رَأْياً لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ، وَلَمْ تَمْضِ بِهِ سُنَّةٌ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لَمْ يَدْرِ عَلَى مَا هُوَ مِنْهُ، إِذَا لَقِيَ اللهَ عزّ وجل.

[مي١٦٣]

* إسناده صحيح.

م. عن الشَّعْبِيِّ قَالَ: مَا حَدَّثُوكَ هَؤُلَاءِ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَخُذْ بِهِ، وَمَا قَالُوهُ بِرَأْيِهِمْ فَأَلقِهِ فِي الحُشِّ.

[مي٢٠٦]

* إسناده صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ هەردویان رازی بیت) گۆت: هەر كەسێ رایەكێ بێژیت د كتێبا خودێدا نەبیت و سونەتا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پێ نەهاتبیت ئەو نوزانیت دێ چ بۆ هێته نفیسین ئەگەر گەهشتە خودایێ هەر ب هێز و مەزن.

شەعبی گۆت: هندی ئەو ژ پێغەمبەری (ﷺ) بۆ تە بێژن وەربگرە، و ئەگەر وان ژ رایا خۆ گۆت باڤێژە ناڤ بیستانی (ئانكو باڤێژە جهێ دەستئاڤێ و ئەو وی دەمی بۆ دەستئاڤا دچۆنە ناڤ بیسانان).

**ژ بەكرێ هوزەلی (ﷺ) ژ شەعبی گۆت: ئەز ل دەڤ شورەیحی بووم و زەلامەك ژ عێلا مورد هاتە دەڤ، گۆت: ئەی بابێ ئومەییە خوینا تبلان چییە؟ گۆت: هەر تلەك ب دەهـ حێشترانە، بەكرێ هوزەلی گۆت: وەی سوبحان الله ئەڤە هەردو وەكی ئێكن؟ و تلا بەرانی و یا قلیچێ پێكڤە كۆمكرن، ئینا شورەیحی گۆت: وەی سوبحان الله ما گوهێ تە و دەستێ تە وەكی ئێكن؟ گوهـ ب پرچی و كولاڤی و شاشكێ دهێتە ڤەشارتن و نیڤ خوین یا تێدا و دەستی ژی نیڤ خوین یا تێدا، وەی بۆ تە حەدیس بەری قیاسا هەوە یا هاتی ل دویڤ حەدیسێ هەرە و ژ نك خۆ چو نەدەرێخە ب راستی تو بەرزە نابی هندی تو ل دویڤ حەدیسێ بچی، ئەبوبەكەری گۆت: شەعبی گۆتە من. ئەی هوزەلی ئەگەر ئەحنەفێ هەوە و ئەڤ بچویكێ د پێچۆلكێدا هاتنە كوشتن ئەرێ دێ خوینا وان وەكی ئێك بیت؟ من گۆت: بەلێ، ئینا گۆت: پا كا قیاسا هەوە.**

٣٧٩ - عَن الشَّعْبِيِّ قَالَ: وَاللهِ لَئِنْ أَخَذْتُمْ بِالمَقَايِسِ، لَتُحَرِّمُنَّ الحَلاَلَ، وَلَتُحِلُّنَّ الحَرَامَ.

- وعنه أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا أَبْغَضَ إِلَيَّ أَرَأَيْتَ أَرَأَيْتَ! يَسْأَلُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ فَيَقُولُ: أَرَأَيْتَ، وَكَانَ لاَ يُقَايِسُ.
- وعنه: لَوْ أَنَّ هَؤُلاَءِ كَانُوا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) لَنَزَلَتْ عَامَّةُ القُرْآنِ: يَسْأَلُونَكَ، يَسْأَلُونَكَ. [مي١٩٨، ١٩٩، ٢٠١].

* أسانيدها صحيحة.

**ژ شەعبی (ﷺ) گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر هوین كار ب قیاسێ بكەن دێ حەلالی حەرامكەن و حەرامی حەلالكەن.**

- **و ژ وی دگۆت: من چەند ئەڤ ئاخفتنە نەڤێت: تو چ دبێژی؟ تو چ دبێژی؟ زەلام پرسیارا هەڤالێ خۆ دكەت دبێژیت: تو چ دبێژی؟ و وی قیاس نەدكر.**

- **و ژ وی: ئەگەر ئەڤە ل سەر دەمێ پێغەمبەری بان دا پتریا قورئانێ پرسیارێ ژ تە دکەن و پرسیارێ ژ تە دکەن هێتە خوارێ.**

٣٨٠ – وعنه قَالَ: مَا حَدَّثُوكَ هَؤُلاَءِ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَخُذْ بِهِ، وَمَا قَالُوهُ بِرَأْيِهِمْ فَأَلقِهِ فِي الحُشِّ. [مي٢٠٦]

* إسناده صحيح.

**و ژ وی : هندی ئەڤە ژ پێغەمبەری (ﷺ) بۆ تە بێژن وەرگرە و یا ژ بۆچۆنا خۆ بۆ تە گۆتی باڤێژە ناڤ قرشی.**

**٣٤ . باب: اجتناب الاهواء.**

**بابەتێ: دویرکەفتن ژ دلخوازییان.**

٣٨١ – عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ قَالَ: قَالَ إِبْلِيسُ لِأَوْلِيَائِهِ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَأْتُونَ بَنِي آدَمَ؟ فَقَالُوا: مِنْ كُلِّ شَيْءٍ، قَالَ: فَهَلْ تَأْتُونَهُمْ مِنْ قِبَلِ الاِسْتِغْفَارِ؟ فقَالُوا: هَيْهَاتَ، ذَاكَ شَيْءٌ قُرِنَ بِالتَّوْحِيدِ، قَالَ: لَأَبُثَّنَّ فِيهِمْ شَيْئاً لاَ يَسْتَغْفِرُونَ اللهَ مِنْهُ، قَالَ: فَبَثَّ فِيهِمُ الْأَهْوَاءَ.

[مي٣١٦].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەوزاعی (رحمه الله) گۆت: شەیتانی گۆتە هاریکارێت خۆ هوین ب چ رێك دچنە مرۆڤان؟ گۆتن: ب هەمی رێکان. گۆت: هوین ب رێکا ئستیغفاران دچنێ؟ گۆتن وێڤە ژ کیڤە ئەو تشتەکە ب ئێکتاییێڤە (ئێك خودا پەرستییێڤە) گرێدایە، گۆت: ئەز دێ وی د ناڤ واندا بەلاڤکەم ئستیغفارێ بۆ نەکەن، گۆت: دلخوازی د ناڤ واندا بەلاڤ کر.**

٣٨٢ – عَنْ زِيَادِ بْنِ حُدَيْرٍ قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ: هَلْ تَعْرِفُ مَا يَهْدِمُ الْإِسْلاَمَ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: يَهْدِمُهُ زَلَّةُ العَالِمِ، وَجِدَالُ المُنَافِقِ بِالكِتَابِ، وَحُكْمُ الْأَئِمَّةِ المضِلِّينَ. [مي٢٢٠].

* إسناده صحيح.

**ژ زیادێ كوڕێ حودەیری (رحمه الله)، گۆت: عومەری كوڕێ خەتتابی گۆتە من تو د زانی چ ئیسلامێ دهەرفینیت؟ (شەنگستێت وێ ئەوێت ل سەر هاتییە ئاڤاكرن ناهێلیت)، گۆت من گۆت: نەخێر ئەز نوزانم، گۆت: خەلەتیا زانای (یێ خەمسار) و جرەبڕا دوڕوی د قورئانێدا و حوكمدارییا حاكمدارێت سەرداچۆیی دهەرفینیت.**

٣٨٣ – عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: لاَ تُجَالِسُوا أَهْلَ الْأَهْوَاءِ وَلاَ تُجَادِلُوهُمْ، فَإِنِّي لاَ آمَنُ أَنْ يَغْمِسُوكُمْ فِي ضَلاَلَتِهِمْ، أَوْ يَلْبِسُوا عَلَيْكُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ. [مي٤٠٥].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی قیلابەیی (رحمه الله) گۆت: د گەل كەسێت ل دویڤ دلخوازییان دچن نەروینن و گەنگەشێ د گەل نەكەن، ب ڕاستی ئەز یێ پشت ڕاست نینم ئەو هەوە د بەرزەبوونا خۆدا ببەنە خوارێ یان یا هوین دزان ل هەوە تێكەل بكەن.**

٣٨٤ – عَنْ أَسْمَاءَ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: دَخَلَ رَجُلاَنِ مِنْ أَصْحَابِ الْأَهْوَاءِ عَلَى ابْنِ سِيرِينَ، فَقَالاَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، نُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالاَ: فَنَقْرَأُ عَلَيْكَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: لاَ، لَتَقُومَانِ عَنِّي، أَوْ لَأَقُومَنَّ، قَالَ: فَخَرَجَا.

فَقَالَ بَعْضُ القَوْمِ: يَا أَبَا بَكْرٍ، وَمَا كَانَ عَلَيْكَ أَنْ يَقْرَأَا عَلَيْكَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللهِ تعالى؟ قَالَ: إِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْرَأَا عَلَيَّ آيَةً، فَيُحَرِّفَانِهَا، فَيَقِرُّ ذَلِكَ فِي قَلْبِي. [مي٤١١].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەسمائێ كورێ عوبەیدی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: دو زەلام ژ خودانێت دلخوازییان هاتنە دەڤ ئیبن سیرینی، گۆتن: ئەی ئەبا بەكر: حەدیسەكێ بۆ تە بێژین؟ گۆت: نەخێر، گۆتن ئایەتەكێ ژ كتێبا خودێ بۆ تە بخوینین؟ گۆت: نەخێر، و یان هوین دێ ژ دەڤ من چن یان ئەز دێ رابم، گۆت: هەردو دەركەفتن.**

**هندەك ژ روینشتییان گۆت: ئەی ئەبا بەكر ما دا چ ل تە بیت ئەگەر ئایەتەكا قورئانێ بۆ تە خواندبان؟ گۆت ئەز دترسیام ئایەتەكێ بخوینن و ڤارێ بكەن و د دلێ مندا بمینیت.**

٣٨٥ – عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ وَابْنِ سِيرِينَ، أَنَّهُمَا قَالاَ: لاَ تُجَالِسُوا أَصْحَابَ الْأَهْوَاءِ، وَلاَ تُجَادِلُوهُمْ، وَلاَ تَسْمَعُوا مِنْهُمْ. [مي٤١٥].

* إسناده صحيح.

**ژ حەسەنێ بەسری و ئیبن سیرینی گۆتن: ل دەڤ ئەوێت ل دویڤ دلخوازییان دچن نەروینن و گەنگەشێ د گەل نەكەن و گوهدارییا وان نەكەن.**

### ٣٥ . باب: تكريم العلم وبذل المشقة فيه.

### بابەتێ: قەدرگرتنا زانینێ و زەحمەتكێشان د وەرگرتنا وێدا.

٣٨٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وُجِدَ أَكْثَرُ حَدِيثِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عِنْدَ هَذَا الحَيِّ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَاللهِ إِنْ كُنْتُ لَآتِي الرَّجُلَ مِنْهُمْ فَيُقَالُ: هُوَ نَائِمٌ، فَلَوْ شِئْتُ أَنْ يُوقَظَ لِي، فَأَدَعُهُ حَتَّى يَخْرُجَ، لِأَسْتَطِيبَ بِذَلِكَ حَدِيثَهُ. [مي٥٨٦].

* إسناده حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پترییا حەدیسا پێغەمبەری (ﷺ) ل دەڤ ڤی تاخێ خەلكێ مەدینەیێ بوو ژ ئەنساران و ب خودێ ئەز دهاتمە دەڤ زەلامەكی ژ وان،**

**دا بێژنە من یێ نڤستییە، و ئەگەر من ڤیابا بۆ من هشیاربا دا هشیار بیت، بەلێ من ئەو دهێلا هەتا دەرکەفتبا دا ب ڤێ چەندێ خۆش ب ئاخفتنا وی ببەم.**

٣٨٧ – عن الزُّهْرِيِّ قَالَ: كُنْتُ آتِي بَابَ عُرْوَةَ، فَأَجْلِسُ بِالبَابِ، وَلَوْ شِئْتُ أَنْ أَدْخُلَ لَدَخَلْتُ، وَلَكِنْ إِجْلاَلاً لَهُ. [مي٥٨٨].

* إسناده صحيح.

**ژ زوهری (رحمه الله) گۆت: ئەز دهاتمە بەر دەرگەهێ عوروەی و ل بەر دەرگەهی ئەز دروینشتم و ئەگەر من ڤیابا بچمە ژۆر دا چمە ژۆر بەلێ ئەز نەدچۆم ژ مەزنگرتنا وی.**

٣٨٨ – عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قُلْتُ لِرَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا فُلاَنُ، هَلُمَّ فَلْنَسْأَلْ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَإِنَّهُمُ اليَوْمَ كَثِيرٌ، فَقَالَ: وَا عَجَباً لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَتَرَى النَّاسَ يَحْتَاجُونَ إِلَيْكَ، وَفِي النَّاسِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) مَنْ تَرَى؟... الحديث وفيه: فَبَقِيَ الرَّجُلُ حتَّى رآني وقدِ اجْتَمَعَ الناسُ عَلَيَّ، فقالَ: كان هذا الفتى أعقلَ منِّي. [مي٥٨٩].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ، من گۆتە زەلامەکی ژ خەلکێ مەدینەیێ: ئەی فلان وەرە بچین پرسیارا هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) بکەین ئەو ئەڤرۆ گەلەکن، ئینا گۆت: ئەی ئیبن عەباس تو یێ عەجێبی، تو دبینی خەلك دێ هەوجەی تە بن و هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) یێت د ناڤ خەلکیدا تو خۆ چاوا دبینی؟! وی ئەڤە هێلا.**

**و من بەرێ خۆ دا پرسیارکرنێ ئەگەر حەدیسەك ژ زەلامەکی گەهشتبا من، دا دەمێ نیڤرۆ هێمە دەڤ ئەو یێ نڤستی بوو دا عەبایێ خۆ دانمە پالا خۆ و ل بەر دەرگەهێ وی روینم و بای تۆز دئینا سەروچاڤێت من، ڤێجا دا دەرکەڤیت هۆ من بینیت دا بێژیت: ئەی پسمامێ پێغەمبەرێ خودێ چ تو ئینایە، بۆ تە نەدهنارت ئەز دا هێم؟ من دگۆت: ئەز**

هەژیترم بهێمە دەڤ تە، گۆت: ئەو زەلام ما هەتا ئەز دیتیم و خەلك ل دۆرماندۆرێت من یێت كۆم بووین، ئینا گۆت: ئەڤ گەنجە ژ من ب عاقلتر بوو.

## ٣٦ . باب: ما جاء في صفات العلماء.

## بابەتێ: ئەوا د سالۆخەتێت زانایاندا هاتی.

٣٨٩ - عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: لاَ تَكُونُ عَالِماً حَتَّى تَكُونَ مُتَعَلِّماً، وَلاَ تَكُونُ بِالعِلْمِ عَالِماً حَتَّى تَكُونَ بِهِ عَامِلاً، وَكَفَى بِكَ إِثْماً أَنْ لاَ تَزَالَ مُخَاصِماً، وَكَفَى بِكَ إِثْماً أَنْ لاَ تَزَالَ مُمَارِياً، وَكَفَى بِكَ كَاذِباً أَنْ لاَ تَزَالَ مُحَدِّثاً فِي غَيْرِ ذَاتِ اللهِ. [مي٣٠١].

* إسناده حسن.

ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: تو نابییە زانا هەتا نەبییە فێرخواز، و ب زانینێ تو نابییە زانا هەتا تو كار پێ نەكەی، و ئەو گونەهـ بۆ تە بەسە تو هەر یێ هەڤڕك بی، و بەسە بۆ تە گونەهـ بەردەوام رویمەتكار بی، و بەسە بۆ تە درەوكەربی بەردەوام ئاخفتنا تە بۆ غەیری خودێ بیت.

٣٩٠ - عَنْ عِمْرَانَ المِنْقَرِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ يَوْماً فِي شَيْءٍ قَالَهُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ لَيْسَ هَكَذَا يَقُولُ الفُقَهَاءُ، فَقَالَ: وَيْحَكَ! وَرَأَيْتَ أَنْتَ فَقِيهاً قَطُّ؟ إِنَّمَا الفَقِيهُ: الزَّاهِدُ فِي الدُّنْيَا، الرَّاغِبُ فِي الْآخِرَةِ، البَصِيرُ بِأَمْرِ دِينِهِ، المُدَاوِمُ عَلَى عِبَادَةِ رَبِّهِ. [مي٣٠٢].

* إسناده صحيح.

ژ عیمرانێ مینقەری (رحمه الله) گۆت: من رۆژەكێ د دەرهەقێ تشتەكیدا كو حەسەن بەسری گۆتی، گۆتێ: ئەی ئەبو سەعید فقهزان ڤێ نابێژن، ئینا گۆتە من وەی بۆ تە ما تە جارەكێ ئەز دیتیمە فقهزان، فقهزان بەس ئەوە یێ حەژ دنیایێ نەكەت و حەژ

ئاخرەتێ بکەت و د کارێ دینێ خۆدا شارەزا و تێگەهشتن تیژ و یێ بەردەوام ل سەر پەرستنا خودایێ خۆ.

٣٩١ - عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ قَالَ: إِنِّي لَأَجِدُ نَعْتَ قَوْمٍ يَتَعَلَّمُونَ لِغَيْرِ العَمَلِ، وَيَتَفَقَّهُونَ لِغَيْرِ العِبَادَةِ، وَيَطْلُبُونَ الدُّنْيَا بِعَمَلِ الْآخِرَةِ، وَيَلْبَسُونَ جُلُودَ الضَّأْنِ، وَقُلُوبُهُمْ أَمَرُّ مِنَ الصَّبْرِ، فَبِي يَغْتَرُّونَ، أَوْ إِيَّايَ يُخَادِعُونَ، فَحَلَفْتُ بِي لَأُتِيحَنَّ لَهُمْ فِتْنَةً تَتْرُكُ الحَلِيمَ فِيهَا حَيْرَانَ. [مي٣٠٧].

* إسناده صحيح.

ژ کەعبێ ئەحباری (رحمه الله) گۆت: ئەز (د کتێبا خودێدا) سالۆخەتێت هندەکان دبینم: نە بۆ کارکرنێ خۆ فێردکەن و نە بۆ پەرستنێ خۆ شارەزا دکەن، و دنیایێ ب کارێ ئاخرەتێ دخوازن، و کەڤلێ بەرخی دکەنە بەر خۆ، و دلێت وان ژ گیایێ سەبارەیێ تەحلترە، هوین ب دلۆڤانییا من سەردا دچن یان هوین من دخاپینن؟ ئەز ب خۆ سویند دخۆم دێ ئاتافەکێ ب سەر واندا ئینم مرۆڤێ ب عاقل گوهوشی بهێلیت.

٣٩٢ - عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ يَطْلُبُ هَذَا العِلْمَ مَنِ اجْتَمَعَتْ فِيهِ خَصْلَتَانِ: العَقْلُ وَالنُّسُكُ، فَإِنْ كَانَ نَاسِكاً وَلَمْ يَكُنْ عَاقِلاً قَالَ: هَذَا أَمْرٌ لاَ يَنَالُهُ إِلاَّ العُقَلاَءُ، فَلَمْ يَطْلُبْهُ، وَإِنْ كَانَ عَاقِلاً وَلَمْ يَكُنْ نَاسِكاً قَالَ: هَذَا أَمْرٌ لاَ يَنَالُهُ إِلاَّ النُّسَّاكُ، فَلَمْ يَطْلُبْهُ.

قَالَ: وَلَقَدْ رَهِبْتُ أَنْ يَكُونَ يَطْلُبُهُ اليَوْمَ مَنْ لَيْسَتْ فِيهِ وَاحِدَةٌ مِنْهُمَا: لاَ عَقْلٌ وَلاَ نُسُكٌ. [مي٣٨٣].

* إسناده صحيح.

ژ شەعبی (رحمه الله) گۆت: ب راستی بەس ئەو ڤێ زانینێ دخوازیت یێ دو سالۆخەت تێدا بن: عەقل و عیبادەتکاری، چونکی ئەگەر یێ عیبادەتکەر بیت و نەیێ ب عەقل بیت دێ

بێژیت: ڤی تشتی كەس ناگەهیتێ یێ ب عەقل نەبیت (و دێ هزر كەت یێ ب عاقلە) و عەقلی ناخوازیت: و ئەگەر یێ ب عاقل بیت و نەیێ عیبادەتكەر بیت دێ بێژیت: ڤی تشتی كەس ناگەهیتێ یێ عیبادەتكەر نەبیت، و عیبادەتكارییێ ناخوازیت.

شەعبی گۆت: و ئەز دترسم ئەڤرۆ ئەو زانینێ بخوازیت یێ ئێك ژ ڤان تێدا نەبیت نە عەقل و نە عیبادەتكاری.

٣٩٣ – وعَنه قَالَ: وَدِدْتُ أَنِّي نَجَوْتُ مِنْ عِلْمي كَفَافاً، لاَ لِي، وَلاَ عَلَيَّ. [مي٥٤٨].

* إسناده صحيح.

ژ وی (رحمه الله) گۆت: من حەز دكر ئەز ب زانینا خۆ سەر ب سەر رزگار ببام نە بۆ من با و نە ل سەر من با.

٣٩٤ – عَن الحَسَنِ قَالَ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ، وَالنَّاسِكُ إِذَا نَسَكَ لَمْ يُعْرَفْ مِنْ قِبَلِ مَنْطِقِهِ، وَلَكِنْ يُعْرَفُ مِنْ قِبَلِ عَمَلِهِ، فَذَلِكَ العِلْمُ النَّافِعُ. [مي٥٥٨].

* إسناده صحيح.

ژ حەسەنێ بەسری (رحمه الله) گۆت: ئەز گەهشتمە خەلكی و عیبادەتكەر ئەگەر عیبادەت دكر خەلكی ب ئەزمانێ وی ئەو نەدنیاسی بەلكی ب كریارێت وی دهاتە نیاسین و ئەڤەیە زانینا مفادار.

### ٣٧ . باب العمل بالعلم وحسن النية فيه.

### بابەتێ: كاركرن ب زانینێ و نیەتا باش تێدا.

٣٩٥ – عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلشَّعْبِيِّ: أَفْتِنِي أَيُّهَا العَالِمُ، فَقَالَ: العَالِمُ مَنْ يَخَافُ اللهَ. [مي٢٦٤].

* إسناده صحيح.

**ژ مالكێ كورێ میغوەلی (رحمه الله) گۆت: زەلامەكی گۆتە شەعبی: بەرسڤا من بدە ئەی زانا، ئینا گۆت: زانا ئەوە یێ ژ خودێ بترسیت.**

٣٩٦ – عَنِ الحَسَنِ قَالَ: العِلْمُ عِلْمَانِ: فَعِلْمٌ فِي القَلْبِ فَذَلِكَ العِلْمُ النَّافِعُ، وَعِلْمٌ عَلَى اللِّسَانِ، فَذَلِكَ حُجَّةُ اللهِ عَلَى ابْنِ آدَمَ. [مي٣٧٦].

* إسناده صحيح.

■ وعنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)... مِثْلَ ذَلِكَ.

* مرسل صحيح. [مي٣٧٧].

**ژ حەسەنێ بەسری (رحمه الله) گۆت: زانین دو زانینن، زانینەكا د دلیدا ئها ئەو زانینا مفادارە، و زانینا ل سەر ئەزمانی ئەو بەلگەیا خودێیە ل سەر مرۆڤی.**
**و ژ وی ژ پێغەمبەری (ﷺ) وەكی وێ.**

٣٩٧ – عَنْ حَبِيبِ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: تَعَلَّمُوا العِلْمَ وَانْتَفِعُوا بِهِ، وَلاَ تَعَلَّمُوهُ لِتَتَجَمَّلُوا بِهِ، فَإِنَّهُ يُوشِكُ، إِنْ طَالَ بِكُمْ عُمُرٌ، أَنْ يَتَجَمَّلَ ذُو العِلْمِ بِعِلْمِهِ كَمَا يَتَجَمَّلُ ذُو البِزَّةِ بِبِزَّتِهِ. [مي٣٨١].

* إسناده صحيح.

**ژ حەبیبێ كورێ عوبەیدی، گۆت: دگۆتن فێری زانینێ ببن و پێ مفای ببینن و فێر نەبنێ دا خۆ پێ جوانكەن، ب راستی نێزیكە ئەگەر ژییێ هەوە درێژ بوو (هوین ببینن) خودانێ زانینێ خۆ ب زانینا خۆ جوان دكەت هەروەكی خودانێ جلكی خۆ ب جلكێ خۆ جوان دكەت.**

٣٩٨ – عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الحَسَنِ البَصْرِيِّ قَالَ: إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيُصِيبُ البَابَ مِنَ العِلْمِ، فَيَعْمَلُ بِهِ فَيَكُونُ خَيْراً لَهُ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، لَوْ كَانَتْ لَهُ فَجَعَلَهَا فِي الْآخِرَةِ.

قَالَ: قَالَ الحَسَنُ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا طَلَبَ العِلْمَ، لَمْ يَلْبَثْ أَنْ يُرَى ذَلِكَ فِي بَصَرِهِ وَتَخَشُّعِهِ وَلِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَصِلَتِهِ وَزُهْدِهِ.

قَالَ: وقَالَ مُحَمَّدٌ -ابْنُ سِيرِينَ-: انْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ هَذَا الحَدِيثَ، فَإِنَّمَا هُوَ دِينُكُمْ. [مي٣٩٨].

* إسناده صحيح.

**ژ هیشامی ژ حەسەنێ بەسری (رحمه الله) گۆت: ئەگەر بابەتەكێ ژ زانینێ بگەهیتە مرۆڤی و كار پێ بكەت بۆ وی ژ دنیایێ و تشتێ تێدا باشترە ئەگەر (دنیایێ) بكەتە د ئاخرەتا خۆدا.**

**گۆت: حەسەن بەسری گۆت: ئەگەر مرۆڤی زانین خواست (رێكا زانینێ گرت) چویێ وەسا نامینیت ئەو (رەنگڤەدانا خۆ) د چاڤێ ویدا و د ترسیانا ویدا و د ئەزمانێ ویدا و د دەستێ ویدا و د نڤێژا ویدا و د پارێزكارییا ویدا دهێتە دیتن.**

**گۆت: موحەممەدێ كورێ سیرینی گۆت: بەرێ خۆ بدەنێ كا هوین ڤێ حەدیسێ ژ كێ وەردگرن ئەو دینێ هەومیە.**

٣٩٩ - عَنْ أَبِي مُسْلِمٍ الخَوْلَانِيُّ قَالَ: العُلَمَاءُ ثَلَاثَةٌ: فَرَجُلٌ عَاشَ فِي عِلْمِهِ وَعَاشَ مَعَهُ النَّاسُ فِيهِ، وَرَجُلٌ عَاشَ فِي عِلْمِهِ وَلَمْ يَعِشْ مَعَهُ فِيهِ أَحَدٌ، وَرَجُلٌ عَاشَ النَّاسُ فِي عِلْمِهِ وَكَانَ وَبَالاً عَلَيْهِ.

[مي٣٧٣].

* إسناده صحيح.

**ژ موسلمێ خولانی (رحمه الله) گۆت: زانا سێنە، زانایەك د زانینا خۆدا بژیت (كار پێ بكەت) و خەلك د گەل وی تێدا بژین، و زانایەك د زانینا خۆدا بژیت و كەس د گەل وی تێدا نەژیت، و زانایەك خەلك د زانینا ویدا بژیت بەلێ بۆ وی ژ ناڤچۆن و هیلاك بیت.**

## ٣٨ـ باب: فضل العلم على العبادة.

## بابەتێ: بهایێ زانینێ ل سەر پەرستنێ.

٤٠٠ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ البَاهِلِيِّ قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) رَجُلاَنِ: أَحَدُهُمَا عَابِدٌ، وَالْآخَرُ عَالِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَضْلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ، كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ)**. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ وَمَلاَئِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرَضِينَ، حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا، وَحَتَّى الحُوتَ، لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الخَيْرَ)**. [ت٢٦٨٥/ مي٢٩٧]

* صحيح.

**ژ ئەبی ئومامەی (رضي الله عنه) گۆت: بەحسێ دو زەلامان بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە كرن ئێك ژ وان عیبادەتكارە و یێ دی زانایە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قەدرێ زانای ل سەر عیبادەتكەری وەكی قەدرێ منە ل سەر یێ ژ هەوە هەمیان كێمتر)، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ و ملیاكەت و خەلكێ عەرد و عەسمانان هەتا مێری د كونا خۆڤە و هەتا ماسی سەلەواتان[1] ددەنە سەر مامۆستایێت خێرێ نیشا خەلكی ددەن).**

٤٠١ – عَنْ وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ قَالَ: مَجْلِسٌ يُتَنَازَعُ فِيهِ العِلْمُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ قَدْرِهِ صَلاَةً، لَعَلَّ أَحَدَهُمْ يَسْمَعُ الكَلِمَةَ فَيَنْتَفِعُ بِهَا سَنَةً، أَوْ مَا بَقِيَ مِنْ عُمُرِهِ.

[مي٣٣٤].

* إسناده صحيح.

[انظر: ٣٠٣].

---

(١) سەلات ژ خودێ: دلۆڤانییە و ژ ملیاكەتان داخوازا گونەهژێبرنێیە و ژ مرۆڤان و تشتێت دی دوعایە.

ژ وەهبێ كورێ مونەببەهی (رحمه الله) گۆت: دیوانەكا زانین تێدا بهێتە گەنگەشەكرن خۆشتڤیترە ل دەڤ من ژ هندی وێ نڤێژ، دبیت ئێك هەبیت پەیڤەكێ گوھ لێ ببیت سالەكێ مفای ژێ ببینیت یان هندی ژییێ وی یێ مای.

## ٣٩ . باب الوصاية بطلب العلم.

## بابەتێ: وەسیەتكرن ب خواستنا زانینێ.

٤٠٢ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (سَيَأْتِيكُمْ أَقْوَامٌ يَطْلُبُونَ العِلْمَ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمْ فَقُولُوا لَهُمْ: مَرْحَباً مَرْحَباً بِوَصِيَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَاقْنُوهُمْ).

قال الحَكَم: اقْنُوهُم: عَلِّمُوهُمْ. [جه٢٤٧].

* حسن.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دێ هندەك كەس هێنە دەڤ هەوە داخوازا زانینێ كەن، بێژنێ ب خێر هاتن ب خێر هاتن ب وەسیەتكرنا پێغەمبەرێ خودێ ( ) و نیشا بدەن).**

## ٤٠ . باب: التوقي في الفتيا والخوف منها.

## بابەتێ: خۆپاراستن ژ فەتوادانێ و ترس ژێ.

٤٠٣ – عن أبي هُرَيْرَةَ قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ أُفْتِيَ بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ).

[د٣٦٥٧/ جه٥٣/ مى١٥٩]

* حسن.

ژ ئەبی هورەیرەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ بێی زانین بەرسڤ (فەتوا) بۆ هاتیە دان، گونەها وی ل سەر وییە یێ بەرسڤ (فەتوا) دای).**

٤٠٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ أَفْتَى بِفُتْيَا يُعَمَّى عَنهَا فَإِثْمُهَا عَلَيْهِ. [مي١٦٢].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەر كەسێ فەتوایێ بدەت و ئەو ل دویڤ راستییێ تێدا نەچیت گونەها وێ ل سەر وییە.**

٤٠٥ – عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ نافِعِ بْنِ مَالِكٍ الأَصْبَحِيِّ قَالَ: كَانَ عَلَى امْرَأَتِي اعْتِكَافُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي المَسْجِدِ الحَرَامِ، فَسَأَلْتُ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ العَزِيزِ، وَعِنْدَهُ ابْنُ شِهَابٍ، قَالَ: قُلْتُ: عَلَيْهَا صِيَامٌ؟ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: لاَ يَكُونُ اعْتِكَافٌ إِلاَّ بِصِيَامٍ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ العَزِيزِ: عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَنْ أَبِي بَكْرٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَنْ عُمَرَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَنْ عُثْمَانَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ عُمَرُ: مَا أَرَى عَلَيْهَا صِيَاماً.

فَخَرَجْتُ فَوَجَدْتُ طَاوُساً وَعَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ، فَسَأَلْتُهُمَا، فَقَالَ طَاوُسٌ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ لاَ يَرَى عَلَيْهَا صِيَاماً إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ عَلَى نَفْسِهَا. قَالَ: وَقَالَ عَطَاءٌ: ذَلِكَ رَأْيِي. [مي١٦٤].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی سەهل (رحمه الله) گۆت: سێ رۆژ ئیعتیكاف ل سەر هەڤژینا من بوون ل مزگەفتا كەعبەیێ (ئانكو نەزر كربوو) من پرسیارا عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی كر و ئیبن شیهاب ژی ل دەڤ وی بوو، گۆت: من گۆت: رۆژی ل سەرن ؟ ئیبن شیهابی گۆت ئیعتیكاف بێ رۆژی نینە، ئینا عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی گۆت: ئەڤە ژ پێغەمبەرییە (ﷺ)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: ژ ئەبوبەكرییە؟ گۆت: نەخێر، گۆت ژ عومەرییە؟ گۆت: نەخێر، گۆت: ژ عوسمانییە؟ گۆت: نەخێر، ئینا عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی گۆت: ئەز نابینم رۆژی ل سەر بن.**

**ئەز دەرکەفتم من تاووس و عەتائێ کورێ رەباحی دیتن، من پرسیارا وان کر؟ ئینا تاووسی گۆت: ئیبن عەباسی نەددیت رۆژی ل سەرە ژ بلی ئەو ل سەر خۆ نەزر بکەت، گۆت: و عەتائی گۆت: و ئەڤە دیتنا منە.**

٤٠٦ – عَنْ مَيْمُونٍ أَبِي حَمْزَةَ قَالَ: قَالَ لِي إِبْرَاهِيمُ ـ النَّخَعِيُّ ـ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، وَاللهِ لَقَدْ تَكَلَّمْتُ، وَلَوْ وَجَدْتُ بُدّاً مَا تَكَلَّمْتُ، وَإِنَّ زَمَاناً أَكُونُ فِيهِ فَقِيهَ أَهْلِ الكُوفَةِ زَمَانُ سُوءٍ. [مي٢٠٢].

**ژ مەیموونێ بابێ حەمزەیی گۆت: ئیبراهیمێ نەخەعی (رحمه الله) گۆت: ئەی بابێ حەمزەیی ئەز ب خودێ کەمە ئەز ئاخفتم و ئەگەر من چارەیەك دیتبا ئەز نەدئاخفتم و دەمەك هەبیت ئەز تێدا فقهزانێ خەلکێ کووفەیێ بم دەمەکێ خرابە.**

٤٠٧ – عَنْ عُمَر بْنِ إِسْحَاقَ قَالَ: لَمَنْ أَدْرَكْتُ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَكْثَرُ مِمَّنْ سَبَقَنِي مِنْهُمْ، فَمَا رَأَيْتُ قَوْماً أَيْسَرَ سِيرَةً، وَلاَ أَقَلَّ تَشْدِيداً مِنْهُمْ. [مي١٢٨].

* إسناده جيد.

**ژ عومەرێ کورێ ئیسحاقی (رحمه الله) گۆت ئەوێت ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز گەهشتیمێ پترن ژ وان یێت د بەری من راکرین (ئانکو وەغەر کرین) من کەس ژ رێڤەبرنا ژیانێ ساناهیتر و نەکێمتر ژ توندکارییێ ژ وان نەدیتییە.**

٤٠٨ – عَنْ جَعْفَرِ بْنِ إِيَاسٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: مَا لَكَ لاَ تَقُولُ فِي الطَّلاَقِ شَيْئاً؟ قَالَ: مَا مِنْهُ شَيْءٌ إِلاَّ قَدْ سَأَلْتُ عَنْهُ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُحِلَّ حَرَاماً، أَوْ أُحَرِّمَ حَلاَلاً. [مي١٣٦].

* إسناده صحيح.

**ژ جەعفەرێ كورێ ئیاسی (رحمه الله) گۆت: من گۆتە سەعیدێ كورێ جوبەیری (رحمه الله) تە خێرە بۆچی تو چو د بەردانێدا نابێژی؟ ئینا گۆت: چو ژێ نەمایە پرسیار ژ من نەهاتبیتە كرن، بەلێ من نەڤێت ئەز حەلالەكی حەرام كەم یان حەرامەكی حەلال كەم.**

٤٠٩ - عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقَدْ أَدْرَكْتُ فِي هَذَا المسْجِدِ عِشْرِينَ وَمِائَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، وَمَا مِنْهُمْ مِنْ أَحَدٍ يُحَدِّثُ بِحَدِيثٍ إِلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ الحَدِيثَ، وَلاَ يُسْأَلُ عَنْ فُتْيَا إِلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ الفُتْيَا. [مي١٣٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبی لەیلایێ (رحمه الله) گۆت: ئەز ل ڤێ مزگەفتێ گەهشتمە سەد و بیست سەحابان ژ خەلكێ مەدینەیێ و كەس ژ وان نەبوو ئاخفتنەكێ باخڤیت ئەگەر حەزنەكربا هەڤالێ وی ل شوینا وی ئاخفتبا و بەسی وی كربا، و پرسیارا شەرعی ژێ نەدهاتە كرن ئەگەر حەز نەكربا برایێ وی ل شوینا وی بەرسڤ دابا و بەسی وی كربا.**

٤١٠ - عَن ابْنِ المُنْكَدِرِ قَالَ: إِنَّ العَالِمَ يَدْخُلُ فِيمَا بَيْنَ اللهِ وَبَيْنَ عِبَادِهِ، فَلْيَطْلُبْ لِنَفْسِهِ المخْرَجَ.

[مي١٣٩].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن مونكەدری (رحمه الله) گۆت: زانا دكەڤیتە د ناڤبەرا خودێ و بەندەیێت ویدا، ڤێجا بلا دەركەفتنێ بۆ خۆ بخوازیت (ئانكو چاوا دێ خۆ ژ بەرپرساتییێ رزگار كەت).**

٤١١ - عن الصَّلْتِ بْنِ رَاشِدٍ قَالَ: سَأَلْتُ طَاوُساً عَنْ مَسْأَلَةٍ، فَقَالَ لِي: كَانَ هَذَا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ آللهِ؟ قُلْتُ: آللهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا أَخْبَرُونَا عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ أَنَّهُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! لاَ تَعْجَلُوا

بِالبَلاَءِ قَبْلَ نُزُولِهِ، فَيُذْهَبُ بِكُمْ هُنَا وَهُنَا، فَإِنَّكُمْ إِنْ لَمْ تَعْجَلُوا بِالبَلاَءِ، قَبْلَ نُزُولِهِ، لَمْ يَنْفَكَّ المسْلِمُونَ أَنْ يَكُونَ فِيهِمْ مَنْ إِذَا سُئِلَ سَدَّدَ، وَإِذَا قَالَ: وُفِّقَ.[مي١٥٥].

* إسناده صحيح.

**ژ سەلتێ كورێ راشدی (رحمه الله) گۆت: من ژ پرسەكێ پرسیار ژ تاووسی كر، ئینا گۆته من، ئەڤە ژی بوویە؟ من گۆت: بەلێ، گۆت: بێژە ب خودێ. من گۆت: ب خودێ، پاشی گۆت: ب راستی هەڤالێت مە ژ مەعازێ كورێ جەبەلی گەهاندییە مە، ب راستی گەلی مرۆڤان لەزێ ل بەلایێ نەكەن بەری بهێت، ڤێجا هەوە هۆسا و هۆسا ببەت، ب راستی ئەگەر هوین لەزێ ل هاتنا بەلایێ نەكەن بەری ئەو بهێت دێ هەر د ناڤ موسلماناندا هەبن ئەگەر پرسیار ژێ هاتە كرن راست بكەت و ئەگەر ئاخفت راستییێ بێژیت.**

٤١٢ – عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ أَبُو سَلَمَةَ البَصْرَةَ، أَتَيْتُهُ أَنَا وَالحَسَنُ، فَقَالَ لِلْحَسَنِ: أَنْتَ الحَسَنُ، مَا كَانَ أَحَدٌ بِالبَصْرَةِ أَحَبَّ إِلَيَّ لِقَاءً مِنْكَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُفْتِي بِرَأْيِكَ. فَلاَ تُفْتِ بِرَأْيِكَ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ سُنَّةٌ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، أَوْ كِتَابٌ مُنْزَلٌ. [مي١٦٥].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی نەزرەیی (رحمه الله) گۆت: دەمێ ئەبو سەلەمە (رحمه الله) هاتییە بەسرا ئەز و حەسەن هاتینە دەڤ، گۆتە حەسەنی تو حەسەنی، كەس ژ بەسرایێ ژ تە من پێخۆشتر نەبوو ببینم و ئەو ژی چونكی گەهشتییە من تو دویف بۆچۆنا خۆ بەرسڤا شەرعی ددەی ل دویف بۆچۆنا خۆ بەرسڤا شەرعی نەدە ژ بلی حەدیسەك بیت ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یان ژ كتێبەكا هاتییە خوار.**

## ٤١ ـ باب: اعظام العلم وصیانته.

## بابەتێ: مەزنكرنا زانینێ و پاراستنا وێ.

٤١٣ – عَن الحَسَنِ: أَنَّهُ دَخَلَ السُّوقَ فَسَاوَمَ رَجُلاً بِثَوْبٍ فَقَالَ: هُوَ لَكَ بِكَذَا وَكَذَا، وَاللهِ لَوْ كَانَ غَيْرَكَ مَا أَعْطَيْتُهُ، فَقَالَ: فَعَلْتُمُوهَا! فَمَا رُئِيَ بَعْدَهَا مُشْتَرِياً مِنَ السُّوقِ، وَلاَ بَائِعاً، حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ. [مي٥٩٢].

* إسناده صحيح.

**ژ حەسەنی (رحمه الله) ئەو چۆ بازاری و جلكەك د گەل زەلامەكی بازر كر، ئینا گۆت: ئەو بۆ تە ب هندێ و هندێ و ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر بۆ ئێكێ دی با من ب هندێ نەددایێ، ئینا گۆت: هەوە ئەڤە ژی كر، پشتی هینگێ نە بكڕ ل بازاری هاتە دیتن و نە فرۆشیار هەتا گەهشتییە خودایێ خۆ.**

٤١٤ – عَنْ عُبَيْدِ بْنِ الحَسَنِ قَالَ: قَسَمَ مُصْعَبُ بْنُ الزُّبَيْرِ مَالاً فِي قُرَّاءِ أَهْلِ الكُوفَةِ، حِينَ دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ، فَبَعَثَ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَعْقِلٍ بِأَلفَيْ دِرْهَمٍ، فَقَالَ لَهُ: اسْتَعِنْ بِهَا فِي شَهْرِكَ هَذَا. فَرَدَّهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَعْقِلٍ وَقَالَ: لَمْ نَقْرَإِ القُرْآنَ لِهَذَا. [مي٥٩٤]

* إسناده صحيح.

**ژ عوبەیدێ كوڕێ حەسەنی (رحمه الله) گۆت: دەمێ هەیڤا رەمەزانێ هاتی موسعەبێ كوڕێ زوبەیری پارە ل سەر قورئانخوینێت كووفە بەلاڤ كر، دو هزار دەرهەم بۆ عەبدولرەحمانێ كوڕێ مەعقەلی هنارتن و گۆتێ هاریكارییا خۆ د ڤێ هەیڤێدا پێ بكە، ئینا عەبدولرەحمانێ كوڕێ مەعقەلی زڤراندن و گۆت: مە قورئان بۆ ڤێ نەخواندییە.**

٤١٥ – عن عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ: مَنْ أَرْبَابُ العِلْمِ؟ قَالَ: الَّذِينَ يَعْمَلُونَ بِمَا يَعْلَمُونَ، قَالَ: فَمَا يَنْفِي العِلْمَ مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ؟ قَالَ: الطَّمَعُ. [مي٥٩٥].

* إسناده صحيح.

**ژ عوبەیدوللایێ کورێ عومەری (رضي الله عنه) عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆتە عەبدوللایێ کورێ سەلامی: خودانێت زانینێ کینە؟ گۆت: ئەوێت کار ب وێ یا زانی دکەن. گۆت: چ تشتە زانینێ د سینگێ زەلاماندا ناهێلیت؟ گۆت: تەماعی.**

٤١٦ – عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: تَعَلَّمُوا العِلْمَ، فَإِذَا عَلِمْتُمُوهُ فَاكْظِمُوا عَلَيْهِ، وَلاَ تَشُوبُوهُ بِضَحِكٍ وَلاَ بِلَعِبٍ فَتَمُجَّهُ القُلُوبُ. [مي٦٠٢].

* إسناده صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: فێری زانینێ ببن و ئەگەر هوین فێر بوون باش بگرن و نە ب کەنی و نە ب یارییان تێکەل نەکەن پاشی دلان نەڤێت و قەبویل ناکەن.**

## ٤٢ . باب: يكره للعالم ان يمشي الرجال وراءه.

## بابەتێ: نەباشە بۆ زانای زەلام د دویڤ ویرا بهێن.

٤١٧ – عَنْ سُلَيْمِ بْنِ حَنْظَلَةَ قَالَ: أَتَيْنَا أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ لِنَتَحَدَّثَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ قُمْنَا وَنَحْنُ نَمْشِي خَلْفَهُ، فَرَهِقَنَا عُمَرُ، فَتَبِعَهُ فَضَرَبَهُ عُمَرُ بِالدِّرَّةِ، قَالَ: فَاتَّقَاهُ بِذِرَاعَيْهِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! مَا نَصْنَعُ؟ قَالَ: أَوَ مَا تَرَى فِتْنَةً لِلْمَتْبُوعِ مَذَلَّةً لِلتَّابِعِ. [مي٥٤٠].

* إسناده جيد.

**ژ سولەیمانێ کورێ حەنزەلەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم هاتینە دەڤ ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه) دا د گەل باخڤین، ڤێجا دەمێ رابووی ئەم ژی رابووین و ئەم د دویڤرا دچۆین،**

**عومەر (ﷺ) گەهشتە مە و دویف چۆ و عومەری قامچی دانایێ، و وی ب هەردو دەستێت خۆ خۆ پاراست و گۆت: ئەو تو چ دکەی ئەی میرێ باوەریداران؟! گۆت: ما تو نا بینی دویف هاتنا وان تاقیکرنە بۆ دویکەفتی و شکاندنە بۆ دویفچۆیی.**

٤١٨ – عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: كَانُوا يَكْرَهُونَ أَنْ تُوطَأَ أَعْقَابُهُمْ. [مي ٥٤١].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبراهیمی (ﷺ) گۆت: وان (مەبەستا وی پێ هەڤال و هۆگرێت پێغەمبەرینە) نەدڤیان خەلك د دویف وانرا بچن.**

٤١٩ – عن سُفْيَانَ، عَنْ أُمَيٍّ قَالَ: مَشَوْا خَلْفَ عَلِيٍّ، فَقَالَ: عَنِّي خَفْقَ نِعَالِكُمْ، فَإِنَّهَا مُفْسِدَةٌ لِقُلُوبِ نَوْكَى الرِّجَالِ.

[مي ٥٥١].

**سوفیانی (ﷺ) ژ ئومەیی گۆت: د دویف عەلیرا چۆن، ئینا گۆت: ڕپڕپا شمکێت خۆ ژ من دویر بێخن، ب راستی ئەو خرابکەرە بۆ دلێت زەلامێت کێم عەقل.**

### ٤٣ . باب: أخذ الاجرة على تعليم القران.

### بابەتێ: وەرگرتنا کرێ ل سەر فێرکرنا قورئانێ.

٤٢٠ – عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: عَلَّمْتُ نَاساً مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ الكِتَابَ وَالقُرْآنَ، فَأَهْدَى إِلَيَّ رَجُلٌ مِنْهُمْ قَوْساً، فَقُلْتُ: لَيْسَتْ بِمَالٍ، وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللهِ عزّ وجل، لآتِيَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَلأَسْأَلَنَّهُ، فَأَتَيْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، رَجُلٌ أَهْدَى إِلَيَّ قَوْساً مِمَّنْ كُنْتُ أُعَلِّمُهُ الكِتَابَ وَالقُرْآنَ، وَلَيْسَتْ بِمَالٍ، وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللهِ؟ قَالَ: **(إِنْ كُنْتَ تُحِبُّ أَنْ تُطَوَّقَ طَوْقاً مِنْ نَارٍ فَاقْبَلْهَا)**.

[د٣٤١٦، ٣٤١٧/ جه٢١٥٧].

* صحيح.

**ژ عوبادەیێ کوڕێ سامتی (رضي الله عنه) گۆت: من نفیسین و قورئان نیشا هندەك خەلکێ سوففەیێ دا (هندەك کەسێت فەقەتیایی بوون ژ مرۆڤێت خۆ و ژ هەژارییا خۆ ل مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) دمان ل هیڤیا خێر و سەدەقەیان) زەلامەکی ژ وان کڤانەك دیاری دا من. من گۆت: نە دراڤە (نە پارەیە) و ئەز دێ د رێکا خودێدا ب کار ئینم و دێ هێمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و پرسیارێ ژێ کەم، ئەز هاتمە دەڤ و من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ زەلامەکی ژ وان یێت من نفیسین و قورئان نیشا دای کڤانەك دیاری دا من و نە پارەیە و ئەز دێ د رێیا خودێدا هاڤێژم؟ گۆت: (ئەگەر تە بڤێت ب تۆکەکا ئاگری بهێیە تۆککرن قەبویل بکە).**

٤٢١ – عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: عَلَّمْتُ رَجُلاً الْقُرْآنَ، فَأَهْدَى إِلَيَّ قَوْساً، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (إِنْ أَخَذْتَهَا أَخَذْتَ قَوْساً مِنْ نَارٍ) فَرَدَدْتُهَا. [جه٢١٥٨].

* صحيح.

**ژ ئوبەیێ کوڕێ کەعبی (رضي الله عنه) گۆت: من قورئان نیشا زەلامەکی دا، کڤانەك دیاری دا من، من ئەڤە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئینا گۆت: (ئەگەر تە هەلگرت تە کڤانەك ژ ئاگری هەلگرت، ئینا من زڤراندەڤە).**

## ٤٤ ـ باب: تعليم الصغار.

## بابەتێ: فێرکرنا بچویکان.

٤٢٢ – عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ كَانَ يَجْمَعُ بَنِيهِ فَيَقُولُ: يَا بَنِيَّ، تَعَلَّمُوا، فَإِنْ تَكُونُوا صِغَارَ قَوْمٍ، فَعَسَى أَنْ تَكُونُوا كِبَارَ آخَرِينَ، وَمَا أَقْبَحَ عَلَى شَيْخٍ يُسْأَلُ لَيْسَ عِنْدَهُ عِلْمٌ. [مي٥٧١]

[انظر: ٨٥، ٣٢٨].

ژ عورمیێ کورێ زوبەیری (ﷺ): وی بچویکێت خۆ کۆم دکرن و دگۆت: زارۆکێت من فێر ببن، ئەگەر ئەڤرۆ هوین بچویکێت خەلکی بن، من هیڤییە ببنە مەزنێت هندەکێت دی، و چو ژ وێ بۆ پیرەمێری کرێتتر نینە پرسیار ژێ بهێتە کرن و چو زانین ل دەڤ نەبیت.



## الفصل الأول: جمع اقران

## پشکا ئێکێ: کۆمکرنا قورئانا پیرۆز

### ١ ـ باب: نزول الوحي ومدة ذلك.

### بابەتێ: هاتنەخوارا وەحی و دەمێ وێ.

٤٢٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**ما مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلاَّ أُعْطِيَ ما مِثْلُه آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وإِنَّمَا كانَ الَّذِي أُوتِيتُهُ وَحْياً أَوْحاهُ اللهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ٤٩٨١/ م١٥٢].

**ژ ئەبی هورەیرەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژ پێغەمبەران پێغەمبەرەك نینە ئەگەر خودێ هندی یا دایێ ژ موعجیزەیان مرۆڤان باوەری پێ نەئینابیت و ب راستی یا خودێ دایە من وەحییە خودێ وەحی بۆ من هنارتی[1] و ئەز هیڤی دکەم من رۆژا قیامەتێ دویکەفتی پتر هەمیان هەبن).**

٤٢٤ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ اللهَ تَعَالَى تَابَعَ عَلَى رَسُولِهِ (ﷺ) الْوَحْيَ قَبْلَ وَفاتِهِ، حَتَّى تَوَفَّاهُ أَكْثَرَ ما كانَ الْوَحْيُ، ثُمَّ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَعْدُ. [خ٤٩٨٢/ م٣٠١٦].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: خودایێ مەزن وەحی بەردەوام و دویڤێك بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا خوارێ بەری مرنا وی، و بەری بمریت پترییا قورئانێ بۆ ئینا خوار[2] پاشی پێغەمبەر (ﷺ) چۆ بەر دلۆڤانییا خودێ و وەحی هاتە برین.**

---

(١) کو قورئانە و موعجیزەکا بەردەوامە.

(٢) چونکی گەلەك موسلمان دبوون و گەلەك شاند دهاتنە دەڤ.

٤٢٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَكَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ، وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [خ٣٩٠٣، (٣٨٥١)/ م٢٣٥١].

- وفي رواية لمسلم: أَقَامَ بمكة ثَلاثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحى إِلَيْهِ، وبالمدينَةِ عَشْراً.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سێزدە سالان ما ل مەکەهێ، و ل شێست و سێ سالییێ چۆ بەر دلۆڤانییا خودێ.**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: سێزدە سالان ل مەکەهێ ما و دەه سالان ل مەدینەیێ وەحی بۆ دهات و ژییێ وی شێست و سێ سال بوون چۆ بەر دلۆڤانییا خودێ.**

٤٢٦ - (خ) عَنْ عائِشَةَ وَابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهم: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَبِثَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، يُنْزَلُ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ، وَبِالمَدِينَةِ عَشْراً. [خ٤٤٦٤، ٤٤٦٥ (٣٨٥١)].

**ژ عائیشایێ و ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت)، پێغەمبەر (ﷺ) دەه سالان ل مەکەهێ ما و دەه سالان ل مەدینەیێ ما قورئان بۆ دهاتە خوارێ.**

٤٢٧ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما في قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِي لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ [القدر: ١]. قَالَ: أُنْزِلَ القُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً فِي لَيْلَةِ القَدْرِ إلى السَّمَاءِ الدُّنْيَا وَكَانَ بِمَوْقِعِ النُّجومِ، وَكَانَ اللهُ يُنَزِّلُهُ عَلَى رَسُولِهِ (ﷺ) بَعْضَهُ فِي أَثَرِ بَعْضٍ قَالَ: وَقَالوا: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ٣٢﴾[الفرقان:٣٢]. [ك٢٨٧٨].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عەباس (رضي الله عنهما) د گۆتنا خودێدا ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾[1]. گۆت: قورئان ئێک جار پێکڤە د شەڤا ب قەدردا یا هاتییە عەسمانێ دنیایێ، و ئەو ل جهێ ستێران بوو، و**

---

[1] **رامان ب کورتی: مە قورئان یا د شەڤا ب قەدردا ئینایە خوارێ .**

**خودێ ب سەر پێغەمبەرێ خودێدا (ﷺ) هندەك ل دویڤ هندەکێ دئینا خوار، گۆت: و گۆتن: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا﴾[١].**

## ٢ ـ باب ما بين الدفتين.

## بابەتێ: یا د ناڤبەرا هەردو لایاندا.

٤٢٨ - (خ) عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَشَدَّادُ بْنُ مَعْقِلٍ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، فَقَالَ لَهُ شَدَّادُ بْنُ مَعْقِلٍ: أَتَرَكَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: ما تَرَكَ إِلاَّ ما بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ.

قَالَ: وَدَخَلْنَا عَلَى مُحَمَّدِ ابْنِ الحَنَفِيَّةِ، فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: ما تَرَكَ إِلاَّ ما بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ. [خ٥٠١٩].

**ژ عەبدولعەزیزێ کورێ روفەیعی (رحمه الله) گۆت: ئەز و شەددادێ کورێ مەعقیلی چۆینە دەڤ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ئینا شەددادێ کورێ مەعقیلی گۆتێ: ئەرێ پێغەمبەری (ﷺ) تشتەك پاش خۆ هێلایە (مەبەست یێ نفیسی)؟ گۆت: چو نەهێلایە ئەڤا د ناڤبەرا ڤان هەردو کاڤلاناندا نەبیت کۆ قورئان.**

**گۆت: و ئەم چۆینە دەڤ موحمەدێ کورێ حەنیفەیێ مە پرسیار ژێ کر؟ گۆت: چو نەهێلایە یا د ناڤبەرا ڤان هەردو کاڤلاناندا نەبیت کو قورئانە.**

[١] رامان ب کورتی: و ئەوێت گاور بووین گۆتن: بلا قورئان ب جارەکێ و پێکڤە بۆ هاتبایە خوارێ [وەکی هەمی کتێبێت دی یێت عەسمانی]. پیچ پیچە و جودا جودا ئەم قورئانێ بۆ تە دئینینە خوارێ، دا دلێ تە پێ موکوم بکەین و ب هێز بێخین [و تو دلێت موسلمانان پێ ب هێز بێخی، دا ب ساناهی ژ بەر بکەن و تێ بگەهن، و دا بەردەوام بەرسڤا گاوران بدەی، ل سەر وان تشتێت وان دڤێن تە تێدا ناسێ بکەن]، و مە قورئان ئایەت ئایەت [نانکو پیچ پیچە] ب تە [ب رێکا جبریلی] دا خواندنێ.

## ٣ ـ باب اول ما نزل واخر ما نزل.

## بابەتێ: یێ ئێكێ هاتییە خوارێ و یێ دویماهییێ هاتییە خوارێ.

٤٢٩ – (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ كَامِلَةً بَرَاءَةٌ، وَآخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ خاتِمَةُ سُورَةِ النِّسَاءِ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ [النساء:١٧٦].

[خ٤٣٦٤/ م١٦١٨].

- وفي رواية لهما: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾. [خ٤٦٥٤].

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) گۆت دویماهی سۆرەت پێكڤە هاتییە خوارێ سۆرەتا بەرائە بوو (ئانكو سۆرەتا تەوبە) و دویماهی سۆرەت دویماهییا وێ هاتییە خوارێ سۆرەتا نیساء بوو ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلْ الله يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ﴾ هەی موحەممەد، پرسیارا میراتێ وی مری ئەوێ نە باب و باپیر و نە كوڕ و نە نەڤی هەین، ژ تە دكەن كا چاوانە بێژە: ژ خۆ خودێ دێ بۆ هەوە میراتێ وی دیاركەت.**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: دویماهی ئایەت هاتییە خوارێ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ .....﴾.**

٤٣٠ – (م) عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: قَالَ لِيَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تَعْلَمُ آخِرَ سُورَةٍ نَزَلَتْ مِنَ الْقُرْآنِ، نَزَلَتْ جَمِيعاً؟ قُلْتُ: نَعَمْ ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴿١﴾﴾ [النصر] قَالَ: صَدَقْتَ.

[م٣٠٢٤].

**ژ عوبەیدوللایێ كوڕێ عەبدوللایێ كوڕێ عوتبەی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عەباسی گۆتە من، تو دزانی دویماهی سۆرەت پێكڤە هاتییە خوارێ؟ من گۆت: بەلێ، ﴿إذا جاء نَصْرُ اللّٰهِ وَالْفَتْحُ﴾ گۆت تو راست دبێژی.**

٤٣١ – عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: هَلْ تَقْرَأُ سُورَةَ الْمَائِدَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَإِنَّهَا آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَلاَلٍ؛ فَاسْتَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَرَامٍ؛ فَحَرِّمُوهُ. وَسَأَلْتُهَا عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: الْقُرْآنُ. [حم٢٥٥٤٧].

* إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح.

**ژ جوبەیرێ كورێ نوفەیری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز چۆمە دەڤ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: تو سۆرەتا مائیدە دخوینی؟ گۆت: من گۆت: بەلێ، گۆت: ئەو دویماهی سۆرەتە هاتییە خوارێ، هەر حەلالەكێ هوین تێدا دبینن حەلال بزانن، و ئەوا هەوە حەرام تێدا دیت حەرام بزانن، و من پرسیارا رەوشتێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژێ كر؟ گۆت: قورئان بوو.**

٤٣٢ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: إِنَّ أَوَّلَ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ [العلق: ١]. [هق٩/٦].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ب راستی یا بەراهیێ ژ قورئانێ هاتییە خوارێ ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِى خَلَقَ﴾**

٤٣٣ – عَنْ أَبِي رَجَاء العُطَارِدِيِّ، عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: تَعَلَّمْنَا القُرْآنَ فِي المسْجِدِ ـ يعني: مَسْجِدَ البَصْرَةِ ـ وكنا نَجْلِسُ حِلَقاً حِلَقاً، وَكَأَنَّما أَنْظُرُ إِلَيْه بَيْنَ ثَوْبَيْنِ أَبْيَضَيْنِ، وَعَنْهُ أَخَذْتُ هذهِ السُّورةَ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١﴾ [العلق] قَالَ: وَكَانَتْ أَوَّلَ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ عَلى مُحَمَّدٍ (ﷺ). [ك٢٨٧٢].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئەبی رەجائێ عەتاردی، ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری، (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل ڤێ مزگەفتێ فێری قورئانێ بووین ـ ئانكو مزگەفتا بەسرایێ ـ و ئەم خەلەك خەلەك**

**دروینشتینە خوارێ، و هەر وەکی ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمێ و ئەو یێ د دو جلکێت سپیدا بوو و ژ وی من ئەڤ سۆرەتە وەرگرت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ گۆت: ئەڤە سۆرەتا ئێکێ بوو ل سەر موحەممەدی (ﷺ) هاتییە خوارێ.**

٤٣٤ - عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رضي الله عنه قَالَ: آخِرُ مَا نَزَلَ مِنَ الْقُرْآنِ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [التوبة: ١٢٨]. [ك٣٢٩٦].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئوبەیێ کورێ کەعبی، (رضي الله عنه) گۆت: دویماهی ژ قورئانێ هاتییە خوارێ: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾[1].**

## ٤ ـ باب: جمع القران الكريم.

## بابەتێ: کۆمکرنا قورئانێ.

٤٣٥ - (خ) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ وَعِنْدَهُ عُمَرُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ: إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ فِي الْمَوَاطِنِ كُلِّهَا، فَيَذْهَبَ قُرْآنٌ كَثِيرٌ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ، قُلْتُ: كَيْفَ أَفْعَلُ شَيْئاً لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ عُمَرُ: هُوَ وَاللهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي فِي ذلِكَ حَتَّى شَرَحَ اللهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَ عُمَرَ، وَرَأَيْتُ فِي ذلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ.

---

[1] **رامانا ئایەتێ ب کورتی: ب ڕاستی پێغەمبەرەکێ وەسا یێ ژ هەوە بۆ هەوە هاتی، وەستیانا هەوە ل سەر وی یا گرانە [ئانکو وی پێ نەخۆشە هوین زەحمەتێ بکێشن و ئێزا بگەهیتە هەوە]، ل سەر ڕاستەڕێکرنا هەوە یێ ڕژدە [و یێ هشیارە ل سەر باوەرییا هەوە]، و بۆ خودان باوەران زێدە دلسۆژ و ب ڕەحمە.**

قال زَيْدٌ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَإِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ، قَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ، فَاجْمَعْهُ.

قَالَ زَيْدٌ: فَوَاللهِ! لَوْ كَلَّفَنِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كانَ بِأَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا كَلَّفَنِي مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلاَنِ شَيْئاً لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)؟ قَالَ أَبُو بكْرٍ: هُوَ وَاللهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ يَحُثُّ مُرَاجَعَتِي حَتَّى شَرَحَ اللهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ اللهُ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَرَأَيْتُ فِي ذلِكَ الَّذِي رَأَيَا.

فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَالرِّقَاعِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجالِ، فَوَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ: ﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ﴾ [التوبة:١٢٨] إِلَى آخِرِهَا مَعَ خُزَيْمَةَ. أَوْ أَبِي خُزَيْمَةَ. فَأَلْحَقْتُهَا فِي سُورَتِهَا، فَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَيَاتَهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ عزّ وجل، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ. [خ٧١٩١، (٢٨٠٧)].

- وفي رواية: قَالَ: نَسَخْتُ الصُّحُفَ فِي المَصَاحِفِ، فَفَقَدْتُ آيَةً مِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ، كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقْرأُ بِهَا، فَلَمْ أَجِدْهَا إِلاَّ مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ، الَّذِي جَعَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) شَهَادَتَهُ شَهَادَةَ رَجُلَيْنِ، وَهْوَ قَوْلُهُ: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ﴾ [الأحزاب:٢٣]. [خ٢٨٠٧].

**ژ زەیدێ كورێ سابتی، (رضي الله عنه) گۆت: ئەبوبەكری هنارتە دویڤ منڕا د شەڕێ یەمامەدا، و عومەرێ كورێ خەتتابی ژی ل نك بوو، ئەبوبەكری گۆت: عومەر یێ هاتییە نك من و یێ دبێژت ب راستی شەڕ و ب هەڤچۆن و پێكداداں یێت گەرم بووین، و گەلەك خواندەڤانێن ژبەركەرێن قورئانێ یێن دهێنە شەهیدكرن، ئەز دترسم ژ ناڤچۆنا ڤان خواندەڤانان قورئان ژی گەلەك ژ ناڤ بچیت، ئەز حەز دكەم و پێشنیار دكەم تو فەرمانێ ب كۆمكرنا قورئانێ بدەی، ڤێجا دەمێ عومەری ئەڤ پێشنیارە پێشكێشی ئەبوبەكری كری، ئەبوبەكری گۆت: ئەم دێ چاوا كارەكی كەین و پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) نەكری!؟**

ئینا عومەری گۆت: ئەز ب خودێ كەم ئەز دبینم ئەڤە خێرە و باشە و چو زیان تێدا نینە، هۆسا عومەری گەلەك جاران گۆتە من و دوبارە كر و پرسیارا من كر دا بۆچۆنا من وەرگریت.

ڤێجا زەیدی گۆت: ئەبوبەكری گۆتە من: تو زەلامەكی و تو گەنجەكی و لاوی و ب ژیر و عەقلمەندی و چو جاران تۆمەتێت خیانەتێ و درەوێ ل سەر تە نینن، و تو نەهاتییە گونەهباركرن، و ئەم تە گونەهبار نابینین، و ب راستی تە وەحی د حازربینا پێغەمبەریدا دنڤیسی، هەتا دویماهییێ، ڤێجا هەرە ل دویڤ قورئانێ بگەڕە و كۆم بكە و خرڤەكە.

زەیدی گۆت: ئەز ب خودێ كەم ئەگەر ئەز هاتبام راسپاردن ب ڤەگوهاستنا چیایەكی ژ جهێ وی ل سەر من گرانتر نەبوو ژ ئەڤ چەندا فەرمانا من پێ هاتییە كرن؛ چونكی ئەمانەتەكی گەلەك مەزنە.

زەیدی گۆت: من ژی گۆت چاوا دێ كارەكی ئەنجام دەین و پێغەمبەری نەكربیت!؟ گۆت: ئەبوبەكری گۆتە من ئەز ب خودێ كەم ئەڤە كارەكی باشە و خێرە، ئەبوبەكری گەلەك جاران گۆتە من هەتا خودێ دلێ من بۆ ڤی كاری ڤەكری هەروەكی خودێ دلێ ئەبوبەكری و عومەری بۆ ڤی كارێ پیرۆز ڤەكری.

زەیدی گۆت: ئەز ل دویڤ كۆمكرنا قورئانێ گەریام و ل دویڤ چۆم و مە كۆم كر ژ ئەڤا ل سەر تابلۆیان و ل سەر بەرێ سپی یێ تەنك و ل سەر كەڤلێت گیانەوەران یێت گەماركری و ل سەر تایێت دارقەسپان و... دهاتە نڤیسین، و دیسا ئەڤا د سینگێ خواندەڤاناندا هاتییە ژبەركرن.

و دویماهییا سۆرەتا تەوبە ﴿لقد جَاءَكُمْ رَسُولٌ من أَنْفُسِكُمْ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ من ل دەڤ خوزەیمە یان بابێ خوزەیمەی دیت و من دا د گەل، و قورئانا نڤیسایی ل دەڤ ئەبوبەكری بوو د ژیانا ویدا هەتا خودایێ هەر ب هێز و مەزن برییە دەڤ خۆ، پاشی ل

**دەڤ عومەری بوو د ژیانا ویدا هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ پاشی ل دەڤ حەفسایا كچا عومەری.**

- **و د ڤەگەرەكێدا: من ژ بەرپەڕان دنڤیسی و من ئایەتا سۆرەتا ئەحزاب گوه ل پێغەمبەرێ خودێ دبوو (ﷺ) دخواند من ل دەڤ كەسێ نڤیسی نەدیت، خوزەیمەیێ كوڕێ سابتێ ئەنساری نەبیت، ئەوێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شەهدەیا وی كرییە شەهدەیا دو زەلامان، ئەو ژی گۆتنا وی بوو:** ﴿من الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا ما عَاهَدُوا اللَّهَ عليه﴾.

## ٥ ـ باب: نسخ القرآن في عهد عثمان.

## بابەتێ: كۆپیكرنا قورئانێ ل سەر دەمێ عوسمانی.

٤٣٦ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمانَ، وَكانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّامِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلاَفُهُمْ فِي الْقِرَاءَةِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمانَ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! أَدْرِكْ هذِهِ الأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلاَفَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى. فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ: أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي المصَاحِفِ، ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ، فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمانَ، فَأَمَرَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ، وعَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدَ بْنَ الْعاصِ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنَسَخُوهَا فِي المصَاحِفِ، وقَالَ عُثْمانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلاَثَةِ: إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ فاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ، فَفَعَلُوا، حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي المصَاحِفِ، رَدَّ عُثْمانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ، وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا، وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنَ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ، أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ. [خ٤٩٨٧، (٣٥٠٦)].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه): حوزەیفەیێ كوڕێ یەمانی هاتە نك (عثمان)ی دەمێ شەڕێ شامێ دكر و ڤەكرنا ئەرمینیا و ئازەربێجان د گەل خەلكێ عیراقێ، حوزەیفە**

**ژ نەوەکئێکی و جوداییا د خواندنێدا ترسیا، (نەکو ببیت ئەگەرێ فتنێ و دوبەرەکی و راکێشانێ) ژ بەر هندێ حوزەیفەی گۆتە (عثمان)ی (رضي الله عنه) بگەهە ڤێ ئوممەتێ بەری ئەنجامێ ڤێ جیاوازییێ وەکی جیاوازییا جوهی و فەلا لێ بێت، ئینا (عثمان)ی فرێکرە دویف حەفسایێرا وێ (مصحف)ێ (ئەڤا عومەری تەسلیمی وێ کری و ل نك وێ هێلایی، ئەڤا ل سەر دەمێ ئەبوبەکری هاتییە کۆمکرن) بۆ مە بهنێرە ئەم د موسحەفاندا کۆپی بکەین پاشی دێ بۆ تە زڤرینینەڤە، حەفسایێ ئەو موسحەف بۆ عوسمانی هنارت. ئینا عوسمانی فەرمان ل زەیدێ کوڕێ سابتی و عەبدوللایێ کوڕێ زوبەیری و سەعیدێ کوڕێ عاسی و عەبدولرەحمانێ کوڕێ حارسێ کوڕێ هیشامی کر دچەند موسحەفەکاندا کۆپی کرن، و عوسمانی گۆتە کۆما سێیان یێت قورەیشی: ئەگەر هوین و زەید جیاواز بوون د هندەك لایێن خواندنێدا پشتبەستنێ ب زاراڤێ قورەیشییان بکن، و ب زاراڤێ وان بنڤیسن؛ چونکی قورئان یا ب زمانێ قورەیشییان هاتییە خوار، وان ئەو کر ڤێجا هەتا وان ژ بەر وێ موسحەفێ چەند موسحەف نڤیسین عوسمانی ئەو موسحەفە بۆ حەفسایێ زڤراندەڤە و بۆ هەر لایەکی موسحەفەك ژ وان یێت نڤیساییێن فرێکر و فەرمان کر ژ بلی وان قورئان د چ دا بیت بهێتە سۆتن.**

٤٣٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) لاَ يَعْرِفُ فَصْلَ السُّورِ حَتَّى تَنَزَّلَ عَلَيْهِ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾. [د٧٨٨].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دویماهیا سۆرەتان نەدزانی هەتا ﴿بِسْمِ اللهِ الرحمن الرَّحِيمِ﴾ بۆ هاتییە خوارێ (و بوویە ناڤبڕ د ناڤبەرا سۆرەتێ و سۆرەتێدا).**

## ٦ ـ باب: نزول القرآن على سبعة احرف.

## بابەتێ: هاتنەخوارا قورئانێ ل سەر حەفت ئاوایان.

٤٣٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أَقْرَأَنِي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ، فَرَاجَعْتُهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ وَيَزِيدُنِي، حَتَّى انْتَهَى إِلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ**).

[خ٤٩٩١ (٣٢١٩)/ م٨١٩].

- زاد مسلم: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: بَلَغَنِي أَنَّ تِلْكَ السَّبْعَةَ الْأَحْرُفَ، إِنَّمَا هِيَ فِي الْأَمْرِ الَّذِي يَكُونُ وَاحِداً، لاَ يَخْتَلِفُ فِي حَلاَلٍ وَلاَ حَرَامٍ.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) دبێژت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: جبریلی قورئان ب ئێك ئاوایی بۆ من دخواند، ڤێجا ئەز بەردەوام بووم، و من هەر لێزڤرین بۆ کر (دا ب هندەك روییێت دی ژی بۆ من بێژت و بخوینت) و گۆت ئەز نەراوەستام هەتا بۆ من زێدە کری، و هەر زێدە کر هەتا گەهشتییە حەفت رەنگێت خواندنێ.**

- **و موسلمی زێدە کرییە: ئیبن شیهابی (ئانکو زوهری) گۆت گەهشتییە من (مەرەم ژ سەحابان) ئەو حەفت ئاوا د ئێك کار دایە حەلال و حەرام جوداهی نەکەڤیتە تێدا([١]).**

٤٣٩ - (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ ما أَقْرَؤُهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَقْرَأَنِيهَا، وَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ، فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ عَلَى غَيْرِ ما أَقْرَأْتَنِيهَا،

---

**(١) ئیبن حەجەر د شرۆڤەکرنا خۆدا بۆ چیرۆکا عومەری و هیشامی د هاتنەخوارا قورئانێدا ب حەفت دیالێکتان ئانکو: ب حەفت زاراڤان دبێژیت: دورستە ب کیژ زاراڤی ژ وان بێتە خواندن، و مەرەم پێ ئەو نینە هەر پەیڤەك و هەر رستەیەك ژێ ب حەفت زاراڤان بێتە خواندن، بەلکی مەرەم پێ ئەوە هژمارا خواندنان د هەر پەیڤەکێدا ژ ئێکێ هەتا حەفتایە.** (فتح الباري ج٩/ص٢٣).

فَقَالَ لِي: (أَرْسِلْهُ). ثمَّ قَالَ لَهُ: (اقْرَأْ)، فَقَرَأَ، قَالَ: (هَكَذَا أُنْزِلَتْ). ثُمَّ قَالَ لِي: (اقْرَأْ)، فَقَرَأْتُ، فَقَالَ: (هكَذَا أُنْزِلَتْ، إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَؤُوا مِنْهُ ما تَيَسَّرَ). [خ٢٤١٩/ م٨١٨].

**ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: من گوه ل هیشامێ كورێ حەكیمێ كورێ حیزامی بوو سۆرەتا فورقان دخواند، نەوەكی ئەز دخوینم و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ من خواندبوو، عومەری گۆت: نێزیك بوو ئەز تۆڕەبوونا خۆ لێ ئاشكرا بكەم، پاشی من بێهنا خۆ لێ فرەهـ كر هەتا سلاڤا ملا ڤەدای من د پستۆیێ ویڕا گرت و برە نك پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، من گۆت: من گوه لێ بوو ئەڤە یێ خواندنەكێ دخوینیت نە ئەوا تە بۆ مە خواندی، ئینا گۆت: (كا بەردە) پاشی گۆتێ: (كا بخوینە)، ئینا خواند، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هۆسا یا هاتییە خوارێ)، و پاشی گۆتە من: (بخوینە)، (عومەری) گۆت: من خواند پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هۆسا یا هاتییە خوارێ، ب راستی قورئان ل سەر حەفت روییێت خواندنێ هاتییە خوار یا بۆ هەوە ساناهی وێ بخوینن).**

٤٤٠ – (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: كُنْتُ فِي الْمَسْجِدِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ يُصَلِّي، فَقَرَأَ قِرَاءَةً أَنْكَرْتُهَا عَلَيْهِ، ثُمَّ دَخَلَ آخَرُ، فَقَرَأَ قِرَاءَةً سِوَى قِرَاءَةِ صَاحِبِهِ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الصَّلَاةَ، دَخَلْنَا جَمِيعاً عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ: إِنَّ هَذَا قَرَأَ قِرَاءَةً أَنْكَرْتُهَا عَلَيْهِ، وَدَخَلَ آخَرُ فَقَرَأَ سِوَى قِرَاءَةِ صَاحِبِهِ! فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فقَرَآا، فَحَسَّنَ النَّبِيُّ (ﷺ) شَأْنَهُمَا، فَسُقِطَ فِي نَفْسِي مِنَ التَّكْذِيبِ وَلاَ إِذْ كُنْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ ! فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَا قَدْ غَشِيَنِي، ضَرَبَ فِي صَدْرِي، فَفِضْتُ عَرَقاً، وَكَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَى اللهِ عزّ وجل فَرَقاً، فَقَالَ لِي: (**يَا أُبَيُّ، أُرْسِلَ إِلَيَّ: أَنِ اقْرَإِ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفٍ، فَرَدَدْتُ إِلَيْهِ: أَنْ هَوِّنْ عَلَى أُمَّتِي. فَرَدَّ إِلَيَّ الثَّانِيَةَ: اقْرَأْهُ عَلَى حَرْفَيْنِ، فَرَدَدْتُ إِلَيْهِ: أَنْ هَوِّنْ عَلَى أُمَّتِي. فَرَدَّ إِلَيَّ الثَّالِثَةَ: اقْرَأْهُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَلَكَ بِكُلِّ رَدَّةٍ رَدَدْتُكَهَا مَسْأَلَةٌ تَسْأَلُنِيهَا، فَقُلْتُ: اللهُمَّ اغْفِرْ لأُمَّتِي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأُمَّتِي، وَأَخَّرْتُ الثَّالِثَةَ لِيَوْمٍ يَرْغَبُ إِلَيَّ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ، حَتَّى إِبْرَاهِيمُ (ﷺ)**). [م٨٢٠].

**ژ ئوبەیێ كورێ كەعبی (خودێ ژێ رازی) گۆت: ئەم ل مزگەفتێ بووین، كەسەك هاتە**

زۆر نڤێژ کر و خواندنەك خواند من دورست نەدانا و کرێت دانا، پاشی زەلامەکێ دی هاتە ژۆر وی ژی خواندنەك خواند، نەخواندنا هەڤالێ خۆ، ڤێجا دەمێ نڤێژ خلاس بووی ئەم پێکڤە چۆینە نك پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، گۆت: ئەڤی زەلامی ب شێوەیەکی قورئان خواند من دورست نەدانا و من کرێتی بۆ دیت، و ئێکێ دی هات وی ژی نەوەکی هەڤالێ خۆ خواند، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا وان هەردو زەلامان کر، (بخوینن ئەڤا وان خواندی)، هەردوکان خواند، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) خواندنا هەردویان باش دانا، ئینا درەو دانان کەفتە دلێ من نەوەکی یا نەزانینێ (ئانکو مەزنتر) ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیتی کا چ ب سەر مندا هات، دەستێ خۆ ل سینگێ من دا خوەه ب مندا هاتە خوارێ و هەروەکی ئەز ژ ترسادا بەرێ خۆ ددەمێ خودایێ هەر ب هێز و مەزن و گۆتە من: **(ئەی ئوبەی بۆ من هاتە هنارتن[1] قورئانێ ل سەر رویەکێ بخوینە من ژێ دخواست ل سەر ئوممەتا من ساناهی بکە جارا دووێ بەرسڤا من دا ل سەر دو رویان بخوینە من دخواست ل سەر ئوممەتا من سڤك بکە جارا سێیێ بەرسڤا من دا ل سەر حەفت رویان بخوینە و بۆ تە بۆ هەر داخوازییەکا تە ژ من کری و من بەرسڤا تە دای داخوازییەکا هەی ژ من بکەی[2] ئینا من گۆت: یا خودێ گونەهێت ئوممەتا من ژێ ببە، یا خودێ گونەهێت ئوممەتا من ژێ ببە، و یا سێیێ من بۆ رۆژا هەمی مرۆڤ هەوجەی من دبن هەتا ئیبراهیم (ﷺ) هێلا)[3].**

٤٤١ – وعَنْه قَالَ: لَقِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) جِبْرِيلَ فَقَالَ: (يَا جِبْرِيلُ، إِنِّي بُعِثْتُ إِلَى أُمَّةٍ أُمِّيِّينَ: مِنْهُمْ الْعَجُوزُ، وَالشَّيْخُ الْكَبِيرُ، وَالْغُلَامُ، وَالْجَارِيَةُ، وَالرَّجُلُ الَّذِي لَمْ يَقْرَأْ كِتَاباً قَطُّ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ). [ت٢٩٤٤]

(1) ئانکو وەحی بۆ من ژ خودێ هات.

(2) ئانکو ژ وان سێ داخوازییان سێیێت دی بکە دێ دەمە تە.

(3) ئانکو رۆژا قیامەتێ ئەو رۆژا هەمی پێغەمبەر نەشێن بەرەڤانییێ بکەن پێغەمبەرێ مە نەبیت (ﷺ).

* حسن صحيح.

**ژ ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) جبریل دیت گۆتێ: (ئەی جبریل ئەز بۆ ملەتەکێ نەخویندەوار یێ هاتیمە هنارتن پیرمێر و دانعەمر و لاو و کچ و زەلامێ ئێك کتێب د بنیاتدا نەخواندی. گۆت: ئەی موحەممەد ب راستی قورئان یا ل سەر حەفت رویان هاتی).**

٤٤٢ – عن أبي جُهَيْمِ بْنِ الحَارِثِ: أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَلَفَا فِي آيَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ، فَقَالَ هَذَا: تَلَقَّيْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَقَالَ الْآخَرُ: تَلَقَّيْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَسَأَلاَ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: (**الْقُرْآنُ يُقْرَأُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَلاَ تُمَارُوا فِي الْقُرْآنِ، فَإِنَّ مِرَاءً فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ**).          [حم١٧٥٤٢].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەبی جوهەیمێ کورێ حارسی گۆت: دو زەلام د ئێك ئایەتا قورئانێدا جودا بوون ئێکی ژ وان گۆت: من هۆسا یا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەرگرتی و یێ دی ژی گۆت: من هۆسا یا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەرگرتی، پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) کرن؟ ئینا گۆت: (قورئان ل سەر حەفت روییێت خواندنێ دهێتە خواندن[1]، فێجا جرەبڕێ ب چو ژ وان لایان نەکەن، ب راستی چونکی جرەبڕی[2] د قورئانێدا کوفرە).**

٤٤٣ – عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَرَأْتُ آيَةً وَقَرَأَ ابْنُ مَسْعُودٍ خِلاَفَهَا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقُلْتُ: أَلَمْ تُقْرِئْنِي آيَةَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: (بَلَى)، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَلَمْ تُقْرِئْنِيهَا كَذَا وَكَذَا؟ فَقَالَ: (**بَلَى، كِلاَكُمَا مُحْسِنٌ مُجْمِلٌ**) قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ، فَضَرَبَ صَدْرِي، فَقَالَ: (**يَا أُبَيُّ بْنَ كَعْبٍ! إِنِّي أُقْرِئْتُ الْقُرْآنَ فَقِيلَ لِي: عَلَى حَرْفٍ أَوْ عَلَى حَرْفَيْنِ؟ قَالَ: فَقَالَ الْمَلَكُ الَّذِي مَعِي: عَلَى حَرْفَيْنِ، فَقُلْتُ: عَلَى حَرْفَيْنِ،**

---

(١) ئانکو هاتییە خوارێ.

**(٢) مەرەم جرەبڕا بکێشیتە گۆمان چێکرنێ یان درەودانانا قورئانێ، چونکی درەودانان یان گۆمانکرن د قورئانێدا هەردو کوفرن.**

فَقَالَ: عَلَى حَرْفَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ؟ فَقَالَ الْمَلَكُ الَّذِي مَعِي: عَلَى ثَلاَثَةٍ، فَقُلْتُ: عَلَى ثَلاَثَةٍ، حَتَّى بَلَغَ سَبْعَةَ أَحْرُفٍ، لَيْسَ مِنْهَا إِلاَّ شَافٍ كَافٍ، إِنْ قُلْتَ: غَفُوراً رَحِيماً، أَوْ قُلْتَ: سَمِيعاً عَلِيماً، أَوْ عَلِيماً سَمِيعاً، فَاللهُ كَذَلِكَ، مَا لَمْ تَخْتِمْ آيَةَ عَذَابٍ بِرَحْمَةٍ، أَوْ آيَةَ رَحْمَةٍ بِعَذَابٍ). [حم٢١١٤٩، ٢١١٥٣].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئوبەیێ کوڕێ کەعبی (ﷺ) گۆت: من ئایەتك خواند و ئیبن مەسعودی وەکی وێ نەخواند، ژ بەر وێ چەندێ ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) من گۆت: ما تە هۆسا و هۆسا بۆ من نەخواندییە؟ گۆت: (بەلێ)، ئیبن مەسعودی گۆت: ما تە هۆسا و هۆسا بۆ من نەخواندییە؟ گۆت: (بەلێ، هوین هەردو باش و جوان دخوینن). گۆت: من گۆتە وی[1]، ئینا دەستێ خۆ دانا سینگێ من و گۆت: (ئەی ئوبەییێ کوڕێ کەعبی قورئان (ژ لایێ جبریلیڤە) بۆ من هاتە خواندن گۆتە من تە ل سەر روییەکی دڤێت یان دو روییان؟ گۆت ملیاکەتێ[2] د گەل من گۆتە من بێژە: ل سەر دو روییان، من گۆت ل سەر دو روییان، ئینا ملیاکەتی گۆت: ل سەر دووا یان سێیا؟ ئەو ملیاکەتێ د گەل من گۆت: بێژە سێیا، من گۆت: سێیا، هەتا گەهشتییە حەفت روییان، هەر ئێك ژ وان یێ سلامەتکەرە[3] و بەسە[4] و ئەگەر تو بێژی گونەهە ژێبەر و دلۆڤانە یان بێژی گوهدێر و زانایە، یان زانا و گوهدێرە خودێ یێ وەسایە ئانکو تە دورست گۆت هنگی تو ئایەتەکا ئازارێ ب دلۆڤانییێ ب دویماهی نەئینی، یان ئایەتەکا دلۆڤانییێ ب ئازارێ ب دویماهی نەئینی).**

٤٤٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (أُنْزِلَ الْقُرْآنُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، والمِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ ـ ثلاثاً ـ مَا عَرَفْتُمْ مِنْهُ فَاعْمَلُوا بِهِ، وَمَا جَهِلْتُمْ مِنْهُ فَرُدُّوهُ إِلَى عَالِمِهِ). [حب ٧٤].

* إسناده صحيح على شرطهما.

---

(١) ئانکو چاوا تۆ دبێژیە من تە دورست خواند و دبێژییە وی ژی تە دورست خوداند؟!.

(٢) کو میکائیلە و هلتییە گۆتن هەر جبریلە.

(٣) بۆ نەخۆشییان و نەزانینێ و بۆ دلێت باوەریداران.

(٤) بۆ نڤێژێ و ئیعجازێ و رەوانبێژییێ و بەلگەیێ ل سەر گاوران.

**ژ ئەبی هورەیرە (ڕەزیاللەهوعەنهو) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قورئان یا ل سەر حەفت رویبان هاتییە خوارێ و جڕەبڕ[١] د قورئانێدا کوفرە، سێ جارا ئەڤە گۆت یا هەوە ژێ زانی کار پێ بکەن و یا هەوە ژێ نەزانی بزڤرییننە دەڤ زانایێ وێ).**

٧ ـ باب ترتیب السور.

**بابەتێ: ڕێزبەندیکرنا سۆرەتان.**

٤٤٥ – (خ) عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكٍ قَالَ: إِنِّي عِنْدَ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ رضي الله عنها، إِذْ جاءَهَا عِرَاقِيٌّ فَقَالَ: أَيُّ الْكَفَنِ خَيْرٌ؟ قَالَتْ: وَيْحَكَ! وَما يَضُرُّكَ؟ قَالَ: يَا أُمَّ المؤْمِنِينَ! أَرِينِي مُصْحَفَكِ، قَالَتْ: لِمَ؟ قَالَ: لَعَلِّي أُوَلِّفُ الْقُرْآنَ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ يُقْرَأُ غَيْرَ مُؤَلَّفٍ. قالَتْ: وَما يَضُرُّكَ أَيَّهُ قَرَأْتَ قَبْلُ؟ إِنَّمَا نَزَلَ أَوَّلَ ما نَزَلَ مِنْهُ سُورَةٌ مِنَ المفَصَّلِ، فِيهَا ذِكْرُ الجَنَّةِ وَالنَّارِ، حَتَّى إِذَا ثَابَ النَّاسُ إِلَى الإِسْلاَمِ نَزَلَ الحَلاَلُ وَالحَرَامُ، وَلَوْ نَزَلَ أَوَّلَ شَيْءٍ: لاَ تَشْرَبُوا الخَمْرَ، لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الخَمْرَ أَبداً، وَلَوْ نَزَلَ: لاَ تَزْنُوا، لَقَالُوا: لاَ نَدَعُ الزِّنَى أَبداً، لَقَدْ نَزَلَ بِمَكَّةَ عَلَى مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَإِنِّي لَجَارِيَةٌ أَلْعَبُ: ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾﴾ [القمر]، وَما نَزَلَتْ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَالنِّساءِ؛ إِلاَّ وَأَنَا عِنْدَهُ، قَالَ: فَأَخْرَجَتْ لَهُ المصْحَفَ، فَأَمْلَتْ عَلَيْهِ آيَ السُّوَرِ. [خ٤٩٩٣ (٤٨٧٦)].

**ژ یووسفێ کوڕێ ماهەکی، (ڕەحمەتوللاهعەلەیهـ) گۆت: ئەز ل دەڤ عائیشایێ بووم دایکا موسلمانان (ڕەزیاللەهوعەنها) ئێکێ عیراقی هاتە دەڤ، گۆت: ئەرێ کیژ کفن بخێرترە؟ گۆتێ: وەی بۆ تە هەما چ بیت ما دێ چ زیانێ گەهینیتە تە، گۆت: ئەی دایکا موسلمانان کا قورئانا خۆ نیشا من بدە. گۆت: و ژ بەر چ؟ گۆت: دا ئەز ل بەر وێ یا خۆ ڕێزبەندی بکەم، ب راستی نەرێزبەندی دهێتە خواندن، گۆت: ما چ زیان دێ گەهیتە تە هەر ئایەتا تە بەریکێ**

[١] ئەوا دکێشیتە درەودانانا قورئانێ یان جێکرنا گۆمانێ تێدا.

خواند، ب راستی یا بەراهییێ ژێ هاتییە خوارێ سۆرەتێت (مفصل) بوون[(١)] بەحسێ بەحەشت و جەهنەمێ تێدا بوو، هەتا خەلك زڤرییە ئیسلامێ حەلال و حەرام هاتە خوارێ، و ئەگەر دەستپێکێ هاتبا خوارێ عەرەقێ نەڤەخۆن دا بێژن ئەم چ جوار عەرەقێ ناهێلین، و ئەگەر گۆتبا زنایێ نەکەن دابێژن ئەم چو جارا زنایێ ناهێلین، و ل مەکەهێ ﴿بَلْ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ﴾[(٢)]. ل سەر موحەممەدی (ﷺ) هاتە خوارێ و ئەز کچ بووم من یاری دکرن، و سۆرەتا بەقەرە و نیساء نەهاتنە خوارێ هەتا ئەز نەهاتیمە دەڤ (ئانکو ل مەدینەیێ) و قورئانا خۆ، بۆ دەرێخست و سۆرەت بۆ گۆتن.

## ٨ . باب: القراء من الصحابة.

## بابەتێ: قورئانخوین ژ سەحابان.

٤٤٦ – (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: ذُكِرَ عَبْدُ اللهِ عَنْدَ عَبْد اللهِ بْنِ عَمْرٍو فَقَالَ: ذَاكَ رَجُلٌ لاَ أَزَالُ أُحِبُّهُ، بَعْدَ ما سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (اسْتَقْرِئُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ: مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ ـ فَبَدَأَ بِهِ ـ وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ). قَالَ: لاَ أَدْرِي بَدَأَ بِأُبَيٍّ أَوْ بِمُعاذٍ.

[خ٣٧٥٨/ م٢٤٦٤].

ژ مەسروقی (رحمه الله) گۆت بەحسێ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی ل دەڤ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری هاتە کرن گۆت: ئەو زەلامەکە بەردەوام ئەز حەژێ دکەم، پشتی من گوه ل

(١) سۆرەتێت موفەسەل ئەو سۆرەتن یێت کورت و نەدرێژ و دبێژنێ موفەسەل چونکی گەلەك بەسمەلە (بسم الله الرحمن الرحیم) دکەڤیتە د ناڤبەرا واندا و زانا نەلێکن کا ژ کیژ سۆرەتێ دەست پێ دکەن، بەلێ گەلەك دبێژن ژ سۆرەتا قاف دەست پێ دکەن هەتا سۆرەتا (الناس) دویماهییا قورئانێ.

(٢) رومانا ئایەتێ ب کورتی: و ژڤانێ ئیزادانا وان پشتی بەدرێ رۆژا قیامەتێیە، و رۆژا قیامەتێ هێژ مەزنتر و تەحلترە ژ ئیزایا دنیایێ.

**پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بووی دگۆت: (قورئانێ ژ چواران وەرگرن و بخوازن عەبدوللایێ کورێ مەسعودی ـ ب وێ دەستپێکر ـ و سالێ ئازاکرییێ حوزەیفەی، و ئوبەیێ کورێ کەعبی و مەعازێ کورێ جەبەلی)** گۆت: ئەز نوزانم بەریکێ ئوبەی گۆت یان مەعاز.

٤٤٧ - (ق) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَرْبَعَةٌ، كُلُّهُمْ مِنَ الأَنْصَارِ: أُبَيٌّ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وأَبُو زَيْدٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ.

قُلْتُ لأَنَسٍ: مَن أَبُو زَيْدٍ؟ قَالَ: أَحَدُ عُمُومَتِي. [خ٣٨١٠/ م٢٤٦٥].

- وفي رواية للبخاري: قَالَ: ماتَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَلَمْ يَجْمَعِ الْقُرْآنَ غَيْرُ أَرْبَعَةٍ: أَبُو الدَّرْدَاءِ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَبُو زَيْدٍ. قَالَ: وَنَحْنُ وَرِثْنَاهُ. [خ٥٠٠٤].

**ژ قەتادەیی ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: چار کەسان ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) قورئان هەمی ژ بەر کربوو[(١)] هەمی ژی ژ ئەنساران بوون (ئانکو خەلکێ مەدینەیێ) ئوبەی و مەعاز و ئەبو زەید و زەیدێ کورێ سابتی.**

**گۆت: من گۆتێ ئەبو زید کیژکە؟ گۆت: ئێك ژ مامێت منە.**

- **و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: پێغەمبەر (ﷺ) مر و کەسێ قورئان هەمی ژ بەر نەبوو چار تێ نەبن: ئەبو دەرداء و مەعازێ کورێ جەبەلی و زەیدێ کورێ سابتی و ئەبو زەیدی، و گۆت: و مە جهێ وی گرت.**

٤٤٨ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لأُبَيّ: (**إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ**: ﴿لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾[البينة] )، قَالَ: وَسَمَّانِي؟ قَالَ: (**نَعَمْ**)، فَبَكَى.

[خ٣٨٠٩/ م٧٩٩].

(١) مەبەست نەو نینە ڤان تنێ قورئان ژبەر بوو، بەلێ ژ نویجاخەکێ چاران قورئان ژ بەر بوو، ئاشکرا بوو هەر چوار خەلیفێت راستەرێکری قورئان ژ بەر بوو و گەلەك سەحابییێت دی و تنێ د شەرێ یەمامەدا حەفتێ ژبەرکەرێت قورئانێ شەهید بوون.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه): (ب راستی خودایێ ب هێز و مەزن، فەرمانا من کر ئەز: ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾[1]، بۆ تە بخوینم)، گۆت: و ناڤێ من ئینا؟! گۆت: (بەلێ)، ئینا ئوبەی کرە گری.**

٩ . باب العرضة الاخير.

**بابەتێ: خواندنا دویماهییێ.**

٤٤٩ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ يَعْرِضُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) الْقُرْآنَ كُلَّ عامٍ مَرَّةً، فَعَرَضَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ، وَكَانَ يَعْتَكِفُ كُلَّ عامٍ عَشْراً، فَاعْتَكَف عِشْرِينَ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ. [خ٤٩٩٨ (٢٠٤٤)].

**و ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: جبریلی هەر سال جارەکێ قورئان بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دخواند و سالا تێدا وەغەر کری دو جارا بۆ خواند، و هەمی رەمەزانان دەه رۆژان ژێ ئیعتیکاف دکر[2]، بەلێ دەمێ بوویە ئەو سالا تێدا چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ بیست رۆژان ئیعتیکاف کر.**

٤٥٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَيُّ الْقِرَاءَتَيْنِ كَانَتْ أَخِيراً، قِرَاءَةُ عَبْدِ اللهِ أَوْ قِرَاءَةُ زَيْدٍ؟ قَالَ: قُلْنَا: قِرَاءَةُ زَيْدٍ، قَالَ: لَا، إِلَّا أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَعْرِضُ الْقُرْآنَ عَلَى جَبْرَائِيلَ كُلَّ عَامٍ مَرَّةً، فَلَمَّا كَانَ فِي الْعَامِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ عَرَضَهُ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ، وَكَانَتْ آخِرَ الْقِرَاءَةِ قِرَاءَةُ عَبْدِ اللهِ. [حم٢٤٩٤].

* صحيح.

**ژ موجاهدی (رضي الله عنه) گۆت: ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: کیژ هەردو خواندن یا دویماهییێ بوو خواندنا عەبدوللایێ کورێ مەسعودی یان خواندنا زەیدی؟ گۆت مە گۆت: خواندنا زەیدی، گۆت: نەخێر هەر سال جارەکێ پێغەمبەری قورئان بۆ**

---

(١) ئانکو: سۆرەتا بەیینە.

(٢) بۆ پەرستنێ دما ل مزگەفتێ.

**جبریلی دخواند بەلێ د وێ سالا تێدا چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ دو جارا بۆ خواند و دویماهی خواندن خواندنا عەبدوللایی بوو.**

٤٥١ - عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رضي الله عنه قَالَ: عُرِضَ القرآنُ عَلى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَرَضَاتٍ فَيَقُولُونَ: إِنَّ قِراءَتنا هذهِ هِي العَرْضَةُ الأَخِيرةُ. [ك٢٩٠٤].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ سەمورەیێ كورێ جوندوبی (ﷺ) گۆت: قورئان چەند جاران ل سەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە نیشادان و دبێژن: خواندنا مە یا نیشادانا دویماهیییێیە.**

٤٥٢ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ جِبْرِيلُ يَعْرِضُ القُرْآنَ عَلى النَّبِيِّ (ﷺ) كُلَّ عَامٍ مَرَّةً فِي رَمَضَانَ، فَلَمَّا كَانَ العَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيْهِ عَرَضَهُ مَرَّتَيْنِ. [مخ٧/٢٥٩٣].

* إسناده حسن.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: هەر سال جارەكێ جبریلی قورئان بۆ پێغەمبەری دخواند بەلێ د وێ سالا تێدا چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ دو جاران بۆ خواند.**

### ١٠ . باب: وقوع النسخ في القران.

### بابەتێ: هەبوونا نەسخێ د قورئانێدا[1].

٤٥٣ - (خ) عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: أَقْرَؤُنَا أُبَيٌّ، وَأَقْضَانَا عَلِيٌّ، وَإِنَّا لَنَدَعُ مِنْ قَوْلِ أُبَيٍّ، وَذَاكَ أَنَّ أُبَيّاً يَقُولُ: لاَ أَدَعُ شَيْئاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَقَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَـةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ [البقرة:١٠٦]. [خ٤٤٨١].

**ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: خواندەڤانترێ مە ئوبەیە و دادوەرترێ مە عەلییە و ب راستی ئەم هندە خواندنا ئوبەی دهێلین چونكی ئەو دبێژیت ئەز چو تشتی**

---

(١) ڕاكرنا فەرمانا ئایەتەكێ ب فەرمانا ئایەتەكا دی پشتی وێ هاتی.

**ناهێلم من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ ببیت و خودایێ مەزن دبێژیت: ﴿ما نَنْسَخْ من آيَةٍ أو نُنْسِهَا﴾[(١)] حوکمێ هەر ئایەتەکا ئەم ل جهێ ئێکا دی بدانین یان ژ سەر دلێ تە ببەین (ئانکو: ژ بیرا تە ببەین).**

٤٥٤ - (ع) عَن زِرٍّ قَالَ: قال لي أُبَيُّ بنُ كَعبٍ: كأيِّنْ تَقرَأُ سُورةَ الأحزابِ؟ أو كأيِّنْ تَعُدُّها؟ قال: قُلْتُ له: ثلاثًا وسَبعينَ آيةً، فقال: قَطُّ؟ لقد رَأيْتُها، وإنَّها لَتُعادِلُ سورةَ البَقَرةِ، ولقد قَرَأْنا فيها: (الشَّيخُ والشَّيخةُ إذا زَنَيا فارْجُموهُما البَتَّةَ نَكالًا منَ اللهِ واللهُ عزيزٌ حكيمٌ)[(٢)]. [حم٢١٢٠٧، ٢١٢٠٦].

*إسناده ضعيف.

**ژ زرِی (ﷺ) گۆت: ئوبەیێ کورێ کەعبی (ﷺ) گۆتە من تو سۆرەتا ئەحزاب چەند دبینی؟ یان تو چەند ددانی؟ گۆت: من گۆت: حەفتێ و سێ ئایەت، گۆت: ئەبەد من یا دیتی و ئەو تەمەت سۆرەتا بەقەرەیێ بوو[(٣)] و من تێدا یا خواندی پیرەمێری و پیرەژنێ ئەگەر زنا کرن بێگۆمان بەرباران بکەن ئیزایە بۆ وان ژ لایێ خودێڤە و خودێ یێ زانا و کاربنەجهە.**

---

**(١) هەرسال جارەکێ جبریلی قورئان بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دخواند و نیشا ددا و سالا تێدا وەغەرکری دو جاران و پشت بەستن ب نیشادانا دویماهیکێیە.**

**(٢) شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ نینایە:** ٤٥٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ عُمَر رضي الله عنه: أُبَيٌّ أَقْرَؤُنَا، وَإِنَّا لَنَدَعُ مِنْ لَحْنِ أُبَيٍّ، وأُبَيٌّ يَقُولُ: أَخَذْتُهُ مِنْ رَسُوْلِ اللهِ (ﷺ)، فلا أَتْرُكُهُ لِشَيْءٍ. قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ [البقرة:١٠٦]. [خ٥٠٠٥].

**ژ ئیبن عەباسی (ﷺ) گۆت عومەری گۆت: ئوبەی ژ مە د قورئانێدا شارەزاترە و ئەم هندەک تشتێ ئەو دبێژت دهێلین (چونکی نەسخا ب سەردا هاتی) بەلێ ئەو دبێژیت ئەز وی تشتی ناهێلم یێ من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بووی و خودێ دبێژیت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ هەروەکی دبێژیتێ پا کا نەسخ ئانکو ئەو تشتێ تە گوه لێ بووی و نەسەخ بووی دڤێت ژێ نەڤەگوهێزی.**

**(٣) هەلبەت ئەڤە بەری نەسخ ببیت (راکرانا فەرمانا ئایەتەکێ ب فەرمانا ئایەتەکا دی پشتی وێ هاتی یان راکرنا ئایەتێ ب ئێکجاری ب فەرمان و ب خواندنڤە).**

## ١١ ـ باب: المكي والمدني.

## بابەتێ: سۆرەت و ئایەتێت مەکی و مەدەنی.

٤٥٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ ـ ابنِ مَسْعُودٍ ـ رضي الله عنه قَالَ: مَا كَانَ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ أُنْزِلَ بِالمدِيْنَةِ، وَمَا كَانَ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ فَبِمَكَّةَ. [ك٤٢٩٥]

- وفي رواية قال: قَرَأْنَا المفَصَّلَ حِيْناً وَحِجَجاً بِمَكَّةَ لَيْسَ فِيها ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾. [ك٤٢٩٦]

* قال الذهبي: على شرطهما. وسكت عن الأولى.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: ج ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ هەیە ل مەدینەیێ هاتییە خوارێ و ج ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ل مەکەهێ.**

- **و د ڤەگێرەکێدا مە سۆرەتێت (مفصل) دەمەکێ و ب سالان ل مەکەهێ دخواندن و ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ تێدا نەبوو.**



الفصل الثاني: فضل القرآن وفضل تلاوته.

## پشكا دوویێ: خێرا قورئانێ و خێرا خواندنا وێ.

١ ـ باب:فضل تلاوة القرآن.

### بابەتێ خێرا خواندنا قورئانی

٤٥٦ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ. وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ، لاَ رِيحَ لَهَا، وَطَعْمُهَا حُلْوٌ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ. وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ، وَطَعْمُهَا مُرٌّ**).

[خ٥٤٢٧ (٥٠٢٠)/ م٧٩٧].

**و ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مەتەلا خودان باوەرێ قورئانێ دخوینیت وەكی نارنجێیە بێهنا وێ یا خۆشە و تاما وێ یا خۆشە، و مەتەلا خودان باوەرێ قورئانێ نەخوینیت، وەكی قەسپێیە، بێهن نینە و تاما وێ یا خۆشە، و مەتەلا دوڕوییێ قورئانێ دخوینیت وەكی رحانێیە بێهنا وێ یا خۆشە و تاما وێ یا تەحلە و مەتەلا دوڕوییێ قورئانێ نەخوینیت وەكی زەردەلكێیە نە بێهن هەیە و تاما وێ ژی یا تەحلە).**

٤٥٧ - (ق) عَنْ عبد الله بن عمر رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ حَسَدَ إِلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٍ آتَاهُ اللهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ. وَرَجُلٍ آتَاهُ اللهُ مالاً، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ**). [خ٧٥٢٩ (٥٠٢٥)/ م٨١٥].

و ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(حەسویدی نەیادورستە د دو سەخلەتاندا نەبیت([1])، مرۆڤەکی خودێ ژبەرکرن و تێگەهشتنا قورئانێ دابیتێ، و ئەو هەمی دەمێت شەڤێ و دەمێت رۆژێ ب جھ دئینیت (ژ کاری و خواندن و ژبەرکرنێ) و زەلامەکی خودێ مال دابیتێ ڤێجا ئەو هەمی دەمێت شەڤێ و دەمێت رۆژێ بکەتە خێر).**

٤٥٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ أَنْ يَجِدَ فِيهِ ثَلاَثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ)؟ قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: (فَثَلاثُ آيَاتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثِ خَلِفَاتٍ عَظَامٍ سِمَانٍ). [م٨٠٢].

ژ ئەبی هورەیرەیی (ﷺ) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەرێ ئێکی ژ هەوە دڤێت بزڤریتە مالا خۆ و ئەو سێ حێشترێت ئاڤز و مەزن و قەلەو تێدا ببینیت)، مە گۆت: (بەلێ، گۆت سێ ئایەتان ئێك ژ هەوە د نڤێژا خۆدا بخوینیت بۆ وی باشترە ژ سێ حێشترێت ئاڤز و مەزن و قەلەو).**

٤٥٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ، وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا). [د١٤٦٤/ ت٢٩١٤].

* حسن صحيح.

و ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی خودێ ژ هەردویان رازی بیت گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دێ بێژنە خودانێ قورئانێ (ئانکو یێ قورئان ژبەر) بخوینە و**

(١) زانا دبێژن دو رەنگێت حەسویدییێ یێت هەین یا راست، ئەو ژی ئەڤەیە: تو حەز بکەی خۆشییا غەیری تە نەمینیت، ئەڤە یا حەرامە ل سەر بۆچۆنا هەمی زانایان، و یادی یا مەجازییە، تو حەز بکەی ئەو خۆشی بگەهیتە تە ژی و خۆشییا وی هەر بمینیت و نەچیت و مەرەما حەدیسێ ئەڤ رەنگەیە.

**سەرکەڤە، و بخوینە هەروەکی تە د دنیایێدا دخواند، ب راستی جهێ تە دێ ئەو بیت ئەو جهێ تو دویماهی ئایەت لێ دخوینی).**

٤٦٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ قَرَأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللهِ، فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ)**.

[ت٢٩١٠].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ پیتەکێ ژ قورئانێ بخوینیت خێرەك بۆ وییە و خێر ب دەهێت وەکی خۆیە، ئەز نابێژم (ئەلیف لام میم) پیتەکە بەلێ ئەلیف پیتەکە و لام پیتەکە و میم پیتەکە).**

٤٦١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ للهِ أَهْلِينَ مِنَ النَّاسِ)** قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: **(هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ، أَهْلُ اللهِ وَخَاصَّتُهُ)**. [جه٢١٥/ مي٣٣٦٩].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ مرۆڤێت خۆ ژ خەلکی یێت هەین)،** گۆتن: ئەو کینە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: **(ئەو ژبەرکەر و کارپێکەرێت قورئانێنە ئەو مرۆڤێت خودێنە و تایبەتمەندێت وینە).**

٤٦٢ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: اقْرَؤوا الْقُرْآنَ، وَلاَ يَغُرَّنَّكُمْ هَذِهِ الْمَصَاحِفُ الْمُعَلَّقَةُ، فَإِنَّ اللهَ لَنْ يُعَذِّبَ قَلْباً وَعَى الْقُرْآنَ. [مي٣٣٦٢، ٣٣٦٣].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی ئومامەی (رضي الله عنه) گۆت: قورئانێ بخوینن و بلا ئەڤ قورئانێت هەلایستی هەوە نەخاپینیت ب راستی خودێ دلەکێ ئازار نادەت قورئان چوبیتە تێدا[1].**

٤٦٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ إِذَا رَجَعَ مِنْ سُوقِهِ، أَوْ مِنْ حَاجَتِهِ، فَاتَّكَأَ عَلَى فِرَاشِهِ، أَنْ يَقْرَأَ ثَلاَثَ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ. [مي٣٣٧٩].

* إسناده صحيح.

[انظر: ٢٩٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ما چ رێگرییێ ل ئێك ژ هەوە دکەت، ئەگەر ژ بازارێ خۆ یان ژ هەوجەییا خۆ زڤریڤە و پالدا سەر نڤینا خۆ سێ ئایەتان ژ قورئانێ بخوینیت.**

٢ . باب فضل تعاهد القرآن.

**بابەتێ: بەردەوامبوون ل سەر خواندنا قورئانێ.**

٤٦٤ - (ق) عَنْ عائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَهُوَ حافِظٌ لَهُ، مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَمَثَلُ الَّذِي يَقْرَأُ، وَهُوَ يَتَعَاهَدُهُ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَدِيدٌ، فَلَهُ أَجْرَانِ).

[خ٤٩٣٧/ م٧٩٨].

**و ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مەتەلا وی یێ قورئانێ دخوینیت و ژبەر کربیت یێ د گەل ملیاکەتێت قەدرگران و گوهدار، و مەتەلا وی یێ قورئانێ دخوینیت و بەردەوامییێ بدەتە پاراستن و ژبەرکرنا قورئانێ و ئەڤە ل سەر وی یا گران بیت، دو خێر بۆ وینە).**

(١) ئانکو: قورئانێ ژبەرکەن و بکەنە ددلێت خۆدا و ددلێت خۆدا ب هەلایسن نە دمالێت خۆدا.

٤٦٥ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمر رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الإِبِلِ المُعَقَّلَةِ، إِنْ عاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ**). [خ٥٠٣١/ م٧٨٩].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی هندی مەتەلا خودانێ قورئانێیە وەكی مەتەلا خودانێت حێشترێت گرێدایینە ئەگەر چاڤێ خۆ دایێ ئەو گرتن و ئەگەر بەردان ئەو چۆن).**

٤٦٦ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**بِئْسَ ما لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ**: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ نُسِّيَ، وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّياً مِنْ صُدُورِ الرِّجالِ مِنَ النَّعَمِ).

[خ٥٠٣٢/ م٧٩٠].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پیسە كارە ئێك بێژیت: من فلان ئایەت و فلان ئایەت ژبیر كرن بەلكی (ژ خەمساری و ژ نەبەردەوامیبوونێ) ژ بیرێ هاتە برن، و بەردوام قورئانێ ل بیرا خۆ بینن، ب راستی قورئانا ژبەركری زویتر د سینگێ موسلمانیدا ژ حێشترا گرێدای ب كنفا خۆڤە دچیت).**

٤٦٧ – عن السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ شُرَيْحاً الْحَضْرَمِيَّ ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَتَوَسَّدُ الْقُرْآنَ**). [ن١٧٨٢].

* صحيح الإسناد.

**ژ سائبێ كورێ یەزیدی (ﷺ) گۆت: بەحسێ شورەیحێ حەزرەمی ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتەكرن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەو شەڤێ بێ قورئان نانڤیت)[1].**

---

(١) هەروەكی قورئان د گەل دنڤیت و ئەو قورئانێ ناهێلیت چ خواندن چ ژبەركرن چ خواندن د شەڤنڤێژاندا.

### ٣ ـ باب: خيركم من تعلم القران وعلمه.

### بابەتێ: باشترێ هەوە ئەوە یێ فێری قورئانێ ببیت و فێرکرنا وێ بکەت.

٤٦٨ - (خ) عَنْ عُثْمَانَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ**).

[خ٥٠٢٧].

**ژ عوسمانی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (باشترێ هەوە ئەوە یێ فێری قورئانێ ببیت و فێرکرنا وێ بکەت).**

٤٦٩ - (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: جَمَعْتُ الْمُحْكَمَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ لَهُ: وَمَا الْمُحْكَمُ؟ قَالَ: المفَصَّلُ. [خ٥٠٣٦ (٥٠٣٥)].

**ژ سەعیدێ کوڕێ جوبەیری (رضي الله عنه) ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سۆرەتێت نەسخ تێدا نەهێتە کرن ژبەرکرن، من گۆتێ: سۆرەتێت موحکەم کیژکن؟ گۆت: یێت (مفصل)ن[(١)].**

### ٤ ـ باب: المد والترجيع في القراءة.

### بابەتێ: کێشانا دەنگی و خۆشکرنێ د خواندنێدا

٤٧٠ - (ق) عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُغَفَّلِ المزَنِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ الْفَتْحِ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ، يَقْرَأُ سُورَةَ الْفَتْحِ ـ أَوْ مِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ ـ قَالَ: فَرَجَّعَ فِيهَا.

---

(١) سۆرەتێت موفەسەل، مەبەست پێ ئەو سۆرەتن یێت بەسمەلە (بسم الله الرحمن الرحيم) گەلەك بكەڤیتە د ناڤبەرا واندا و ئەو ژ سۆرەتا (قاف) دەست پێ دکەن هەتا دویماهیيا قورئانێ، و دهێتە گۆتن ژ سۆرەتا حوجورات و دهێتە گۆتن ژ سۆرەتا موحەممەد هەتا دویماهیيا قورئانێ.

قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ مُعَاوِيَةُ يَحْكِي قِرَاءَةَ ابْنِ مُغَفَّلٍ، وقَالَ: لَوْلاَ أَنْ يَجْتَمِعَ النَّاسُ عَلَيْكُمْ لَرَجَّعْتُ كَمَا رَجَّعَ ابْنُ مُغَفَّلٍ، يَحْكِي النَّبِيَّ (ﷺ).

فَقُلْتُ لِمُعَاوِيَةَ: كَيْفَ كَانَ تَرْجِيعُهُ؟ قَالَ: آ آ آ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. [خ٧٥٤٠ (٤٢٨١)/ م٧٩٤].

- وفي رواية للبخاري: وَهُوَ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفَتْحِ ـ أَوْ مِنْ سُورَةِ الْفَتْحِ ـ قِرَاءَةً لَيِّنَةً، يَقْرَأُ وَهُوَ يُرَجِّعُ. [خ٥٠٤٧].

**ژ شوعبەیی ژ موعاویەیێ کوڕێ قوڕەی ژ عەبدوللایێ کوڕێ موغەففەلێ موزەنی، گۆت: رۆژا فەتحا مەکەهێ من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر حێشترەکا وی دیت سۆرەتا فەتح دخواند یان ژ سۆرەتا فەتح دخواند گۆت: و دەنگێ خۆ درێژ کر و پێ خۆش دکر.**

**شوعبەی گۆت: پاشی معاویەیی خواند چاڤ ل خواندنا ئیبن موغەففەلی کر و گۆت: ئەگەر من ترسا هندێ نەبا خەلك ل سەر هەوە کۆم ببیت دا دەنگێ خۆ درێژکەم و خۆشکەم هەروەکی ئیبن موغەففەلی چاڤ ل پێغەمبەری (ﷺ) دکر.**

**شوعبە دبێژیت من گۆتە موعاویەی درێژکرن و خۆشکرنا وی یا چاوا بوو، گۆت: سێ جاران گۆت: ئا ئا ئا.**

- **و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: و ئەو یێ سۆرەتا فەتح دخوینیت یان ژ سۆرەتا فەتح دخوینیت خواندنەکا نەرم و دەنگێ خۆ پێ دکێشا و خۆش دکر.**

٤٧١ - (خ) عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سُئِلَ أَنَسٌ: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَقَالَ: كَانَتْ مَدّاً، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝١﴾، يَمُدُّ بِبِسْمِ اللهِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحْمنِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ. [خ٥٠٤٦ (٥٠٤٥)].

**ژ قەتادەی پرسیار ژ ئەنەسی هاتەکرن خواندنا پێغەمبەری (ﷺ) یا چاوا بوو؟ گۆت: خواندنا وی کێشان بوو پاشی ﴿بِسْمِ اللهِ الرحمن الرَّحِيمِ﴾ خواند دەنگ ب ﴿بِسْمِ اللّهِ] دکێشا ب ﴿الرَّحْمَنِ﴾ دکێشا و ب ﴿الرَّحِيمِ﴾ دکێشا.**

## ٥ ـ باب ترتيل القرآن واجتناب الهذ.

## بابەتێ: خواندنا نەرم یا قورئانێ و دویركەفتن ژ لەزكرنێ.

٤٧٢ – (ق) عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ: قَرَأْتُ المفَصَّلَ اللَّيْلَةَ فِي رَكْعَةٍ، فَقَالَ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ ؟! لَقَدْ عَرَفْتُ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْرِنُ بَيْنَهُنَّ، فَذَكَرَ عِشْرِينَ سُورَةً مِنَ المفَصَّلِ، سُورَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ. [خ٧٧٥/ م٨٢٢].

**ژ وائیلی (﵁) زەلامەك هاتە دەڤ ئیبن مەسعودی گۆت: ئەڤ شەڤە من سۆرەتێت (مفصل) هەمی د ئێك ركعەتدا خواندن، ئینا گۆت: ئەڤە لەزكرنا هۆزانێیە ب راستی ئەز سۆرەتێت وەكی ئێك (د رامان و شیرەتاندا و نە د هژمارا ئایەتاندا) ئەوێت پێغەمبەری (ﷺ) د ناڤبەرا واندا كۆم دكرن دزانم، و بیست سۆرەت ژ سۆرەتێت (مفصل) گۆتن دو سۆرەت د هەر ركعەتەكێدا دخواندن.**

٤٧٣ – عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) . قَالَ أَبُو عَامِرٍ: قَالَ نَافِعٌ: أُرَاهَا حَفْصَةَ . أَنَّهَا سُئِلَتْ عَنْ قِرَاءَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: إِنَّكُمْ لاَ تَسْتَطِيعُونَهَا، قَالَ: فَقِيلَ لَهَا: أَخْبِرِينَا بِهَا، قَالَ: فَقَرَأَتْ قِرَاءَةً تَرَسَّلَتْ فِيهَا . قَالَ أَبُو عَامِرٍ: قَالَ نَافِعٌ: فَحَكَى لَنَا ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ . ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ۝٢﴾، ثُمَّ قَطَّعَ ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝٣﴾، ثُمَّ قَطَّعَ ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ۝٤﴾. [حم٢٦٤٧٠]

* رجاله ثقات رجال الشيخين.

**ژ ئەبی مولەیكەی (﵁) ژ هندەك هەڤژینێن پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەبو عامری گۆت: نافعی گۆت: یا ژ منڤە حەفسە بوو و پرسیارا وێ ژ خواندنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتەكرن؟ گۆت: هوین نەشێن وێ خواندنێ بخوینن، گۆت: كا بۆ مە بێژە یا چاوا بوو؟ گۆت: وێ خواند و هێدی ب دلێ خۆ خواند.**

**ئەبو عامری گۆت: نافعی گۆت ئیبن ئەبی مولەیکەی بۆ مە خواندنا وێ ڤەگێرا : ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاشی راوەستا و ﴿الرحمن الرَّحِيمِ﴾ پاشی راوەستا و ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ پاشی راوەستا.**

## ٦ ـ باب: حسن الصوت بالقراءة.

## بابەتێ: باشکرنا دەنگی ب خواندنێ.

٤٧٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**ما أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ ما أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ**). [خ٧٥٤٤ (٥٠٢٣)/ م٧٩٢].

- وفي رواية لهما: (**مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ** ). [خ٧٤٨٢].
- وفي رواية للبخاري قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ**). [خ٧٥٢٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دبێژیت: (خودێ گوهدانا کەسێ نەکرییە گوهدانا رازیبوون و قەبویلکرنێ وەکی گوهدانا وی بۆ پێغەمبەرەکێ قورئانێ بخوینیت و دەنگێ خۆ ب قورئانێ خۆشکەت).**

- و د ڤەگێرەکا واندا: **(خودێ گوهدانا کەسێ نەکرییە گوهدانا رازیبوون و قەبویلکرنێ وەکی گوهدانا وی بۆ پێغەمبەری دەنگێ خۆ ب قورئانێ خۆشکەت).**
- و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: **(نە ژ مەیە یێ دەنگێ خۆ ب قورئانێ خۆش نەکەت).**

٤٧٥ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ لَهُ: (**يَا أَبَا مُوسى! لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْماراً مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ** ). [خ٥٠٤٨/ م٧٩٣]

- وزاد عند مسلم في أوله: (**لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ**).

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وی: (خودێ دەنگەکێ خۆش وەکی دەنگێ داوودی پێ دایە تە).**

- **و موسلمی د دەستپێکا وێدا زێدەکرییە: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتی: (ئەگەر تە ئەز دوهی دیتبام من گوهێ خۆ ددا خواندنا تە).**

٤٧٦ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ**).

[د١٤٦٨/ ن١٠١٤٠/ جه١٣٤٢/ مي٣٥٤٣].

* صحيح.

**ژ بەرائێ کورێ عازبی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەنگێ خۆ ب قورئانێ بخەملینن و جوانکەن).**

٤٧٧ – عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: أَبْطَأْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لَيْلَةً بَعْدَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ جِئْتُ، فَقَالَ: (**أَيْنَ كُنْتِ**) ؟ قُلْتُ: كُنْتُ أَسْتَمِعُ قِرَاءَةَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِكَ، لَمْ أَسْمَعْ مِثْلَ قِرَاءَتِهِ وَصَوْتِهِ مِنْ أَحَدٍ. قَالَتْ: فَقَامَ وَقُمْتُ مَعَهُ حَتَّى اسْتَمَعَ لَهُ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: (**هَذَا سَالِمٌ، مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي أُمَّتِي مِثْلَ هَذَا**). [جه ١٣٣٨].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (ﷺ) ـ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ـ گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شەڤەکێ پشتی عەیشا ئەز گیرۆ بووم پاشی ئەز هاتم، ئینا گۆت: (تو ل کیڤە بووی؟) من گۆت: من گوهێ خۆ ددا زەلامەکی ژ هەڤالێت تە من وەکی خواندنا وی و دەنگێ وی ژ کەسێ گوه لێ نەبوویە، گۆت: ئەو رابوو و ئەز د گەل رابووم هەتا گوهێ**

**خۆ دایێ پاشی بەرێ خۆ دا من و گۆت: ( ئەڤە ساله ئازاکرییێ حوزەیفە سوپاس بۆ خودایی وەکی ڤی کرینە د ئوممەتا مندا).**

٤٧٨ – عَنْ مُحَمَّدٍ ـ ابن سيرين ـ قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ هَذِهِ الْأَلْحَانَ فِي الْقُرْآنِ مُحْدَثَةً. [مي٣٥٤٦].

* إسناده جيد.

**ژ موحەممەدێ کورێ سیرینی (رحمه الله) گۆت: وان[1] ئەڤ ئاوازە د قورئانێدا یێت نوی و نەدورست دیتن.**

٤٧٩ – عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبا مُوسَى رضي الله عنه كَانَ يَقْرَأُ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَمَشَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَسْمَعُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قِيْلَ لَهُ، قَالَ: لَوْ عَلِمْتُ لَحَبَّرْتُ لَكَ تَحْبِيراً، وَلَشَوَّقْتُ لَكَ تَشْوِيقاً. [مخ٥/١٦٥٠].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: ئەبو مووسای (رضي الله عنه) د شەڤەکێدا قورئان دخواند پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ گوهێ خۆ دایێ، ڤێجا دەمێ بوویە سپێدە گۆتێ، گۆت: ئەگەر من زانیبا ئەز دا بۆ تە زێدەتر دەنگێ خۆ خۆش کەم و دا شرینتر لێ کەم کو یێ گوه لێ ببیت حەز بکەت پتر گوهێ خۆ بدەتێ.**

٤٨٠ – عَنْ أَنسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ حِلْيَةً، وَحِلْيَةُ الْقُرْآنِ الصَّوْتُ الْحَسَنُ).** [مخ٧/٢٤٩٦].

* إسناده حسن.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر تشتەکی جەکێ جوانکرنێ یێ هەی، و جەکێ قورئانێ دەنگێ خۆشە).**

---

[1] سەحابان و مەزنە تابیعییان.

٤٨١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): أَيُّ النَّاسِ أَحْسَنُ قِرَاءَةً؟ قَالَ: (**الَّذِي إِذَا سَمِعْتَهُ يَقْرَأُ رَأَيْتَ أَنَّهُ يَخْشَى اللهَ عز وجل**). [مخ١١/٢٢٣].

* رجاله ثقات

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) هاتەكرن، كیژ مرۆڤ خواندنا وی باشترە؟. گۆت: (ئەوێ ئەگەر تە گوه لێ بوو دخوینیت تو ببینی ژ خودێ دترسیت).**

٧ ـ باب: اقرؤوا القرآن ما ائتلفت قلوبكم.

**بابەتێ: قورئانێ بخوینن هندی دلێت هەوە د گەل كۆم بن.**

٤٨٢ - (ق) عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**اقْرَؤوا الْقُرْآنَ ما ائْتَلَفَتْ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ** ). [خ٥٠٦٠/ م٢٦٦٧].

**ژ جوندوبێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قورئانێ بخوینن هندی دلێت هەوە كۆم بكەت و ئەگەر نەلێكییەك د ناڤبەرا هەوەدا چێ بوو ژێكڤە ببن)[1].**

٤٨٣ - (خ) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً قَرَأَ آيَةً، وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقْرَأُ خِلاَفَهَا، فَجِئْتُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَعَرَفْتُ فِي وَجْهِهِ الْكَرَاهِيَةَ، وقَالَ: (**كِلاَكُمَا مُحْسِنٌ، وَلاَ تَخْتَلِفُوا، فَإِنَّ مَنْ كانَ قَبْلَكُمُ اخْتَلَفُوا؛ فَهَلَكُوا**). [خ٣٤٧٦ (٢٤١٠)].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل زەلامەكی بوو ئایەتەك دخواند و من گوه ل پێغەمبەری ببوو نەوەكی وی دخواند، ڤێجا من ئینا دەڤ**

---

[1] ئانكو: ئەو نەلێكی نەكێشیتە خرابییێ.

**پێغەمبەری (ﷺ) من بۆ گۆت، ئینا من نەرازیبوون د ناڤچاڤاندا دیت و گۆت: (هوین هەردو دورستن و ژێكجودا نەبن، ب راستی یێت بەری هەوە ژێك جودا بوون ڤێجا ژ ناڤ چوون).**

٨ ـ باب: البكاء عند قراءة القرآن.

**بابەتێ: گری د خواندنا قورئانێدا.**

٤٨٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُود قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اقْرَأْ عَلَيَّ**)، قَالَ: قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: (**إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي**)، قَالَ: فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴿٤١﴾﴾ [النساء]، قَالَ لِي: (**كُفَّ، أَوْ أَمْسِكْ**)، فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَذْرِفانِ. [خ٥٠٥٥ (٤٥٨٢)/ م٨٠٠].

**و ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (قورئانێ بۆ من بخوینە)، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز بۆ تە بخوینم، و بۆ تە یا هاتییە خوارێ؟! گۆت: (من دڤێت ژ ئێكێ دی گوه لێ ببم)، من سۆرەتا نیساء بۆ خواند، هەتا ئەز گەهشتیمە ڤێ ئایەتێ: ﴿فَكَيْفَ إذا جِئْنا مِنْ كُلِّ أُمَّة بِشَهيد وجِئْنا بِكَ عَلى هَؤلاءِ شَهِيداً﴾[1]. گۆتە من: (ڤێ كاڤێ بەسە یان راوەستە)، من دیت، چاڤێت وی رۆندك دباراندن.**

٩ ـ باب: في كم يقرأ القرآن.

**بابەتێ: د چەندێدا دێ قورئانێ خوینیت.**

٤٨٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ**)، قُلْتُ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، حَتَّى قَالَ: (**فَاقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ، وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذلِكَ**).

[خ٥٠٥٤ (١١٣١)/ م١١٥٩/١٨٤].

---

(١) **رامانا ئایەتێ ب كورتی: ڤێجا ئەو دێ د چ كراسدا بن دەمێ ئەم بۆ هەر ملەتەكی شاهدەكی دئینین پێغەمبەرێت وان شەهدەییێ ل سەر وان ددەن و ئەم تە ژی ل سەر ڤان دكەینە شاهد.**

- وفي روايةٍ لهما قَالَ: (وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ، فَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَلِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَلِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً). [خ١٩٧٥].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د هەیڤەكێدا قورئانێ بخوینە)، من گۆت: ئەز دبینم ئەزێ یێ ب هێزم، هەتا گۆتی: (د حەفت رۆژاندا بخوینە و كێمتر لێ نەكە).**

- **و د ڤەگێرەكا هەردوكاندا: (و كێمتر لێ نەكە ب راستی هەڤژینا تە ماف یێ ل سەر تە هەی و مێڤانێت تە ماف یێ ل سەر تە هەین و لەشێ تە ماف یێ ل سەر تە هەی).**

٤٨٦ - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ). [م٧٤٧].

**ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ژ پشكا خۆ ژ یا قورئانێ یا ب شەڤ بنڤیت و نەخوینیت یان ژ تشتەكی ژێ، و د ناڤبەرا نڤێژا سپێدێ و نڤێژا نیڤرۆدا بخوینیت بۆ هاتە نڤیسین هەروەكی وی ب شەڤ خواندی).**

١٠ . باب: اقل مايقرأ.

**بابەتێ: یا كێمتر دهێتە خواندن.**

[ انظر:٥٢٦]. بەرێ خۆ بدە هژمارا : ٥٢٦ ژ ڤێ كتێبێ.

## ١١ ـ باب يرفع الله بهذا الكتاب اقواما.

## بابەتێ: خودێ هندەکان ب فێ کتێبێ بلند دکەت.

٤٨٧ – (م) عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الحَارِثِ لَقِيَ عُمَرَ بِعُسْفَانَ، وَكَانَ عُمَرُ يَسْتَعْمِلُهُ عَلَى مَكَّةَ، فَقَالَ: مَنِ اسْتَعْمَلْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي؟ فَقَالَ: ابْنَ أَبْزَى، قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ: مَوْلًى مِنْ مَوَالِينَا، قَالَ: فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى؟ قَالَ: إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللهِ عزّ وجل، وَإِنَّهُ عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ. قَالَ عُمَرُ: أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ (ﷺ) قَدْ قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ**).

[م٨١٧].

**ژ عامرێ کورێ واسیلەیی (رضي الله عنه) نافعێ کورێ عەبدلحارسی ل عەسەفاتێ گەهشتە عومەری، و عومەری ئەو کربوو ئەمیرێ مەکەهێ، ئینا گۆتە وی: تە کی ل جهێ خۆ ل سەر خەلکێ مەکەهێ دانایە؟ گۆت: ئیبن بەزی، گۆت: و ئیبن بەزی کیژکە؟ گۆت: ئازاکرییەکە ژ ئازاکرییێت مە، گۆت: تە ئازاکرییەك پاش خۆ ل سەر وان هێلایە؟! گۆت: ب راستی ئەو قورئان خوینە و زانایە د میراتزانیێدا، عومەری گۆت: بزانن ب راستی پێغەمبەرێ هەوە یا گۆتی: (ب راستی خودێ دێ هندەکان ب فێ قورئانێ بلند کەت و هندەکێت دی پێ نزم کەت).**

## ١٢ ـ باب: لا يسافر بالقرآن الى أرض العدو.

## بابەتێ: نابیت ب قورئانێڤە وەغەر بهێتە کرن بۆ جهێ دژمنی.

٤٨٨ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ العَدُوِّ. [خ٢٩٩٠/ م١٨٦٩].

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تُسَافِرُوا بِالْقُرْآنِ، فَإِنِّي لاَ آمَنُ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ**).

**و ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهیا کری وەغەر ب قورئانێڤە بۆ عەردێ دژمنی بهێتە کرن.**

**و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: (وەغەرێ ب قورئانێڤە نەکەن ب راستی ئەز پێ پشت راست نینم دەستێ دژمنی بگەهیتێ).**

## ١٣ . باب: فضل القرآن.

## بابەتێ: تایبەتمەندییا قورئانێ.

٤٨٩ - عَنِ الْحَارِثِ الأَعْوَرِ، عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ أُمَّتَكَ سَتُفْتَتَنُ مِنْ بَعْدِكَ؟ قَالَ: فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَوْ سُئِلَ: مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا؟ قَالَ: (**الْكِتَابُ الْعَزِيزُ، الَّذِي** ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾﴾[فصلت]، **مَنِ ابْتَغَى الْهُدَى فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللهُ، وَمَنْ وَلِيَ هَذَا الْأَمْرَ مِنْ جَبَّارٍ فَحَكَمَ بِغَيْرِهِ قَصَمَهُ اللهُ، هُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ، وَالنُّورُ الْمُبِينُ، وَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ، فِيهِ خَبَرُ مَنْ قَبْلَكُمْ، وَنَبَأُ مَا بَعْدَكُمْ، وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، وَهُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ، وَهُوَ الَّذِي سَمِعَتْهُ الْجِنُّ فَلَمْ تَتَنَاهَ أَنْ قَالُوا:** ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ﴾ [الجن]، **وَلاَ يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ الرَّدِّ، وَلاَ تَنْقَضِي عِبَرُهُ، وَلاَ تَفْنَى عَجَائِبُهُ**).

ثُمَّ قَالَ عَلِيٌّ لِلْحَارِثِ: خُذْهَا إِلَيْكَ يَا أَعْوَرُ. [مي٣٣٧٥]

* إسناده حسن.

**ژ حارسێ ئەعوەر (رضي الله عنه) ژ عەلی: گۆتە پێغەمبەری: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی ئوممەتا تە پشتی تە دێ کەڤنە د بەلایاندا، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرسیار کر یان پرسیار هاتە کرن و دەرکەفتن ژێ چییە؟ گۆت: (کتێبا خودایێ ب هێزە ئەوا** ﴿لا يأتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه تنزيل من حكيم حميد﴾[1] **و هەر کەسێ راستەرێیێ ژ**

(١) رامان ب کورتی: گوهۆڕین ب چو ڕەنگان ناگەهیتێ، و چوجا پویچ نابیت و یا پارستییە ژ کێمکرن و زێدەکرنێ، و پشتی وێ ژی چو کتێب نائێن، وێ پویچ بکەن، چونکی ئەو ژ دەڤ خودایێ کاربنەجە، و شایی گەلە پەسنێ، یا هاتییە خوارێ.

**غەیری وێ بخوازیت خودێ دێ وی گومراکەت و هەر کەسێ ببیتە بەرپرس و حاکمدار ژ مەزنان و حوکم ب غەیری وێ کر خودێ دێ وی شکێنیت و ژ ناڤ بەت، و ئەو سەربلندی و سەرفەرازییە و یا پیرۆز و بنەجە و دویرە ژ گۆمانێ و رۆناهییا رۆنکەرە و رێکا راستە بەحسێ پێت بەری هەوە پێت تێدا و پێت پشتی هەوە و حوکمێ د ناڤبەرا هەوەدایە و یا ڤەبڕ و جوداکەرە حەقی و نەحەقییێ ژێك جودا دکەت و ڕاستییە، یاری تێدا نینە ئەجنان گوه لێ بوو نەگەهشتنە چو ژ بلی بێژن: ﴿إنا سمعنا قرآنا عجبا يهدي إلى الرشد﴾[1] و ب چۆنا دەمی و ب دوبارەکرنێ کەڤن نابیت و شیرەتێت وێ ب دویماهی ناهێن و رامان (یان موعجیزە)پێت وێ پێت عەجیب ب دویماهی ناهێن).**

**پاشی علی گۆتە حارسی ها وەرگرە ئەی ئەعوەر.**

٤٩٠ – عَنْ كَعْبِ الأَحْبَارِ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالْقُرْآنِ، فَإِنَّهُ فَهْمُ الْعَقْلِ، وَنُورُ الْحِكْمَةِ، وَيَنَابِيعُ الْعِلْمِ، وَأَحْدَثُ الْكُتُبِ بِالرَّحْمَنِ عَهْداً. وَقَالَ: فِي التَّوْرَاةِ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي مُنَزِّلٌ عَلَيْكَ تَوْرَاةً حَدِيثَةً، تَفْتَحُ فِيهَا أَعْيُناً عُمْياً، وَآذَاناً صُمّاً، وَقُلُوباً غُلْفاً. [مي ٣٣٧٠]

* إسناده حسن.

**ژ کەعبێ ئەحبار (رحمه الله) گۆت: قورئانێ بگرن و بەرنەدەن ب راستی ئەو تێگەهشتنا عەقلییە و رۆناهییا شارەزاییا دورستە و کانییا زانینێیە و دویماهی و نویترین کتێبە ژ دلۆڤانی، و گۆت: یا د تەوراتێدا هاتی: ئەی موحەممەد ب راستی ئەز دێ تەوراتەکا نوی دەمە تە چاڤێت کۆرە گوهێت مسمت و دلێت پەردەکری پێ ڤەکەی.**

٤٩١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مسعودٍ قَالَ: إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ مَأْدُبَةُ اللهِ، فَخُذُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ شَيْئاً أَصْفَرَ مِنْ خَيْرٍ مِنْ بَيْتٍ لَيْسَ فِيهِ مِنْ كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ. وَإِنَّ الْقَلْبَ الَّذِي لَيْسَ فِيهِ مِنْ كِتَابِ اللهِ شَيْءٌ خَرِبٌ، كَخَرَابِ الْبَيْتِ الَّذِي لاَ سَاكِنَ لَهُ. [مي ٣٣٥٠].

* رجاله ثقات.

---

(١) رامان ب کورتی: مە گوه ل قورئانەکا نەدیتی ئانکو: وەکی وێ نەهاتییە گوهلێبوون و نەهاتییە دیتن و کارلێکەر بوو.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی گۆت: ب راستی ئەڤ قورئانە گازییا خودێیە یان شیلانا خودێیە (شیلانا هزر و فکر و زانینێیە) ژێ وەرگرن هندی هوین پشێن، ب راستی ئەز چو تشتی ژ خێرێ ڤالاتر نابینم ژ مالەکێ چو ژ قورئانێ تێڤە نەبیت و ب راستی ئەو دلێ چو ژ قورئانێ تێدا نەبیت کافلە وەکی کاڤلێ مالێ ئاکنجی بۆ نەبن.**

٤٩٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ قَرَأَ القُرْآنَ فَقَدِ اسْتَدْرَجَ النُّبوَّةَ بَيْنَ جَنْبَيْهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لا يُوحى إِلَيْهِ، لا يَنْبَغِي لِصَاحِبِ القُرْآنِ أَنْ يَجِدَ مَعْ مَنْ وَجَدَ، وَلا يَجْهَلَ مَعْ مَنْ جَهِلَ، وَفِي جَوْفِهِ كَلامُ اللهِ تَعَالى).** [ك٢٠٢٨].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری، (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ قورئان خواند (ژبەر کر و کار پێ کر) ب راستی پێغەمبەراتی کرە د ناڤ سینگێ خۆدا بەلێ پا وەحی بۆ ناهێت، نەدورستە خودانێ قورائانێ تۆرە ببیت د گەل یێ تۆرە ببیت و نابیت خەلەت ببیت د گەل وی یێ خەلەت ببیت و ئاخفتنا خودێ د سینگێ ویدا بیت).**

## ١٤ ـ باب: القرآن كلام الله.

## بابەتێ: قورئان ئاخفتنا خودێیە.

٤٩٣ – عَنْ عَمْرِو بنِ دِينَارٍ قَالَ،: أَدْرَكْتُ النَّاسَ مُنْذُ سَبْعِينَ سَنَةً يَقُولُونَ: اللهُ الخَالِقُ وَمَا سِواهُ مَخْلُوقٌ، وَالقُرْآنُ كَلامُ اللهِ عزّ وجل. [هق١٠/٤٣].

**ژ عەمرێ کورێ دیناری (رحمه الله) گۆت: ئەڤە حەفتێ سالە ئەز گەهشتیمە خەلکی دبێژن خودێ چێکەرە و ژ بلی وی چێکرییە و قورئان ئاخفتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزنە.**

٤٩٤ – عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَضْلُ كَلامِ اللهِ عَلَى كَلامِ خَلْقِهِ، كَفَضْلِ اللهِ عَلَى خَلْقِهِ).** [مي٣٤٠٠].

* مرسل، إسناده حسن.

**ژ شەهرێ کورێ حەوشەبی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قەدرێ ئاخفتنا خودێ (کو قورئانە) ل سەر ئاخفتنا چێکرییێت وی وەکی قەدرێ خودێیە ل سەر چێکرییێت وی).**

## ١٥ ـ فضل استماع القرآن.

## بابەتێ: خێرا گوهدانا قورئانێ.

٤٩٥ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنِ استمَعَ إلى آيةٍ من كتابِ اللهِ، كانتْ له نُورًا. [مي ٣٤١٠](1).

* إسناده ضعيف.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: یێ گوهێ خۆ بدەتە ئایەتەکێ ژ قورئانێ دێ بۆ بیتە رۆناهی.**

٤٩٦ – عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ قَالَ: إنَّ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ لَهُ أَجْرٌ، وَإِنَّ الَّذِي يَسْتَمِعُ لَهُ أَجْرَانِ.

[مي٣٤٠٩]

[وانظر: ٤٧٥ . ٤٧٩، ٤٨٤].

---

(1) **شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینایە:** ٤٩٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُود قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اقْرَأْ عَلَيَّ)، قَالَ قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: (إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي)، قَالَ: فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ [النساء]، قَالَ لِي: (كُفَّ، أَوْ أَمْسِكْ)، فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَذْرِفانِ. [خ٥٠٥٥ (٤٥٨٢)/ م٨٠٠]

وفي رواية لهما: (فَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي). [خ٤٥٨٢].

**ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: قورئانێ بۆ من بخوینە، من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ، ئەز بۆ تە بخوینم، و بۆ تە یا هاتیە خوارێ؟! گۆت: د لێ من د چیتێ ژ ئێکێ دی گوه لێ ببم، من سۆرەتا نیساء بۆ خواند، هەتا گەهشتیمە ڤێ ئایەتێ:** ﴿فَكَيْفَ إذا جِئْنا مِنْ كُلِّ أُمَّة بِشَهيد وجِئْنا بِكَ عَلى هَؤلاءِ شَهِيداً﴾ **ڤێجا ئەو دێ د چ کراسدا بن دەمێ ئەم بۆ هەر ملەتەکی شاهدەکی دئینین [ پێغەمبەرێت وان شەهدەیییێ ل سەر وان ددەن ] و ئەم تە ژی ل سەر ڤان دکەینە شاهد. گۆتە من ڤێ گاڤێ بەسە، من بەرێ خۆ دایێ، چاڤێت وی رۆندك دباراندن.**

**و د ڤەگێرەکا دیدا یا وان گۆت: ب ڕاستی من دڤێت ژ ئێکێ دی گوه لێ ببم.**

**ژ خالدێ کورێ مەعدانی (رحمه الله) گۆت: ب راستی ئەوێ قورئانێ دخوینیت خێرەك بۆ وییە و یێ گوهدانێ بۆ دکەت دو خێر بۆ وینە.**

١٦ . باب: مقدار رفع الصوت بالقرآن.

## بابەتێ: ئاستێ بلندکرنا دەنگی ب قورئانێ.

٤٩٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ عَلَى قَدْرِ مَا يَسْمَعُهُ مَنْ فِي الْحُجْرَةِ، وَهُوَ فِي الْبَيْتِ.

[د١٣٢٧].

* حسن صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خواندنا پێغەمبەری (ﷺ) هند بوو یێ د ژۆرێڤە گوه لێ ببیت و ئەو ل مالا خۆ[1].**

٤٩٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ (ﷺ) بِاللَّيْلِ، يَرْفَعُ طَوْراً، وَيَخْفِضُ طَوْراً. [د١٣٢٨]

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: خواندنا پێغەمبەری (ﷺ) ب شەڤێ جار بلند دکر جار نزم دکر.**

٤٩٩ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ لَيْلَةً، فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه يُصَلِّي، يَخْفِضُ مِنْ صَوْتِهِ، قَالَ: وَمَرَّ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَهُوَ يُصَلِّي رَافِعاً صَوْتَهُ. قَالَ: فَلَمَّا اجْتَمَعَا عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ النَّبِيِّ (ﷺ): (**يَا أَبَا بَكْرٍ! مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي تَخْفِضُ صَوْتَكَ**)، قَالَ: قَدْ أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: وَقَالَ لِعُمَرَ: (**مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي رَافِعاً صَوْتَكَ**)، قَالَ: فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ!

---

(١) **ئانکو: ل مال و د شەڤنڤێژاندا دەنگێ خۆ بلند نەدکر.**

أُوقِظُ الْوَسْنَانَ، وَأَطْرُدُ الشَّيْطَانَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (يَا أَبَا بَكْرٍ! ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئاً)، وَقَالَ لِعُمَرَ: (اخْفِضْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئاً). [د١٣٢٩/ ت٤٤٧]

* صحيح.

**ژ ئەبی قەتادەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د بەر ئەبوبەکریڕا بۆری نڤێژ دکر و دەنگێ خۆ نزم دکر، و د بەر عومەریڕا بۆری نڤێژ دکر و دەنگێ خۆ بلند دکر، ڤێجا دەمێ هەردو ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) کۆم بووین: گۆتە ئەبوبەکری: (ئەیی ئەبا بەکر ئەز د بەر تەڕا بۆریم تە نڤێژ دکر و تە دەنگێ خۆ نزم دکر). گۆت: من گەهاندە وی یێ ئەز د گەل دئاخفتم، و گۆت: (و ئەز د بەر تەڕا بۆریم ئەی عومەر تە دەنگێ خۆ بلند دکر)، گۆت: (ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ نڤستی هشیار دکەم و شەیتانی دەردئێخم) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە ئەبی بەکری: (پیچەکێ دەنگێ خۆ بلند بکە) و گۆتە عومەری: (پیچەکێ دەنگێ خۆ نزم بکە).**

٥٠٠ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ، فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ، فَكَشَفَ السِّتْرَ، وَقَالَ: (أَلاَ إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ، فَلاَ يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضاً، وَلاَ يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ)، أَوْ قَالَ: (فِي الصَّلاَةِ). [د١٣٣٢]

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئعتیکاف[1] ل مزگەفتێ کر گوهـ لێ بوو دەنگێ خۆ ب خواندنێ بلندکەن، ئینا پەردە راکر و گۆت: (ب راستی هوین هەمی ب دەنگێ نزم یێ د گەل خودایێ خۆ دئاخڤن ئەزیەتا ئێك و دو نەکەن و دەنگێ خۆ ل سەر ئێکدو بلند نەکەن یان گۆت د نڤێژێدا).**

٥٠١ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ). [د١٣٣٣/ ت٢٩١٩/ ن١٦٦٢]

* صحيح.

(١) ئعتیکاف مانا ل مزگەفتێیە بۆ پەرستنێ.

**ژ عوقبەیێ كورێ عامری (ﷺ) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ دەنگێ خۆ ب قورئانێ بلند بكەت وەكی وییە یێ سەدەقێ ب ئاشكرایی ددەت، و یێ دەنگێ خۆ ب قورئانێ فەشێریت وەكی وییە یێ سەدەقێ ب نهێنی ددەت).**

## ١٧ ـ باب: تحزيب القرآن.

## بابەتێ: پشككرنا قورئانێ.

٥٠٢ - عَنِ ابْنِ الْهَادِ قَالَ: سَأَلَنِي نَافِعُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، فَقَالَ لِي: فِي كَمْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ فَقُلْتُ: مَا أُحَزِّبُهُ، فَقَالَ لِي نَافِعٌ: لاَ تَقُلْ مَا أُحَزِّبُهُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**قَرَأْتُ جُزْءاً مِنَ الْقُرْآنِ**). قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ ذَكَرَهُ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ. [د١٣٩٢]

* صحيح.

**ژ ئیبن ئەلهادی (ﷺ) گۆت: نافعێ كورێ جوبەیرێ كورێ موتعمی پرسیار ژ من كر. د چەندێدا تو قورئانێ دخوینی؟ من گۆت: ئەز قورئانێ ناكەمە پشك پشك، ئینا نافعی گۆتە من: نەبێژە ئەز ناكەمە پشك پشك، ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من پشكەك ژ قورئانێ خواند)، گۆت: ئەز هزر دكەم وی ئەڤە یا ژ موغیرەیێ كورێ شوعبەی ڤەگێڕای.**

٥٠٣ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: وَجد رسولُ اللهِ (ﷺ) ذاتَ ليلةٍ شيئًا، فلما أصبح قيل: يا رسولَ اللهِ، إنَّ أثرَ الوجَعِ عليك لَبَيِّنٌ، قال: (**أَمَا إِنِّي علَى ما تَرَوْنَ -بِحَمْدِ اللهِ- قد قرأتُ البارحةَ السَّبْعَ الطِّوالَ**)(١). [مه١١٣٦/ حب٣١٩]

---

(١) **شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینایە: ٥٠٣** - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ). [م٧٤٧].

* إسناده ضعيف (ناصر).

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب خەم کەفت، ڤێجا دەمێ بوویە سپێدە گۆتنێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ نیشانێت ئێشانێ ل سەر تە د دیارن، گۆت: (ب راستی ئەز د سەر وێرا یا هوین دبینن ـ سوپاس بۆ خودێ ـ شڤێدی من حەفت سۆرەتێت درێژ خواندن).**

١٨ . باب من نسي شيئا من القرآن.

**بابەتێ: یێ تشتەکی ژ قورئانێ ژبیر بکەت.**

٥٠٤ – عَنْ أَنَسِ بنِ مالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(عُرِضَتْ عَليَّ أجورُ أمتي، حتى الْقَذاةُ يُخرجُها الرَّجُلُ مِنَ المَسجدِ، وعُرِضَ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتي، فَلَمْ أَرَ ذَنبًا أعظَمَ مِنْ سُورةٍ مِنَ القرآنِ، أوْ آيةٍ أُوتِيَهَا رَجُلٌ ثُمَّ نسيَها).** [د٤٦١/ ت٢٩١٦](١).

*ضعيف.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خێرێت ئوممەتا من نیشا من دان هەتا ئەو گلێشکێ (هندی پرتا کایێ) موسلمان ژ مزگەفتێ دەردئێخیت و گونەهێت وێ ژی نیشا من دان من چو گونەهـ مەزنتر نەدیتن ژ سۆرەتکێ یان ئایەتکێ ژ قورئانێ ب رزقێ موسلمانەکی کربیت پاشی ژبیر کربیت).**

---

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: هەر کەسێ ژ پشکا خۆ ژ قورئانێ ب شەڤ بنڤیت و نەخوینیت یان تشتەکی ژێ، و د ناڤبەرا نڤێژا سپێدێ و نڤێژا نیڤرۆدا بخوینیت دێ بۆ هێتە نڤیسین هەرومکی وی ب شەڤ خواندی.**

**(١) شێخ سالحی نەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ نینایە:** ٥٠٤ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (بِئْسَ ما لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ، بَلْ نُسِّيَ، وَاسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ أَشَدُّ تَفَصِّياً مِنْ صُدُورِ الرِّجالِ مِنَ النَّعَمِ). [خ٥٠٣٢/ م٧٩٠].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: چ پیسە ناخفتنە نێك بێژیت: نەڤ ئایەت و نەڤ ئایەتە من ژبیرکرن، بەلێ یێ ژ بیرێ چۆین و قورئانێ ل بیرا خۆ بینن، ب راستی ئەو د سینگێ مرۆڤاندا زویتر دچیت ژ کەوالان.**

## ١٩ ـ باب: قوم يتعجلون أجر القرآن.

## بابەتێ: هندەك لەزێ ل كرێیا قورئانێ دكەن د دنیایێدا دڤێن.

٥٠٥ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَنَحْنُ نَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَفِينَا الْأَعْرَابِيُّ وَالْأَعْجَمِيُّ، فَقَالَ: (**اقْرَؤوا فَكُلٌّ حَسَنٌ، وَسَيَجِيءُ أَقْوَامٌ يُقِيمُونَهُ كَمَا يُقَامُ الْقِدْحُ، يَتَعَجَّلُونَهُ، وَلاَ يَتَأَجَّلُونَهُ**). [د٨٣٠].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی، (رضي الله عنه) هاتە دەڤ مە و مە قورئان دخواند و ژ مە هەبوون عەرەب و بیانی، ئینا گۆت: (بخوینن هوین هەمی باشە (عەرەب و بیانی پێ ئەزمانێ وی باش نەكەڤیتە سەر) و هندە مرۆڤ دێ هێن دێ خواندنا خۆ راست كەت راستكرنا دارێ تیرێ لەزێ ل خێرا وێ دكەن (دنیایێ پێ دخوازن) و گیرۆ ناكەن بۆ ئاخرەتێ (ئاخرەتێ پێ ناخوازن).**

٥٠٦ – عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**اقْرَؤوا الْقُرْآنَ، وَلاَ تَغْلُوا فِيهِ، وَلاَ تَجْفُوا عَنْهُ، وَلاَ تَأْكُلُوا بِهِ، وَلاَ تَسْتَكْثِرُوا بِهِ**). [حم١٥٥٢٩]

* حديث صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ شیبلی، (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (فێری قورئانێ ببن، و ئەگەر هوین فێربوونێ توندییێ تێدا نەكەن[1] و سستییێ تێدا نەكەن و پشتا خۆ نەدەنە خواندنا وێ، و دنیایێ پێ نەخۆن و دنیایێ پێ نەخوازن، و زێدەیێ (یا متا و پەرگارێت دنیایێ) پێ نەخوازن و نەكەن (ئانكو نەكەنە دەرگەهەك و رێكەك هوین پێ بگەهنە زێدەییا دنیایێ).**

---

(1) كویر بچنە تێدا و ژ تخوییێت وێ بێت دورست دەركەڤن، مەرەم دڤێت د گەل قورئانێ و د هەمی كار و باراندا مرۆڤ پێ نافنجی بیت.

## ٢٠ ـ باب: ماجاء في فضل قراءة عدد من الآيات.

## بابەتێ: ئەو تشتێ د خێرا خواندنا هندە ئایەتاندا هاتی.

٥٠٧ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ عَشْرَ آيَاتٍ كُتِبَ مِنَ الذَّاكِرِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَرَأَ بِخَمْسِ مِائَةِ آيَةٍ إِلَى الْأَلْفِ أَصْبَحَ وَلَهُ قِنْطَارٌ مِنَ الْأَجْرِ، قِيلَ: وَمَا الْقِنْطَارُ؟ قَالَ: مِلْءُ مَسْكِ الثَّوْرِ ذَهَباً. [مي٣٥٠١]

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: یێ دەھ ئایەتان د شەڤەکێد بخوینیت ئەو ژ زکرکەران هاتە نڤیسین و یێ سەد ئایەتان بخوینیت ئەو ژ گوهدار و خودێ ترس و پەرستکاران هاتە نڤیسین و یێ پێنج سەد ئایەتان هەتا هزاران بخوینت سپێدە لێ بوو و بۆ وی ڤینتارەکا خیرێ یا هەی. گۆتن: ڤینتار چییە؟ گۆت: تژی کەڤلێ گای زێر بیت.**

٥٠٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ بِخَمْسِينَ آيَةً، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ.

[مي٣٤٨٩]

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: یێ پێنجی ئایەتان د شەڤێدا بخوینیت ئەو ژ بێ ئاگەهان ناهێتە نڤیسین.**

٥٠٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ حَافَظَ عَلى هَؤلاَءِ الصَلَواتِ المكتوباتِ لم يُكْتَبْ مِن الغافلينَ، ومَنْ قرأَ في ليلةٍ مائةَ آيةٍ لم يُكتب مِن الغافلين –أو كُتِبَ من القانتين–).**

[مه١١٤٢/١].

* إسناده صحيح على شرطهما (ناصر).

**ژ ئەبی هورەیرەی (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ پارێزییێ ل سەر نڤێژێت فەرز کر ئەو ژ بێ ئاگەهان ناهێتە نڤیسین، و هەر کەسێ سەد ئایەتان د شەڤەکێدا بخوینیت ئەو ژ بێ ئاگەهان ناهێتە نڤیسین یان ئەو ژ گوهدار و خودێ ترس و پەرستکاران هاتە نڤیسین).**

٥١٠ - عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قَالَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): **(مَن قَرَأَ عَشْرَ آياتٍ في ليلةٍ لَمْ يُكتبْ من الغافِلينَ)**. [ك٢٠٤١].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ دەھ ئایەتان د شەڤەکێدا بخوینیت، ئەو ژ بێ ئاگەهان ناهێتە نڤیسین).**

**٢١ ـ باب: ما جاء في ختم القرآن.**

**بابەتێ: تشتێ د خەتمکرنا قورئانێدا هاتی.**

٥١١ - عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ قَالَ: إِنَّمَا دَعَوْنَاكَ أَنَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْتِمَ الْقُرْآنَ، وَإِنَّهُ بَلَغَنَا: أَنَّ الدُّعَاءَ يُسْتَجَابُ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ، قَالَ: فَدَعَوْا بِدَعَوَاتٍ. [مي٣٥٢٥]

* إسناده صحيح.

**ژ حەکەمی (﵀) ژ موجاهدی (﵀) گۆت: هنارتە دویڤ منڕا و گۆت: ب ڕاستی مە تو بەس بۆ هندێ یێ داخواز کری مە دڤیا ئەم قورئانێ خەتم بکەین و یا گەهشتییە مە دوعا ل نك خەتمکرنا قورئانێ قەبویل دبن و گۆت: دوعا ب هندە دوعایان کرن.**

٥١٢ – عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ قَالَ: إِذَا قَرَأَ الرَّجُلُ الْقُرْآنَ نَهَاراً صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ قَرَأَهُ لَيْلاً صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى يُصْبِحَ.

- وفي رواية: قَالَ سُلَيْمَانُ الأَعْمَشُ: فَرَأَيْتُ أَصْحَابَنَا يُعْجِبُهُمْ أَنْ يَخْتِمُوهُ أَوَّلَ النَّهَارِ، وَأَوَّلَ اللَّيْلِ. [مي٣٥٢٠، ٣٥٢١]

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبراهیمێ نەخەعی (رحمه الله) گۆت: ئەگەر موسلمانی قورئان ل رۆژێ خەتم كر ملیاكەت هەتا ئێڤار لێ دبیت دوعا بۆ دكەن و ئەگەر ب شەڤێ خەتم كر ملیاكەت هەتا سپێدە لێ دبیت دوعا بۆ دكەن.**

- **سولەیمانێ ئەعمەش گۆت: هەڤالێت مە حەز دكر ئەو خەتما خۆ ل دەستپێكا رۆژێ یان ل دەستپێكا شەڤێ بكەن.**

٢٢ ـ باب: لا يمس القرآن إلا طاهر.

**بابەتێ: دەستێ خۆ ناكەتە قورئانێ یێ پاك نەبیت.**

٥١٣ – عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ بِكِتَابٍ فِيهِ الْفَرَائِضُ وَالسُّنَنُ وَالدِّيَاتُ، وَبَعَثَ بِهِ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَفِيهِ قَالَ: (وَلاَ يَمَسُّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ). [ط٤٦٨] [هق٣٠٩/١].

**ژ ئەبی بەكرێ كورێ موحەممەدێ كورێ عەمری كورێ حەزمی ژ بابێ خۆ ژ باپیرێ خۆ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ خەلكێ یەمەنێ نڤیسانەك ب فەرزان و سونەتان و خوینان نڤیسی و د گەل عەمرێ كورێ حەزمی هنارت، و حەدیس ڤەگێرا و تێدا هاتییە: و گۆت: (و كەس دەستێ خۆ نەكەتە قورئانێ یێ پاك نەبیت).**

٥١٤ – عَنْ عَبدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبي (ﷺ): (**لاَ يَمَسُّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ**). [هق ١/٨٨].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (کەس دەستێ خۆ نەکەتە قورئانێ بێ پاك نەبیت).**

٥١٥ – عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أُمْسِكُ المصْحَفَ عَلَى سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ فَاحْتَكَكْتُ، فَقَالَ سَعْدٌ: لَعَلَّكَ مَسَسْتَ ذَكَرَكَ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: قُمْ فَتَوَضَّأْ، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ ثُمَّ رَجَعْتُ. [هق ١/٨٨].

**ژ موسعەبێ کوڕێ سەعدی (رحمه الله) گۆت: من قورئان بۆ سەعدێ کوڕێ ئەبی وەقاس دگرت، من خۆ خوراند، ئینا سەعدی گۆت: دبیت تە دەستێ خۆ کربیتە ناڤرانا خۆ؟ من گۆت: بەلێ، گۆت: هلۆ دەستنڤێژا خۆ بشۆ، ئەز رابووم من دەستنڤێژا خۆ شویشت پاشی زڤریم.**

٥١٦ – عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمَّا بَعَثَهُ وَالِياً إِلَى اليَمَنِ قَالَ: (**لاَ تَمَسَّ الْقُرْآنَ إِلاَّ وَأَنْتَ طَاهِرٌ**). [ك ٦٠٥١]

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ حەکیمێ کوڕێ حیزامی دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) هنارتییە یەمەنێ گۆت: (دەست نەکە قورئانێ تو بێ پاك نەبی).**

## ٢٣ . باب: القراءة على غير وضوء.

## بابەتێ: خواندنا قورئانێ بێ دەستنڤێژ.

٥١٧ – عَنْ أَبِي الْغَرِيفِ قَالَ: أُتِيَ عَلِيٌّ رضي الله عنه بِوَضُوءٍ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ ثَلاَثاً، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثاً، وَغَسَلَ يَدَيْهِ وَذِرَاعَيْهِ ثَلاَثاً ثَلاَثاً، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ

رَسُولَ اللهِ (ﷺ) تَوَضَّأَ، ثُمَّ قَرَأَ شَيْئاً مِنَ الْقُرْآنِ ثُمَّ قَالَ: **(هَذَا لِمَنْ لَيْسَ بِجُنُبٍ، فَأَمَّا الْجُنُبُ فَلاَ وَلاَ آيَةَ)**. [حم٨٧٢].

* إسناده حسن.

**ژ بابێ غەریفی (رضي الله عنه) گۆت: ئاڤا دەسترویفەدانێ بۆ عەلی (رضي الله عنه) ئینان، ئینا سێ جاران ئاڤ د دەڤێ خۆ وەردا، و سێ جاران دا بن دفنا خۆ، و سێ جاران ناڤچاڤێت خۆ شویشتن، و دەستێت خۆ و زەندکێت خۆ سێ جاران شویشتن، و سەرێ خۆ ڤەمالی، و پێت خۆ شویشتن، و پاشی گۆت: من هۆسا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت دەستڤێژا خۆ دشویشت، پاشی تشتەك ژ قورئانێ خواند، پاشی گۆت: (ئەڤ خواندنە بۆ وی دورستە یێ ب جەنابەت نەبیت، بەلێ یێ ب جەنابەت بیت نەخێر خۆ ئایەتەك ژی).**

٥١٨ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنَّا مَعَ سَلْمَانَ فَخَرَجَ فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ جَاءَ فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ، لَوْ تَوَضَّأْتَ لَعَلَّنَا أَنْ نَسْأَلَكَ عَنْ آيَاتٍ، قَالَ: إِنِّي لَسْتُ أَمَسُّهُ، إِنَّمَا ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ۝٧٩﴾ [الواقعة:٧٩]، فَقَرَأَ عَلَيْنَا مَا شِئْنَا. [ك٣٧٨٢/ هق١/٨٨].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدولرەحمانێ کورێ یەزیدی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د گەل سەلمانی بووین، چۆ دەستئاڤا خۆ خۆش کر پاشی هات، من گۆتێ: ئەی بابێ عەبدوللایی ئەگەر تە دەستڤێژا خۆ شویشتبا دبیت ئەم پرسیارا هندە ئایەتان ژ تە بکەین، گۆت: ئەز دەستێ خۆ ناکەمێ، ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ کەس دەستێ خۆ ناکەتێ یێت پاك نەبن، ئەو بۆ مە خواندن یا مە ڤیای.**

٥١٩ – عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ كَانَ فِي قَوْمٍ وَهُمْ يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ رَجَعَ وَهُوَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! أَتَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَلَسْتَ عَلَى وُضُوءٍ؟ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَنْ أَفْتَاكَ بِهَذَا، أَمُسَيْلِمَةُ؟ [ط ٤٦٩]

* رجاله ثقات، وابن سيرين لم يسمع من عمر.

**ژ موحەممەدێ کورێ سیرینی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی د گەل هندە کەسان بوو، و وان قورئان دخواند، بۆ هەوجەییا خۆ دەرکەفت پاشی زڤری و وی قورئان دخواند، ئینا زەلامەکی گۆتێ ئەی میرێ باوەریداران تو قورئانێ دخوینی و تو یێ بێ دەستنڤێژ؟ ئینا عومەری گۆت: کێ ئەڤ فەتوە دایە تە موسەیلەمەیی؟.**

## ٢٤ . باب: تعلم القرآن والعمل به.

## بابەتێ: فێری قورئان خواندن و کارپێکرنێ ببە.

٥٢٠ – عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَنْ كَانَ يُقْرِئُنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُمْ كَانُوا يَقْتَرِئُونَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَشْرَ آيَاتٍ، فَلاَ يَأْخُذُونَ فِي الْعَشْرِ الْأُخْرَى حَتَّى يَعْلَمُوا مَا فِي هَذِهِ مِنَ الْعِلْمِ وَالْعَمَلِ، قَالُوا: فَعَلِمْنَا الْعِلْمَ وَالْعَمَلَ. [حم٢٣٤٨٢].

* إسناده حسن.

**ژ عەتائی (رحمه الله) ژ بابێ عەبدولرەحمانی (رحمه الله) گۆت: ئەوێت قورئان نیشا مە ددا وان دەھ ئایەت ژ خواندنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەردگرتن و دەھێت دی نەوەردگرتن هەتا زانین و کارێ تێدا فێرببان، گۆتن ئەم فێری زانین و کاری بووین.**

٥٢١ – عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَبْدِ الله ـ ابنِ مَسْعُودٍ ـ قَالَ: كُنَّا إِذَا تَعَلَّمْنَا مِنَ النَّبِي (ﷺ) عَشْرَ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ، لَمْ نَتَعَلَّمْ مِنَ الْعَشْرِ التي نَزَلَتْ بَعَدَهَا حَتَّى نَعْلَمَ مَا فِيهِ، قِيلَ لِشَرِيكٍ: مِنَ الْعَمَلِ؟ قَالَ: نَعَمْ. [ك٢٠٤٧/هق٣/١١٩]

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ شەریکی (رحمه الله) ژ عەتائێ کورێ سائبی (رحمه الله) ژ بابێ عەبدولرەحمانی (رحمه الله) ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رحمه الله) گۆت: ئەگەر ئەم ژ پێغەمبەری (ﷺ) فێری دەھ ئاتان ژ قورئانێ ببایـنە ئەم فێری دەھێت دی یێت دویڤرا ھاتین نەدبووین ھەتا مە زانیبا کا چ تێدایە، گۆتنە شەریکی ژ کاری. گۆت: بەلێ.**

٥٢٢ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ قَالَ: لَقَدْ عِشْنَا بُرْهَةً مِنْ دَهْرِنَا وَأَحَدُنَا يُؤْتَى الإِيمَانَ قَبلَ الْقُرْآنِ، وَتَنْزِلُ السُّورَةُ عَلَى مُحَمَّدٍ (ﷺ)، فَيَتَعَلَّمُ حَلاَلَهَا وَحَرَامَهَا، وَآمِرَهَا، وَزَاجِرَهَا، وَمَا يَنْبَغِي أَنْ يَقِفَ عَنْدَهُ مِنْهَا، كَمَا تَعَلَّمُونَ أَنْتُمُ الْيَوْمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ لَقَدْ رَأَيْتُ الْيَوْمَ رِجَالاً يُؤْتَى أَحَدُهُمُ الْقُرْآنَ قَبْلَ الإِيمَانِ، فَيَقْرَأُ مَا بَيْنَ فَاتِحَتِهِ إِلَى خَاتِمَتِهِ، مَا يَدْرِي مَا آمِرُهُ وَلاَ زَاجِرُهُ، وَلاَ مَا يَنْبَغِي أَنْ يَقِفَ عِنْدَهُ مِنْهُ، فَيَنْثُرُهُ نَثْرَ الدَّقَلِ. [ك١٠١/هق٣/١٢٠].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمەکی ژ ژیێ خۆ ژیاین و ئێکی ژ مە خودێ باوەری بەری قورئانێ ددایێ، و سۆرەت ل سەر موحەممەدی (ﷺ) دھاتە خوارێ فێری حەلالێ وێ و حەرامێ وێ دبوو و کا چ پێدڤییە ل سەر تێدا راوەستیت ھەروەکی ھوین فێری قورئانێ دبن، پاشی گۆت: ب راستی من ھندە مرۆڤ دیتن قورئان پێ دھێتە دان ڤێجا ژ فاتحا وێ ھەتا دویماھییا وێ دخوینیت و نوزانیت کا فەرمانا وێ چییە و پاشڤەلێدانا وێ چییە و یا پێدڤی ل سەر تێدا راوەستیت، ژێکڤەدکەن ژێکڤەکرنا ڤەسپێت بێخێر (ئانکو ب لەز دخوینن).**

## ٢٥ . باب: التكبير عند نهاية السور القصار.

## بابەتێ: گۆتنا (الله اكبر) دویماهییا سۆرەتێت کورت.

٥٢٣ - عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلى إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ قِسْطَنْطِينَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١﴾ قَالَ لِي: كَبِّرْ عِنْدَ خَاتِمَةِ كُلِّ سُورَةٍ حَتَّى تَخْتِمْ، وَأَخْبَرَهُ عَبْدُ اللهِ بْنِ كَثِيرٍ: أَنَّهُ قَرَأَ عَلى مُجَاهِدٍ فَأَمَرَهُ بِذلِكَ، وَأَخْبَرَهُ مُجَاهِدٌ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَمَرَهُ بذلِكَ، وَأَخْبَرَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَمَرَهُ بِذلِكَ، وَأَخْبَرَهُ أُبيُّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَهُ بِذلِكَ. [ك٥٣٢٥]

* قال الذهبي: فيه البزي، قد تُكُلِّمَ فيه.

**ژ عیکریمەیێ کورێ سولەیمانی (رحمه الله) گۆت: من ل دەڤ ئسماعیلێ کورێ عەبدوللایێ کورێ قوستەنتینی قورئان دخواند، ڤێجا دەمێ ئەز گەهشتیمە سۆرەتا ﴿وَٱلضُّحَىٰ﴾ گۆتە من دویماهییا هەر سۆرەتەکێ بێژە (الله أكبر الله أكبر) هەتا تو خەتم دکەی و گۆتێ: عەبدوللایێ کورێ کەسیری ل دەڤ موجاهدی دخواند فەرمانا وی ب ڤێ کر، و موجاهدی گۆتە وی ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) فەرمانا وی ب ڤێ کر، و ئیبن عەباسی گۆتە وی ئوبەیێ کورێ کەعبی فەرمانا وی ب ڤێ کر، و ئوبەیێ کورێ کەعبی گۆتە وی پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا وی ب ڤێ کر.**



## الفصل الثالث: فضل بعض السور والايات

## پشكا سێیێ: قەدرێ هندە سۆرەت و ئایەتان.

### ١ ـ باب:فضل سورة الفاتحة.

### بابەتێ: قەدرێ سۆرەتا فاتیحەیێ.

٥٢٤ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) سَمِعَ نَقِيضاً مِنْ فَوْقِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ، لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ، فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَقَالَ: هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الأَرْضِ، لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ، فَسَلَّمَ وقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا، لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ. [م٨٠٦].

**و ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: د دەمەكیدا جبریل سلاڤ ل سەر بن ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) یێ روینشتی بوو، ل هنداڤ خۆ گوه ل دەنگەكی ڤەكرنا دەرگەهەكی بوو، سەرێ خۆ بلند كر و گۆت: ئەڤە دەرگەهەكە ژ عەسمانی ئەڤرۆكە هاتە ڤەكرن و د بنیڕا نەهاتییە ڤەكرن ئەڤرۆكە نەبیت، ملیاكەتەك تێڕا هاتە خوارێ، گۆت: ئەڤە ملیاكەتەكە هاتە عەردی و ئەو د بنیڕا نەهاتییە خوارێ ئەڤرۆ نەبیت، سلاڤ كر و گۆت: مزگینی بۆ تە ب دانا دو رۆناهییان، نەهاتینە دان بۆ چو پێغەمبەران بەری تە، فاتحا قورئانێ و دویماهییا سۆرەتا بەقەرە، تو چ ژێ ناخوینی ئەگەر خودێ پێ نەدەتە تە.**

٥٢٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَا أُبَيُّ)** ! وَهُوَ يُصَلِّي، فَالْتَفَتَ أُبَيٌّ وَلَمْ يُجِبْهُ، وَصَلَّى أُبَيٌّ فَخَفَّفَ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ، مَا مَنَعَكَ يَا أُبَيُّ أَنْ تُجِيبَنِي إِذْ دَعَوْتُكَ)** ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي كُنْتُ فِي الصَّلاَةِ، قَالَ: **(أَفَلَمْ تَجِدْ فِيمَا أَوْحَى اللهُ إِلَيَّ أَنِ** ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ [الأنفال:٢٤] )، قَالَ: بَلَى، وَلاَ أَعُودُ

إِنْ شَاءَ اللهُ، قَالَ: (**أَتُحِبُّ أَنْ أُعَلِّمَكَ سُورَةً لَمْ يَنْزِلْ فِي التَّوْرَاةِ وَلاَ فِي الْإِنْجِيلِ، وَلاَ فِي الزَّبُورِ، وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلُهَا**) ؟ قَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**كَيْفَ تَقْرَأُ فِي الصَّلاَةِ**) ؟ قَالَ: فَقَرَأَ أُمَّ الْقُرْآنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! مَا أُنْزِلَتْ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الْإِنْجِيلِ، وَلاَ فِي الزَّبُورِ، وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلُهَا، وَإِنَّهَا سَبْعٌ مِنَ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُعْطِيتُهُ**).

[ت٢٨٧٥/ مي٣٤١٦]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ دەڤ ئوبەیێ کورێ کەعبی، گازی کرێ گۆت: (ئەی کەعب)، و وی نڤێژ دکر، زڤری و بەرسڤا وی نەدا و نڤێژا خۆ کر و سڤك کر، پاشی چۆ دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: سلاڤێت خودێ ل سەر تەبن ئەی پێغەمبەرێ خودێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (و سلاڤ ل سەر تەبن، چ نەهێلا تو بەرسڤا من بدەی دەمێ من گازی تە کری)؟ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز د نڤێژێدا بووم. گۆت: (ما تە د وحییا بۆ من هاتیدا نەدیتیە: ﴿اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾)[1] گۆت بەلێ، و ئەز نازڤرمەڤێڤە ب ئانەهییا خودێ، گۆت: (ئەرێ تە دڤێت ئەز سۆرەتەکێ نیشا تە بدەم وەکی وێ نە د تەوراتێدا و نە د ئنجیلێدا و نە د زەبوورێدا و نە د قورئانێدا نەهاتبیتە خوارێ)؟ گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تو چ دنڤێژێدا دخوینی)؟ گۆت: سۆرەتا فاتحێ (ئوم القورئان) خواند، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی کەمە یێ کارێ من و جانێ من د دەستیدا وەکی وێ نە د تەوراتێدا و نە د ئنجیلێدا و نە د زەبوورێدا و نە د**

(١) ئانکو: گەلی خودان باوەران، بەرسڤا خودێ و پێغەمبەری بدەن ﴿ئانکو ب لەز گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری بکەن﴾ دەمێ بۆ وی تشتی گازی هەوە دکەت یێ هەوە زێندی دکەت.

**قورئانێدا نەهاتینە خوارێ، و ب راستی ئەوە حەفت ئایەتێت هەر دهێنە دوبارەکرن و قورئانا مەزنە یا دایە من).**

٢ . باب: فضل البقرة وآل عمران وآية الكرسي.

**بابەتێ: خێرا سۆرەتا بەقەرە و ئالیعیمران و ئایەتا کورسی.**

٥٢٦ – (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبقرَةِ. مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ).** [خ٤٠٠٨/ م٨٠٧، ٨٠٨].

و ژ ئەبی مەسعودێ بەدری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ دو ئایەتێت دویماهییا سۆرەتا بەقەرە د شەڤێدا بخوینیت، بەسی وینە)**[1].

٥٢٧ – (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) **(يَا أَبَا الْمُنْذِرِ! أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ مَعَكَ أَعْظَمُ)** ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: **(يَا أَبَا الْمُنْذِرِ! أَتَدْرِي أَيُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ مَعَكَ أَعْظَمُ)** ؟ قَالَ: قُلْتُ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ﴾ [البقرة:٢٥٥]، قَالَ: فَضَرَبَ فِي صَدْرِي وقَالَ: **(واللهِ! لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ).** [م٨١٠].

و ژ ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەی بابێ مونزری ئەرێ تو دزانی کیژ ئایەت ژ قورئانێ ل دەڤ تە مەزنترە)؟** گۆت: من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی پتر دزانن. گۆت: **(ئەی بابێ مونزری ئەرێ تو دزانی کیژ ئایەت ژ قورئانێ ل دەڤ تە مەزنترە)؟** گۆت: من گۆت ﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُو الحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ ئینا دەستێ خۆ ل سینگێ من دا و گۆت: **(خودێ زانینێ بۆ تە ساناهی بکەت ئەی بابێ مونزری).**

٥٢٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ).** [م٧٨٠].

---

(1) ژ ئەزیەتا وێ شەڤێ یان ژ رابوونا شەڤێ.

و ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مالێت خۆ نەکەنە گۆڕستان، ب راستی شەیتان ژ وێ مالێ درەڤیت یا سۆرەتا بەقەرە تێڤە دهێتە خواندن).**

٥٢٩ – (م) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (اقْرَؤُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعاً لأَصْحَابِهِ. اقْرَؤُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ، تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا. اقْرَؤُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ). [م٨٠٤].

ژ ئومامەیێ باهلی (﵁) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(قورئانێ بخوینن، ب راستی ئەو دێ رۆژا قیامەتێ هێت بەرەڤانییێ ژ خودانێ خۆ کەت هەردو رۆناهییا[1] سۆرەتا بەقەرە و ئالیعیمران، ب راستی ئەو رۆژا قیامەتێ دێ هێن هەرومکی دو عەورانە[2] یان دو سیبەرن[3] یان دو کۆمێت بالندەیێت پەڕ ڤەکرینە[4] و بەرەڤانییێ ژ خودانێت خۆ دکەن، سۆرەتا بەقەرە بخوینن ب راستی وەرگرتنا وێ[5] بەرکەت و پیرۆزییە، و هێلانا وێ پەشێمانییە و سێربەند نەشێن بخوینن).**

٣ ـ باب: فضل السبع الأول.

**بابەتێ: خێرا حەفت سۆرەتێت ئێکێ.**

٥٣٠ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ أَخَذَ السَّبْعَ الْأُوَلَ فَهُوَ حَبْرٌ). [حم٢٤٤٤٣].

* إسناده حسن.

ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ حەفت سۆرەتێت ئێکێ وەرگریت[6] ئەو زانایە).**

(١) ژ بەر رۆناهییا فەرمانێت تێدا و بۆ خودانێ خۆ رۆژا قیامەتێ دبنە رۆناهی.

(٢) خودانێ خۆ ژ کەلەژانا رۆژا قیامەتێ دپارێزن.

(٣) سیبەرێ ل خودانێ خۆ دکەن.

(٤) سەر سەرێ خودانێ خۆ دکەنە سیبەر.

(٥) بەردەوامیبوون ل سەر و کارکرن پێ.

(٦) ژبەر بکەت و کار پێ بکەت.

**٤ . باب فضل سورة هود والواقعة.**

**بابەتێ: خێرا سۆرەتا هوود و واقیعەیێ.**

٥٣١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: يَا رَسُولَ اللهِ! قَدْ شِبْتَ، قَالَ: (**شَيَّبَتْنِي** **هُودٌ**، وَالْوَاقِعَةُ، وَالْمُرْسَلاَتُ، وَ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ﴾، وَ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾). [ت٣٢٩٧].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەبوبەکری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی تو پیر بووی، گۆت: (سۆرەتا هوود و واقیعە و مورسەلات و ﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ﴾ و ﴿إذا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ ئەز پیرکرم).**

**٥ . باب: فضل سورة الكهف.**

**بابەتێ: خێرا سۆرەتا کەهف.**

٥٣٢ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ، وَإِلَى جانِبِهِ حِصَانٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدْنُو وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ، فَقَالَ: (**تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالْقُرْآنِ**). [خ٥٠١١ (٣٦١٤)/ م٧٩٥].

**و ژ بەرائێ کورێ عازبی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەکی سۆرەتا کەهف دخواند، و هەسپەکێ گرێدای ب دو کنفانڤە ل دەڤ بوو، عەورەك ل هنداڤ بلند بوو و دەست پێ کر نێزیك بوو، و نێزیك بوو و هەسپێ وی وەلێ کر ژێ برەڤیت، و دەمێ لێ بوویە سپێدە هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئەوا دیتی بۆ گۆت، ئینا گۆت: (ئەو دلرەحمتی بوو (یان ملیاکەت بوو) ژ بەر قورئانێ هاتبوو خوارێ).**

٥٣٣ - (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ**). [م٨٠٩].

■ وفي رواية: قَالَ: (**مِنْ آخِرِ الْكَهْفِ**).

**ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ دەھ ئایەتان ژ سەرێ سۆرەتا كەھف ژبەركەت ئەو ژ دەجالی هاتە پاراستن).**

■ **و د ڤەگێڕەكێدا گۆت: (ژ دویماهییا سۆرەتا كەھف).**

٥٣٤ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ. [مي٣٤٥٠].

* موقوف إسناده صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: هەر كەسێ سۆرەتا كەھف شەڤا ئەینی بخوینیت خودێ دێ رۆناهییێ د ناڤبەرا وی و كەعبەیەێدا دەتێ.**

## ٦ ـ باب: فضل سورة الكهف.

## بابەتێ: خێرا سۆرەتا سەجدەیێ.

٥٣٥ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ بِتَنْزِيلِ السَّجْدَةِ وَبتَبَارَكَ.

[ت٢٨٩٢/ مي٣٤٥٤]

* صحيح.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) نەدنڤست هەتا سۆرەتا سەجدە و مولك دخواندن.**

٥٣٦ – عَنْ كَعْبٍ الأَحْبَارِ قَالَ: مَنْ قَرَأَ تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ، وَ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾، كُتِبَ لَهُ سَبْعُونَ حَسَنَةً، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا سَبْعُونَ سَيِّئَةً، وَرُفِعَ لَهُ بِهَا سَبْعُونَ دَرَجَةً. [مي٣٤٥٢]

* موقوف، إسناده صحيح.

**ژ كەعبێ ئەحبارى (رحمه الله) گۆت: هەر كەسێ سۆرەتا سەجدە و ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ سۆرەتا مولك بخوینیت، حەفتێ خێر بۆ پێ هاتنە نڤیسین و حەفتێ گونەھ بۆ پێ هاتنە ژێبرن، و حەفتێ پلە بۆ پێ هاتنە بلندكرن.**

### ٧ . باب: فضل سورة ياسين.

### بابەتێ: تایبەتمەندییا سۆرەتا یاسین.

٥٣٧ – عن صَفْوَانَ، حَدَّثَنِي الْمَشْيَخَةُ: أَنَّهُمْ حَضَرُوا غُضَيْفَ بْنَ الْحَارِثِ الثُّمَالِيَّ حِينَ اشْتَدَّ سَوْقُهُ، فَقَالَ: هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ يَقْرَأُ ﴿يسٓ﴾؟ قَالَ: فَقَرَأَهَا صَالِحُ بْنُ شُرَيْحٍ السَّكُونِيُّ، فَلَمَّا بَلَغَ أَرْبَعِينَ مِنْهَا قُبِضَ، قَالَ: فَكَانَ الْمَشْيَخَةُ يَقُولُونَ: إِذَا قُرِئَتْ عِنْدَ الْمَيِّتِ خُفِّفَ عَنْهُ بِهَا. [حم١٦٩٦٩].

* أثر إسناده حسن.

**ژ سەفوانى (رحمه الله) گۆت: سەیدایان بۆ من گۆت: ئەو ل دەڤ (غضيف بن الحارث الثمالي) (هەلبەت ئەو سەحابى بوو) ئامادەبوون دەمێ نێزیك بووى وەغەر بكەت، گۆت: ئێك ژ هەوە هەیە سۆرەتا یاسین بخوینیت؟ گۆت: سالحێ كورێ شورەیحێ سكونى خواند هەتا گەهشتییە ئایەتا چلێ، رحا وى هاتە كێشان، گۆت: سەیدایان دگۆت: ئەگەر سۆرەتا یاسن ل سەر یێ د سەكەراتێدا هاتە خواندن ل سەر سڤك دبیت.**

## ٨ . باب فضل حم الدخان.

## بابەتێ: خێرا سۆرەتا دوخان.

٥٣٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عِيسَى قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ مَنْ قَرَأَ ﴿حـم﴾ الدُّخَانَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، إِيمَاناً وَتَصْدِيقاً بِهَا أَصْبَحَ مَغْفُوراً لَهُ. [مي٣٤٦٣]

* موقوف، إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عیسای (رحمه الله) گۆت: بۆ من هاتە گۆتن هەر کەسێ شەڤا ئەینی ژ باوەری ب خودێ و ژ باوەری کو قورئانە و تشتێ تێدا راستە ﴿حمٓ﴾ سۆرەتا دوخان بخوینیت دێ سپێدە لێ بیت و گونەهێت وی ژێ بری.**

## ٩ . باب فضل سورة الملك.

## بابەتێ: خێرا سۆرەتا مولك.

٥٣٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ سُورَةً مِنَ الْقُرْآنِ ثَلاَثُونَ آيَةً شَفَعَتْ لِرَجُلٍ حَتَّى غُفِرَ لَهُ، وَهِيَ سُورَةُ** ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾). [د١٤٠٠/ ت٢٨٩١/ جه٣٧٨٦]

* صحيح.

[وانظر: ٥٣٥، ٥٣٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژ قورئانێ سۆرەتەکا هەی سیه ئایەتە، بەرەڤانی بۆ زەلامەکی کر هەتا گونەهێت وی هاتینە ژێبرن، ئەو ژی: ﴿تبارَكَ الذِي بِيَدِهِ المُلْكُ﴾)[1].**

---

[1] ئانکو سۆرەتا مولکە.

## ١٠ . باب: فضل سورة الزلزلة:

## بابەتێ: خێرا سۆرەتا زەلزەلە.

٥٤٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (﴿إِذَا زُلْزِلَـتِ﴾ **تَعْدِلُ نِصْفَ الْقُرْآنِ**، و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝﴾ **تَعدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**، و﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝﴾ **تَعْدِلُ رُبُعَ الْقُرْآنِ**).

[ت٢٨٩٤]

* صحيح، دون فضل ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ﴾.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (﴿إذا زلْزِلَتْ﴾ بەرامبەر نیڤا قورئانێیە و ﴿قُلْ هو الله أَحَدٌ﴾ بەرامبەر سێكا قورئانێیە، و ﴿قُلْ يا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بەرامبەر چارێكا قورئانێیە).**

## ١١ . باب: فضل: ﴿قُلْ يا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾.

## بابەتێ: خێرا : ﴿قل يا أيُّها الكافرُونَ﴾.

٥٤١ - عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَجِيءٌ مَا جَاءَ بِكَ**) ؟ قَالَ: جِئْتُ لِتُعَلِّمَنِي شَيْئاً أَقُولُهُ عِنْدَ مَنَامِي، فقَالَ: (**فَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ فَاقْرَأْ** ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، **ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ**). لفظ الدارمي. [د٥٠٥٥/ ت٣٤٠٣/ مي٣٤٧٠]

* صحيح.

**ژ فەروەیێ كورێ نەوفەلی (رضي الله عنه) ژ بابێ وی: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چ وەل تە كر تو هاتی)** ؟ **گۆت: ئەز هاتم دا تشتەكی نیشا من بدەی دەمێ دنڤم بێژم، گۆت: (ئەگەر تو**

**چۆیە سەر جهێت خۆ سۆرەتا ﴿قُلْ يا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوینە پاشی ل سەر دویماهییا وێ بنڤە، ب راستی ئەو بەرائەتە ژ هەڤپشکچێکرنێ).**

## ١٢ . باب: فضل ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ١﴾.

## بابەتێ: خێرا ﴿قُلْ هوَ الله احَدٌ﴾

٥٤٢ – (ق) عَنْ عائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ، وَكانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِ فَيَخْتِمُ بِـ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ①﴾، فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: (**سَلُوهُ، لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذلِكَ**) ؟ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمنِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللهَ يُحِبُّهُ**). [خ٧٣٧٥/ م٨١٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك ل سەر سەرێ سریەکێ هنارت (کرە سەرداری وان) ل بەری هەڤالێت خۆ نڤێژ دکر و بۆ وان قورئان دخواند و هەرجار خواندنا خۆ ب: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ ب دویماهی دئینا، و دەمێ زڤرین، ئەڤە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت، ئینا گۆت: پرسیارا وی بکەن کا بۆچی وی وەدکر؟ پرسیار ژێ کرن، گۆت: چونکی ئەو سالۆخەتا خودایێ دلۆڤانە، ئەز حەز دکەم وێ بخوینم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بێژنێ ب راستی خودایێ مەزن حەژ تە دکەت).**

٥٤٣ – (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ①﴾. يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ، وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ**). [خ٥٠١٣].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی گوه ل زەلامەکی بوو ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ هەر دخواند و دوبارە دکر ڤێجا دەمێ بوویە سپێدە، هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ**

**(ﷺ) و ئەو بۆ گۆت، هەروەكی وی ئەڤە كێم ددانا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا ئەو ـ ﴿قُلْ هو الله أَحَدٌ﴾ ئانكو سۆرەتا ئیخلاس ـ بەرامبەری سێكا قورئانێیە).**

٥٤٤ – (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يِقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ)** ؟ قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: **(﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾، تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ)**. [م٨١١].

**ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەرێ ئێك ژ هەوە نەشێت سێكا قورئانێ د شەڤەكێدا بخوینیت، گۆتن: چاوا دێ سێكا قورئانێ خوینیت؟ ئینا گۆت: ﴿قُلْ هُو الله أَحَدٌ﴾: بەرامبەر سێكا قورئانێیە).**

٥٤٥ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) **(احْشُدُوا، فَإِنِّي سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ)** فَحَشَدَ مَنْ حَشَدَ، ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) فَقَرَأَ: **﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾**، ثُمَّ دَخَلَ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ: إِنِّي أُرَى هَذَا خَبَرٌ جَاءَهُ مِنَ السَّمَاءِ، فَذَاكَ الَّذِي أَدْخَلَهُ، ثمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(إِنِّي قُلْتُ لَكُمْ: سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، أَلاَ إِنَّهَا تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ)**. [م٨١٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: كۆم ببن، ب راستی ئەز دێ سێكا قورئانی بۆ هەوە خوینم. ڤێجا ئەو كۆم بوو یێ كۆم بووی، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ﴿قُلْ هو الله أَحَدٌ﴾ خواند و پاشی چۆ د ژۆرڤە، هندەكان ژی گۆتە هندەكێت دی، ئەز دبینم فەرمانەك بۆ ژ عەسمانی هات ئەڤێ ئەو برە د ژۆرڤە، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دركەفت و گۆت: (من گۆتبوو هەوە ئەز دێ سێكا قورئانێ بۆ هەوە خوینم و بزانن ئەو (ئانكو: قُلْ هو الله أَحَدٌ) بەرامبەر سێكا قورئانێیە).**

## ١٣ . باب فضل المعوذات.

## بابەتێ: خێرا سۆرەتا (ئێخلاس و فەلەق و ناس).

٥٤٦ - (خ) عَنْ عائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ، جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا، فَقَرَأَ فِيهِمَا: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، وَ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾، و﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا ما اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رأْسِهِ وَوَجْهِهِ، وَما أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ، يَفْعَلُ ذلِكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ. [خ٥٠١٧].

- زاد في رواية: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمَّا اشْتَكَى كَانَ يَأْمُرُنِي أَنْ أَفْعَلَ ذَلِكَ بِهِ. [خ٥٧٤٨].

**ژ عائیشایێ (ڕەزیا خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ دچۆ سەر نقینێت خۆ هەرشەڤ دەستێت خۆ كۆم دكرن پاشی پف دكرە تێدا و** ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾، **و** ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ﴾، **و** ﴿قُلْ أَعُوذُ بِربِّ النَّاسِ﴾ **تێدا دخواند پاشی هندی دشیا لەشێ خۆ پێ ڤەدمالی، ب سەر و چاڤێت خۆ دەست پێ دكر و لایێ سینگی ژ لەشێ خۆ، ئەڤ چەندە سێ جاران دكر.**

- **د ڤەگێرەكێدا زێدە كرییە: عائیشایێ گۆت: ڤێجا دەمێ نەساخ بووی فەرمانا من كر من وەلێ دكر.**

٥٤٧ - (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتِ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ؟** ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾، وَ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾). [م٨١٤].

**ژ عوقبەیێ كوڕێ عامری (ڕەزیا خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تو دزانی ڤێ شەڤێ هندەك ئایەت یێت هاتینە خوارێ وەكی وان نەهاتینە دیتن؟** ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ﴾ **و** ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾**)**[1].

---

(١) ئانكو سۆرەتا فەلەق و سۆرەتا ناس.

## ١٤ . باب: فضل بعض السور.

## بابەتێ: خێرا هندە سۆرەتان.

٥٤٨ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: تَعَلَّمُوا سُورَةَ البَقَرَةِ، وَسُورَةَ النِّسَاءِ، وَسُورَةَ المائِدَةِ، وَسُورَةِ الحَجِّ، وَسُورَةَ النُّورِ؛ فإِنَّ فِيهِنَّ الفَرَائِضَ. [ك٣٤٩٣]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) دگۆت: سۆرەتا بەقەرە و سۆرەتا مائیدە و سۆرەتا حەج و سۆرەتا نوور فێربن ب راستی فەرمان یێت د واندا.**



## الفصل الرابع: سجود التلاوة.

## پشکا چارێ: سەجدەیێت قورئان خواندنێ

### ١ . باب فضل سجود التلاوة واحكامه.

### بابەتێ: خێرا سەجدەیێت قورئان خواندنێ و فەرمانێت وێ.

٥٤٩ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْرَأُ عَلَيْنَا السُّورَةَ فِيهَا السَّجْدَةُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ، حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَوْضِعَ جَبْهَتِهِ. [خ١٠٧٥/ م٥٧٥].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سۆرەتا سەجدە تێدا بۆ مە دخواند و وی سەجدە دبر و مە ژی سەجدە دبر هەتا ئێك ژ مە جهێ ئەنیا خۆ نەددیت.**

٥٥٠ – (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه: أنه قَرَأَ يَوْمَ الجُمُعَةِ عَلَى المِنْبَرِ بِسُورَةِ النَّحْلِ، حَتَّى إِذَا جاءَ السَّجْدَةَ نَزَلَ فَسَجَدَ، وَسَجَدَ النَّاسُ، حَتَّى إِذَا كانَتِ الجُمُعَةُ الْقَابِلَةُ، قَرَأَ بِهَا، حَتَّى إِذَا جَاءَ السَّجْدَةَ، قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّا نَمُرُّ بِالسُّجُودِ، فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ. وَلَمْ يَسْجُدْ عُمَرُ رضي الله عنه.

- وَزَادَ نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: إِنَّ اللهَ لَمْ يَفْرِضِ السُّجُودَ؛ إِلاَّ أَنْ نَشَاءَ. [خ١٠٧٧].

**ژ عومەرێ کوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) وی رۆژا ئەینی سۆرەتا نەحل ل سەر مینبەرێ خواند، هەتا گەهشتییە سەجدەیێ، هاتە خوارێ و سەجدە بر و خەلکی ژی سەجدە برن، هەتا بوویە ئەینییا دویڤڕا هەر ئەو خواند هەتا گەهشتییە سەجدەیێ، گۆت: گەلی مرۆڤان ئەم ل سەر سەجدەیان دبۆرین ڤێجا هەر کەسێ سەجدە بر وی دورست کر، و یێ سەجدە نەبر چو گونەه ل سەر نینە، و عومەری سەجدە نەبر.**

- و نافعی (ﭬ) ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) زێدە کرییە. ب راستی خودێ سەجدە فەرز نەکرییە ئەو نەبیت مە بڤێت.

٥٥١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ، اعْتَزَلَ الشَّيْطَانِ يَبْكِي، يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ! ـ وَفِي رِوَايَةِ أَبِي كُرَيْبٍ: يَا وَيْلِي! ـ أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ). [م٨١].

ژ ئەبی هورەیرەی، (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر دوپندەها ئادەمی سەجدە خواند و سەجدە بر شەیتان خۆ ڤەدەر دکەت و دکەتە گری و دبێژیت: وەی کۆڤان و ژ ناڤچۆنێ)**، و د ڤەگێرا ئەبی کورەیبیدا: **(وەی کۆڤان و ژ ناڤچۆنا من، فەرمان ب سەجدەبرنێ ل دوپندەها ئادەمی هاتە کرن سەجدە بر ژ بەر هندێ بەحەشت بۆ وییە، و فەرمانا من ب سەجدەبرنێ هاتە کرن من گوهداری نەکر لەوا ئاگر بۆ منە).**

٢ ـ باب: السور التي فيها السجدات.

**بابەتێ: ئەو سۆرەتێت سەجدە تێدا.**

٥٥٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ (ﷺ) النَّجْمَ بِمَكَّةَ، فَسَجَدَ فِيهَا وَسَجَدَ مَنْ مَعَهُ، غَيْرَ شَيْخٍ أَخَذَ كَفّاً مِنْ حَصى، أَوْ تُرابٍ، فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ، وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كافِراً. [خ١٠٦٧/ م٥٧٦].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (ﭬ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ل مەکەهێ سۆرەتا نەجم خواند تێدا چۆ سەجدێ و یێت د گەل هەمیان سەجدە بر، پیرەمێرەك نەبیت مستەکا بەرەشیشکا یان ژ ئاخێ راکر و بلندکرە ئەنیا خۆ، و گۆت: ئەڤە بەسی منە، پشتی هینگێ من ئەو دیت گاور هاتە کوشتن.

٥٥٣ – عَنِ الْأَعْرَجِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَرَأَ بِـ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾، فَسَجَدَ فِيهَا، ثُمَّ قَامَ فَقَرَأَ بِسُورَةٍ أُخْرَى. [ط٤٨١].

* إسناده منقطع.

**ژ ئەعرەجی (ﷺ) كو عومەرێ كوڕێ خەتتابی (ﷺ) سۆرەتا نجم ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ خواند و تێدا چۆ سەجدێ پاشی رابوو سۆرەتەكا دی خواند.**

٥٥٤ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ﴿صٓ﴾ لَيْسَ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْجُدُ فِيهَا. [خ١٠٦٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سۆرەتا ﴿صٓ﴾ نە ژ سەجدەیێت فەرمان پێ كرییە و ب راستی من پێغەمبەر (ﷺ) دیت تێدا دچۆ سەجدێ.**

٥٥٥ – (ق) عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ الْعَتَمَةَ، فَقَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾ [الانشقاق]، فَسَجَدَ، فَقُلْتُ لَهُ، قَالَ: سَجَدْتُ خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ (ﷺ)، فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ. [خ٧٦٦/ م٥٧٨].

**ژ ئەبی رافعی (ﷺ) گۆت: من نڤێژا عەیشا پشت ئەبو هورەیرە كر ئینا** ﴿إذا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ﴾ **خواند و سوجدە بر، من پرسیارا ڤێ سوجدەیێ ژێ كر گۆت: من پشت بابێ قاسمی پێغەمبەری (ﷺ) سوجدە یا بری و بەردوام دێ سوجدەیێ بەم هەتا ئەز دگەهمە وی.**

٥٥٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَسْجُدُ فِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَيْنِ. [ط ٤٨٠].

* إسناده صحيح.

**ژ مالكێ كوڕێ عەبدوللایێ كوڕێ دیناری (ﷺ) گۆت: من عەبدوللایێ كوڕێ عومەری دیت دو سەجدە د سۆرەتا حەجدا دبرن.**

٥٥٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فِي سُورَةِ الحَجِّ سَجْدَتَانِ. [ك٣٤٧٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دو سەجدە یێت د سۆرەتا حەجدا.**

### ٣ . باب: ما يقول في سجود القرآن.

### بابەتێ: كا دێ چ د سەجدەیێت قورئانێدا بێژیت.

٥٥٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي رَأَيْتُنِي اللَّيْلَةَ، وَأَنَا نَائِمٌ، كَأَنِّي أُصَلِّي خَلْفَ شَجَرَةٍ، فَسَجَدْتُ، فَسَجَدَتِ الشَّجَرَةُ لِسُجُودِي، فَسَمِعْتُهَا وَهِيَ تَقُولُ: اللَّهُمَّ اكْتُبْ لِي بِهَا عِنْدَكَ أَجْراً، وَضَعْ عَنِّي بِهَا وِزْراً، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْراً، وَتَقَبَّلْهَا مِنِّي، كَمَا تَقَبَّلْتَهَا مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَرَأَ النَّبِيُّ (ﷺ) سَجْدَةً ثُمَّ سَجَدَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَسَمِعْتُهُ وَهُوَ يَقُولُ مِثْلَ مَا أَخْبَرَهُ الرَّجُلُ عَنْ قَوْلِ الشَّجَرَةِ. [ت٥٧٩، ٣٤٢٤/ جه١٠٥٣].

* حسن.

**ژ ئیبن عەباس (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: شەڤێدی من د خەونێدا دیت و ئەز یێ نڤستی هەروەكی من نڤێژ پشت دارەكێ دكر، و ئەز چۆمە سەجدێ و دار ژی ب سەجدا من دچۆ سەجدێ، و من گوه لێ بوو دگۆت: یا خودێ بۆ من خێرێ پێ ل دەڤ خۆ بنڤیسە و گونەهێ پێ ژ من نەهێلە و بۆ من ل دەڤ خۆ هەلگرە و ژ من قەبویل بكە هەروەكی تە ژ بەندەیێ خۆ داوودی قەبویل كری.**

**ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری ئایەتەکا سەجدەیەکێ خواند و سەجدە بر، ئینا ئیبن عەباسی گۆت: من گوه لێ بوو وی ئەو دگۆت یا وی زەلامی ژ گۆتنا دارێ گۆتی.**

٥٥٩ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ: (**سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ**). لفظ الترمذي. [د١٤١٤/ ت٥٨٠/ ن١١٢٨].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د سەجدەیێت قورئانێدا یێت د شەڤێدا دگۆت: (سەروچاڤێت من بۆ وی سەجدە بر یێ چێکری و ب شیان و هێزا خۆ گوه و چاڤ کرینە تێدا و تێدا ڤەکرین).**

٤ ـ باب: عدد سجود القرآن.

**بابەتێ: هژمارا سەجدەیێت قورئانێ.**

٥٦٠ – عَن عَمرِو بنِ العَاصِ: أن النبيَّ – (ﷺ) – أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَجدَةً في القُرآنِ، منها: ثَلَاثَ عشْرةَ في المفصَّلِ، وفي سورةِ الحَجِّ سَجدتانِ[1]. [د١٤٠١/ جه١٠٥٧].

* ضعيف.

(١) **شێخ سالحی ئەڤ فەرموودە د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینایە:** ٥٦٠ – (م) عن أبي هريرة قال: سجدنا مع النبي (ﷺ) في ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ [الانشقاق] و﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ﴾ [العلق]. [م٥٧٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: مە سوجدە د گەل پێغەمبەری (ﷺ) د ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ و د ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ﴾دا بر.**

**ژ عەمرێ کورێ عاسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پازدە سەجدە د قورئانێدا بۆ خواندن، سێ یێت د سۆرەتێت کورتدا و دو سەجدە یێت د سۆرەتا حەجدا هەین.**

٥٦١ – عَنْ عَليّ رضي الله عنه قَالَ: عَزَائِمُ السُّجودِ في القُرْآنِ: ﴿الٓمٓ تَنزِيلُ﴾و ﴿حمٓ تَنزِيلُ﴾ السجدة، و(النجم)، و﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ①﴾. [ك٣٩٥٧].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: سەجدەیێت فەرمان پێ هاتییە کرن د قورئانێدا ئەڤەنە ﴿الم تَنْزِيلُ﴾ سۆرەتا سەجدە و ﴿حم تَنْزِيلُ﴾ سۆرەتا (فصلت) و ﴿وَالنَّجْمِ﴾ سۆرەتا نەجم و ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ سۆرەتا عەلەق.**

### ٥ . باب: هل يكبر لسجود التلاوة.

### ئەرێ دێ تەکبیرێ بۆ سوجدەیا قورئانێ کەت.

٥٦٢ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْرَأُ عَلَيْنَا الْقُرْآنَ، فَإِذَا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ كَبَّرَ، وَسَجَدَ وَسَجَدْنَا.

قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: وَكَانَ الثَّوْرِيُّ يُعْجِبُهُ هَذَا الْحَدِيثُ.

قَالَ أَبُو دَاوُد: يُعْجِبُهُ لِأَنَّهُ كَبَّرَ. [د١٤١٣].

* منكر بذكر التكبير، والمحفوظ دونه.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) قورئان بۆ مە دخواند، فێجا ئەگەر ل سەر ئایەتا سوجدەكێرا بۆریبا دا تەكبیرێ كەت (بێژیت: الله أكبر) و چیتە سوجدێ و مە ژی سوجدە دبر.

عەبدولرەزاق دبێژیت: سەوری حەژ ڤێ فەرموودەیێ دكر.

ئەبو داوودی گۆت: چونكی تەكبیر تێدا بوو.

٦ ـ باب: هل يسجد للتلاوة أوقات النهي.

**بابەتێ: سوجدا قورئان خواندنێ د دەمێت پاشڤەلێدان تێدا دهێتە برن؟.**

٥٦٣ – عَنْ أَبِي تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيِّ قَالَ: لَمَّا بَعَثْنَا الرَّكْبَ. قَالَ أَبُو دَاوُد: يَعْنِي: إِلَى الْمَدِينَةِ. قَالَ: كُنْتُ أَقُصُّ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ فَأَسْجُدُ، فَنَهَانِي ابْنُ عُمَرَ، فَلَمْ أَنْتَهِ، ثَلاَثَ مِرَاتٍ، ثُمَّ عَادَ فَقَالَ: إِنِّي صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رضي الله عنهم، فَلَمْ يَسْجُدُوا حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ. [د١٤١٥].

* صحيح بمتابعاته (شعيب).

ژ ئەبی تەمیمێ هوجەیمی (رحمه الله)، گۆت: دەمێ مە كاروان ب رێ ئێخستی ـ ئەبو داوودی گۆت ئانكو بۆ مەدینەیێ ـ گۆت: من پشتی نڤێژا سپێدێ شیرەتكرن و ئایەتێت سوجدێ دخواندن و ئەز دچۆمە سوجدێ، ئیبن عومەری ئەز پاشڤە لێدام ئەز پاشڤە نەچۆم سێ جاران، پاشی زڤری گۆت: ب راستی من پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و د گەل ئەبوبەكری و عومەری و عوسمانی خودێ ژ هەمیان رازی بیت نڤێژ یا كری و سوجدە نەبرینە هەتا رۆژ دەركەفتی((١)).

(١) بۆچۆنا دورستتر ژ دو گۆتنێت زانایان سوجدا قورئان خواندنێ دهێتە برن هەتا د وان دەماندا یێت پاشڤەبرن تێدا، چونكی سوجدا قورئان خواندنێ نەنڤێژە و هەتا نڤێژ ژی هەكە ئەگەر بۆ هەبیت دهێتە كرن وەكی نڤێژ سلاڤا مزگەفتێ.

## ٧ ـ باب: هل يسجد الجنب والحائض.

## بابەتێ: ئەرێ کەسێ ب جەنابەت و کەسا د عادێدا سوجدێ دبەن؟

٥٦٤ – عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: إِذَا سَمِعَ الْحَائِضُ وَالْجُنُبُ «السَّجْدَةَ»، يَغْتَسِلُ الْجُنُبُ وَيَسْجُدُ، وَلاَ تَقْضِي الْحَائِضُ؛ لِأَنَّهَا لاَ تُصَلِّي. [مي١٠١٦].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبراهیمی، (رحمه الله) گۆت: ئەگەر مرۆڤێ ب جەنابەت و ژنا د عادێدا گوه ل ئایەتا سوجدەیێ بوون، یێ ب جەنابەت دێ سەرێ خۆ شۆت و سوجدەیێ بەت و ژنا د عادێدا قەزا ناکەت چونکی ئەو نڤێژێ ناکەت.**



## باب: من فسر القرآن برأيه.

## بابەتێ: یێ قورئانێ ب بۆچوونا خۆ رافە بكەت.

٥٦٥ - عن جندب بن عبد الله قال: قال رسول الله (ﷺ): **(من قال في كتاب الله عزّ وجل برأيه فأصاب، فقد أخطأ).** [د٣٦٥٢/ ت٢٩٥٢]

* ضعيف.

[انظر: ٢٨٨، ٢٨٩، ٣٧٠].

**ژ جوندوبێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ژ دەڤ خۆ[1] تشتەكی د قورئانێدا بێژیت و دورست گۆتبیت هەر ئەو خەلەت بوو)[2].**

(١)

### سورة الفاتحة.

### سۆرەتا فاتیحە

٥٦٦ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ المعَلَّى قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فِي المسْجِدِ، فَدَعانِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَلَمْ أُجِبْهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي، فَقَالَ: (**أَلَمْ يَقُلِ اللهُ:** ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ﴾ [الأنفال:٢٤] )، ثمّ قَالَ لِي: (**لأُعَلِّمَنَّكَ سُورَةً هِيَ أَعْظَمُ السُّوَرِ فِي القُرْآنِ، قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ المَسْجِدِ**). ثمّ أَخَذَ بِيَدِي، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، قُلْتُ لَهُ: أَلَمْ تَقُلْ: (**لأُعَلِّمَنَّكَ**

---

[1] ئانكو بێی زانین.

[2] چونكی نابیت بێی زانین قورئان بهێتە رافەكرن.

سُورَةً هِيَ أَعْظَمُ سُورَةٍ فِي القُرْآنِ)، قَالَ: (﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[الفاتحة: ٢] : هِيَ السَّبْعُ المَثَانِي، وَالقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ). [خ٤٤٧٤].

**ژ ئەبی سەعیدی، رافعێ کورێ موعەللایی (رضي الله عنه) گۆت: من نڤێژ ل مزگەفتێ دکر ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی من کر، من بەرسڤا وی نەدا، ئەز هاتم من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من نڤێژ دکر ئینا گۆت: (ما خودێ نەگۆتییە:** ﴿اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾[1] **پاشی گۆتە من: (ئەرێ ئەز مەزنترین سۆرەت ژ قورئانێ نیشا تە نەدەم بەری تو ژ مزگەفتێ دەرکەڤی)؟ دەستێ من گرت، و دەمێ مە ڤیای دەرکەڤین من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە گۆتبوو دێ مەزنترین سۆرەت ژ قورئانێ نیشا تە دەم؟ گۆت: (**﴿الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ﴾[2]**، ئەوە حەفت ئایەتێت هەر دهێنە دوبارەکرن و قورئانا مەزنە یا دایە من).**

٥٦٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أُمُّ القُرْآنِ هِيَ: السَّبْعُ المَثَانِي، وَالقُرْآنُ الْعَظِيمُ**). [خ٤٧٠٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بنەمایێ قورئانێ (ئانکو سۆرەتا فاتیحە) ئەو حەفت ئایەتێت دهێنە دوبارەکرن و قورئانا مەزنە).**

٥٦٨ - عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْيَهُودُ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ، وَالنَّصَارَى ضُلَّالٌ**).

[ت٢٩٥٤].

* صحيح.

---

(١) ئانکو: گەلی خودان باوەران، بەرسڤا خودێ و پێغەمبەری بدەن ـ ئانکو ب لەز گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری بکەن ـ دەمێ بۆ وی تشتی گازی هەوە دکەت یێ هەوە زێندی دکەت.

(٢) ئانکو: فاتحە.

**ژ عەدییێ كورێ حاتەمی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (جوهی كەرب لێكرینە و فەلە رێ بەرزەكرینە).**

٥٦٩ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّهَا ذَكَرَتْ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝١ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ۝٤﴾، يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ آيَةً آيَةً.

- ولفظ الترمذي: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ يَقْرَأُ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ۝٢﴾، ثُمَّ يَقِفُ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ۝٣﴾، ثُمَّ يَقِفُ، وَكَانَ يَقْرَؤُهَا: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ۝٤﴾.

[د٤٠٠١/ ت٢٩٢٧].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (ﷺ) وێ بەحسێ خواندنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكر: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرحمن الرَّحِيمِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الرحمن الرَّحِيمِ مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ خواندنا خۆ ئایەت ئایت دبڕی و دگۆت.**

- **و د بێژەیا ترمزیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خواندنا خۆ دبڕی و دگۆت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ پاشی رادوەستا ﴿الرحمن الرَّحِيمِ﴾ پاشی رادوەستا و وی دخواند ﴿مالك يَوْمِ الدِّينِ﴾.**

٥٧٠ – عن عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ: أَنَّهُ أَخْبَرَهُ مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) . وَهُوَ بِوَادِي الْقُرَى وَهُوَ عَلَى فَرَسِهِ .، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ مِنْ بُلْقِينَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: (**هَؤُلاَءِ الْمَغْضُوبُ عَلَيْهِمْ**) وَأَشَارَ إِلَى الْيَهُودِ، فَقَالَ: مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قَالَ: (**هَؤُلاَءِ الضَّالُّون**)؛ يَعْنِي النَّصَارَى. قَالَ: وَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: اسْتُشْهِدَ مَوْلاَكَ . أَوْ قَالَ: غُلاَمُكَ . فُلاَنٌ، قَالَ: (**بَلْ هُوَ يُجَرُّ إِلَى النَّارِ فِي عَبَاءَةٍ غَلَّهَا**). [حم٢٠٧٣٦].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ شەقیقی (ﷺ) کو ئێکێ ل نهالا گوندان (وادي القرى)[(١)] د گەل پێغەمبەری بوو (ﷺ) و ئەو ل سەر هەسپێ خۆ بوو و زەلامەکێ خەلکێ بولقینێ[(٢)] پرسیار ژێ کر: گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە کینە گۆت: (ئەو کەرب لێکرینە) و دەستێ خۆ درێژکرە جوهییان. و گۆت: ئەڤە کینە؟ گۆت: (ئەو رێ بەرزەکرینە) ئانکو فەلەنە، گۆت: و زەلامەك هات گۆت: ئازاکرییێ تە یان خزمەتکارێ تە فلان شەهید بوو، گۆت: (نەخێر ئەو یێ بۆ ئاگری دهێتە کێشان، ب عەبایەکێ خیانەتا کری بەری بەلاڤکرنا دەسکەفتییان).**

٥٧١ - عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾. قَالَ: الجِنُّ والإِنْسُ. [ك٣٠٢١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزن د ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾دا گۆت: ئەو ئەجنە و مرۆڤن، (ئانکو خودایێ ئەجنە و مرۆڤان).**

٥٧٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، وعَنْ أُنَاسٍ مِنْ أصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ): ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾. قَالَ: هُوَ يَوْمُ الحِسَابِ. [ك٣٠٢٢].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

[وانظر: ١٢٠٨ (قسمتُ الصلاة بيني وبين عبدي)].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (ﷺ) ژ هندە کەسان ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) د ﴿مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾دا گۆت: ئەو رۆژا سزادانێیە**

---

**(١) نهالەکا بەرفرەهە دکەڤیتە د رێکا خەیبەرێدا و دبێژنێ (وادی القری) چونکی گەلەك گوند ییچت ل وێ نهالێ.**

**(٢) ناڤێ گوندەکییە.**

(٢)

سورة البقرة.

**سۆرەتا بەقەرە.**

**قوله تعالى: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ [البقرة:٢]**

**گۆتنا خودایێ مەزن: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ ئەڤە ئەو قورئانە کو گۆمان تێدا نینە ژ دەڤ خودێ هاتییە.**

٥٧٣ - (خـ) قَالَ مَعْمَرٌ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ هَذَا الْقُرْآنُ. ﴿هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾: بَيَانٌ وَدِلاَلَةٌ. ﴿لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾: لاَ شَكَّ. ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾؛ يَعْنِي: هَذِهِ أَعْلاَمُ الْقُرْآنِ.

[خ. التوحيد، باب ٤٦].

**مەعمەر (رحمه الله) دبێژیت: ﴿ذلك الْكِتَابُ﴾ ئەڤ قورئانە ﴿هُدًى لِلْمُتَّقِينَ﴾ دیاریکرن و رێنیشادانە ﴿لَا رَيْبَ﴾ بێ گۆمانە ﴿تِلْكَ آيَاتُ﴾ ئانکو نیشانێت قورئانێ.**

قوله تعالى: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا﴾ [٢٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو فێقییێ بۆ وان دئێتە دان (بەردەستکرن) وەکی ئێکە بەلێ تام نەئێکە.**

٥٧٤ - (خـ) قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ﴾: أُتُوا بِشَيْءٍ، ثُمَّ أُتُوا بِآخَرَ. ﴿قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُ﴾: أُتِينَا مِنْ قَبْلُ. ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا﴾ يُشْبِهُ بَعْضُهُ بَعْضاً، وَيَخْتَلِفُ فِي الطُّعُومِ.

[خ. بدء الخلق، باب٨].

**ئەبو عالیە (رحمه الله) دبێژیت: ﴿كُلَّمَا رُزِقُوا﴾ تشتەك بۆ ئینا پاشی تشتەکێ دی بۆ ئینا ﴿قالوا هذا الذي رُزِقْنَا من قَبْلُ﴾ ئەڤە بەری نوکە دابوو مە ﴿وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا﴾ هندەك وەکی هندەکانە و د تامێدا د جودانە.**

## قوله تعالى: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ [٣٧]

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئادەم چەند ئاخڤتنەك ژ خودایێ خۆ وەرگرتن.**

٥٧٥ - (خ) قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ﴾ فَهُوَ قَوْلُهُ: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا﴾ [الأعراف:٢٣].			[خ. الأنبياء، باب ١].

**ئەبو عالیە (رحمه الله) دبێژیت: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ من رَبِّهِ كَلِمَاتٍ﴾ ئەو پەیڤ گۆتنا وییە ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنا﴾.**

## قوله تعالى: ﴿ وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ﴾ [٥٨]

**گۆتنا خودایێ مەزن: و چەمانەدی (خۆشكاندی بۆ خودایێ هوین ژ بەرزەبوونێ ڕزگار كرین) هەرنە ژۆر، و بێژن: خودێوۆ گونەهێت مە داقوتە، دا ئەم ژێ ل گونەهێت هەوە ببۆرین و نەهێلین.**

٥٧٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (قِيلَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ: ﴿وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُواْ حِطَّةٌ﴾، فَبَدَّلُوا، فَدَخَلُوا يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ، وَقَالُوا: حَبَّةٌ فِي شَعْرَةٍ).			[خ٣٤٠٣/ م٣٠١٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (گۆتنە ئیسرائیلییان: ﴿وادخلوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ﴾، هەرنە د ڤی گوندێ مەقدسدا و ب بەرفرەهی و ل جهێ هەوە بڤێت ژێ بخۆن، و چەمانەدی و خۆشكاندی بۆ خودایێ هوین ژ بەرزەبوونێ ڕزگار كرین هەرن، و بێژن: خودێوۆ گونەهێت مە داقوتە، چۆنە تێدا خۆ ل سەر قوینان خشاندن و گۆتن: دنكەك د جهیدا)[1].**

---

(١) ئەڤێ ئاخفتنێ چو رامان نینە نارمانجا وان نەگوهدارییا خودێیە و هەر هند.

قوله تعالى: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ﴾ [٦٨].

**گۆتنا خودايێ مەزن: كا ژ خودايێ خۆ بخوازە بۆ مە ديار بكەت، كا ئەو چ چێلە؟**

٥٧٧ – (خـ) قَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: الْعَوَانُ: النَّصَفُ بَيْنَ الْبِكْرِ وَالْهَرِمَةِ. ﴿فَاقِعٌ﴾: صَافٍ. ﴿لَّا ذَلُولٌ﴾: لَمْ يُذِلَّهَا الْعَمَلُ. ﴿تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ﴾: لَيْسَتْ بِذَلُولٍ تُثِيرُ الأَرْضَ، وَلاَ تَعْمَلُ فِي الْحَرْثِ. ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾ مِنَ الْعُيُوبِ. ﴿لَّا شِيَةَ﴾: بَيَاضٌ. ﴿صَفۡرَآءُ﴾ إِنْ شِئْتَ سَوْدَاءُ. ﴿فَٱدَّٰرَٰٔتُمۡ﴾: اخْتَلَفْتُمْ. [خ. الأنبياء، باب ٣٠].

**ئەبو عاليە دبێژيت: رامانا ﴿عَوَانٌ﴾ ناڤنجى د ناڤبەرا جەحێلاتى و پيراتييێدا ﴿فَاقِعٌ﴾ خۆسەر ﴿لَا ذَلُولٌ﴾ شۆلێ نەرم نەكرييە ﴿تُثِيرُ الْأَرْضَ﴾ نەيا سەرنەرمە عەردى بكێليت و عەردى ناكێليت، ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾ بێ كێماسييە ﴿لَا شِيَةَ﴾ سپيياتى ﴿صَفْرَاءُ﴾ ئەگەر تە بڤێت رەشاتى ﴿فَادَّارَأْتُمْ﴾ ژێكجودا بوون.**

**قوله تعالى: ﴿ فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ﴾ [٧٩].**

**گۆتنا خودايێ مەزن: وەى نەخۆشى و ئيزا بۆ وان بيت يێت كتێبێ ب دەستێت خۆ دنڤيسن.**

٥٧٨ – عَنْ ابن عباس في قوله: ﴿فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ يَكۡتُبُونَ ٱلۡكِتَٰبَ بِأَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشۡتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًاۖ﴾. قال: أحبار اليهود وجدوا صفة محمد (ﷺ) مكتوباً في التوراة: أكحلَ العين، ربعةً، جَعْدَ الشعرِ، حسن الوجه، فلما وجدوه في التوراة محَوْهُ حسداً وبغياً، فأتاهم نفرٌ من قريش من أهل مكة، فقالوا: تجدون في التوراة نبياً منا؟ فقالوا: نعم، نجده طويلاً أزرق سبط الشعر، فأنكرت قريش وقالوا: ليس هذا منا. [مخ١٢٣/١٢].

* إسناده صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَاذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾ گۆت: زانایێت جوهییان سالۆخەتێ موحەممەدی (ﷺ) د تەوراتێدا نڤیسی دیتن: چاڤکلدایە بێ کل و ناڤنجییە د ناڤبرا درێژی و کورتییێدا و پرچ ناڤنجییە د ناڤبەرا حولیاتی و خەلەکییێدا و دێم جوانە، ڤێجا دەمێ ئەڤە د تەوراتێدا دیتین ژ زکرەشی و ژ ستەمداری ژێ بر، و قورەیشی ژ خەلکێ مەکەهێ هاتنە دەڤ و گۆتنێ ئەرێ هوین د تەوراتێدا پێغەمبەرەکی ژ مە دبینن؟ گۆتن: بەلێ یێ درێژە و شوینە و سەر حولییە، ئینا قورەیشییان پەسند نەکر و گۆتن ئەڤە نە ژ مەیە.

قوله تعالى: ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ﴾ [١١٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەر جهەکێ هوین بەرێ خۆ بدەنێ، خودێ لێیە.**

٥٧٩ – عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ الْقِبْلَةُ، فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِيَالِهِ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَنَزَلَ: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾. [ت٣٤٥/ جه١٠٢٠].

* حسن.

ژ عامرێ کورێ رەبیعەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د وەغەرەکێدا د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ) د شەڤەکا تاریدا مە نەزانی قیبلە ل کیرێیە، هەر زەلامەکی ژ مە نڤێژ ل دویف سەرێ خۆ کر، ڤێجا دەمێ سپێدە ل مە بووی، مە ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەڤە هاتە خوارێ ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ هەر جهەکێ هوین بەرێ خۆ بدەنێ، خودێ لێیە.

قوله تعالى: ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَـٰنَهُۥ﴾ [١١٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گۆتن (مەخسەد جوهی و فەلە و بوتپەرێسن): خودێ زارۆیەك بۆ خۆ ڕاكرییە، و خودێ ژ ڤێ چەندێ پێ پاك و پاقژە.**

٥٨٠ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (قَالَ اللهُ: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ: فَزَعَمَ أَنِّي لاَ أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كما كانَ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ: فَقَوْلُهُ: لِي وَلَدٌ، فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَوْ وَلَداً). [خ٤٤٨٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ گۆت: دوپندەها ئادەمی ئاخفتنا من نەومیی دانا و وی ئەو ماف نەبوو، و كێماسی دا پال من (خەبەر گۆتنە من) و وی ئەو ماف نەبوو، هندیكە نەوپی دانانا وی بۆ من، هزر دكەت ئەز وی نازڤرینمەڤە، و كێماسیا پالدانا وی بۆ من گۆتنا وییە كو من كوڕ یێ هەی، و پاكی و پاقژی ژ هەمی كێماسییان بۆ من بیت ئەز هەڤژینێ یان كوڕی بگرم).**

قوله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ [١٢١].

**گۆتنا خودانێ مەزن: ئەوێت مە كتێب بۆ ئینایین و دورست و كا چاوا هاتییە خوارێ وەسا دخوینن.**

٥٨١ - (خ) عَنْ أَبِي رَزِينٍ قَالَ: ﴿يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾: يَتَّبِعُونَهُ يَعْمَلُونَ بِهِ حَقَّ عَمَلِهِ. [خ. كتاب التوحيد، باب ٤٧].

**ژ ئەبی روزەینی (رحمه الله) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ گۆت: دویڤ دچن و ب دورستی كار پێ دكەن.**

٥٨٢ - عن ابن عباس رضي الله عنهما في قول الله عزّ وجل: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾. قال: يُحِلُّونَ حَلالَهُ ويُحَرِّمونَ حَرامَهُ، ولا يُحَرِّفُونَهُ عن مَوَاضِعِه. [ك٣٠٥٤].

* قال الذهبي: صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ﴾ گۆت: حلالێ وێ حەلال دکەن و حەرامێ وێ حەرام دکەن و ژ جهێت وێ نا گوهۆرن.

قوله تعالى: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾ [١٤٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن، و هەروەسا مە هوین کرنە کۆمەکا ناڤنجی.**

٥٨٣ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يُدْعى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُقَالُ لأُمَّتِهِ: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: ما أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ، فَيَقُولُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ، فَيَشْهَدُونَ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ، ﴿وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾. فَذلِكَ قَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾). وَالْوَسَطُ: الْعَدْلُ.

[خ٤٤٨٧ (٣٣٣٩)].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(رۆژا قیامەتێ نووح و ئوممەتا وی دێ هێن، خودایێ مەزن دێ بێژیتێ: تە گەهاندە وان؟ دێ بێژیت: بەلێ ئەی خودایێ من، دێ بێژیتە ئوممەتا وی: گەهاندییە هەوە؟ دێ بێژن: نەخێر چو پێغەمبەر بۆ مە نەهاتینە، دێ بێژیتە نووحی کی شەهدەیێ بۆ تە ددەت؟ دێ بێژیت: موحەممەد ( ) و ئوممەتا وی، ڤێجا ئەم دێ شەهدەیێ بۆ دەین کو وی یا گەهاندی و ئەڤە گۆتنا خودێ ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ على الناس﴾)** و هەروەسا مە هوین کرنە کۆمەکا ناڤنجی، دا هوین ببنە شاهد ل سەر خەلکی، و دا پێغەمبەر ژی ل سەر هەوە ببیتە شاهد و (وَالْوَسَطُ) ئانکو دادوەری.

قوله تعالى: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ﴾ [١٤٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڤێ فەرمانێ (گوهۆرینا ڤیبلەیێ) خودێ پەرستنا هەوە (نڤێژێت هەوە بۆ بەیتولمەڤدسێ) بەرزە ناكەت.**

٥٨٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا تَوَجَّهَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَى الْكَعْبَةِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَيْفَ الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تعالى: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾ الآية.
[د٤٦٨٠/ ت٢٩٦٤/ مي١٢٧١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) بەرێ خۆ دایە كەعبێ (وەك ڤیبله) گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پا ئەو چاوانە ئەوێت مرین و وان د نڤێژاندا بەرێ خۆ ددا مەڤدسێ؟ ئینا خودایێ مەزن ئەڤە ئینا خوارێ ﴿وما كان الله لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ﴾ ب ڤێ فەرمانێ خودێ پەرستنا هەوە نڤێژێت هەوە بۆ بەیتولمەڤدسێ بەرزە ناكەت.**

قوله تعالى: (أولئك يَلْعَنُهُمْ الله وَيَلْعَنُهُمْ اللَّاعِنُونَ).

**گۆتنا خودایێ مەزن: خودێ لەعنەتێ ل ڤان دكەت، و لەعنەتكەر ژی لەعنەتان لێ دكەن.**

٥٨٥ – عَنْ البَرَاءِ بنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ﴿يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾، قَالَ: (**دَوَابُّ الأرضِ**)(١). [جه٤٠٢١].

* ضعف الإسناد.

---

(١) **شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا شینێ و ب هەر وێ هژمارێ ئینایە:** ٥٨٥ – (ق) عَنْ عَاصِمٍ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، لِأَنَّهَا كَانَتْ مِنْ شَعَائِرِ الجَاهِلِيَّةِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾. [خ١٦٤٨، م١٢٧٨].

**ژ عاسمی (رحمه الله) گۆت: من گۆ تە ئەنەسێ كورێ مالكی ئەرێ هەوە هاتن و چون د ناڤبەرا سەفا و مەروەیێدا نەدڤیا؟ گۆت: بەلێ چونكی ئەو ژ رێورەسمێت جاهلیەتێ بوون هەتا خودێ ئەڤە** ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ **ئینایە خوارێ.**

**ژ بەرائێ كوڕێ عازبی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ﴿يَلْعَنُهُمْ الله وَيَلْعَنُهُمْ اللَّاعِنُونَ﴾ گۆت: گیاندارێت ل سەر عەردی.**

قوله تعالى: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ﴾ [١٧٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: د دەرهەقێ كوشتنێدا تۆل (قیساس) ل سەر هەوە دانان (ئانكو: گونەهكار ب گونەها خۆ بێتە جزاكرن، و كوژەك ب تنێ بێتە كوشتن).**

٥٨٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ الْقِصَاصُ وَلَمْ تَكُنْ فِيهِمُ الدِّيَةُ، فَقَالَ اللهُ تَعَالَى لِهَذِهِ الأُمَّةِ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾، فَالْعَفْوُ أَنْ يَقْبَلَ الدِّيَةَ فِي الْعَمْدِ، ﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ﴾: يَتَّبِعُ بِالمَعْرُوفِ، وَيُؤَدِّي بِإِحْسَانٍ، ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ مِمَّا كُتِبَ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾: قَتَلَ بَعْدَ قَبُولِ الدِّيَةِ.　　　　[خ٤٤٩٨].

**ژ ئیبن عەباس (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: تۆلڤەكرن ب تنێ ل ناڤ ئیسرائیلییان هەبوو و خوین وەرگرتن د ناڤ واندا نەبوو، و خودایێ مەزن گۆتە ڤێ ئوممەتێ ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ له من أَخِيهِ شَيْءٌ﴾ (فَالْعَفْوُ) خوینێ وەرگریت د كوشتنا بێ غالوغەرەز ﴿فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إليه بِإِحْسَانٍ﴾ رێكا باش بگریت و تازە و بێ كێماسی و بێ گیرۆكرن خوینا وی بدەتێ ﴿ذلك تَخْفِيفٌ من رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ و ئەڤ بڕیارە ـ گوهارتنا كوشتنێ ب دانا خوینێ ـ بارسڤكاتی و دلۆڤانییە ژ خودایێ هەوە ژ وێ یا ل سەر یێت بەری هەوە نڤیسی ﴿فَمَنْ اعْتَدَى بَعْدَ ذلك فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ كوشتنێ بكەت پشتی خوین قەبویل كری.**

قوله تعالى: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ ﴾ [١٨٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو کەسێت گەلەك زەحمەت و نەخۆشییێ ب گرتنا رۆژییانڤە دبەن.**

٥٨٧ - (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قال: لما نَزَلَتْ: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾، كانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا، فَنَسَخَتْهَا. [خ٤٥٠٧/ م١١٤٥].

■ وفي رواية لمسلم: قَالَ: كُنَّا فِي رَمَضَانَ عَلَى عهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ فَافْتَدَى بِطَعَامِ مِسْكِينٍ، حَتَّى أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ [البقرة: ١٨٥].

**ژ سەلەمەیێ کورێ ئەکوەعی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ هاتییە خوارێ ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾[(1)] وی دەمی یێ ڤیابا رۆژی دخوار و شوین پێشڤە ددا هەتا ئایەتا دویڤرا هاتی ئەو فەرمان راکر.**

■ **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا گۆت: ئەم د رەمەزانێدا ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ ڤیابا ب رۆژی دبوو و یێ دڤیا دخوار و پێشڤە خوارن ددا هەتا ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمْ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ ڤێجا هەر کەسێ ژ هەوە ئەڤ هەیڤە ب سەردا هات ـ ل مال بیت و نە ل سەر وەغەرێ بیت ـ بلا رۆژییان بگریت.**

قوله تعالى: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ﴾ [١٨٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: چۆنا هەوە بۆ نڤینا ژنێ شەڤێت هەیڤا رەمەزانێ هاتە دورستکرن.**

---

**(١) و ئەو کەسێت گەلەك زەحمەت و نەخۆشییێ ب گرتنا وانڤە دبەن، بلا پێش خوارنا هەر رۆژییەکێڤە، خوارنا بەلنگازەکی ل سەر خۆ بێخن و بدەن.**

٥٨٨ - (خ) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِماً، فَحَضَرَ الإِفْطَارُ، فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ، لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلاَ يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ. وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِماً، فَلَمَّا حَضَرَ الإِفْطَارُ، أَتَى امْرَأَتَهُ فَقَالَ لَهَا: أَعِنْدَكِ طَعَامٌ؟ قَالَتْ: لاَ، وَلكِنْ أَنْطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ، وَكَانَ يَوْمَهُ يَعْمَلُ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ! فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَذُكِرَ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾، فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحاً شَدِيداً، وَنَزَلَتْ: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾. [خ١٩١٥].

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) گۆت: هەڤالێت موحەممەدی (ﷺ) ئەگەر زەلامەك ژ وان یێ ب رۆژیبا و دەمێ فتارێ هاتبا و نفستبا بەری فتارێ بکەت وێ شەڤا خۆ چو نەدخوار و رۆژا خۆ ژی هەتا ببا مەغرەبڤە، و قەیسێ کورێ (صرمة)یێ ئەنساری یێ ب رۆژی بوو، ڤێجا دەمێ فتارێ هاتە دەڤ هەڤژینا خۆ و گۆتێ: ئەرێ خوارنەك ل دەڤ تە هەیە؟ گۆت: نەخێر، بەلێ ئەز دێ چم بۆ تە خوازم، و وێ رۆژێ وی کار دکر چاڤێت وی شیانە وی و نفست، ڤێجا هەڤژینا وی هاتە دەڤ و دەمێ دیتی یێ نفستی، گۆت: خوسارەتی بۆ تە بیت. ڤێجا دەمێ بوویە نیڤا رۆژێ گێژ بوو، و ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە گۆتن، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إلى نِسَائِكُمْ﴾ چۆنا هەوە بۆ نڤینا ژنێ شەڤێت هەیڤا رەمەزانێ هاتە دورستکرن کەیفا وان پێ هات کەیفهاتنەکا گەلەك، و ئەڤە ژی هاتە خوارێ ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حتى يَتَبَيَّنَ لَكُمْ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ من الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾ و ب شەڤ بخۆن و ڤەخۆن هەتا سپیاتییا رۆژێ بۆ هەوە ژ تاریاتییا شەڤێ جودا دبیت و دیار دبیت.**

٥٨٩ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ [البقرة:١٨٣]، فَكَانَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذَا صَلَّوْا الْعَتَمَةَ حَرُمَ عَلَيْهِمْ

الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ وَالنِّسَاءُ وَصَامُوا إِلَى الْقَابِلَةِ، فَاخْتَانَ رَجُلٌ نَفْسَهُ، فَجَامَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَلَمْ يُفْطِرْ، فَأَرَادَ اللهُ عزّ وجل أَنْ يَجْعَلَ ذَلِكَ يُسْراً لِمَنْ بَقِيَ وَرُخْصَةً وَمَنْفَعَةً، فَقَالَ سُبْحَانَهُ: ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ [البقرة:١٨٧]، وَكَانَ هَذَا مِمَّا نَفَعَ اللهُ بِهِ النَّاسَ، وَرَخَّصَ لَهُمْ وَيَسَّرَ. [د٢٣١٣].

* حسن صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كما كُتِبَ على الَّذِينَ من قَبْلِكُمْ﴾[1] خەلك ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر نڤێژا عەیشا کربان خوارن و ڤەخوارن و نڤینا ژنان ل سەر وان حەرام بوو هەتا رۆژا پاشتر، ئینا زەلامەکی خیانەت ل خۆ کر و چۆ نڤینا ژنا خۆ و نڤێژا عەیشا کربوو و فتارە نەکربوو ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ڤیا ڤێ ل سەر وی یێ مای ساناهی بکەت و بکەتە دەستویری و مفا، خودایێ پاك ژ هەمی کێماسیان گۆت: ﴿عَلِمَ اللهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ﴾[2] و ئەڤە ژ وێیە یا خودێ پێ مفا گەهاندییە خەلکی بۆ وان دورست کر و ساناهی کر.**

قوله تعالى: ﴿ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ﴾ [١٨٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و د دەرگەهانڕا وەرنە د مالانڤە.**

٥٩٠ – (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: نَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ فِينَا، كانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَجَاؤُوا، لَمْ يَدْخُلُوا مِنْ قِبَلِ أَبْوَابِ بُيُوتِهِمْ، وَلكِنْ مِنْ ظُهُورِهَا، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ قِبَلِ بَابِهِ، فَكَأَنَّهُ عُيِّرَ بِذلِكَ، فَنَزَلَتْ: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُواْ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ﴾. [خ١٨٠٣/ م٣٠٢٦].

---

**(١) گەلی خودان باوەران، رۆژی ل سەر هەوە هاتە نڤیسین، هەروەکی ل سەر یێت بەری هەوە ژی هاتییە نڤیسین.**

**(٢) خودێ زانی هوین خۆ ناگرن، و دێ خیانەتێ ل خۆ کەن، تۆبە دا سەر هەوە و ل هەوە بۆری.**

**ژ بەرائێ کورێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: ئەڤ ئایەتە د راستا مەدا هاتە خوارێ، هندیکە خەلکێ مەدینەیێیە ئەگەر حەجی هاتبانەڤە ژ دەرگەهێت مالێت خۆڕا نەدچۆنە د مالێت خۆڤە بەلکی ژ پشتێڤە دچۆنە د خانییێت خۆڤە، زەلامەك ژ خەلکێ مەدینەیێ هات ژ لایێ دەرکەهیڤە چۆ هەروەکی ئەو ب ڤێ هاتە کێماسیکرن ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ ﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ من ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ من اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ من أَبْوَابِهَا﴾[1].**

قوله تعالى: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ ﴾ [١٩٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هوین گەلی موسلمانان، شەڕێ وان بکەن، دا ڕێکا ئیسلامێ نەئێتە گرتن.**

٥٩١ – (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً جاءَهُ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! أَلاَ تَسْمَعُ ما ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا﴾ إِلى آخِرِ الآيَةِ [الحجرات:٩]، فَمَا يَمْنَعُكَ أَنْ لاَ تُقَاتِلَ كَمَا ذَكَرَ اللهُ فِي كِتَابِهِ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! أُعَيَّرُ بِهذِهِ الآيَةِ وَلاَ أُقاتِلُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعَيَّرَ بِهذِهِ الآيَةِ الَّتِي يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ إِلى آخِرِهَا [النساء:٩٣]. قَالَ: فَإِنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ﴾. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَدْ فَعَلْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) إِذْ كَانَ الإِسْلاَمُ قَلِيلاً، فَكَانَ الرَّجُلُ يُفْتَنُ فِي دِينِهِ: إِمَّا يَقْتُلُونَهُ وَإِمَّا يُوثِقُونَهُ، حَتَّى كَثُرَ الإِسْلاَمُ، فَلَمْ تَكنْ فِتْنَةٌ. فَلَمَّا رَأَى أَنَّهُ لاَ يُوَافِقُهُ فِيما يُرِيدُ قَالَ: فَمَا قَوْلُكَ فِي عَلِيٍّ وَعُثْمَانَ؟ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: ما قَوْلِي فِي عَلِيٍّ وَعُثْمَانَ؟ أَمَّا عُثْمَانُ: فَكَانَ اللهُ قَدْ عَفَا عَنهُ، فَكَرِهْتُمْ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُ. وَأَمَّا عَلِيٌّ: فَابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَخَتَنُهُ. وَأَشَارَ بِيَدِهِ. وَهذِهِ ابْنَتُهُ. أَوْ بِنْتُهُ. حَيْثُ تَرَوْنَ.

[خ٤٦٥٠ (٤٥١٣)].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ و گۆتێ: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی ما تە گوه ل ئەڤا د کتێبا خودێدا هاتی نینە ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ من الْمُؤْمِنِينَ**

[1] و نە ژ قەنجیێیە هوین د پشت خانیڕا بێنە د ژۆرڤە، بەلێ قەنجی ئەوە پارێزکارییێ بکەن، و د دەرگەهانڕا بێنە د مالانڤە.

اقْتَتَلُوا﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ، چ رێگرییێ ل تە دكەت تو شەڕی نەكەی هەروەكی د كتێبا خودێدا هاتی؟ گۆت برازا ئەز ب ڤێ ئایەتێ بهێمە كێماسیكرن و شەڕی نەكەم بۆ من خۆشترە ئەز ب ڤێ ئایەتێ بهێمە كێماسیكرن ئەوا خودێ دبێژیت: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ، وی زەلامی گۆت: ب راستی خودێ دبێژیت: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حتى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ ئیبن عومەری گۆت: مە ئەڤە ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر ئەو دەمێ موسلمان د كێم، مرۆڤ هینگێ د دینێ ویدا دهاتە ئەزموونكرن و ئازاردان، یان دێ كوژن یان گرێدەن، هەتا موسلمان زۆر بووین و ئەزموونكرن و ئازاردان نەمای، ڤێجا دەمێ وی زەلامی زانی ئیبن عومەر گوهدارییا وی ناكەت ل سەر یا وی دڤێت ئینا گۆتی: تو بۆ عەلی و عوسمانی چ دبێژی؟ ئیبن عومەری گۆت: گۆتنا من د عەلی و عوسمانیدا، هندیكە عوسمانە خودێ یێ لێ بۆری، بەلێ هەوە نەڤیا خودێ لێ ببۆریت، و هندیكە عەلییە ب راستی ئەو پسمامێ پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ) و زاڤایێ وییە و ب دەستێ خۆ نیشان كر و گۆت و ئەڤە كچا وییە هەر وەكی هوین دبینن.

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾ [١٩٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و خۆ ب دەستێت خۆ نەهاڤێژنە د مالوێرانییێدا و خۆ د هیلاك نەبەن.**

٥٩٢ - (خ) عَنْ حُذَيْفَةَ: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾. قَالَ: نَزَلَتْ فِي النَّفَقَةِ. [خ٤٥١٦].

ژ حوزەیفەی (رضي الله عنه): (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللهِ ولا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إلى التَّهْلُكَةِ) یا د مەزاختنێدا هاتی.

٥٩٣ – عَنْ أَسْلَمَ أَبِي عِمْرَانَ قَالَ: كُنَّا بِمَدِينَةِ الرُّومِ، فَأَخْرَجُوا إِلَيْنَا صَفّاً عَظِيماً مِنَ الرُّومِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُمْ أَوْ أَكْثَرُ، وَعَلَى أَهْلِ مِصْرَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ، وَعَلَى الْجَمَاعَةِ فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ، فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ، فَصَاحَ النَّاسُ وَقَالُوا: سُبْحَانَ اللهِ، يُلْقِي بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ!

فَقَامَ أَبُو أَيُّوبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَتَأَوَّلُونَ هَذِهِ الْآيَةَ هَذَا التَّأْوِيلَ، وَإِنَّمَا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللهُ الْإِسْلاَمَ، وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سِرّاً دُونَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): إِنَّ أَمْوَالَنَا قَدْ ضَاعَتْ، وَإِنَّ اللهَ قَدْ أَعَزَّ الْإِسْلاَمَ، وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ، فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا، فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا.

فَأَنْزَلَ اللهُ تَبارَكَ وتَعالَى عَلَى نَبِيِّهِ (ﷺ) يَرُدُّ عَلَيْنَا مَا قُلْنَا: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾، فَكَانَتِ التَّهْلُكَةُ الْإِقَامَةَ عَلَى الْأَمْوَالِ وَإِصْلاَحِهَا، وَتَرْكَنَا الْغَزْوَ.

فَمَا زَالَ أَبُو أَيُّوبَ شَاخِصاً فِي سَبِيلِ اللهِ، حَتَّى دُفِنَ بِأَرْضِ الرُّومِ. (واللفظ للترمذي).[د٢٥١٢/ ت ٢٩٧٢].

* صحيح.

**ژ ئەسلەمی بابێ عیمرانی، (رحمه الله) گۆت: ئەم ل باژێرەکێ رۆمێ بووین، ریزەکا مەزن ژ رۆمییان بەرسینگێ مە درئێخستن، و موسلمان ژی هندی وان یان پتر بۆ دەرکەفتن، و عوقبەیێ کورێ عامری فەرماندێ مسرییان بوو، و فوزالەیێ کورێ عوبەیدی فەرماندەیێ خەلکێ مەدینەیێ ئەنساران بوو، ئینا زەلامەك ژ موسلمانان سەر ب ریزا رۆمییاندا گرت هەتا چۆیە د ناڤدا، خەلکی کرە گازی و گۆتن: وەی پاکی و پاقژی بۆ خودێ بن ئەڤی ب دەستێ خۆ خۆ هاڤێتە تالوکەتێ، ئینا ئەبو ئەیووب رابی و گۆت: گەلی خەلکی هوین ڤێ ئایەتێ ب ڤێ راڤەکرنێ راڤە دکەن، و ب راستی یا د راستا مە خەلکێ ئەنساراندا هاتییە خوارێ، دەمێ خودێ ئیسلام ب هێز ئێخستی، و پشتەڤان و هاریکارێت وێ زۆر بووین،**

هندەكا ژ مە ب نهێنیڤە بێی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتنە ئێكدو، ب راستی مالێ مە نەما و ب راستی ئیسلام یا ب هێز كەفتی و پشتەڤانێت وێ یێت زۆر بووین ئەگەر ئەم مابانە د ناڤ مالێ خۆدا و ئەوا نەمایی مە زڤراندباڤە و مە خەم ژێ خواربا، ئینا خودێ ئەو ل سەر پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) ئینا خوارێ بەرسڤا گۆتنا مە گۆتی ددەت: ﴿وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ولا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلى التَّهْلُكَةِ﴾ ڤێجا ژ ناڤچۆن یا د مانا د ناڤ مالیدا و چاڤدانا مالی و مە جیهاد هێلا و ئەبو ئەیووب بەردەوام د رێكا خودێدا یێ دەركەتی هەتا ل عەردێ رۆمێ هاتییە ڤەشارتن.

قوله تعالى: ﴿ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ﴾ [١٩٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن، و كارێ خۆ بكەن (بۆ وەغەرا دنیایێ) و ب ڕاستی چێترین خۆكاركرن (بۆ وەغەرا قیامەتێ) پارێزكارییە.**

٥٩٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كانَ أَهْلُ الْيَمَنِ يَحُجُّونَ وَلاَ يَتَزَوَّدُونَ، وَيَقُولُونَ: نَحْنُ المتَوَكِّلُونَ، فَإِذَا قَدِمُوا مَكَّةَ سَأَلُوا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾.

[خ١٥٢٣].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خەلكێ یەمەنێ حەج دكر و كارێ حەجێ نەدكر، خوارن د گەل خۆ نەدئینان و دگۆتن ئەم پشتگرێدایێت خودێینە، ڤێجا ئەگەر هاتبانە مەكەهێ خواستن ژ خەلكی دكر، ئینا خودایێ مەزن ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ: ﴿وَتَزَوَّدُوا فإن خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى﴾ ئانكو: و كارێ خۆ بكەن بۆ وەغەرا دنیایێ كو حەجە و ب ڕاستی چێترین خۆكاركرن بۆ وەغەرا قیامەتێ پارێزكارییە.**

قوله تعالى: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ [١٩٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: چو گونەه بۆ هەوە تێدا نینە هوین (دەمێ حەجێ) كەرەم و خێران ژ خودایێ خۆ بخوازن (ئانكو بازرگانییێ بكەن).**

٥٩٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَتْ عُكَاظٌ وَمَجَنَّةُ وَذُو الْمَجَازِ أَسْوَاقاً فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا كَانَ الإِسْلاَمُ تَأَثَّمُوا مِنَ التِّجَارَةِ فِيهَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ...﴾ فِي مَوَاسِمِ الحَجِّ. قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَذَا. [خ٢٠٩٨، (١٧٧٠)].

■ وفي رواية لأبي داود: قَالَ ابن عَبَّاسٍ: كَانُوا لاَ يَتَّجِرُونَ بِمِنًى، فَأُمِرُوا بِالتِّجَارَةِ إِذَا أَفَاضُوا مِنْ عَرَفَاتٍ. [د١٧٣١].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: عوكاز و میجەننە و زیلمەجاز بازارێت بەری ئیسلامێ بوون، ژ گونەهێ دترسییان ئەو ژی دەمێ حەجێ كڕین و فرۆتنێ بكەن، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿لیس عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ د دەمێت حەجێدا ئیبن عەباسی هۆسا خواند، ئانكو: چو گونەه بۆ هەوە تێدا نینە هوین دەمێ حەجێ كەرەم و خێران ژ خودایێ خۆ بخوازن ئانكو بازرگانییێ بكەن.**

■ **و د ڤەگێڕا ئەبو داوودا: ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: وان (مەبەست سەحابییان) بازرگانی ل مینایێ نەدكر، فەرمانا وان هاتە كرن ئەو بازرگانییێ بكەن دەمێ ژ عەرەفێ دەركەفتن.**

٥٩٦ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ التَّيْمِيِّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ، وَكَانَ نَاسٌ يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ، فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي رَجُلٌ أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ، وَإِنَّ نَاساً يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ؟

فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَلَيْسَ تُحْرِمُ وَتُلَبِّي، وَتَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَتُفِيضُ مِنْ عَرَفَاتٍ، وَتَرْمِي الْجِمَارَ؟ قَالَ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ لَكَ حَجّاً. جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَسَأَلَهُ عَنْ مِثْلِ مَا سَأَلْتَنِي عَنْهُ، فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَلَمْ يُجِبْهُ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَقَرَأَ عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةَ، وَقَالَ: (لَكَ حَجٌّ). [د١٧٣٣].

* صحيح.

**ئەبو ئومامەیێ تەمیمی (رحمه الله) دبێژیت ئەز د دەمێ حەجێدا دهاتمە كرێكرن، و هندە خەلكی دگۆتە من حەج بۆ تە نینە، من ئیبن عومەر دیت من گۆتێ: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی ئەز مرۆڤەكم د ڤێ وەغەرێدا دهێمە كرێكرن، و هندەك خەلكی گۆتە من حەج بۆ تە نینە، ئیبن عومەری گۆت: ما تو ئیحرامان ناكەیە بەر خۆ و تەلبییێ ناكەی و تەوافێ ل دۆر كەعبێ ناكەی و تو ل عەرەفێ ناداكەڤی و بەركان یێت جەمەراتان ناهاڤێژی؟ من گۆت: بەلێ، گۆت: ب راستی حەجا بۆ تە هەی. زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) وەكی پرسیارا تە ژ من كری پرسیارا وی كر، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لێ بێ دەنگ بوو هەتا ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿لیس عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا من رَبِّكُمْ﴾ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هنارتە دویڤڕا و ئەڤ ئایەتە بۆ خواند و گۆتێ حەج یا بۆتە هەی.**

قوله تعالى: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴾ [١٩٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: پاشی داڕژنە خوارێ ژ موزدەلیفەیێ، وی جهێ خەلك ژێ دادرژتە خوارێ.**

٥٩٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: يَطُوفُ الرَّجُلُ بِالْبَيْتِ ما كانَ حَلاَلاً حَتَّى يُهِلَّ بِالحَجِّ، فَإِذَا رَكِبَ إِلَى عَرَفَةَ فَمَنْ تَيَسَّرَ لَهُ هَدِيَّةٌ مِنَ الإِبِلِ أَوِ الْبَقَرِ أَوِ الْغَنَمِ، ما تَيَسَّرَ لَهُ مِنْ ذلِكَ، أَيَّ ذلِكَ شَاءَ، غَيْرَ أَنَّهُ إِنْ لَمْ يَتَيَسَّر لَهُ، فَعَلَيْهِ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ فِي الحَجِّ، وَذلِكَ قَبْلَ يَوْمِ عَرَفَةَ، فَإِنْ كانَ آخِرُ يَوْمٍ مِنَ الأَيَّامِ الثَّلاَثَةِ يَوْمَ عَرَفَةَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ، ثُمَّ لِيَنْطَلِقْ حَتَّى يَقِفَ بِعَرَفاتٍ مِنْ صَلاَةِ الْعَصْرِ إِلَى أَنْ يَكُونَ الظَّلاَمُ، ثُمَّ لِيَدْفَعُوا مِنْ عَرَفاتٍ إِذَا أَفاضُوا مِنْهَا حَتَّى يَبْلُغُوا جَمْعاً الَّذِي يُتَبَرَّرُ فِيهِ، ثُمَّ لِيَذْكُرُوا اللهَ كَثِيراً، أَوْ: أَكْثِرُوا التَّكْبِيرَ والتَّهْلِيلَ قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا، ثُمَّ أَفِيضُوا فَإِنَّ النَّاسَ كانُوا يُفِيضُونَ، وَقَالَ اللهُ تَعَالى: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾﴾. حَتَّى تَرْمُوا الجَمْرَةَ. [خ١٥٢١٤].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خەلكێ مەكەهێ و یێ هاتی عەمرە كری و ئنیەتا حەجا تەمەتوعێ ئینای دێ تەوافێ ل دۆر كەعبێ كەن هندی د ئیحراماندا نەبن، هەتا ئیحرامان بۆ حەجێ گرێ ددەت، ڤێجا دەمێ سویار دبیت بۆ عەرەفێ دچیت، یێ قوربان ب دەست كەفت ژ حێشتر و چێل و پەزی هەچییێ ژ وان ب دەست كەفت و ڤیا باشە، بەلێ یێ قوربان ب دەست نەكەفت سێ رۆژی ل حەجێ ل سەر وینە بەری عەرەفێ بەلێ ئەگەر رۆژا سێیێ عەرەفە بیت گونەه ل سەر نینە، پاشی بلا بچیت هەتا ل عەرەفێ پشتی نڤێژا ئێڤاری دراوەستیت هەتا دبیتە تاری، پاشی بلا ژ عەرەفێ دەركەڤن ئەگەر ژێ دارێژیان هەتا دگەهنە موزدەلیفەیێ ئەوا خێرێ تێدا دخوازن، پاشی بلا تێدا زكرێ خودێ گەلەك بكەن یان گەلەك تەكبیر (الله اكبر) و تەهلیلا (لا اله الا الله) تێدا بكەن بەری سپێدە ببیت، پاشی هەرن ب راستی پشتی سپێدێ خەلك دچۆن، و خودایێ مەزن یا گۆتی: (ثُمَّ أَفِيضُوا من حَيْثُ أَفَاضَ الناس وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (پاشێ دارژنە خوارێ ژ [موزدەلیفەیێ]، وی جهێ خەلك**

ژێ دادڕژتە خوارێ، و داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودێ بخوازن، ب ڕاستی خودێیە گونەهـ ژێبەر و دلۆڤان.) هەتا هوین بەرا دهاڤێژنە جهێ وان.

قوله تعالى: ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴾ [٢٢٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ژنێت هەوە زەڤینە بۆ هەوە جهێ شینكرنا دویندەهێنە.**

٥٩٨ - (ق) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَتِ الْيهُودُ تَقُولُ: إِذَا جامَعَهَا مِنْ وَرَائِهَا؛ جاءَ الْوَلَدُ أَحْولَ، فَنَزَلَتْ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾. [خ٤٥٢٨/ م١٤٣٥].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: جوهییان دگۆت: ئەگەر ئێك ژ پشتێڤە چۆ نڤینا هەڤژینا خۆ زارۆك دێ ویر هێت، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ ژنێت هەوە زەڤینە بۆ هەوە (جهێ شینكرنا دویندەهێنە)، ڤێجا كا هەوە چاوا بڤێت هەرنە زەڤیا خۆ (هەرنە نڤینا ژنا خۆ).**

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ ﴾ [٢٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ب مەرەما ئێزادان و دەستدرێژییێ دەستێ خۆ نەدانن سەر وان.**

٥٩٩ - عَنْ مَالِك، عَنْ ثَوْرِ بْنِ زَيْدٍ الدِّيلِيِّ: أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثُمَّ يُرَاجِعُهَا، وَلاَ حَاجَةَ لَهُ بِهَا، وَلاَ يُرِيدُ إِمْسَاكَهَا، كَيْمَا يُطَوِّلُ بِذَلِكَ عَلَيْهَا الْعِدَّةَ لِيُضَارَّهَا، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ يَعِظُهُمْ اللهُ بِذَلِكَ. [ط١٢٤٨]

* إسناده منقطع.

**ژ مالکێ کورێ سەوری کورێ زەیدی یێ دیلی (ﷺ): زەلام دا ژنا خۆ بەردەت پاشی دا زڤرینیتەڤە و هەوجەیی پێ نەبوو و نەدڤیا ب دورستی بزڤرینیت بەس دا ژڤانێت وێ ل سەر درێژکربان و دا زیانێ بگەهینیتێ، خودایێ پاك و بلند ئینا خوارێ: ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذلك فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ (و ب مەرەما ئیزادان و دەستدرێژییێ دەستێ خۆ نەدانانە سەر وان، و هەر کەسێ ڤێ بکەت، ئەوی ب ڕاستی ستەم ل خۆ کر) وان ب ڤێ چەندێ شیرەت دکەت.**

قوله تعالى: ﴿ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ ﴾ [٢٣٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: نەکەڤنە د ڕێکا واندا، و نەبنە ئاستەنگ، کو ل زەلامێت خۆ بزڤڕنەڤە.**

٦٠٠ - (خ) عَنِ الحَسَنِ: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾. قَالَ: حَدَّثَنِي مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ: أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ، قَالَ: زَوَّجْتُ أُخْتاً لِي مِنْ رَجُلٍ فَطَلَّقَهَا، حَتَّى إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا جاءَ يَخْطُبُهَا، فَقُلْتُ لَهُ: زَوَّجْتُكَ وَفَرَشْتُكَ وَأَكْرَمْتُكَ، فَطَلَّقْتَهَا، ثُمَّ جِئْتَ تَخْطُبُهَا! لاَ وَاللهِ لاَ تَعُودُ إِلَيْكَ أَبداً. وَكانَ رَجُلاً لاَ بَأْسَ بِهِ، وَكانَتِ المَرْأَةُ تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾. فَقُلْتُ: الآنَ أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: فَزَوَّجَهَا إِيَّاهُ. [خ٥١٣٠ (٤٥٢٩)].

**ژ یوونسێ کورێ حەسەنی (ﷺ) : ﴿فلا تَعْضُلُوهُنَّ﴾ ئانکو: ڕێگرتنێ لێ نەکەن، گۆت: مەعقیلێ کورێ یەساری گۆتە من ئەڤ ئایەتە د ڕاستا ویدا یا هاتە خوارێ، وی خویشکا خۆ ل زەلامەکی مارە کربوو و بەردا، ڤێجا دەمێ ژڤانێت وێ ب دوماهی هاتین هات بخوازیتەڤە، من گۆتێ: من ل تە مارە کر و من بۆ بۆت کرە نڤین و من قەدرێ تە گرت، و تە بەردا و پاشی تو دهێی دخوازییەڤە، نە ب خودێ چو جارا نازڤریتەڤە، و زەلامەکێ**

خراب نەبوو و ژنێ ژی دڤیا بزڤریتەڤە وی، ئینا خودێ ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ: ﴿فلا تَعْضُلُوهُنَّ﴾ من گۆت: ئها ڤێ گاڤێ ئەز دێ هێلم ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئینا لێ مارەکر.

قوله تعالى: ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾ [٢٣٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: بەردەوام بن ل سەر نڤێژێت خۆ، و نڤێژا ئێڤاری.**

٦٠١ - (م) عَنْ أَبِي يُونُسَ . مَوْلَى عَائِشَةَ . أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنْ أَكْتُبَ لَهَا مُصْحَفاً، وَقَالَتْ: إِذَا بَلَغْتَ هَذِهِ الآيَةَ فَآذِنِّي: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾، فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا، فَأَمْلَتْ عَلَيَّ: حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى، وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، وَقُومُوا للهِ قَانِتِينَ. قَالَتْ عَائِشَةُ: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [م٦٢٩].

**ژ ئەبی یوونس ئازاکرییێ عائیشایێ (رضي الله عنها): گۆت: عائیشایێ فەرمان ل من کر ئەز قورئانێ د بەرپەڕاندا بنڤیسم، و گۆت: ئەگەر تو گەهشتییە ڤێ ئایەتێ من ئاگەهدارکە ﴿حَافِظُوا على الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى﴾ ڤێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ من ئاگەهدار کر بۆ من خواند: ﴿حَافِظُوا على الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى﴾ و نڤێژا ئێڤاری ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ عائیشایێ گۆت: من ئەڤە یا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بووی.**

٦٠٢ - (م) عَنْ شَقِيقِ بْنِ عُقْبَةَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، فَقَرَأْنَاهَا مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ نَسَخَهَا اللهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ﴾، فَقَالَ رَجُلٌ كَانَ جَالِساً عِنْدَ شَقِيقٍ لَهُ: هِيَ إِذَنْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَقَالَ الْبَرَاءُ: قَدْ أَخْبَرْتُكَ كَيْفَ نَزَلَتْ، وَكَيْفَ نَسَخَهَا اللهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ. [م٦٣٠].

**ژ شەقیقێ کوڕێ عوقبەیی (رحمه الله) ژ بەرائێ کوڕێ عازبی گۆت: ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: پارێزییێ ل سەر نڤێژان بکەن و نڤێژا ئێڤاری، و مە ئەڤە دخواند هندی خودێ**

**حەز كری پاشی خودێ نەسخ كر و ئەڤە هاتە خوارێ: ﴿حَافِظُوا على الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى﴾ زەلامەك ل دەڤ برایێ خۆ یێ روینشتی بوو گۆتێ: ڤێجا ئەو نڤێژ یا ئێڤارییە، بەرائی گۆت: من گۆتە تە چاوا هاتییە خوارێ و چاوا خودێ نەسخ كر و خودێ چێتر دزانیت.**

قوله تعالى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا ﴾ [٢٤٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ژ هەوە ئەوێت دمرن و ژنان ب پاش خۆڤە دهێلن.**

٦٠٣ - (خ) عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا﴾؛ قَالَ: كَانَتْ هَذِهِ الْعِدَّةُ، تَعْتَدُّ عِنْدَ أَهْلِ زَوْجِهَا وَاجِبٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ﴾. قَالَ: جَعَلَ اللهُ لَهَا تَمَامَ السَّنَةِ سَبْعَةَ أَشْهُرٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَصِيَّةً، إِنْ شَاءَتْ سَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ، وَهُوَ قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾. فَالعِدَّةُ كما هِيَ وَاجِبٌ عَلَيْهَا، زَعَمَ ذلِكَ عَنْ مُجَاهِدٍ.

وَقَالَ عَطَاءٌ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَسَخَتْ هذِهِ الآيَةُ عِدَّتَهَا عِنْدَ أَهْلِهَا، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَهْوَ قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾. قَالَ عَطَاءٌ: إِنْ شَاءَتِ اعْتَدَّتْ عِنْدَ أَهْلِهِ وَسَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ، لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ﴾. قَالَ عَطَاءٌ: ثُمَّ جاءَ الْمِيرَاثُ فَنَسَخَ السُّكْنى، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ وَلاَ سُكْنى لَهَا. [خ٤٥٣١].

**ژ موجاهدی (رحمه الله): (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا) گۆت: ئەڤە ژڤانێت ژنێ بوون ل دەڤ مرۆڤێت زەلامێ خۆ د ما وەك ئەرك و خودێ ئەڤە ئینا خوار ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إلى الْحَوْلِ غير إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ في**

**ما فَعَلْنَ فِي أَنْفُسِهِنَّ من مَعْرُوفٍ﴾ گۆت: خودێ بۆ سال تمام كر حەفت هەیڤ و بیست شەڤ كرنە سەر قەویاتییە ئەگەر ڤیا دێ ل دویڤ قەویاتییێ ئاكنجی بیت و ئەگەر ڤیا دێ دەركەڤیت و ئەڤەیە گۆتنا خودێ: ﴿غیر إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ ژڤان وەكی هاتییە دانان (سالەكێ بمینیت) ئەرك و واجبە ل سەر وێ، ئەڤە موجاهد دبێژیت[(١)].**

**عەتاء دبێژیت: ئیبن عەباسی گۆت: ئەڤێ ئایەتێ مانا ژنێ ل دەڤ مرۆڤێت زەلامێ وێ نەسخ كر هەر جهێ بڤێت دێ ژڤانان لێ بەت و ئەڤەیە گۆتنا خودێ ﴿غیر إِخْرَاجٍ فَإِنْ...... الاية﴾ عەتاء دبێژیت: ئەگەر ڤیا دێ ژڤانان ل دەڤ مرۆڤێت وی بەت (ئانكو زەلامێ وێ) و ئاكنجی بیت ل دویڤ قەویاتیا بۆ هاتییە كرن و ئەگەر ڤیا دێ دەركەڤیت ژ بەر گۆتنا خۆدێ: ﴿فلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ﴾ عەتائی گۆت: پاشی ئایەتێت میراتێ ئاكنجیبوونێ نەسخ كر ڤێجا هەر جهێ بڤێت دێ ژڤانان لێ بەت و سەكەن بۆ نینە.**

قوله تعالى: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾ [٢٥٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: كۆتەكی و خورتی د دینیدا نینە ب خورتی خەلك بێتە موسلمانكرن.**

٦٠٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَكُونُ مِقْلاَتاً، فَتَجْعَلُ عَلَى نَفْسِهَا إِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ أَنْ تُهَوِّدَهُ، فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ، كَانَ فِيهِمْ مِنْ أَبْنَاءِ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: لاَ نَدَعُ أَبْنَاءَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ﴾.

قَالَ أَبُو دَاوُد: الْمِقْلاَت: الَّتِي لاَ يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ. [د٢٦٨٢].

---

**(١) شیبلێ كورێ عوباد دبێژیت: ئیبن ئەبی نەجیح دبێژیت: ئەڤە گۆتنا موجاهدییە: و بۆچۆنا وی ئەوە ئەڤ ئایەتە (**ويذرون أزواجا وصية لأزواجهم**) نەسخ نەبوویە.**

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباس (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژن هەبوو زارۆك بۆ نەدمان، ڤێجا دا ل سەر خۆ دانیت ئەگەر زارۆکێ وێ ژیا ئەو دێ وی کەتە جوهی، ڤێجا دەمێ جوهییێت بەنی نەزیر هاتینە راکرن، عەیالێت خەلکێ مەدینەیێ د گەل وان هەبوون، گۆتن: ئەم ناهێلین کورێت مە بچن، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قد تَبَيَّنَ الرُّشْدُ من الْغَيِّ﴾ (کۆتەکی و خورتی د دینیدا نینە ﴿ب خورتی خەلك بێتە موسلمانکرن﴾ ب سویند (باوەریئینان) و نەراستی (گاوری) ژێك هاتنە ڤاڤارتن (ژێك هاتنە نیاسین)).**

قوله تعالى: ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ ﴾ [٢٦٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەرێ ئێك ژ هەوە هەیە بڤێت چەمەك هەبیت.**

٦٠٥ - (خ) عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ رضي الله عنه يَوْماً لأَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ): فِيمَ تَرَوْنَ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ: ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ﴾؟ قَالُوا: اللهُ أَعْلَمُ، فَغَضِبَ عُمَرُ، فَقَالَ: قُولُوا: نَعْلَمُ أَوْ لاَ نَعْلَمُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فِي نَفْسِي مِنْهَا شَيْءٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! قَالَ عُمَرُ: يَا ابْنَ أَخِي، قُلْ وَلاَ تَحْقِرْ نَفْسَكَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ضُرِبَتْ مَثَلاً لِعَمَلٍ، قَالَ عُمَرُ: أَيُّ عَمَلٍ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لِعَمَلٍ، قَالَ عُمَرُ: لِرَجُلٍ غَنِيٍّ يَعْمَلُ بِطَاعَةِ اللهِ عزّ وجل، ثُمَّ بَعَثَ اللهُ لَهُ الشَّيْطَانَ، فَعَمِلَ بِالمعاصِي حَتَّى أَغْرَقَ أَعْمَالَهُ. [خ٤٥٣٨].

**ژ عوبەیدێ کورێ عومەیری (رحمه الله) گۆت: عومەری (رضي الله عنه) گۆتە هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) هوین دبینن ئەڤ ئایەتە ﴿أَيَوَدُّ أحدكم أَنْ تَكُونَ له جَنَّةٌ﴾ د چدا هاتییە خوارێ؟ گۆتن: خودێ دزانیت، عومەر تۆڕەبوو و گۆت: بێژن ئەم دزانین یان ئەم نوزانین، ئینا ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت ئەی میرێ موسلمانان تشتەکێ**

**د دلێ مندا هەی د راستا وێدا، ئینا عومەری گۆت: ئەی برازا بێژە و خۆ کێم نەبینە، ئیبن عەباسی گۆت: مەتەلە بۆ کارەکی هاتییە ئینان، عومەری گۆت: چ کار؟ ئیبن عەباسی گۆت: بۆ کارەکی، عومەری گۆت: بۆ زەلامەکێ زەنگین (خودان خێر) کار ب گوهدارییا خودایێ هەر ب هێز و مەزن بکەت، پاشی خودێ شەیتانی بۆ بهنێریت ڤێجا کار ب گونەهان بکەت هەتا خێرێت خۆ دخەندقینیت.**

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴾ [٢٦٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و یێ بێخێر ژ مالێ مە دایە هەوە نەکەنە خێر.**

٦٠٦ – عَنِ الْبَرَاءِ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ﴾. قَالَ: نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، كُنَّا أَصْحَابَ نَخْلٍ، فَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي مِنْ نَخْلِهِ عَلَى قَدْرِ كَثْرَتِهِ وَقِلَّتِهِ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي بِالْقِنْوِ وَالْقِنْوَيْنِ، فَيُعَلِّقُهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَكَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ، فَكَانَ أَحَدُهُمْ إِذَا جَاعَ أَتَى الْقِنْوَ فَضَرَبَهُ بِعَصَاهُ، فَيَسْقُطُ مِنَ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ فَيَأْكُلُ، وَكَانَ نَاسٌ مِمَّنْ لاَ يَرْغَبُ فِي الْخَيْرِ، يَأْتِي الرَّجُلُ بِالْقِنْوِ فِيهِ الشِّيصُ وَالْحَشَفُ، وَبِالْقِنْوِ قَدْ انْكَسَرَ، فَيُعَلِّقُهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ﴾، قَالوا: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أُهْدِيَ إِلَيْهِ مِثْلُ مَا أَعْطَاهُ لَمْ يَأْخُذْهُ إِلاَّ عَلَى إِغْمَاضٍ أَوْ حَيَاءٍ، قَالَ: فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ يَأْتِي أَحَدُنَا بِصَالِحِ مَا عِنْدَهُ. [ت٢٩٨٧/ جه١٨٢٢].

* صحيح.

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) گۆت: گۆتنا خودێ ﴿ولا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ منه تُنْفِقُونَ﴾ (و یێ بێخێر ژێ نەکەنە خێر) د راستا مەدا ئەم خەلکێ مەدینەیێدا هاتە خوارێ، ئەم خودان دارقەسپ بووین ڤێجا زەلام ژ قەسپێت خۆ دویڤ گەلەکی و کێمییا وان دا ئویشییەکی و دو ئویشییان ئینیت د مزگەفتێڤە هەلاویسیت و خەلکێ (صفة)یێ خوارن نەبوون، و ئێك ژ**

**وان ئەگەر برسی ببا دا دارەکی دانیتێ، ڤێجا بوسر (قەسپا کەسك بەری ببیتە روتەب) و قەسپ دوەریان و دا خوَت، و هندە خەلك هەبوو حەژ خێرێ نەدکرن زەلام دا ئویشییێ قەسپێت چرچوَیی بێ بەرك و هشك و ئویشییێ ئەو ب خوَ شکەستی ئینیت هەلاویسیت: ئینا خودێ ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا من طَيِّبَاتِ ما كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ من الأرض ولا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ منه تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إلا أَنْ تُغْمِضُوا فيه﴾ (گەلی خودان باوەران ژ حەلال باشێ هەوە ب دەست خوَڤە ئینایی و پەیدا کری، و ژ وی یێ مە بوَ هەوە ژ عەردی دەرئێخستی بمەزێخن د رێکا خودێدا بدەن و یێ بێخێر ژێ نەکەنە خێر، ئەوێ هوین ب خوَ، ئەگەر نە ژ ئێکا شەرمێ بیت وەرناگرن و چاڤێت خوَ ژ بێخێرییا وی ناگرن و پێ ڤایل نابن) گوَتن ئەگەر ئێك ژ هەوە وەکو یا دایی دیاری بوَ بهێت وەرناگریت ژ چاڤنقاندن و ژ شەرمێ نەبیت و مە پشتی هنگی تشتێ باش یێ خوَ دئینا.**

قوله تعالى: ﴿ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ ﴾ [٢٨٤].

**گوَتنا خودایێ مەزن: و تشتێ د دلێ خوَدا چ هوین دیار بکەن چ ژێ ڤەشێرن.**

٦٠٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ): ﴿لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴿٢٨٤﴾﴾. قَالَ: فَاشْتَدَّ ذلِكَ عَلَى أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَتَوْا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ، فَقَالُوا: أَيْ رَسُولَ اللهِ! كُلِّفْنَا مِنَ الأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ: الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالْجِهَادُ وَالصَّدَقَةُ، وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هذِهِ الآيَةُ، وَلاَ نُطِيقُهَا، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ: سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا؟ بَلْ قُولُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ**) قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ. فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَوْمُ ذَلَّتْ بِهَا أَلْسِنَتُهُمْ،

فَأَنْزَلَ اللهُ فِي إِثْرِهَا: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴿٢٨٥﴾﴾ [البقرة].

فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللهُ تَعَالَى، فَأَنْزَلَ اللهُ عز وجل: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَا﴾، قَالَ: (نَعَمْ) ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَا﴾، قَالَ: (نَعَمْ) {رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ} قَالَ: (نَعَمْ) ﴿...وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴿٢٨٦﴾﴾[البقرة] قَالَ: (نَعَمْ). [م١٢٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە: ﴿لِلَّهِ ما في السماوات وما في الأرض وَإِنْ تُبْدُوا ما في أَنْفُسِكُمْ أو تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ الله فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ من يَشَاءُ وَاللَّهُ على كل شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (هندی د عەرد و عەسماناندا یێ خودێیە، ڤێجا تشتێ د دلێ خۆدا چ هوین دیار بکەن چ هوین ڤەشێرن، خودێ دێ هەر حسێبا وی د گەل هەوە کەت). ل سەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتییە خوارێ، ل سەر هۆگرێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گران بوو، ئینا هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشی کەفتنە سەر چۆکێت خۆ و گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ، هند کار و کریار ل مە هاتنە کرن ئەم بشێین و دەرحەق بهێینە دەرێ: نڤێژ و جیهاد و رۆژی و سەدەقە، و ئەڤ ئایەتە بۆ تە یا هاتییە خوارێ، و ئەم نەشێینێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ هەوە دڤێت هوین وێ بێژن یا خودان هەردو کتێبێت بەری هەوە گۆتین؛ مە [ ئاخفتنا تە ] بهیست بەلێ ئەم پێ [ ب گۆتنا تە ] ناکەین؟ بەلێ بێژن: ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ مە بهیست و مە گوهداری کر، خودێوۆ ل مە ببۆرە، جهێ مە هەر تویی [ دویماهییا مە ئەوە یا ل دەڤ**

تە). ڤێجا دەمێ خواندین و ئەزمانێ وان پێ تیژ بووی، خودایێ مەزن دویڤرا ئەڤە ئینا خوارێ، ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إليه من رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بين أَحَدٍ من رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ (پێغەمبەری باوەری ئینایییە ب تشتێ بۆ [ وی ] ژ دەڤ خودێ هاتی، و خودان باوەران ژی، هەمییان باوەری ب خودێ و ملیاکەتێت وی و کتێبێت وی و پێغەمبەرێت وی ئینایییە [ و دبێژن ] ئەم فەرقێ (جوداییێ) نائێخینە ناڤبەرا چو پێغەمبەرێت وی، و هەمیان تێکدا (پێغەمبەری و خودان باوەران) گۆت: [ خودێوۆ ] مە بهیست و مە گوهداری کر، خودێوۆ ل مە ببۆرە، جهێ مە هەر تویی [ دویماهییا مە ئەوە یا ل دەڤ تە ]). ڤێجا دەمێ وەکرین خودێ حوکمێ وێ ئایەتێ راکر و ئەڤە ئینا خوارێ ﴿لَا يُكَلِّفُ الله نَفْسًا إلا وُسْعَهَا لها ما كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا ما اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إن نَسِينَا أو أَخْطَأْنَا﴾ (خودێ هەر کەسەکی ژ بارێ وی زێدەتر لێ ناکەت، ڤێجا چ یا بکەت [ چ قەنج چ خراب ] بۆ خۆ دکەت و ل خۆ دکەت، خودێوۆ ل مە نەگرە ئەگەر مە تشتەك ژ بیر کر یان ئەم خەلەت بووین) گۆت: بەلێ ﴿رَبَّنَا ولا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كما حَمَلْتَهُ على الَّذِينَ من قَبْلِنَا﴾ (خودێوۆ بارەکێ هند گران ل مە نەکە وەکی وی یێ تە ل یێت بەری مە کری [ کو جوهی بوون ]) گۆت: بەلێ، (رَبَّنَا ولا تُحَمِّلْنَا ما لَا طَاقَةَ لنا بِهِ) (خودێوۆ وی باری ل مە نەکە یێ ئەم نەشێین ڕاکەین و هەلگرین) گۆت: بەلێ، ﴿وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لنا وَارْحَمْنَا أنت مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا على الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ (و ل مە ببۆرە، و گونەهێت مە ژێ ببە، و دلۆڤانییێ ب مە ببە، تو پشتەڤانێ مەیی، و مە ب سەر کۆما گاوران بێخە) گۆت: بەلێ.

(٣)

سورة ال عمران

سۆرەتا ئالیعیمران.

قوله تعالى: ﴿ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ ﴾ [٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هندەك ژێ ئایەتێت د ڕۆن و ئاشكەرانە (مەخسەد و مەرەما وان یا دیار دیارە).**

٦٠٨ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: تَلاَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) هَذِهِ الآيَةَ: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾﴾. قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ما تَشَابَهَ مِنْهُ، فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللهُ، فَاحْذَرُوهُمْ)**. [خ٤٥٤٧/ م٢٦٦٥].

**ژ عائیشایێ، (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿هو الذي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ منه آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ ما تَشَابَهَ منه ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وما يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إلا الله وَالرَّاسِخُونَ في الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ من عِنْدِ رَبِّنَا وما يَذَّكَّرُ إلا أولوا الْأَلْبَابِ﴾[(١)] گۆت: پێغەمبەرێ خودێ**

---

**(١) راڤەكرن: ئەوە یێ كتێب (كو قورئانە) ب سەر تەدا ئینایییە خوار، هندەك ئایەتێت وێ د ڕۆن و ئاشكەرانە (مەخسەد و مەرەما وان یا دیار دیارە) و ئەون هێڤێن و ماكا كتێبێ و (بناغە و بنیاتێ ئایەتێت دی). و هندەكێت دی (هەنە) د مەخسەد ڤەشارتی (ئانكو: مەخسەدا وان نەیا ئاشكەرا ئاشكەرایە) ڤێجا ئەڤێت، ڤارێبوون ژ ڕاستییێ د دلێ واندا هەی، ب دویڤ وان دكەڤن (ب وانڤە دمینن) ئەوێت مەخسەد نەئاشكەرا، ژ بۆ**

**(ﷺ) گۆت: (ئەگەر تە ئەو دیتن یێت ل دویڤ وان ئایەتان دچن یێت د مەخسەد ڤەشارتی و مەخسەدا وان نەیا ئاشكەرا ئاشكەرایە ئها ئەو ئەوون یێت خودێ گۆتین هشیاری وان بن (گوهدارییا وان نەكەن).**

قوله تعالى: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ [١١٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هوین گەلێ موسلمانان باشترین ملەتن بۆ خەلكی هاتین.**

٦٠٩ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾. قَالَ: خَيْرَ النَّاسِ لِلنَّاسِ، تَأْتُونَ بِهِمْ فِي السَّلَاسِلِ فِي أَعْنَاقِهِمْ، حَتَّى يَدْخُلُوا فِي الإِسْلَامِ. [خ٤٥٥٧ (٣٠١٠)].

■ وفي رواية قال: قال رَسُول الله (ﷺ): **(عَجِبَ اللهُ مِنْ قَوْمٍ يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ فِي السَّلَاسِلِ).** [خ٣٠١٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) د گۆتنا خودێدا ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ گۆت: باشترین مرۆڤ بۆ مرۆڤان وان ب زنجیران ب ستۆیێ وانڤە بینن هەتا بهێنە د ئیسلامێدا.**

■ **و د ڤەگێرەكا د یدا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( خودێ ب هـ ندەكان خۆشە ب زنجیرڤە دچنە د بەحەشتێڤە)[1].**

٦١٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾. قَالَ: هُمُ الَّذِينَ هَاجَرُوا مَعَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) إِلَى الْمَدِينَةِ. [حم٢٤٦٣].

* إسناده حسن.

---

هلنێخستنا فتنەیێ یان ژ بۆ ڤاڕێكرنا مەخسەدێ (كو وێ مەخسەدێ بدەنێ یا وان دڤێت). و ژ خودێ پێڤەتر كەس مەخسەدا وان نوزانیت. و ئەڤێت زێدەزانا دبێژن: مە باوەری ب هەمییێ هەیە، هەمی ژ دەڤ خودایێ مە هاتییە، و ژ بلی ئاقلداران كەسێ دی هزرا خۆ د ڤێ چەندێدا ناكەت (و ل خۆ نازڤڕیت).

[1] ئانكو دهێنە ئێخسیركرن پاشی دهێنە زنجیركرن پاشی موسلمان دبن و دچنە بەحەشتێ.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ گۆت: ئەو ئەون یێت د گەل موحەممەدی (ﷺ) مشەخت بووینە مەدینەیێ.**

قوله تعالى: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ ﴾ [١٢٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: (هەی موحەممەد، بزانە) تە چو دەست د ڤی کاروباریدا نینە (هەمی د دەست خودێدایە چ یا وی بڤێت دێ ل وان کەت).**

٦١١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ، أَوْ يَدْعُوَ لأَحَدٍ، قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ، فَرُبَّمَا قَالَ، إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ: (**اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ. اللَّهُمَّ! أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ. اللَّهُمَّ! اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ**)، يَجْهَرُ بِذلِكَ، وَكَانَ يَقُولُ فِي بَعْضِ صَلاَتِهِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ: (**اللَّهُمَّ! الْعَنْ فُلاَناً وَفُلاَناً**) لأَحْيَاءٍ مِنَ الْعَرَبِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ﴾ الآيَةَ. [خ٤٥٦٠ (٧٩٧)/ م٦٧٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ڤیابا دوعا ل ئێکی بکەت یان دوعا بۆ بکەت قنوت پشتی رکوعێ دکر، و دبیت پشتی گۆتنا** (سمع الله لمن حمده) **گۆتبا: (یا خودێ خودایێ مە پەسن و سوپاسی بۆ تە یا خودێ وەلیدێ کورێ وەلیدی و سەلەمەیێ کورێ هیشامی و عەیاشێ کورێ ئەبی رەبیعەی رزگار بکە، یا خودێ ئیزایا خۆ ل سەر موزەرییان گران و دژوار بکە، و ب سەر بکە سالێت هشك و بێ باران و تەنگاڤ)، و دەنگێ خۆ ب ڤێ بلند دکر و د هندە نڤێژێت خۆدا د نڤێژا سپێدێدا دگۆت: (یا خودێ نەفرەتان ل فلانی و فلانی بکە)، هندە تاخێت عەرەبانە هەتا گۆتنا خودێ هاتییە خوارێ ﴿لیس لك من الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ و هەتا تامامیا ئایەتێ.**

قوله تعالى: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً﴾ [١٣٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەوێت ئەگەر گونەهەكێ دكەن یان ژی ستەمێ ل خۆ دكەن.**

٦١٢ - عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: إني كُنْتُ رَجُلاً إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَدِيثاً نَفَعَنِي اللهُ مِنْهُ بِمَا شَاءَ أَنْ يَنْفَعَنِي، وَإِذَا حَدَّثَنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ اسْتَحْلَفْتُهُ، فَإِذَا حَلَفَ لِي صَدَّقْتُهُ، وإنهَ حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ . وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ . قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنْباً، ثُمَّ يَقُومُ فَيتطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ إِلاَّ غَفَرَ اللهُ لَهُ**)، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. [د١٥٢١/ ت٤٠٦/ جه١٣٩٥]

* حسن صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز زەلامەك بووم ئەگەر من فەرموودەیەك گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ببا خودێ ب كارپێكرنێ مفا دگەهاندە من ب وێ یا وی دڤیا مفای بگەهینیتە من، و ئەگەر ئێك ژ هەڤالێت وی ژ وی فەرموودەك بۆ من گۆتبا، من ددا سویندێ، ڤێجا ئەگەر سویند خواربا من باوەر ژێ دكر، و ئەبوبەكری بۆ من گۆت و ئەبوبەكر (رضي الله عنه) راست گۆت: كو وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (نینە بەندەیەك گونەهەكێ بكەت و پاشی دەستنڤێژا خۆ باش بشۆت و پاشی دو ركاعەتان بكەت و پاشی داخوازا گونەهژێبرنێ بكەت، ئەگەر خودێ گونەهێت وی ژێ نەبەت)، پاشی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وَالَّذِينَ إذا فَعَلُوا فَاحِشَةً أو ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ﴾ [(١)] هەتا دویماهییا ئایەتێ.**

(١) و ئەوێت ئەگەر گونەهەكێ دكەن یان ژی ستەمێ ل خۆ دكەن، ناڤێ خودایێ خۆ دئینن و خودێ دئیننە بیرا خۆ، و داخوازا گونەه ژێبرنێ ژ خودێ دخوازن.

قوله تعالى: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢا﴾ [١٦٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ هزر نەکەن ئەوێت د رێکا خودێدا هاتینە کوشتن د مرینە وەکی هەر ئێک دمریت.**

٦١٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَمَّا أُصِيبَ إِخْوَانُكُمْ بِأُحُدٍ، جَعَلَ اللهُ أَرْوَاحَهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، تَرِدُ أَنْهَارَ الْجَنَّةِ، تَأْكُلُ مِنْ ثِمَارِهَا، وَتَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مِنْ ذَهَبٍ مُعَلَّقَةٍ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ، فَلَمَّا وَجَدُوا طِيبَ مَأْكَلِهِمْ وَمَشْرَبِهِمْ وَمَقِيلِهِمْ، قَالُوا: مَنْ يُبَلِّغُ إِخْوَانَنَا عَنَّا أَنَّا أَحْيَاءٌ فِي الْجَنَّةِ نُرْزَقُ، لِئَلاَّ يَزْهَدُوا فِي الْجِهَادِ، وَلاَ يَنْكُلُوا عِنْدَ الْحَرْبِ؟ فَقَالَ اللهُ سُبْحَانَهُ: أَنَا أُبَلِّغُهُمْ عَنْكُمْ**)، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. [د٢٥٢٠].

* حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمێ برایێت هەوە ل شەڕێ ئوحودێ شەهید بووین خودێ جانێت وان کرنە د ناڤ بالندەیێت کەسکدا دهێنە سەر رووبارێت بەحەشتێ (یێت ئاڤێ و شیری و مەیێ و هنگڤینی) و ژ فێقییێ وێ دخۆن، و ب شەڤ دچنە د هندە چرایێت زێریدا یێت هەلاویستی ب عەرشیڤە، ڤێجا دەمێ خۆشییا خوارن و ڤەخوارن و جهێ ڤەهەسیان و نڤستنا خۆ دیتی گۆتن؛ کی دێ ژ مە گەهینیتە برایێت مە کو ئەم د بەحەشتێدا د ساخین و رزقێ مە دهێتە دان، دا جیهادێ نەهێلن و ل شەڕان نەترسن، ئینا خودێ گۆت؛ ئەز دێ پێش هەوڤە گەهینمە وان)، گۆت: ئینا خودێ ئینا خوار: ﴿ولا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا في سَبِيلِ اللَّهِ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ.**

قوله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ﴾ [١٧٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: خەلکی (نەیارێت هەوە) لەشکەرێ بۆ هەوە (بۆ بنبڕکرنا هەوە) کۆم کری، ژ خۆ بترسن و هشیار بن.**

٦١٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾. قالَهَا إِبْرَاهِيمُ عليه السلام حِينَ أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَقَالَهَا مُحَمَّدٌ (ﷺ) حِينَ قَالوا: ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ۝١٧٣﴾. [خ٤٥٦٣].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ﴿حَسْبُنَا الله وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (خودێ بەسی مەیە، و پشتەڤان هەما هەر خودێیە). ئیبراهیمی (عليه السلام) ئەڤە گۆت، دەمێ هاڤێتییە د ئاگریدا، و موحەممەدی (ﷺ) گۆت، دەمێ گۆتین: ﴿إِنَّ الناس قد جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا الله وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ خەلکی ـ نەیارێت هەوە ـ لەشکەرێ بۆ هەوە بۆ بنبڕکرنا هەوە کۆم کری، ژ خۆ بترسن و هشیار بن، شوینا بترسن باوەرییا وان پتر لێ هات و ژ بەر هندێ گۆتن: خودێ بەسی مەیە و پشتەڤان هەما هەر خودێیە.**

قوله تعالى: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ﴾ [١٨٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هزر نەکە ئەوێت ب کریارێت خۆ دلخۆش دبن (دێ ژ ئیزایا خودێ رزگار بن).**

٦١٥ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رِجالاً مِنَ الْمُنَافِقِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، كانَ إِذَا خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ، وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلافَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَإِذَا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) اعْتَذَرُوا إِلَيْهِ وَحَلَفُوا، وَأَحَبُّوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا، فَنَزَلَتْ: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ﴾ الآية. [خ٤٥٦٧/ م٢٧٧٧].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﭬ) گۆت: هندە زەلام ژ دوڕوییان ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر دەركەفتبا جیهادێ ژێ ڤەدمان و ب ڤەمان و ڕوینشتنا خۆ (د مالێت خۆدا)، پشتی پێغەمبەرێ خودێ چۆیی، خۆشبوون، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەدگەریاڤە لێبۆرین دخواستن و هێجەت دگرتن و سویند دخوارن و دڤیان دەستخۆشییا وان ل سەر وێ یا نەكرین بێتە كرن، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿لَا تَحسبنَ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَم يَفْعَلُوا﴾[1] هەتا دویماهییا ئایەتێ.**

٦١٦ - (ق) عَنْ مَرْوَانَ ـ ابنِ الحَكَمِ ـ قَالَ لِبَوَّابِهِ: اذْهَبْ يا رَافِعُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ: لَئِنْ كانَ كُلُّ امْرِئٍ فَرِحَ بِمَا أُوتِيَ، وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ، مُعَذَّباً؛ لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ! فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَما لَكُمْ وَلِهذِهِ؟ إِنَّمَا دَعا النَّبِيُّ (ﷺ) يَهُودَ فَسَأَلَهُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ، وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ، فَأَرَوْهُ أَنْ قَدِ اسْتَحْمَدُوا إِلَيْهِ بِمَا أَخْبَرُوهُ عَنْهُ فِيما سَأَلَهُمْ، وَفَرِحُوا بِمَا أَتَوْا مِنْ كِتْمانِهِمْ، ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ﴾ كَذَلِكَ، حَتَّى قَوْلِهِ: ﴿يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ﴾. [خ٤٥٦٨/ م٢٧٧٨].

**ژ مەروانێ كوڕێ حەكەمی (ﭬ) گۆتە دەرگەهڤانێ خۆ هەرە دەڤ ئیبن عەباسی، و بێژێ: ئەگەر هەر مرۆڤەكێ هەبیت دلخۆش ببیت ب وێ یا دایێ و ڤیا دەستخۆشی لێ بهێتە كرن ل سەر وێ یا نەكری، بهێتە ئازاردان هۆسا ئەم هەمی دێ ئازارلێكری بین، ئینا ئیبن عەباسی گۆت: ما هەوە و ڤێ چ د گەلێكە (ژ پرسیارێ نەرازییە). ئەڤە پێغەمبەری (ﷺ) گازی هندە جوهییان كر، و پرسیارا تشتەكی ژێ كر، ژێ ڤەشارتن و تشتەكێ دی گۆتێ، و نیشا پێغەمبەری (ﷺ) دان ئەو هەژی دەستخۆشییێنە ب وێ یا وان ل دۆر پرسیارا وی گۆتینێ، و دلخۆش بوون ژ وێ یا وان بەخشی ژ ڤەشارتنا وان، پاشی**

---

**(١) هزر نەكە ئەوێت ب كریارێت خۆ دلخۆش دبن و دڤێن دەستخۆشییا وان بێتە كرن ل سەر وێ یا نەكرین، هزر نەكە ئەڤە دێ ژ ئیزایێ قورتال بن، ئیزا و نەخۆشییەكا دژوار بۆ ڤان هەیە.**

**ئیبن عەباسی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ هۆسا هەتا گەهشتییە گۆتنا وێ: ﴿يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا﴾[1].**

قوله تعالى: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ﴾ [١٩٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەز كار و كریارێت چو كریاركەران ژ هەوە بەرزە ناكەم چ مێر چ ژن.**

٦١٧ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! لاَ أَسْمَعُ اللهَ ذَكَرَ النِّسَاءَ فِي الْهِجْرَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنْ بَعْضٍ﴾. [ت٣٠٢٣].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ، (رضي الله عنها) من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز نابینم خودێ بەحسێ ژنان د مشەختبوونێدا كربیت، ئینا خودایێ مەزن ئینا خوار: ﴿أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ من ذَكَرٍ أو أُنْثَى بَعْضُكُمْ من بَعْضٍ﴾ ئەز كار و كریارێت چو كریاركەران ژ هەوە بەرزە ناكەم چ مێر چ ژن، هەر هندەك ژ هەوە ژ هندەكانن، ئانكو ژێدەرێ هەوە ژن و مێران هەر ئێكە و فەرق و جودایی د ناڤبەرا هەوەدا نینە.**

---

**(١) راڤەكرنا هەردو ئایەتان ب كورتی: و بۆ ملەتێ خۆ بێژە: دەمێ خودێ ژ وان ئەوێت كتێب بۆ هاتین سۆز و پەیمان ستاندی [و گۆتییە وان] كو هوین بێ گۆمان دێ ڤێ كتێبێ بۆ خەلكی رۆن و ئاشكەراكەن و چو یێ ژێ ناڤەشێرن، [بەلێ ئەو سۆز و پەیمانا وان دایی] ب پشت خۆڤە هێلان [ئانكو پشتا خۆ دانێ]. و [سۆز و پەیمانا خۆ] ب بهایەكی كێم فرۆتن، و نە چو بازار بوو وان كری. [هەی موحەممەد] هزر نەكە ئەوێت ب كریارێت خۆ دلخۆش دبن [كو ئەو جوهینە یێت نیشانێت موحەممەد پێغەمبەر ئەوێت د تەوراتێدا هاتین ڤەشارتین ب ڤی كارێ خۆ دلخۆش بوویین دێ ژ ئیزایا خودێ رزگار بن] و دڤێن دەستخۆشیيا وان بێتە كرن ل سەر وێ یا نەكرین.**

(٤)

سورة النساء

سۆرەتا نیساء

قوله تعالى: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى﴾ [٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر هوین ترسیان د ڕاستا كچێت سێویدا (ئەوێت هوین خودانییێ ژێ دكەن ئەگەر مار بكەن) دادوەرییێ نەكەن (و مافێت وان ب دورستی نەدەنێ).**

٦١٨ - (ق) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ سَأَلَ عائِشَةَ رضي الله عنها، عَنْ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ﴾، إِلَى ﴿وَرُبَاعَ﴾. فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي! هِيَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، تُشَارِكُهُ فِي مالِهِ، فَيُعْجِبُهُ مالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ ما يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ؛ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ، وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا ما طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ.

قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عائِشَةُ: ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَعْدَ هـذِهِ الآيَةِ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾[النساء:١٢٧]. وَالذِي ذَكَرَ اللهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ الآيَةُ الأُولَى، الَّتِي قَالَ فِيهَا: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ﴾ [النساء:٣].

قَالَتْ عائِشَةُ: وَقَوْلُ اللهِ فِي الآيَةِ الأُخْرَى: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ [النساء:١٢٧] ؛ يَعْنِي: هِيَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ الَّتِي تَكُونُ فِي حَجْرِهِ، حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ المَالِ وَالجَمَالِ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا ما رَغِبُوا فِي مالِهَا وَجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إِلاَّ بِالْقِسْطِ، مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ.

[خ٢٤٩٤/ م٣٠١٨].

ژ عوروەیێ کورێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی پرسیار ژ عائیشایێ ژ گۆتنا خودێ مەزن کر: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ﴾ هەتا ﴿وَرُبَاعَ﴾ ئینا گۆت: خوارزاییێ من ئەو بەحسێ کچا سێوییە یا ل دەڤ سەمیانێ خۆ و هەڤپشکییا وی د مالێ ویدا دکەت، ڤێجا دێ حەژ مالێ وێ و جوانییا وێ کەت و سەمیانێ وێ دڤێت مارە بکەت بێی دادگەرییێ د مەهرا وێدا بکەت و وێ بدەتێ یا ددەتە ئێکا دی، ئینا ژ مارکرنا وان هاتنە پاشڤەلێدان ژ بلی ئەو دادگەرییێ د واندا بکەن و مەهرا وان بلندتر ژ یا عەدەتێ وان بدەنێ، و فەرمانا وان هاتە کرن یێت وان بڤێن ژ بلی وان مارە بکەن.

عوروەی گۆت: عائیشایێ گۆت: پاشی خەلکی پشتی ڤێ ئایەتێ پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ () د راستا ژنا سێویدا کر (کا چ بڕیار و ئەحکام د دەرهەڤێ وێدا هەنە) ئینا خودێ ئینا خوار ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾ هەتا گۆتنا وی ﴿وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ و ئەوا گۆتی قورئان دێ بۆ هەوە ب ڤێ چەندێ هێتە خواندن ئایەتا ئێکێ ئەوا تێدا گۆتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ ألا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا ما طَابَ لَكُمْ من النِّسَاءِ﴾ و گۆتا خودێ د ئایەتا دیدا ﴿وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ ئانکو: نەحەژێکرنا ئێك ژ هەوە ئێتیما خۆ و ل دەڤ وی ئەگەر یا کێم مال و جوانی بیت مارە بکەت، ڤێجا هاتنە پاشڤەلێدان ژ یا وان حەژێ کری ژ جوانییا وێ و مالێ وێ ژ بلی هندێ دادگەرییێ بکەن ژ بەر هەوە حەز ل سەر نینە چونکی د کێم مال و جوانینە.

قوله تعالى: ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ [٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هەچییێ خێزان (فەقیر) بیت بلا تەمەتی زەحمەتا خۆ و ل دویڤ هەوجەیییا خۆ بخوٚت.**

٦١٩ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾. قَالَتْ: أُنْزِلَتْ فِي وَالِي الْيَتِيمِ، أَنْ يُصِيبَ مِنْ مالِهِ إِذَا كانَ مُحْتاجاً، بِقَدْرِ مالِهِ بِالمَعْرُوفِ. [خ٢٧٦٥ (٢٢١٢)/ م٣٠١٩].

■ وفي رواية للبخاري: إِذَا كانَ فَقِيراً، أَنَّهُ يَأْكُلُ مِنْهُ مَكَانَ قِيَامِهِ عَلَيْهِ بِمَعْرُوفٍ. [خ٤٥٧٥].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها): د راستا ڤێ ئایەتێدا ﴿وَمَنْ كان غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كان فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ گۆت: ئەڤ ئایەتە د راستا سەمیانێ سێویدا هاتە خوارێ، ئەو هند مالێ سێوی ببەت ئەگەر یێ هەوجە بیت تەمەت هەوجەیییا خۆ و ل دویڤ زەحمەتا خۆ و ل دویڤ عەدەتێ رێز و سەروبەران.**

■ **ئەگەر (سەمیان) یێ هەژار بیت ئەو بەرامبەر خودانکرنا خۆ دێ ژێ خوٚت ل دویڤ عەدەتێ رێز و سەروبەران.**

قوله تعالى: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ﴾ [٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر دەمێ لێکڤەکرنێ، کەس و کار و سێوی و بەلنگاز ئامادە بوون، تشتەکی ژ وی میراتی بدەنە وان.**

٦٢٠ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ نَاساً يَزْعُمُونَ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نُسِخَتْ، وَلاَ واللهِ ما نُسِخَتْ، وَلكِنَّهَا مِمَّا تَهَاوَنَ النَّاسُ، هُمَا وَالِيَانِ: وَالٍ يَرِثُ وَذَاكَ الَّذِي يَرْزُقُ، وَوَالٍ لاَ يَرِثُ فَذَاكَ الَّذِي يَقُولُ بِالمعْروفِ، يَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ أُعْطِيَكَ. [خ٢٧٥٩].

■ وفي رواية: هِيَ مُحْكَمَةٌ وَلَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ. [خ٤٥٧٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هندە خەلك دبێژن ئەڤ ئایەتە یا نەسخ کرییە، نە ب خودێ نەهاتییە نەسخکرن، بەلێ ژ وانە یێت خەلکی سستی تێدا کرین، لێکڤەکەرێت میراتی دونە، لێکڤەکەرەك میراتخۆرە ئەو دڤێت بدەت، و لێکڤەکەرك نەمیراتخۆرە، ئەوە یێ ئاخفتنا باش دکەت و دێ بێژیت: من نینە ئەز بدەمە تە.**

- **و د ڤەگێرەکێدا: ئەو ئایەتا نەگوهۆرە و نە یا نەسخ کرییە.**

قوله تعالى: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا﴾ [١٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایین نەدورستە هوین ب کۆتەکی ببنە میراتخۆرێت ژنان [ئانکو وەکی هەر میراتەکی بگەهیننە خۆ و دەستێ خۆ داننە سەر].**

٦٢١ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾. قَالَ: كانُوا إِذَا ماتَ الرَّجُلُ كانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ شَاؤُوا زَوَّجُوهَا، وَإِنْ شَاؤُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا، فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي ذلِكَ. [خ٤٥٧٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا ڤێ ئایەتێدا ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا﴾ گۆت: دەمێ زەلام دمریت مرۆڤێت زەلامی هەژیترى ژنا وى بوون، ئەگەر هندەکان ڤیابان دا مارەکەت، و ئەگەر ڤیابان دا دەنە وی یێ وان ڤیابا، و ئەگەر ڤیابان نەددانە شوی و ئەو ژ مرۆڤێت وێ هەژیتر بوون ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ.**

قوله تعالى: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ [٣٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هوین دلخوازییا وی تشتێ كو خودێ هندەك ژ هەوە پێ ب سەر هندەكێت دی ئێخستین، نەكەن.**

٦٢٢ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: يَغْزُو الرِّجَالُ وَلاَ تَغْزُو النِّسَاءُ، وَإِنَّمَا لَنَا نِصْفُ الْمِيرَاثِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وتَعَالَى: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾. قَالَ مُجَاهِدٌ: وَأَنْزَلَ فِيهَا: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾ [الأحزاب:٣٥]. [ت٣٠٢٢].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: زەلام دچنە جیهادێ و ژن ناچنە جیهادێ و نیڤا میراتی بۆ مەیە ئینا خودێ ئینا خوارێ: ﴿ولا تَتَمَنَّوْا ما فَضَّلَ الله بِهِ بَعْضَكُمْ على بَعْضٍ﴾ و موجاهد دبێژیت: خودێ د راستا وێدا ئەڤ ئایەتە ئینا خوار: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ﴾.**

قوله تعالى: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ﴾ [٣٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و مە میراتگر بۆ هەر ئێكی دانایینە ژ میراتێ دەیباب و كەس و كاران هێلایی.**

٦٢٣ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ﴾ قَالَ: وَرَثَةً. ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ قَالَ: كانَ المهَاجِرُونَ لَمَّا قَدِمُوا المدِينَةَ، يَرِثُ المهَاجِرُ الأَنْصَارِيَّ دُونَ ذَوِي رَحِمِهِ، للأُخُوَّةِ الَّتِي آخى النَّبِيُّ (ﷺ) بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ﴾ نَسَخَتْ، ثُمَّ قَالَ: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ إِلاَّ النَّصْرَ وَالرِّفَادَةَ وَالنَّصِيحَةَ. وَقَدْ ذَهَبَ الْمِيرَاثُ. وَيُوصِي لَهُ.

[خ٢٢٩٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ گۆت: میراتکرن و د گۆتنا خودێدا ﴿وَالَّذِينَ عقدت أَيْمَانُكُمْ﴾[1] گۆت: مشەختی دەمێ هاتینە مەدینەیێ میراتگرییا خەلکێ مەدینێ دکرن ژ بلی مرۆڤێت وی ژ بەر وێ برایینییا پێغەمبەری (ﷺ) د ناڤبەرا واندا کری، ڤێجا دەمێ ئەڤ ئایەتە ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ هاتییە خوارێ ئەو نەسخ کر و نەهێلا، پاشی گۆت: ﴿وَالَّذِينَ عقدت أَيْمَانُكُمْ﴾ ژ بلی سەرئێخستن و هاریکاری و شیرەتکرنێ، و میراتگری نەما و وەسیەت بۆ دهێتە کرن.**

٦٢٤ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ [النساء:٣٣]، كَانَ الرَّجُلُ يُحَالِفُ الرَّجُلَ لَيْسَ بَيْنَهُمَا نَسَبٌ، فَيَرِثُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، فَنَسَخَ ذَلِكَ الْأَنْفَالُ، فَقَالَ تَعَالَى: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ﴾ [الأنفال:٧٥]. [د٢٩٢١]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا: ﴿وَالَّذِينَ عقدت أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ گۆت: زەلامی پەیمانا میراتگرییێ ددا زەلامی و چو بابینی د گەلێك نەبوو و دبوونە میراتگرێت ئێکدو ئایەتا ئەنفالێ ﴿وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾[2] ئەو نەسخ کر، ئەو فەرمان راکر.**

---

**(١) و ئەوێت هەوە پەیمان داینێ [کو ببنە میراتگرێت هەوە] پشك و بارێت وان بدەنێ [هەلبەت ئەڤ فەرمانە ل دەستپێکا ئیسلامێ بوو، پاشی هاتە راکرن ب گۆتنا خودێ (وَأُولُو الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ) ب راستی خودێ ل سەر هەمی تشتان بەرهەڤ و شاهدە.**

**(٢) مرۆڤێت ئێك ژ بیانییان هەژیترن ببنە میراتخۆرێت ئێکدو.**

قوله تعالى: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ [٩٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ و هەر كەسێ موسلمانەكی، بێ غالی و غەرمز و ژ قەستا بكوژیت.**

٦٢٥ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: آيَةٌ اخْتَلَفَ فِيهَا أَهْلُ الْكُوفَةِ، فَرَحَلْتُ فِيهَا إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْهَا، فَقَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾، هِيَ آخِرُ ما نَزَلَ، ومَا نَسَخَهَا شَيْءٌ. [خ٤٥٩٠، (٣٨٥٥)/ م٣٠٢٣].

■ وفي رواية لهما: قَالَ: أَمَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ أَبْزَى قَالَ: سَلِ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ ما أَمْرُهُمَا: ﴿وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ [الأنعام:١٥١]، ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: لَمَّا أُنْزِلَتِ الَّتِي فِي الْفُرْقانِ، قَالَ مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ: فَقَدْ قَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ، وَدَعَوْنَا مَعَ اللهِ إِلهاً آخَرَ، وَقَدْ أَتَيْنَا الفَوَاحِشَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ﴾ الآيَةَ [الفرقان:٧٠]، فَهذِهِ لأُولئِكَ، وَأَمَّا التِي فِي النِّسَاءِ: الرَّجُلُ إِذَا عَرَفَ الإِسْلاَمَ وَشَرَائِعَهُ، ثُمَّ قَتَلَ فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ. [خ٣٨٥٥].

**ژ سەعیدێ كورێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: خەلكێ كووفەیێ د ئایەتەكێدا جودا بوون، من برە دەڤ ئیبن عەباسی، من پرسارا وێ ژێ كر: گۆت: ئەڤ ئایەتە: ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ ژ ئایەتێت دویماهییێ بوون هاتینە خوارێ و چو ئەو نەسخ نەكرییە.**

■ **و د ڤەگێرەكێدا یا وان هەردوكان: عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبزی (رضي الله عنه) فەرمان ل من كر ئەز پرسیارا ڤان هەردو ئایەتان ژ ئیبن عەباسی بكەم كا كارێ وان چییە؟ ﴿ولا تَقْتُلُوا النَّفْسَ التي حَرَّمَ الله إلا بِالْحَقِّ﴾ ﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا﴾ من پرسیار ژ ئیبن عەباسی كر، ئینا گۆت: دەمێ ئەو ئایەتا د سۆرەتا فورقانێدا هاتییە خوارێ، هەڤپشكێت خەلكێ مەكەهێ گۆتن: مە ئەو گیان كوشت یا خودێ**

**دورست نەكری بهێتە كوشتن، و مە خوداوەندەكێ دی د گەل خودێ پەرست، و مە گونەهێت كرێت ژێ كرن، ئینا خودێ ئینا خوارێ: ﴿إلا من تَابَ وَآمَنَ﴾ ئەڤە بۆ وانە و هندیكە ئەوا د سۆرەتا نیسائێدا هاتی ئەوە، هەكە زەلامێ ئیسلام و شەریعەتێ وێ زانی پاشی كوشتنێ بكەت سزایێ وی جەهنەمە.**

قوله تعالى: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ [٩٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەوێ سلاڤا موسلمانەتییێ ل هەوە كر، نەبێژنێ تو نەموسلمانی.**

٦٢٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾. قَالَ: كَانَ رَجُلٌ فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ فَلَحِقَهُ المسْلِمُونَ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غُنَيْمَتَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِي ذلِكَ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾: تِلْكَ الْغُنَيْمَةُ.

قالَ: قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ: السَّلاَمَ. [خ٤٥٩١/ م٣٠٢٥].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿ولا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمْ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ گۆت: زەلامەك ل بەر هندە پەزكێت خۆ بوو، هندە موسلمان گەهشتنێ ئینا گۆت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ) سلاڤ ل سەر هەوە بن، ئینا كوشت و پەزێ وی برن، ئینا خودێ د ڤێ چەندێدا هەتا گۆتنا وی ئینا خوار: ﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[1] ئەڤە ئەو دەستكەفتە.**

**گۆت: ئیبن عەباسی خواند: السلام.**

---

(١) گەلی خودان باوەران هەر گاڤەكا هوین د رێكا خودێدا بۆ جیهادێ دەركەفتن، [لەزێ ل شەرِی نەكەن] و موسلمان و گاوران ژێك بنیاسن، و ئەوێ سلاڤ [یا موسلمانەتییێ] ل هەوە كر، نەبێژنێ تو نەموسلمانی، بۆ متا و پەرتالەكی ژیانا دنیایێ، و ل دەڤ خودێ دەستكەفتییێت مەزن هەنە، [ژبیر نەكەن] هوین ژی بەری نوكە وەسا بوون، ڤێجا خودێ كەرەم د گەل هەوە كر [و هوین راستەرێ كرن] [لەزێ ل كوشتنێ نەكەن] و ب دورستی بزانن و ژێك بنیاسن، ب راستی خودێ ب تشتێ هوین دكەن یێ ئاگەهدارە.

قوله تعالى: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾ [٩٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: موسلمانێت ڕوینشتی ژ جیهادێ ئەو نەبن یێت زیان پێ كەفتی، نەوەكی وانن، یێت ب خۆ و مالێ خۆ جیهادێ د ڕێكا خودێدا دكەن.**

٦٢٧ - (خ) عَنْ زيدِ بنِ ثابتٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَمْلَى عَلَيْهِ: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾... ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ، فقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ، وَكَانَ رَجُلاً أَعْمى، فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى رَسُولِهِ (ﷺ). وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أَنَّ تُرَضَّ فَخِذِي. ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾. [خ٢٨٣٢].

**ژ زەیدێ كوڕێ سابتی (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ): ﴿لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ﴿وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بۆ من دخواند دا بۆ بنڤیسم و ئیبن ئوم مەكتوم هاتە دەڤ و ئەو یێ بۆ من دخوینیت دا بۆ بنڤیسم، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر ئەز شیابام جیهادێ بكەم دا كەم و ئەو زەلامەكێ كۆرە بوو، ئینا خودایێ مەزن ل سەر پێغەمبەرێ خۆ ئینا خوارێ و رانێ وی ل سەر رانێ من بوو، هەتا ئەز ترسیایم رانێ من ب هەرشیت، پاشی پشتی بەردای خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئینا خوار: ﴿غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾.**

قوله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ [٩٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڕاستی ئەوێت ستەم ل خۆ كرین (مشەخت نەبووین و ماینە د ناڤ گاوراندا) ملیاكەت جانێ وان دكێشن و دبێژنێ: هوین ل سەر چ بوون.**

٦٢٨ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ نَاساً مِنَ المسْلِمِينَ كانُوا مَعَ المشْرِكِينَ، يُكَثِّرُونَ سَوَادَ المشْرِكِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، يَأْتِي السَّهْمُ فَيُرْمى بِهِ، فَيُصِيبُ أَحَدَهُمْ فَيَقْتُلُهُ، أَوْ يُضْرَبُ فَيُقْتَلُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ الآية. [خ٤٥٩٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هندە مرۆڤ ژ موسلمانان هەبوون د گەل هەڤپشكچێكەران بوون و هژمارا هەڤپشكچێكەران زێدە دكرن ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ڤێجا دا تیر هێت دا هێتە هاڤێتن و دا ب ئێك ژ وان كەڤیت و دا وی كوژیت یان دا هێتە لێدان و دا هێتە كوشتن ئینا خودێ ئینا خوار: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمْ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ﴾ و تمامیا ئایەتێ.**

قوله تعالى: ﴿أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ [١٠٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: (چو گونەه ل سەر هەوە نینە ئەگەر ئەزیەتەك ژ بارانێ ب هەوە كەڤتبیت یان ژی هوین د نەساخ بن) هوین چەكێ خۆ دانن.**

٦٢٩ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾. قَالَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ كانَ جَرِيحاً. [خ٤٥٩٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا: ﴿إن كان بِكُمْ أَذًى من مَطَرٍ أو كُنْتُمْ مَرْضَى﴾ گۆت: عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی یێ بریندار بوو.**

قوله تعالى: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا﴾ [١٢٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ و ئەگەر ژن ترسیا زەلامێ وێ ژێ دویرکەڤیت و ڕوییێ خۆ ژێ وەرگێڕیت یان دەست ژێ بەردەت.**

٦٣٠ – (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾. قَالَتْ: الرَّجُلُ تكُونُ عِنْدَهُ المرْأَةُ، لَيْسَ بِمُسْتَكْثِرٍ مِنْهَا، يُرِيدُ أَن يُفَارِقَهَا، فَتَقُولُ: أَجْعَلُكَ مِنْ شَأْنِي فِي حِلٍّ، فَنَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ فِي ذلِكَ. [خ٢٤٥٠/ م٣٠٢١].

- وفي رواية لهما قالَتْ: هُوَ الرَّجُلُ يَرَى مِنِ امْرَأَتِهِ ما لاَ يُعْجِبُهُ، كِبَراً أَوْ غَيْرَهُ، فَيُرِيدُ فِرَاقَهَا، فَتَقُولُ: أَمْسِكْنِي وَاقْسِمْ لِي ما شِئْتَ، قَالَتْ: فَلاَ بَأْسَ إِذَا تَرَاضَيَا. [خ٢٦٩٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) د ڕاستا گۆتنا خودێدا ﴿وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ من بَعْلِهَا نُشُوزًا أو إِعْرَاضًا﴾ گۆت: ئەوە زەلامی ژن ل دەڤ بیت ناخوازیت گەلەك د گەل بیت و دڤێت بەردەت (ژ بەر پیراتی یان کرێتی یان خرابی یان ڕەوشتخرابییا وێ) ڤێجا ئەو بێژیت: ئەز تە د ڕاستا خۆدا ئازا دکەم (ئانکو ژ مافێت هەڤژینییێ ئازا دکەم بەس من بەرنەدە) ئینا ئەڤ ئایەتە دەرحەقێ ڤێدا هاتە خوارێ.**

- **و د ڤەگێڕەکا هەردویاندا گۆت: ئەوە زەلام وێ ژ ژنا خۆ ببینیت حەژێ نەکەت، دانعەمری بیت یان تشتەکێ دی، ڤێجا دڤێت بهێلیت و بەردەت، ڤێجا ئەو بێژیت: من بەرنەدە و تە چەند دڤێت بهێیە دەڤ هندێ وەرە، ئینا گۆت: چ دڤێدا نینە ئەگەر ب ئێکدو ڕازی بن.**

(٥)

سورة المائدة.

**سۆرەتا مائیدە.**

قوله تعالى: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ [٣]

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەڤرۆ من دینێ هەوە تەمام کر (کێماسی تێدا نەمایە ژ بەر هندێ نابیت چو ژێ بێتە کێمکرن و چو لێ زێدە ببیت).**

٦٣١ - (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ قَالَ لَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَؤُونَهَا، لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ، لاَتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيداً، قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾. قَالَ عُمَرُ: قَدْ عَرَفْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ، وَالْمَكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، وَهُوَ قَائِمٌ بِعَرَفَةَ يَوْمَ جُمُعَةٍ. [خ٤٥/ م٣٠١٧].

**ژ عومەرێ کوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) زەلامەك ژ جوهیان گۆتێ: ئەی میرێ موسلمانان ئایەتەکا د قورئانا هەوەدا هوین دخوینن، ئەگەر ل سەر مە گەلێ جوهیان هاتبا خوار، ئەم دا وێ رۆژێ جەژن گرین، گۆت: کیژ ئایەت؟ گۆت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمْ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ عومەری گۆت: ب راستی مە ئەو رۆژ و جهێ ل سەر پێغەمبەری (ﷺ) هاتییە خوارێ دزانی، ئەو رۆژا ئەینییێ ل عەرەفێ یێ ژ پیانڤە بوو.**

قوله تعالى: ﴿وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ﴾ [٤٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر تە حوکم د ناڤبەرا واندا کر، ڤێجا حوکمی ب دادوەری د ناڤبەرا واندا بکە.**

٦٣٢ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ قُرَيْظَةُ وَالنَّضِيرُ، وَكَانَ النَّضِيرُ أَشْرَفَ مِنْ قُرَيْظَةَ، فَكَانَ إِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْظَةَ رَجُلاً مِنَ النَّضِيرِ قُتِلَ بِهِ، وَإِذَا قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ فُودِيَ بِمِائَةِ وَسْقٍ مِنْ تَمْرٍ. فَلَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَتَلَ رَجُلٌ مِنَ النَّضِيرِ رَجُلاً مِنْ قُرَيْظَةَ، فَقَالُوا: ادْفَعُوهُ إِلَيْنَا نَقْتُلْهُ، فَقَالُوا: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَأَتَوْهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ﴾، وَالْقِسْطُ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، ثُمَّ نَزَلَتْ: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ [المائدة:٥٠].

[د٤٤٩٤/ ن٤٧٤٦].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: قورەیزی و نەزیر هەبوون و نەزیر مەزنتر بوون ژ قورەیزییان، ڤێجا ئەگەر زەلامەكێ قورەیزییان زەلامەك ژ نەزیرییان كوشتبا پێ دهاتە كوشتن، و ئەگەر زەلامەكێ ژ نەزیریان زەلامەك ژ قورەیزییان كوشتبا، سەد بارێت قەسپان خوین پێشڤە ددان، ڤێجا دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتییە هنارتن زەلامەكی ژ نەزیرییان زەلامەك ژ قورەیزییان كوشت، گۆتن: وی بدەنە ڤ مە بكوژین، ئینا گۆتن پێغەمبەر (ﷺ) د ناڤبەرا مە و هەوەدایە، ڤێجا هاتنە دەڤ و ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ﴾ و دادگەری ئەوە گیان ب گیانییە، پاشی ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾ ئەرێ وان حوكمێ غەیری خودێ دڤێت.**

قوله تعالى: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ [٤٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هەر كەسێ حوكمی ب وێ نەكەت یا من ئینایییە خوارێ.**

٦٣٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾: هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ الثَّلَاثِ نَزَلَتْ فِي الْيَهُودِ خَاصَّةً، فِي قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ.

[د٣٥٧٦].

* حسن صحيح الإسناد.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: گۆتنا خودێ ﴿وَمَنْ لم يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ﴾ هەتا گۆتنا وی ﴿الْفَاسِقُونَ﴾ ئەڤ هەرسێ ئایەتە تایبەت د راستا جوهییاندا هاتینە خوارێ قورەیزی و نەزیرییان.**

٦٣٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ اللهَ عزّ وجل أَنْزَلَ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، وَ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾، وَ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَنْزَلَهَا اللهُ فِي الطَّائِفَتَيْنِ مِنَ الْيَهُودِ، وَكَانَتْ إِحْدَاهُمَا قَدْ قَهَرَتِ الْأُخْرَى فِي الْجَاهِلِيَّةِ، حَتَّى ارْتَضَوْا أَوْ اصْطَلَحُوا عَلَى أَنَّ كُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الْعَزِيزَةُ مِنَ الذَّلِيلَةِ فَدِيَتُهُ خَمْسُونَ وَسْقاً، وَكُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الذَّلِيلَةُ مِنَ الْعَزِيزَةِ فَدِيَتُهُ مِائَةُ وَسْقٍ.

فَكَانُوا عَلَى ذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ، فَذَلَّتِ الطَّائِفَتَانِ كِلْتَاهُمَا لِمَقْدَمِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، ورَسول الله (ﷺ) يَوْمَئِذٍ لَمْ يَظْهَرْ وَلَمْ يُوطِئْهُمَا عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصُّلْحِ، فَقَتَلَتِ الذَّلِيلَةُ مِنَ الْعَزِيزَةِ قَتِيلاً، فَأَرْسَلَتِ الْعَزِيزَةُ إِلَى الذَّلِيلَةِ أَنِ ابْعَثُوا إِلَيْنَا بِمِائَةِ وَسْقٍ، فَقَالَتِ الذَّلِيلَةُ: وَهَلْ كَانَ هَذَا فِي حَيَّيْنِ قَطُّ دِينُهُمَا وَاحِدٌ وَنَسَبُهُمَا وَاحِدٌ وَبَلَدُهُمَا وَاحِدٌ، دِيَةُ بَعْضِهِمْ نِصْفُ دِيَةِ بَعْضٍ؟ إِنَّا إِنَّمَا أَعْطَيْنَاكُمْ هَذَا ضَيْماً مِنْكُمْ لَنَا وَفَرَقاً مِنْكُمْ، فَأَمَّا إِذْ قَدِمَ مُحَمَّدٌ فَلاَ نُعْطِيكُمْ ذَلِكَ، فَكَادَتِ الْحَرْبُ تَهِيجُ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ ارْتَضَوْا عَلَى أَنْ يَجْعَلُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَيْنَهُمْ، ثُمَّ ذَكَرَتِ الْعَزِيزَةُ فَقَالَتْ: وَاللهِ مَا مُحَمَّدٌ بِمُعْطِيكُمْ مِنْهُمْ ضِعْفَ مَا يُعْطِيهِمْ مِنْكُمْ، وَلَقَدْ صَدَقُوا مَا أَعْطَوْنَا هَذَا إِلاَّ ضَيْماً مِنَّا وَقَهْراً لَهُمْ، فَدُسُّوا إِلَى مُحَمَّدٍ مَنْ يَخْبُرُ لَكُمْ رَأْيَهُ: إِنْ أَعْطَاكُمْ مَا تُرِيدُونَ حَكَّمْتُمُوهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِكُمْ حَذِرْتُمْ فَلَمْ تُحَكِّمُوهُ.

فَدَسُّوا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) نَاساً مِنَ الْمُنَافِقِينَ لِيَخْبُرُوا لَهُمْ رَأْيَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَخْبَرَ اللهُ رَسُولَهُ بِأَمْرِهِمْ كُلِّهِ، وَمَا أَرَادُوا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ [المائدة: ٤١ ـ ٤٧]، ثُمَّ قَالَ: فِيهِمَا وَاللهِ نَزَلَتْ، وَإِيَّاهُمَا عَنَى اللهُ عزّ وجل. [حم٢٢١٢]

* إسناده حسن.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئینا خوارێ: ﴿وَمَنْ لم يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ الله فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ و ﴿أُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ و ﴿أُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ئیبن عەباسی گۆت: ئەڤە د راستا دو کۆمێت ژ جوهییان ئینانە خوارێ و ئێك ژ وان بەری ئیسلامەتییێ ب سەر یا دی کەتبوو و شکاندبوو هەتا نەچار کرین و ل سەر هندێ پێك هاتین ئەگەر یا سەرکەفتی ئێك ژ یا شکەستی کوشت خوینا وی پێنجی بارن، و ئەگەر یا شکەستی ژ یا سەرکەفتی بکوژیت خوینا وی سەد بارن.

و ئەو د هۆسا بوون هەتا پێغەمبەر (ﷺ) هاتییە مەدینەیێ، خودێ هەردو کۆم ب هاتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شکاندن، و وی دەمی چو دەستدرێژی ژ وان ل سەر یا دی چێ نەببوو، و پێغەمبەری ژی رێککەفتنا وان پەسند نەکربوو، و ئەو د پێکهاتنێدا بوو، ئینا یا شکەستی و لاواز ئێك ژ یا سەرکەفتی کوشت، یا سەرکەفتی هنارتە یا شکەستی سەد باران بۆ مە بهنێرن، یا شکەستی گۆت: ما ئەڤە د دو تاخاندا جارەکێ چێ بوویە دینێ وان ئێك و قنێتا وان ئێك و بازێرێ وان ئێك خوینا هندەك ژ وان نیڤا خوینا هندەکێت دی بیت؟! مە ئەو ددا هەوە ژ بەر ستەما هەوە ل مە دکر و ژ ترسا مە ژ هەوە، بەلێ پشتی موحەممەد هاتی ئەم نادەینە هەوە، نێزیك بوو شەڕ د ناڤبەرا واندا بئارییێت، پاشی رازیبوون پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤبەرا خۆدا بکەنە حەکەم، پاشی یا ب سەرکەفتی بۆ خۆ گۆت: ب خودێ موحەممەد ئەوا هوین ددەنە وان دوقاتا وێ ژ وان نادەتە هەوە، و ئەو راست دبێژن و وان ئەڤە نەددا مە ژ ستەم و خورتی نەبیت، و ڤەشارتی ئێکی بهنێرنە دەڤ موحەممەدی بۆچۆنا وی بۆ هەوە بینیت ئەگەر وێ بدەتە هەوە یا هەوە دڤێت بکەنە حەکەم، و ئەگەر وێ نەدەت هوین هاتنە ئاگەهدارکرن و وی نەکەنە حەکەم.

ڤێجا هندەك مرۆڤ ژ دوڕوییان ب بەرزەییڤە هنارتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا بۆچۆنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ وان بزانیت، ڤێجا دەمێ ئەو و د گەل وان هاتینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، خودێ کارێ وان و کا وان چ دڤێت بۆ ئاشکرا کر: و ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ ﴿يا أَيُّهَا الرَّسُولُ لاَ يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قالوا آمَنَّا﴾

**هەتا گۆتنا وی ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[1] پاشی گۆت: ب خودێ ئەڤ ئایەتە د واندا هاتنە خوارێ و مەبەستا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئەو هەردو بوون.**

---

(١) ڕاڤەكرنا وان ئایەتان ب كورتی ئایەتا (٤١ ـ ٤٧) ژ سۆرەتا مائیدە:

﴿٤١﴾ هەی پێغەمبەر، بلا تە ب خەم نەئێخن ئەوێت خۆش ب بەر گاورییێڤە دچن [ژ دوڕوییان] ئەوێت سەردەڤ دبێژن: باوەری مە ئینایییە، و ئەو ب خۆ هێز دلێت وان د بێ باوەرن، و دیسا [بلا تە ب خەم نەئێخن] ئەوێت بووینە جوهی، زێدە گوهدارییا درەوان دكەن، و گوهدارییێ بۆ دەستەكەكا دی دكەن كو [ژ مەزناتی] نەهاتینە دەڤ تە، ئاخفتنان ڤاڕێ دكەن و ژ جهێ وان دبەن، دبێژنە [هەڤالێت خۆ]: ئەگەر موحەممەد ب وێ هاتە هەوە یا مە ڤاڕێ كری ژێ وەرگرن، و ئەگەر ب وێ نەهاتە هەوە، هشیار بن [باوەر ژێ نەكەن] و یێ خودێ بەرزەبوون و گاوری بۆ ڤیایی، ڤێجا تو نابینی ئێك هەبیت تشتێ خودێ ڤیایی نەهێلیت چێ ببیت. ئەڤە ئەون یێت خودێ نەڤیایی دلێت وان پاقژ بكەت، ڕوی ڕەشی و شەرمزاری بۆ وان بیت د دنیایێدا و ئیزایەكا مەزن د ئاخرەتێ ژیدا بۆ وان هەیە.

﴿٤٢﴾ گوهدارییا درەوان دكەن، و بەرتیل و مالێ حەرام و نەدورست دخۆن، ڤێجا ئەگەر ئەو هاتنە دەڤ تە [دا حوكمی د ناڤبەرا واندا بكەی] ڤێجا تە دڤێت حوكمی د ناڤبەرا واندا بكە و یان ڕوییێ خۆ ژێ وەرگێڕە. د بنیڕا نەشێن زیانەكێ بگەهیننە تە، و ئەگەر تە حوكم د ناڤبەرا واندا كر، ڤێجا حوكمی ب دادوەری د ناڤبەرا واندا بكە، ب ڕاستی خودێ حەژ دادوەران (عادلان) دكەت.

﴿٤٣﴾ و چاوا ئەو ڤەستا تە دكەن و حوكمێ تە دخوازن؟! و تەورات ل دەڤ وانە، بڕیارا خودێ تێدایە [كا حوكمێ زناكەری چییە] و پاشی پشتا خۆ ددەنە حوكمێ تە [ئەوێ وەكی یێ تەوراتێ]، و ب ڕاستی ڤان باوەری نەئینایییە و نە ژ خودان باوەرانن.

﴿٤٤﴾ ب ڕاستی مە تەورات ئینایییە خوار، ڕاستەڕێیی و ڕۆناهی تێدایە، و پێغەمبەرێت خۆ سپارتینە خودێ ل دویڤ تەوراتێ حوكم بۆ جوهییان دكرن، دیسا خودێناس و زانایان ژی حوكم ب وێ دكر ئەوا ژێ هاتییە خواستن كو بپارێزن ژ گوهۆڕین و ڤاڕێكرنێ، و ئەو زێرەڤان بوون ل سەر وان [ل سەر جوهییان، دا نەئێتە گوهۆڕین]، [گەلی زانا و ڕێبەرێت جوهییان] ژ مرۆڤان نەترسن [كو ئەگەر هوین ڕاستییێ بێژن، دێ زیانێ گەهیننە هەوە]، و هوین ژ من بترسن، و ئایەتێت من ئەرزان نەفرۆشن، و هەر كەسێ حوكمی ب وێ نەكەت یا من ئینایییە خوارێ ئەو ژ گاورانە.

﴿٤٥﴾ و هەر د وێ [كتێبێدا كو تەوراتە] مە ل سەر ئسرائیلییان نڤیسی، جانێ كوشتی [ئەڤسا هاتییە كوشتن] ب ئەڤسا كوژەكییە، و چاڤ ب چاڤییە، و دفن ب دفنێیە و گوه ب گوهییە، و ددان ب ددانییە، و برینان تۆل یا تێدا [ئانكو برین ب برینێیە و بەرانبەری ئێكن]. و هەر كەسێ [مافێ خۆ بهێلیت، و ل گونەهكاری] ببۆریت [و تۆلێ لێ ڤەنەكەت]، ئەو لێبۆرین دێ بۆ بیتە گونەهـ ڕاكەر. و هەر كەسێ حوكمی ب ئەوا مە ئینایییە خوارێ نەكەت، ئەو ژ زۆردارانە.

قوله تعالى: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ [٦٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و خودێ دێ تە ژ خەلکی پارێزیت.**

٦٣٥ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُحْرَسُ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾، فَأَخْرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) رَأْسَهُ مِنَ الْقُبَّةِ، فَقَالَ لَهُمْ: (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْصَرِفُوا فَقَدْ عَصَمَنِي اللَّهُ**). [ت٣٠٤٦].

* حسن.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: زێرەڤانی ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دهاتە کرن هەتا ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ من الناس﴾ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرێ خۆ ژ گومبەتکێ (خیڤەتا گرۆڤرە ل مزگەفتێ بۆ ئیعتکافێ دهاتە دانان) دەرئێخست و گۆتە وان: گەلی مرۆڤان هەرن ب راستی خودێ ئەز پاراستم.**

قوله تعالى: ﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ [٩٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: چو گونەه ل سەر وان نینە، ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت چاك کرین ل سەر ئەوا وان کری.**

٦٣٦ - عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: مَاتَ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ، فَلَمَّا حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، قَالَ رِجَالٌ: كَيْفَ بِأَصْحَابِنَا وَقَدْ مَاتُوا يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ؟ فَنَزَلَتْ: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾. [ت٣٠٥٠].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ حەرامکرنا عەرقێ هاتییە خوارێ، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ مە بێژە حوکمێ وان چییە یێت مرین و وان عەرەق**

---

**﴿٤٦﴾ و د دویف وانرا [پێغەمبەرێت نسرائیلییان]، مە عیسایێ کورێ مەریەمێ هنارت، کو ڕاستدەرئێخێ کتێبا بەری خۆیە کو تەوراتە، و مە ئنجیل دایێ، ڕاستەرێیی و ڕۆناهی تێدایە، و ڕاستدەرئێخا کتێبا بەری خۆیە، کو تەوراتە، و ڕاستەرێیی و شیرەتە بۆ پارێزکاران.**

**﴿٤٧﴾ و خودانێت ئنجیلێ، بلا حوکمی ب وێ بکەن ئەوا خودێ د ئنجیلێدا ئینایییە خوار، و هەر کەسێ حوکمی ب وێ نەکەت ئەوا خودێ ئینایییە خوار، ئەو ژ ڕێکا ڕاست و باوەرییێ ڤەدەرن.**

ڤەدخوار؟ ئینا ئەڤە هاتە خوارێ: ﴿ليس على الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إذا ما اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾[1].

قوله تعالى: ﴿لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾ [١٠١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: پرسا وان تشتان ژ پێغەمبەری نەکەن ئەوێت ئەگەر بۆ هەوە ئاشکەرا ببن هوین پێ نەخۆش ببن.**

٦٣٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ قَوْمٌ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) اسْتِهْزَاءً، فَيَقُولُ الرَّجُلُ: مَنْ أَبِي؟ وَيَقُولُ الرَّجُلُ تَضِلُّ نَاقَتُهُ: أَيْنَ نَاقَتِي؟ فَأَنْزَلَ اللهُ فيهم هذِهِ الآيَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾، حَتَّى فَرَغَ مِنَ الآيَةِ كُلِّهَا. [خ٤٦٢٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هندە کەسان ب ترانەڤە پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دکرن، زەلامەك دا بێژیت: بابێ من کییە؟ و زەلامێ حێشترا وی بەرزە بووی دا بێژیت: حێشترا من ل کیرێیە؟ ئینا خودێ ئەڤ ئایەتە د واندا ئینا خوار: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عن أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾[2] هەتا ئایەت هەمی گۆتی.**

---

(١) چو گونەهـ ل سەر وان نینە، ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت چاك کرین ل سەر ئەوا وان کری [ژ ڤەخوارنا مەیێ و کرنا قومارێ بەری حەرام ببن]. ئەگەر بەری هنگی خۆ ژ حەرامی یان شیرکێ پاراستبیت، و باوەری ب خودێ ئینابیت و کار و کریارێت ڤەنج کربن، پاشی خۆ ژ وی حەرامی دابنە پاش یێ وان باوەری پێ ئینایی، و پاشی بەردەوام بووبین ل سەر خۆپارستنێ و کار و کریارێت ڤەنج کربن، و خودێ ب خۆ ژی حەژ ڤەنجیکاران دکەت.

(٢) گەلی خودان باوەران پرسا وان تشتان [ژ پێغەمبەری] نەکەن ئەوێت ئەگەر بۆ هەوە ئاشکەرا ببن هوین پێ نەخۆش ببن، و ئەگەر هوین د وەختێ هاتنا قورئانێدا پرسا وان بکەن، دێ بۆ هەوە ئاشکەرا بن، خودێ هوین ژ پرس و پرسیارێت بۆری ئازا کرن. و خودێ ب خۆ ژی گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە و سزا لەزلێنەکەرە.

(٦)

سورة الأنعام

**سۆرەتا ئەنعام.**

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم ﴾ [٥٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەوێت سپێدە و ئێڤاران گازی خودایێ خۆ دكەن و خودێ دپەرێسن.**

٦٣٨ – عَنْ خَبَّابٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾. قَالَ: جَاءَ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ وَعُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ الْفَزَارِيُّ، فَوَجَدَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَعَ صُهَيْبٍ وَبِلاَلٍ وَعَمَّارٍ وَخَبَّابٍ قَاعِداً فِي نَاسٍ مِنَ الضُّعَفَاءِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَمَّا رَأَوْهُمْ حَوْلَ النَّبِيِّ (ﷺ) حَقَرُوهُمْ، فَأَتَوْهُ، فَخَلَوْا بِهِ وَقَالُوا: إِنَّا نُرِيدُ أَنْ تَجْعَلَ لَنَا مِنْكَ مَجْلِساً، تَعْرِفُ لَنَا بِهِ الْعَرَبُ فَضْلَنَا، فَإِنَّ وُفُودَ الْعَرَبِ تَأْتِيكَ، فَنَسْتَحْيِي أَنْ تَرَانَا الْعَرَبُ مَعَ هَذِهِ الْأَعْبُدِ؟! فَإِذَا نَحْنُ جِئْنَاكَ؛ فَأَقِمْهُمْ عَنْكَ، فَإِذَا نَحْنُ فَرَغْنَا؛ فَاقْعُدْ مَعَهُمْ إِنْ شِئْتَ.

قَالَ: (**نَعَمْ**)، قَالُوا: فَاكْتُبْ لَنَا عَلَيْكَ كِتَاباً.

قَالَ: فَدَعَا بِصَحِيفَةٍ، وَدَعَا عَلِيّاً لِيَكْتُبَ، وَنَحْنُ قُعُودٌ فِي نَاحِيَةٍ، فَنَزَلَ جِبْرَائِيلُ عليه السلام فَقَالَ: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿٥٢﴾﴾ ثُمَّ ذَكَرَ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ وَعُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ، فَقَالَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ﴿٥٣﴾﴾ [الأنعام]، ثُمَّ قَالَ: ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾ [المائدة: ٥٤].

قَالَ: فَدَنَوْنَا مِنْهُ حَتَّى وَضَعْنَا رُكَبَنَا عَلَى رُكْبَتِهِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَجْلِسُ مَعَنَا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ، قَامَ وَتَرَكَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ﴾، وَلاَ تُجَالِسِ الْأَشْرَافَ ﴿تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا﴾؛ يَعْنِي: عُيَيْنَةَ وَالْأَقْرَعَ ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ٢٨﴾ [الكهف:٢٨] قَالَ: هَلاَكاً، قَالَ: أَمْرُ عُيَيْنَةَ وَالْأَقْرَعِ. ثُمَّ ضَرَبَ لَهُمْ مَثَلَ الرَّجُلَيْنِ وَمَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا.

قَالَ خَبَّابٌ: فَكُنَّا نَقْعُدُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَإِذَا بَلَغْنَا السَّاعَةَ الَّتِي يَقُومُ فِيهَا، قُمْنَا وَتَرَكْنَاهُ حَتَّى يَقُومَ. [جه٤١٢٧]

* صحيح.

**ژ خەبابی (ﷺ) د گۆتنا خودێدا ﴿ولا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ﴾ هەتا گۆتنا خودێ ﴿فَتَكُونَ من الظَّالِمِينَ﴾[(١)] گۆت: ئەقرەعێ کورێ حابسێ تەمیمی و عویەینەیێ کورێ حیسنێ فەزاری هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو د گەل سوهەیب و بیلال و عەممار و خەببابی و د گەل هندە خەلکێت لاواز ژ باوەریداران یێ روینشتی بوو، ڤێجا دەمێ وان ئەو ل دۆرماندۆرێت پێغەمبەری (ﷺ) دیتین ب کێمی دیتن، و هاتنە دەڤ و ب تنێ د گەل ئاخفتن، و گۆتن: مە دڤێت تو دیوانەکێ ژ دەڤ خۆ بۆ مە دانی عەرەب پێ بهایێ مە بزانن، ب راستی شاندێت عەرەبان دهێنە دەڤ تە و ئەم شەرم دکەین عەرەب مە د گەل ڤان بەندەیان ببینن، ڤێجا دەمێ ئەم دهێینە دەڤ تە وان ژ دەڤ خۆ راکە و ئەگەر ئەم رابووین د گەل وان روینە ئەگەر تە بڤێت.**

**گۆت: (بلا)، گۆتن نڤیسانەکێ بۆ مە پێ بنڤیسە.**

---

**(١) رامانا ئایەتێ ب کورتی: [هەی موحەممەد] تو ئەوێت سپێدە و ئێڤاران گازی خودایێ خۆ دکەن [و خودێ دپەرێسن] و [ب پەرستن و گازیا خۆ] قایلبوون و ڕازیبوونا خودێ دخوازن، دەرنەئێخە، نە چو حسێبا وان ل سەر تەیە و نە چو حسێبا تە ل سەر وانە، ڤێجا ئەگەر تو وان دەربێخی، دێ بییە ژ زۆرداران.**

گۆت: كاغەزەك داخواز كر و گازی عەلی كر دا بنڤیسیت، و ئەم ل لایەكی د روینشتی بووین، و جبریل سلاڤ ل سەر بن هاتە خوار و گۆت: ﴿ولا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ ما عَلَيْكَ من حِسَابِهِمْ من شَيْءٍ وما من حِسَابِكَ عليهم من شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ من الظَّالِمِينَ﴾ پاشی بەحسێ ئەقرەعێ كورێ حابسی و عویەینەیێ كورێ حیسنی كر و گۆت: ﴿وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ الله عليهم من بَيْنِنَا أَلَيْسَ الله بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾(١) **پاشی گۆت**: ﴿وإذا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ على نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾(٢).

گۆت: ئەم نێزیكی وی بووین هەتا مە چۆكێت خۆ دانایە سەر چۆكێت وی و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل مە دروینشتە خوارێ و ئەگەر ڤیابا رابیت دا رابیت و مە هێلیت، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مع الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ ولا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾ و د گەل كەنكەنا نەروینە خوارێ ﴿تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ولا تُطِعْ من أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عن ذِكْرِنَا﴾ ئانكو عویەینە و ئەقرەعی ﴿وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وكان أَمْرُهُ فُرُطًا﴾(٣) گۆت: ئانكو: ژ ناڤ چۆن، گۆت: كارێ عویەینە و ئەقرەعی پاشی مەتەلا هەردو زەلامان و مەتەلا ژیانا دنیایێ ب وان ئینا.

---

(١) [ب ڤی رەنگی] مە هندەك ژ وان ب هندەكێت دی جەرباندن، دا [گرەگر و كەنكەنە] بێژن: نەرێ ئەڤەنە یێت خودێ د ناڤ مەدا كەرەم د گەل كری؟ ئەرێ ما خودێ شوكورداران چێتر نانیاسیت؟!

(٢) و گاڤا ئەوێت باوەری ب نیشان و ئایەتێت مە ئینایین هاتنە دەڤ تە، بێژە: [وان] سلاڤ ل سەر هەوە بن، خودایێ هەوە دلۆڤانی ل سەر خۆ نڤیسییە

(٣) راڤەكرنا ئایەتێ هەمییێ ب كورتی: [هەی موحەممەد] تو سەبرێ خۆ ل سەر وان بكێشە، و وان نەهێلە ئەوێت سپێدە و ئێڤاران گازی خودایێ خۆ دكەن [و خودایێ خۆ دپەرێسن، و ب پەرستن و گازییا خۆ]، ڤایلبوون و رازیبوونا خودایێ خۆ دڤێن، و بەرێ خۆ ژ وان وەرنەگێرە [چەند د هەژار و دەست تەنگ بن بۆ هندە كەنكەنە و گرەگران]، و تە دڤێت زەنگین و خەلكێ دنیایێ ل دیوانا تە بن و گوهێ خۆ نەدە وی یێ مە دلێ وی ژ بیرئینانا خۆ بێ ئاگەه كری، و ب دویڤ دلخوازییا خۆ كەتی، و كارێ وی زێدە خرابییە.

**خەبابی گۆت: ئەم (پشتی ڤێ) د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دروینشتینە خوارێ هەتا ئەو دەم دهات یێ تێدا رادبوو، دا رابین و مە ئەو دهێلا دا ئەو رابیت.**

قوله تعالى: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ [٥٩].

**و کلیلێت (خزینەیێت) غەیبێ (نەپەنی و ڤەشارتییان) ل دەڤ وینە و ژ وی پێڤەتر (ژ خودێ پێڤەتر) کەس پێ نوزانیت.**

٦٣٩ - (خ) عَنِ ابنِ عُمر رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُول اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَفاتِحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ**: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾﴾). [خ٤٦٢٧، (١٠٣٩)].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (﴿مَفَاتِحُ الْغَيْبِ﴾ کلیلێت غەیبێ (نەپەنی و ڤەشارتییان) پێنجن: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنْزِلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ ما فِي الْأَرْحَامِ وما تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وما تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾. ب ڕاستی خودێ دزانیت کا قیامەت کەنگی دێ ئێت، و ئەوە بارانێ دبارینیت، و دزانیت کا چ د مالبچویکاندایە بەری ببیتە مرۆڤ و کەس نوزانیت کا سوبەهی دێ چ ئێتە سەری، و کەس نوزانیت کا ل کیرێ و ل کیڤە دێ مریت، ب ڕاستی خودێ زانا و شارەزایە).**

قوله تعالى: ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا﴾ [٦٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: یان ژی هەوە ژێکڤەکەت و بکەتە دەستەک دەستەک.**

٦٤٠ - (خ) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ﴾، قَالَ رسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَعُوذُ بِوَجْهِكَ**). قَالَ: ﴿أَوْ مِن تَحْتِ

أَرْجُلِكُمْ﴾، قَالَ: (**أَعُوذُ بِوَجْهِكَ**). ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**هَذَا أَهْوَنُ، أَوْ: هَذَا أَيْسَرُ**). [خ٤٦٢٨].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿قُلْ هو الْقَادِرُ على أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا من فَوْقِكُمْ﴾ (بێژە: ئەو خودێ دشێت هنداڤی هەوە ئیزایەکێ ب سەر هەوەدا بینیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز خۆ ب تە دپارێزم) گۆت: ﴿أو من تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾ (یان د بن پییێت هەوەدا) گۆت: (ئەز خۆ ب تە دپارێزم) گۆت: ﴿أو يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ﴾ (یان ژی هەوە ژێکڤەکەت و بکەتە دەستەک دەستەک، و هندەکان ژ هەوە ب هندەکان بئێشینیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەڤە سڤکترە یان ئەڤە ساناهیترە).**

قوله تعالى: ﴿ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴾ [٨٢].

**گۆتنا خودێ: و ئەوێت ستەم و شیرک تێکەلی باوەرییا خۆ نەکرین.**

٦٤١ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾، شَقَّ ذلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَقَالُوا: أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ، إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لابْنِهِ**: ﴿يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ [لقمان:١٣]). [خ٦٩٣٧ (٣٢)/ م١٢٤].

▪ وفي رواية للبخاري: (**لَيْسَ ذَلِكَ، إِنَّمَا هُوَ الشِّرْكُ**). [خ٣٤٢٩].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا ولَم يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ (ئەوێت باوەری ئینایین و ستەم و شیرک تێکەلی باوەرییا خۆ نەکرین) ئەڤە ل سەر سەحابێت پێغەمبەری (ﷺ) گران بوو و گۆتن ما کی ژ مە هەیە باوەرییا خۆ تێکەلی ستەمێ نەکربیت؟! ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی**

**ئەوسایە ما هوین گوهێ خۆ نادەنە ئاخفتنا لوقمانی گۆتییە کوڕێ خۆ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (ب ڕاستی شیرك ستەمەکا مەزنە).**

- **و د ڤەگێڕەکا بوخاریدا: (ئەوسایە بەلکی ئەو (ستەم) شیرکە).**

قوله تعالى: ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا ﴾ [١٤٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: بێژە: ئەز د وێ وەحییێدا یا بۆ من هاتی کو قورئانە تشتەکێ حەرام و نەدورست ل سەر هەر ئێکێ هەبیت نابینم، ژ بلی .... ئایەت.**

٦٤٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَأْكُلُونَ أَشْيَاءَ، وَيَتْرُكُونَ أَشْيَاءَ تَقَذُّراً، فَبَعَثَ اللهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ (ﷺ)، وَأَنْزَلَ كِتَابَهُ، وَأَحَلَّ حَلاَلَهُ، وَحَرَّمَ حَرَامَهُ، فَمَا أَحَلَّ فَهُوَ حَلاَلٌ، وَمَا حَرَّمَ فَهُوَ حَرَامٌ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ عَفْوٌ. وَتَلاَ: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. [د٣٨٠٠].

* صحيح الإسناد.

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: خەلکێ بەری ئیسلامەتییێ هندە تشت دخوارن و هندە تشت ژ نەڤیان دهێلان ئینا خودێ پێغەمبەرێ خۆ هنارت و قورئانا خۆ ئینا خوار و حەلالێ وێ (ئانکو قورئانێ) حەلال کر و حەرامێ وێ حەرام کر، ڤێجا یا حەلال کری ئەو یێ حەلالە، و یا حەرام کری ئەو یێ حەرامە و یا ژێ بێدەنگ بووی ئەو لێ ناهێنە گرتن (ئانکو هوین تێدا ئازانە) و ئەڤ ئایەتە خواند. ﴿قُلْ لَا أَجِدُ فِيمَا أُوحِيَ إِلَي مُحَرَّمًا﴾.**

قوله تعالى: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا ﴾ [١٥٣].

**گۆتنا خودێ: و ب ڕاستی ئەڤەیە ڕێکا من، کو ڕێکەکا ڕاست و دورستە**

٦٤٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَخَطَّ خَطّاً، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَمِينِهِ، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَسَارِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ فِي الْخَطِّ الْأَوْسَطِ فَقَالَ: (**هَذَا سَبِيلُ اللهِ**)، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾. [جه١١].

* صحيح.

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەری بووین (ﷺ) خیچەك كێشا و دو خیچ ل لایێ وێ یێ راستێ كێشان و دو خیچ ل لایێ وێ یێ چەپێ كێشان، پاشی دەستێ خۆ دانا سەر وێ خیچا د نیڤەكێدا و گۆت: **(ئەڤە رێكا خودێیە)** پاشی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وَأَنَّ هذا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ولا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عن سَبِيلِهِ﴾ (و ب ڕاستی ئەڤەیە ڕێكا من، كو ڕێكەكا ڕاست و دورستە، ڤێجا بگرن و ل دویڤ هەڕن، و چو ڕێكێت دی نەگرن، دێ هەوە ژ ڕێكا خودێ دەرئێخن و هەوە ژێكڤەكەن).

(٧)

سورة الأعراف

سۆرەتا ئەعراف

قوله تعالى: ﴿ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ د گەل هەر نڤێژەکێ یان تەوافەکێ جلکێت خۆ یێت جوان بکەنە بەر خۆ.**

٦٤٤ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ، فَتَقُولُ: مَنْ يُعِيرُنِي تِطْوَافاً؟ تَجْعَلُهُ عَلَى فَرْجِهَا، وَتَقُولُ: مَن يُعِيرُنِي تِطْوَافًا؟ تَجْعَلُهُ على فَرْجِهَا، وَتَقُولُ:

الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ

فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾. [م٣٠٢٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) (بەری موسلمانەتییێ) ژنێ تەواف ل دۆر کەعبێ دکر و ئەو یا رویس و دگۆت: کی دێ جلکەکێ د خۆوەرکرنێ دەتە ڤ من و دانیتە سەر شەرمگەها خۆ و دگۆت:**

**ئەڤرۆ هندەك یان هەمی دیارە ببیت و یا ژێ دیارە بووی ئەز حەلال ناکەم**

**ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كل مَسْجِدٍ﴾.**

قوله تعالى: ﴿ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ ﴾ [١٤٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ ڤێجا وەختێ خودایێ وی بۆ چیایی دیار بووی [دیاربوونەکا هێژایی وی و یا بێ چاوایی].**

٦٤٥ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾. قَالَ حَمَّادٌ: هَكَذَا، وَأَمْسَكَ سُلَيْمَانُ بِطَرَفِ إِبْهَامِهِ عَلَى أَنْمُلَةِ إِصْبَعِهِ الْيُمْنَى، قَالَ: فَسَاخَ الْجَبَلُ، ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾. [ت٣٠٧٤].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿فلما تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا﴾ حەمادی گۆت: هۆسا و سولەیمانی لایێ تلا خۆ یا بەرانی ل سەر سەرێ تلا خۆ یا راستێ گرت، (رامان دورستی خودێ بۆ چیای دیار نەبوو بەلێ گەلەك كێم) چیا د عەردیدا چۆ خوارێ ﴿وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا﴾ و مووسا كەڤت و های ژ خۆ نەما.**

## قوله تعالى: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ﴾ [١٧٢]

### گۆتنا خودایێ مەزن: ما ئەز نە خودایێ هەوەمە.

٦٤٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**أَخَذَ اللهُ الْمِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنَعْمَانَ . يَعْنِي: عَرَفَةَ . فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا، فَنَثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِّ، ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قِبَلاً، قَالَ:** ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُوا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾﴾). [حم٢٤٥٥].

* رجاله ثقات.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**خودێ پەیمان ژ پشتا ئادەمی ل نهالا نەعمان (نهالەكە دكەڤیتە مەكەهێ) و ل رۆژا عەرەفەیێ وەرگرت، و ژ پشتا وی گیانێت هەمی دویندەها وی دەرئێخستن و بەر دەستێت وی بلاڤكرن وەكی مێری زەركا، و پاشی روی ب روی د گەل وان ئاخفت و گۆت: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قالوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يوم الْقِيَامَةِ إِنَّا كنا عن هذا غَافِلِينَ أو تَقُولُوا إنما أَشْرَكَ آبَاؤُنَا من قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً من بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ﴾ (و وەختێ خودایێ تە ژ پشتا ئادەمی، دویندەها وی دەرئێخستی، و هەر ئەو [دویندەه] ل سەر دویندەهێ ب خۆ كرنە شاهد، [وی وەختی خودێ گۆتە وان]: ما ئەز نە خودایێ هەوەمە؟ گۆتن: بەلێ، ئەم شادەییێ ددەین، ئەڤە**

**دا هوین ڕۆژا قیامەتێ نەبێژن، ئەم ژ ڤێ د بێ ئاگەهـ بووین. یان ژی دا هوین نەبێژن [ئەم چ بكەین] باب و باپیرێت مە بەری مە هەڤال و هەڤپشك [بۆ خودێ] چێ كربوون، و ئەم ژی دویندەهەك بووین پشتی وان هاتین [مە ژ نك خۆ هەڤال و هەڤپشك چێ نەكرینە، مە چاڤ ل وان كر]، ڤێجا ما دێ مە ب كریارا گۆمڕایان د هیلاك بەی؟)**

قوله تعالى: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ﴾ [١٩٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: لێنەگرتنێ و كار و ئالییێ ساناهی بگرە، و فەرمانێ ب كار و كریارێت قەنج بكە.**

٦٤٧ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾. قَالَ: ما أَنْزَلَ اللهُ إِلاَّ فِي أَخْلاَقِ النَّاسِ. [خ٤٦٤٣].

- وفي رواية معلقة: قَالَ: أَمَرَ اللهُ نَبِيَّهُ (ﷺ) أَنْ يَأْخُذَ الْعَفْوَ مِنْ أَخْلاَقِ النَّاسِ. [خ٤٦٤٤].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ زوبەیری (رضي الله عنهما) د گۆتنا خودێدا ﴿خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ﴾ گۆت: ئەڤە خودێ نەئینایە خوارێ د رەوشتێ خەلكیدا نەبیت. (ئانكو دڤێت رەوشتێ خەلكی لێبۆرین و نەزەحمەت ئێخستن و فەرمانكرن ب باشییێ ل دەڤ هەبیت).**

- **و د ڤەگێرەكا هەلاویستیدا: گۆت: خودێ فەرمانا پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) كر ئەو ئالییێ ساناهی ژ رەوشتێ خەلكی قەبویل بكەت و ل سەر وان گران نەكەت.**

(٨)

## سورة الأنفال

## سۆرەتا ئەنفال.

قوله تعالى: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ﴾ [١٩٩]

**گۆتنا خودایێ مەزن: پرسیارا دەستکەفتییێت (خەزایێ) ژ تە دکەن [کا دێ چاوا ئێنە بەلاڤکرن، نەخاسمە پشتی ژێك جودا بوون ل سەر دەستکەفتییێت بەدرێ پەیدا بوویی].**

٦٤٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ بَدْرٍ: (**مَنْ فَعَلَ كَذَا وَكَذَا فَلَهُ مِنَ النَّفَلِ كَذَا وَكَذَا**)، قَالَ: فَتَقَدَّمَ الْفِتْيَانُ، وَلَزِمَ الْمَشْيَخَةُ الرَّايَاتِ فَلَمْ يَبْرَحُوهَا، فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِمْ، قَالَ الْمَشْيَخَةُ: كُنَّا رِدْءاً لَكُمْ، لَوِ انْهَزَمْتُمْ لَفِئْتُمْ إِلَيْنَا، فَلاَ تَذْهَبُوا بِالْمَغْنَمِ وَنَبْقَى، فَأَبَى الْفِتْيَانُ وَقَالُوا: جَعَلَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ۝﴾، يَقُولُ: فَكَانَ ذَلِكَ خَيْراً لَهُمْ، فَكَذَلِكَ أَيْضاً، فَأَطِيعُونِي، فَإِنِّي أَعْلَمُ بِعَاقِبَةِ هَذَا مِنْكُمْ.

■ وفي رواية: قَالَ: فَقَسَمَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالسَّوَاءِ. [د٢٧٣٧ . ٢٧٣٩].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا بەدرێ گۆت: (هەر کەسێ هۆ بکەت و هۆ بکەت (ئانکو کارێت مەزن و قارەمانییێ بکەت) بۆ وی زێدەی پشك و بارێت وی ژ دەستکەفتان خەلات هەیە)[1]، گۆت: گەنج پێشکەفتن و پیرەمێران ئالا گرتن و بەرنەدان و دەمێ خودێ سەرکەفتن دایە وان، پیرەمێران گۆتە وان: ئەم پشت و هاریکارێت هەوە بووین، و ئەگەر هوین شکەستبان دا زڤرنە دەڤ مە، ڤێجا هەمی**

(١) بۆ گەرمکرنا وان.

دەستكەفتان بۆ خۆ نەبەن و مە بهێلنە وەسا، گەنج رازی نەبوون و گۆتن پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێت بۆ مە ئێخستین، ئینا خودێ ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عن الْأَنْفَالِ قُلْ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ﴾ هەتا ﴿كما أَخْرَجَكَ رَبُّكَ من بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا من الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ﴾[1] دبێژیت: دەركەفتنا وان ب دلێ وان نەبوو، خێرا وان تێدا بوو، و كا چاوا ئەڤە بۆ هەوە خێر بوو هۆسا گوهدارییا من د بەلاڤكرنا دەسكەفتاندا بكەن، ب راستی ئەز ژ هەوە چێتر دویماهییا ڤی كاری دزانم. (ئەڤە گۆتنا پێغەمبەرییە (ﷺ)).

- و د ڤەگێرەكێدا. گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەكی د ناڤبەرا واندا لێكڤە كر.

(١) ژ ئایەتا ئێكێ هەتا یا پێنجێ د ڤێ چەندێدا هاتنەخوار و كورتییا راڤەكرنا وان ئەڤەیە:

﴿١﴾ پرسیارا دەستكەفتییێت (خەزایێ) ژ تە دكەن [كا دێ چاوا ئێنە بەلاڤكرن، نەخاسمە پشتی ژێكجودابوون ل سەر دەستكەفتییێت بەدرێ پەیدابوویی]، بێژە: دەستكەفتی بۆ خودێ و پێغەمبەرینە [ئانكو بەلاڤكرنا وان ب هیڤیا پێغەمبەریڤەیە]، ڤێجا پارێزكارییا خودێ بكەن [ل سەر دەستكەفتییان ژێكڤە نەبن، و ل بەر فەرمانا خودێ ڕاوەستن]، و ناڤبەرا خۆ دورست بكەن، و گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی بكەن ئەگەر هوین خودان باوەر بن.

﴿٢﴾ ب ڕاستی خودان باوەر بەس ئەون، ئەوێت ئەگەر ناڤێ خودێ هاتە ئینان، دلێت وان ژ ترساندا خۆ دقوتن، و ئەگەر قورئان ل سەر وان هاتە خواندن، باوەرییا وان پتر لێ دئێت، و پشتا خۆ ب خودێ موكوم و گەرم دكەن.

﴿٣﴾ و ئەوێت بەردەوام [و ب ڕەنگێ پێدڤی] نڤێژان دكەن، و ژ تشتێ مە داییێ خێران ددەن.

﴿٤﴾ ئەها ئەڤەنە خودان باوەرێت ڕاست و دورست، وان ل دەڤ خودایێ خۆ پێك و پایە و گونەهـ ژێبرن و ڕزقەكێ بەرفرەهـ هەیە.

﴿٥﴾ [حوكمێ ژێكڤەكرنا دەستكەفتییان ب دویماهی هات، دێ ب وی ڕەنگی بیت یێ خودێ بڤێت، د گەل هندێ كو ب دلێ هندەكان نینە ژێ] هەروەكی خودایێ تە تو ژ مەدینەیێ دەرئێخستی بۆ بەدرێ [بۆ كارەكی تەقدیرا وی ل سەر بوو]، و هندەك ژ خودان باوەران ئەڤە پێ نەخۆش بوو.

قوله تعالى: ﴿إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُ﴾ [١٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: [گەلی موشركان] ئەگەر هوین سەركەفتنێ دخوازن [بۆ وی یێ ڕاست و دورست]، ڤێجا سەركەڤتن ل دویڤ داخوازا هەوە هات [كا كی چێتر و دورستترە، خودێ ئەو سەرئێخست].**

٦٤٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ أَبِي صُعَيرٍ العُذْرِيِّ قَالَ: كَانَ المسْتَفْتِحَ أَبو جَهْلٍ، فَإِنَّهُ قَالَ حِيْنَ التَقَى القَوْمُ: اللَّهُمَّ أَيُّنَا كَانَ أَقْطَعَ لِلرَّحِمِ، وَآتَانَا بِمَا لا نَعْرِفُ، فَأَحْنِهِ الغَدَاةَ، فَكَانَ ذَلِكَ اسْتِفْتَاحَهُ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُ﴾ إلى قوله: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾. [ك٣٢٦٤].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ سەعلەبەیێ كوڕێ ئەبی سوعەیرێ عوزری (ﷺ) گۆت: یێ سەركەفتن بۆ یێ دورستتر داخواز كری ئەبو جەهل بوو دەمێ ئەو و موسلمان (ڕۆژا بەدرێ) گەهشتینە ئێك گۆت: ئەی خودا كی ژ مە بۆ مرۆڤانییێ خرابترە و ئەو ئینایە یا نەهاتییە زانین ئەڤرۆ وی ژ ناڤ ببە و بشكێنە و ئەڤە سەركەفتنخوازییا وی بوو، ئینا خودێ ئینا خوارێ: ﴿إِنْ تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ﴾ هەتا گۆتنا وی: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[1].**

(١) ڕاڤەكرنا ئایەتێ: [گەلی موشركان] ئەگەر هوین سەركەفتنێ دخوازن [بۆ وی یێ ڕاست و دورست]، ڤێجا سەركەڤتن ل دویڤ داخوازا هەوە هات [كا كی چێتر و دورستترە، خودێ ئەو ب سەرئێخست]، و ئەگەر هوین نەیارەتییا [پێغەمبەری و موسلمانان] بهێلن و بەس بكەن، نێ ئەڤە بۆ هەوە چێترە، و ئەگەر هوین بزڤڕنەڤە [گاورییێ و دژمناتییێ]، ئەم ژی دێ [بۆ هاریكارییا پێغەمبەری و شكاندنا گاوران] زڤڕینەڤە، و كۆم و هەژمارا هەوە چو مفایی ناگەهینیتە هەوە، هوین چەند گەلەك ژی بن، و ب ڕاستی خودێ یێ د گەل خودان باوەران.

قوله تعالى: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ﴾ [٢٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڕاستی خرابترین جاندار ل دەڤ خودێ، ئەون ئەوێت كەڕ و لال، ئەوێت تێ نەگەهن.**

٦٥٠ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾؛ قَالَ: هُمْ نَفَرٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ. [خ٤٦٤٦].

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) د گۆتنا خودێدا ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ گۆت: ئەو چەند مرۆڤەكن ژ بەنی عەبد ئەلدار. (دگۆتن: ئەم د ڕاستا وی تشتیدا یێ موحەممەد پێ هاتی د كەڕ و كۆرە و لالین).**

قوله تعالى: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً﴾ [٢٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و خۆ ژ ئاتافەكێ بپارێزن، نەبەس دێ وان ب تنێ گریت، ژ هەوە، ئەوێت ستەم كرین.**

٦٥١ - عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: قُلْنَا لِلزُّبَيْرِ رضي الله عنه: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ، مَا جَاءَ بِكُمْ ضَيَّعْتُمُ الْخَلِيفَةَ حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ جِئْتُمْ تَطْلُبُونَ بِدَمِهِ؟! قَالَ الزُّبَيْرُ رضي الله عنه: إِنَّا قَرَأْنَاهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رضي الله عنهم: ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً﴾ لَمْ نَكُنْ نَحْسَبُ أَنَّا أَهْلُهَا حَتَّى وَقَعَتْ مِنَّا حَيْثُ وَقَعَتْ! [حم١٤١٤، ١٤٣٨].

* إسناده جيد.

**ژ موتەڕیفی (رحمه الله) گۆت: مە گۆتە زوبەیری (رضي الله عنه) ئەی بابێ عەبدوللایی ئەڤە چ هوین ئینایینە؟! هەوە خەلیفە هێلا هەتا هاتییە كوشتن، پاشی هوین دهێن داخوازییا خوینا وی دكەن، زوبەیری (رضي الله عنه) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبوبەكری و عومەری و عوسمانی مە ئەڤ ئایەتە ﴿وَاتَّقُوا فِتْنَةً لاَ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً﴾ دخواند و مە هزر نەدكر ئەم خودانێت وێنە هەتا ئەو ژ مە رویدای یا رویدایی.**

قوله تعالى: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ﴾ [٣٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و خودێ وان ئیزا نادەت [هەمیان ب گشتی ب بەر ئیزا نائێخیت] و تو [هەی موحەممەد] د ناڤ واندا.**

٦٥٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: اللَّهُمَّ! إِنْ كانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ، فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ، أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ. فَنَزَلَتْ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ۝٣٣ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ الآيَةَ. [خ٤٦٤٨/ م٢٧٩٦].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: ئەبو جەهلی گۆت: ئەی خودا ئەگەر ئەڤە (یا موحەممەد، پێ هاتی) راستی بیت ژ دەڤ تە بیت، بارانا بەرا ژ عەسمانی ب سەر مەدا ببارینە، یان ئیزایەکا دژوار بۆ مە بینە، ئینا خودێ ئینا خوار: ﴿وما كان الله لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وما كان الله مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ وما لهم ألا يُعَذِّبَهُمْ الله وَهُمْ يَصُدُّونَ عن الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾[1] تامامیا ئایەتێ.**

٦٥٣ - عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**انزَلَ اللهُ عَلَيَّ أَمَانَيْنِ لأُمَّتِي**: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾، **فَإِذا مَضَيتُ، تَرَكتُ فِيهِمُ الإستِغفَار إِلَى يَومِ القِيَامَةِ**). [ت٣٠٨٢].

---

**(١) و خودێ وان ئیزا نادەت [هەمییان ب گشتی ب بەر ئیزا نائێخیت] و تو [هەی موحەممەد] د ناڤ واندا.. و خودێ وان ب بەر ئیزایێ نائێخیت، و ئەو داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بکەن. و وان چ هەیە نەهێلیت خودێ وان ب بەر ئیزا بێخیت [پشتی تو و موسلمانێت لاواز ژ ناڤ وان دەرکەفتین] و ما بۆچی خودێ وان ئیزا نادەت، و ئەو رێکا خەلکی ژ مزگەفتا حەرام [کەعبەیێ] دگرن، و ئەو ب خۆ نەخودانێت مزگەفتێ.. خودانێت وێ ژ پارێزکاران پێڤەتر کەسێ دی نینە، بەلێ باراپتر ژ وان ڤێ نوزانن.**

* ضعيف الإسناد.

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودێ بۆ من (د قورئانێدا) دو ئێمناهی بۆ ئوممەتا من پێت ئینانینە خوارێ** ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾**، ڤێجا ئەگەر ئەز چۆم من خواستنا گونەهژێبرنێ (ئیستغفار) د ناڤ واندا یا هێلای هەتا رۆژا قیامەتێ).**

قوله تعالى: ﴿ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ ﴾ [٤١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و بزانن ب ڕاستی هەر دەستکەفتییەکێ ب دەست هەوە بکەڤیت، پێنجیێك ژێ بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وییە.**

٦٥٤ – عَنْ عَطَاءٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾. قَالَ: خُمُسُ اللهِ وَخُمُسُ رَسُولِهِ وَاحِدٌ، كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَحْمِلُ مِنْهُ، وَيُعْطِي مِنْهُ وَيَضَعُهُ حَيْثُ شَاءَ، وَيَصْنَعُ بِهِ مَا شَاءَ. [ن٤١٥٣].

* مرسل صحيح الإسناد.

**ژ عەتائی (رحمه الله) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ من شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى﴾ (و بزانن ب ڕاستی هەر دەستکەفتییەکێ ب دەست هەوە بکەڤیت، پێنجیێك ژێ بۆ خودێ و پێغەمبەری و مرۆڤێت وی [ژ بابکێ هاشم و (مطلب)ی]) گۆت: پێنجیێکا خودێ و پێنجیێکا پێغەمبەرێ وی هەر ئێکە، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ وێ هاریکاری دکر، و ژ وێ ددا و ژ وێ دکرە د وی جهیدا یێ وی دڤیا و ئەو پێ دکر یا وی دڤیا.**

٦٥٥ – عَنْ قَيْسِ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ﴾. قَالَ: هَذَا مَفَاتِحُ كَلاَمِ اللهِ، الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ لِلَّهِ، قَالَ: اخْتَلَفُوا فِي هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): سَهْمِ الرَّسُولِ وَسَهْمِ ذِي الْقُرْبَى؛ فَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ الرَّسُولِ (ﷺ) لِلْخَلِيفَةِ مِنْ بَعْدِهِ. وَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ ذِي الْقُرْبَى لِقَرَابَةِ الرَّسُولِ (ﷺ). وَقَالَ قَائِلٌ: سَهْمُ ذِي الْقُرْبَى لِقَرَابَةِ الْخَلِيفَةِ، فَاجْتَمَعَ رَأْيُهُمْ عَلَى أَنْ جَعَلُوا هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ فِي الْخَيْلِ وَالْعُدَّةِ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَكَانَا فِي ذَلِكَ خِلاَفَةَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ. [ن٤١٥٤].

* مرسل صحيح الإسناد.

**ژ قەیسێ كورێ موسلمی (رحمه الله) گۆت من پرسیارا ڤێ ئایەتێ ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ من شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ﴾ ژ حەسەنێ كورێ موحەممەدی كر، گۆت: ئەڤە ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ﴾ دەستپێكرنا ئاخفتنا خودێیە (بۆ پیرۆزیێیە) و دنیا و ئاخرەت یێت وینە (ئانكو رامان ئەو نینە پشكەك بۆ خودێیە بەلكی بۆ بەركەت دەستپێكرنا ب ناڤێ وی هاتییە كرن) و گۆت: و پشتی مرنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ڤان هەردو پشكاندا یێت ژێك جودا بووین، پشكا پێغەمبەری و پشكا مرۆڤێت پێغەمبەری (ژ بابكێ هاشم و (مطلب)ی) هندەكان گۆت: پشكا پێغەمبەری بۆ خەلیفەیێ پشتی وییە، و پشكا مرۆڤێت پێغەمبەری (ژ بابكێ هاشم و (مطلب)ی) بۆ مرۆڤێت پێغەمبەرێ خودێنە (ﷺ) و هندەكان گۆت: پشكا مرۆڤێت پێغەمبەری (ﷺ) بۆ كەس و كارێت خەلیفەیە، و بۆچۆنا وان ل سەر هندێ كۆم بوو ئەو ڤان هەردو پشكا بێخنە د هەسپ و بەرهەڤییێت جیهادا د رێكا خودێدا و حوكمدارییا ئەبوبەكر و عومەری ل سەر ڤێ چەندێ بوو.**

قوله تعالى: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ﴾ [٦٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەگەر بیستێت بێنفرەھ ژ هەوە هەبن، دێ شێنە دوسەدان.**

٦٥٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا نَزَلَت: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾، شَقَّ ذلِكَ عَلَى المسْلِمِينَ، حِينَ فُرِض عَلَيْهِمْ أَنْ لاَ يَفِرَّ وَاحِدٌ مِنْ عَشَرَةٍ، فَجَاءَ التَّخْفِيفُ، فَقَالَ: ﴿ٱلْـَٔانَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ﴾، قَالَ: فَلَمَّا خَفَّفَ اللهُ عَنْهُمْ مِنَ الْعِدَّةِ، نَقَصَ مِنَ الصَّبْرِ بِقَدْرِ ما خُفِّفَ عَنْهُمْ. [خ٤٦٥٣ (٤٦٥٢)].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت دەمێ هاتییە خوار ﴿إِن يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ (ئەگەر بیستێت بێنفرەھ ژ هەوە هەبن، دێ شێنە دوسەدان) ئەڤە ل سەر موسلمانان گران بوو دەمێ ل سەر وان نڤیسی ئێك ژ دەهان نەرەڤیت، ئینا سڤككرن هات گۆت: ﴿الْآنَ خَفَّفَ اللهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضُعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ (ئەها ڤێ گاڤێ خودێ ل سەر هەوە سڤك كر، و زانی لاوازییەكا ل دەڤ هەوە هەی، ڤێجا ئەگەر سەدێت بێنفرەھ ژ هەوە هەبن، دێ شێنە دوسەدان) گۆت: دەمێ خودێ ژ هەژمارێ ل سەر وان سڤك كری ژ بێهنفرەهییێ تەمەت یا ل سەر سڤك كری كێم كر.**

(۹)

سورة التوبة (براءة).

**سۆرەتا تەوبە (بەرائە)**

٦٥٧ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: سُورَةُ التَوْبةِ؟ قَالَ: التَّوْبَةُ هِيَ الْفَاضِحَةُ، ما زَالَتْ تَنْزِلُ: وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ، حَتَّى ظَنُّوا أَنَّهَا لَنْ تُبْقِيَ أَحداً مِنْهُمْ إلاَّ ذُكِرَ فِيهَا. قَالَ: قُلتُ: سورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَدْرٍ. قَالَ: قُلْتُ: سُورَةُ الحَشْرِ؟ قَالَ: نَزَلَتْ في بَنِي النَّضِيرِ. [خ٤٨٨٢، (٤٠٢٩)/ م٣٠٣١].

**ژ سەعیدێ كوڕێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: من گۆتە ئیبن عەباسی سۆرەتا تەوبە؟ گۆت سۆرەتا تەوبە ئەو شەرمزاركەرە و بەردەوام ئەو دهاتە خوارێ و ژ وان و ژ وان هەتا وان هزر كری كەسێ ژ وان ناهێلیت شەرمزار نەكەت[1] گۆت: من گۆتێ: سۆرەتا ئەنفال؟ گۆت: ئەو ل بەدرێ هاتە خوارێ، گۆت من گۆت: سۆرەتا حەشرێ؟ گۆت: ئەو د راستا بەنی نەزیردا هاتە خوارێ.**

قوله تعالى: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ ﴾ [٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر ئێك ژ موشركان خۆ هاڤێتە بەختێ تە.**

٦٥٨ - (خ) عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾: إِنْسَانٌ يَأْتِيهِ فَيَسْتَمِعُ مَا يَقُولُ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَهُوَ آمِنٌ حَتَّى يَأْتِيَهُ فَيَسْمَعَ كَلاَمَ اللهِ، وَحَتَّى يَبْلُغَ مَأْمَنَهُ حَيْثُ جَاءَهُ. [خ. التوحيد، باب ٣٩].

(١) ئانكو: ئەڤە چەند جار تێدا دوبارە بوویە وەكی: (ومنهم الذين يؤذون النبي) و (منهم من يلمزك في الصدقات) و (منهم من يقول ائذن لي) و (منهم من عاهد الله).

ژ موجاهدی (رحمه الله) د گۆتنا خودێدا ﴿وَإِنْ أَحَدٌ من الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حتى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ﴾[1] گۆت: مرۆڤەك بهێتە دەڤ گوهدانا وێ بكەت یا ئەو دبێژیت و یا بۆ هاتییە خوار و ئەو یێ ئێمنە هەتا دهێتە دەڤ و گوه ل ئاخفتنا خودێ دبیت و هەتا دگەهیتە جهێ ئێمن دبیت.

قوله تعالى: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ﴾ [١٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەرێ هوین كارێ ئاڤدانا حەجییان.**

٦٥٩ – (م) عَن النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ، إِلاَّ أَن أُسْقِيَ الْحَاجَّ. وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لاَ أَعْمَلَ عَمَلاً بَعْدَ الإِسْلاَمِ، إِلاَّ أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ. وَقَالَ آخَرُ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ. فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ وَقَالَ: لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ. فأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ الآيَةَ إِلَى آخِرِهَا. [م١٨٧٩].

ژ نوعمانێ كوڕێ بەشیری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل دەڤ مینبەرا پێغەمبەرێ خودێ بووم (ﷺ) زەلامەكی گۆت: من خەم نینە ئەز پشتی موسلمانەتییێ چو كاران نەكەم ژ بلی ئەز ئاڤێ بدەمە حەجییان، و ئێكێ دی گۆت: من خەم نینە ئەز پشتی موسلمانەتییێ چو كاران نەكەم ژ بلی ئەز مزگەفتا كەعبەیێ سەخبێر بكەم، ئێكێ دی گۆت: جیهادا د ڕێكا خودێدا ب خێرترە ژ وێ یا هەوە گۆتی، ئینا عومەری پاشڤە برن و گۆت: دەنگێ خۆ ل دەڤ مینبەرا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بلند نەكەن و ئەو ڕۆژا خوتبە بوو، بەلێ ئەگەر من نڤێژا خوتبێ كر، دێ چمە دەڤ پرسیارێ ژ وێ یا هوین تێدا جودا بووین كەم، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ

(١) و ئەگەر ئێك ژ موشركان خۆ هاڤێتە بەختێ تە، بحەوینە دا كەلامێ خودێ گوه لێ ببیت و قورئانێ بۆ بخوینە.

**﴿الْآخِرِ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ (ئەرێ هوین کارێ ئاڤدانا حەجییان و ئاڤاکرن و سەخبێکرنا ئاڤاهییێ کەعبەیێ، وەکی کارێ وی ددانن ئەوێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا قیامەتێ ئینایی و جیهاد د ڕێکا خودێدا کری، ئەڤە ل دەڤ خودێ نەوەکی ئێکن، و خودێ ب خۆ ملەتێ ستەمکار ڕاستەڕێ ناکەت).**

قوله تعالى: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەوان (مەخسەد جوهی و فەلەیان) زانا و عیبادەتکەرێت خۆ بۆ خۆ خودا دانایینە.**

٦٦٠ – عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: (**يَا عَدِيُّ! اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الْوَثَنَ**)، وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةٌ: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾، قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ، وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئاً اسْتَحَلُّوهُ، وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئاً حَرَّمُوهُ**). [ت٣٠٩٥].

* حسن.

**ژ عەدییێ کوڕێ حاتەمی (ڕضي الله عنه) گۆت ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و خاچەك ژ زێری د ستۆیێ من بوو، ئینا گۆت: (ئەی عەدی ئەوی بوتی ژ خۆ ڤەکە)، و من گوه لێ بوو سۆرەتا بەرائە دخواند ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا من دُونِ اللَّهِ﴾ گۆت: (ڕاستە وان ئەو نەدپەرستن بەلێ ئەگەر وان تشتەك حەلال کربا وان حەلال وەردگرت، و ئەگەر تشتەك حرام کربا وان حەرام وەردگرت).**

قوله تعالى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ ﴾ [٣٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەوێت زێر و زیڤان ددانە سەرێك (و هەڤێ خودێ ژێ دەرنەئێخن).**

٦٦١ – (خ) عَنْ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ ـ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ـ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، فَلَحِقَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ لَهُ: قَوْلُ اللهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾؟ قَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ كَنَزَهَا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا فَوَيْلٌ لَهُ، إِنَّمَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللهُ طَهُوراً لِلْأَمْوَالِ. ثُمَّ الْتَفَتَ فَقَالَ: مَا أُبَالِي لَوْ كَانَ لِي أُحُدٌ ذَهَباً، أَعْلَمُ عَدَدَهُ وَأُزَكِّيهِ، وَأَعْمَلُ فِيهِ بِطَاعَةِ اللهِ عزّ وجل. (لفظ ابن ماجه) [خ(١٤٠٤) معلّقاً/ جه١٧٨٧].

* صحيح.

**ژ خالدێ كورێ ئەسلەمی (ﷺ) ئازاكرییێ عومەرێ كورێ خەتتابی گۆت: ئەز د گەل عەبدوللایێ كورێ عومەری دەركەفتم كۆچەرە عەرەبەك گەهشتێ و پرسیارا گۆتنا خودێ: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ ولا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ژێ كر ئیبن عومەری گۆت: یێ دانیتە سەر ئێك و زەكاتا وی نەدەت ئها ئیزا بۆ وییە و ب راستی ئەڤ بەری فەرمانا زەكاتێ بهێتە خوارێ و پشتی هاتییە خوارێ زەكات كرە پاقژكەر بۆ مالی پاشی زڤری و گۆت: من خەم نینە ئەگەر من چیایێ ئوحودێ زێر هەبن و ئەز هژمارا وان بزانم و ئەز زەكاتێ ژێ بدەم و گوهدارییا خودایێ هەر ب هێز و مەزن تێدا بكەم.**

قوله تعالى: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ ﴾ [٧٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەو [دوڕوییێت] چكیان ددەنە خودان باوەرێن ژ دل و گیان [گەلەك] سەدەقەیان ددەن.**

٦٦٢ – (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ قَالَ: لَمَّا أُمِرْنَا بِالصَّدَقَةِ كُنَّا نَتَحَامَلُ، فَجَاءَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، وَجاءَ إِنْسَانٌ بِأَكْثَرَ مِنْهُ، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: إِنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا، وَما فَعَلَ هَذَا الآخَرُ إِلاَّ

رِئَاءً، فَنَزَلَت: ﴿ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ﴾ الآية. [خ٤٦٦٨، (١٤١٥)/ م١٠١٨].

**ژ ئەبی مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ فەرمانا مە ب سەدەقەیان هاتییە کرن، مە حەمالی دکر (دا وێ فەرمانێ ب جھ بینین چونکی مە چو نەبوو بکەینە خێر) ئینا ئەبو عەقیلی نیڤ من ئینا و مرۆڤەکێ دی پتر ژ وی ئینا، ڤێجا دوڕوییان گۆت: ب راستی خودێ منەت ب سەدەقا ڤی نینە و ئەڤێ دی ژی ئەڤە نەکرییە بۆ رویمەتییێ نەبیت، ئینا خودێ ئینا خوار ﴿الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ من الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إلا جُهْدَهُمْ﴾ ئایەت. (ئەو [دوڕوییێت] چکییان ددەنە خودان باوەرێن ژ دل و گیان [گەلەك] سەدەقەیان ددەن [دبێژن: ئەڤە بۆ ڕویمەتییێیە نە ژ بۆ ڕازیبوونا خودێیە]، و [ژ خودان باوەران] ئەوێت چو نەبینن بدەن ژ بلی پێچێبوونا خۆ، [دوڕوی] ترانەیان بۆ خۆ پێ دکەن [و دبێژن: خودێ چو پاکی ب ڤێ کێمێ نینە]، خودێ ئەو جزادان ل سەر ترانەیێت وان، و ئیزایەکا ب ژان و دژوار بۆ وان هەیە.)**

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴾ [٨٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هەر کەسێ ژ وان بمریت نڤێژێ د بنیڕا ل سەر نەکەی، و ل سەر گۆڕێ وی د وەختێ ڤەشارتنێدا نەراوەستە.**

٦٦٣ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، جاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ اللهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ يُكَفِّنُ فِيهِ أَبَاهُ فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِيُصَلِّيَ، فَقَامَ عُمَرُ فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! تُصَلِّي عَلَيْهِ، وَقَدْ نَهَاكَ رَبُّكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللهُ فَقَالَ:** ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً﴾، **وَسَأَزِيدُهُ عَلَى السَّبْعِينَ**). قَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ، قَال:

فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ﴾. [خ٤٦٧٠، (١٢٦٩)/ م٢٤٠٠ و٢٧٧٤].

**ژ نافعی (رحمه الله) ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ عەبدوللایێ کورێ ئوبەی مری کورێ وی عەبدوللایێ کورێ عەبدوللایی هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و داخواز ژێ کر ئەو قەمیسێ خۆ بدەتە وی دا وی پێ کفن بکەت، پاشی داخواز ژێ کر نڤێژێ ل سەر بکەت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو دا نڤێژێ ل سەر بکەت، عومەر رابوو جلکێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرت و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دێ نڤێژێ ل سەر کەی و خودایێ تە تو یێ دایە پاش نڤێژێ ل سەر بکەی؟! ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ هەلبژارتن یا دایە من و گۆت: ﴿اسْتَغْفِرْ لهم أو لَا تَسْتَغْفِرْ لهم إن تَسْتَغْفِرْ لهم سَبْعِينَ مَرَّةً﴾[1] و ئەز دێ ل سەر حەفتێیان زێدەکەم)، عومەری گۆت: ب راستی ئەو دوروییە. گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر کر، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿ولا تُصَلِّ على أَحَدٍ منهم مَاتَ أَبَدًا ولا تَقُمْ على قَبْرِهِ﴾. و هەر کەسێ ژ وان بمریت نڤێژێ د بنیرا ل سەر نەکەی، و ل سەر گۆڕێ وی د وەختێ ڤەشارتنێدا نەراوەستە.**

٦٦٤ – (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّاب رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا ماتَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ، دُعِيَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَثَبْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَتُصَلِّي عَلَى ابْنِ أُبَيٍّ، وَقَدْ قَالَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا: كَذَا وَكَذَا؟ أُعَدِّدُ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَتَبسَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَقَالَ: **(أَخِّرْ عَنِّي يَا عُمَرُ)**! فَلَمَّا أَكْثَرْتُ عَلَيْهِ قَالَ: **(إِنِّي خُيِّرْتُ فَاخْتَرْتُ، لَوْ أَعْلَمُ أَنِّي إِنْ زِدْتُ عَلَى السَّبْعِينَ يُغْفَرُ لَهُ لَزِدْتُ عَلَيْهَا)**. قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثُمَّ انْصَرَفَ، فَلَمْ يَمْكُثْ إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى نَزَلَتِ الآيَتَانِ

---

**(١) چ تو داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان دوروییان بکەی، یان ژی داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان نەکەی، خۆ ئەگەر حەفتێ جاران داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان بکەی، هەر خودێ گونەهێت وان ژێ نابەت.**

مِنْ بَرَاءَةٌ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا﴾ إِلَى ﴿وَهُمْ فَٰسِقُونَ﴾. قَالَ: فَعَجِبْتُ بَعْدُ مِنْ جُرْأَتِي عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ، واللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. [خ١٣٦٦].

**ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) دەمێ عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەیێ كوڕێ سەلوولی مری، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە گازیكرن دا نڤێژێ ل سەر بكەت، و ئەز رابووم گەهشتمێ من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دێ تو نڤێژێ ل سەر گۆڕێ ئوبەی كەی و وی فلان رۆژێ ئەڤە و ئەڤە و ئەڤە یا گۆتی و من گۆتنێت وی بۆ هەژمارتن؟! پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرنژی و گۆت: (خۆ ژ من بدە پاش ئەی عومەر)، ڤێجا دەمێ من ل دویڤ درێژ كری، گۆت: (هەلبژارتن یا دایە من و من هەلبژارت و ئەگەر من زانیبا ئەگەر ئەز ژ حەفتێ جاران زێدەكەم دێ گونەهێت وی هێنە ژێبرن دا ل سەر زێدەكەم)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر كر، و پاشی چۆ و چویێ وەسا نەما كێمەك نەبیت هەتا هەردو ئایەت ژ سۆرەتا بەرائە هاتینە خوارێ: ﴿ولا تُصَلِّ على أحَدٍ منهم مَاتَ أبَدًا﴾ هەتا ﴿وَهُمْ فَاسِقُونَ﴾ عومەری گۆت: ئەز وێ رۆژێ ژ بستەیا خۆ ل سەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حێبەتی بووم و خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن.**

قوله تعالى: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ [١١٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: نەدورستە بۆ پێغەمبەری و خودان باوەران داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ موشركان بكەن.**

٦٦٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الوَفَاةُ، أَتَاهُ النَّبِيُّ (ﷺ) وَعِنْدَهُ عَبْدُ اللهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ وَأَبُو جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَيْ عَمُّ إِنَّكَ أَعْظَمُهُمْ عَلَيَّ حَقاً، وَأَحْسَنُهُمْ عِنْدِي يَدَاً، وَلَأَنْتَ أَعْظَمُ حَقاً عَلَيَّ مِنْ وَالِدَيَّ، فَقُلْ كَلِمَةً تَجِبُ لَكَ عَلَيَّ بِهَا الشَّفَاعَةَ**

**يَوْمَ القِيَامَةِ، قُلْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهَ**)، فَقَالا لَهُ: أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ؟ فَسَكَتَ، فَأَعَادَها عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ: أَنَا عَلى مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ، فَمَاتَ.

فَقَال النَّبِيُّ (ﷺ): (**لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ**) فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ الآية، ﴿وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ﴾ إلى آخر الآية. [ك٣٢٩١].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەبو تالب كەفتییە بەر مرنێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ، و عەبدوللایێ كورێ ئەبی ئومەیەی و ئەبو جەهل كورێ هیشامی ل دەڤ بوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مامۆ ب راستی مافێ تە ل سەر من ژ وان هەمیان مەزنترە، و قەنجییا تە ژ هەمیان باشترە، و مافێ تە ل سەر من ژ یێ دایبابێت من مەزنترە، پەیڤەكێ بێژە پێ بەرڤانییێ رۆژا قیامەتێ ل سەر من واجب بكەی بێژە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)) هەردوكان گۆتێ: دێ دینێ عەبدولموتتەلبی هێلی؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر دوبارە كر، وی گۆت: ئەز یێ ل سەر دینێ عەبدولموتتەلبی و مر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەز دێ داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ تە كەم هندی ئەز ژێ نەهێمە پاشڤەلێدان، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئینا خوارێ ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ﴾ و ئایەتا ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهَ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ.**

(١٠)

سورة يونس.

**سۆرەتا یوونس.**

قوله تعالى: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟﴾ [٥٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: (هەی موحەممەد) بێژە: بلا ب کەرەم و دلۆڤانییا خودێ شاد ببن (بلا شاد ببن ب وێ قورئانا خودێ ب ڕزقێ وان کری و بەرێ وان داییە ڕاستەرێییێ، ئانکو هیدایەتێ).**

٦٦٦ - عَنْ عَبْدِ الرَّحمنِ بنِ أَبْزى عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَا أُبَيُّ! أُمِرْتُ أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ سُورَةَ كَذَا وَكَذَا**)، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَقَدْ ذُكِرْتُ هُنَاكَ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ! فَفَرِحْتَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: وَمَا يَمْنَعُنِي وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ﴾ فَلْتَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا تَجْمَعُونَ. قَالَ مُؤَمَّلٌ: قُلْتُ لِسُفْيَانَ: هَذِهِ الْقِرَاءَةُ فِي الْحَدِيثِ؟ قَالَ: نَعَمْ. [حم٢١١٣٧].

* حديث صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ ئەبزی ژ ئوبەیێ کوڕێ کەعبی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ئەی ئوبەی فەرمانا من یا هاتییە کرن ئەز ڤێ سۆرەتێ و ڤێ سۆرەتێ بۆ تە بخوینم)، گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ و ناڤێ من ل وێرێ هاتە ئینان؟ گۆت: (بەلێ)، من گۆتێ: ئەی بابێ مونزری کەیفا تە ب ڤێ چەندێ هات؟ گۆت: و ما چ دێ ڕێگرییێ ل من کەت و خودایێ پاك و بلند دبێژیت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ﴾ پێ دلخۆش ببن ئەو ژ وێ باشترە یا ئەو کۆم دکەن، موئەممەلی گۆت: من گۆتە سوفیانی ئەڤ خواندنە د فەرموودەییێدا هەیە گۆت: بەلێ.**

قوله تعالى: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ [٦٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: د ژیانا دنیایێ و ئاخرەتێدا مزگینی بۆ وان هەیە (مزگینییا دنیایێ ئەوە یا ملیاكەت ددەنێ د گەل رحكێشانێ، یان ژی خەونا چاكە یا ئەو دبینن، یان ژی ب وانڤە دئێتە دیتن، و مزگینییا ئاخرەتێ بەحەشتە).**

٦٦٧ – عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ قَوْلِهِ: ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾؟ قَالَ: (**هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُؤْمِنُ أَوْ تُرَى لَهُ**).

[ت٢٢٧٥/ جه ٣٨٩٨/ مي٢١٨٢].

* صحيح.

**ژ عوبادەیێ كورێ سامتی (رضي الله عنه) قال: من پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ گۆتنا وی كر: ﴿لهم الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ گۆت: (ئەو خەونا چاكە باوەریدار دبینیت یان پێڤە دهێتە دیتن).**

قوله تعالى: ﴿ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ [٩٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: من باوەری ئینا كو ب راستی ژ بلی وی خودایێ ئسرائیلییان باوەری پێ ئینایی، چو خودایێت دی نینن.**

٦٦٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لَمَّا أَغْرَقَ اللهُ فِرْعَوْنَ قَالَ:** ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾، **فَقَالَ جِبْرِيلُ: يَا مُحَمَّدُ، فَلَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا آخُذُ مِنْ حَالِ الْبَحْرِ فَأَدُسُّهُ فِي فِيهِ، مَخَافَةَ أَنْ تُدْرِكَهُ الرَّحْمَةُ**). [ت٣١٠٧].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: دەمێ فیرعەون خەندقی گۆت: ﴿آمَنْتُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إلا الذي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ﴾ ئینا جبریلی گۆت: (ئەی موحەممەد ئەگەر تە ئەز دیتبام و من ئاخا دەریایێ هەلدگرت و دكرە د دەڤێ ویدا ترسا هندێ دلۆڤانییا خودێ ژێ بگریت).**

(١١)

## سورة هود

## سۆرەتا هوود.

قوله تعالى: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ [١١٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەی موحەممەد تو د هەردو رەخێت رۆژێدا سپێدێ و ئێڤاری و پشکەکێ ژ شەڤێ، نڤێژێ بکە، ب راستی خێر و چاکی گونەهان پویچ دکەن.**

٦٦٩ - (ق) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً أَصَابَ مِنِ امْرَأَةٍ قُبْلَةً، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَذَكَرَ ذلِكَ لَهُ، فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤﴾، قَالَ الرَّجُلُ: أَلِي هذِهِ؟ قَالَ: (**لِمَنْ عمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي**). [خ٤٦٨٧ (٥٢٦)/ م٢٧٦٣].

**و ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی ماچەك ل ژنەکێ دا، هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و بۆ گۆت، ئینا خودێ ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ: ﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَي النَّهَارِ وَزُلَفاً مِنَ الَّليْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾ هەی موحەممەد تو د هەردو رەخێت رۆژێدا سپێدێ و ئێڤاری و پشکەکێ ژ شەڤێ، نڤێژێ بکە، ب راستی خێر و چاکی گونەهان پویچ دکەن. ئینا زەلامی گۆت: ئەڤە بۆ من ب تنێیە یا پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (بۆ هەمی ئوممەتا منە).**

٦٧٠ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَجاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أَصَبْتُ حَدّاً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، قَالَ: وَلَمْ يَسْأَلْهُ عَنْهُ، قَالَ: وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَلَمَّا قَضى النَّبِيُّ (ﷺ) الصَّلاَةَ، قامَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أَصَبْتُ حَدّاً، فَأَقِمْ فِيَّ كِتَابَ اللهِ، قَالَ: (**أَلَيْسَ قَدْ صَلَّيْتَ مَعَنَا**)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَإِنَّ اللهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ ذَنْبَكَ، أَوْ قَالَ: حَدَّكَ**). [خ٦٨٢٣/ م٢٧٦٤].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) و گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ من گونەهەکا کری هەژی سزایێیە من سزاکە، گۆت: و پێغەمبەری پرسیارا وی ژ وێ گونەهێ نەکر. و بوو دەمێ نڤێژێ، نڤێژ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) کر، ڤێجا دەمێ نڤێژ ب دویماهی هاتی گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ من گونەهەکا کری هەژی سزایێیە، ڤێجا حوکمێ کتێبا خودێ دانە سەر من، گۆت: **(ئەرێ تە نڤێژ د گەل مە کر)؟** گۆت: بەلێ، گۆت: **(بێ گۆمان گونەها تە بۆ تە هاتە ژێبرن یان ئەو گونەها تو هزر دکەی هەژی سزایە).**

(١٢)

## سورة يوسف

## سۆرەتا یووسف

قوله تعالى: ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ ﴾ [٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەم باشترین چیرۆك و سەرهاتییان بێت ملەتێت بەرێ بۆ تە ڤەدگێرین.**

٦٧١ - عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، في قوله عزّ وجل: ﴿الٓرۚ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝١ إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ [يوسف: ١ . ٢]، قَالَ: نَزَلَ الْقُرْآنُ على رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَتَلاهُ عَلَيْهِمْ زَمَاناً، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ قَصَصْتَ عَلَيْنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾ الآية، قَالَ: فَتَلاهُ عَلَيْهُمْ زَمَاناً قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ حدَّثْتَنا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل : ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا مَّثَانِيَ﴾ الآية [الزمر:٢٣] كُلُّ ذَلِكَ يُؤْمَرُونَ بِالْقُرْآنِ: قَالَ خلاّد: وَزَادَنِي فيهِ غيرهُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ ذَكَّرْتَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾

[الحديد:١٦]. [حب٦٢٠٩/ ك٣٣١٩/ مخ٣/١٠٦٩].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەقاسی (رضي الله عنه) گۆت: قورئان بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە خوارێ و دەمەكی بۆ وان دخواند، ئینا گۆتن: ئەگەر تە سەرهاتی بۆ مە گۆتبان، ئینا خودێ ﴿الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ ئینا خوارێ هەتا گۆتنا وی ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ﴾ پێغەمبەری دەمەكێ دی قورئان بۆ وان خواند گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ**

**خودێ ئەگەر تو بۆ مە ئاخفتبای، ئینا خودێ ﴿اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُتَشَابِهًا﴾ ئینا خوارێ، و ڤێ هەمییێ ب قورئانێ فەرمان یا ل وان دهێتە کرن، و خەللادی گۆت: و لێ زێدەکر دەمێ گۆتین: ئەی پێغەمبەرێ خودێ شیرەتا ل مە بکە ئینا خودێ ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ ئینا خوارێ.**

قوله تعالى: ﴿ قَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴾ [٢٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ دێ ب لەز پێشڤە وەرە.**

٦٧٢ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: ﴿هَيْتَ لَكَ﴾ قَالَ: وَإِنَّمَا نَقْرَؤُهَا كما عُلِّمْنَاهَا. [خ٤٦٩٢].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) د راستا گۆتنا خودێدا: ﴿هَيْتَ لك﴾ گۆت: ب راستی ئەم وەسا دخوینین هەروەکی ئەم فێرکرنا وێ هاتینە فێرکرن.**

قوله تعالى: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾ [١١٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن : گاڤا پێغەمبەر ژ باوەریئینانا ملەتێت خۆ بێ هیڤی بووین.**

٦٧٣ - (خ) عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ عائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَرَأَيْتِ قَوْلَهُ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ قَدْ﴾ كُذِبُوا، أَوْ كُذِّبُوا؟ قالَتْ: بَلْ كَذَّبَهُمْ قَوْمُهُمْ، فَقُلْتُ: وَاللهِ! لَقَدِ اسْتَيْقَنُوا أَنَّ قَوْمَهُمْ كَذَّبُوهُمْ وما هُوَ بِالظَّنِّ. فَقالَتْ: يا عُرَيَّةُ! لَقَدِ اسْتَيْقَنُوا بِذلِكَ، قُلْتُ: فَلَعَلَّهَا أَوْ كُذِبُوا، قالَتْ: مَعَاذَ اللهِ! لَمْ تَكُنِ الرُّسُلُ تَظُنُّ ذلِكَ بِرَبِّهَا. وَأَمَّا هذِهِ الآيَةُ، قَالَتْ: هُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، الَّذِينَ امَنُوا بِرَبِّهِمْ وَصَدَّقُوهُمْ، وَطَالَ عَلَيْهِمُ الْبَلاءُ، وَاسْتَأْخَرَ عَنْهُمُ النَّصْرُ، حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَتْ مِمَّنْ كَذَّبَهُمْ مِنْ قَوْمِهِمْ، وَظَنُّوا أَنَّ أَتْبَاعَهُمْ كَذَّبُوهُمْ، جاءَهُمْ نَصْرُ اللهِ. [خ٣٣٨٩].

**ژ عوروەیی (رضي الله عنه) وی پرسیار ژ عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) کر گۆتێ بێژە من گۆتنا خودێ: ﴿حتى إذا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قد كُذِبُوا﴾ گۆت من گۆت: (أَكُذِبُوا) ئانکو درەو د گەل هاتە کرن، یان (كُذِّبُوا) ئاخفتنا وان درەو هاتە دانان؟ عائیشایێ گۆت:**

﴿كُذِّبُوا﴾ من گۆت: بێ گۆمان وان دزانی ملەتێ وان ئەو درەوین دانان، پا ئەو هزرکرن چییە. ئینا گۆت: ئەی عورەییە (بچویککرنا ناڤێ وییە) ب راستی ئەو ب ڤێ چەندێ بێ گۆمان بوون، من گۆت: بەلکی یان ئەڤە بیت (كُذِبُوا) درەو د گەل هاتە کرن، گۆت: خودێ نەکەت پێغەمبەران ئەو هزر ژ خودایێ خۆ نەدکرن، و هندیکە ئەڤ ئایەتەیە گۆت: ئەو دویکەفتییێت پێغەمبەرانە ئەوێت باوەری ب خودایێ خۆ ئینایین و خودێ راست د گەل وان گۆتی و نەخۆشی ل سەر وان درێژ بووی و سەرکەفتن گیرۆ بووی هەتا پێغەمبەر ژ باوەرئینانا وان یێت درەوین دانایین ژ ملەتی بێهیڤی بووین و دویکەفتییێت وان هزر کرین ئەو ژڤانا وان دایی وەکی خۆ نەهات هنگی سەرکەفتنا خودێ بۆ وان هات.

(١٣)

سورة الرعد.

**سۆرەتا رەعد.**

قوله تعالى: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ﴾ [﴿٢٤﴾].

**گۆتنا خودایێ مەزن: سلاڤ ل هەوە بن ژ بەر وێ بێنفرەهیا هەوە ل سەر پارێزکارییا خودێ کری، هەوە پیرۆز بیت ئەڤ دویماهییا هۆسا یا جوان.**

٦٧٤ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِي، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: **(هَلْ تَدْرُونَ أَوَّلَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ خَلْقِ اللهِ)** ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: **(أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ خَلْقِ اللهِ الْفُقَرَاءُ، وَالْمُهَاجِرُونَ الَّذِينَ تُسَدُّ بِهِمُ الثُّغُورُ، وَيُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، وَيَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لاَ يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً، فَيَقُولُ اللهُ عزّ وجل لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ مَلاَئِكَتِهِ: ائْتُوهُمْ فَحَيُّوهُمْ، فَتَقُولُ الْمَلاَئِكَةُ: نَحْنُ سُكَّانُ سَمَائِكَ وَخِيرَتُكَ مِنْ خَلْقِكَ، أَفَتَأْمُرُنَا أَنْ نَأْتِيَ هَؤُلاَءِ فَنُسَلِّمَ عَلَيْهِمْ، قَالَ: إِنَّهُمْ كَانُوا عِبَاداً يَعْبُدُونِي، لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً، وَتُسَدُّ بِهِمُ الثُّغُورُ، وَيُتَّقَى بِهِمُ الْمَكَارِهُ، وَيَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لاَ يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً، قَالَ: فَتَأْتِيهِمُ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ ذَلِكَ، فَيَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ** ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ﴾). [حم٦٥٧٠].

* إسناده جيد.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری کوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ هوین دزانن پێت ئێکێ ژ بەندەیێت خودێ دچنە بەحەشتێ کینە؟ گۆتن: خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن، گۆت: پێت ئێکێ ژ بەندەیێت خودێ دچنە بەحەشتێ هەژارێت مشەختن، ئەوێت تخویب پێ دهێنە گرتن و پاراستن ژ نەخۆشییان ب وان دهێتە کرن، و ئێك ژ وان دمریت و هەوجەییا وی د سینگێ ویدا و نەشێت**

**بقەتینیت، ڤێجا خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ بێژیتە وان ملیاکەتێت وی بڤێت، هەرنە دەڤ سلاڤکەنێ و خێرهاتنێ پێ بکەن، ملیاکەت دێ بێژن: ئەم خەلکێ عەسمانێ تەینە، و بژارتییێت چێکرییێت تەینە، تو فەرمانێ ل مە دکەی ئەم بچینە دەڤ وان و سلاڤ کەینە وان، دێ بێژیت: ئەو هندە بەندەبوون ئەز دپەرستم و چو هەڤپشك بۆ من چێنەدکرن و تخویب ب وان دهاتنە گرتن و پاراستن ژ نەخۆشییان ب وان دهاتە کرن، و ئێك ژ وان**

**دمریت و هەوجەییا وی د سینگێ ویدا و نەدشیا بقەتینیت، ڤێجا وی دەمی ملیاکەت دێ هێنە دەڤ وان د هەمی دەرگەهانرا چنە دەڤ وان و بێژن:** ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾).

(١٤)

سورة ابراهيم.

**سۆرەتا ئیبراهیم.**

قوله تعالى: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ﴾ [٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و مە چو پێغەمبەر نەهنارتینە ئەگەر ب زمانێ وی ملەتی نەبیت یێ مە بۆ هنارتی.**

٦٧٥ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَمْ يَبْعَثِ اللهُ نَبِيّاً إِلاَّ بِلُغَةِ قَوْمِهِ). [حم٢١٤١٠].

* متنه صحيح.

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ چو پێغەمبەر نەهنارتینە ئەگەر ب زمانێ وی ملەتی نەبیت).**

قوله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا﴾

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەرێ ما تە نەدیت، ئەوێت نیعمەت و کەرەما خودێ ژ چاڤکۆرەیی گوهارتی.**

٦٧٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا﴾. قَالَ: هُمْ وَاللهِ كُفَّارُ قُرَيْشٍ. [خ٣٩٧٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا﴾ گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەو گاورێت قورەیشیانە.**

(١٥)

سورة الحجر

**سۆرەتا حیجر.**

قوله تعالى: ﴿إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾ [١٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ژ بلی وی یێ ب دزیڤە گوهدارییێ بکەت، ڤێجا دێ بزۆتەکێ دیار پارچەیەکە ژ هەسارێ (کەوکەبان) ب دویڤ کەڤیت.**

٦٧٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)، قَالَ: (**إِذَا قَضى اللهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ، ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَاناً لِقَوْلِهِ، كَالسِّلْسِلَةِ عَلَى صَفْوَانٍ**. قَالَ عَلِيٌّ، وَقَالَ غَيْرُهُ: صَفْوَانٍ، يَنْفُذُهُمْ ذلِكَ. **فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ، قالُوا: ماذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قالُوا لِلَّذِي قَالَ: الْحَقَّ، وَهْوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ. فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ، وَمُسْتَرِقُو السَّمْعِ هكَذَا وَاحِدٌ فَوْقَ آخَرَ**. وَوَصَفَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ وَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدِهِ الْيُمْنى، نَصَبَهَا بَعْضَهَا فَوْقَ بَعْضٍ. **فَرُبَّمَا أَدْرَكَ الشِّهَابُ الْمُسْتَمِعَ قَبْلَ أَنْ يَرْمِيَ بِهَا إِلَى صَاحِبِهِ فَيُحْرِقَهُ، وَرُبَّمَا لَمْ يُدْرِكْهُ حَتَّى يَرْمِيَ بِهَا إِلَى الَّذِي يَلِيهِ، إِلَى الَّذِي هُوَ أَسْفَلُ مِنْهُ، حَتَّى يُلْقُوهَا إِلَى الأَرْضِ**. وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: **حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى الأَرْضِ. فَتُلْقى عَلَى فَمِ السَّاحِرِ، فَيَكْذِبُ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ، فَيُصَدَّقُ فَيَقُولُونَ: أَلَمْ يُخْبِرْنَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، يَكُونُ كَذَا وَكَذَا، فَوَجَدْنَاهُ حَقّاً؟ لِلْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ**). [خ٤٧٠١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دگەهینیتە پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**ئەگەر خودێ فەرمانەك دا، ملیاکەت پەرێت خۆ ژ گوهدارییێ لێك ددەن، و گۆتنا خودێ وەکی دەنگێ رستکا ئاسنی ل بەرێ حولی ددەن، و عەلییێ کورێ عەبدوللایی و غەیری وی گۆت، بەرێ حولی، ب ڤێ فەرمان دگەهیتە ملیاکەتان، ڤێجا ئەگەر** ﴿فُزِّعَ عن قُلُوبِهِمْ قالوا مَاذَا قال رَبُّكُمْ﴾ **کاڤا ترس ل سەر دلێ وان نەما دێ بێژنە ئێکدو: خودایێ هەوە چ گۆت، دێ بێژنە وی یێ**

**گۆتی: ﴿الْحَقَّ وهو الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ هەقی گۆت و ئەوە یێ بلند و مەزن. ڤێجا دزیكەرێت گوهدارییێ دێ گوه لێ بن و دزیكەرێت گوهدارییێ د هۆسانە ئێك یێ د سەر ئێكیدا)، و** سوفیانی ب دەستێ خۆ دیار كر و د ناڤبەرا تلێت خۆ ژێكڤەكرن و تلێت خۆ دانان هندەك ل سەر هندەكان (**ڤێجا دبیت بزۆت ب گوهدێری بكەڤیت بەری ئەو بگەهینیتە هەڤالێ خۆ و وی بسۆژیت، و دبیت نەگەهیتێ هەتا ئەو بگەهینیتە یێ نێزیكی خۆ ئەوێ د بن ویدا، هەتا دگەهیننە عەردی، و دبیت سوفیانی گۆت: هەتا ل عەردی ب دویماهی دهێت، ڤێجا دێ هاڤێژنە سەر دەڤێ سێربەندی، و ئەو دێ سەد درەوان د گەل كەت، و دێ باوەر ژێ هێتە كرن، و دێ بێژن: ما تە فلان و فلان رۆژێ نەگۆتبوو مە فلان تشت و فلان تشت دێ چێ بیت، مە دیت راستە (و هەمی ئاخفتنێت وی دێ دورست ددانن) ژ بەر وێ پەیڤا ژ ئەسمانی هاتییە گوهلێبوون).**

٦٧٨ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّهُمْ بَيْنَمَا هُمْ جُلُوسٌ لَيْلَةً مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) رُمِيَ بِنَجْمٍ فَاسْتَنَارَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَاذَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، إِذَا رُمِيَ بِمِثْلِ هَذَا**) ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، كُنَّا نَقُولُ: وُلِدَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ عَظِيمٌ، وَمَاتَ رَجُلٌ عَظِيمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَإِنَّهَا لاَ يُرْمَى بِهَا لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنْ رَبُّنَا . تَبَارَكَ وَتَعَالَى اسْمُهُ . إِذَا قَضَى أَمْراً سَبَّحَ حَمَلَةُ الْعَرْشِ، ثُمَّ سَبَّحَ أَهْلُ السَّمَاءِ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، حَتَّى يَبْلُغَ التَّسْبِيحُ أَهْلَ هَذِهِ السَّمَاءِ الدُّنْيَا. ثُمَّ قَالَ الَّذِينَ يَلُونَ حَمَلَةَ الْعَرْشِ لِحَمَلَةِ الْعَرْشِ: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ فَيُخْبِرُونَهُمْ مَاذَا قَالَ. قَالَ: فَيَسْتَخْبِرُ بَعْضُ أَهْلِ السَّمَاوَاتِ بَعْضاً، حَتَّى يَبْلُغَ الْخَبَرُ هَذِهِ السَّمَاءَ الدُّنْيَا، فَتَخْطَفُ الْجِنُّ السَّمْعَ، فَيَقْذِفُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ، وَيُرْمَوْنَ بِهِ، فَمَا جَاؤُوا بِهِ عَلَى وَجْهِهِ فَهُوَ حَقٌّ، وَلَكِنَّهُمْ يَقْرِفُونَ فِيهِ وَيَزِيدُونَ**). [م٢٢٢٩].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەكی ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) ژ ئەنسارییان گۆتە من: د دەمەكیدا ئەو ب شەڤ ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د روینشتی بوون، ستێرەك رشت، ئینا رۆن بوو و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)**

گۆتە وان: **(بەری ئیسلامەتییێ هەو چ دگۆت ئەگەر وەکی ڤێ ڕشتبا)؟** گۆتن: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، مە دگۆت: ئەڤ شەڤە زەلامەکێ مەزن ژ دایك بوو، و زەلامەکێ مەزن مر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب ڕاستی ئەڤە بۆ مرنا ئێکی یان بۆ ژیانا ئێکی نارشن ، بەلێ خودایێ مە یێ هەر پاك و ناڤێ وی بلند ئەگەر فەرمانەك دا ملیاکەتێت هەلگرێت عەرشی دبێژن (سبحان الله) پاشی خەلکێ عەسمانێ دویڤ وانڕا ژی دبێژن (سبحان الله) هەتا تەسبیح گۆتن دگەهیتە خلکێ عەسمانێ دنیایێ، پاشی ئەوێت نێزیکی هەلگرێت عەرشی دێ بێژن: خودایێ هەوە چ فەرمان دا؟ دێ بێژنە وان کا چ گۆت، ڤێجا هندەك خەلکێ عەسمانان دێ داخوازا هندەکێت دی کەن کا خودێ چ فەرمان دا هەتا ئەو فەرمان دگەهیتە ڤی عەسمانێ دنیایێ، ئەجنە دێ دزن و بۆ هەڤالێت خۆ هاڤێژن و دێ وان بزۆتا هاڤێژنە وان ڤێجا یا وەکی وێ یا گوهـ لێ بووی گۆت ئەو ڕاستییە بەلێ ئەو درەوێ د گەل تێکەل دکەن و ل سەر زێدە دکەن).**

٦٧٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مسعود قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا تَكَلَّمَ اللهُ بِالْوَحْيِ، سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا، فَيُصْعَقُونَ، فَلاَ يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ، حَتَّى إِذَا جَاءَهُمْ جِبْرِيلُ؛ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ). قَالَ: (فَيَقُولُونَ: يَا جِبْرِيلُ مَاذَا قَالَ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: الْحَقَّ، فَيَقُولُونَ: الْحَقَّ، الْحَقَّ). [د٤٧٣٨].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (ڕضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر خودێ ب وەحییێ ئاخفت، خەلکێ عەسمانی دێ ژ عەسمانی دەنگێ کەتنا ئاسنی ل سەرێك وەکی دەنگێ زنجیرا ئاسنی د سەر بەرێ حولیڕا بکێشن گوهـ لێ بن، ڤێجا دێ گێژ بن و وەسا دێ مینن هەتا جبریل دهێتە دەڤ وان، و ئەگەر جبریل هاتە دەڤ وان ترس ل سەر دلێ وان دچیت)**، گۆت: **(دێ بێژن: ئەی جبریل خودایێ تە چ گۆت؛ دێ بێژیت ڕاستی گۆت، دێ بێژن ئاخفتنا خودایێ تە ڕاستییە و ڕاستییە).**

قوله تعالى: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ﴾ [١٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب راستی ئەم دزانین كی ژ هەوە پێش دكەڤیت.**

٦٨٠ – عن ابن عباس قَالَ: كانت امرأةٌ تصلِّي خلفَ رسولِ اللَّهِ (ﷺ)، حسناءُ من أحسنِ النَّاسِ، فَكانَ بعضُ القومِ يتقدَّمُ في الصَّفِّ الأوَّلِ، لئلَّا يَراها، ويستأخِرُ بعضُهُم حتَّى يَكونَ في الصَّفِّ المؤخَّرِ، فإذا رَكَعَ نظرَ من تحتِ إبطِهِ، فأنزلَ اللَّهُ ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ﴾[١] [٢]. [ت٣١٢٢/ ن٨٦٥/ جه١٠٤٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەكێ نڤێژ پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكر و یا جوان بوو و ژ هەمی خەلكی جوانتر بوو، ڤێجا هندەك كەس پێش دكەفتنە رێزا ئێكێ دا نەبینن، و هندەك ڤەدمان هەتا كەتبانە رێزا دویماهییێ، ڤێجا ئەگەر چۆبا ركوعێ د بن كەفشێ خۆرا بەرێ خۆ ددایێ، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنْكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ﴾[٣].**

---

**(١) ئەڤ فەرمووده نەلێكییەك یا ل سەر دورستییا وێ هەی، ئیبن كەسیر د تەفسیرا خۆدا ئیشارەت كرییە لاوازییا وێ و ترمزی دبێژت: یا دورستتر ئەڤە ئاخفتنا ئەبی جەوزائە نە یا ئیبن عەباسی.**

**(٢) شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینایە:** ٦٨٠ – عن ابن عباس رضي الله عنهما في قوله عزّ وجل: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ قال: أما ترى الرجل يرسل بخاتمه إلى أهله، فيقول هاتوا كذا وكذا، فإذا رأوه عرفوا أنه حق. [ك٣٣٥٠].

* قال الذهبي: صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ هەردویان رازی بیت) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ گۆت: تو نابینی زەلام گوستیركا خۆ بۆ مالا خۆ فرێدكەت و دبێژیت فلان تشتی و فلان تشتی بینن و ئەگەر وان گوستیرك دیت دزانن ئەو راستییە.**

(٣) **ئەم دزانین كی ژ هەوە پێش دكەڤیت و كی پاش دكەڤیت.**

قوله تعالى: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴾ [٧٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڕاستی ئەڤ ڕویدانێت هەنێ ئایەت و نیشانن بۆ كەسێت هشیار و شارەزا.**

٦٨١ – عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدريّ قَالَ: قَالَ رسولُ اللهِ (ﷺ): (**اتَّقوا فِراسةَ المؤمنِ، فإنَّه ينظرُ بنورِ اللهِ**)، ثم قرأ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ﴾.		[ت٣١٢٧].

* ضعيف.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خۆ ژ بەرێخۆدانا دلی یا باوەریداری بپارێزن ب ڕاستی ئەو ب چاڤێ دلێ خۆ یێ خودێ ڕۆن كری بەرێخۆدانێ دكەت). پاشی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿إِنَّ فِي ذلك لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾**[1].

قوله تعالى: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ﴾ [٨٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و مە حەفت ئایەتێت هەر دئێنە دوبارەكرن ﴿كو فاتیحەیە﴾، و قورئانا مەزن یێت داینە تە.**

٦٨٢ - عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**مَا أَنْزَلَ اللهُ فِي التَّوْرَاةِ، وَلاَ فِي الإِنْجِيلِ، مِثْلَ أُمِّ الْقُرْآنِ، وَهِيَ: السَّبْعُ الْمَثَانِي، وَهِيَ مَقْسُومَةٌ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ**).

[ت٣١٢٥/ ن٩١٣/ مي٣٤١٥].

* صحيح.

**ژ ئوبەیێ كوڕێ كەعبی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خودێ نە د تەوراتێدا و نە د ئنجیلێدا وەكی فاتحێ نەئینایە خوارێ و ئەو حەفت ئایەتن یێت دهێنە**

[1] ب ڕاستی دڤێ چەندێدا نیشان هەنە بۆ كەسێت ب دلی بەرێخۆدانێ دكەن.

**دوبارەکرن و ئەو یا د ناڤبەرا من و بەندەیێ مندا لێکڤەکرییە[1]، و بەندەیێ من چ بخوازیت بۆ وییە).**

٦٨٣ - عن ابن عباس رضي الله عنهما في قوله عزّ وجل: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ۝٨٧﴾. قال: البقرة، وآل عمران، والنساء، والمائدة، والأنعام، والأعراف، وسورة الكهف. [ك٣٣٥٣].

* قال الذهبي: على شرطهما.

[وانظر: ٥٦٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ﴾ گۆت: بەقەرەیە و ئالیعیمرانە و مائیدەیە و ئەنعامە و ئەعرافە و سۆرەتا کەهفە.**

قوله تعالى: ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴾ [۝٩١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەو خودان کتێبن (جوهی و فەلەنە) قورئان پارچە پارچە کرین،(باوەرییێ ب هندەکێ دئینن، و ژ هندەکێ بێ باوەرن).**

٦٨٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ۝٩١﴾. قَالَ: هُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، جَزَّؤُوهُ أَجْزَاءً، فَآمَنُوا بِبَعْضِهِ وَكَفَرُوا بِبَعْضِهِ. [خ٤٧٠٥، (٣٩٤٥)]

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا : ﴿الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ﴾ گۆت: ئەو خودان کتێبن (جوهی و فەلەنە) قورئان پارچە پارچە کر، باوەرییێ ب هندەکێ دئینن، و ژ هندەکێ بێ باوەرن.**

---

[1] نیڤا وێ پەسنێت خودێنە و نیڤا دی داخوازییێت بەندەینە.

(١٦)

سورة النحل.

**سۆرەتا نەحل.**

قوله تعالى: ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ﴾ [١٢٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر هەوە تۆلڤەكرن ڤیا ڤێجا هندی (تەمەتی) ئەوا ب سەرێ هەوە هاتی تۆلێ بستینن.**

٦٨٥ - عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ، أُصِيبَ مِنَ الْأَنْصَارِ أَرْبَعَةٌ وَسِتُّونَ رَجُلاً، وَمِنَ الْمُهَاجِرِينَ سِتَّةٌ مِنْهُم حَمْزَةُ، فَمَثَّلُوا بِهِمْ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: لَئِنْ أَصَبْنَا مِنْهُمْ يَوْماً مِثْلَ هَذَا لَنُرْبِيَنَّ عَلَيْهِمْ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تعالى: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾ [١٢٦] فَقَالَ رَجُلٌ: لاَ قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**كُفُّوا عَنِ الْقَوْمِ؛ إِلاَّ أَرْبَعَةً**). [ت٣١٢٩].

* حسن صحيح الإسناد.

**ژ ئوبەیێ كورێ كەعبی (رضي الله عنه) گۆت: ل شەرێ ئوحودێ شێست و چار زەلام ژ ئەنساران شەهید بوون و شەش ژ مشەختییان و حەمزە ژ وان بوو (و قورەیشییان) ئەو كرێت كربوون (ئەندامێت وان ژێڤەكربوون) ئەنساران گۆت: ئەگەر رۆژەكا وەكی ئەڤرۆ ئەم ب سەر وان كەفتین ئەم دێ پتر ژ كوشتییێت وان كرێت كەین، ڤێجا دەمێ رۆژا ڤەكرنا مەكەهێ خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ ما عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ﴾ زەلامەكی گۆت: پشتی ئەڤرۆ قورەیشی نینە ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەلكی بهێلن چار تێ نەبن)[1].**

---

[1] نانكو: دەستێ خۆ نە كەنە كەسێ هەمی یێت نێمن چوار كەس نەبن ئەو ژی ئەڤەنە: عیكریمەیێ كورێ ئەبی جەهلی و عەبدوللاهێ كورێ خەنزەلەیی و موقەیسێ كورێ سەبابەیی و عەبدوللاهێ كورێ سەعدییێ كەرێ ئەبی سەرحی.

(١٧)

## سورة الإسراء

## سۆرەتا ئیسراء.

قوله تعالى: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا ﴾ [الإسرا:١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژە، ئەوێ بەندەیێ خۆ د شەڤەكێدا ژ مزگەفتا مەسجدولحەرام بۆ مزگەفتا ئەقسا (كو قودسە) ب شەڤ بری.**

[أنظر: باب الإسراء والمعراج في السيرة].

٦٨٦ - عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: قُلْتُ لِحُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ: أَصَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: أَنْتَ تَقُولُ ذلِكَ يَا أَصْلَعُ! بِمَ تَقُولُ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: بِالْقُرْآنِ بَيْنِي وَبَيْنَكَ الْقُرْآنُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: مَنِ احْتَجَّ بِالْقُرْآنِ فَقَدْ فَلَجَ. قَالَ سُفْيَانُ: يَقُولُ: فَقَدِ احْتَجَّ، وَرُبَّمَا قَالَ: قَدْ أَفْلَجَ. فَقَالَ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا﴾ قَالَ: أَفَتَرَاهُ صَلَّى فِيهِ؟ قُلْتُ: لاَ. قال: لَوْ صَلَّى فيهِ، لَكُتِبَتْ عَلَيْكُمْ فيهِ الصَّلاَةُ كَمَا كُتِبَتِ الصَّلاَةُ فِي المسْجِدِ الحَرَامِ.

قَالَ حُذَيْفَةُ: قد أُتِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِدَابَّةٍ طَوِيلَةِ الظَّهْرِ مَمْدُودَةٍ هَكَذَا، خَطْوُهُ مَدُّ بَصَرِهِ، فَمَا زَايَلاَ ظَهْرَ الْبُرَاقِ حَتَّى رَأَيَا الْجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَوَعْدَ الْآخِرَةِ أَجْمَعَ، ثُمَّ رَجَعَا عَوْدَهُمَا عَلَى بَدْئِهِمَا. قَالَ: وَيَتَحَدَّثُونَ أَنَّهُ رَبَطَهُ، لِمَ؟ أَيَفِرُّ مِنْهُ، وَإِنَّمَا سَخَّرَهُ لَهُ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ. [ت٣١٤٧].

* حسن الإسناد.

**ژ زوڕێ كوڕێ حوبەیشی (ﷺ) گۆت: من گۆتە حوزەیفەیێ یەمانی، ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل قودسێ كرییە؟ گۆت: نەخێر، من گۆت: بەلێ، گۆت: تو ڤێ دبێژی هەی سەرحۆچ تو ڤێ ب چ دبێژی؟ من گۆت: ب قورئانێ و قورئان یا د ناڤبەرا من و تەدا، ئینا حوزەیفەی گۆت: یێ قورئانێ بكەتە بەلگە ب راستی ئەو. سوفیانی گۆت:**

دبێژیت: ئەو سەركەفت و دبیت گۆتبیت، سەرفەراز بوو ئینا گۆت: ﴿سُبْحَانَ الذي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا من الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إلى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى﴾ گۆت: ما تو د ڤێ ئایەتێدا دبینی نڤێژ ل وێرێ كربیت، من گۆت. نەخێر، گۆت: ئەگەر نڤێژ ل وێرێ كربا دا ل سەر هەوە هێتە نڤیسین، هەروەكی نڤێژكرن ل كەعبەیێ ل سەر هەوە هاتییە نڤیسین، حوزیفەی گۆت: دەوارەك بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا، پشتا وی یا درێژ و كێشای بوو، هۆسا پێنگاڤا وێ هند بوو هندی چاڤێ وێ قەترە دكر، و هەردو مانە ل سەر پشتا وێ هەتا بلندبووینە عەسمانان و بەحەشت و جەهنەم و ژڤانا ئاخرەتێ دیتین، پاشی د رێكا خۆ یا دەستپێكرنێڕا زڤرینەڤە و گۆت: دبێژن وی بوراق گرێدابوو، بۆچی؟ ما دێ رەڤیت؟ نێ زانایێ تشتێ بەرچاڤ و یێ نەبەرچاڤ ئەو یێ بۆ سەرنەرم كری.

قوله تعالى: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا ﴾ [١٦]

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر مە ڤیا ئەم خەلكێ گوندەكی د هیلاك ببەین، ئەم دێ فەرمانێ ب گوهداری و تاعەتی دەینە دەولەمەند و سەركار و سەرومەرێت وان.**

٦٨٧ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: كُنَّا نَقُولُ لِلْحَيِّ إِذَا كَثُرُوا فِي الجَاهِلِيَّةِ: أَمِرَ بَنُو فُلاَنٍ. [خ٤٧١١].

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: بەری ئیسلامەتییێ مە دگۆتە وێ عەشیرەتێ یا بۆش و زێدە بووین فلان عەشیرەت یێت زێدەبووین. (ئانكو رامان (أمر) زێدەبوونە).

قوله تعالى: ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ ﴾ [٥٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: چو تشت نەبوو رێگر ئەم موعجیزەیان هەرومكی خەلكێ مەكەهێ ژ تە دخوازن كو تو سەفایێ بۆ بكەیە زێر و چیایێت مەكەهێ ژ وان دویربێخی بهنێرین.**

٦٨٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ (ﷺ) أَنْ يَجْعَلَ لَهُمُ الصَّفَا ذَهَباً، وَأَنْ يُنَحِّيَ الْجِبَالَ عَنْهُمْ فَيَزْدَرِعُوا، فَقِيلَ لَهُ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تَسْتَأْنِيَ بِهِمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُؤْتِيَهُمُ الَّذِي سَأَلُوا، فَإِنْ كَفَرُوا أُهْلِكُوا كَمَا أَهْلَكْتُ مَنْ قَبْلَهُمْ، قَالَ: (**لاَ، بَلْ أَسْتَأْنِي بِهِمْ**)، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ﴾. [حم٢٣٣٣].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خەلکێ مەکەهێ داخواز ژ پێغەمبەری (ﷺ) کرن، ئەو چیایێ سەفایێ بۆ وان بکەتە زێر، و چیایان ژ وان دویر بێخیت دا کێلان و چاندنێ بکەن، گۆتێ: ئەگەر تە بڤێت بێهنا خۆ ل وان فرەهکە و یێ نەرمبە و ئەگەر تە بڤێت ژی وێ بدەیێ یا وان داخواز کری، بەلێ ئەگەر باوەری نەئینان دێ ژ ناڤ چن، هەروەکی من یێت بەری وان ژ ناڤ برین، گۆت: (بەلکی دێ نەرمبم د گەل وان)، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ: ﴿وما مَنَعَنَا أَنْ نُرْسِلَ بِالآيَاتِ إِلاَّ أَنْ كَذَّبَ بِهَا الأَوَّلُونَ وَآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً﴾.**

قوله تعالى: ﴿نَافِلَةً لَّكَ﴾ [٧٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: كرنا شەڤنڤێژان فەرزەكا زێدەیە و بۆ تە ب تنێیە.**

٦٨٩ - عَنْ أبي أمامة، ﴿نَافِلَةً لَّكَ﴾ قال: إنَّما كانتِ النَّافلةُ خاصَّةً لرسولِ اللهِ (ﷺ)[1]. [حم٢٢٢١٠].

- وفي رواية: كانتْ للنَّبيِّ (ﷺ) نافلةً، ولكم فَضيلةً. [حم٢٢٢٣٠]

* إسناده ضعيف.

**ژ ئەبی ئومامەی (رضي الله عنه) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿نَافِلَةً لَّكَ﴾ گۆت: ئەو فەرزەكا زێدەبوو ل سەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب تنێ.**

- **و د ڤەگێرەكا دیدا: شەڤنڤێژ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) فەرزەكا زێدەبوو و بۆ هەوە سونەتە.**

قوله تعالى: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾ [٧٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: دا خودایێ تە ب وان نڤێژان تە بگەهینیتە جهێ پەسنكری (ئەو جهێ سوپاسیا تە تێدا دئێتە كرن رۆژا مەهدەرا مەزن دكەی).**

٦٩٠ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: إنَّ النَّاسَ يَصِيرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ جُثاً، كُلُّ أُمَّةٍ تَتْبَعُ نَبِيَّهَا يَقُولُونَ: يَا فُلاَنُ اشْفَعْ، يَا فُلاَنُ اشْفَعْ، حَتَّى تَنْتَهِيَ الشَّفَاعَةُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَذلِكَ يَوْمَ يَبْعَثُهُ اللهُ المَقَامَ الْمَحْمُودَ. [خ٤٧١٨ (١٤٧٥)].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: رۆژا قیامەتێ خەلك دێ بنە كۆم كۆم و هەر ئوممەتەك دێ د گەل پێغەمبەرێ خۆ بیت، و دێ بێژن: فلان مەهدەرێ**

---

[1] **شێخ سالحی نەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینایە:** ٦٨٩ - عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِع: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ دُلُوكُ الشَّمْسِ: مَيْلُهَا. [ط١٩]

* إسناده صحيح.

**ژ مالكی (رحمه الله) ژ نافعی كو عەبدوللایێ كورێ عومەری د (دُلُوكُ الشَّمْسِ)دا دگۆت: خواربوونا وێیە.**

**(بەرەڤانییێ) بکە، ئەی فلان مەهدەرێ بکە، هەتا مەهدەر دگەهیتە پێغەمبەری (ﷺ) ئها ئەو رۆژ ئەوە یا خودێ وی دگەهینیتە جهێ پەسنکری (ئەو جهێ سوپاسیا وی تێدا دئێتە کرن ئەو ڕۆژا ئەو مەهدەرا مەزن تێدا دکەت).**

قوله تعالى: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ﴾ [٨٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: بێژە: خودێوۆ هەر کاروبارەکێ هەبیت ب ڕەنگەکی تو پێ ڕازی، ب من بدە کرن و من بکە د ناڤدا.**

٦٩١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِمَكَّةَ، ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ، فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا﴿٨٠﴾﴾.

[ت٣١٣٩].

* ضعيف الإسناد، قال الترمذي: حسن صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ل مەکەهێ بوو پاشی فەرمانا وی ب مشەختبوونێ هاتە کرن ڤێجا ئەڤە ل سەر هاتە خوارێ: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي من لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا﴾.**

قوله تعالى: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾ [٨٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو پرسیارا ڕحێ ژ تە دکەن کا چییە؟**

٦٩٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: بَيْنَا أَنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي حَرْثٍ، وَهْوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ، إِذْ مَرَّ الْيَهُودُ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ؟ فَقَالَ: ما رَابَكُمْ إِلَيْهِ؟ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ يَسْتَقْبِلُكُمْ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ، فَقَالوا: سَلُوهُ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَأَمْسَكَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِمْ شَيْئاً، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحى إِلَيْهِ، فَقُمْتُ مَقَامِي، فَلَمَّا نَزَلَ الْوَحْيُ قَالَ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴿٨٥﴾﴾.

[خ٤٧٢١ (١٢٥)/ م٢٧٩٤].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: د دەمەکیدا ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووم ل جهەکێ شینکاتی و داروبار و وی خۆ ددا سەر دارێ بەلگەکێ دارقەسپێ، مە هند دیت جوهی بۆرین، هندەکان گۆتنە هندەکان، پرسیارا ڕحێ ژێ بکەن کا چییە؟ ئێکی گۆت: ما چ هەوجەیە هوین پرسیار ژێ بکەن، یان چ هوین د ویدا ب گۆمان ئێخستینە هەتا هوین پرسیار ژێ بکەن؟ و هندەکان گۆت: پرسیار ژێ نەکەن دا تشتەکی نەبێژیتە هەوە و هەوە نەڤێت، ئینا گۆتن: پرسیارا ڕحێ ژێ بکەن کا چییە؟ ئینا پرسیار ژێ کرن پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو و بەرسڤا وان نەدا من زانی وەحی یا بۆ دهێت ئینا ئەز ژ جهێ خۆ رابووم (رێزگرتن بۆ وی دەمێ وەحی بۆ دهێت) ڤێجا دەمێ وەحی بۆ هاتی گۆت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عن الرُّوحِ قُلْ الرُّوحُ من أَمْرِ رَبِّي وما أُوتِيتُمْ من الْعِلْمِ إلا قَلِيلًا﴾[1].

قوله تعالى: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ﴾ [١٠١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ب ڕاستی مە نەهـ موعجیزەیێت ئاشکەرا دانە مووسایی.**

٦٩٣ - عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ: أَنَّ يَهُودِيَّيْنِ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى هَذَا النَّبِيِّ نَسْأَلُهُ، فَقَالَ: لاَ تَقُلْ: نَبِيٌّ، فَإِنَّهُ إِنْ سَمِعَهَا تَقُولُ نَبِيٌّ، كَانَتْ لَهُ أَرْبَعَةُ أَعْيُنٍ، فَأَتَيَا النَّبِيَّ (ﷺ) فَسَأَلاَهُ عَنْ قَوْلِ اللهِ عزّ وجل: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ﴾. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَسْحَرُوا، وَلاَ تَمْشُوا بِبَرِيءٍ إِلَى سُلْطَانٍ فَيَقْتُلَهُ، وَلاَ تَأْكُلُوا الرِّبَا، وَلاَ تَقْذِفُوا مُحْصَنَةً، وَلاَ تَفِرُّوا مِنَ الزَّحْفِ**. شَكَّ شُعْبَةُ. **وَعَلَيْكُمْ يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ خَاصَّةً: لاَ تَعْدُوا فِي السَّبْتِ**)، فَقَبَّلاَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ، وَقَالاَ: نَشْهَدُ أَنَّكَ نَبِيٌّ. قَالَ: (**فَمَا يَمْنَعُكُمَا أَنْ تُسْلِمَا**) ؟ قَالاَ: إِنَّ دَاوُدَ دَعَا اللهَ أَنْ لاَ يَزَالَ فِي ذُرِّيَّتِهِ نَبِيٌّ، وَإِنَّا نَخَافُ إِنْ أَسْلَمْنَا أَنْ تَقْتُلَنَا الْيَهُودُ. [ت٢٧٣٣/ ن٤٠٨٩/ جه٣٧٠٥].

* ضعيف، قال الترمذي: حسن صحيح.

---

(١) رامان ب کورتی: و ئەو پرسیارا ڕحێ ژ تە دکەن کا چیە؟ بێژە: ڕح ژ کارێ خودایێ منە (نانکو نەو ب تنێ و ب دورستی دزانیت کا چییە)، و ژ کێمەکا زانینێ پێڤەتر بۆ هەوە نەهاتییە دان.

ژ سەفوانێ كورێ عەسسالی، (رضي الله عنه) گۆت: دو جوهییان ئێكی ژ وان گۆتە هەڤالێ خۆ مە ببە دەڤ پێغەمبەری پرسیارێ ژێ بكەین، ئینا گۆتێ: نەبێژە پێغەمبەری چونكی ئەگەر وی گوهـ لێ ببیت تو دبێژی پێغەمبەری دێ ب چار چاڤ كەڤیت، ئینا هاتنە دەڤ و پرسیارا گۆتنا خودێ ژێ كرن: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چو تشتا بۆ خودێ نەكەنە شریك، و زنایێ نەكەن، و كەسێ خودێ حەرامكری بهێتە كوشتن، نەكوژن ب حەقییێ نەبیت (وەك قیساس) و دزییێ نەكەن، و سێربەندییێ نەكەن، و مرۆڤێ بێ گونەهـ نەبەنە دەڤ حاكمداری بكوژیت، و رۆژا شەمبێ د گەل گاوران نەرەڤن، - گۆمان بۆ شوعبەی دورست بوو - و تایبەت بۆ هەوە گەلی جوهییان شەمبییێ زێدەگاڤییێ نەكەن)** ئینا دەست و پێت وی ماچیكرن، و گۆتن: ئەم شەهدەیێ ددەین تو پێغەمبەری، گۆت: **(پا چ رێگرە هوین موسلمان نەبن)؟** گۆتن: ب راستی داوودی یا داخواز كری بەردەوام پێغەمبەر د دویندەها ویدا هەبن، و ب راستی ئەم دترسین ئەگەر موسلمان ببین جوهی مە بكوژن.

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴾ [١١٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و تو نڤێژا خۆ ب دەنگێ بلند نەكە و د دلێ خۆدا ژی نەكە (كو كەسێ گوهـ ل دەنگێ تە نەبیت).**

٦٩٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾. قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، كانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالقُرْآنِ، فَإِذَا سَمِعَهُ المشْرِكُونَ سَبُّوا القُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جاءَ بِهِ، فقَالَ اللهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ (ﷺ): ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾؛ أَيْ: بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ المشْرِكُونَ فَيَسُبُّوا القُرْآنَ، ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ عَنْ أَصْحَابِكَ فَلاَ تُسْمِعُهُمْ ﴿وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾. [خ٤٧٢٢/ م٤٤٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿ولا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ولا تُخَافِتْ بِهَا﴾ گۆت: ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ ڤەشارتی بوو ل مەکەهێ ئەو دەمێ نڤێژ ب هەڤالێت خۆ دکرن دەنگێ خۆ ب قورئانێ بلند کر. ڤێجا ئەگەر موشرکان گوه لێ دبوو خەبەر دگۆتنە قورئانێ و یێ ئینایە خوارێ و پێ هاتی، ئینا خودایێ مەزن گۆتە پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) ﴿ولا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾ ئانکو دەنگێ خۆ ب خواندنا خۆ بلند نەکە، ئەگەر دێ موشرکان گوه لێ بیت و خەبەران بێژنێ ﴿ولا تُخَافِتْ بِهَا﴾ و د دلێ خۆدا ژی نەکە و ڤەشێری ژ هەڤالێت خۆ ڤێجا گوه لێ نەبن ﴿وَابْتَغِ بين ذلك سَبِيلًا﴾. و رێکەکێ بگرە د ناڤبەرا هەردوکاندا بیت.**

٦٩٥ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: أُنْزِلَ ذلِكَ فِي الدُّعاءِ. [خ٤٧٢٣/ م٤٤٧].

**عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەڤ ئایەتە د راستا دوعایێدا یا هاتییە خوارێ، (ئانکو دڤێت دوعا نە زێدە ب دەنگێ بلند بهێنە کرن و نە د دلدا و دڤێت ب دەنگەکێ ناڤنجی بهێنە کرن).**

## (١٨)

### سورة الكهف.

### سۆرەتا كەهف.

قوله تعالى: ﴿ قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ﴾ [١٠٣].

**گۆتنا خودايێ مەزن: بێژە: ئەرێ بێژمە هەوە گەلی مرۆڤان كا كی ژ هەمییان پتر د كریارێت خۆدا د خوسارەتن؟**

٦٩٦ - (خ) عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبِي: ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ١٠٣﴾. هُمُ الحَرُورِيَّةُ؟ قَالَ: لاَ، هُمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، أَمَّا الْيَهُودُ: فَكَذَّبُوا مُحَمَّداً (ﷺ)، وَأَمَّا النَّصَارَى: كَفَرُوا بِالجَنَّةِ وَقالُوا: لاَ طَعَامَ فِيهَا وَلاَ شَرَابَ، وَالحَرُورِيَّةُ: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ﴾ [البقرة:٢٧]. وَكانَ سَعْدٌ يُسَمِّيهِمُ: الْفَاسِقِينَ. [خ٤٧٢٨].

**ژ موسعەبێ كورێ سەعەدی (رضي الله عنه) گۆت من پرسیار ژ بابێ خۆ كر ژ گۆتنا خودێ ﴿قُلْ هل نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا﴾ بەحسێ حەرورییانە[1] گۆت: نە ئەو جوهی و فەلەنە، هندیكە جوهینە وان پێغەمبەر (ﷺ) درەوین دانا، و هندیكە فەلەنە وان باوەری ب بەحەشتێ نەئینا و گۆتن: نە خوارن نە ڤەخوارن تێدا نینە، و حەروری ئەون یێت خودێ د دەرحقیدا گۆتی: ﴿الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ من بَعْدِ مِيثَاقِهِ﴾[2] و سەعەدی ب ژ رێدەركەفتییان ب ناڤ دكرن.**

---

(١) حەروری ب ناڤێ گوندێ حەروره هاتینە ناڤكرن، و ئەو ئەو گوندە یێ جارا ئێكێ رێدەركەفتی ل سەر فەرمانا ئیمام عەلی و دژی وی دەركەفتین كو دبێژنێ خەوارج.

(٢) ئەو ژ رێدەركەڤتییێت پەیمانا خودێ پشتی موكومكرنێ دشكێنن.

قوله تعالى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ﴾ [١٠٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەڤە ئەون ئەوێت باوەری ب نیشان و بەرهەمبەربوونا خودێ نەئینایین، ڤێجا ژ بەر هندێ کار و کریارێت وان پویچ بوون.**

٦٩٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَقَالَ: اقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ:** ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا﴾). [خ٤٧٢٩/ م٢٧٨٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی زەلامێ قەلەوێ کەلەخ مەزن (یێ گونەهکار) رۆژا قیامەتێ دێ هێت و ل دەڤ خودێ تەمەت پەرێ پێشییەکێ نینە، و گۆت: بخوینن ئەگەر هەوە بڤێت: ﴿فلا نُقِيمُ لهم يوم الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾)[1].**

---

(١) رۆژا قیامەتێ ئەم چو قەدر و قیمەتی بۆ وان نادانین.

(١٩)

سورة مريم

**سۆرەتا مەریەم.**

قوله تعالى: ﴿ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴾ [٥٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و مە ئەو هلدا جهەكێ بلند.**

٦٩٨ - عَنْ قَتَادَةَ فِي قَوْلِهِ: ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لَمَّا عُرِجَ بِي رَأَيْتُ إِدْرِيسَ فِي السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ). [ت٣١٥٧].

* صحيح.

**ژ قەتادەیی د گۆتنا خودێدا ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ گۆت: ئەنەسێ كورێ مالكی بۆ مە گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمێ ئەز بریمە عەسمانان من ئدریس ل عەسمانێ چارێ دیت).**

قوله تعالى: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ﴾ [٦٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەم ملیاكەت نائێینە خوارێ ئەگەر ب ئەمرێ خودایێ تە و ب دەستوورا وی نەبیت.**

٦٩٩ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (يَا جِبْرِيلُ ما يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا)، فَنَزَلَتْ: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَ: كَانَ هَذَا الجَوَابَ لِمُحَمَّدٍ (ﷺ). [خ٧٤٥٥، (٣٢١٨)].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە جبریلی: (ئەی جبریل چ ناهێلیت سەرەدانا مە بكەی پتر ژ ڤێ سەرەدانا تو بۆ مە دكەی)؟ ئەڤ ئایەتە**

**هاتە خوارێ: ﴿وما نَتَنَزَّلُ إلا بِأَمْرِ رَبِّكَ له ما بين أَيْدِينَا وما خَلْفَنَا﴾ هەتا دویماهیکا ئایەتێ[1] و ئەڤە بەرسڤا جبریلی بوو بۆ موحەممەدی (ﷺ).**

قوله تعالى: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾ [٧١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و کەس ژ هەوە نینە د سەرڕا (د سەر دۆژەهێڕا) نەچیت (خودان باوەر دێ د سەرڕا بۆرنە بەحەشتێ، و گاور دێ کەڤنە تێدا).**

٧٠٠ – عن مُرَّةَ الْهَمْدَانِيِّ في قَوْلِهِ تعالى: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ عن عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ، ثُمَّ يَصْدُرُونَ عَنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ، فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ الْبَرْقِ، ثُمَّ كَالرِّيحِ، ثُمَّ كَحُضْرِ الْفَرَسِ، ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ، ثُمَّ كَمَشْيِهِ). [ت٣١٥٩/ مي٢٨٥٢].

* صحيح.

**ژ مورەیێ هەمەدانی (رحمه الله) د گۆتنا خودێدا ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إلا وَارِدُهَا﴾ گۆت: ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەلك دێ د سەر جەهنەمێڕا بۆرن پاشی ب کریارێت خۆ دێ ژێ رزگار بن یێ ئێکێ ژێ رزگار دبیت دێ وەکی برویسییێ دەرباز بیت، پاشی وەکی بای، پاشی وەکی غارا هەسپی، پاشی وەکی سویارێ ل سەر دەوارێ خۆ، پاشی وەکی غاردانا زەلامی، پاشی وەکی چۆنا ئاسایی).**

---

[1] دەمێ جبریل گیرۆ بووی ل پێغەمبەری و پێغەمبەر ژ بەر هندێ نەخۆش بووی، خودێ ئەمر دا جبریلی بێژیت: ئەم ملیاکەت نائێینە خوارێ ئەگەر ب ئەمرێ خودایێ تە و ب دەستوورا وی نەبیت، هندی بەری مە و هندی پشتی مە و هندی د ناڤبەرا هەردوویاندا، هەمی یێ خودێیە و ب ئەمرێ وییە.

قوله تعالى: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا ﴾ [٧٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەرێ تە دیت و بۆ تە بێژم سەرهاتییا وی ئەوێ باوەری ب ئایەتێت مە نەئینایی و ئینكار كرین (و باوەر نەكری جارەكا دی پشتی مرنێ دێ ساخكەینەڤە).**

٧٠١ - (ق) عَنْ خَبَّابٍ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً قَيْناً، وَكَانَ لِي عَلَى الْعَاصِي بْنِ وَائِلٍ دَيْنٌ، فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ لِي: لاَ أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ، قَالَ: قُلْتُ: لَنْ أَكْفُرَ بِهِ حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ، قَالَ: وإِنِّي لَمَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ المَوْتِ؟ فَسَوْفَ أَقْضِيكَ إِذَا رَجَعْتُ إِلَى



مَالٍ وَوَلَدٍ. قَالَ: فَنَزَلَتْ: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ۝٧٧ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ۝٧٨ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ۝٧٩ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ۝٨٠﴾. [خ٤٧٣٥ (٢٠٩١)/ م٢٧٩٥].

**ژ خەببابی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز زەلامەكێ ئاسنگەر بووم و من دەینەك ل سەر عاسێ كوڕێ وائیلی هەبوو، ئەز هاتمە دەڤ دەینێ خۆ ژێ بخوازم، گۆتە من: ئەز دەینێ تە نادەمە تە هەتا تو گاورییێ ب موحەممەدی نەكەی، گۆت من گۆت: ئەز گاورییێ پێ ناكەم هەتا تو د مری و پاشی ساخ دبییەڤە، گۆت: ئەرێ ئەز دێ پشتی مرنێ ساخبمەڤە؟! پاشی هینگێ ئەز دێ دەینێ تە دەمە تە ئەگەر ئەز زڤریمەڤە مال و عەیالی، گۆت: ئینا ئەڤە هاتە خوارێ: ﴿أَفَرَأَيْتَ الذي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وقال لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرحمن عَهْدًا كَلَّا سَنَكْتُبُ ما يقول وَنَمُدُّ له من الْعَذَابِ مَدًّا وَنَرِثُهُ ما يقول وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾[1].**

(١) ب كورتی: (هەی موحەممەد) ئەرێ تە دیت و بۆ تە بێژم سەرهاتییا وی ئەوێ باوەری ب ئایەتێت مە نەئینایی و نینكار كرین (و باوەر نەكری جارەكا دی پشتی مرنێ دێ ساخكەینەڤە)، و گۆت: (ڕۆژا ئەز ژ گۆڕێ ڕادبم و زێندی دبمەڤە) دێ مال و عەیالەكێ زێدەتر بۆ من ئێتە دان ﴿ئەڤ ئایەتە د دەرهەقێ (وائیلێ كوڕێ عاص)یدا

(٢١)

سورة الأنبياء

**سۆرەتا ئەنبیاء.**

قوله تعالى: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ [٤٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەم دێ ترازیییێت ڕاست و دورست بۆ ڕۆژا قیامەتێ دانین، ڤێجا كەسێ كێمترین ستەم ژی لێ نائێتە كرن (نە خێرێت وی كێم دبن، و نە ژی گونەهێت وی زێدە دبن).**

٧٠٢ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَجُلاً قَعَدَ بَيْنَ يَدَيْ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي مَمْلُوكِينَ يُكَذِّبُونَنِي، وَيَخُونُونَنِي، وَيَعْصُونَنِي، وَأَشْتُمُهُمْ وَأَضْرِبُهُمْ، فَكَيْفَ أَنَا مِنْهُمْ؟ قَالَ: (**يُحْسَبُ مَا خَانُوكَ وَعَصَوْكَ وَكَذَّبُوكَ، وَعِقَابُكَ إِيَّاهُمْ، فَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِمْ كَانَ كَفَافاً لاَ لَكَ وَلاَ عَلَيْكَ، وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ دُونَ ذُنُوبِهِمْ كَانَ فَضْلاً لَكَ، وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَوْقَ ذُنُوبِهِمْ اقْتُصَّ لَهُمْ مِنْكَ الْفَضْلُ**).

قَالَ: فَتَنَحَّى الرَّجُلُ فَجَعَلَ يَبْكِي وَيَهْتِفُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَمَا تَقْرَأُ كِتَابَ اللهِ** ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ﴾ الْآيَةَ)، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! مَا أَجِدُ لِي وَلِهَؤُلاَءِ شَيْئاً خَيْراً مِنْ مُفَارَقَتِهِمْ، أُشْهِدُكُمْ أَنَّهُمْ أَحْرَارٌ كُلُّهُمْ. [ت٣١٦٥].

* صحيح الإسناد.

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: زەلامەك روینشتە بەردەستێت پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من هندە كۆلە یێت هەین درەو و خیانەتێ ل من دكەن و گوهداریيا من ناكەن، و ئەز خەبەران دبێژمێ و دقوتم، ڤێجا دێ رەوشا من ژ بەر وان یا**

---

**هاتییە خوارێ (خەبابێ كوڕێ ئەرتی) دەینەك ل سەر بوو، دەینێ خۆ ژێ خواست، گۆتێ: هەتا تو خۆ بێ باوەر نەكەی ژ موحەممەدی، ئەز دەینێ تە نادەمە تە، ئینا گۆت: ب خودێ ئەز ژێ بێ باوەر نابم هەتا تو نەمری و ساخ ببییەڤە، ئینا گۆت: دەمێ ڕادبمەڤە وەرە دەڤ من، دێ دەینێ تە دەمە تە).**

**چاوا بیت؟ گۆت: (دویڤ خیانەت و درەو و نەگوهدارییا ئەو ل تە دکەن ئەگەر سزایێ تە بۆ وان دویڤ گونەهێت وان بیت ئەڤە کەفتنە بەرێك و نە چو بۆ تەیە و نە چو ل سەر تەیە، و ئەگەر سزایێ تە ژ گونەها وان کێمتر بیت هینگێ بۆ تە خێرە، و ئەگەر سزایێ تە بۆ وان ژ گونەها وان پتر بیت دێ تۆل ل تە هێتە ڤەکرن ل سەر ئەوا زێدە)، گۆت: خۆ دا لایەکی و دەستهاڤێتێ گری و کرە قێژی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ما تو د قورئانێدا ناخوینی: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شيئا وَإِنْ كان مِثْقَالَ﴾ ئایەت، ئینا وی زەلامی گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز چو تشتی نابینم بۆ من و وان باشتر ژ هندێ ژ ژێکڤەبوونا من ژ وان، ئەز تە دکەمە شاهد ئەو هەمی د ئازانە.**

قوله تعالى: ﴿ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ﴾ [٨٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئینا د تاریستاناندا (تارییا شەڤێ، تارییا دەریایێ و تارییا زکێ نەهنگی) هەوار کر.**

٧٠٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ قَالَ: ظُلْمَةُ اللَّيْلِ، وَظُلْمَةُ بَطْنِ الحُوتِ، وَظُلْمَةُ البَحْرِ. [ك٣٤٤٥].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ﴾ گۆت: تارییا شەڤێ و تارییا زکێ نەهنگی و تارییا دەریایێ.**

(٢٢)

## سورة الحج

## سۆرەتا حەج

قوله تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گەلی مرۆڤان پارێزكارییا خودایێ خۆ بكەن، ب ڕاستی بیڤەلەرزا ڕۆژا قیامەتێ تشتەكێ مەزنە.**

٧٠٤ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ نَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾ على النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ حَتَّى ثَابَ إِلَيْهِ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: **(أَتَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هذا؟ يَوْمَ يَقُولُ اللهُ جَلَّ وَعَلا لآدَمَ: قُمْ فَابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ، مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمائةٍ وَتِسْعَة وَتِسْعِين) !** فَكَبُرَ ذَلِكَ عَلى المسْلِمِينَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(سَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، فَوَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلاَّ كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ البَعِيرِ، أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَابَّةِ، وَإِنَّ مَعَكُمْ لَخَلِيقَتَيْنِ مَا كَانَتَا مَعَ شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ كَثَّرَتَاهُ: يَأْجُوجُ وَمَأجُوجُ، وَمَنْ هَلَكَ مِنْ كَفَرَةِ الجِنّ وَالإِنْسِ)**.

[حب ٧٣٥٤/ ك٦٧، ٨٦٩٢].

* إسناده على شرطهما (شعيب).

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾** ل سەر پێغەمبەری (ﷺ) هاتییە خوارێ، ئەو د وەغەرەكێدا بوو، ئینا دەنگێ خۆ پێ بلند كر هەتا هەڤالێت وی زڤرینە دەڤ، پاشی گۆت: **(هوین دزانن ئەڤە چ ڕۆژە)؟ ڕۆژا خودێ هەر ب هێز و بلند دبێژیتە ئادەمی، ئەی ئادەم ڕابە پێت جەهنەمی بهنێرە ژ هزاران: نەهـ سەد و نۆت و نەهان)**، ئینا ئەڤە ل سەر موسلمانان گران بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دورستیخواز بن بێ كێمكرن و بێ زێدەكرن، و**

**خۆ راگرن و بمینن و د کار و بارێت خۆدا نافنجیخواز بن و ئەگەر هوین نەشیان کاری ب رەنگێ پێدڤی بکەن دویر نەکەڤن و نێزیکی کاری بن، و بلا دلێ هەوە ب خێرا کاری خۆش بیت دا بگەهنە خێرێ، ئەز ب وی کەمە یێ جان و کارێ من د دەستێ ویدا، هوین چو نینن ژ خەلکی ژ خالەکێ نەبیت ل تەنشتا حێشترەکێ یان وەکی بەلەکەکا سپی ژ دەستێ دەواری و دو چێکری یێت هەین ناکەڤنە د گەل چو تشتان ئەگەر ژ وان پتر لێ نەهێن یەئجووج و مەئجووج و یێت گاور مرین ژ ئەجنە و مرۆڤان).**

قوله تعالى: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖ﴾ [١١].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ و ژ مرۆڤان هندەك یێت هەین ل هەجەتن (نە د بنەجهن، و ب گۆمانن) د پەرستنا خودێدا.**

٧٠٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖ﴾. قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ المدِينَةَ، فَإِنْ وَلَدَتِ امْرَأَتُهُ غُلاماً، وَنُتِجَتْ خَيْلُهُ، قَالَ: هَذَا دِينٌ صَالِحٌ، وَإِنْ لَمْ تَلِدِ امْرَأَتُهُ وَلَمْ تُنْتَجْ خَيْلُهُ، قَالَ: هَذَا دِينُ سُوءٍ. [خ٤٧٤٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا گۆتنا خودێدا: ﴿وَمِنْ الناس من يَعْبُدُ اللَّهَ على حَرْفٍ﴾ گۆت: زەلام دهاتە مەدینەیێ ئەگەر ژنا وی کورەك ببا و هەسپێت وی ب بەر کەتبانە دا بێژیت: ئەڤە دینەکێ باشە، و ئەگەر ژنا وی ب بچویك نەببا و هەسپێت وی ب بەر نەکەتبان دا بێژیت: ئەڤە دینەکێ خرابە.**

قوله تعالى: ﴿ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٍ﴾ [٢٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هەر کەسێ بڤێت و بکەتە د دلێ خۆدا، د مزگەفتا کەعبەیێدا گونەهەکێ بکەت، و ژ رێکا راست دەرکەڤیت، ئەم دێ ئیزایەکا دژوار دەینێ.**

٧٠٦ - عن شُعْبَةَ، عَنِ السُّدِّيِّ أَنَّهُ سَمِعَ مُرَّةَ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ. قَالَ لِي شُعْبَةُ: وَرَفَعَهُ وَلاَ أَرْفَعُهُ لَكَ. يَقُولُ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٍ﴾؛ قَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً هَمَّ فِيهِ بِإِلْحَادٍ وَهُوَ بِعَدَنِ أَبْيَنَ، لَأَذَاقَهُ اللهُ عزّ وجل عَذَاباً أَلِيماً. [حم٤٠٧١/ ك٣٤٦٠].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ شوعبەیی، ژ سوددی (رحمه الله) وی گوه ل مورەی بوو، کو وی گوه ل عەبدوللایێ کورێ مەسعودی بوو. شوعبەیی گۆتە من: و وی دگەهاندە پێغەمبەری (ﷺ) و ئەز ناگەهینمێ، د گۆتنا خودێدا ﴿وَمَنْ يُرِدْ فيه بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾ دبێژیت: ئەگەر زەلامەك بکەتە دلێ خۆ ئەو گونەهەکێ تێدا بکەت و ئەو ل عەدەنا ئەبیەنێ[1] بیت دێ خودێ ئیزایەکێ دژوار دەتە بەر وی.**

قوله تعالى: ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ ﴾ [٢٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و گازی مرۆڤان بکە بۆ حەجێ.**

٧٠٧ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لما فَرَغَ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام مِنْ بِنَاءِ البَيْتِ قَالَ: رَبِّ قَدْ فَرَغْتُ، فَقَالَ: أَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ، قَالَ: رَبِّ وَمَا يَبْلُغُ صوتي! قَالَ: أَذِّنْ وَعَلَيَّ الْبَلاَغُ، قَالَ: رَبِّ كَيْفَ أَقُولُ؟ قَالَ: يَاأَيُّهَا النَّاسُ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الحَجُّ، حَجُّ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ، فَسَمِعَهُ مَنْ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، أَلاَ تَرَى أَنَّهُمْ يَجِيئُونَ مِنْ أَقْصَى الأَرْضِ يُلَبُّونَ. [ك٣٤٦٤/ هق٥/١٧٦/ مخ١٠/١١].

* قال الذهبي: صحيح.

---

(١) عەدەن باژێرێ یەمەنێیە دیارە و ئەبیەن ناڤێ زەلامەکێ عەدەنییە.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) دەمێ ئیبراهیم (ﷺ) ژ ئاڤاکرنا کەعبەیێ ب دویماهی هاتی، گۆت: ئەی خودا من ب دویماهی ئینا، ئینا گۆتێ: گازی مرۆڤان بکە بێنە حەجێ، گۆت: ئەی خودا ما دەنگێ من دێ چەند چیت؟ گۆت: گازیکە و گەهاندن ل سەر منە، گۆت: ئەی خودێ ئەز چ بێژم؟ گۆت: بێژە: گەلی مرۆڤان حەج ل سەر هەوە هاتە نڤیسین حەجا مالا پیرۆز بێت ل ناڤبەرا عەرد و عەسمانان گوه لێ بوو و ما تو نابینی ئەو عەردێ ژ هەمیان دویرتر دهێن حەجێ دکەن.**

قوله تعالى: ﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ ﴾ [٣٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: دەستویرییا شەری بۆ وان هاتە دان ئەوێت شەرێ وان دئێتە کرن، ژ بەر وێ ستەما ل وان هاتییە کرن.**

٧٠٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ مَكَّةَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ، إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، لَيَهْلِكُنَّ، فَنَزَلَتْ ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ٣٩﴾ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَكُونُ قِتَالٌ.

- وعند الترمذي: فقال أبو بكرٍ: لقد عَلِمتُ أنه سيكونُ قِتالٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَهِيَ أَوَّلُ آيَةٍ نَزَلَتْ فِي الْقِتَالِ. [ت٣١٧١/ ن٣٠٨٥].

* صحيح الإسناد.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) ژ مەکەهێ هاتییە دەرئێخستن، ئەبوبەکری گۆت: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إليه رَاجِعُونَ﴾ بێ گۆمان دێ ژ ناڤ چن: ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ على نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ و من زانی دێ شەڕ چێ بیت.**

- **و ل دەڤ ترمزی ب راستی من زانی دێ شەڕ چێ بیت، و ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەڤە ئایەتا ئێکێ بوو د راستا شەڕیدا هاتییە خوارێ.**

(٢٣)

سورة المؤمنون.

**سۆرەتا موئمینوون.**

قوله تعالى: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ ﴾ [٦٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەوێت سەدەقەیان ژ وی مالی ددەن، یێ خودێ داییە وان یان ژی وێ خێر و باشییا ئەو دکەن، دکەن، و دلێ وان یێ ب ترسە دترسن خودێ ژ وان قەبویل نەکەت.**

٧٠٩ – عن عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) . قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ﴾، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَهُمُ الَّذِينَ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ وَيَسْرِقُونَ؟ قَالَ: (**لاَ يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ! وَلَكِنَّهُمُ الَّذِينَ يَصُومُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَدَّقُونَ، وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لاَ تُقْبَلَ مِنْهُمْ، أُولَئِكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ**). [ت٣١٧٥/ جه٤١٩٨].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: من پرسیارا ڤێ ئایەتێ ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ ما آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾ ژ پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ)، عائیشایێ گۆت: ئەو ئەوون یێت مەیێ ڤەدخۆن و دزیا دکەن؟ گۆت: نەخێر ئەی کچا راستدەرێخی، بەلێ ئەو ئەوون یێت رۆژییان دگرن، و نڤێژان دکەن، و زەکاتێ ددەن، و دترسن خودێ ژ وان نەوەرگریت، ئەڤەنە یێت لەزێ ل خێران دکەن، و بەری خەلکی، خۆ دهاڤێژنە خێرێ.**

قوله تعالى: ﴿ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ [١٠١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەگەر پف ل بووقێ هاتە دان، هنگی مرۆڤانی (مرۆڤانییا خوینێ) د ناڤبەرا واندا نامینیت (کەسێ ئاگەه ژ کەسێ نامینیت خۆ پێ مەزن بکەت یان مفایی بگەهینیتێ).**

٧١٠ - (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنِّي أَجِدُ فِي الْقُرْآنِ أَشْيَاءَ تَخْتَلِفُ عَلَيَّ. قَالَ: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾، ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴿٢٧﴾﴾ [الصافات]، ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ [النساء:٤٢]، ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴿٢٣﴾﴾ [الأنعام:٢٣]، فَقَدْ كَتَمُوا فِي هَذِهِ الْآيَةِ.

وَقَالَ: ﴿أَمِ ٱلسَّمَآءُ بَنَىٰهَا﴾، إلى قوله: ﴿دَحَىٰهَآ﴾ [النازعات:٢٧ . ٣٠]، فَذَكَرَ خَلْقَ السَّمَاءِ قَبْلَ خَلْقِ الْأَرْضِ، ثُمَّ قَالَ: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ﴾، إلى ﴿طَآئِعِينَ﴾ [فصلت:٩ . ١١]، فَذَكَرَ فِي هَذِهِ خَلْقَ الْأَرْضِ قَبْلَ خَلْقِ السَّمَاءِ.

وَقَالَ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ [النساء:٩٦]، ﴿عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ [النساء:٥٦]، ﴿سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ [النساء:٥٨]، فَكَأَنَّهُ كَانَ ثُمَّ مَضَى؟

فَقَالَ: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ﴾ فِي النَّفْخَةِ الْأُولَى، ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ ﴿فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾، ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ﴾، عِنْدَ ذَلِكَ ﴿وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾، ثُمَّ فِي النَّفْخَةِ الْآخِرَةِ ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴿٢٧﴾﴾.

وَأَمَّا قَوْلُهُ: ﴿مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، فَإِنَّ اللهَ يَغْفِرُ لِأَهْلِ الْإِخْلَاصِ ذُنُوبَهُمْ، وَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: تَعَالَوْا نَقُولُ: لَمْ نَكُنْ مُشْرِكِينَ، فَخُتِمَ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ فَتَنْطِقُ أَيْدِيهِمْ، فَعِنْدَ ذَلِكَ عُرِفَ أَنَّ اللهَ لاَ يُكْتَمُ حَدِيثاً، وَعِنْدَهُ ﴿يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ الْآيَةَ [النساء:٤٢].

وَخَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ، ثُمَّ خَلَقَ السَّمَاءَ، ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ فِي يَوْمَيْنِ آخَرَيْنِ، ثُمَّ دَحَا الْأَرْضَ، وَدَحْوُهَا: أَنْ أَخْرَجَ مِنْهَا الْمَاءَ وَالْمَرْعَى، وَخَلَقَ الْجِبَالَ وَالْجِمَالَ وَالْآكَامَ، وَمَا بَيْنَهَا فِي يَوْمَيْنِ آخَرَيْنِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿دَحَىٰهَآ﴾، وَقَوْلُهُ: ﴿خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ﴾، فَجُعِلَتِ الْأَرْضُ وَمَا فِيهَا مِنْ شَيْءٍ فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ، وَخُلِقَتِ السَّمَاوَاتُ فِي يَوْمَيْنِ.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ سَمَّى نَفْسَهُ ذَلِكَ، وَذَلِكَ قَوْلُهُ؛ أَيْ: لَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ، فَإِنَّ اللهَ، لَمْ يُرِدْ شَيْئاً إِلاَّ أَصَابَ بِهِ الَّذِي أَرَادَ. فَلاَ يَخْتَلِفْ عَلَيْكَ الْقُرْآنُ، فَإِنَّ كُلاًّ مِنْ عِنْدِ اللهِ. [خ معلق. مقدمة سورة فصلت].

**ژ سەعیدێ كورێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: زەلامەكی گۆتە ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ب راستی ئەز هندە تشتان د قورئانێدا دبینم ل سەر من تێك دچن.**

**گۆت: خودێ دبێژیت: ﴿فلا أَنْسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ ولا يَتَسَاءَلُونَ﴾ (هینگێ مرۆڤانی د ناڤبەرا واندا نامینیت (كەسێ ئاگەهـ ژ كەسێ نامینیت خۆ پێ مەزن بكەت یان مفایی بگەهینیتێ)، و كەس پرسیارا كەسێ ناكەت هەر ئێك ب خۆڤە مژویلە) و دبێژیت: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ على بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ (و ئەو (گرەگر و خزمەتكار) ل ئێك و دو زڤڕین، و گازندە ژ ئێك كرن) و دبێژیت: ﴿ولا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا﴾ (و چو ئاخفتنان ل خودێ ناڤەشێرن) و دبێژیت: ﴿والله رَبِّنَا ما كنا مُشْرِكِينَ﴾ (ب خودێ كو خودایێ مەیە، ئەم نە ژ هەڤپشك چێكەران (موشركان) بووین.) و وان د ڤێ ئایەتێدا ڤەشارت.**

**و گۆت: ﴿أَمْ السَّمَاءُ بَنَاهَا﴾ هەتا گەهشتییە گۆتنا وی ﴿دَحَاهَا﴾ (ئەرێ ساخكرنا هەوە پشتی مرنێ ب زەحمەتترە یان چێكرنا عەسمانی؟ بانێ وی بلند كر و بێ كێماسی دورست كر. شەڤا وی تاری كر و ڕۆژا وی ب ڕۆناهی ئێخست. و عەرد پشتی هینگێ ل سەر ئاوایێ هێكێ ڕاست و خۆش كر بۆ ژیانێ). بەحسێ چێكرنا عەسمانی بەری چێكرنا عەردی كر پاشی گۆت: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾ هەتا گۆتنا وی: ﴿طَائِعِينَ﴾ (بێژە: ئەرێ هوین باوەرییێ ب وی (خودایی) نائینن ئەوێ عەرد د دو ڕۆژاندا چێ كری، و هوین هەڤبەران بۆ چێ دكەن؟ ئەو چێكەر، خودانێ جیهانانە. و چیایێت بنەجهـ و بلند یێت ئێخستینە د عەردیدا (دا نەهەژیێت)، و (ب ئاڤ و گل و گیایی و دار و دەرامەت و شینكاتی) یێ ب بەرەكەت ئێخستی، و د چار ڕۆژێت تمامدا، ڕزقێ خەلكێ عەردی**

ئەوێت هەوجە دیار كر. پاشی بەرێ خۆ دا عەسمانی و ئەو دویكێل بوو، و گۆتە عەردی و عەسمانی هەوە بڤێت و نەڤێت ل دویڤ ئەمرێ من وەرن (كا من چ د ناڤ هەوەدا بۆ مرۆڤان چێ كرییە، دەربێخن) گۆتن: (ئەم ب دلخۆشی و بەر ئەمرێ تە هاتین). د ڤێدا بەحسێ چێكرنا عەردی بەری یا عەسمانی كر.

و گۆت: گۆتنا خودێ: ﴿وكان الله غَفُورًا رَحِيمًا﴾ و خودێ یێ گونەهژێبەر و دلۆڤانە ﴿عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ و سەردەست و كاربنەجهە ﴿سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ بهیسەر و بینەرە، هەروەكی بەرێ ئەو یێ وەسا بوو پاشی وەسا نەما.

ئیبن عەباسی گۆت: ﴿فلا أَنْسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ ولا يَتَسَاءَلُونَ﴾ (هینگێ مرۆڤانی د ناڤبەرا واندا نامینیت (كەسێ ئاگەهـ ژ كەسێ نامینیت خۆ پێ مەزن بكەت یان مفایی بگەهینیتێ)، و كەس پرسیارا كەسێ ناكەت هەر ئێك ب خۆڤە یێ مژویلە) ئەو دەمێ پفكرنا ئێكێیە پاشی دێ د بووقێدا هێتە پفكرن ﴿فَصَعِقَ من في السماوات وَمَنْ في الأرض إلا من شَاءَ اللهُ﴾ (و بووق (بووقا ئێكێ) هاتە پفكرن، ڤێجا هندی د عەرد و عەسمانانداهەی دكەڤن و دمرن، ژ بلی وی یێ خودێ حەز نەكری بمریت (كو ئسرافیل ب خۆیە، پاشی پشتی هینگێ ئەو ژی دمریت) هینگێ مرۆڤانی د ناڤبەرا واندا نینە و پرسیارێ ژ ئێكدو ناكەن، پاشی پشتی پفا دووێ ﴿وأقبل بَعْضُهُمْ على بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ (و ئەو (گرەگر و خزمەتكار) ل ئێك و دو زڤرین، و گازندە ژ ئێك كرن). و دیسا گۆتنا وان: ﴿ما كنا مُشْرِكِينَ﴾ ﴿ولا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا﴾ ب راستی خودێ گونەهێت دلسۆزان ژێ دبەت ڤێجا شریكچێكەر دێ بێژن وەرن بێژن: ئەم نە ژ شریكچێكەرانین دێ دەڤێت وان هێنە مۆركرن هینگێ دەستێت وان دێ ئاخڤن، ئها وی دەمی دێ هێتە زانین چو تشت ل خودێ ناهێتە ڤەشارتن و وی دەمی: ﴿يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ (وێ ڕۆژێ (ڕۆژا قیامەتێ) ئەوێت گاور

بوویین و گوهدارییا پێغەمبەری نەكرین، حەز دكەن عەرد بێتە كەلاشتن، و تێدا بچن و د گەل ئاخێ ببنە ئێك، (وێ رۆژێ) نەشێن چو ئاخفتنان ل خودێ ڤەشێرن).

و عەرد د دو رۆژاندا یێ چێكری پاشی عەسمان د دو رۆژێت دیدا تمام كر، پاشی عەرد ل سەر رەنگێ هێكێ دەشت كر و ئاڤ و چەرە ژێ دەرئێخستن و چیا و حێشتر و گر تێدا چێكرن، و د ناڤبەرا چێكرنا عەردی و چێكرنا تشتێ دی تێدا دو رۆژێت دینە، و ئەڤەیە رامانا ﴿دَحَاهَا﴾ و گۆتنا وی ﴿خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾ ڤێجا چێكرنا عەردی و تشتێ تێدا د چار رۆژاندا چێ كر و عەسمان د دو رۆژاندا هاتنە چێكرن.

﴿وكان الله غَفُورًا رَحِيمًا﴾ خۆ پێ ناڤ كر و ئەڤەیە رامانا گۆتنا وی ئانكو: بەردەوام یێ وەسایە و ب راستی خودێ تشتەك نەڤێت ئەگەر دورست نەئینابیت ئەوا وی دڤێت ڤێجا بلا قورئان ل بەر تە تێك نەچیت هەمی ژ دەڤ خودێیە.

(٢٤)

سورة النور

**سۆرەتا نوور.**

قوله تعالى: ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ [١٥]

**گۆتنا خودایێ مەزن: وەختێ هەوە ئەڤ ئاخڤتنە ژ ئێکدو ڤەدگوهاست و هوین پێ دئاخڤتن.**

٧١١ - (خ) عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: كانَتْ تَقْرَأُ: إِذْ تَلِقُونَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ، وَتَقُولُ: الْوَلْقُ الْكَذِبُ.

قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: وَكَانَتْ أَعْلَمَ مِنْ غَيْرِهَا بِذلِكَ؛ لأَنَّهُ نَزَلَ فِيهَا. [خ٤١٤٤].

**ژ ئیبن ئەبی مەلیکەی ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) وێ ئەڤە ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ هۆسا ﴿إِذْ تَلِقُونَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ دخواند و دگۆت: و وەلەق درەوە.**

**ئیبن ئەبی مەلیکەی گۆت: و ئەو د ڤێدا ژ هەر ئێکێ دی شارەزاترە، چونکی ئەڤ ئایەتە یا د راستا وێدا هاتی خوارێ.**

قوله تعالى: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و بێژە ژنێت خودان باوەران بلا چاڤێت خۆ ژ بەرێخۆدانا نەدورست و حەرام وەرگێڕن.**

٧١٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ﴾ الْآيَةَ، فَنُسِخَ وَاسْتُثْنِيَ مِنْ ذَلِكَ: ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ الْآيَةَ [النور:٦٠]. [د٤١١١].

* صحيح الإسناد.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ گۆت: ئەڤە یا هاتییە نەسخکرن و ئەڤە یا ژێ دەرئێخستی ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ و ژنێت ژ بچویکان و ژ عوزران بوویین، و دل ژ بەر پیراتییێ ل سەر شویکرنێ نەمایی.**

قوله تعالى: ﴿ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و بلا جهێ خەمل و جەکێت خۆ (کو جهێ بازن و حنجۆل (خلخال) و گوهار و رستکێت حەفکێ و رستکێت دکەڤنە سەر سینگی و تۆڤا سەری) دەرنەئێخن، و دیار نەکەن بۆ بیانییان.**

٧١٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ قَالَ: لاخَلْخَالَ ولا شَنْفَ وَلاقِرْطَ وَلا قِلادَةَ ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ قَالَ: الثِّيَابُ. [ك٣٥٠١].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) د راستا ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ گۆت: نە حنجۆل و نە خزێمك و نە گوهارك و نە رستکا دکەڤیتە سەر سینگی، و د راستا ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ گۆت: جلکن.**

قوله تعالى: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و بلا دەرسۆکا خۆ ب سەر سینگێ خۆدا بەردەن (بلا دەرسۆکا وان، پرچ و ستۆ و سینگێ وان، ژ بیانییان ڤەشێریت).**

٧١٤ - (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: يَرْحَمُ اللهُ نِسَاءَ المُهَاجِرَاتِ الأُوَلَ، لَمَّا أَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾؛ شَقَّقْنَ مُرُوطَهُنَّ فَاخْتَمَرْنَ بِهَا. [خ٤٧٥٨].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: خودێ دلۆڤانییێ ب ژنێت مشەختێت ئێكێ ببەت دەمێ ئەڤە هاتییە خوارێ ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ على جُيُوبِهِنَّ﴾ ئەو پاتێت د خۆ وەردكرن دڕاندن و سەرێت خۆ پێ گرتن.**

قوله تعالى: ﴿ وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ ﴾ [٣٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و زنایێ ب خورتی (و نەخورتی) ب جارییێت خۆ نەدەنە كرن.**

٧١٥ - (م) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ جَارِيَةً لِعَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيِّ ابْنِ سَلُولَ يُقَالُ لَهَا: مُسَيْكَةُ، وَأُخْرَى يُقَالَ لَهَا: أُمَيْمَةُ، فَكَانَ يُكْرِهُهُمَا عَلَى الزِّنَى، فَشَكَتَا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَنْزَلَ اللهُ ﴿وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾. [م٣٠٢٩].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ ئیبن سەلولی جارییەك هەبوو دگۆتنێ موسەیكە و ئێكا دی دگۆتنێ ئومەیمە و بخورتی زنا ب وان ددانە كرن، ئینا گازندا خۆ ب ڤێ چەندێ گەهاندنە پێغەمبەری (ﷺ) ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ ﴿ولا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ على الْبِغَاءِ﴾ هەتا گۆتنا وی: ﴿غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾.**

٧١٦ - عن مُعْتَمِر بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِيهِ: ﴿وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، قَالَ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ أَبِي الْحَسَنِ: غَفُورٌ لَهُنَّ: الْمُكْرَهَاتُ. [د٢٣١٢].

* صحيح مقطوع.

**ژ موعتەمەرێ كوڕێ سولەیمانی ژ بابێ وی د گۆتنا خودێدا ﴿وَمَنْ يكرههن فإن اللَّهَ من بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ گۆت: سەعیدێ كوڕێ ئەبی حەسەنی گۆت: گونەهژێبەرە بۆ وان خورتی لێكرییان.**

قوله تعالى: ﴿لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ﴾ [٥٨]

**گۆتنا خودایێ مەزن: بلا کۆلەیێت هەوە و دیسا بچویکێت هەوە ژی (کچ و کوڕ)، ئەوێت هێژ بالق نەبووین، سێ وەختان دەستویرییێ ژ هەوە بخوازن (بەری بێنە وێ مەزەلا هوین تێڤە).**

٧١٧ - عَنْ عِكْرِمَةَ: أَنَّ نَفَراً مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ قَالُوا: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، كَيْفَ تَرَى فِي هَذِهِ الآيَةِ الَّتِي أُمِرْنَا فِيهَا بِمَا أُمِرْنَا، وَلاَ يَعْمَلُ بِهَا أَحَدٌ؛ قَوْلُ اللهِ عزّ وجل: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم﴾، قَرَأَ الْقَعْنَبِيُّ إِلَى: ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ اللهَ حَلِيمٌ رَحِيمٌ بِالْمُؤْمِنِينَ يُحِبُّ السَّتْرَ، وَكَانَ النَّاسُ لَيْسَ لِبُيُوتِهِمْ سُتُورٌ وَلاَ حِجَالٌ، فَرُبَّمَا دَخَلَ الْخَادِمُ أَوْ الْوَلَدُ، أَوْ يَتِيمَةُ الرَّجُلِ، وَالرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ، فَأَمَرَهُمُ اللهُ بِالاِسْتِئْذَانِ فِي تِلْكَ الْعَوْرَاتِ، فَجَاءَهُمُ اللهُ بِالسُّتُورِ وَالْخَيْرِ، فَلَمْ أَرَ أَحَداً يَعْمَلُ بِذَلِكَ بَعْدُ. [د٥١٩٢]

* موقوف، حسن الإسناد.

**ژ عیکریمەی (رحمه الله) گۆت: هندە کەسا ژ خەلکێ عیراقێ گۆتن: ئەی ئیبن عەباس تو چاوا ڤێ ئایەتێ دبینی فەرمانا مە تێدا یا هاتییە کرن ب وی تشتێ فەرمانا مە پێ هاتییە کرن و کەس کار پێ ناکەت گۆتنا خودێ هەر ب هێز و مەزن: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمْ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لم يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ من قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ من الظَّهِيرَةِ وَمِنْ بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ ليس عَلَيْكُمْ ولا**

عليهم جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ﴾[1] قەعنەبی هەتا ﴿عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خواند، ئیبن عەباسی گۆت: ب راستی خودایێ مەزن ب باوەریداران یێ نەرم و حەلیم و دلۆڤانە، حەژ ستارەیێ دكەت، و خەلكی خانییێت وان نە پەردە هەبوون و نە پەری (ئەو ژۆرا گرۆڤرە وەكی گومبەتكەكێیە دۆرماندۆرێت وێ ب پاتەی دهێتە ڤەشارتن بۆ بویكا دورست دكەن) و دبیت خزمەتكار یان كورِ یان سێوییا زەلامی چۆبا دەڤ و زەلام یێ ل دەڤ هەڤژینا خۆ، ژ بەر هندێ خودێ فەرمانا وان ب دەستویر وەرگرتنێ كر د ڤان دەمێت شەلاندنێ تێدا دكەن و خودێ ستارەیی و خێر بۆ وان ئینا، ڤێجا پشتی هینگێ من كەس نەدیت وێ فەرمانێ بشكێنیت و كار پێ نەكەت.

قوله تعالى: ﴿أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ [٦٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گونەه ل سەر وان نینە ئەو هندەك جلكێت خۆ نەكەنە بەر خۆ ئەگەر ئنیەتا وان ئەو نەبیت لەشێ خۆ نیشا كەسێ بدەن.**

٧١٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾. قال: هي الجلابيب. [مخ١٣/٢١].

* إسناده حسن.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ گۆت: ئەو جلبابن (جلباب جلكێ ئێك پارچەیی و لەشی هەمییێ دگریت).

(١) راڤەكرنا ئایەتێ ب كورتی: گەلی خودان باوەران، بلا كۆلەیێت هەوە و دیسا بچویكێت هەوە ژی [كچ و كورِ]، ئەوێت هێژ بالق نەبووین، سێ وەختان دەستویرییێ ژ هەوە بخوازن [بەری بێنە وێ مەزەلا هوین تێڤە] بەری نڤێژا سپێدێ، و وەختێ هوین پشتی نڤێژا نیڤرۆ خۆ دشەلینن [جلكێت خۆ دئێخن]، و پشتی نڤێژا عەیشا، ئەڤە سێ وەختن، جلكێ هەوە ب دورستی ل سەر هەوە نامینیت، ژ بلی ڤان هەرسێ وەختان، نە گونەه ل سەر هەوەیە و نە ل سەر وانە [بێ دەستویری بێنە دەڤ هەوە] ئەو دئێنە دەڤ هەوە و دچن، هندەك ژ هەوە ژی دئێن و دچنە دەڤ ئێكدو، و هۆسا خودێ ئەحكام و ئایەتان بۆ هەوە دیار دكەت، و خودێ ب خۆ یێ زانا و كاربنەجهە.

(٢٥)

سورة الفرقان

**سۆرەتا فورقان**

قوله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ﴾ [٣٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەوێت ل سەر سەروچاڤان بەر ب دۆژەهێ دئێنە كۆمكرن و ڕاكێشان.**

٧١٩ - (ق) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَيْفَ يُحْشَرُ الْكافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: (**أَلَيْسَ الَّذِي أَمشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا قادِراً عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**).

قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا. [خ٤٧٦٠/ م٢٨٠٦].

**ژ قەتادە (رحمه الله) گۆت: ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، چاوا گاور دێ ڕۆژا قیامەتێ ل سەر سەروچاڤان هێتە ئینان؟ ئینا گۆت: (ما ئەوێ د دنیایێدا ئەو ل سەر پیان بری نەشێت ڕۆژا قیامەتێ وی ل سەر سەروچاڤێت وی ببەت).**

**قەتادەیی (رحمه الله) گۆت: بەلێ ئەز ب مەزناتییا خودایێ خۆ كەمە.**

(٢٦)

سورة الشعراء

**سۆرەتا شوعەراء**

قوله تعالى: ﴿ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ ﴾ [١٦٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ و هەڤسەرێت خودێ بۆ هەوە دورستکرین، و ژ بەر هەوە دایین دهێلن.**

٧٢٠ - عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾. قَالَ: هُوَ ـ وَاللهِ ـ الْقُبُلُ. [مي١١٦٣].

* إسناده حسن.

**ژ موجاهدی (رحمه الله) د گۆتنا خودێدا: ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ﴾ گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەو پێشییە.**

قوله تعالى: ﴿ وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ ﴾ [٢٢٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ و هۆزانڤان (یێت نەموسلمان، و یێت گاور) مرۆڤێت سەرداچۆیی، ب دویڤ وان دکەڤن (و گوهێ خۆ ددەنە وان).**

٧٢١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ﴾ [٢٢٤]، فَنَسَخَ مِنْ ذَلِكَ وَاسْتَثْنَى، فَقَالَ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا﴾ [الشعراء:٢٢٧]. [د٥٠١٦]

* حسن الإسناد.

ژ ئیبن عەباسی (ﷺ) د ڕاستنا گۆتنا خودێدا ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمْ الْغَاوُونَ﴾ و هۆزانڤانَ (یێت نەموسلمان، و یێت گاور) مرۆڤێت سەرداچۆیی، ب دویڤ وان دکەڤن (و گوهێ خۆ ددەنە وان). گۆت: ژێ هاتە نەسخکرن و ژێ هاتە دەرئێخستن و گۆت: ﴿إلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا﴾ ژ بلی وان ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت ڕاست و باش کرین، و گەلەك زکرێ خودێ کرین).

(٢٨)

سورة القصص

سۆرەتا قەسەس.

قوله تعالى: ﴿ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ ﴾ [٢٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئێك ژ وان هەردو ژنان ب شەرمڤە هاتە دەڤ مووسایی.**

٧٢٢ - عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: ﴿فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ﴾ قَالَ: كانت تجيء وهي خَرَّاجةً وَلَأَّجةً واضعةً يدها على وجهها، فقام معها موسى وقال لها: امشي خَلْفي وانعتي لي الطريق، وأنا أمشي أمامكِ فإنا لا ننظرُ في أَدْبارِ النساء. ثم قالت: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ ٢٦﴾ لما رأته من قوته ولقوله لها ما قال، فزاده ذلك فيه رغبة. فقال: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٢٧﴾؛ أي: في حُسْنِ الصحبة والوفاء بما قلتُ، قال موسى: ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ﴾ قال: نعم، قال:

﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ٢٨﴾ [القصص:٢٥ . ٢٨] فزَوَّجه، وأقام معه يَكفيه، ويعمل له في رعاية غَنمه، وما يحتاج إليه منه، وزوَّجه صفورة أو أختها شرقاء وهما اللتان كانتا تَذُودَان. [ك٣٥٣٠].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عومەری (ﷺ) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ﴾ گۆت: و ئەو هات و ئەو گەلەك دچۆ و دهات (ئانكو گەلەك دەردكەفت و دهاتە د ژۆرڤە چونكی كار دكر) و دەستێ خۆ دانا بوو سەر سەروچاڤێت خۆ، مووسا د گەل وێ رابوو و گۆتێ: پشت من وەرە و رێكێ نیشا من بدە و ئەز دێ ل بەری تە چم، ب راستی ئەم بەرێ خۆ نادەینە پاشییێت ژنان، پاشی گۆت: ﴿يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ (باب ب شڤانی بگرە، ب ڕاستی یێ ژ هەمیان چێتر تو ب شڤانی بگری، ئەوە یێ ب هێز و**

**ئەمین). ژ بەر وێ هێزا ژێ دیتی و ژ بەر گۆتنا وی گۆتنییێ ئەڤێ حەزا شوعەیبی پتر ئێخستە سەر ئینا گۆت: ﴿إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنْكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ، فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (من دڤێت ئێك ژ هەردو كچێت خۆ ل تە مار بكەم، ب شەرت تو هەشت سالان شڤانییا من بكەی، ژ خۆ ئەگەر تو تمام بكەی و بكەیە دەه، ئەڤە قەنجییەكە ژ دەڤ تە، من نەڤێت ئەز زەحمەتێ بۆ تە چێكەم [كو تو بكەیە دەه سال]، و ئەگەر خودێ حەزكەت، دێ من ژ مرۆڤێت باش بینی). ئانكو باش هەڤالینی و ئەختوبارییێ ب وێ ئەوا من گۆتی، مووسای گۆت: ﴿ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ﴾ (ئەڤە پەیمانە (قەولە) د ناڤبەرا من و تەدا، و كیژك ژ هەردو وەختان من ب جه ئینا، ـ هەشت سال یان دەه سال ـ زێدە ژ من نائێتە خواستن و چو ل سەر من نینە) گۆت: بلا، گۆت: خودێ ل سەر وێ ئەوا ئەم دبێژین شاهد و زێرەڤانە ئینا كچا خۆ لێ مارەكر، و د گەل ما شوینا وی كار دكر و بۆ وی كار دكر د خودانكرنا پەزێ ویدا و كا چ هەوجەیە ژێ و كچا خۆ (صفورة) یان خویشكا وێ شەرڤاء لێ مارەكر و ئەو ئەو بوون یێت پەز ددا پاش.**

## قوله تعالى: ﴿ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ ﴾ [٢٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: كیژك ژ هەردو وەختان من ب جه ئینا، ـ هەشت سال یان دەه سال ـ زێدە ژ من نائێتە خواستن و چو ل سەر من نینە.**

٧٢٣ - (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلَنِي يَهُودِيٌّ مِنْ أَهْلِ الْحِيرَةِ: أَيَّ الأَجَلَيْنِ قَضَى مُوسَى؟ قُلْتُ: لاَ أَدْرِي، حَتَّى أَقْدَمَ عَلَى حَبْرِ الْعَرَبِ فَأَسْأَلَهُ، فَقَدِمْتُ فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: قَضَى أَكْثَرَهُمَا وَأَطْيَبَهُمَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) إِذَا قَالَ فَعَلَ. [خ٢٦٨٤].

**ژ سەعیدێ كوڕێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: جوهییەكێ خەلكێ حیرە پرسیار ژ من كر ئەرێ مووسای كیژ دەم ب جه ئینا؟ من گۆت: ئەز نوزانم هەتا ئەز دچمە دەڤ زانایێ عەرەبان پرسیارێ ژێ دكەم ئەز هاتم من پرسیارا ئیبن عەباسی كر گۆت: دەمێ پتر و دلخۆشكەرتر ب جه ئینا ب راستی هندی پێغەمبەرە ئەگەر تشتەك گۆت دێ كەت.**

قوله تعالى: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ [٥٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: تو نەشێی ئەوێ تە بڤێت ڕاستەڕێ بکەی، بەلێ خودێیە یێ بڤێت ڕاستەڕێ دکەت.**

٧٢٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِعَمِّهِ: **(قُلْ: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**، قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ، يَقُولُونَ: إِنَّمَا حَمَلَهُ عَلَى ذلِكَ الْجَزَعُ، لأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾. [م٢٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە مامێ خۆ: بێژە (لَا إِلَهَ إِلا الله) ئەز دێ ڕۆژا قیامەتێ شەهدەیێ بۆ تە پێ دەم)، گۆت: ئەگەر ژ بەر هندێ نەبیت قورەیشی من کێم بکەن بێژن ترسا زێدە وەلێ کر وەبێژیت دا چاڤێت تە پێ ڕۆنکەم ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي من أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي من يَشَاءُ﴾[1].**

قوله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ [٨٥]..

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەوێ قورئان بۆ تە ئینایییە خوار، و ل سەر تە واجب کری (بخوینی و کار پێ بکەی، و بگەهینی) جارەکا دی دێ تە زڤرینیتەڤە مەکەهێ.**

٧٢٥ - (خ) عَنِ ابنِ عباس ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾. قَالَ: إِلى مكة. [خ٤٧٧٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) د ڕاستا گۆتنا خودێدا ﴿لَرَادُّكَ إلى مَعَادٍ﴾ گۆت: بۆ مەکەهێ.**

---

[1] تو نەشێی ئەوێ تە بڤێت ڕاستەڕێ بکەی، بەلێ خودێیە یێ بڤێت ڕاستەڕێ دکەت.

(٢٩)

سورة العنكبوت.

**سۆرەتا عەنکەبووت.**

قوله تعالى: ﴿ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ ﴾ [٢٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ ب ڕاستی هوین پێ پویچاتییەکێ دکەن کەسێ ژ خەلکێ بەری هەوە نەکرییە.**

٧٢٦ - عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢٨﴾، قَالَ: مَا نَزَا ذَكَرٌ عَلَى ذَكَرٍ، حَتَّى كَانَ قَوْمُ لُوطٍ. [مي١١٧٩].

* إسناده صحيح.

**ژ عەمرێ کوڕێ دیناری د ڕاستا گۆتنا خودێدا (إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ) گۆت: نێری خۆ نەهاڤێتییە سەر نێری هەتا د ملەتێ (لوط)یدا چێ بووی.**

## (٣٠)

## سورة الروم

## سۆرەتا رۆم.

قوله تعالى: ﴿الٓمٓ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ [الروم: ٢].

**گۆتنا خودێ: ڕۆم ب دەستێ فورسێ هاتە شکاندن.**

٧٢٧ - عَنْ سعيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿الٓمٓ ① غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ② فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ﴾. قَالَ: غُلِبَتْ وَغَلَبَتْ، قَالَ: كَانَ الْمُشْرِكُونَ يُحِبُّونَ أَنْ يَظْهَرَ أَهْلُ فَارِسَ عَلَى الرُّومِ، لِأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ أَهْلُ الأَوْثَانِ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ أَنْ يَظْهَرَ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ، لِأَنَّهُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، فَذَكَرُوهُ لِأَبِي بَكْرٍ، فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُمْ سَيَغْلِبُونَ**)، فَذَكَرَهُ أَبُو بَكْرٍ لَهُمْ، فَقَالُوا: اجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ أَجَلاً، فَإِنْ ظَهَرْنَا كَانَ لَنَا كَذَا وَكَذَا، وَإِنْ ظَهَرْتُمْ كَانَ لَكُمْ كَذَا وَكَذَا، فَجَعَلَ أَجَلاً خَمْسَ سِنِينَ فَلَمْ يَظْهَرُوا، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: (**أَلاَ جَعَلْتَهُ إِلَى دُونَ** . قَالَ: أُرَاهُ . **الْعَشْرَ**)، قَالَ سَعِيدٌ: وَالْبِضْعُ مَا دُونَ الْعَشْرِ، قَالَ: ثُمَّ ظَهَرَتِ الرُّومُ بَعْدُ. قَالَ: فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿الٓمٓ ① غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ②﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ④ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ﴾.

قَالَ سُفْيَانُ: سَمِعْتُ أَنَّهُمْ ظَهَرُوا عَلَيْهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ. [ت٣١٩٢]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿غُلِبَتْ الرُّومُ﴾ گۆت: ڕۆم دشەکەست و ب سەردکەفت و هەڤپشکچێکەران حەز دکر فورس ب سەر ڕۆمێ بکەڤیت چونکی ئەو و ئەو بوتپەرێسن و موسلمانان حەز دکر ڕۆم ب سەر فورسێ بکەڤیت چونکی ئەو خودان کتێبن، ئەڤە بۆ ئەبوبەکری هاتە گۆتن، ئینا ئەبوبەکری بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئینا گۆت: ب راستی ئەو دێ ب سەرکەڤن، ئینا**

ئەبوبەکری ئەڤە بۆ وان گۆت: ئینا گۆتن دەمەکێ د ناڤبەرا مە و خۆدا دانە ئەگەر ئەم سەرکەفتین ئەڤە و ئەڤە بۆ مەیە و ئەگەر هوین سەرکەفتن ئەڤە و ئەڤە بۆ هەوەیە، ئینا پێنج سال دەم دانان و ئەو د ڤی دەمیدا سەرنەکەفتن و وی ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئینا گۆت: **(تە بۆچی دەم نەدکرە کێمتر)**، ئەبوبەکر دبێژیت: ئەز دبێژم گۆت کێمتر ژ دەهێ، ئەبو سەعید دبێژیت: هندەك د بن دەهێدایە پاشی، پشتی هینگێ رۆم سەرکەفت و ئەڤەیە گۆتنا خودێ ﴿غُلِبَتْ الرُّومُ﴾ هەتا گۆتنا وی: ﴿يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ من يَشَاءُ﴾.

سوفیانی گۆت: من گوه لێ بوو ئەو رۆژا بەدرێ سەرکەفتن.

(۳۱)

## سورة لقمان

## سۆرەتا لوقمان

قوله تعالى: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِى لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ ﴾ [٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هندەك مرۆڤ پەیڤێت هەین ئاخفتنێت پویچ و بێ تام دكڕین.**

۷۲۸ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَبِيعُوا الْقَيْنَاتِ وَلاَ تَشْتَرُوهُنَّ، وَلاَ تُعَلِّمُوهُنَّ**، وَلاَ خَيْرَ فِي تِجَارَةٍ فِيهِنَّ، وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ) فِي مِثْلِ هَذَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿**وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِى لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ**﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ.

[ت۱۲۸۲، ۳۱۹۵/ جه۲۱٦۸].

* حسن.

**ژ ئەبی ئومامەی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جارییێت سترانبێژ نەفرۆشن و نەکڕن، و وان فێری ستران نەکەن، و چو خێر د بازرگانیکرنا واندا نینە و بهایێ وان حەرامە). د وەکی ڤێدا ئەڤ ئایەتە ل سەر وی هاتە خوارێ: ﴿وَمِنْ الناس من يَشْتَرِي لَهْوَ الحديث لِيُضِلَّ عن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ.**

## (٣٢)

## سورة السجدة.

## سۆرەتا سەجدە.

قوله تعالى: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴾ [١٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: فەوی تەنشتێت وان ناکەڤنە سەر نڤینان، ئانکو: کێم دنڤن.**

٧٢٩ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴿١٦﴾﴾. قَالَ: كَانُوا يَتَيَقَّظُونَ مَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ يُصَلُّونَ.

وَكَانَ الْحَسَنُ يَقُولُ: قِيَامُ اللَّيْلِ. [د١٣٢١/ ت٣١٩٦].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) د راستا گۆتنا خودێدا: ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عن الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ گۆت: د ناڤبەرا مەغرەب و عەیشادا هشیار دمان نڤێژ دکرن.**

**و حەسەنی دگۆت: ئەو شەڤ نڤێژن.**

قوله تعالى: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ ﴾ [٢١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: بێ گۆمان ئەم ئیزایا دنیایێ بەری ئیزایا مەزنتر یا قیامەتێ دێ دەینە بەر وان.**

٧٣٠ - (م) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ﴾. قَالَ: مَصَائِبُ الدُّنْيَا، وَالرُّومُ، وَالْبَطْشَةُ، أَوِ الدُّخَانُ. شُعْبَةُ الشَّاكُّ فِي الْبَطْشَةِ أَوِ الدُّخَانِ .. [م٢٧٩٩].

ژ ئوبەییێ کوڕێ کەعبی (ﷺ) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُمْ من الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ﴾ گۆت: بەلایێت دنیایێ و سەرکەفتنا ڕۆمێ ل سەر فارسان و کوشتنا د واندا چێ بووی رۆژا بەدرێ یان

ژی هاتنا دویکێلی (و ئەڤە ب سەرێ قورەیشییان سالا هشکاتییێ هات) و شوعبە ب گۆمان بوو د کوشتنا واندا رۆژا بەدرێ یان ژی هاتنا دویکێلی.

(٣٣)

سورة الأحزاب.

**سۆرەتا ئەحزاب.**

قوله تعالى: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ ﴾ [٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هوین ب ناڤێ بابێت وان گازی وان بکەن، ئەڤە گازیکرنا وان ب ناڤێ بابێت وان ل دەڤ خودێ دورستترە.**

٧٣١ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ . مَوْلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) . ما كُنَّا نَدْعُوهُ إِلاَّ زَيْدَ بْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: ﴿**ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ**﴾. [خ٤٧٨٢/ م٢٤٢٥].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەیدێ کورێ حاریسەیی ئازاکرییێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مە گازی نەدکرێ ب ناڤێ زەیدێ کورێ موحەممەدی نەبیت هەتا قورئان هاتییە خوارێ: ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هو أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ﴾.**

قوله تعالى: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ ﴾ [٣٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: زەلامێت موسلمان و ژنێت موسلمان، و زەلامێت خودان باوەر و ژنێت خودان باوەر.**

٧٣٢ – عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ الْأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّهَا أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: مَا أَرَى كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ لِلرِّجَالِ، وَمَا أَرَى النِّسَاءَ يُذْكَرْنَ بِشَيْءٍ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿**إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ**﴾. [ت٣٢١١].

* صحيح الإسناد.

**ژ ئوم عیمارە یا ئەنساری ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەز نابینم ئەگەر هەمی تشت بۆ زەلامان نەبن و ئەز نابینم بەحسێ ژنان ب تشتەكی هاتبیتە كرن، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ.**

٧٣٣ – عن أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا لَنَا لاَ نُذْكَرُ فِي الْقُرْآنِ كَمَا يُذْكَرُ الرِّجَالُ؟ قَالَتْ: فَلَمْ يَرُعْنِي مِنْهُ يَوْماً إِلاَّ وَنِدَاؤُهُ عَلَى الْمِنْبَرِ: (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ**) ! قَالَتْ: وَأَنَا أُسَرِّحُ رَأْسِي، فَلَفَفْتُ شَعْرِي ثُمَّ دَنَوْتُ مِنَ الْبَابِ، فَجَعَلْتُ سَمْعِي عِنْدَ الْجَرِيدِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل يَقُولُ**: ﴿**إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ**﴾) هَذِهِ الْآيَةَ قَالَ عَفَّانُ: ﴿**أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا**﴾. [حم٢٦٥٧٥].

* إسناده صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ گۆت: من گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ مە خێرە بۆچی بەحسێ مە د قورئانێدا ناهێتە كرن وەكی بەحسێ زەلامان دهێتە كرن؟! چ ئەز ئاگەهدار نەكرم دەنگێ وی نەبیت ل سەر مینبەرێ، (گەلی مرۆڤان)، و گۆت: من سەرێ خۆ شەدكر من سەرێ خۆ تێكوەركر پاشی ئەز نێزیكی دەرگەهی بووم و من گوهێ خۆ ئێخستە دەڤ بەندكێ ڤەكرنا دەرگەهی من گوه لێ بوو دگۆت: ب راستی خودێ هەر مەزن و ب هێز دبێژیت: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ والْمُؤْمِنَاتِ﴾ و ئەڤ ئایەتە، عەفان دبێژیت: ﴿أَعَدَّ الله لهم مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾[1].**

---

(١) ب ڕاستی خودێ بۆ ڤان هەمییان ژن و مێران گونەهژێبرن و خەلاتەكێ مەزن یێ بەرهەڤ كری.

قوله تعالى: ﴿ وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ ﴾ [٣٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و تو وێ د دلێ خۆدا ڤەدشێری ماركرنا وێ پشتی ئەو بەردەت یا كو خودێ دڤێت ئاشكەرا بكەت.**

٧٣٤ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿**وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ**﴾ نَزَلَتْ فِي شَأْنِ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَزَيْدِ بْنِ حارِثَةَ. [خ٤٧٨٧].

- وفي رواية قال: جاءَ زَيْدُ بْنُ حارِثَةَ يَشْكُو، فَجَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ: (**اتَّقِ الله، وَأَمْسِكْ عَلَيْك زَوْجَكَ**). قَالَ أَنَسٌ: لَوْ كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) كاتِماً شَيْئاً لَكَتَمَ هذِهِ.

قَالَ: فَكَانَتْ زَيْنَبُ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) تَقُولُ: زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ، وَزَوَّجَنِي اللهُ تَعَالَى مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَماوَاتٍ. [خ٧٤٢٠].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) ئەڤ ئایەتە ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ ما الله مُبْدِيهِ﴾ د راستا زەینەبا كچا جەحشی و زەیدێ كورێ حاریسەیدا هاتە خوارێ.**

- **و د ڤەگێرەكێدا گۆت: زیدێ كورێ حاریسەی هات گازندە كرن ئینا پێغەمبەری گۆتێ (ژ خودێ بترسە و هەڤژینا خۆ بەرنەدە)، ئەنەسی گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئایەتەك ڤەشارتبا دا ڤێ ئایەتێ ڤەشێریت و گۆت: زەینەبێ شانازی ب خۆ دبر ب سەر هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) و دگۆت: مرۆڤێت هەوە هوین یێت داینە شوی و خودایێ هەر بلند و مەزن ئەز د سەر حەفت عەسمانانرا یا ل پێغەمبەری مارەكریم.**

قوله تعالى: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ﴾ [٥١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: یا تە بڤێت ژ هەڤسەرێت خۆ شەڤا وێ گیرۆكەی گیرۆكە، و یا تە بڤێت شەڤا وێ بینییە پێش بینە پێش، و یا تە بڤێت و نە شەڤا وێ، چو ل سەر تە نینە تو بچییە دەڤ.**

٧٣٥ – (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كُنْتُ أَغارُ عَلَى اللَّاتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وأَقُولُ: أَتَهَبُ المرْأَةُ نَفْسَهَا؟ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾، قُلْتُ: ما أَرَى رَبَّكَ إلاَّ يُسَارِعُ في هَوَاكَ.　　[خ٤٧٨٨/ م١٤٦٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من ئەو ژنێت خۆ پێشكێشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كرین مارە بكەت ب كێماسی ددیتن و من دگۆت: ما ژن هەیە خۆ پێكێش بكەت بهێتە مارەكرن، ڤێجا دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿ترجي من تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ من تَشَاءُ وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ من گۆت ئەز نابینم ئەو نەبیت خودێ لەزێ د رازیكرنا تەدا دكەت وێ ددەتە تە یا تە بڤێت.**

٧٣٦ – (ق) عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كانَ يَسْتَأْذِنُ في يَوْمِ المرْأَةِ مِنَّا، بَعْدَ أَنْ أُنْزِلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِى إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾. فَقُلْتُ لَهَا: ما كُنْتِ تَقُولِينَ؟ قَالَتْ: كُنْتُ أَقُولُ لَهُ: إِنْ كانَ ذَاكَ إِلَيَّ، فَإِنِّي لاَ أُرِيدُ يا رَسُولَ اللهِ أَنْ أُوثِرَ عَلَيْكَ أَحَداً.　　[خ٤٧٨٩/ م١٤٧٦].

**ژ موعازەیێ ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا هەڤژینەكێ ژ مە دەستویری دخوازت پشتی ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ: ﴿ترجي من تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ**

**من تَشَاءُ وَمَنْ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فلا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ من گۆتێ: تە چ دگۆتێ؟ گۆت من دگۆتێ: ئەگەر ب من بیت من نەڤێت ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز تە بۆ کەسەکی دی بهێلم.**

قوله تعالى: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ﴾ [٥٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: پشتی ڤان هەڤسەرێت تە هەین، چو ژن بۆ تە دورست نینن تو ل خۆ مار بکەی.**

٧٣٧ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا مَاتَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَتَّى أُحِلَّ لَهُ النِّسَاءُ.

[ت٣٢١٦/ ن٣٢٠٤، ٣٢٠٥].

* صحيح الإسناد.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەمر هەتا خودێ ئەو ژن بۆ دورست نەکرین[1].**

**(١) ئانکو: بەری هینگێ ل سەر دانابوو چو ژنێت دی نەئینیت نەو نەبن یێت هەین پاشی خودێ بۆ دورستکرڤە بەلێ د گەل هندێ ژی چو یێت دی نەئینان.**

(٣٥)

## سورة فاطر

## سۆرەتا فاطر

قوله تعالى: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا ﴾ [٣٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: پاشی مە ئەڤ قورئانە دا ملەتێ تە و مە دا وان ئەوێت مە ژ ناڤ بەندەیێت خۆ هەلبژارتین.**

٧٣٨ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ﴾: قَالَ: (هؤلاءِ كُلُّهم بمَنزِلَةٍ واحدةٍ، وكُلُّهم في الجَنَّةِ). [ت٣٢٢٥].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی د ڤێ ئایەتێدا گۆت:** ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا من عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ﴾ ، **(ئەڤە هەمی ئێك رێزن و هەمی یێت د بەحەشتێدا).**

٧٣٩ - عَنْ أَبِي الدَّرداءِ قَالَ: سَمِعتُ رسولَ اللهِ (ﷺ) يقولُ: قال اللهُ عزَّ وجلَّ: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ﴾: (فأمَّا الذين سَبَقوا بالخَيراتِ، فأولئك الذين يَدخُلونَ الجَنَّةَ بغيرِ حِسابٍ، وأمَّا الذين اقتَصَدوا، فأولئك يُحاسَبونَ حِسابًا يَسيرًا، وأمَّا الذين ظَلَموا أنفُسَهم، فأولئك الذين

يُحاسَبونَ في طُولِ المَحشَرِ، ثُمَّ هم الذين تَلافاهم اللهُ برَحمتِه، فهم الذين يَقولونَ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾، إلى قَولِه: ﴿لُغُوبٌ﴾

[فاطر: ٣٤-٣٥]. [حم٢١٧٢٧]

* إسناده ضعيف.

ژ ئەبی دەردائی گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) د راستا ڤێ ئایەتێدا ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا من عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ گۆت: هندیكە ئەون یێت لەزێ ل قەنجییان دكەن و بەردەوام دبن ل سەر دێ بێ پرسین چنە بەحەشتێ، و هندیكە ئەون ئەوێت ناڤنجی دێ پرسینەكا سڤك د گەل وان هێتە كرن، و هندیكە ئەون ئەوێت ستەم ل خۆ كرین ئەڤە دێ درێژاهییا رۆژا قیامەتێ هێنە راوەستاندن پاشی ئەون یێت خودێ دگەهینیتە دلۆڤانییا خۆ و ئەون یێت دبێژن: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الذي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾ هەتا گۆتنا وی ﴿لُغُوبٌ﴾[1].

---

(١) هەمی شوكور و پەسن بۆ خودێ، ئەوێ هەمی خەمێت مە ڤەرەڤاندین و نەهێلایین، ب ڕاستی خودایێ مە گونەه ژێبەر و خەلاتبەخشە (خەلاتدەهە). [ئەو خودایێ] ژ كەرەما خۆ ئەم كرینە د بەحەشتا نێورینێدا، نە وەستیان تێدا دگەهیتە مە و نە كەرخین.

(٣٦)

سورة ياسين.

**سۆرەتا یاسین.**

قوله تعالى: ﴿وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾ [١٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و یا وان كری و پاش خۆ هێلایی دنڤیسین.**

٧٤٠ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَتْ بَنُو سَلِمَةَ فِي نَاحِيَةِ الْمَدِينَةِ، فَأَرَادُوا النُّقْلَةَ إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ آثَارَكُمْ تُكْتَبُ) ؛ فَلَمْ يَنْتَقِلُوا. [ت٣٢٢٦].

* قال الترمذي: حسن غريب. وقال شعيب: صحيح لغيره.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: بەنی سەلەمە ل رەخێ مەدینەیێ بوون و حەژ ڤەگوهازتنا بۆ نێزیكی مزگەفتێ دكرن، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ:** ﴿إِنَّا نَحْنُ نحيي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ ما قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾ **ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێنگاڤێت هەوە بۆ هەوە دهێنە نڤیسین ئینا ڤەگوهازتن نەكر).**

قوله تعالى: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَا﴾ [٣٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: رۆژ ژی بەر ب بنەجهییا خۆڤە دچیت ئەوا خودێ بۆ دانایی و ژێ دەرناكەڤیت، ئەڤە ژ دانانا خودایێ سەردەست و زانایە.**

٧٤١ - (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لأَبِي ذَرٍّ حِينَ غَرَبَتِ الشَّمْسُ: (تَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ)؟ قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (فَإِنَّهَا تَذْهَبُ حَتَّى تَسْجُدَ تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَسْتَأْذِنَ، فَيُؤْذَنَ لَهَا، وَيُوشِكُ أَنْ تَسْجُدَ فَلاَ يُقْبَلَ مِنْهَا، وَتَسْتَأْذِنَ فَلاَ يُؤْذَنَ لَهَا، يُقَالَ لَهَا: ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٣٨﴾). [خ٣١٩٩/ م١٥٩].

**ژ ئەبی زەرِی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە ئەبی زەرِی دەمێ رۆژ ئاڤا بووی، ئەرێ تو دزانی كیڤە دچیت؟ من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: (ئەو**

**دچیت هەتا سوجدەیێ ل بن عەرشی دبەت و دێ دەستویرییێ خوازیت و دێ دەستویری بۆ هێتە دان، و نێزیکە سوجدەیێ ببەت ژێ نەهێتە قەبویلکرن بزڤریت و دەستویرییێ بخوازیت ژ جهێ خۆ دەرکەڤیت دەستویری بۆ ناهێتە دان و دێ بۆ هێتە گۆتن بزڤرە جهێ تو ژێ هاتی ل وێرێ بهەلێ و دەرکەڤە، ڤێجا دێ ژ رۆژئاڤا خۆ هەلێت و ئەڤەیە رامانا گۆتنا خودێ: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لها ذلك تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾).**

قوله تعالى: ﴿ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ [٧٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو ڤێ گاڤێ ڤێ زێدە جڕەبڕێ دکەت و دژمنەکێ ئاشکەرایە.**

٧٤٢ - عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ العَاصُ بْنِ وَائِلٍ إِلى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بِعَظْمٍ حَائِلٍ فَفَتَّهُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَيَبْعَثُ اللهُ هَذا بَعْدُ مَا أَرَمَّ؟ قالَ: (**نَعَمْ يَبْعَثُ اللهُ هَذا، يُمِيتُكَ ثُمَّ يُحْيِيكَ ثُمَّ يُدْخِلُكَ نَارَ جَهَنَّم**)! قَالَ: فَنَزَلَتِ الآيَاتُ: ﴿**أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾**...﴾ إلى آخر السورة. [ك٣٦٠٦].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت:** عاسێ کوڕێ وائلی هەستییەکێ پۆتی ئینا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و پرت پرت کر و گۆت: ئەی موحەممەد خودێ دێ ڤی ساخکەتەڤە پشتی نەمای؟! گۆت: **(بەلێ خودێ دێ ڤی ڤەژینیتەڤە و دێ تە مرینیت پاشی تە ساخکەت پاشی تە بەتە ئاگرێ جەهنەمێ)**، گۆت: خودێ ئەڤ ئایەتە ئینانە خوارێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ﴾ **هەتا دیماهیکا سۆرەتێ.**

(٣٧)

سورة الصافات

سۆرەتا صافات

قوله تعالى: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: سویند ب ملیاکەتێت ب ڕێز ڕاوەستیایین.**

٧٤٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا١﴾ قَالَ: الملائِكَةُ ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا٢﴾ قَالَ: الملائِكَةُ ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا٣﴾ قَالَ: الملائِكَةُ. [ك٣٦٠٧].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا: ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا﴾ گۆت: ملیاکەتن و ﴿فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا﴾ گۆت: ملیاکەتن و ﴿فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا﴾ گۆت: ملیاکەتن.**

قوله تعالى: ﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ [٢٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەوێت ستەم کرین و هەڤالێت وان یێت وەکی وان و ئەوێت وان شوینا خودێ دپەرستن کۆم بکەن.**

٧٤٤ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾. قَالَ: أَمْثَالَهُمْ الذِينَ هُمْ مِثْلُهُمْ. [ك٣٦٠٩].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ عومەرێ کوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ﴾ گۆت: نموونەیێت وەکی وان.**

(٣٩)

سورة الزمر

**سۆرەتا زومەر**

قوله تعالى: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: پاشی، ب ڕاستی هوین ڕۆژا قیامەتێ ل دەڤ خودایێ خۆ دێ د گەلێك ب جرە چن.**

٧٤٥ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾. قَالَ الزُّبَيْرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَتُكَرَّرُ عَلَيْنَا الْخُصُومَةُ بَعْدَ الَّذِي كَانَ بَيْنَنَا فِي الدُّنْيَا؟ قَالَ: (نَعَمْ)، فَقَالَ: إِنَّ الْأَمْرَ إِذاً لَشَدِيدٌ. [ت٣٢٣٦].

* حسن الإسناد.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ زوبەیری ژ بابێ خۆ (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ:** ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يوم الْقِيَامَةِ عِنْدَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ **زوبەیری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو هەڤڕكییا د ناڤبەرا مەدا د دنیایێدا جارەكا دی دێ ل سەر مە دوبارە بیت؟ گۆت: (بەلێ) ئینا گۆت: ئانكو ب ڕاستی ڕەوش یا دژوارە.**

قوله تعالى: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ﴾ [٥٣].

**ئاخفتنا خودایێ مەزن: هەی بەندەیێت من، هەی ئەوێت هەوە زێدە گونەه كرین و هەوە د كرنا گونەهاندا، دایییە سەر هەمی تخوییان، ژ دلۆڤانییا خودێ بێ هیڤی نەبن.**

٧٤٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ نَاساً مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ، كَانُوا قَدْ قَتَلُوا وَأَكْثَرُوا، وَزَنَوْا وَأَكْثَرُوا، فَأَتَوْا مُحَمَّداً (ﷺ) فَقَالُوا: إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وَتَدْعُو إِلَيْهِ لَحَسَنٌ، لَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَارَةً، فَنَزَلَ: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ

إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ﴾ [الفرقان:٦٨]. وَنَزَلَ: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ﴾. [خ٤٨١٠/ م١٢٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) هندە کەس ژ هەڤپشکچێکەران کوشتن کربوون و زێدە کربوون و زنا کربوون و زێدە کربوون هاتنە دەڤ موحەممەدی (ﷺ) گۆتن: ب راستی ئەوا تو دبێژی و داخوازێ بۆ دکەی یا باشە ئەگەر تو بۆ مە بێژی ژێبرنەك بۆ کارێ مە کری هەیە؟ ئینا ئەڤە هاتە خوارێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مع اللهِ إِلَهًا آخَرَ ولا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ التي حَرَّمَ الله إلا بِالْحَقِّ ولا يَزْنُونَ﴾[1] و ئەڤە هاتە خوارێ: ﴿قُلْ يا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا على أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا من رَحْمَةِ اللهِ﴾.**

قوله تعالى: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ ﴾ [٦٧].

## گۆتنا خودایێ مەزن: وان ئەوێت هەڤپشکان بۆ خودێ چێ دکەن ب دورستی و ب ڕەنگێ پێدڤی، ڕێز ل خودێ نەگرتییە و وەك پێدڤی نەنیاسییە و مەزن نەدانایە.

٧٤٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ حَبْرٌ مِنَ الأَحْبَارِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّا نَجِدُ: أَنَّ اللهَ يَجْعَلُ السَّمَاوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الخَلَائِقِ عَلَى إِصْبَعٍ فَيَقُولُ: أَنَا المَلِكُ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَصْدِيقاً لِقَوْلِ الحَبْرِ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ

---

(١) ڕاڤەکرنا ئایەتا (٦٨ ـ ٧١) ب کورتی: و ئەون ئەوێت ژ بلی خودێ، دوعایان ژ کەسێ دی نەکەن [ژ بلی خودێ کەسێ نەپەرێسن] و ئەو، ئەو مرۆڤێ خودێ کوشتنا وی دورست نەکری، و ب هەقی نەبیت [کو بەرانبەر ئێکێ دی بێتە کوشتن] ناکوژن، و زنایێ و دەهمەن پیسییێ ناکەن، و هەر کەسێ ڤان بکەت، دێ گونەهـ ل سەر ستویر بن، و دێ پێ ئێتە جزاکرن. ڕۆژا قیامەتێ ئیزا دێ ل سەر بێتە دوقات، و هەروهەر دێ ڕەزیل و شەرمزار تێدا مینیت [چونکی گونەهـ ژێ دا د گەل گاورییێ]. ژ بلی وی یێ تۆبە کری و باوەری ئینای و کار و کریارێت ڕاست و قەنج کرین، ئەڤێت هۆسا، خودێ دێ گونەهێت وان کەتە خێر [ئانکو دێ گونەهێت وان ژێ بەت، و خێران دێ ل جهێ وان دانیت]، و خودێ ب خۆ گونەهـ ژێبەر و دلۆڤانە. و ئەوێ تۆبە بکەت و [پاشی] کارەکێ ڕاست و باش بکەت، ب ڕاستی ئەو زڤرینەکا دورست ب بال خودێڤە زڤڕی.

وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾. [خ٤٨١١/ م٢٧٨٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: زانایەك ژ زانایێت جوهییان هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەی موحەممەد ئەم د کتێبێت خۆدا دبینین خودێ دێ عەسمانان دانیتە سەر تبلەکا خۆ و عەردان ل سەر تبلەکێ و داران ل سەر تبلەکێ و ئاڤێ و ئاخێ ل سەر تبلەکێ و هەمی چێکرییێت دی ل سەر تبلەکێ و دێ بێژیت: ئەز خودانم، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) کرە کەنی هەتا ددانێت بەرێ دەڤێ وی دیار بووین، پەسەندکرن بۆ گۆتنا زانایی، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وما قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جميعا قَبْضَتُهُ يوم الْقِيَامَةِ والسماوات مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.**

(٤٠)

سورة غافر

## سۆرەتا غافر

قوله تعالى: ﴿ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ ﴾ [١١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: دو جاران ژی تە ئەم پێت ساخكرین.**

٧٤٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ عزّ وجل ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾. قَالَ: هِي مِثْلُ الَّتِي فِي البقَرَة: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ [البقرة]. [ك٣٦٣٦].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ گۆت: ئەڤە وەكی یا سۆرەتا بەقەرەیە: ﴿كُنْتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾.**

٧٤٩ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾، قَالَ: أَحْيَاهُمْ وَلَمْ يَكُونُوا شَيْئاً، ثُمَّ أَمَاتَهُمْ، ثُمَّ أَحْيَاهُمْ. [مخ١٢/١٢١].

* إسناده حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ گۆت: ئەو ساخكرن و ئەو نەبوون پاشی مراندن پاشی ساخكرن.**

قوله تعالى: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾ [٦٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: دوعایێ ژ من بکەن ئەز دێ بەرسڤا هەوە دەم.**

٧٥٠ - عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ، قَالَ رَبُّكُمْ: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾**). [د١٤٧٩/ ت٢٩٦٩/ جه٣٨٢٨].

* صحيح.

**ژ نوعمانێ کوڕێ بەشیری (ڕەزایا خودێ لێ بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: دوعا عیبادەتە و ئەڤە خواند: ﴿وقال رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾.**

قوله تعالى: ﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ [٦٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ڤێجا هوین پەرستنا وی ب تنێ بکەن و چو هەڤپشکان بۆ چێ نەکەن، و هەمی پەسن و شوکور بۆ خودانێ جیهانان.**

٧٥١ - عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَنْ قَالَ: لا إلهَ إلاَّ اللهُ، فَلْيَقُلْ عَلى أَثَرِهَا: الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ، يُرِيدُ قَوْلَه عزّ وجل: **﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾**.

[ك٣٦٣٩].

**★ قال الذهبي: على شرطهما.**

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: یێ بێژیت: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بلا دویڤڕا بێژیت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) مەبەستا وی گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزنە: ﴿فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.**

(٤١)

## سورة فصلت

## سۆرەتا فوصیلەت

قوله تعالى: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً ﴾ [١٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەگەر وان بەرێ خۆ ژ باوەرییئینان و هزرکرنێ د ڤان چێکریاندا وەرگێڕا، تو بێژە: ئەڤە من هوین ژ هشکەڤێڕییەکێ ترساندن.**

٧٥٢ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: اجْتَمَعَتْ قُرَيْشٌ يَوْماً، فَأَتَاهُ عُتْبَةُ بْنُ رَبِيْعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَنْتَ خَيْرٌ أَمْ عَبْدُ اللهِ؟ فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ لَه رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَفَرَغْتَ؟) قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ، حمٓ ١ تَنزِيلٌ...﴾ حتى بلغ ﴿فَإِنْ أَعْرَضُواْ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ١٣﴾) فَقَالَ لَهُ عُتْبَةُ: حَسْبُكَ حَسْبُكَ مَا عِنْدَكَ غَيْرُ هذا؟ قَالَ: (لا). فَرَجَعَ عُتْبَةُ إِلى قُرَيْشٍ فَقَالُوا: مَا وَرَاءَكَ؟ فَقَالَ: مَا تَرَكْتُ شَيْئاً أَرَى أَنَّكُمْ تُكَلِّمُونَهُ إِلاَّ قَدْ كَلَّمْتُهُ، قَالُوا: فَهَلْ أَجَابَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، لا وَالذِيْ نَصَبَهَا بَنِيَّةً مَا فَهِمْتُ شَيْئاً مِمَّا قَالَ، غَيْرَ أَنَّهُ أَنْذَرَكُمْ صَاعِقَةً مِثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ، قَالُوا: وَيْلَكَ يُكَلِّمُكَ رَجُلٌ بِالعَرَبِيَّةِ وَلا تَدْرِي مَا قَالَ؟ قَالَ: لا وَاللهِ مَا فَهِمْتُ شَيْئاً مِمَّا قَالَ، غَيْرَ ذِكْرِ الصَّاعِقَةِ. [ك٣٠٠٢].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: رۆژەکێ قورەیشی کۆم بوون، و عوتبەیێ کوڕێ رەبیعەیێ کوڕێ عەبد شەمس هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی موحەممەد، تو باشتری یان عەبدوللاه؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بێ دەنگ بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (تو ب دویماهی هاتی)؟ گۆت: بەلێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ ﴿حم تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ هەتا**

**گەهشتییە ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنْذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ عوتبەیی گۆتێ بەسە بەسە، ژ بلی ڤێ چو دی ل دەڤ تە نینە؟ گۆت: نەخێر، عوتبە زڤریڤە دەڤ قورەیشییان، گۆتنێ: چ ل دەڤ تە هەیە؟ ئینا گۆت: من تشتەك نەهێلایە هەوە دڤیا بێژنێ و من نەگۆتبیتێ، گۆتنێ: بەرسڤا تە دا؟ گۆت: بەلێ، نە ب وی کەمە یێ مالا خۆ (کەعبە) دانایی ئەز تشتەکێ ژ یا وی گۆتی تێنە گەهشتم ئەو نەبیت ب ڕاستی ئەو هەوە ژ هشکەڤێڕییەکێ دترسینیت وەکی وێ هشکەڤێڕییێ ئەوا عاد و (ثمود) هنگاڤتین، گۆتن: وەی بۆ تە ئەو مرۆڤ ب عەرەبی د گەل تە دئاخڤت و تو تێناگەهی کا چ گۆت؟! گۆت: نە ب خودێ چو ژ یا گۆتی تێنەگەهشتم ژ بلی بەحسێ هشکەڤێژییێ.**

قوله تعالى: ﴿ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ ﴾ [٢٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: وەختێ هەوە گونەهـ دکر هەوە خۆ ژ گوهـ و چاڤ و چەرمێ خۆ نەدڤەشارت هوین ل وێ هزرێ بوون شادەیییێ ل سەر هەوە نادەن.**

٧٥٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ رضي الله عنه قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ . أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ . كَثِيرَةٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ، قَلِيلَةٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتُرَوْنَ أَنَّ اللهَ يَسْمَعُ ما نَقُولُ؟ قَالَ الآخَرُ: يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا، وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا، وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ الآيَةَ. [خ٤٨١٧ (٤٨١٦)/ م٢٧٧٥].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (ڕضي الله عنه) گۆت: دو قورەیشی و سەقەفییەك (خەلکێ تائیفێ) یان دو سەقەفی و قورەیشییەك ل کەعبێ کۆم بوون بەزێ زکێ وان گەلەك بوو بەلێ تێگەهشتنا دلێ وان یا کێم بوو، ئینا ئێکی ژ وان گۆت: هوین دبینن ئەوا ئەم دبێژن خودێ گوهـ لێ هەیە؟ یێ دی گۆت: گوهـ لێ هەیە ئەگەر بلند باخفین و گوهـ لێ نینە**

ئەگەر نزم بئاخڤین. و یێ دی گۆت: ئەگەر وی گوه لێ ببیت دەمێ ئەم بلند ئاخفتین ب راستی وی گوه لێ هەیە ئەگەر ئەم نزم ژی ئاخفتین، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿وما كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ ولا أَبْصَارُكُمْ ولا جُلُودُكُمْ﴾.

قوله تعالى: ﴿ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا ﴾ [٢٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەوێت گاور بووبین گۆتن: خودێوۆ، كا وان هەردوكان، ئەجنە و مرۆڤان ئەوێت ئەم سەردا برین و گومڕا كرین نیشا مە بدە.**

٧٥٤ – عَنْ عَلِّيٍ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا﴾، قَالَ: إِبْلِيسُ وَابْنُ آدَمَ الَّذِي قَتَلَ أَخَاهُ. [ك٣٢١٥].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا ﴿رَبَّنَا أَرِنَا اللَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا﴾ گۆت: ئەو شەیتانە و كوڕێ ئادەمی یێ برایێ خۆ كوشتی.**

قوله تعالى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ﴾ [٣٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڕاستی ئەوێت گۆتین: خودانێ مە خودێیە، پاشی ل سەر ڤێ مایین و خۆ ڕاگرتین.**

٧٥٥ . عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾؟ فَقَالُوا: ﴿الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ فَلَمْ يَلْتَفِتُوا وَقَوْلُهُ: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ بِخَطِيئَةٍ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: حَمَلْتُمُوهَا عَلَى غَيْرِ وَجْهِ الْمَحْمَلِ، ﴿ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ وَلَمْ يَلْتَفِتُوا إِلَى إِلَهٍ غَيْرِهِ، ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ أَيْ بِشِرْكٍ. [ك٣٦٤٨].

قال الذهبي: صحيح.

ژ ئەبی بەکرێ سەدیق (رضي الله عنه) گۆت: هوین بۆ گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ و گۆتنا خودایێ بلند: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ چ دبێژن؟ گۆتن: ﴿الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ نەزڤری و گۆتنا: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ ب گونەهەکێ، ئینا ئەبوبەکری گۆت: هەوە ئەو رامان دایێ یا هەلنەگریت ﴿ثُمَّ اسْتَقَامُوا﴾ ئانکو نەزڤرییە غەیری خودێ و ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ ئانکو: ب شیرکێ.

(٤٢)

## سورة الشورى

## سۆرەتا شوورا

قوله تعالى: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ﴾ [٣٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەر نەخۆشییەكا بگەهیتە هەوە ژ بەر وان كار و كریارانە یێت هەوە كرین، و ل گەلەك گونەهان ژی دبۆریت جزایی بۆ نادانیت.**

٧٥٦ - عَنِ الحَسَنِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْهِ بَعْضُ أَصْحَابِهِ وقَدِ ابْتُلِيَ فِي جَسَدِهِ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُهُمْ: إِنَّا لَنَبْتَئِسُ لَكَ لِما نَزَلَ فِيْكَ، قَالَ: فَلا تَبْتَئِسْ لِما تَرَى، فَإِنَّمَا نَزَلَ بِذَنْبٍ وَمَا يَعْفُو اللهُ عَنْهُ أَكْثَرُ. قَالَ: ثُمَّ تَلاَ عِمَرانُ هذه الآية: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠﴾ إلى آخر الآية. [ك٣٢١٥].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ حەسەنی (رحمه الله) ژ عیمرانێ كورێ (حصین)ی (رضي الله عنه) گۆت: هندەك هەڤالێت وی چۆنە دەڤ و و لەشێ وی تووشی نەخۆشییەكێ ببوو، هندكا ژ وان گۆتنێ ئەم ب خەمین ژ بەر وێ یا گەهشتییە تە، گۆت: ب خەم نەكەڤە ژ بەر وێ یا تو دبینی، ئەڤە ب گونەهێ یا هاتی و خودێ ل گەلەكێ ژی دبۆریت، پاشی عیمرانی ئەڤ ئایەتە ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ﴾. هەتا دویماهیكا ئایەتێ خواند.**

(٤٣)

سورة الزخرف

**سۆرەتا زوخروف**

قوله تعالى: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾ [٣٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەرێ ما لێکڤەکرنا دلۆڤانییا خودایێ تە د دەست واندایە؟ (ئانکو ما پێغەمبەراتی د دەست واندایە، دا بێژن ئەڤە یێ هەژییە و ئەوێ هە نە.. یان بلا بۆ ڤی هاتبایە و بۆ ئەوێ هە نەهاتبایە؟) مە ڕزقێ وان د ژیانا دنیایێدا د ناڤبەرا واندا یێ لێکڤەکری.**

٧٥٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم...﴾ الآية، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَخْلاقَكُمْ، كَمَا قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَرْزَاقَكُمْ، وإِنَّ اللهَ لَيُعْطِي الدُّنْيَا مَنْ أَحَبَّ وَمَنْ لا يُحِبُّ، وَلا يُعْطِي الدِّينَ إِلاَّ مَنْ أَحَبَّ، فَمَنْ أَعْطَاهُ الدِّينَ فَقَدْ أَحَبَّهُ). [ك٣٦٧١].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) ئەڤ ئایەتە** ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ﴾ **خواند: ئینا عەبدوللایی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب ڕاستی خودێ ڕەوشتێ هەوە د ناڤبەرا هەوەدا یێ ژێکڤەکری هەروەکی ئەرزاقێ هەوە د ناڤبەرا هەوەدا ژێکڤەکری و ب ڕاستی خودێ دنیایێ ددەتە وی یێ بڤێت و یێ نەڤێت و دینی نادەت بۆ وی نەبیت یێ بڤێت، و هەر کەسێ دین دایێ ب ڕاستی وی حەژ وی کر).**

(٤٤)

## سورة الدخان

## سۆرەتا دوخان

قوله تعالى: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ [٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڕاستی مە ئەڤ كتێبە (كو قورئانە) د شەڤەكا پیرۆزدا (كو (ليلة القدر)ـە، شەڤا ب ڕێز و ڕویمەتە) ئینا خوارێ.**

٧٥٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّكَ لَتَرى الرَّجُلَ يَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ، وَقَدْ رُفِعَ اسْمُهُ فِي الموْتَى، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ﴾ إلى قَوْلِهِ: ﴿فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ٤﴾ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ يُفْرَقُ أَمْرُ الدُّنيا إِلى مِثْلِها مِنْ قَابِلٍ. [ك٣٦٧٨/ مخ١٠/٢٤٨].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: ب ڕاستی دبیت تو زەلامی ل بازاران ببینی بێت و بچیت و ناڤێ وی یێ كەفتییە د گەل مرییان، پاشی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ، إِنَّا كُنَّا مُنْذِرِينَ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ ئانكو (ليلة القدر)، (شەڤا ب ڕێز و ڕویمەت) د وێ شەڤێدا هەمی كاروبارێت دنیایێ هەتا ڕۆژا وەكی وێ ژ سالا بهێت ب حیكمەت و شارەزایی، دئێنە دیاركرن و ژێك جوداكرن.**

قوله تعالى: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ﴾ [١٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: فێجا هەی موحەممەد خۆ بگرە هەتا عەسمان دویكێلەكا ئاشكەرا دئینیت.**

٧٥٩ - (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: بَيْنَما رَجُلٌ يُحَدِّثُ فِي كِنْدَةَ فَقَالَ:

يَجِيءُ دُخانٌ يَوْمَ الْقِيامَةِ، فَيَأْخُذُ بِأَسْماعِ المُنافِقِينَ وَأَبْصارِهِمْ، يَأْخُذُ المُؤْمِنَ كَهَيْئَةِ الزُّكامِ، فَفَزِعْنا! فَأَتَيْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ، وَكانَ مُتَّكِئاً، فَغَضِبَ، فَجَلَسَ فَقالَ: مَنْ عَلِمَ فَلْيَقُلْ، وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلِ: اللهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ تَقُولَ لِما لا تَعْلَمُ: لا أَعْلَمُ، فَإِنَّ اللهَ قالَ لِنَبِيِّهِ (ﷺ): ﴿**قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ**٨٦﴾ [ص]، وَإِنَّ قُرَيْشاً أَبْطَؤُوا عَنِ الإِسْلامِ، فَدَعا عَلَيْهِمِ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقالَ: (**اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ**)، فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَتَّى هَلَكُوا فِيها، وَأَكَلُوا المَيْتَةَ وَالْعِظامَ، وَيَرَى الرَّجُلُ ما بَيْنَ السَّماءِ وَالأَرْضِ كَهَيْئَةِ الدُّخانِ. فَجاءَهُ أَبُو سُفْيانَ فَقالَ: يا مُحَمَّدُ، جِئْتَ تَأْمُرُنا بِصِلَةِ الرَّحِمِ، وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللهَ. فَقَرَأَ: ﴿**فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ**١٠﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿**عَآئِدُونَ**﴾، أَفَيُكْشَفُ عَنْهُمْ عَذابُ الآخِرَةِ إِذا جاءَ؟ ثُمَّ عادُوا إِلَى كُفْرِهِمْ. فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعالَى: ﴿**يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ**﴾ [الدخان:١٦] يَوْمَ بَدْرٍ، وَ﴿**لِزَامَا**﴾ يَوْمَ بَدْرٍ، ﴿**الٓمٓ**١ **غُلِبَتِ ٱلرُّومُ**٢﴾ إِلَى ﴿**سَيَغْلِبُونَ**﴾ [الروم]، وَالرُّومُ قَدْ مَضى.

[خ٤٧٧٤ (١٠٠٧)/ م٢٧٩٨].

**ژ مەسروقی (رحمه الله) گۆت: د دەمەكیدا زەلامەك ل كیندە (جهەكە) دئاخفت، ئینا گۆت: رۆژا قیامەتێ دێ دویكێلەك هێت دێ گوه و چاڤێت دوروییان ژ ناڤ بەت، و دێ وەكی پەرسیڤی باوەریداری گریت، ئینا ئەم ترسیاین، ئەز هاتمە دەڤ ئیبن مەسعودی و ئەو یێ پالدای بوو، تۆرە بوو و روینشت و گۆت: هەر كەسێ زانی بلا بێژیت و یێ نەزانیت بلا بێژیت: خودێ دزانیت، ب راستی ژ زانینێیە تو بۆ تشتێ نەزانی بێژی ئەز نوزانم ب**

راستی خودێ گۆتە پێغەمبەرێ خۆ: ﴿قُلْ ما أَسْأَلُكُمْ عليه من أَجْرٍ وما أنا من الْمُتَكَلِّفِينَ﴾[1] و قورەیشی گیرۆ بوون موسلمان نەبوون. ئینا پێغەمبەری (ﷺ) نفرین ل وان كرن و گۆت: (ئەی خودا هاریكارییا من ل سەر وان ب حەفت سالان بكە وەكی سالێت یوسفی)، ڤێجا هشكە سالییەكێ ئەو گرتن هەتا ژ ناڤ چۆین، و مرار و هەستی خوارین، و زەلامی د ناڤبەرا عەرد و عەسمانیدا وەكی دویكێلی ددیت، ئینا ئەبو سوفیان هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی موحەممەد، تو بۆ مە یێ هاتی فەرمانێ ب باشیكرنا د گەل مرۆڤان بكەی، و خەلكێ تە ب راستی ژ ناڤ چۆن، دوعا ژ خودێ بكە، و ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿فَارْتَقِبْ يوم تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ﴾ هەتا گۆتنا وی ﴿عَائِدُونَ﴾ ئەرێ ما دێ ئیزایا ئاخرەتێ ل سەر وان راكەت ئەگەر هات، پاشی بزڤرنە گاورییا خۆ، و ئەڤە رامانا گۆتنا وییە: ﴿يوم نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى﴾ رۆژا بەدرێیە ﴿الم غُلِبَتْ الرُّومُ﴾ هەتا گۆتنا وی ﴿سَيَغْلِبُونَ﴾ و سەركەفتنا ڕۆمێ ل سەر فارسان بۆری.

قوله تعالى: ﴿فما بَكَتْ عليهم السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ﴾.

**گۆتنا خودایێ مەزن: و عەرد و عەسمان بۆ وان نەگرین پشتی مە د هیلاك برین.**

٧٦٠ – عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (ما من مؤمنٍ إِلَّا ولَهُ بابانِ بابٌ يصعَدُ منهُ عملُهُ، وبابٌ ينزِلُ منهُ رزقُهُ فإذا ماتَ بَكَيا عليهِ فذلِكَ قولُهُ عزّ وجل: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ٢٩﴾[2]. [ت٣٢٥٥].

* ضعيف.

---

(١) هەی پێغەمبەر بێژە: بەرانبەری پێغەمبەراتییا خۆ ئەز چو كرێیان ژ هەوە ناخوازم، و ئەز نە ژ وانم یێت خۆ تشتەك ددانن، و ئەو ب خۆ ئەو نە.

(٢) شێخ سالحی ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا و ب هەر وێ هژمارێ شینێ ئینا یە: ٧٦٠ – عن ابن عباس رضي الله عنهما في قوله عزّ وجل: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ﴾ قال: يُفقَدُ المؤمنُ أربعينَ صباحاً.[ك٣٦٧٩].

* قال الذهبي: صحيح.

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(باوەریدار نینە ئەگەر وی دو دەرگەهـ نەبن د دەرگەهەکیڕا کارێت وی بلند دبن و د دەرگەهەکیڕا رزقێ وی دهێتە خوارێ، و ئەگەر مر بۆ دکەنە گری، و ئەڤەیە مەبەست ژ گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزن: ﴿فما بَكَتْ عليهم السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وما كَانُوا مُنْظَرِينَ﴾).**

٧٦١ - عَنْ عَلِّيٍ قَالَ: إِنَّ المؤمِنُ إذا مَاتَ بَكَى عَلَيْهِ مُصَلاَّهُ مِنَ الأَرْضِ وَمَصْعَدُ عَمَلِهِ مِنَ السَّمَاءِ، ثُمَّ تَلا: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ﴾. [مخ٢/٧٤١]

* إسناده حسن.

**ژ عەلییێ کورێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر بەندەیێ راستکار مر نڤێژگەهـا وی ژ عەردی و جهێ بلندبوونا کارێ وی ژ عەسمان و عەردی بۆ دکەنە گری پاشی ئەڤە: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ﴾ خواند.**

## (٤٦)

## سورة الأحقاف

## سۆرەتا ئەحقاف

قوله تعالى: ﴿أَوْ أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾ [٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: یان پاشماییەكی ژ زانینا ملەتێت كەڤن.**

٧٦٢ – عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ؛ قَالَ سُفْيَانُ: لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): ﴿أَوْ أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾. قَالَ: (الْخَطُّ). [حم١٩٩٢].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ سوفیانی، ژ سەفوانێ كوڕێ سولەیمی ژ ئەبی سەلەمەیێ كوڕێ عەبدولرەحمانی ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) سوفیانی گۆت: ئەز نوزانم ئەگەر ژ پێغەمبەری (ﷺ) نەبیت: رامانا ﴿أو أثَارَةٍ من عِلْمٍ﴾ گۆت: (ئەو خیچە).**

قوله تعالى: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ﴾ [١٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو كوڕێ دبێژیتە دەیبابێت خۆ ئۆف بۆ هەوە ئەز ژ هەوە بێ تێرم، ئەرێ هوین من دترسینن.**

٧٦٣ – (خ) عَنْ يُوسُفَ بْنِ ماهَكَ قَالَ: كانَ مَرْوانُ عَلَى الْحِجَازِ، اسْتَعْمَلَهُ مُعَاوِيَةُ، فَخَطَبَ فَجَعَلَ يَذْكُرُ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ لِكَيْ يُبَايَعَ لَهُ بَعْدَ أَبِيهِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ شَيْئاً، فَقَالَ: خُذُوهُ، فَدَخَلَ بيْتَ عائِشَةَ فَلَمْ يَقْدِرُوا، فَقَالَ مَرْوَانُ: إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللهُ فِيهِ: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ﴾، فَقَالَتْ عائِشَةُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: ما أَنْزَلَ اللهُ فِينَا شَيْئاً مِنَ القُرْآنِ، إِلاَّ أَنَّ اللهَ أَنْزَلَ عُذْرِي. [خ٤٨٢٧].

ژ یووسفێ کورێ ماهکی گۆت: مەروان والیێ معاوییەی بوو ل سەر حیجازێ، گۆتار دخواند و بەحسێ زەیدێ کورێ موعاویەی دکر دا پەیمانان بدەنە وی پشتی بابێ وی، ئینا عەبدولرەحمانێ کورێ ئەبوبەکری تشتەك گۆتێ، ئینا گۆت: وی ببەن (ئانکو بگرن) ئینا چۆ د خانییێ عائیشایێڤە و نەشیان بگرن، ئینا مەروانی گۆت:

ئەڤە ئەوە یێ خودێ د راستا ویدا ئینایە خوارێ: ﴿وَالَّذِي قال لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا أَتَعِدَانِنِي﴾ ئینا عائیشایێ پشت پەردێ گۆت: خودێ چو ژ قورئانێ د راستا مەدا نەئینایە خوارێ ژ بلی خودێ دەستویرییا من ئینا خوارێ.

(٤٧)

## سورة محمد

## سۆرەتا موحەممەد

قوله تعالى: (وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ).

**گۆتنا خودایێ مەزن؛ و ئەگەر هوین گەلی مرۆڤان پشتا خۆ بدەنە گوهدارییا خودێ و گوهدارییا پێغەمبەرێ وی، و ئەگەر مالی د رێکا خودێدا نەمەزێخن، خودێ دێ هەوە ب ملەتەکێ دی گوهۆڕیت، پاشی ئەو وەکی هەوە نابن.**

٧٦٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ ذَكَرَ اللهُ: إِنْ تَوَلَّيْنَا اسْتُبْدِلُوا بِنَا، ثُمَّ لَمْ يَكُونُوا أَمْثَالَنَا؟ قَالَ: وَكَانَ سَلْمَانُ بِجَنْبِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قَالَ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَخِذَ سَلْمَانَ، وَقَالَ: (**هَذَا وَأَصْحَابُهُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ؛ لَوْ كَانَ الْإِيمَانُ مَنُوطاً بِالثُّرَيَّا، لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ فَارِسَ**). [ت ٣٢٦١]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: هندەك کەسان ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو کینە ئەوێت خودێ بەحسێ وان کری، ئەگەر ئەم پشتا خۆ بدەینە گوهدارییا خودێ و گوهدارییا پێغەمبەرێ وی دێ مە ب ملەتەکێ دی گوهۆڕیت، پاشی ئەو وەکی مە نابن؟. گۆت: و سەلمان ب رەخ پێغەمبەرێ خودێڤە بوو (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) دەستێ خۆ ل رانێ سەلمانی دا و گۆت: (ئەڤە و هەڤالێت وی ئەز ب وی کەسە یێ کار و جانێ من د دەستێ ویدا ئەگەر باوەری ب ستێرێڤە یا گرێدای بیت دێ هندەك زەلام ژ فارسا گەهنێ).**

(٤٨)

سورة الفتح

**سۆرەتا فەتح**

قوله تعالى: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ [٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەی پێغەمبەر ب ڕاستی مە تو یێ هنارتی، ببییە شاهد و مزگینئین و ئاگەهداركەر.**

٧٦٥ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما: أَنَّ هذِهِ الآيَةَ الَّتِي فِي الْقُرْآنِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ۝٤٥﴾ [الأحزاب]. قَالَ فِي التَّوْرَاةِ: يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَحِرْزاً لِلأُمِّيِّينَ، أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي، سَمَّيْتُكَ المتَوَكِّلَ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلاَ غَلِيظٍ وَلاَ سَخَّابٍ بِالأَسْوَاقِ، وَلاَ يَدْفَعُ السَّيِّئَةَ بِالسَّيِّئَةِ، وَلكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ، وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ المِلَّةَ الْعَوْجاءَ، بِأَنْ يَقُولُوا: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، فَيَفْتَحَ بِهَا أَعْيُناً عُمْياً، وَآذَاناً صُمّاً، وَقُلُوباً غُلْفاً.

[خ٤٨٣٨ (٢١٢٥)].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) كو ئەڤ ئایەتا د قورئانێدا هاتی: ﴿يا أَيُّهَا النبي إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ گۆت د تەوراتێدایە: ئەی پێغەمبەر ب ڕاستی مە تو یێ هنارتی، ببییە شاهد و مزگینئین و پارێزەر بۆ نەخواندەواران (ئانكو عەرەبان) تو بەندەیێ منی و پێغەمبەرێ منی، من ناڤێ تە یێ كرییە پشتبەستكار ب خودێ، نە یێ هشكە و نەیێ دلرەقە، و نەیێ دەنگ بلندە ل بازاران، و خرابییێ ب خرابییێ چارەسەر ناكەت (خرابییێ نادانیتە جهێ خرابییێ) بەلێ ئازا دكەت و لێ دبۆریت و خودێ وی نامرینیت هەتا ملەتێ خوار پێ ڕاست نەكەت كو**

**بێژن: (لَا إِلَهَ إلا الله) چو خودایێت راست و دورست و هەژی پەرستنێ نینن خودێ نەبیت، ڤێجا خودێ پێ چاڤێت کۆرە و گوهێت کەڕ و دلێت دائێخستی ڤەکەت.**

**قوله تعالى: ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ [٢٦].**

**گۆتنا خودایێ مەزن: و پەیڤا پارێزکارییێ (لا إله إلا الله) بۆ وان هەلبژارت.**

٧٦٦ – عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾. قَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ). [ت٣٢٦٥].

* صحيح.

**ژ ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) د ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى﴾دا گۆت: (لَا إِلَهَ إلا الله) چو خودایێت راست و دورست و هەژی پەرستنێ نینن خودێ نەبیت.**

قوله تعالى: ﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ﴾ [٢٩]

**گۆتنا خودایێ مەزن: نیشانا وان یا ل سەروچاڤێت وان ژ بەر سوجدەبرنێ.**

٧٦٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ﴾. قَالَ: السَّمْتُ الْحَسَنُ. [هق٢/٢٨٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا: ﴿سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾ گۆت: ئەو دەنگ و باسێت باشن (یان ژیانەکا سەرفەرازە).**

٧٦٨ . عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عُمَرَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ قَالَ : مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ : أَنَا حَاضِنُكَ فُلاَنٌ. وَرَأَى بَيْنَ عَيْنَيْهِ سَجْدَةً سَوْدَاءَ فَقَالَ : مَا هَذَا الأَثَرُ بَيْنَ عَيْنَيْكَ؟ فَقَدْ صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ فَهَلْ تَرَى هَا هُنَا مِنْ شَيْءٍ؟.

[هق٢/٢٨٦].

**ژ سالمێ بابێ نەزری گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ ئیبن عومەری، سلاڤ کرێ، گۆتێ تو کی؟ گۆت: ئەز فلانم چاڤدانکارێ تە، و د ناڤبەرا چاڤێت ویدا نیشانا سەجدەکا رەش دیت، ئینا گۆتێ: ئەڤە چ نیشانە ل ئەنیا تە؟ ب راستی من هەڤالینییا پێغەمبەری (ﷺ) و ئەبوبەکری و عومەری و عوسمانی یا کری ما تشتەکێ وەسا ئها ل ڤێرێ دبینی (مەبەست ئەنیا خۆیە)؟**

٧٦٩ . عَنْ أَشْعَثَ بْنِ أَبِي الشَّعْثَاءِ عَنْ أَبِيهِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ : أَنَّهُ رَأَى أَثَرًا فَقَالَ : يَا عَبْدَ اللَّهِ إِنَّ صُورَةَ الرَّجُلِ وَجْهُهُ ، فَلاَ تَشِنْ صُورَتَكَ. [هق٢/٢٨٦].

**ژ ئەشعەسێ کورێ ئەبی شەعسائی ژ بابێ خۆ ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی نیشانەك ب ئەنیا ئێکیڤە دیت، ئینا گۆت ئەی بەندەیێ خودێ ب راستی وێنەیێ زەلامی سەروچاڤێت وینە ڤێجا وێنەیێ خۆ کرێت نەکە.**

٧٧٠ . عَنْ أَبِي عَوْنٍ قَالَ : رَأَى أَبُو الدَّرْدَاءِ امْرَأَةً بِوَجْهِهَا أَثَرٌ مِثْلُ ثَفِنَةِ الْعَنْزِ ، فَقَالَ : لَوْ لَمْ يَكُنْ هَذَا بِوَجْهِكِ كَانَ خَيْرًا لَكِ. [هق٢/٢٨٦].

**ژ ئەبی عەونی (رحمه الله) گۆت: ئەبو دەردائی ژنەك دیت و نیشانەکا وەکی چۆکێ بزنێ ل ئەنیا وێ بوو، ئینا گۆتێ: ئەگەر ئەڤە ل ئەنیا تە نەبا بۆ تە ب خێرتر بوو.**

(٤٩)

سورة الحجرات.

**سۆرەتا حوجورات**

قوله تعالى: ﴿لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ [٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گەلی ئەوێت هەوە باوەری ئینایی، دەنگێ خۆ ب سەر دەنگێ پێغەمبەری نەئێخن.**

٧٧١ - (خ) عَنْ نَافِعِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كادَ الْخَيِّرَانِ أَنْ يَهْلِكَا: أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رضي الله عنهما، رَفَعَا أَصْوَاتَهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) حِينَ قَدِمَ عَلَيْهِ رَكْبُ بَنِي تَمِيمٍ، فَأَشَارَ أَحَدُهُما بِالأَقْرَعِ بْنِ حابِسٍ أَخِي بَنِي مُجَاشِعٍ، وَأَشَارَ الآخَرُ بِرَجُلٍ آخَرَ. قَالَ نَافِعٌ: لاَ أَحْفَظُ اسْمَهُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ: ما أَرَدْتَ إِلاَّ خِلاَفِي! قَالَ: ما أَرَدْتُ خِلاَفَكَ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فِي ذلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ﴾ الآيَةَ.

قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: فَمَا كانَ عُمَرُ يُسْمِعُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَعْدَ هذِهِ الآيَةِ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ ذلِكَ عَنْ أَبِيهِ؛ يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ. [خ٤٨٤٥، (٤٣٦٧)].

**ژ نافعێ كوڕێ عومەری (رحمه الله) ژ كوڕێ ئەبی مەلیكەیی گۆت: نێزیك بوو هەردو چاك ژ ناڤ بچن: ئەبوبەكر و عومەر (خودێ ژ وان رازی بیت) دەنگێت خۆ ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) بلندكرن دەمێ كاروانەك ژ بەنی تەمیم هاتینە دەڤ (دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) ڤیایی ئێك ژ وان هەلبژێریت ببیتە سەركێشێ وان) ئێكی ژ وان ئاماژە كرە ئەقرەعێ كوڕێ حابسی یێ بەنی موجاشع، و یێ دی ئاماژە كرە زەلامەكی دی، نافعی گۆت: ناڤێ وی ل بیرا من نینە، ئینا ئەبوبەكری گۆتە عومەری تە بەس دڤیا دژاتییا من بكەی، گۆت:**

**مەبەستا من دژاتییا تە نینە، ژ بەر ڤێ دەنگێت وان بلند بوون، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ﴾.**

**ئیبن زوبەیری گۆت: پشتی ڤێ ئایەتێ ئێدی عومەری هند دەنگێ خۆ بلند نەدکر پێغەمبەر (ﷺ) باش گولێ ببیت هەتا ژێ خوازتبا دەنگێ خۆ بلند بکەت و ئەڤە ژ بابێ خۆ (باپیرێ) خۆ ئەبوبەکری نەڤەگوهازتییە.**

٧٧٢ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) افْتَقَدَ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنا أَعْلَمُ لَكَ عِلْمَهُ. فَأَتَاهُ فَوَجَدَهُ جالِساً فِي بَيْتِهِ، مُنَكِّساً رَأْسَهُ، فَقَالَ: ما شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: شَرٌّ، كانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ، وَهْوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَأَتَى الرَّجُلُ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ مُوسى بْنُ أَنَسٍ: فَرَجَعَ المَرَّةَ الآخِرَةَ بِبِشَارَةٍ عَظِيمَةٍ، فَقَالَ: (**اذْهَبْ إِلَيْهِ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَلكِنْ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ**). [خ٣٦١٣].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سابتێ كورێ قەیسی نەدیت و پرسیارا وی كر، زەلامەكی گۆت: ئەز دێ بۆ تە رەوشا وی زانم، هاتە دەڤ دیت یێ روینشتییە و سەرێ خۆ یێ چەماندی، ئینا گۆت: رەوشا تە چییە؟ گۆت: رەوشا من یا خرابە، من دەنگێ خۆ ل سەر دەنگێ پێغەمبەری (ﷺ) دئێخست و كریارێت من پویچ بوون و ئەز خەلكێ ئاگریمە، ئەو زەلام هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆتێ وی ئەڤە و ئەڤە گۆت، مووسایێ كورێ ئەنەسی (ئێك ژ ڤەگێرێت فەرموودەیێیە) گۆت: جارا دویماهییێ ب مەزنترین مزگینی زڤریڤە دەڤ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەرە دەڤ پێژێ ب راستی تو نە خلكێ جەهنەمێیی بەلێ تو خەلكێ بەحەشتێیی)[1].**

---

(١) بۆ زانین سابت ل شەرێ یەمامە شەهید بوو.

قوله تعالى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ ﴾ [٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ب ڕاستی ئەوێت ژ پشتا خانییان گازی تە دكەن، باراپتر ژ وان نەزانن.**

٧٧٣ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ فِي قَوْلِهِ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ٤﴾. قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ حَمْدِي زَيْنٌ وَإِنَّ ذَمِّي شَيْنٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (ذَاكَ اللهُ). [ت٣٢٦٧].

* صحيح.

**ژ بەرائێ كوڕێ عازبی (رضي الله عنه) د راستا گۆتنا خودێدا ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ من وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ گۆت: زەلامەك رابی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پەسنكرنا من جوانییە و هاڤێتنا من كرێتییە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەو خودێیە یێ وەسا).**

قوله تعالى: ﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ [٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و بزانن كو ب ڕاستی پێغەمبەرێ خودێ یێ د ناڤ هەوەدا ڤێجا لەزێ ل تشتی نەكەن، و بێی دویڤچۆن سالۆخان وەرنەگرن، ئەگەر گوهێ خۆ د گەلەك تشتاندا دابایە هەوە و ب ئاخفتنا هەوە كربایە، هوین دا كەڤنە د تەنگاڤییێدا، و دا زەحمەت بۆ هەوە چێ بیت.**

٧٧٤ – عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: قَرَأَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ﴾، قَالَ: هَذَا نَبِيُّكُمْ (ﷺ) يُوحَى إِلَيْهِ، وَخِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ لَوْ أَطَاعَهُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُوا، فَكَيْفَ بِكُمُ الْيَوْمَ. [ت٣٢٦٩].

* صحيح الإسناد.

ژ ئەبی نەزرەی (ﷺ) گۆت: ئەبو سەعیدێ خودری ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ﴾ و گۆت: ئەڤە پێغەمبەرێ هەوەیە و وەحی یا بۆ دهێت و باشێت پێشاهی و ئیمامێت هەوە ئەگەر گوهدارییا هەوە د گەلەك تشتاندا كربا دا وەستن یا هوین چاوانە ئەڤرۆ.

قوله تعالى: ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ﴾ [١٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و مە هوین یێت كرینە ملەت ملەت و عەشیر عەشیر دا ئێك و دو بنیاسن.**

٧٧٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ﴾. قَالَ: الشُّعُوبُ: الْقَبَائِلُ الْعِظَامُ، وَالْقَبَائِلُ: الْبُطُونُ. [خ٣٤٨٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ﴾ گۆت:** (الشعوب)**: عەشیرەتێت مەزن مەزنن و** (قبائل)**: بابكن.**

٧٧٦ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَطَبَ النَّاسَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَقَالَ: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا، فَالنَّاسُ رَجُلاَنِ: رَجُلٌ بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللهِ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللهِ، وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ، وخلقَ اللهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ، قَالَ اللهُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾).** [ت٣٢٧٠]

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا ڤەکرنا مەکەهێ گۆتار بۆ خەلکی خواند و گۆت: **(گەلی مرۆڤان ب راستی خودێ خۆمەزنکرنا نەزانینێ و خۆمەزنکرن ب باب و باپیران یا ژ دەڤ هەوە راکری، و خەلك دو مرۆڤن: باش و پارێزکارە ب قەدرە ل دەڤ خودێ و گونەهکار و دلنەخۆشە و یێ بێ بهایە ل دەڤ خودێ، و مرۆڤ هەمی دویندەها ئادەمینە و خودێ ئادەم یێ ژ ئاخێ چێ کری، خودێ دبێژیت: ﴿يا أَيُّهَا الناس إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ من ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾)**[1].

---

(١) رامانا ئایەتێ ب کورتی: گەلی مرۆڤان، ب ڕاستی مە هوین ژ نێر و مێیەکێ ئانکو زەلام و ژنەکێ کو ئادەم و حەوانە پێت داین، و مە هوین پێت کرینە ملەت ملەت و عەشیر عەشیر دا نێك و دو بنیاسن، ب ڕاستی یێ ژ هەوە هەمییان پتر ب ڕێز و ڕویمەت ل دەڤ خودێ، ئەوە یێ ژ هەوە هەمییان تەقواتر ئانکو یێ ژ هەوە هەمییان پتر ژ خودێ دترسیت، و خودێ زێدە زانا و شارەزایە).

(٥٠)

سورة ق

**سۆرەتا قاف**

قوله تعالى: ﴿ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ ﴾ [١٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و مرۆڤ چو ئاخفتنان ناکەت چ باش چ خراب، ئەگەر ملیاکەتەکێ کارکری و زێرەڤانێ د گەل، نەنڤیسیت.**

٧٧٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ١٨﴾. قَالَ: يَا غُلامُ، أَسْرِجِ الفَرَسَ، إِسْقِ مَاءً، لا يُكْتَبُ إلا الخَيْرُ والشَّرُّ. [ك٣٧٣٠/ مخ١٢/٣٠٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عیکریمەی (ﷺ) ژ ئیبن عباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا** (مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إلا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ) **گۆت: ئەی جەحێلۆك هەسپی زینکە، ئاڤێ بدە من، و ژ بلی باشی و خرابیێ ناهێتە نڤیسین.**

قوله تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾ [٤٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و چەندەکێ ژ شەڤێ ژی تەسبیحا وی بکە، و پشتی نڤێژان ژی.**

٧٧٨ – (خ) عَنْ ابنِ عباسٍ قال: أَمَرَهُ أَنْ يُسبِّحَ فِي أَدْبَارِ الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا؛ يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿ وَأَدۡبَٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾. [خ٤٨٥٢].

**ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خودێ فەرمانا پێغەمبەرێ خۆ کر ئەو پشتی هەمی نڤێژان تەسبیحا خودێ بکەت و ئەڤەیە رامانا گۆتنا وی: ﴿وأدبار السُّجُودِ﴾.**

(٥١)

سورة الذاريات

## سۆرەتا ذاريات.

قوله تعالى: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا۝١﴾ [١].

## گۆتنا خودایێ مەزن: سویند ب بایێت بەلاڤکەر.

٧٧٩ - عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: رَأَيْتُ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَّيَ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَامَ عَلى المِنْبَرِ فَقَالَ: سَلُونِي قَبْلَ أَنْ لا تَسْأَلُونِي، وَلَنْ تَسْأَلوا بَعْدِي مِثْلِي، قَالَ: فَقَامَ ابْنُ الكَوَّاءِ فَقَالَ: يَا أَمِيْرَ المؤْمنِينَ، ما ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا۝١﴾؟ قَالَ: الرِّيَاحُ، قَالَ: فَمَا ﴿فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا۝٢﴾؟ قَالَ: السَّحَابُ، قَالَ: فَمَا ﴿فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا۝٣﴾؟ قَالَ: السُّفُنُ، قَالَ: فَمَا ﴿فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا۝٤﴾؟ قَالَ: الملائِكَةُ، قَالَ: فَمَنِ ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ۝٢٨ جَهَنَّمَ﴾ [إبراهيم]؟ قَالَ: مُنَافِقُو قُرَيْشٍ. [ك٣٧٣٦]

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئەبی توفەیلی (رحمه الله) گۆت: من میرێ باوەریداران عەلییێ کورێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) دیت چۆ سەر مینبەرێ و گۆت: پرسیارێ ژ من بکەن بەری هوین نەشێن پرسیارێ ژ من بکەن و هوین پشتی من کەسێ وەکی من نابینن پرسیارێ ژێ بکەن، ئینا ئیبن کەواء رابوو گۆت ئەی میرێ باوەریدان: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا﴾ چییە؟ گۆت: بایە، گۆت: پا ﴿الْحَامِلَاتِ وِقْرًا﴾ چییە؟ گۆت: عەورن، گۆت: پا ﴿الْجَارِيَاتِ يُسْرًا﴾ چییە؟ گۆت: گەمینە، گۆت: پا ﴿الْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾ چییە؟ گۆت: ملیاکەتن، گۆت: پا ﴿الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَةَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ جَهَنَّمَ﴾[1]. ئەڤە کینە؟ گۆت: دوڕوییێت قورەیشینە.**

---

**(١) راڤەکرن ب کورتی: ئەرێ ما تە نەدیت، ئەوێت نیعمەت و کەرەما خودێ ژ چاڤکۆرەیی گوهارتی، و ملەتێ خۆ [ب سەرڕەقییا خۆ] کێشاینە خانییێ بنبڕی و هیلاکێ ئەو خانی دۆژەهە دێ چنە تێدا.**

(٥٣)

سورة النجم

## سۆرەتا نەجم

قوله تعالى: ﴿ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ﴾ [٣٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەوێت ژ بلی گونەهێت بچویك، خۆ ژ هەمی گونەهێت مەزن و تەرێف وەكی زنایێ دپارێزن.**

٧٨٠ – عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾؛ قَالَ: زِنى العَينينِ النّظَرُ، وزِنى الشَّفتينِ التَّقْبِيلُ، وزِنى اليَدينِ البَطْشُ، وزِنى الرِّجْلَيْنِ المشْيُ، وَيُصَدِّقُ ذَلك أَوْ يُكَذِّبُهُ الفَرْجُ، فَإِنْ تَقَدَّمَ بِفَرْجِهِ كَانَ زَانياً، وَالا فَهُو اللَّمَمُ. [ك٣٧٥١].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا ﴿إِلَّا اللَّمَمَ﴾ گۆت: زنا چاڤان بەرێخۆدانە، و زنا لێڤان ماچیكرنە، و زنا دەستان گرتن و دەستكرنە، و زنا پێیان چۆن و پێنگاڤ هاڤێتنە، و شەرمینگەهـ مەرەما وان كاران (ڤان ئەندامێت لەشی) یان راست دەردئێخیت یان درەو دردئێخیت، و ئەگەر ب شەرمینگەها خۆ كر ئەو زنایە، و ژ بلی ڤێ ژ گونەهێت بچویكە.**

## (٥٥)

## سورة الرحمن

## سۆرەتا رەحمان

قوله تعالى: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾

**گۆتنا خودایێ مەزن: ڤێجا گەلی مرۆڤ و ئەجنەیان هوین کیژ نیعمەتا خودایێ خۆ درەو ددانن و پەسەند ناکەن.**

٧٨١ - عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقَرَأَ عَلَيْهِمْ سُورَةَ الرَّحْمَنِ مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا، فَسَكَتُوا، فَقَالَ: (**لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الجِنِّ، لَيْلَةَ الجِنِّ، فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُوداً مِنْكُمْ، كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، قَالُوا: لاَ بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ، فَلَكَ الحَمْدُ**). [ت٣٢٩١].

* حسن.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەرکەفتە دەڤ هەڤالێت خۆ و سۆرەتا رەحمان ژ سەرێ سۆرەتێ هەتا دویماهییا وێ بۆ وان خواند، بێ دەنگ بوون. ئینا گۆت: (ب راستی ئەڤ سۆرەتە شەڤا ئەجنە کۆمبووین من خواند و کارڤەدانا وان ژ هەوە باشتر بوو، هەر دەمێ ئەز هاتبامە سەر گۆتنا خودێ: ﴿فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ دگۆتن: نە ب چ کەرەمێت تە خودایێ مە سوپاس و پەسن بۆ تە).**

قوله تعالى: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ [٢٩]

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو هەر وەختەکی کارەکی دکەت.**

٧٨٢ - (خ) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿**كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ**﴾؛ قَالَ: (مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَغْفِرَ ذَنْباً، وَيُفَرِّجَ كَرْباً، وَيَرْفَعَ قَوْماً، وَيَخْفِضَ آخَرِينَ). [خ مقدمة السورة/ جه٢٠٢]

**ئەبو دەردائی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا ﴿كُلَّ يَوْمٍ هو في شَأْنٍ﴾ گۆت: (ژ کارێ وییە گونەهەکێ ژێ دبەت و نەخۆشییەکێ رادکەت و هندە کەسان بلند دکەت و هندەکێت دی نزم دکەت).**

## (٥٦)

## سورة الواقعة

**سۆرەتا واقیعە.**

قوله تعالى: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾ [٧٥].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ڤێجا ب ڕاستی ئەز ب جهێ ستێران سویند دخۆم.**

٧٨٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاس: ﴿**فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ ٱلنُّجُومِ**﴾. قَالَ: نُجُوم القُرْآنِ، فُصِل القرآنُ مِنَ الذِّكر، فَوُضِعَ فِي بَيْتِ العِزَّةِ في السَّماءِ الدُّنيا، فَجَعَلَ جِبْرِيلُ يُنَزِّلُهُ عَلى النَّبِيِّ (ﷺ) يُرَتِّلُهُ تَرْتِيلاً.

[مخ١٠/١٦٢، ٣٩١].

* إسناده حسن.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿فَلَا أقسم بمواقع النُّجُوم﴾ گۆت: ژێکجوداکرنا قورئانێ ژ دەپێ پاراستی هاتە ژێڤەکرن و دانا (بیت العزة)[1] ل عەسمانێ دنیایێ و جبریلی ژ وێرێ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دئینا خوار و قورئان هێدی و ل سەر خۆ بۆ دخواند.

قوله تعالى: ﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴾ [٨٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هوین شوینا سوپاسی و شوکرا رِزقێ خۆ بکەن درەوان دکەن (خودێ بارانێ و رِزقی ددەتە هەوە، شوینا هوین سوپاسییا وی بکەن هوین درەوان دکەن، و دبێژن ب ئاخفتنا وێ هە یان ب ڤێ ستێرێ باران بۆ مە هات).**

٧٨٤ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مُطِرَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شَاكِرٌ، وَمِنْهُمْ كَافِرٌ، قَالُوا: هذِهِ رَحْمَةُ اللهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَقَدْ صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا). قَالَ: فَنَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ٨٢﴾ [الواقعة]. [م٧٣].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) باران بۆ خەلکی هات، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(سپێدە ل خەلکی بوو هندەك سوپاسدارن و هندەك گاورن، گۆتن: ئەڤە دلۆڤانییا خودێیە و ب دلۆڤانییا وی باران بۆ مە هات، و هندەکا ژ وان گۆتن: ڤێ ستێرێ و ڤێ گۆتنێ راست گۆت و باران بۆ مە هات، ئینا ئەڤ ئایەتە** ﴿فلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾ **هاتە خوارێ هەتا گەهشتییە** ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾.

---

(١) هەر عەسمانەکی بەرامبەر کەعبەیێ مالەك یا هەی، ئەو مالا ل عەسمانێ حەفتێ دبێژنێ: (البيت المعمور) مالا ئاڤاکری و ئەو مالا ل عەسمانێ دنیایێ رِاستا کەعبەیێ دبێژنێ: (بيت العزة).

## (٥٧)

## سورة الحديد

## سۆرەتا حەدید

قوله تعالى: ﴿ أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾ [١٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەرێ ما وەخت نەهاتییە دلێ خودان باوەران ب بیرئینانا خودێ و قورئانێ بترسیت.**

٧٨٥ - (م) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَا كَانَ بَيْنَ إِسْلاَمِنَا وَبَيْنَ أَنْ عاتَبَنَا اللهُ بِهذِهِ الآيَةِ: ﴿أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾، إِلاَّ أَرْبَعُ سِنِينَ. [م٣٠٢٧].

[وانظر: ٦٧١].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: چو د ناڤبەرا موسلمانبوونا مە و گازندا خودێ ب ڤێ ئایەتێ ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ ل مە كری نەبوو چار سال نەبن.**

(٦٨)

## سورة المجادلة

## سۆرەتا موجادیلە

قوله تعالى: ﴿ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ [٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و هەر وەختەکێ دئێنە دەڤ تە وێ سلاڤێ ل تە دکەن ئەوا خودێ ل تە نەکری.**

٧٨٦ – عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ يَهُودِيّاً أَتَى عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَأَصْحَابِهِ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ عَلَيْهِ الْقَوْمُ، فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ): **(هَلْ تَدْرُونَ مَا قَالَ هَذَا)**؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، سَلَّمَ يَا نَبِيَّ اللهِ! قَالَ: **(لاَ، وَلَكِنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا، رُدُّوهُ عَلَيَّ)**، فَرَدُّوهُ، قَالَ: **(قُلْتَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ)**؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) عِنْدَ ذَلِكَ: **(إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَقُولُوا: عَلَيْكَ)**، قَالَ: عَلَيْكَ مَا قُلْتَ، قَالَ: **﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ﴾**. [ت٣٣٠١].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: جوهییەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی و گۆت:** (السَّامُ عَلَيْكُمْ) **ئانکو: مرن بۆ هەوە بیت، سەحابان سلاڤ لێ وەرگێرا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەوە زانی ڤی چ گۆت)؟ گۆتن: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ وی سلاڤ کر، ئینا گۆت: (نەخێر، بەلێ وی ئەڤە گۆت و ئەڤە گۆت، کا وی بۆ من بزڤرینن)، ئینا زڤراند، و گۆتێ تە گۆت:** (السَّامُ عَلَيْكُمْ) **گۆت: بەلێ، ئینا وی دەمی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ خودانێت کتێبان سلاڤ کرە هەوە، هوین بێژن ل سەر تە بیت)، گۆت: ل سەر تە بیت یا تە گۆتی، گۆت:** ﴿وإذا جاؤوك حَيَّوْكَ بِمَا لم يُحَيِّكَ بِهِ الله﴾.

قوله تعالى: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟...﴾ [٨-١٠]

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەو مال بۆ وان فەقیر و زارێت مشەختن ئەوێت ژ ناڤ مال و جه و وارێت خۆ هاتینە دەرئێخستن، داخوازا كەرەم و ڕازیبوونا خودایێ خۆ دكەن (ئانكو دا بگەهنە كەرەم و ڕازیبوونا خودایێ خۆ، مشەخت بوون)، و دینێ خودێ ب سەردئێخن و هاریكاریا پێغەمبەرێ وی دكەن، و ئەڤەنە د باوەریا خۆدا ڕاست و دورست. و ئەوێت بەرێ ل مەدینەیێ ئاكنجی، و باوەری ئینایین بەری مشەخت بچنە مەدینەیێ، ئەو حەژ وان مشەختان دكەن ئەوێت قەستا وان كرین، و چو كەرب و دلڕەشییێ د دلێت خۆدا نابینن بەرانبەری مشەختان، ژ بەر مالێ پێغەمبەری دایییە وان مشەختان، و ئەو وان ب پێش خۆ دئێخن و وان ژ خۆ فەرتر ددانن، خۆ چەند د هەوجە و دەست تەنگ ژی بن، و ئەوێت خۆ ژ چڕوویكیا نەفسا خۆ دپارێزن، ئەون سەرفەراز. و ئەوێت د دویڤ وانڕا هاتین دبێژن: خودێوۆ گونەهێت مە و یێت برایێت مە یێت بەری مە باوەری ئینایین ژێ ببە، و نەڤیانا وان ئەوێت باوەری ئینایین نەئێخە د دلێت مەدا، و مە د ڕاستا واندا زكرەش نەكە، خودێوۆ تو میهرەبان و دلۆڤانی.**

٧٨٧ - عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه قَالَ: النَّاسُ عَلى ثَلاثِ مَنَازِلَ: فَمَضَتْ مِنْهُمُ اثْنَتَانِ وَبَقِيَتْ وَاحِدَةٌ، فَأَحْسَنُ مَا أَنْتُم كَائِنُونَ عَلَيْهِ أَنْ تَكُونُوا بِهذِهِ المَنْزِلَةِ الَّتِي بَقِيَتْ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ...﴾ الآية، ثُمَّ قَالَ: هَؤلاءِ المهَاجِرُونَ، وَهذِهِ مَنْزِلَةٌ، وَقَدْ مَضَتْ. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ...﴾ الآية، ثُمَّ قَالَ: هَؤلاءِ الأَنْصَارُ، وَهَذِهِ مُنْزِلَةٌ، وَقَدْ مَضَتْ. ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ...﴾ الآية، قَالَ: فَقَدْ مَضَتْ هَاتَانِ المَنْزِلَتَانِ، وَبَقِيَتْ هَذِهِ المَنْزِلَةُ، فَأَحْسَنُ مَا أَنْتُمْ كَائِنُونَ عَلَيْهِ أَنْ تَكُونُوا بِهذِهِ المَنْزِلَةِ الَّتِي بَقِيَتْ. [ك٣٨٠٠].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ سەعدێ كوڕێ ئەبی وەققاسی (ﷺ) گۆت: خەلك سێ ڕێزن، دو ژ وان یێت بۆرین، و ئێك یا مایی، باشترین كاروبار هوین ل سەر بن هوین د ڤێ ڕێزێدا بن ئەوا مایی. پاشی**

**ئەڤ ئایەتە: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ﴾ خواند. پاشی گۆت: ئەڤە مشەختی بوون و ئەڤ رێزە یا بۆری. پاشی ئەڤ ئایەتە: (لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ) خواند، پاشی گۆت: ئەڤە پشتەڤانن خەلکێ مەدینەیێ و ئەڤ رێزە یا چۆی. پاشی ئەڤ ئایەتە: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ خواند، و گۆت: هەردو رێز ییێت چۆین و ئەڤ رێزە یا مای ڤێجا باشترین کاروبار هوین ل سەر بن هوین د ڤێ رێزێدا بن ئەوا مایی.**

قوله تعالى: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ [٩].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەو مشەختییان ب پێش خۆ دئێخن و وان ژ خۆ فەرتر ددانن، خۆ چەند د هەوجە و دەست تەنگ ژی بن، و ئەوێت خۆ ژ چرویکییا نەفسا خۆ دپارێزن، ئەون سەرفەراز.**

٧٨٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ)، فَبَعَثَ إِلَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ: ما مَعَنَا إِلاَّ الماءُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ يَضُمُّ . أَوْ يُضِيفُ . هَذَا**)؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَا، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: أَكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: مَا عِنْدَنَا إِلاَّ قُوتُ صِبْيَانِي، فَقَالَ: هَيِّئِي طَعَامَكِ، وَأَصْبِحِي سِرَاجَكِ، وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ إِذَا أَرَادُوا عَشَاءً. فَهَيَّأَتْ طَعَامَهَا، وَأَصْبَحَتْ سِرَاجَهَا، وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا، ثُمَّ قامَتْ كَأَنَّهَا تُصْلِح سِرَاجَهَا فَأَطْفَأَتْهُ، فَجَعَلاَ يُرِيَانِهِ أَنَّهُمَا يَأْكُلاَنِ، فَبَاتَا طَاوِيَيْنِ! فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**ضَحِكَ اللهُ اللَّيْلَةَ . أَوْ عَجِبَ . مِنْ فَعَالِكُمَا**)، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾. [خ٣٧٩٨/ م٢٠٥٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری فرێکر پرسیارا کابانیێت خۆ کر، گۆتن: چو ل دەڤ مە نینە ئاڤ نەبیت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (کی دێ د گەل خۆ بەت، یان کی دێ ڤی مێڤان کەت)؟ زەلامەکی ژ**

**پشتەڤانان ڕابوو گۆت: ئەز یا پێغەمبەرێ خودێ، و برە جهێ خۆ و گۆتە ژنا خۆ قەدرێ مێڤانێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بگرە، ئینا گۆت: مە ژ بلی خوارنا بچویکێت خۆ چو نینە، گۆت: خوارنا خۆ دورست بکە و چرایێ خۆ هەلکە و زارۆکێت خۆ بنڤینە ب ئەگەر وان شیڤ ڤیا، ئینا خوارنا خۆ دورست کر و چرایێ خۆ هەلکر و زارۆکێت خۆ نڤاندن پاشی ڕابوو هەروەکی چرایێ خۆ دورست دکەت ئەو ڤەمراند، و هەردویان هۆسا نیشا مێڤانی دا هەروەکی ئەو ژی یێ دخۆن، و ئەو برسی و ل سەر وی زکی نڤستن، و دەمێ سپێدە لێ بووی چۆ دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆتێ: (ب ڕاستی خودێ ژ کارێ هەوە یێ شەڤێدی ڕازی بوو یێ هەوە هەردویان کری) و خودێ ئەڤ ئایەتە ئینا خوارێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ على أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كان بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾.**

قوله تعالى: ﴿ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴾ [٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: بۆچی هوین دبێژن و ناکەن؟**

٧٨٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ قَالَ: قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَتَذَاكَرْنَا، فَقُلْنَا: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الْأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ لَعَمِلْنَاهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ① يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ②﴾ [الصف].

قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلَامٍ: فَقَرَأَهَا عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [ت٣٣٠٩/ مي٢٤٣٥].

* صحيح الإسناد.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ سەلامی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم چەند کەسەك ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڕوینشتینە خوارێ و مە سوحبەت کر و مە گۆت: ئەگەر مە زانیبا خودێ حەژ چ کاران دکەت دا کەین، ئینا خودایێ هەر بلند ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ ما في السماوات وما في الأرض وهو الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ ما لَا تَفْعَلُونَ﴾ و عەبدوللایێ کوڕێ سەلامی گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو بۆ مە خواند.**

(٦٢)

سورة الجمعة

## سۆرەتا جومعە

قوله تعالى: ﴿ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾ [٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و بێ هاتییە هنارتن بۆ هندەکێت دی ژی کو هێژ نەگەهشتینە وان (ئانکو ئەو بێ هاتییە هنارتن بۆ موسلمانێت سەردەمێ پێغەمبەری و پێت پشتی وان دئێن هەتا رۆژا قیامەتێ، ژ عەرەب و نەعەرەبان).**

٧٩٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ: ﴿وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُواْ بِهِمْ﴾، قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ حَتَّى سَأَلَ ثَلاَثاً، وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ، وَضَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ، ثُمَّ قَالَ: (**لَوْ كانَ الإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا، لَنَالَهُ رِجالٌ ـ أَوْ رَجُلٌ ـ مِنْ هؤُلاَءِ**). [خ٤٨٩٧/ م٢٥٤٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) د روینشتی بووین، ئینا سۆرەتا جومعە بۆ هاتە خوارێ: ﴿وَآخَرِينَ منهم لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ﴾ گۆت: من گۆت ئەو کینە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ بەرسڤ نەدا و لێ نەزڤراند، هەتا سێ جاران پرسیار کری، و سەلمانێ فارسی د ناڤ مەدا بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ خۆ دانا سەر و پاشی گۆت: (ئەگەر باوەری ل دەڤ ستێران بیت دێ زەلام یان زەلامەك ژ ڤان گەهیتێ).**

قوله تعالى: ﴿ وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَـٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا ﴾ [١١].

**گۆتنا خودێ: و گاڤا وان بازرگانییەك یان کەیف و شاهییەك دیت، ب بەرڤە دچن و تە دهێلنە ژپێڤە (ل سەر مینبەرێ).**

٧٩١ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ رضي الله عنه قَالَ: أَقْبَلَتْ عِيرٌ وَنَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) الجُمُعَةَ، فَانْفَضَّ النَّاسُ؛ إلاَّ اثْنَيْ عَشَرَ رجُلاً، فَنَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿وَإِذَا رَأَوْاْ تِجَٰرَةً أَوْ لَهْوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمًا﴾. [خ٢٠٦٤ (٩٣٦)/ م٨٦٣].

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: کاروانەك هات و مە نڤێژا خوتبێ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دکر ئینا خەلك ژێکڤەبوون و رابوون دوازدە زەلام تێ نەبن ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿وإذا رَأَوْا تِجَارَةً أو لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾.**

**(٦٣)**

**سوره المنافقون**

**سۆرەتا مونافیقوون.**

قوله تعالى: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گاڤا دوروی دئێنە دەڤ تە دبێژن ئەم شادەییێ ددەین کو ب ڕاستی تو پێغەمبەرێ خودێیی.**

٧٩٢ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) في سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ لأَصْحَابِهِ: لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ. وَقَالَ: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى المدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ ما فَعَلَ، قالُوا: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِمَّا قالُوا شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل تَصْدِيقِي فِي: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾، فَدَعَاهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ، فَلَوَّوْا رُؤُوسَهُمْ. وَقَوْلُهُ: ﴿خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾ [المنافقون:٤]، قَالَ: كانُوا رِجالاً أَجْمَلَ شَيْءٍ.

[خ٤٩٠٣، (٤٩٠٠)/ م٢٧٧٢].

ژ زەیدێ كورێ ئەرقەمی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم وەغەرەكێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتین، تێدا زەحمەت بۆ خەلكی چێ بوو، ئینا عەبدوللایێ كورێ ئوبەی گۆت: ﴿لَا تُنْفِقُوا على من عِنْدَ رسول اللَّهِ حتى يَنْفَضُّوا﴾ چو نەدەنە وان ئەوێت ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ، دا ڤەرەڤن و ل دۆر كۆم نەبن، و گۆت: ﴿لَئِنْ رَجَعْنَا إلى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ منها الْأَذَلَّ﴾ ئەگەر ئەم زڤرینەڤە مەدینەیێ و ئەوێت خودان قەدر و ماقویل و دەستهەلاتدار مەرەما وان ئەو ب خۆنە، دێ بێ قەدر و بێ دەستهەلاتان (مەرەما وان پێغەمبەر و مشەختن) دەرئێخن، ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من بۆ گۆت، ڤرێكرە دویڤ عەبدوللایێ كورێ ئوبەیرا، سویندێت موكم خوارن كو وی وەنەگۆتییە، گۆتن: زەیدی درەو ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، نەخۆشییەكا گران كەفتە د دلێ

مندا ژ بەر ئاخفتنا وان گۆتی، هەتا ئاخفتنا خودایێ مەزن ل سەر راستییا من هاتی: ﴿إذا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ﴾ (ئەگەر دوڕوی هاتنە دەڤ تە) پشتی هینگێ پێغەمبەری (ﷺ) گازی وان كر دا داخوازا گونەهـ ژێبرنێ بۆ وان بكەت، بەلێ وان سەرێت خۆ بادان و روییێ خۆ وەرگێڕان و گۆتنا وی ﴿خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾ و ئەو زەلام بوون و یێت جوان بوون.

(٦٤)

## سورة التغابن

## سۆرەتا تەغابون.

قوله تعالى: ﴿ إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ ﴾ [﴿١٤﴾].

**گۆتنا خودایێ مەزن: گەلی خودان باوەران، ب ڕاستی هندەك ژ ژن و زارۆكێت هەوە دژمنێت هەوەنە، ڤێجا هشیاری وان بن (ئەو كارلێكرنێ ل هەوە نەكەن هوین گونەهێ بكەن یان د ڕێكا خودێدا سست ببن).**

٧٩٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْۚ﴾. قَالَ: هَؤُلَاءِ رِجَالٌ أَسْلَمُوا مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، وَأَرَادُوا أَنْ يَأْتُوا النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَبَى أَزْوَاجُهُمْ وَأَوْلَادُهُمْ أَنْ يَدَعُوهُمْ أَنْ يَأْتُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَأَوْا النَّاسَ قَدْ فَقُهُوا فِي الدِّينِ، هَمُّوا أَنْ يُعَاقِبُوهُمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْۚ﴾ الْآيَةَ. [ت٣٣١٧].

* حسن.

**ژ عیكریمەی ژ ئیبن عەباسی، زەلامەكی پرسیارا ڤێ ئایەتێ ژێ كر: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ من أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾ گۆت: ئەو ئەو زەلام بوون ژ خەلكێ مەكەهێ موسلمان بوون و دڤیان بگەهنە پێغەمبەری (ﷺ)، بەلێ هەڤژینێت وان و زارۆكێت وان نەهێلان ئەو بهێنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ڤێجا دەمێ هاتینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیتن خەلك یێ د دینیدا شارەزا بووین و ڤیان وان سزا بدەن ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئینا خوارێ: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ من أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ﴾.**

(٦٦)

سورة التحريم

## سۆرەتا تەحریم

قوله تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەی پێغەمبەر، بۆچی تشتێ خودێ بۆ تە دورست كری، ل سەر خۆ حەرام و نەدورست دكەی؟**

٧٩٤ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، فَتَواصَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ: أَنَّ أَيَّتَنَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُما فَقَالَتْ لَهُ ذلِكَ، فَقَالَ: (**لاَ، بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَلَنْ أَعودَ لَهُ**)، فَنَزَلَتْ: ﴿**يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ**﴾ إِلَى ﴿**إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ**﴾ لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، ﴿**وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ**﴾ [التحريم:٣] لِقَوْلِهِ: (**بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً**). [خ٥٢٦٧، (٤٩١٢)/ م١٤٧٤].

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ل دەڤ زەینەبا كچا جەحشی د ما و هنگڤین ل دەڤ وێ دخوار، و ئەز و (حفصة) پێكهاتین ئەگەر ئەو هاتە دەڤ هەر ئێك ژ مە، بێژینێ بێهنا مەغافیرێ[1] ژ تە دهێت تە مەغافیر یا خواری، ڤێجا چۆ دەڤ ئێك ژ وان وە گۆتێ، ئینا گۆت: (نەخێر من هنگڤین یێ ل دەڤ زەینەبا كچا جەحشی خواری، و ئەز لێ نازڤرمەڤە)، ئینا ئەڤە ﴿يا أَيُّهَا النبي لِمَ تُحَرِّمُ ما أَحَلَّ الله لك﴾ هاتە خوارێ، هەتا ﴿إِن تَتُوبَا إِلى اللَّهِ﴾ ئانكو عائیشا و (حفصة) ﴿وَإِذْ أَسَرَّ النبي إِلى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ﴾ ژ بەر گۆتنا وی من هنگڤین یێ خواری.**

(١) مەغافیر: ئاڤەكە ژ هندە داران دەردئێخن، تام شرینە و دكەنە د ناڤ ئاڤێدا و ڤەدخۆن و بێهنەكا نەخۆش ژێ دهێت و پێغەمبەری (ﷺ) نەدڤیا بێهنا نەخۆش ژێ بهێت.

قوله تعالى: ﴿ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا ﴾

**گۆتنا خودایێ مەزن: و ئەوێت باوەری د گەل ئینایین ڕۆناهییا وان ل پێشییا وان و ل ملێ وان یێ ڕاستێ دچیت، و دبێژن (وەختێ دیتین ڕۆناهییا دوڕوییان ڤەمری و ل وان بوو تاری): خودێوۆ ڕۆناهییا مە بۆ مە تمام بكە.**

٧٩٥ - عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما في قول الله عزّ وجل: ﴿يَوۡمَ لَا يُخۡزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾، قَالَ: لَيْسَ أَحَدٌ مِن الموَحِّدين إِلَّا يُعْطَى نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَمَّا المنافِق فَيُطفىَ نُورُه، وَالْمُؤْمِنُونَ مُشْفِقٌ مِمَّا رأى مِنْ إِطْفَاءِ نُورِ المنافِق، فَهُوَ يَقُول: ﴿رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾(١). [ك٣٨٣٢]

ضعّفه الذهبي فقال: عُتبة واهٍ.

**ژ ئیبن عباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا** ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾ **گۆت: نینە كەسەك ژ موسلمانان رۆژا قیامەتێ ئەگەر رۆناهییێ نەدەنێ هندیكە یێ دوڕوییە دێ رۆناهییا وی ڤەمریت و باوەریدار ژ ئەڤا دیتی ژ ڤەمریانا رۆناهییا دوڕوی دترسیت، ڤێجا دێ بێژیت:** ﴿رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا﴾ **خودایێ مە رۆناهییا مە بۆ مە تمام بكە.**

---

(١) **شیخ سالحی د مالپەرێ خۆدا ئەڤ فەرموودەییە و ب هەر وێ ژمارێ نینایە:** ٧٩٥ - عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه في قوله تعالى: ﴿قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا﴾ قال: عَلموا أنفسَكُم وأهْليكم الخيرَ. [ك٣٨٢٦]

* قال الذهبي: صحيح على شرطهما.

**ژ عەلیێ كورێ ئەبی تالبی (ﷺ) د گۆتنا خودێدا** ﴿قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا﴾ **گۆت: خێرێ نیشا خۆ و خەلكێ خۆ بدەن.**

قوله تعالى: ﴿ فَخَانَتَاهُمَا ﴾ [١٠].

**گۆتنا خودایێ مەزن: وان هەردو ژنان خیانەت ل وان کرن (نە خیانەتا نامویسێ، ژنا نووحی دگۆت نووح یێ دینە، و ژنا (لوط)ی مێڤانێت وی ئاشکەرا دکرن).**

٧٩٦ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾، قَالَ: مَا زَنَتا، أَما امْرَأَةُ نُوحٍ فَكَانَتْ تَقُولُ لِلنّاسِ: إِنَّهُ مَجْنُونٌ، وَأَمَّا امْرَأَةُ لُوطٍ فَكَانَتْ تَدُلُّ عَلى الضَّيْفِ، فَذَلك خِيَانَتُهما. [ك٣٨٣٣]

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾ گۆت: وان زنا نەکرییە، هندیکە ژنا نووحی بوو دگۆتە خەلکی ئەو یێ دینە، و هندیکە ژنا (لوط)ی بوو مێڤان نیشا وان ددان و ئەڤەیە خیانەتا وان.**

(٧٠)

## سورة المعارج

## سۆرەتا مەعارج.

قوله تعالى: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ [٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: د ڕۆژەکێدا درێژییا وێ پێنجی هزار سالن.**

٧٩٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾، قَالَ: يوم القيامة. ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ [الحج:٤٧] قَالَ: مِنْ الأيامِ السِّتَّةِ الَّتِي خَلَقَ اللهُ فيها السَّماواتِ والأَرْضَ، وفِي قَوْلِهِ: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ [السجدة:٥] قَالَ: مِنَ الأَيامِ السِّتة الَّتِي خَلَقَ اللهُ فِيها السَّماوات والأَرْضَ. [مخ١٢/١١٤]

* إسناده حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) د گۆتنا خودێدا** ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ **گۆت: ئەو ڕۆژا قیامەتێیە، د گۆتنا خودێدا** ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾ **گۆت: ژ وان شەش ڕۆژانە یێت خودێ تێدا عەرد و عەسمان چێکرین و د گۆتنا خودێدا:** ﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ **گۆت: ژ وان شەش ڕۆژانە یێت خودێ تێدا عەرد و عەسمان چێکرین.**

قوله تعالى: ﴿لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ﴾ [٢٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و گۆتنە دویکەفتییێت خۆ: پەرستییێت خۆ نەهێلن، و وەدد و سوواع و (یغوث) و یەعووق و نەسری نەهێلن ئەڤە بوتێت وان بوون.**

٧٩٨ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: صَارَتِ الأَوْثَانُ الَّتِي كانَتْ فِي قَوْمِ نُوحٍ فِي الْعَرَبِ بَعْدُ، أَمَّا وُدٌّ: كَانَتْ لِكَلْبٍ بِدُوْمَةِ الجَنْدَلِ، وَأَمَّا سُوَاعٌ: كانَتْ لِهُذَيْلٍ، وَأَمَّا يَغُوثُ: فَكانَتْ لِمُرَادٍ، ثُمَّ لِبَنِي غُطَيْفٍ بِالجُرُفِ عِنْدَ سَبا، وأَمَّا يَعُوقُ: فَكانَتْ لِهَمْدَانَ، وَأَمَّا نَسْرٌ: فَكانَتْ لِحِمْيَرَ، لآلِ ذِي الْكَلاَعِ. أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحى الشَيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ: أَنِ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمْ الَّتِي كانُوا يَجْلِسُونَ أَنْصَاباً وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ، فَفَعَلُوا، فَلَمْ تُعْبَدْ، حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولئِكَ، وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ، عُبِدَتْ. [خ٤٩٢٠].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: بوت د ناڤ ملەتێ نووحیدا بوون، پاشی پشتی وان هاتنە د ناڤ عەرەباندا، هندیكە (وددە) بوتێ عەشیرەتا كەلب بوو، و ل (دەومەت ئەلجەندەل) بوو، و هندیكە (سوواعە) یێ هوزەیل بوو، و هندیكە (یەغوس) یێ موراد بوو، پاشی یێ بەنی غەتیف ل نهالەكێ ل دەڤ سەبەئییان بوو، و هندیكە (یەعوقە) بوتێ هەمەدان بوو، و هندیكە (نەسرە) یێ حیمیەر بوو یێ بنەمالا كیلاع بوو، و ئەڤە ناڤێت مرۆڤێت چاك بوون ژ ملەتێ نووحی، ڤێجا دەمێ مرین شەیتانی ئێخستە سەر دلێ خەلكێ وان پەیكەرێت وان داننە د دیوانخانێت ئەو لێ دروینشتن و ب ناڤێت وان ناڤ بكەن، ئینا وەكرن، ئەو نەهاتنە پەرستن هەتا ئەو مرۆڤ مرین و زانین نەمای هاتنە پەرستن.**

قوله تعالى: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾

**گۆتنا خودایێ مەزن: بێژە ملەتێ خۆ خودێ تەعالا وەحی بۆ من هنارت كو كۆمەكا ئەجنەیان گوهدارییا قورئانێ كرن.**

٧٩٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: انْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، عامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ، فَقَالُوا: ما لَكُمْ؟ فَقَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ، قَالَ: ما حالَ بَيْنَكُمْ

وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إِلاَّ ما حَدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا ما هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حَدَثَ. فَانْطَلَقُوا، فَضَرَبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، يَنْظُرُونَ ما هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حالَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، قَالَ: فَانْطَلَقَ الَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بِنَخْلَةَ، وَهْوَ عامِدٌ إِلَى سُوقِ عُكاظٍ، وَهْوَ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ، فَلَمَّا سَمِعُوا القُرْآنَ تَسَمَّعُوا لَهُ، فَقَالوا: هَذَا الَّذِي حالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، فَهُنَالِكَ رَجَعُوا إِلى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ۝٢﴾. وَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل عَلَى نَبِيِّهِ (ﷺ): ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾، وَإِنَّمَا أُوحِيَ إِلَيْهِ قَوْلُ الجِنِّ. [خ٤٩٢١ (٧٧٣)/ م٤٤٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل کۆمەکا هەڤالێت خۆ چۆنە بازارێ عوکاز و د وی دەمیدا ناڤبرەك کەفتبوو د ناڤبەرا شەیتانان و دەنگوباسێت عەسمانیدا، و گوڕی تێ دهاتنە وەرکرن، ڤێجا شەیتان زڤرینەڤە، و گۆتنە وان ئەڤە هەوە خێرە؟ گۆتن: ناڤبرەك کەفتە د ناڤبەرا مە و عەسمانیدا، و گوڕی د مە هاتنە وەرکرن، گۆتن: چو تشت نەکەفتییە د ناڤبەرا هەوە و دەنگوباسێت عەسمانیدا ئەو نەبیت رویدانەك رویدا بیت، ڤێجا هەرن هوین ل رۆژهەلات و رۆژئاڤایێت عەردی بگەرن، و بەرێ خۆ بدەنێ و لێ بگەرن کا ئەڤە چ تشتە چێ بووی. ڤێجا ئەو ژی چۆن و ل رۆژهەلات و رۆژئاڤایێت عەردی هاتن و چۆن و لێ گەریان کا ئەڤە چ تشتە بوویە ئەگەر ناڤبرەك بکەڤیتە د ناڤبەرا وان و دەنگوباسێت عەسمانیدا، ڤێجا ئەوێت بۆ لایێ رێکا تیهامێ هاتین چۆنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل نەخلەیێ و وی دڤیا بچیتە بازارێ عوکاز، ڤێجا دەمێ ئەو هاتین دیتن پێغەمبەر (ﷺ) یێ نڤێژا سپێدەیێ ل بەراهییا هەڤالێت خۆ دکەت، ڤێجا دەمێ دەنگێ قورئانێ گوه لێ بووین، وان گوهێ خۆ دانێ و گۆتن: ئها ئەڤە ئەو تشتە یێ رێ ل بەر هەوە و دەنگوباسێت عەسمانی گرتی، و بوویە ناڤبر د ناڤبەرا هەودا، ڤێجا ئەو ل ڤێرێ زڤرینە دەڤ ملەتێ خۆ و گۆتن: هەی ملەتێ مە: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا﴾ و خودایێ**

**مەزن ئەڤ سۆرەتە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا خوار: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ﴾ و ئەو وحییا خودێ بۆ پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) ئینایە خوارێ ئاخفتنا ئەجنەیان بوو.**

٨٠٠ - (ق) عَنْ مَعْنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَأَلْتُ مَسْرُوقاً: مَنْ آذَنَ النَّبِيَّ (ﷺ) بِالْجِنِّ لَيْلَةَ اسْتَمَعُوا الْقُرْآنَ؟ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُوكَ . يَعْنِي عَبْدَ اللهِ . أَنَّهُ آذَنَتْ بِهِمْ شَجَرَةٌ.

[خ٣٨٥٩/ م٤٥٠/ ١٥٣].

**ژ مەعنێ كورێ عەبدولرەحمانی گۆت: من گوه ل بابێ خۆ بوو گۆت: من پرسیارا مەسرووقی كر، شەڤا ئەجنەیان گوهدارییا قورئانێ كرین كێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاگەهدار كر؟ گۆت: بابێ تە عەبدوللایێ كورێ مەسعودی گۆتە من دارەكێ ئەو ژ وان ئاگەهدار كر.**

٨٠١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الْجِنُّ يَصْعَدُونَ إِلَى السَّمَاءِ يَسْتَمِعُونَ الْوَحْيَ، فَإِذَا سَمِعُوا الْكَلِمَةَ زَادُوا فِيهَا تِسْعاً، فَأَمَّا الْكَلِمَةُ فَتَكُونُ حَقّاً، وَأَمَّا مَا زَادُوهُ فَيَكُونُ بَاطِلاً، فَلَمَّا بُعِثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُنِعُوا مَقَاعِدَهُمْ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِإِبْلِيسَ، وَلَمْ تَكُنْ النُّجُومُ يُرْمَى بِهَا قَبْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ لَهُمْ إِبْلِيسُ: مَا هَذَا إِلاَّ مِنْ أَمْرٍ قَدْ حَدَثَ فِي الْأَرْضِ، فَبَعَثَ جُنُودَهُ، فَوَجَدُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَائِماً يُصَلِّي بَيْنَ جَبَلَيْنِ، أُرَاهُ قَالَ: بِمَكَّةَ، فَلَقُوهُ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: هَذَا الَّذِي حَدَثَ فِي الْأَرْضِ. [ت٣٣٢٤]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەجنە بلندبوونە عەسمانی و گوهدارییا وەحییێ دكرن، ڤێجا ئەگەر پەیڤەك گوه لێ ببا نەهـ ل سەر زێدە دكرن، و هندیكە ئەو پەیڤ بوو یا راست بوو، بەلێ ئەوا ل سەر زێدە دكر درەو بوو، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتییە هنارتن جهێت وان ل وان هاتنە گرتن، ئینا ئەڤە بۆ ئبلیسی گۆتن، و بەری هینگێ گورِی د وان نەدهاتە وەركرن، ئینا ئبلیسی گۆتە وان: ئەڤە نەبوویە بۆ هندێ نەبیت رویدانەك یا ل عەردەكی رویدای، ئینا سەربازێت خۆ هنارتن، دیتن پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤبەرا دو چیایاندا یێ راوەستایە نڤێژێ دكەت، ئەز دبێژم گۆت: مەككەهێ، و هاتنە دەڤ و سوحبەت بۆ كرن، ئینا گۆت: ئەڤەیە د عەردیدا رویدای.**

(٧٣)

سورة المزمل

**سۆرەتا موززەممیل**

قوله تعالى: ﴿ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ [٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: شەڤێ هەمییێ ڕابە نڤێژان بكە، كێمەك تێ نەبیت.**

٨٠٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ أَوَّلُ الْمُزَّمِّلِ، كَانُوا يَقُومُونَ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى نَزَلَ آخِرُهَا، وَكَانَ بَيْنَ أَوَّلِهَا وَآخِرِهَا سَنَةٌ. [د١٣٠٥].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: دەمێ دەستپێكا موززەممیل هاتییە خوارێ ئەو وەكی ڕابوونا خۆ د هەیڤا ڕەمەزانێدا ڕادبوون هەتا دویماهییا وێ هاتییە خوارێ و د ناڤبەرا دەستپێك و دویماهییا وێدا سالەك بوو.**

(٧٤)

سورة المدثر

**سۆرەتا مدثر**

قوله تعالى: ﴿ ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا ﴾ [١١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ژ من و وی ڤەبە، (وەلیدێ كوڕێ موغیرەیی) یێ من ئەو دایی و ئەو ب تنێ.**

٨٠٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ الوَلِيدَ بْنَ المغيرةِ جَاءَ إلى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَرَأَ عَلَيْهِ القُرْآنَ، فَكَأَنَّهُ رَقَّ لَهُ، فَبَلَغَ ذلكَ أَبَا جَهْلٍ فَأَتَاهُ فَقَالَ: يَا عَمِّ، إِنَّ قَوْمَكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَجْمَعُوا لَكَ مَالاً، قَالَ: لِمَ، قَالَ: لِيُعْطُوكَهُ فَإِنَّكَ أَتَيْتَ مُحَمَّداً لِتَعْرِضَ لِمَا قِبَلَهُ، قَالَ: قَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِهَا مَالاً، قَالَ: فَقُلْ فِيهِ قَوْلاً يَبْلُغُ قَوْمَكَ أَنَّكَ مُنْكِرٌ لَهُ، أَوْ أَنَّكَ كَارِهٌ لَهُ، قَالَ: وَمَاذَا أَقُولُ؟ فَوَاللهِ مَا فِيكُمْ رَجُلٌ أَعْلَمُ

بِالأَشْعَارِ مِنِّي، وَلا أَعْلَمُ بِرَجَزِهِ وَلاَ بِقَصِيدِهِ مِنِّي، وَلا بِأَشْعَارِ الجِنِّ، وَاللهِ مَا يُشْبِهُ الَّذِي يَقُولُ شَيْئاً مِنْ هذا، وَوَاللهِ إِنَّ لِقَوْلِهِ الَّذِي يَقُولُ حَلاوَةً، وإِنَّ عَلَيْهِ لَطَلاوَةً، وإِنَّهُ لَمُثْمِرٌ أَعْلاهُ، مُغْدِقٌ أَسْفَلُهُ، وَإِنَّهُ لَيَعْلُو وَمَا يُعْلى، وإِنَّهُ لَيَحْطِمُ ما تَحْتَهُ! قَالَ: لا يَرْضَى عَنْكَ قَوْمُكَ حَتَّى تَقُولَ فِيْهِ، قَالَ: فَدَعْنِي حَتَّى أُفَكِّرَ، فَلَمَّا فَكَّرَ قَالَ: هذا ﴿سِحْرٌ يُؤْثَرُ﴾ يَأْثُرُهُ عَنْ غَيْرِهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا﴾.

[ك٣٨٧٢].

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: وەلیدێ کوڕێ موغیرەیی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و پێغەمبەری قورئان بۆ خواند، و هەروەکی دلێ وی بۆ نەرم بوو، ئەڤە گەهشتە ئەبو جەهلی هاتە دەڤ و گۆتێ: مامۆ مرۆڤێت تە پێت دبینن بۆ تە پارا کۆم بکەن، گۆت: ژ بەر چ؟! گۆت: دا بدەنە تە تو چۆیە دەڤ موحەممەدی دا ئەوا تە قەبویل کری بهێلی، ئینا گۆت: بێ گۆمان قورەیشی دزانن من پتر وان هەمیان مال یێ هەی، گۆت: ئاخفتنەکێ د ڕاستا ویدا بێژە مرۆڤێت تە بزانن تو باوەر ژ وی ناکەی، یان تە ئەو نەڤێت، گۆت: ما ئەز چ بێژم؟! ب خودێ کەس د ناڤ هەوەدا ژ من شارەزاتر نینە ب هۆزانێ نە د ڤەهاندن و نە د لێکدانێدا و نە د هۆزانێن ئەجنەیاندا، ب خودێ ئەڤە نەوەکی چو تشتییە ژ ئەڤێ خەلك دبێژن، و ب خودێ ئەو ئاخفتنا ئەو دبێژیت تام و شرینییا خۆ یا هەی، و جوانی و خۆشییەك یا بۆ هەی، د بندا کانییە دزێت، و د سەردا بەرهەمی دئینیت، و ئەڤە نەئاخفتنا مرۆڤایە، و هەر بلند دبیت و چو تشت ب سەر وێ ناکەڤن، و هەر تشتەکێ د بن خۆدا پویچ دکت، گۆت: ب خودێ ملەتێ تە دەستان ژ تە بەرنادەن هەتا تو تشتەکی د دەرهەڤا ویدا دبێژی، گۆت: پا بهێلە ئەز هزرا خۆ تێدا بکەم، پشتی هزرێن خۆ کرین گۆت: ئەڤە سێربەندییەکە دەست بۆ دەستی دهێتە**

**ڤەگوهازتن، كارتێكرنێ ل هەر تشتەكی دكەت، ئینا ئەڤە هاتە خوارێ ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً﴾.**

قوله تعالى: ﴿ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ﴾ [٥١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ژ شێرەكی یێت رەڤین.**

٨٠٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ﴾. قَالَ: هُوَ رِكْزُ النَاسِ. قَالَ سُفْيَانُ: يعني: حِسُّهُمْ وَأَصْوَاتُهُمْ. [مخ١١/٢٥٢].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا : ﴿فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ﴾ گۆت: ئەو دەنگێ مرۆڤایە، و سوفیانی گۆت. ئانكو پێژن و دەنگێ وان.**

(٧٥)

سورة القيامة

## سۆرەتا ئەلقیامە

قوله تعالى: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴾ [١٦].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەی پێغەمبەر ئەزمانێ خۆ ب لەز ل قورئانێ نەگەڕینە ژ ترسا ژ بیرکرنێ.**

٨٠٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ١٦﴾. قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكُمْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُحَرِّكُهُمَا، فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ. فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ١٧﴾ قَالَ: جَمْعَهُ لَكَ فِي صَدْرِكَ وَتَقْرَأَهُ، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ١٨﴾ قَالَ: فاسْتَمِعْ لَهُ وَأَنْصِتْ، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ١٩﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا أَنْ تَقْرَأَهُ، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَعْدَ ذلِكَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ اسْتَمَعَ، فَإِذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) كَمَا قَرَأَهُ.

[خ٥/ م٤٤٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ﴾ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەحمەت ب ژبەرکرنا قورئانێ دبر، و ژ بەر ڤێ لێڤێت خۆ دلڤلڤاند، (بەری جبریل (سلاڤ لێ بن) ژێ ب دویماهی هاتبا، هندی هند یێ رژد بوو بۆ ژبەرکرنێ، نەکو هندەکێ ژێ ژ بیر بکەت و ژێ ببۆریت، لەوا دڤیا زوی ژ بەر بکەت) ئیبن عەباس دبێژیت: و ئەز بۆ هەوە یێت دلڤلڤینم هەروەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دلڤلڤاندن، و سەعیدی گۆت: و ئەز بۆ هەوە یێت دلڤلڤینم هەروەکی من ئیبن عەباس دیتی دلڤلڤاندن، ئینا خودایێ مەزن ئەڤ ئایەتە ل سەر وی ئینانە خوارێ ﴿لَا**

**تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ﴾ گۆت: د سینگێ تەدا كۆم بكەین و تو بخوینی، ﴿فإذا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ﴾ گۆت: گوهداریێ بكە و گوهدێربە، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ پاشی ل سەر مەیە تو بخوینی و پێغەمبەری (ﷺ) پشتی هینگێ ئەگەر جبریلی وەحی بۆ ئینابا گوهداری دكر و ئەگەر جبریل چۆبا پێغەمبەری (ﷺ) دخواند هەروەكی وی دخواند.**

(٧٧)

سورة المرسلات.

**سۆرەتا مورسەلات**

قوله تعالى: ﴿ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴾ [٣٢].

**گۆتنا خودایێ مەزن: وی ئاگری هندە چریسك ژێ دچن، تەمەتی ئاڤاهییێت مەزنن.**

٨٠٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: ﴿تَرْمِى بِشَرَرٍ﴾ كُنَّا نَعْمِدُ إِلَى الخَشَبَةِ ثَلَاثَةَ أَذْرُعٍ، أَوْ فَوْقَ ذلِكَ، فَنَرْفَعُهُ لِلشِّتَاءِ، فَنُسَمِّيهِ الْقَصَرَ. ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾: حِبَالُ السُّفُنِ تُجْمَعُ حَتَّى تَكُونَ كَأَوْسَاطِ الرِّجَالِ. [خ٤٩٣٣ (٤٩٣٢)].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گۆتنا خودێدا: ﴿تَرْمِي بِشَرَرٍ﴾ گۆت: مە دارێ سێ گەز یان پتر دئینا و مە بۆ زڤستانێ بلند دكر و مە دگۆتێ قەسر ﴿كَأَنَّهُ جمالة صُفْرٌ﴾ وەریسێت گەمیانە دكەڤنە د گەلێك هەتا وەكی ناڤتەنگا زەلامان لێ دهێت.**

(٧٨)

## سورة النبأ

## سۆرەتا نەبەء.

قوله تعالى: ﴿ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴾ [۳٤].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و پەرداغێت تژی مەی (کو سەرێ وان پێ نەئێشیت).**

۸۰۷ - (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ: ﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾، قَالَ: مَلأَى مُتَتَابِعَةً. قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ: اسْقِنَا كَأْساً دِهَاقاً. [خ۳۸۳۹، ۳۸٤۰].

**ژ عیکریمەی (رحمه الله) د گۆتنا خودێدا: ﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾ گۆت: و پەرداغێت تژی و د دویڤێکرا، و ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل بابێ خۆ بوو دگۆت: مە د نەزانینێدا دگۆت: پەرداغێت تژی و دویڤێکرا بدە من.**

(٨٠)

## سورة عبس

## سۆرەتا عەبەسە

قوله تعالى: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: مڕویتا وی[1] نەخۆش بوو و بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕا.**

٨٠٨ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أُنْزِلَ ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ فِي ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، أَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَجَعَلَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَرْشِدْنِي، وَعِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) رَجُلٌ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُعْرِضُ عَنْهُ، وَيُقْبِلُ عَلَى الْآخَرِ، وَيَقُولُ: (أَتَرَى بِمَا أَقُولُ بَأْساً)؟ فَيَقُولُ: لاَ، فَفِي هَذَا أُنْزِلَ. [ت٣٣٣١].

* صحيح الإسناد.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەڤ ئایەتە: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ د راستا كوڕێ ئوم مەكتومێ كۆرەدا هاتە خوارێ، هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و دەست پێ كر گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، نیشا من بدە، و زەلامەك ژ گرەگرێت هەڤپشكچێكەران ل دەڤ بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕا و بەرێ خۆ دا یێ دی و دگۆت: ما تو خرابییەكێ د ڤێدا دبینی ئەوا ئەز دبێژم؟ دگۆت: نەخێر، ئینا د ڤێدا ئەڤە هاتە خوارێ.**

قوله تعالى: ﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾ [٣١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: و فێقی و چەرە ژی.**

---

(١) مەخسەد پێغەمبەرە (ﷺ)، دەمێ (عبدالله)یێ كوڕێ (أم مكتوم) هاتییە دەڤ و ئەو یێ مژویل بوو ب ریهـ سپییێت قورەیشییانڤە، و دل تێ هەبوو باوەرییێ بینن، و دەعوەیا وان دكر و ژ ئاگرێ جەهنەمێ دترساندن، و د وی وەختیدا و ئەو یێ ب ڤان گرەگرانڤە مژویل، (عبدالله) هاتە دەڤ و گۆتێ: ئەو تشتێ خودێ نیشا تە دایی بۆ من ژی بێژە و نیشا من بدە، پێغەمبەری (ﷺ) نەدڤیا ئاخفتنا وی د گەل ڤان گرەگران بێتە ڤەبرین، ژ بەر هندێ مڕویتا وی نەخۆش بوو.

٨٠٩ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ٢٧ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ٢٨ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ٢٩ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ٣٠ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ٣١﴾، قَالَ: فَكُلُّ هذا قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَمَا الأَبُّ؟ ثُمَّ نَقَضَ عَصاً كَانَتْ فِي يَدِهِ فَقَالَ: هذا لَعَمْرُ اللهِ التَّكَلُّفُ، اتَّبِعُوا مَا تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنْ هذا الكِتَابِ.

[ك٣٨٩٧].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا: ﴿فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا وَعِنَبًا وَقَضْبًا وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا وَحَدَائِقَ غُلْبًا وَفَاكِهَةً وَأَبًّا﴾ گۆت: ئەڤە هەمی مە زانین بەلێ پا (الْأَبُّ) چییە؟ پاشی دارەك د دەستێ ویدا بوو هاڤێت و گۆت: ئەز ب مانا خودێ کەمە ئەڤ زحمەتخوازییە ل دویف وێ هەرن یا بۆ هەوە ژ ڤێ کتێبێ ئاشکەرا بوویی (هەلبەت ژ لایێ خودێ و پێغەمبەرێ ویڤە).**

## (٩٣)

## سورة الضحى

## سۆرەتا زوحا

قوله تعالى: ﴿ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى﴾ [٣].

**گۆتنا خودایێ مەزن، خودایێ تە پشتا خۆ نەدایییە تە، و کەرب ژ تە ڕانەکرییە.**

٨١٠ – (ق) عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ رضي الله عنه قَالَ: اشْتَكى رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّدُ، إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ، لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاثاً. فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ٢ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ٣﴾. [خ٤٩٥٠ (١١٢٤)/ م١٧٩٧].

ژ جوندبێ کوڕێ سوفیانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو شەڤان یان سێ شەڤان نەساخ بوو نەرابوو، ئینا ژنەك هات و گۆت: ئەی موحەممەد ئەز هیڤی دکەم شەیتانێ تە تو هێلابی ئەڤە دو شەڤە یان سێ شەڤە من نێزیکی تە نەدیتییە، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إذا سَجَى ما وَدَّعَكَ رَبُّكَ وما قَلَى﴾.

(٩٩)

سورة الزلزلة.

**سۆرەتا زەلزەلە**

قوله تعالى: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴾ [٧].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەر کەسێ تەمەت گرانییا پرتا ژ هەمییان بچویکتر ڤەنجییێ بکەت، دێ خەلاتێ وێ ڤەنجییێ بینیت.**

٨١١ - عَنْ صَعْصَعَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ . عَمِّ الْفَرَزْدَقِ .: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقَرَأَ عَلَيْهِ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨﴾، قَالَ: حَسْبِي، لاَ أُبَالِي أَنْ لاَ أَسْمَعَ غَيْرَهَا. [حم٢٠٥٩٣ . ٢٠٥٩٥].

* إسناده صحيح، رجاله رجال الشيخين.

ژ سەعسەعەیێ کوڕێ موعاویەی مامێ فیرەزدەقی، ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە بۆ خواند: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ گۆت: ئەڤە بەسی منە و من خەم نینە من گوهـ ل چو یێ دی نەبیت.

(١٠٢)

سورة التكاثر

**سۆرەتا تەکاسور.**

قوله تعالى: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ [٨].

**گۆتنا خودایێ مەزن: پاشی وێ ڕۆژێ، پرسیارا هەر خێر و خۆشییەکێ دێ ژ هەوە ئێتە کرن.**

٨١٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿**ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ**﴾، قَالَ الزُّبَيْرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَيُّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ عَنْهُ، وَإِنَّمَا هُمَا الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالْمَاءُ؟ قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ**). [ت٣٣٥٦/ جه٤١٥٨].

* حسن الإسناد.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ زوبەیرێ کوڕێ عەوامی ژ بابێ خۆ (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ: ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عن النَّعِيمِ﴾ هاتیە خوار، زوبەیری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کیژ خۆشییێ دێ پرسیارا مە ل سەر هێتە کرن، مانێ ئەو بەس قەسپ و ئاڤن، ئینا گۆت: ب راستی ئەو پرسیارکرن دێ هەر بیت.**

٨١٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ** . يَعْنِي: الْعَبْدَ . **مِنَ النَّعِيمِ أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ، وَنُرْوِيَكَ مِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ**). [ت٣٣٥٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئێکەم تشتێ پرسیار رۆژا قیامەتێ ژێ دهێتە کرن ـ ئانکو بەندەیی ـ ژ خۆشیا ئەو بۆ بهێتە گۆتن: ما مە لەشێ تە بۆ تە ساخلەم نەکربوو، و ما مە تو ب ئاڤا سار تێر نەکربووی).**

٨١٤ – عَنْ جابرٍ قَالَ: أَتَانِي النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَأَطْعَمْتُهُمْ رُطَباً، وَأَسْقَيْتُهُمْ مَاءً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (هَذَا مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ). [حم١٤٦٣٧].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر هاتنە دەڤ من و من روتەب و ئاڤ دانێ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەڤە ژ وێ خۆشیێیە یا دێ پرسیارا هەوە ژێ هێتە کرن).**

(١٠٨)

سورة الكوثر

**سۆرەتا کەوسەر**

قوله تعالى: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: هەی موحەممەد مە گەلەك کەرەم و خێر و خێرات یێت داینە تە، ژ وان رویبارێ (کەوسەر)ێ.. د بەحەشتێدا..**

٨١٥ – (خ) عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَ: سَأَلْتُهَا عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾؟ قالَتْ: نَهَرٌ أُعْطِيَهُ نَبِيُّكُمْ (ﷺ)، شَاطِئَاهُ عَلَيْهِ دُرٌّ مُجَوَّفٌ، آنِيَتُهُ كَعَدَدِ النُّجُومِ. [خ٤٩٦٥].

**ژ ئەبی عوبەیدەی (رضي الله عنه) ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من پرسیارا گۆتنا خودێ: ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَر﴾ ژێ کر؟ ئینا گۆت: ئەو رویبارەکە ب پێغەمبەرێ هەوە هاتییە دان هەردو رەخێت وی لۆلۆیێت کون ییێت ل سەر، ئامانێت وی هندی هەژمارا ستێرانن.**

٨١٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّهُ قَالَ فِي الْكَوْثَرِ: هُوَ الْخَيْرُ الَّذِي أَعْطَاهُ اللهُ إِيَّاهُ.

قَالَ أَبُو بِشْرٍ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: فَإِنَّ النَّاسَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ نَهَرٌ فِي الجَنَّةِ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ: النَّهَرُ الذِي فِي الجَنَّةِ مِنَ الْخَيْرِ الَّذِي أَعْطَاهُ اللهُ إِيَّاهُ. [خ٤٩٦٦].

[انظر: ٢٢٥].

**ژ سەعیدێ کورێ جوبەیری (رضي الله عنه) ژ ئیبن عەباسی(خودێ ژ وان رازی بیت) وی د راستا کەوسەرێدا گۆت: ئەو کەرم و خێرا خودێیە یا دایە پێغەمبەرێ خۆ.**

**ئەبو بیشری گۆت: من گۆتە سەعیدێ کورێ جوبەیری: پانێ خەلك دبێژن: ئەو رویبارەکە د بەحەشتێدا، ئینا سەعیدی گۆت: رویبارێ د بەحەشتێدا ژ وێ خێر و کەرەمێیە یا دایێ.**

(١١٠)

سورة النصر

**سۆرەتا نەصر**

قوله تعالى: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: ئەگەر سەرکەفتنا خودێ و ڤەکرنا مەکەهێ بۆ تە هات، و ب دەست تەڤە هات.**

٨١٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ هَذِهِ السُّورَةَ لَمَّا أُنْزِلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ): ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢﴾، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَيَخْرُجُنَّ مِنْهُ أَفْوَاجاً، كَمَا دَخَلُوهُ أَفْوَاجاً). [مي٩١].

*رجاله ثقاة.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ سۆرەتە دەمێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتییە خوارێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (کۆم کۆمە دێ ژێ دەرکەڤن کا چەوا کۆم کۆمە هاتینە د ناڤدا).**

٨١٨ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَّا أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ): ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ كَانَ يُكْثِرُ إِذَا قَرَأَهَا وَرَكَعَ أَنْ يَقُولَ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) ثَلاَثاً. [حم٣٦٨٣/ ك٣٩٨٣]

* قال الذهبي: صحيح.

[انظر: ٣٨٤٧].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ﴿إذا جاء نَصْرُ اللهِ وَالْفَتْحُ﴾ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتی ئەگەر خواندبا و رکوع بربا زێدە دگۆت: **(خودایێ مە ئەز تە ژ هەمی کێماسییان پاك و پاقژ دکەم و ب هاریکارییا تە، یا خودێ گونەهێت من ژێ ببە ب راستی تو تۆبە وەرگر و دلۆڤانی، سێ جاران).**

(١١٢)

سورة الاخلاص

**سۆرەتا ئیخلاص.**

قوله تعالى: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ [١].

**گۆتنا خودایێ مەزن: (هەی موحەممەد بێژە گاوران ئەوێت دڤێن تو خودایێ خۆ بۆ وان بدەیە نیاسین) بێژە خودێ ئێکە و تاك و تەنیایە.**

٨١٩ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (قَالَ اللهُ: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذٰلِكَ، وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُن لَهُ ذٰلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: لَنْ يُعِيدَنِي كَمَا بَدَأَنِي، وَلَيْسَ أَوَّلُ الخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إِعَادَتِهِ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ: اتَّخَذَ اللهُ وَلَداً وَأَنَا الأَحَدُ الصَّمَدُ، لَمْ أَلِدْ وَلَمْ أُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لِي كُفُأً أَحَدٌ). [خ٤٩٧٤ (٣١٩٣)].

[انظر: ٥٤٢ . ٥٤٥].

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: خودێ گۆت: **(کوڕێ ئادەمی ئەز درەوکەر دانام و بۆ وی نەبوو وەکربا، و خەبەر گۆتنە من و بۆ وی نەبوو وەکربا، هندیکە درەو دانانا وییە بۆ من گۆتنا وییە: من نازڤرینیتەڤە هەروەکی دەستپێکی ئەز دایم، و دەستپێکا ئێکێ یا چێ کری بۆ من ب ساناهیتر نینە ژ زڤرینا وی، و هندیکە خەبەر گۆتنا وییە بۆ من، گۆتنا وییە: من کوڕ یێ بۆ خۆ گرتی و ئەز یێ تاك و تەنیامە و هەوجە و وەجا هەمییان دڤەتینم، و پێدڤی و هەوجەی کەسێ نینم، و ئەز ژ کەسێ نەبوویمە و کەس ژی ژ من نەبوویە و چو هەڤکویڤ بۆ من نینن).**



زانين و ژێدەرێت وێ.

# الكتاب الرابع

# الاعتصام بالسنة

# كتێبا چارێ

# خۆ گرتن ب سونەتێڤە

## ١ـ باب وجوب اطاعة النبي (ص).

## بابەتێ: پێدڤیاتییا گوهدانا پێغەمبەری (ﷺ).

٨٢٠ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ، إلاَّ مَنْ أبى**)، قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَنْ يَأْبى؟ قَالَ: (**مَنْ أطَاعَنِي دَخَلَ الجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أبى**). [خ٧٢٨٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەمی ئوممەتا من دێ چیتە بەحەشتێ ئەو نەبیت یێ نەڤێت)، گۆتن: ما كێ نەڤێت یا پێغەمبەرێ خودێ؟! گۆت: (یێ گوهدارییا من كر ئەو چۆ بەحەشتێ، و یێ گوهدارییا من نەكر وی نەڤیا).**

٨٢١ – وعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**وَما أَمَرْتُكُمْ به فَخُذُوهُ، وَما نَهَيْتُكُمْ عنْه فَانتَهُوا**).

[جه١].

*صحيح.

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر تشتێ من فەرمانا هەوە پێ كر بكەن، و هەر تشتێ من هوین ژێ دانە پاش خۆ ژێ بدەنە پاش).**

٨٢١ – (ق) وعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ سُؤَالُهُمْ وَاخْتِلافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ**). [خ٧٢٨٨، م١٣٣٧].

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ گوهدارییا من كر، ب راستی وی گوهدارییا خودێ كر، و یێ گوهدارییا من نەكر ، ب راستی وی گوهدارییا خودێ نەكر).**

## ٢ ـ باب: السنة من الوحي.

## بابەتێ: فەرموودە ژ وەحییێیە.

٨٢٣ – عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللهِ، وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ**). [ط ١٦٦٢].

**ژ مالكی (رحمه الله) كو گەهشتییە وی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من دو تشت پێت د ناڤ هەودا هێلاین هوین بەرزە نابن هندی هوین خۆ پێڤە بگرن كتێبا خودێیە و فەرموودەیێت پێغەمبەرێ وینە).**

٨٢٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَة رضي الله عنه قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللهِ، وَسُنَّتِي، وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الحَوْضَ**). [ك٣١٩].

* صححه الألباني في صحيح الجامع الصغير (٢٩٣٧).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی من دو تشت پێت د ناڤ هەوەدا هێلاین هوین پشتی وان بەرزەنابن، كتێبا خودێ و فەرموودەیا من، و ئەو ژێكڤەنابن هەتا ل سەر بركێ دهێنە دەڤ من).**

## ٣ ـ باب التاكد: من صحة الحديث.

## بابەتێ: پشتڕاستبوون ژ دورستییا فەرموودەیێ.

٨٢٥ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**سَيَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي أُنَاسٌ يُحَدِّثُونَكُمْ مَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ؛ فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ**). [م٦].

- وفي رواية: (**يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دَجَّالُونَ كذَّابُونَ، يَأْتُونَكُمْ مِنَ الأَحَادِيثِ بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ؛ فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ، لاَ يُضِلُّونَكُمْ وَلاَ يَفْتِنُونَكُمْ**). [م٧].

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کو وی گۆت: **(ل دویماهیا ئوممەتا من دێ هندە مرۆڤ هەبن وێ بۆ هەوە بێژن یا نە هەوە و نە باب و باپیرێت هەوە گوه لێ نەبووی، ڤێجا هشیاری وان بن (ژێ دویرکەڤن) هشیاری وان بن (ژ خۆ دویر بێخن)).**

- و د ڤەگێرەکێدا: دویماهیا **(زەمانی دێ ڤێلبازێت درەوین هەبن دێ وان ئاخفتنا بۆ هەوە بێژن یێت نە هەوە و نە باب و باپیرێت هەوە گوه لێ نەبووی، ڤێجا هشیاری وان بن (ژێ دویرکەڤن) و هشیاری وان بن (ژ خۆ دویر بێخن) هەوە سەردا نەبەن و بەرسڤان بۆ هەوە نەدەن).**

٨٢٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ يَسْأَلُهُ، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى رَأْسِهِ مَرَّةً وَإِلَى رِجْلَيْهِ أُخْرَى، هَلْ يَرَى عَلَيْهِ مِنَ الْبُؤْسِ شَيْئاً، ثُمَّ قَالَ لَهُ عُمَرُ: كَمْ مَالُكَ؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ مِنَ الْإِبِلِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ: صَدَقَ اللهُ وَرَسُولُهُ: **(لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ ذَهَبٍ لَابْتَغَى الثَّالِثَ، وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللهُ عَلَى مَنْ تَابَ)**. فَقَالَ عُمَرُ: مَا هَذَا؟ فَقُلْتُ: هَكَذَا أَقْرَأَنِيهَا أُبَيٌّ، قَالَ: فَمُرَّ بِنَا إِلَيْهِ، قَالَ: فَجَاءَ إِلَى أُبَيٍّ، فَقَالَ: مَا يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ أُبَيٌّ: هَكَذَا أَقْرَأَنِيهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: أَفَأُثْبِتُهَا؟ قَالَ: نعم، فَأَثْبَتَهَا. [حم٢١١١١].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت:** زەلامەك هاتە دەڤ عومەری داخوازا مالی ژێ کر، ئینا دەستهاڤێتێ جارەکێ بەرێ خۆ دا سەرێ وی و جارەکێ پێت وی بەلکی تشتەکی ژ هەژارییێ ژێ ببینیت. پاشی عومەری گۆتێ: تە چەند مال هەیە؟ گۆت: چل حێشتر، ئیبن عەباسی گۆت: من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی راست دبێژن: **(ئەگەر کورێ ئادەمی (ئانکو مرۆڤی) نهالەکا زێری هەبیت، حەز دکەت ببنە دو، و چو دەڤێ وی تژی ناکەت، ئاخ نەبیت، و خودێ تەوبێ ددەتە سەر وی یێ ل وی بزڤریت، و تەوبە ب بال ویڤە بکەت)**. ئینا عومەری گۆت: ئەڤە چییە؟ من گۆت: هۆسا ئوبەی یا بۆ من خواندی، گۆت: مە ببە دەڤ وی، گۆت: هاتە

دەڤ ئوبەی، گۆت: ئەڤە چییە؟ ئوبەی گۆت: هۆسا پێغەمبەرێ خودێ یا بۆ من گۆتی، گۆت: ئەز هۆسا بنەجە بکەم؟ گۆت: بەلێ، ئینا بنەجە کر.

٤ ـ باب: كتابة الحديث والعلم.

**بابەتێ: نڤیسینا فەرموودەیێ و زانینێ.**

٨٢٧ - (م) عَنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَكْتُبُوا عَنِّي ، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ، وَحدِّثُوا عَنِّي وَلاَ حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ** ـ قَالَ هَمَّامٌ: أَحْسِبُهُ قَالَ: ـ **مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ**). [م٣٠٠٤].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو تشتی ژ من نەنڤیسن و هەر کەسێ تشتەك ژ من نڤیسی قورئان نەبیت بلا ژێ ببەت، و ژ من ڤەگوهێزن و چو بەرتەنگی ل سەر هەوە نینە، و هەر کەسێ درەوەکێ ب ناڤێ من بکەت ـ و هەممامی گۆت: ئەز هزر دکەم گۆت: ـ ژ قەستا بلا جهێ خۆ ل جەهنەمێ بگریت).**

٨٢٨ - (خ) عَنْ عبدِ اللهِ بنِ دينارٍ: كتبَ عمرُ بنُ عبدِ العزيزِ إلى أبي بكر بن حزم: انظرْ ما كانَ مِنْ حديثِ رسولِ اللهِ (ﷺ) فاكتبْهُ، فإني خفتُ دروسَ العلمِ وذهابَ العلماءِ. [خ. العلم، باب ٣٤].

**ژ عەبدوللایێ کورێ دیناری (ﷺ) گۆت: عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی نامە بۆ والییێ خۆ ئەبی بەکرێ کورێ حەزمی هنارت: بەرێ خۆ بدەیێ کا چ فەرموودەێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەنە بنڤیسە ب راستی ئەز دترسم زانین نەمینیت و زانا بچن (ئانکو وەغەرکەن و بمرن).**

٨٢٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كُنْتُ أَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أُرِيدُ حِفْظَهُ، فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ، وَقَالُوا: أَتَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَا، فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَوْمَأَ بِأُصْبُعِهِ إِلَى فِيهِ فَقَالَ: **(اكْتُبْ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلاَّ حَقٌّ)**. [د٣٦٤٦/ مي٥٠١].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەر تشتەكێ من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ لێ دبوو و من ڤیابا ژبەر بكەم من دنڤیسی، ئینا قورەیشییان ئەز ژ ڤێ دامە پاش و گۆتن: ئەرێ هەر تشتەكێ تە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ لێ بوو تو دنڤیسی و ئەو مرۆڤە د تۆڕەبوون و رازیبوونێدا دئاخڤیت؟ ئینا من خۆ ژ نڤیسانێ ڤەگرت، و من ئەڤ چەندە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئینا ب تلا خۆ نیشان كرە دەڤێ خۆ و گۆت: بنڤیسە ئەز ب وی كەمە یێ كار و جانێ من د دەستیدا چو ژێ دەرناكەڤیت راستی نەبیت).**

٥ ـ باب: هلك المتنطعون.

**بابەتێ: توندخواز ژ ناڤ چۆن.**

٨٣٠ – (ق) عَنْ عائِشَةَ قالَتْ: صَنَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) شَيْئاً فَرَخَّصَ فِيهِ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَخَطَبَ فَحَمِدَ اللهَ، ثُمَّ قَالَ: **(مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ، فَوَاللهِ إِنِّي لأَعْلَمُهُمْ بِاللهِ، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً)**. [خ٦١٠١/ م٢٣٥٦].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) پێغەمبەری (ﷺ) تشتەك كر و دەستویری پێ دا، ئینا هندەكان خۆ ژێ ڤەگرت، و ئەڤە گەهشتە پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا گۆتار خواند و سوپاسییا خودێ كر پاشی گۆت: (هندە مرۆڤان خێرە خۆ ژ هندە تشتان ڤەدگرن ئەز دكەم، ئەز ب خودێ كەمە ب راستی ئەز ژ وان ب خودێ زاناترم و ژ وان پتر ژێ دترسم).**

٨٣١ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ فَقَالَ: نُهِينَا عَنِ التَّكَلُّفِ. [خ٧٢٩٣].

**و ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: ئەم ل دەڤ عومەری بووین ئینا گۆت: نەهیا مە ژ خۆ زێدەدانانێ یان زێدە پرسیارکرنێ یان دویڤچۆنا تشتێ نەدیار و نەپێدڤی یان زەحمەت بۆ خۆ چێکرنێ یا هاتییە کرن.**

٨٣٢ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ**) قَالَهَا ثَلاَثاً.

[م٢٦٧٠].

**و ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەحمەتخواز و توندخواز ژ ناڤ چۆن)، سێ جاران ئەڤە گۆت.**

٦ ـ باب: احسن الهدي.

**بابەتێ: باشترین راستەرێیی**

٨٣٣ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قال: إِنَّ أَحْسَنَ الحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ (ﷺ)، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَ﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ [الأنعام].

[خ٧٢٧٧ (٦٠٩٨)].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: ب راستی چێترین ئاخفتن کتێبا خودێیە، و باشترین رێك رێكا موحەممەدییە (ﷺ) و خرابترین کار و بار ئەون ئەوێت نوی د دینیدا دهێنە کرن، [(١)]، و ﴿إِنَّ ما تُوعَدُونَ لآتٍ وما أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾[(٢)].**

---

(١) تشتێ نوی د دینیدا دهێتە کرن دبیتە بیدعە، و بیدعە: ئەو تشتە یێ نوی د شەریعەتیدا و چو بنیات و بەلگەیێ شەرعی بۆ نەبیت.

(٢) ب راستی تشتێ پەیمان پێ هاتییە دان بۆ هەوە، دێ هەر ئێت، و هوین نەشێن راگرن، یان خودێ نەچار بکەن [کو ئەو وێ پەیمانێ ب سەرێ هەوە نەئینیت ].

٨٣٤ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ الْغَدَ حِينَ بَايَعَ المسْلِمُونَ أَبَا بَكْرٍ، وَاسْتَوَى عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، تَشَهَّدَ قَبْلَ أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَاخْتَارَ اللهُ لِرَسُولِهِ (ﷺ) الَّذِي عِنْدَهُ عَلَى الَّذِي عِنْدَكُمْ، وهَذَا الْكِتَابُ الَّذِي هَدَى اللهُ بِهِ رَسُولَكُمْ، فَخُذُوا بِهِ تَهْتَدُوا لِمَا هَدَى اللهُ بِهِ رَسُولَهُ.

[خ٧٢٦٩ (٧٢١٩)].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی وی گوهـ ل عومەری بوو رۆژا دووێ دەمێ موسلمانان پەیمان داینە ئەبوبەكری ب سەر مینبەرا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كەفت و بەری ئەبوبەكری شادە دا و گۆت: و پشتی ڤێ: خودێ ئەوا ل دەڤ خۆ ل سەر ئەوا ل دەڤ هەوە بۆ پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) هەلبژارت، و ئەڤ كتێبا خودێ پێغەمبەرێ هەوە پێ راستەرێ كری بگرن دێ راستەڕێ بن وەكی خودێ پێغەمبەرێ خۆ پێ راستەڕێ كری**

## ٧ . باب التزام السنة ورفض المحدثات.

## بابەتێ: پێگری ب سوننەتێ و نەوەرگرتنا تشتێ نوی د دینیدا.

٨٣٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا ما لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ)**. [خ٢٦٩٧/ م١٧١٨].

- وفي رواية لمسلم: **(مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)**.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ تشتەكێ نوی د ڤی دینێ مەدا بكەت و نە ژێ بیت ئەو یا پویچە، ئانكو نەیا قەبویلە).**

- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا هاتییە: (هەر كەسێ كارەكی بكەت نە د گەل دینێ مەدا بیت، ئەو یا پویچە، ئانكو نەیا قەبویلە).**

٨٣٦ - (خ) عن ابْن عَوْنٍ قال: ثَلاثٌ أُحِبُّهُنَّ لِنَفْسِي وَلإِخْوَانِي: هَذِهِ السُّنَّةُ أَنْ يَتَعَلَّمُوهَا وَيَسْأَلُوا عَنْهَا، وَالْقُرْآنُ أَنْ يَتَفَهَّمُوهُ وَيَسْأَلُوا عَنْهُ، وَيَدَعُوا النَّاسَ إِلاَّ مِنْ خَيْرٍ. [خ. الاعتصام، باب ٢].

**ژ ئیبن عەونی (ﷺ) گۆت: سێ تشتان ئەز بۆ خۆ و بۆ برایێت خۆ حەژێ دكەم، ئەڤێ سوننەتێ (مەبەست سوننەتا پێغەمبەرییە (ﷺ). فێرببنێ و بخوازن، و قورئانێ تێبگەهن و بخوازن و خەلكی بهێلن (پێڤە مژویل نەبن) بۆ كارەكێ خێرێ نەبیت.**

٨٣٧ – عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا، فَوَعَظَنَا مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ، وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ كَأَنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ، فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا؟

فَقَالَ: **(أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللهِ، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ عَبْداً حَبَشِيّاً، فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ بَعْدِي فَسَيَرَى اخْتِلاَفاً كَثِيراً، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ، تَمَسَّكُوا بِهَا وَعَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ؛ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ)**.

[د٤٦٠٧/ ت٢٦٧٦/ جه ٤٢/ مي٩٦]

* صحيح.

**ژ عیربازێ كوڕێ سارییە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ): شیرەت و وەعزەكێ كارتێكەر ل مە كر دل بۆ ترسیان و ڕۆندك بۆ هاتنە خوارێ، مە گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ هەروەكی ئەڤە وەعز و شیرەتا خاترخوازەكییە، ڤێجا فەرمانێ ل مە بكە. گۆت: (ئەز فەرمانێ ب تەقوا و ترسا خودێ دكەم و ب گوهدان و گوهدارییێ، خۆ ئەگەر بەندەیەكێ حەبەشی ل سەر هەوە میر بێتە دانان، و ب راستی ئەگەر ئێك ژ هەوە بژیت دێ گەلەك ژێكجودابوونێ بینیت، ل وی دەمی ڕێكا من و ڕێكا خەلیفێت راستەڕێكەر و راستەڕێكری بگرن، ب ددانێت بەرێ دەڤی بگرن، و هشیاری كاروبارێت نوی بن (هەلبەت د شەرعیدا) ب راستی هەر بیدعەكا[1] هەبیت یا پویچە).**

(١) بیدعە ئەو تشتە یێ نوی د شەریعەتیدا و چو بنیات و بەلگەیێ شەرعی بۆ نەبیت.

٨ ـ باب: من دعا الى هدى.

**بابەتێ: ئەو کەسێ گازی باشییەکێ بکەت.**

٨٣٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئاً، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ، كانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئاً**). [م٢٦٧٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ داخوازییا راستەرێکرنەکێ بکەت، ژ خێرێ هند بۆ وییە وەکی یا وان یێت ل دویڤ وی هاتین و گوهێ خۆ داینێ، و ئەڤ چەندە تشتەکی ژ خێرێت وان کێم ناکەت ژێ، و هەر کەسێ داخوازییا خرابییەکێ بکەت[1] ژ گونەهێ هند بۆ وییە وەکی یا وان یێت دویڤ وی هاتین و گوهێ خۆ داینێ و ئەڤ چەندە تشتەکی ژ گونەهێت وان کێم ناکەت ژێ).**

٩ ـ باب من سن سنة حسنة.

**بابەتێ: هەر کەسێ رێکەکا باش بگریت.**

٨٣٩ – (م) عَنْ جَرِير بنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي صَدْرِ النَّهَارِ، قَالَ: فَجَاءَهُ قَوْمٌ حُفَاةٌ عُرَاةٌ مُجْتَابِي النِّمَارِ أَوِ الْعَبَاءِ، مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، عَامَّتُهُمْ مِنْ مُضَرَ، بَلْ كُلُّهُمْ مِنْ مُضَرَ. فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لِمَا رَأَى بِهِمْ مِنَ الْفَاقَةِ، فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ، فَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: (﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ﴾، إِلَى آخِرِ الآيَةِ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ۝١﴾ [النساء:١] وَالآيَةَ [١٨] الَّتِي فِي الْحَشْرِ: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٌ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٍۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ **تَصَدَّقَ رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ، مِنْ دِرْهَمِهِ، مِنْ ثَوْبِهِ، مِنْ صَاعِ بُرِّهِ، مِنْ صَاعِ تَمْرِهِ** ـ حَتَّى قَالَ: ـ **وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ**).

---

(١) **ڤێجا چ ئەو خرابی وی دەرئێخستبیت یان بەری وی هاتبیتە کرن.**

قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادَتْ كَفُّهُ تَعْجِزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجَزَتْ. قَالَ: ثُمَّ تَتَابَعَ النَّاسُ، حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَثِيَابٍ، حتَّى رَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَتَهَلَّلُ، كَأَنَّهُ مُذْهَبَةٌ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَن يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ**). [م١٠١٧].

**ژ جەریرێ کورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: دانێ ئێکێ ژ رۆژێ ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) خەلکەکێ رویس و پارچەکا پەرۆکێ خیچ بەلەك یێ هریێ یان عەبایەك ب سەر ستۆیێ خۆدا بربوونە خوارێ، شیرێت وان د بەردا بوون، بارا پتر، بەلکی هەمی ژ موزرییان بوون، سەروچاڤێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهۆرین و تێك چۆن، پشتی ئەو هەژاری ب وانڤە دیتی، چۆ د ژۆرڤە پاشی دەرکەفت فەرمانا بیلالی کر بانگ دا و قامەت گرت، و نڤێژ کر پاشی خوتبە خواند، و گۆت: (﴿یا أَیُّهَا الناس اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ من نَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ هەتا گەهشتییە دویماهییا ئایەتێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ كان عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[1]. و ئایەتا دی یا دویماهییا سۆرەتا حەشرێ: ﴿اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ ما قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾[2]. زەلامی ژ دیناری خۆ ژ دەرهەمێ خۆ ژ جلکێت خۆ ژ منا گەنمێ خۆ ژ منا ڤەسپێت خۆ، حەتا گۆت: خۆ ب کەرێ ڤەسپەکێ ژی، سەدەقە دا).**

---

(١) رامان ب کورتی: خەلکینۆ پارێزکارییا خودایێ خۆ بکەن [ باوەرییێ پێ بینن و بپەرێسن ] ئەوێ هوین ژ ئێك گیانی ب تنێ ئافراندین [ و ئەوی خودایی ژ وی گیانی ] هەڤسەرا وی ژێ چێ کر [ ئافراند ] و ژ ڤان هەردوکان گەلەك ژن و مێر دان و بەلاڤکرن، و هوین پارێزکارییا خودێ بکەن، ئەوێ هوین ب ناڤێ وی تشتان ژ ئێکدو دخوازن، و هشیاری مرۆڤانییێ بن [ نەقەتینن ] ب راستی خودێ ل سەر هەوە زێرەڤانە.

(٢) رامان ب کورتی: گەلی خودان باوەران ژ خودێ بترسن، و هەر ئێك بلا بەرێ خۆ بدەتێ کا چ کار و کریار بۆ سوبەهی کرینە، و چ ل پێشییا خۆ هنارتییە، و ژ خودێ بترسن، ب راستی هەر تشتەکێ هوین دکەن خودێ ژێ ب ئاگەهە.

زەلامەكی ژ خەلكێ مەدینێ هات بوخچكەك ئینا نێزیك بوو دەستێ وی نەراگریت، بەلكی دورست نەراگرت، پاشی خەلكی دا دویڤێك، هەتا من دو كۆمێت خوارنێ و جلكان دیتین، و هەتا من سەروچاڤێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیتین گەش بووین دا بێژی زێرن.

**پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ د موسلمانەتییێدا كارەكێ باش بكەت، خێرا وی كاری بۆ وییە، و خێرا هەركەسەكێ پشتی وی كار ب وی كاری بكەت، بێی كو تشتەك ژ خێرێت وان كێم ببیت، و هەر كەسێ د موسلمانەتییێدا كارەكێ خراب بكەت، گونەها وی كاری بۆ وییە، و گونەها هەركەسەكێ پشتی وی كار ب وی كاری بكەت، بێی كو تشتەك ژ گونەهێت وان كێم ببیت).**

٨٤٠ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: أَرْبَعٌ يُعْطَاهَا الرَّجُلُ بَعْدَ مَوْتِهِ: ثُلُثُ مَالِهِ إِذَا كَانَ فِيهِ قَبْلَ ذَلِكَ لِلَّهِ مُطِيعاً، وَالْوَلَدُ الصَّالِحُ يَدْعُو لَهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ، وَالسُّنَّةُ الْحَسَنَةُ يَسُنُّهَا الرَّجُلُ فَيُعْمَلُ بِهَا بَعْدَ مَوْتِهِ، وَالْمِائَةُ إِذَا شَفِعُوا لِلرَّجُلِ شُفِّعُوا فِيهِ. [مي٥٣٤]

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: چار تشتان پشتی مرنا مرۆڤی ددەنە مرۆڤی: سێكا مالێ وی ئەگەر ئەو بەری بمریت گوهدارییا خودێ تێدا كربیت[(١)]، و زارۆكێ باش پشتی مرنا وی دوعا بۆ بكەت و رێكا باشە مرۆڤ بگریت و پشتی مرنا وی كار پێ بهێتە كرن، و سەد كەسان ئەگەر شادەیی و بەرەڤانی بۆ كر شادەیی و بەرەڤانییا وی هاتە وەرگرتن.**

(١) ئانكو: ب حەلالی ب دەستخۆڤە ئینابیت و وەسیەت بۆ كارەكێ حەلال كربیت و وەسیەتا وی د مالێ ویدا سێك ب تنێ ب جهـ دئێت ژ بەر گۆتنا پێغەمبەری (ﷺ): سێك، سێك ژی گەلەكە یان یا مەزنە.

## ١٠ ـ باب: قوله (ﷺ): (مثلي ومثلكم)

**بابەتێ: گۆتنا پێغەمبەری مەتەلا من و مەتەلا هەوە.**

٨٤١ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ ما بَعَثَنِي اللهُ بِهِ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْماً فَقَالَ: يَا قَوْمِ! إِنِّي رَأَيْتُ الجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَاءَ، فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا، فَانْطَلَقُوا عَلَى مَهَلِهِمْ فَنَجَوْا، وَكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الجَيْشُ فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي فَاتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، وَمَثَلُ مَنْ عَصَانِي وَكَذَّبَ بِمَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الحَقِّ). [خ٧٢٨٣، (٦٤٨٢)/ م٢٢٨٣].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی مەتەلا من و مەتەلا وی تشتێ خودێ ئەز پێ هنارتیم، وەکی مەتەلا مرۆڤەکییە بهێتە دەڤ هندەك مرۆڤان، و بێژیت: گەلی مرۆڤان ب راستی من سەرباز ب چاڤێت خۆ یێت دیتین، و ئەز ئاگەهدارکەرێ سۆر و سۆرم، ڤێجا خۆ رزگار بکەن، ڤێجا هندەك ژ مرۆڤێت وی گوهدارییا وی بکەن و هەر ل دەستپێکا شەڤێ ب دلێ خۆ دەرکەڤن و رزگار ببن، و هندەکان ژ وان درەو دانا و باوەر ژێ نەکر و د جهێ خۆدا سپێدە ل وان بوو، و سپێدێ سەربازان ب سەر واندا گرت و ژ ناڤ برن و بنبڕ کرن، ئها ئەو مەتەلا وییە یێ گوهدارییا من کری و ل دویڤ وێ چۆی یا ئەز پێ هاتیم و مەتەلا یێ گوهدارییا من نەکری و باوەری ب راستییێ نەئینای یا ئەز پێ هاتیم).**

٨٤٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ النَّاسِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَاراً، فَلَمَّا أَضَاءَتْ ما حَوْلَهُ جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهذِهِ الدَّوَابُّ الَّتِي تَقَعُ فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا، فَجَعَلَ يَنْزِعُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَقْتَحِمْنَ فِيهَا، فَأَنَا آخُذُ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، وَأَنْتُمْ تَقَحَّمُونَ فِيهَا). [خ٦٤٨٣، (٣٤٢٦)/ م٢٢٨٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) وی گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(مەتەلا من و مەتەلا مرۆڤان، وەکی مەتەلا زەلامەکییە: ئاگرەکی هەلکەت، ڤێجا دەمێ دۆرماندۆرێت خۆ رۆنکری بەلاتینك و ئەڤ گیانەوەرۆکە ئەوێت دکەڤنە د ئاگریدا خۆ باڤێژنە تێدا، ڤێجا دەست باڤێژیتێ وان بکێشیت بەلێ ئەو سەری ژ وی بستینن و بکەڤنە تێدا، ڤێجا ئەز ژی ژ پشتڤە هەوە ژ ئاگری دگرم و هوین خۆ دهاڤێژنە تێدا).**

١١ . باب: التحذير من اتباع الامم السابقة.

**بابەت: هشیارکرن ژ دویڤچۆنا ملەتێت بەرێ.**

٨٤٣ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، شِبْراً بِشِبْرٍ، وَذِرَاعاً بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا جُحْرَ ضَبٍّ تَبِعْتُمُوهُمْ)**. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: **(فَمَنْ)**؟. [خ٧٣٢٠، (٣٤٥٦)/ م٢٦٦٩].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی هوین دێ دویڤ رێکێت یێت بەری خۆ چن بهۆست ب بهۆست، گەز ب گەز، هەتا ئەگەر وان کونا بزنمشکەکی گرت هوین ژی دێ وێ کونێ گرن)**، مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو جوهی و فەلەنە؟ ئینا گۆت: **(پا کینە)؟!**.

١٢ . باب: انتم أعلمُ بأمورِ دُنياكم.

**بابەتێ: هوین د کاروبارێ دنیا خۆدا زاناترن.**

٨٤٤ - (م) عَنْ طلحةَ قَالَ: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَقَوْمٍ عَلَى رُؤُوسِ النَّخْلِ، فَقَالَ: **(مَا يَصْنَعُ هَؤُلاَءِ)** ؟ فَقَالُوا: يُلَقِّحُونَهُ، يَجْعَلُونَ الذَّكَرَ فِي الأُنْثَى فَتَلْقَحُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَا أَظُنُّ يُغْنِي ذَلِكَ شَيْئاً)**. قَالَ: فَأُخْبِرُوا بِذلِكَ فَتَرَكُوهُ، فَأُخْبِرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِذَلِكَ فَقَالَ: **(إِنْ كَانَ يَنْفَعُهُمْ ذَلِكَ، فَلْيَصْنَعُوهُ، فَإِنِّي إِنَّمَا ظَنَنْتُ ظَنّاً، فَلاَ تُؤَاخِذُونِي بِالظَّنِّ، وَلَكِنْ إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنِ اللهِ شَيْئاً؛ فخُذُوا بِهِ، فَإِنِي لَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللهِ عزّ وجل)**. [م٢٣٦١].

ژ تەلحەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر هندەك كەسانڕا بۆریم ل گوپێت دارقەسپا بوون. ئینا گۆت: **(ئەڤە چ دكەن)؟** گۆتن: ئەو پەترومەیێ دكەن، یا نێر ددانە سەر یا مێ ئاڤز دبیت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز هزر ناكەم ئەڤە مفایەكی بكەت)**، گۆت: ئینا ئەڤ ئاخفتنە بۆ وان هاتە گۆتن و وان ئەو كار هێلا، ئەڤ چەندە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە گۆتن: ئینا گۆت: **(ئەگەر ئەو كار مفایی ل وان دكەت بلا بكەن، ب راستی من بەس هزرەكا هزركری بلا ب هزرێ ل من نەگرن، بەلێ ئەگەر من تشتەك بۆ هەوە ژ خودێ گۆت، وەرگرن ب راستی ئەز درەوێ ل سەر خودایێ هەر ب هێز و مەزن ناكەم)**.

٨٤٥ - (م) عَنْ عَائِشَةَ وَعَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) مَرَّ بِقَوْمٍ يُلَقِّحُونَ، فَقَالَ: **(لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا لَصَلُحَ)** ، قَالَ: فَخَرَجَ شِيصاً، فَمَرَّ بِهِمْ فَقَالَ: **(مَا لِنَخْلِكُمْ)** ؟ قَالُوا: قُلْتَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: **(أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ)**. [م٢٣٦٣].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) و ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەر (ﷺ) د بەر هندە كەسانڕا بۆری پەترومەیی[(١)] دكرن، ئینا گۆت: **(ئەگەر هوین وەنەكەن دا چێ بیت)**، گۆت: قەسپا وان خراب و چرمسی دەركەفت، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) د بەرڕا بۆری و گۆت: **(ئەڤە دارقەسپێت هەوە خێرە)؟** گۆتن: تە هۆ و هۆ گۆت، گۆت: **(هوین د كاروبارێ دنیا خۆدا زاناترن)**.

---

(١) دبیت هندەك بێژن پەترومە نەوە پشكا دارێ بێخنە د ناڤ تیفلێ دارەكا دیدا و بهێتە گرێدان و پێڤە شین ببیت راستە نەڤە پەترومەیە بەلێ نەڤە گشتییە و ژ ڤێ ژی دگریت، و دبیت نەم بێژینێ دارناڤزی ژی، چونكی د كەلتورێ مە یێ كوردیدا هاتییە سەرێ بهاران بایەكێ نەرم دهێت كورد دبێژنێ بایێ دارئاڤزییێ، ئانكو: تۆڤێ دارێت نێر د گەل خۆ هەلدگریت و دبەتە سەر دارێت مێ و دار ب بەر دكەڤیت.

## ١٣ ـ باب: نسخ السنة بالسنة

## بابەتێ راکرنا فەرمانا فەرمودەیێ ب فەرمانا فەرمودەیێ

٨٤٦ – (م) عَنْ أَبِي الْعَلَاءِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَنْسَخُ حَدِيثُهُ بَعْضُهُ بَعْضاً، كَمَا يَنْسَخُ الْقُرْآنُ بَعْضُهُ بَعْضاً. [م٣٤٤].

**ژ ئەبو عەلائی کورێ شیخیری گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرموودەیا وی هندەك ژ وێ هندەکا دی فەرمانا وێ رادکر، هەروەکی قورئان هندەك ژێ هندەکێ فەرمانا وێ رادکەت.**

## ١٤ ـ باب امره (ص) يقتضي الوجوب.

## بابەتێ: فەرمانا وی (ﷺ) مەبەستا پێڤیاتییێ دخوازیت.

٨٤٧ – عَنْ جَابِرٍ قَالَ: لَمَّا اسْتَوَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ الْجُمُعَةِ، قَالَ: **(اجْلِسُوا)** ، فَسَمِعَ ذَلِكَ ابْنُ مَسْعُودٍ، فَجَلَسَ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَرَآهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(تَعَالَ يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ)**. [د١٠٩١].

* صحيح.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا ئەینی ل سەر مینبەرێ راوەستای گۆت: (روینن)، ئینا ئیبن مەسعودی ئەڤە گوه لێ بوو، ئینا ل سەر دەرگەهێ روینشت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت گۆتێ: (وەرە ئەی عەبدوللایێ کورێ مەسعودی).**

## ١٥ ـ باب: وجوب العمل بالسنة.

## بابەتێ: کارکرن ب فەرموودەیا پێغەمبەری ئەرکە.

٨٤٨ – عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَلاَ هَلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الْحَدِيثُ عَنِّي، وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى أَرِيكَتِهِ، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللهِ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَلاَلاً اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَرَاماً حَرَّمْنَاهُ، وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) كَمَا حَرَّمَ اللهُ)**.

[ت٢٦٦٤/ جه١٢/ مي٦٠٦].

* صحيح.

ژ میقدادێ كوڕێ مەعد یەكروبێ كیندی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نێزیكە مرۆڤ ل سەر تەختێ خۆ یێ پالدای بیت ب فەرموودەیا من باخڤیت ڤێجا بێژیت د ناڤبەرا مە و هەوەدا كتێبا خودێیە هەر تشتێ ئەم حەلال تێدا ببینین دێ حەلال دانین و هەر تشتێ ئەم حەرام تێدا ببینین دێ حەرام دانین، هشیاربن بزانن ب راستی ئەو تشتێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەرام كری وەكی وییە یێ خودێ حەرام كری).**

٨٤٩ - وَعَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ، أَلاَ يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلاَلٍ فَأَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ، أَلاَ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ لَحْمُ الْحِمَارِ الْأَهْلِيِّ، وَلاَ كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السَّبُعِ، وَلاَ لُقَطَةُ مُعَاهِدٍ؛ إِلاَّ أَنْ يَسْتَغْنِيَ عَنْهَا صَاحِبُهَا، وَمَنْ نَزَلَ بِقَوْمٍ فَعَلَيْهِمْ أَنْ يَقْرُوهُ، فَإِنْ لَمْ يَقْرُوهُ فَلَهُ أَنْ يُعْقِبَهُمْ بِمِثْلِ قِرَاهُ). [د٤٦٠٤]

* صحيح.

و ژ وی، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، كو وی گۆت: **(بزانن ب راستی قورئان و وەكی وێ (كو فەرموودەنە) د گەل وێ یێت داینە من[1]، و نێزیكە مرۆڤەكێ تێر ل سەر تەختێ خۆ بێژیت: قورئانێ ب تنێ بگرن هەر تشتێ هەوە حەلال تێدا دیت حەلا بدانن، و هەر تشتێ هەوە حەرام تێدا دیت جەرام بدانن، و بزانن گۆشتێ كەرێ كەهی و گۆشتێ دوڕندەیێت خودان كێلبێت نێچیرێ یێت ب هێز و تشتێ ژ بەختپێدای ئەو نەبیت**

(١) كا چاوا قورئان وەحییە و دڤێت بهێتە وەرگرتن، هۆسا فەرموودە ژی وەحینە و دڤێت بهێنە وەرگرتن، و هەر گاڤا تە ئێك دیت قورئانێ وەردگریت و فەرموودەیان ددەتە پاش، بزانە تێگەهشتنا وی بۆ ئیسلامێ ب سەروبنڤە نە یا دورستە و ئەو یان ژ زانین و ب مەبەست وەدكەت دا خەلكی سەردا ببەت و دینی ل بەر خەلكی بەرزە بكەت، یان ژ نەزانین وەدكەت، یا گرنگ چ ئەڤە بیت یان ئەڤە بیت نە یا دورستە و نابیت ئاخفتنا وان چەند یا شرین بیت مە بخاپینیت و سەردا ببەت.

**خودانێ وێ هێلا بیت نەبێ حەلالە و هەر کەسێ ب مێڤانی چۆ دەڤ هندەک کەسان دڤێت مێڤانداریا وی بکەن، و ئەگەر مێڤانداری بۆ پێشکێش نەکرن بۆ هەیە تەمت مێڤانداریا خۆ ژ وان وەرگریت).**

١٦ ـ باب: التوقي في الحديث عنه (ص).

**بابەتێ: هشیاری د ڤەگوهازتنێدا ژ وی (ﷺ ).**

٨٥٠ – عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ إِذَا حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَدِيثاً، فَفَرَغَ مِنْهُ، قَالَ: أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [جه٢٤]

* صحيح.

**ژ موحەممەدێ کورێ سیرینی (رحمه الله) گۆت: ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) ئەگەر فەرموودەیەك ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگوهازتبا دەمێ ب دویماهی دهات دگۆت: یان وەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتی.**

٨٥١ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: قُلْنَا لِزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ: حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: كَبِرْنَا وَنَسِينَا، وَالْحَدِيثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) شَدِيدٌ. [جه٢٥].

* صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ کورێ ئەبی لەیلای گۆت: مە گۆتە زەیدێ کورێ ئەرقەمی ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ مە بێژە، گۆت: ئەم پیێت مەزن بووین و مە یا ژ بیر کری، و ئاخفتن ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا گرانە.**

١٧ ـ باب: الحديث عن الثقات.

**بابەتێ: ئاختن ژ باوەرپێکرییان.**

٨٥٢ – (م) عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: جَاءَ بُشَيْرٌ الْعَدَوِيُّ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَجَعَلَ يُحَدِّثُ وَيَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَجَعَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ لاَ يَأْذَنُ لِحَدِيثِهِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ،

مَا لِي لاَ أَرَاكَ تَسْمَعُ لِحَدِيثِي؟ أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَلاَ تَسْمَعُ! فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّا كُنَّا مَرَّةً إِذَا سَمِعْنَا رَجُلاً يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ابْتَدَرَتْهُ أَبْصَارُنَا، وَأَصْغَيْنَا إِلَيْهِ بِآذَانِنَا، فَلَمَّا رَكِبَ النَّاسُ الصَّعْبَ وَالذَّلُولَ، لَمْ نَأْخُذْ مِنَ النَّاسِ إِلاَّ مَا نَعْرِفُ. [م. المقدمة ـ باب (٤)].

**ژ موجاهدی (رحمه الله) گۆت: بوشەیرێ عەدەوی هاتە دەڤ ئیبن عەباسی، و دەست پێ کر ئاخفت و دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت، و ئیبن عەباسی گوهێ خۆ نەددا ئاخفتنا وی و بەرێ خۆ نەددایێ، ئینا گۆت: ئەی ئیبن عەباس من خێرە ئەز تە نابینم تو گوهێ خۆ بدەیە ئاخفتنا من و ئەز ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل تە دئاخڤم و تو گوهدارییێ ناکەی؟! ئینا ئیبن عەباسی گۆت: ئەم (مەبەست پێ هەڤالێت پێغەمبەری) ئەگەر مە جارەکێ ژ زەلامەکی گوه لێ ببا دبێژیت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دبێژیت چاڤێت مە دمانە پێڤە و مە ب گوهێت خۆ گوهدارییا وی دکر، بەلێ پشتی مە دیتی خەلکی باش و خراب گرتن ئەم چو ژ خەلکی ناوەرگرین ئەو نەبیت یا ئەم دزانین.**

٨٥٣ – عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ قَالَ: كَانُوا إِذَا أَتَوْا الرَّجُلَ لِيَأْخُذُوا عَنْهُ الْعِلْمَ، نَظَرُوا إِلَى صَلاَتِهِ، وَإِلَى سَمْتِهِ، وَإِلَى هَيْئَتِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُونَ عَنْهُ. [مي٤٣٤]

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبراهیمێ نەخەعی (رحمه الله) گۆت: ئەگەر هاتبانە دەڤ زەلامی دا زانینێ ژێ وەرگرن بەرێ خۆ ددانە نڤێژا وی و سونەتێت وی و سەروبەرێ وی، پاشی ژێ وەردگرتن.**

### ١٨ ـ باب: ما ينقل الحديث بمعناه

### بابەت: ئەرێ فەرمووده ب رامانا وێڤە دهێتە ڤەگێران.

٨٥٤ – عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ قَالَ: إِذَا حَدَّثْنَاكُمْ بِالْحَدِيثِ عَلَى مَعْنَاهُ فَحَسْبُكُمْ. [مي٣٢٤].

* إسناده صحيح.

**ژ واسیلەیێ کوڕێ ئەسقەعی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر مە فەرموودەیەك بۆ هەوە ب رامانا وێڤە گۆت ئەو بەسی هەوەیە.**

٨٥٥ – عن جَرِيرِ بْنِ حَازِمٍ قَالَ: كَانَ الْحَسَنُ يُحَدِّثُ بِالْحَدِيثِ، الْأَصْلُ وَاحِدٌ، وَالْكَلَامُ مُخْتَلِفٌ. [مي٣٢٦].

* إسناده صحيح.

**ژ جەریرێ كورێ حازمی (رحمه الله) گۆت: حەسەنی فەرمووده دگۆتن بنیات ئێك بوو و ئاخفتن (دەربڕین) یا جودا بوو.**

٨٥٦ – عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ الْحُسَيْنِ قَالَ: حَدَّثَ عُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَثَلُ الْمُنَافِقِ مَثَلُ الشَّاةِ بَيْنَ الرَّبِيضَيْنِ، أَوْ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ**) ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: لاَ، إِنَّمَا قَالَ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَزِدْ فِيهِ وَلَمْ يُنْقِصْ مِنْهُ، وَلَمْ يُجَاوِزْهُ وَلَمْ يُقَصِّرْ عَنْهُ. [مي٣٢٧]

* إسناده صحيح.

[انظر: ٨٦٨].

**ژ موحەممەدێ كورێ عەلی كورێ حوسەینی (رحمه الله) گۆت: عوبەیدوللایێ كورێ عومەیری فەرموودەیەك بۆ عەبدوللایێ كورێ عومەری ڤەگێڕا، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مەتەلا دوڕوی وەكی مەتەلا گیسكییە د ناڤبەرا دو مەخەلاندا یان دو پەزاندا)، ئینا ئیبن عومەری گۆت: نەخێر، بەلێ ب راستی پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە و ئەڤە گۆت، و گۆت: و ئەگەر ئیبن عومەری گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) ببا لێ زێدە نەدكر و ژێ كێم نەدكر، و ل سەر زێدە نەدكر، و چو ژێ كێم نەدكر[1].**

## ١٩ . باب: في العرض.

## بابەتێ: بۆ خواندنێ.

٨٥٧ – (خ) عَنِ الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِالْقِرَاءَةِ عَلَى الْعَالِمِ.

**ژ حەسەنێ بەسری، (رحمه الله) گۆت: دورستە بۆ زانایی بهێتە خواندن.**

٨٥٨ – (خ) وعَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ: إِذَا قُرِئَ عَلَى الْمُحَدِّثِ فَلاَ بَأْسَ أَنْ يَقُولَ: حَدَّثَنِي.

---

[1] **یان ژێ نەدبۆری كار پێ نەكربا و تەخسیری تێدا نەدكر.**

**ژ سوفیانێ سەوری (رحمه الله) گۆت: ئەگەر بۆ فەرموودەزانی هاتە خواندن دورستە بێژیت بۆ من گۆت.**

٨٥٩ - (خ) وعَنْ مَالِكٍ وَسُفْيَانَ: الْقِرَاءَةُ عَلَى الْعَالِمِ وَقِرَاءَتُهُ سَوَاءٌ. [خ. العلم، باب ٦].

**و ژ مالكی و سەوری (خودێ ژ وان رازی بیت): خواندن بۆ زانایی و خواندنا زانایی وەكی ئێكن.**

٨٦٠ - عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ: أَنَّهُ كَانَ يَرَى الْعَرْضَ وَالْحَدِيثَ سَوَاءً. [مي٦٦٥]

* إسناده صحيح.

**ژ مالكێ كوڕێ ئەنەسی (رحمه الله) وی بۆ خواندن و ئاخفتن وەرگرتن وەكی ئێك ددیتن.**

## ٢٠ . باب: تأويل حديث النبي (ص).

## بابەتێ: رامانژێبرنا فەرموودەیا پێغەمبەری (ﷺ).

٨٦١ - عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: إِذَا حَدَّثْتُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَدِيثاً، فَظُنُّوا بِهِ الَّذِي هُوَ أَهْنَاهُ وَأَهْدَاهُ وَأَتْقَاهُ. [جه٢٠/ مي٦١٢]

* صحيح.

**ژ عەلیێ كوڕێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) ئەگەر من فەرموودەیەك بۆ هەوە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت، هوین رامانا خۆشتر و راستتر و پارێزكاری پتر تێدا بدەنێ[1].**

٨٦٢ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّهُ حَدَّثَ يَوْماً بِحَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ رَجُلٌ: فِي كِتَابِ اللهِ مَا يُخَالِفُ هَذَا. قَالَ: أَلاَ أُرَانِي أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَتُعَرِّضُ فِيهِ بِكِتَابِ اللهِ؟ كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَعْلَمَ بِكِتَابِ اللهِ مِنْكَ. [مي٦١٠]

* إسناده صحيح.

---

(١) ئانكو ئاخفتنا پێغەمبەری (ﷺ) نابیت ئەم رامانا خراب و مەبەستا خراب بدەینێ، و ئەگەر ئاخفتنا وی دو رامانان هەلگریت یا باشتر و خۆشتر و راستەرێیی تێدا و تەقواداری پتر تێدا دڤێت وێ رامانێ بدەینێ.

**ژ سەعیدێ کوڕێ جوبەیری (رحمه الله) کو وی رۆژەکێ فەرموودەیەك ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئینا زەلامەکی گۆت: د قورئانێدا بەروڤاژی ڤێ یا هەی، ئینا گۆت: ما تو من نابینی ئەز بۆ تە ژ پێغەمبەری (ﷺ) فەرموودەیێ دبێژم، و تو ب قورئانێ بەرێ خۆ ژێ وەرگێری و ناوەرگری و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب قورئانێ ژ تە زاناتر بوو.**

## ٢١ ـ باب تعظيم السنة.

## بابەتێ: مەزنکرنا سوننەتێ.

٨٦٣ - عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَ ابْنُ سِيرِينَ رَجُلاً بِحَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ رَجُلٌ: قَالَ فُلاَنٌ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: أُحَدِّثُكَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) وَتَقُولُ: قَالَ فُلاَنٌ كَذَا وَكَذَا؟! لاَ أُكَلِّمُكَ أَبَداً.

[مي ٤٥٥].

* إسناده حسن.

**ژ قەتادەی (رحمه الله) گۆت: ئیبن سیرینی فەرموودەیەك ژ پێغەمبەری (ﷺ) بۆ زەلامەکی گۆت، ئینا زەلامەکی گۆت: بێڤان ڤێ و ڤێ دبێژیت: ئینا ئیبن سیرینی گۆت: ئەز یێ فەرموودەیێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) بۆ تە دبێژم و تو دبێژی بێڤان و بێڤان ڤێ و ڤێ دبێژن ئەز چو جارا د گەل تە نائاخڤم.**

٨٦٤ - عن مُعْتَمِرِ بْنِ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَا تَخَافُونَ أَنْ تُعَذَّبُوا، أَوْ يُخْسَفَ بِكُمْ أَنْ تَقُولُوا: قَالَ رَسُولُ اللهِ، وَقَالَ فُلاَنٌ؟! [مي ٤٤٥].

* إسناده صحيح.

**ژ موعتەمەرێ کوڕێ سولەیمانێ تەیمی (رحمه الله) ژ بابێ خۆ دبێژیت: ئیبن عەباسی گۆت: ما هوین ناترسن هوین بێنە ئازاردان یان د عەردیدا بهێنە نقۆمکرن هوین بێژن پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دبێژیت و بێڤان دبێژیت.**

٨٦٥ – عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أنه رأى رَجُلاً يُصَلِّي بَعْدَ الْعَصْرِ الرَّكْعَتَيْنِ يُكْثِرُ، قَالَ لَهُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، أَيُعَذِّبُنِي اللهُ عَلَى الصَّلاَةِ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُكَ اللهُ بِخِلاَفِ السُّنَّةِ. [مي ٤٥٠].

* إسناده جيد.

**ژ سەعیدێ کوڕێ موسەیيەبی (رحمه الله) وی زەلامەك دیت پشتی نڤێژا ئێڤاری دو رکعەت دکرن و زێدە دکرن، ئینا گۆتە وی: ئەی بابێ موحەممەدی ما خودێ دێ ل سەر نڤێژان من ئیزا دەت؟! گۆت: نەخێر بەلێ دێ تە ل سەر هێلانا سونەتێ ئیزا دەت.**

٨٦٦ – عَنْ مُحَمَّدٍ بْنِ إِسْمَاعِيل البُخَارِيِّ قَالَ: قَالَ زَكَرِيَّا بْنُ عَدِي: لما قَدِمَ ابْنُ المبَارَكِ الْكُوفَةَ كَانَتْ بِهِ عِلَّةٌ، فَأَتَاهُ وَكِيعٌ وَأَصْحَابُنَا وَالْكُوفِيُّونَ، فَتَذَاكَرُوا عِنْدَهُ، حَتَّى بَلَغُوا الشَّرَابَ، فَجَعَلَ ابْنُ المبَارَكِ يَحْتَجُّ بِأَحَادِيثِ رَسُولِ الله (ﷺ) وَأَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) وَالمهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ قَالُوا: لاَ وَلَكِنْ مِنْ حَدِيثِنَا، فَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: أَخْبَرَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَمْرٍو الْفُقَيْمِي عَنْ فُضَيْل بْنِ عَمْرٍو عَنْ إِبْراهِيمَ قَالَ: كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا سَكِرَ مِنْ شَرَابٍ لَمْ يَحِلَّ لَهُ أَنْ يَعُودَ فِيهِ أَبَداً، فَنَكَّسُوا رُؤوسَهُمْ.

فَقَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ لِلَّذِي يَلِيهِ: رَأَيْتَ أَعْجَبَ مِنْ هَؤُلاَءِ؟! أُحَدِّثُهُمْ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَعَنْ أَصْحَابِهِ وَالتَّابِعِينَ فَلَمْ يَعْبَؤُوا بِهِ، وَأَذْكُرُ عَنْ إِبْراهِيمَ فَنَكَّسُوا رُؤُوسَهُمْ. [هق٨/٢٩٨].

**ژ موحەممەدێ کوڕێ ئیسماعیلێ بوخاری (رحمه الله) گۆت: زەکەریایێ کوڕێ عەدی، گۆت: دەمێ ئیبن موبارەك هاتییە کووفە نەساخییەك لێ بوو، وەکیع و هەڤالێت مە و خەلکێ کووفەیێ هاتنە دەڤ، و بیرا خۆ ل فەرموودەیان ئینان، هەتا گەهشتینە ڤەخوارنێ (مەیێ)، ئیبن موبارەك دەستهاڤێتێ فەرموودەیێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەلگە ئینان و گۆتنێت هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) و مشەختی و ئەنساران خەلکێ مەدینەیێ، گۆتن نەخێر مە دڤێت گۆتنێت خەلکێ مە یێت کووفە بینی، ئینا ئیبن موبارەك گۆت: حەسەنێ کوڕێ عەمرێ فوقەیمی ژ فوزەیلێ کوڕێ عەمری ژ ئیبراهیمی گۆت وان دگۆتن:**

**ئەگەر ژ ڤەخوارنێ سەرخۆش بوو، بۆ وی دورست نینە چو جار لێ بزڤریتەڤە، ئینا سەرێت خۆ چەماندن.**

**ئینا ئیبن موبارەکی گۆتە یێ ب رەخ خۆڤە تە ژ ڤان حێبەتیتر دیتینە، ئەز ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێت و وی و تابعییان وان دئاخێڤم ئەو پویتە پێ نادەن، و ئەز ژ ئیبراهیم وان دئاخێڤم سەرێ خۆ دچەمینن.**

## ٢٢ ـ باب: لا تجتمع الامة على ضلالة.

## بابەتێ: ئوممەت ل سەر خەلەتییێ کۆم نابیت.

٨٦٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنَّ اللهَ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَوَجَدَ قَلْبَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَاصْطَفَاهُ لِنَفْسِهِ، فَابْتَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ، ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ بَعْدَ قَلْبِ مُحَمَّدٍ، فَوَجَدَ قُلُوبَ أَصْحَابِهِ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَجَعَلَهُمْ وُزَرَاءَ نَبِيِّهِ، يُقَاتِلُونَ عَلَى دِينِهِ، فَمَا رَأَى الْمُسْلِمُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ، وَمَا رَأَوْا سَيِّئاً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ سَيِّئٌ. [حم٣٦٠٠]

* إسناده حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: ب ڕاستی خودێ بەرێ خۆ دا دلێت بەندەیان دلێ موحەممەدی باشترین دلێت بەندەیان دیت، بۆ خۆ هلبژارت، و ب نامەیا خۆ هنارت، پاشی بەرێ خۆ دا دلێت بەندەیان پشتی دلێ موحەممەدی، دلێت هەڤالێت وی باشترین دلێت بەندەیان دیت، ڤێجا ئەو کرنە هاریکارێت پێغەمبەرێ خۆ، شەڕی ل سەر دینێ وی دکەن، ڤێجا ئەو تشتێ موسلمان باش ببینن ئەو ل دەڤ خودێ یێ باشە و یا ئەو خراب ببینن ئەو ل دەڤ خودێ یا خرابە.**

## ٢٣ ـ باب حديث الصحابي عن الصحابي.

## بابەتێ: ڤەگێرانا فەرموودەیێ سەحابی ژ سەحابی.

٨٦٨ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: مَا كُلُّ الْحَدِيثِ سَمِعْنَاهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، كَانَ يُحَدِّثُنَا أَصْحَابُنَا عَنْهُ، كَانَتْ تَشْغَلُنَا عَنْهُ رَعِيَّةُ الْإِبِلِ. [حم١٨٤٩٣، ١٨٤٩٨].

* حديث صحيح.

**ژ بەرائێ کورێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: نە هەمی فەرموودە مە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بووینە، هەڤالێت مە ژ وی بۆ مە دگۆتن و خودانکرنا حێشتران ئەم ژێ مژویل کرین.**



العبادات

**پەرستن**

# الكتاب الأول:الطهارة

# كتێبا ئێكێ: پاقژی و نەهێلانا بێنڤێژییێ

## الفصل الاول: الطهارة من النجاسات

## پشكا ئێكێ: پاقژبوون ژ پیساتییان

### ١ ـ باب: الاستنجاء بالماء

### بابەتێ خۆشوشتن ب ئاڤێ

٨٦٩ – (ق) عن أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ، أَجِيءُ أَنَا وَغُلَامٌ، مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ. يَعْنِي: يَسْتَنْجِي بِهِ. [خ١٥٠/ م٢٧١].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) دگۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر دەركەفتبا دەستئاڤێ من و گەنجەكێ د گەل مە ئامانەكێ كەڤلی ئاڤ تێدا دئینا خۆ پێ دشویشت و پاقژ دكر.**

٨٧٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي أَهْلِ قُبَاءٍ** ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ﴾ [التوبة:١٠٨] قَالَ: **كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ، فَنَزَلَتْ فِيهِمْ هَذِهِ الْآيَةُ**).

[د٤٤/ ت٣١٠٠/ جه٣٥٧].

* صحيح.

**ژ ئەبێ هورمیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەڤ ئایەتە ﴿فيه رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا﴾ د ڕاستا خەلكێ قوبائێدا هاتە خوارێ گۆت: وان جهێ دەستئاڤا خۆ ب ئاڤێ دشویشت، ئینا ئەڤ ئایەتە د واندا هاتە خوارێ).**

٨٧١ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مُرْنَ أَزْوَاجَكُنَّ أَنْ يَسْتَطِيبُوا بِالْمَاءِ، فَإِنِّي أَسْتَحْيِيهِمْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَفْعَلُهُ. [ت١٩/ ن٤٦].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: فەرمانێ ل هەڤژینێت خۆ (زەلامان) بكەن ئەو ب ئاڤێ جهێ دەستئاڤا خۆ بشۆن ب ڕاستی ئەز بۆ ڤێ چەندێ شەرمێ ژ وان دكەم و ب ڕاستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە دكر.**

٢ ـ باب: الاستجمار بالحجارة.

**بابەتێ: خۆپاقژكرن ب بەركان.**

٨٧٢ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اتَّبَعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، وخَرَجَ لِحَاجَتِهِ، فَكَانَ لاَ يَلْتَفِتُ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ، فَقَالَ: (**ابْغِنِي أَحْجَاراً أَسْتَنْفِضْ بِهَا ـ أَوْ نَحْوَهُ ـ وَ لاَ تَأْتِنِي بِعَظْمٍ، وَلاَ رَوْثٍ**) ، فَأَتَيْتُهُ بِأَحْجَارٍ بِطَرَفِ ثِيَابِي، فَوَضَعْتُهَا إِلَى جَنْبِهِ، وَأَعْرَضْتُ عَنْهُ، فَلَمَّا قَضَى أَتْبَعَهُ بِهِنَّ. [خ١٥٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د دویڤ پێغەمبەریڕا (ﷺ) چۆم، دەركەفتە دەستئاڤێ، و ئەو نەدزڤری، ئەز لێ نێزیك بووم، ئینا گۆت: (كا بۆ من سەحكە هندە بەركان ئەز خۆ پێ پاقژكەم ـ یان تشتەكێ وەكی وێ ـ و چو هەستیك و پشكلان بۆ من نەئینە)، ڤێجا من هندە بەرك ب دەمانا جلكێ خۆ ئینان و من دانانە ب رەخ ویڤە، و من بەرێ خۆ ژێ وەرگێڕا، ڤێجا دەمێ ب دویماهی هاتی ـ دەستئاڤا خۆ ب دویماهی ئینای ـ د جهێ دەستئاڤێ دان.**

٣ ـ باب: النهي عن الإستنجاء باليمين.

**بابەتێ: پاشڤەلێدانێ ژ خۆپاقژكرنا دەستئاڤێ ب دەستێ ڕاستێ.**

٨٧٣ – (ق) عن أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَأْخُذَنَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَسْتَنْجِ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ**). [خ١٥٤، (١٥٣)/ م٢٦٧].

**و ژ ئەبی قەتادەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە میزت بلا ب دەستێ ڕاستێ شەرمینگەها خۆ نەگریت و ب دەستێ ڕاستێ خۆ پاقژ نەكەت، و بێهنا خۆ د ئامانیدا نەكێشیت).**

## ٤ ـ باب: إذا استجمَرَ فليوتِرْ.

## بابەتێ: ئەگەر بەر بۆ پاقژكرنا دەستئاڤێ ب كارئینان بلا بكەتە كەت.

٨٧٤ – (م) عن جَابِرِ بْن عَبْدِ اللهِ قالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : (إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُوتِرْ).

[م٢٣٩].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) دبێژیت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە بەرك بۆ پاقژكرنا دەستئاڤێ ب كار ئینان بلا بكەتە كەت).**

## ٥ ـ باب: الاستتار لقضاء الحاجة.

## بابەتێ: خۆ پەنیكرن بۆ دەستئاڤێ.

٨٧٥ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثاً لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَداً مِنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِحَاجَتِهِ: هَدَفٌ، أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ. [م٣٤٢].

**ژ عەبدوللایێ كورێ جەعفەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژەكێ ئەز ل پشت خۆ سویاركرم و ئاخفتنەكا نهێنی بۆ من گۆت ئەز بۆ كەسێ ژ خەلكی نابێژم، و پێغەمبەرێ خودێ تشتێ ژ هەمیا پێ خۆشتر بۆ دەستئاڤێ خۆ ل پشت بپارێزیت گركێ ئاخێ بوو یان بیستانێ دارقەسپان.**

٨٧٦ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَرَادَ الْبَرَازَ، انْطَلَقَ حَتَّى لاَ يَرَاهُ أَحَدٌ.

[د/٢ جه٣٣٥].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ڤیابا بچیتە دەسئاڤێ دویر دچۆ هەتا كەس وی نەبینیت.**

٨٧٧ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا أَرَادَ الْحَاجَةَ، لَمْ يَرْفَعْ ثَوْبَهُ، حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الْأَرْضِ.

[ت١٤/ مي٦٩٣].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر چۆبا دەستئاڤێ جلکێ خۆ بلند نەدکر هەتا نێزیکی عەردی ببا.**

٦ ـ باب: النهي عن التخلي في الطرق والظلال.

**بابەتێ: پاشڤەلێدانێ ژ خۆشکرنا دەستئاڤێ د رێك و سیبەراندا.**

٨٧٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ : (**اتَّقُوا اللَّعَّانَيْنِ**)، قَالُوا: وَمَا اللَّعَّانَانِ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ : (**الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ، أَوْ فِي ظِلِّهِمْ**). [م٢٦٩].

**و ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خۆ ژ هەردو لەعنەتچییان بپارێزن)[1]. گۆتن: هەردو لەعنەتچی چنە؟ گۆت: (ئەوێ دەستنڤێژا خۆ د رێکا خەلکیدا یان ل بەر سیبەرێت وان خۆش دکەت).**

٧ ـ باب النهي من البول في الماء الراكد.

**بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ میزتنا د ئاڤا راوەستایدا.**

٨٧٩ – (ق) عن أبي هُرَيْرَة: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ : (**لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِي لاَ يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ**). [خ٢٣٩/ م٢٨٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) کو وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (کەس ژ هەوە د ئاڤا بەردەوامدا ئەوا ژ بەر نەچیت نەمیزیت پاشی خۆ تێدا بشۆت).**

[1] ئانکو دبیتە ئەگەرێ هندێ خەلك لەعنەتان لێ بکەن.

## ٨ ـ باب: البول قائما.

## بابەتێ: میزتن ژ پیاڤە.

٨٨٠ - (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ (ﷺ) سُبَاطَةَ قَوْمٍ، فَبَالَ قَائِماً، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَجِئْتُهُ بِمَاءٍ، فَتَوَضَّأَ. [خ٢٢٤/ م٢٧٣].

**ژ حوزەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە سەر گویفكێ هندە كەسان و ژ پیانڤە میزت، پاشی من هندەك ئاڤ بۆ ئینا دەستنڤێژا خۆ شویشت.**

٨٨١ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا بَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَائِماً مُذْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْقُرآن.

[ك٦٥٩/ هق١/١٠١].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ پیانڤە نەمیزتییە ئەوە قورئان بۆ هاتی خوارێ.**

## ٩ ـ باب حكم المذي.

## بابەت حوكمێ مەزی.

٨٨٢ - (ق) عن عليٍّ قال: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ : (فِيهِ الْوُضُوءُ). [خ١٧٨، (١٣٢)/ م٣٠٣].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز مرۆڤەك پڕ مەزی[1] بووم، من شەرم دكر پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بكەم، ئینا من فەرمانا میقدادێ كوڕێ ئەسوەدی كر پرسیار ژێ كر، گۆت: (دەستنڤێژ یا تێدا).**

(١) مەزی رەنگەكێ ئاڤێە و یا سپی و نویسەكە و زەلالە ژ مێران و ژنان دهێت تایبەت دەمێ هزرا خۆشییا خۆ دكەن یان نێزیكی ئێك دبن.

## ١٠ . باب الاستطابة وعدم استقبال القبلة.

## بابەتێ: خۆ پاقژكرنێ و بەرێ خۆ نەدانا قیبلەیێ.

٨٨٣ - (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ : (**إِذَا أَتَيْتُمُ الغَائِطَ، فَلاَ تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلاَ تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا**).

قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ، فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ بُنِيَتْ قِبَلَ القِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ، وَنَسْتَغْفِرُ الله تَعَالَى.

[خ٣٩٤، (١٤٤)/ م٢٦٤].

**ژ ئەبو ئەیووبێ ئەنساری (رضي الله عنه) كو پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هوین چۆنە دەستئاڤا ستویر نە بەرێ خۆ بدەنە قیبلەیێ و نە پشتا خۆ، بەلێ بەرێ خۆ بدەنە رۆژهەلاتی یان رۆژئاڤایی).**

**ئەبو ئەیووب دبێژیت: دەمێ ئەم هاتینە شامێ مە جهێ دەستئاڤا دیت بۆ لایێ قیبلەیێ یێت ئاڤاكرینە ڤێجا مە خۆ خوار دكر و مە داخوازا گونەهژێبرنێ دكر.**

## ١١ . باب: ما يقول عند الخلاء

## بابەتێ: كا دێ ج بێژیت دەمێ دەستئاڤێ.

٨٨٤ - (ق) عن أنسٍ قال: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قَالَ : (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ والْخَبَائِثِ**). [خ١٤٢/ م٣٧٥].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) چۆبا جهێ دەستئاڤێ دگۆت: (ب ناڤێ خودێ، یا خودێ ب راستی ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ شەیتانێت مێ و پیساتییان).**

٨٨٥ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ قَالَ : (**غُفْرَانَكَ**).

[د٣٠/ ت٧/ جه٣٠٠/ مي٧٠٧].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ژ جهێ دەستئاڤێ دەركەفتبا دگۆت: (غفرانك)[1]،**

## ١٢ . باب: لا كلام عند البول.

## بابەتێ: ئاخفتن ل سەر دەستئاڤێ نینە.

٨٨٦ – (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً مَرَّ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَبُولُ، فَسَلَّمَ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ. [م٣٧٠].

**ژ ئیبن عومەرى (خودێ ژ وان رازى بیت) گۆت: زەلامەك د بەر پێغەمبەرێ خودێرا (ﷺ) بۆرى، وى دەستئاڤا زراڤ خۆش دكر، ئینا سلاڤ كرێ، بەرسڤا وى نەدا.**

٨٨٧ – عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ: أَنَّهُ سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ يَبُولُ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ، حَتَّى تَوَضَّأَ، فَلَمَّا تَوَضَّأَ رَدَّ عَلَيْهِ. [ن٣٨/ مي٢٦٨٣].

**ژ موهاجرێ كورێ قونفوزى (رضي الله عنه) كو وى سلاڤ كرە پێغەمبەرى (ﷺ) و وى دەستئاڤا زراڤ خۆش دكر، سلاڤ ل سەر بن بەرسڤا وى نەدا هەتا دەستنڤێژا خۆ شویشتى، ڤێجا دەمێ دەستڤێژا خۆ شویشتى سلاڤا وى ڤەگێرا.**

## ١٣ . باب: بول الصبيان.

## بابەتێ: میزا زارۆكان.

٨٨٨ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: كانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ، فَيَدْعُو لَهُمْ، فَأُتِيَ بِصَبِيٍّ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ. [خ٦٣٥٥، (٢٢٢)/ م٢٨٦].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: بچویك دئینانە دەڤ پێغەمبەرى (ﷺ) دوعا بۆ دكرن، ڤێجا بچویكەك ئینا و میزتە ب جلكێ ویڤە ئینا هندەك ئاڤ داخواز كر و ل شوینا وێ كر و نەشویشت.**

---

[1] ئانكو: ئەز داخوازا گونەهـ ژێبرن و لێنەگرتنێ ژ تە دكەم.

٨٨٩ - عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ فِي بَوْلِ الرَّضِيعِ : (**يُنْضَحُ بَوْلُ الْغُلاَمِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ**). [ت٦١٠/ جه٥٢٥].

* صحيح.

**ژ عەلییێ كوڕێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (میزا بچویكێ ب شیر دهێتە رەشاندن و میزا كچكێ دهێتە شویشتن).**

## ١٤ . باب: الحض على التنزه من البول

## بابەتێ: پالدان ل سەر خۆپاقژكرنێ ژ میزێ.

[انظر: ١٦٥١].

## ١٥ . باب: حكم المني.

## بابەتێ: حوكمێ مەنی (ئاڤا زەلامی و ژنێ).

٨٩٠ - (ق) عن سليمانَ بنِ يَسَارٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: عَنِ المَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَتْ: كُنْتُ أَغسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ، وَأَثَرُ الْغَسْلِ فِي ثَوْبِهِ: بُقَعُ المَاءِ.

[خ٢٣٠، (٢٢٩)/ م٢٨٩].

**ژ سولەیمانێ كوڕێ یەساری (رحمه الله) گۆت: من پرسیار ژ عائیشایێ كر ئاڤا (مەنی[1]) ب جلكی بكەڤیت؟ گۆت: من ئەو ژ جلكێ پێغەمبەری (ﷺ) دشویشت و ئەو دەردكەڤتە نڤێژێ و پنییێت ئاڤێ ل جلكێ وی بوو.**

---

(١) دبێژنە ئاڤا ژنێ و زەلامی مەنی، و ئەو ئەو ئاڤە یا ب بلق دهێت و یا تیرە و یا زەلامی سەر ب سپیڤەیە و یا ژنێ سەر ب زەریڤەیە.

٨٩١ - (م) عَنْ عَلْقَمَةَ وَالأَسْوَدِ: أَنَّ رَجُلاً نَزَلَ بِعَائِشَةَ، فَأَصْبَحَ يَغْسِلُ ثَوْبَهُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّمَا كَانَ يُجْزِئُكَ، إِنْ رَأَيْتَهُ، أَنْ تَغْسِلَ مَكَانَهُ، فَإِنْ لَمْ تَرَ نَضَحْتَ حَوْلَهُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَفْرُكُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَرْكاً؛ فَيُصَلِّي فِيهِ. [م٢٨٨].

**ژ عەلقەمەیی و ئەسوەدی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: زەلامەك بوو مێڤانێ عائیشایێ، سپێدە لێ بوو و جلكێ خۆ دشویشت، ئینا عائیشایێ گۆت: ب راستی هند بەسی تە بوو ئەگەر تە دیت تو جهێ وی ب تنێ بشۆی، و ئەگەر تە نەدیت ئاڤێ ل دۆرماندۆرێت وی برەشینی، و ب راستی من خۆ دیت من ژ جلكێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دپەرخاند و نڤێژ پێ دكر.**

٨٩٢ - عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ (ﷺ): يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يَأْتِي فِيهِ أَهْلَهُ؟ قَالَ: **(نَعَمْ، إِلاَّ أَنْ يَرَى فِيهِ شَيْئاً؛ فَيَغْسِلَهُ)**. [جه٥٤٢].

* صحيح.

**ژ جابرێ كوڕێ سەمورەیی (ﷺ) گۆت: زەلامەكی پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر، نڤێژێ ب وی جلكی بكەت ئەوێ پێ هاتییە دەڤ هەڤژینا خۆ؟ ئینا گۆت: (بەلێ ئەو نەبیت تشتەكی پێڤە ببینیت وی بشۆت).**

١٦ . باب: النجاسة تقع في السمن.

**بابەتێ: ئەگەر تشتەكێ هەرمی كەفتە د ناڤ دوهنیدا.**

٨٩٣ - (خ) عَنْ مَيْمُونَةَ أُمِّ المُؤْمِنِينَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: **(أَلْقُوهَا، وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ، وَكُلُوا سَمْنَكُمْ)**. [خ٢٣٥].

ژ مەیمونەیێ دایکا موسلمانان،(رضي الله عنها) گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) ژ مشکی هاتە کرن بکەڤیتە د دوهنیدا؟ ئینا گۆت: **(مشکی و دوهنێ دۆرماندۆرێت وی باڤێژن و دوهنێ خۆ بخۆن).**

١٧ ـ باب: طهارة جلود الميتة بالدباغ.

**بابەتێ: پاقژیا کەڤلێت مراری ب گەمارکرنێ.**

٨٩٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: وَجَدَ النَّبِيُّ (ﷺ) شَاةً مَيِّتَةً، أُعْطِيَتْهَا مَوْلاَةٌ لِمَيْمُونَةَ مِنَ الصَّدَقَةِ، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : **(هَلاَّ انْتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا)**. قَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ؟ قَالَ : **(إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا)**. [خ١٤٩٢/ م٣٦٣ ـ ٣٦٥].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) **گۆت:** پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) **گیسکەکێ** مرار دیت جارییا مەیموونەیێ ژ زەکاتێ دابوویێ. **گۆت:** پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) **گۆت: (بلا هەوە مفا ژ کەڤلێ وێ کربا)، گۆتن:** ب راستی ئەو یا مرارە، **گۆت: (بەس خوارانا وێ یا هاتییە حەرامکرن).**

٨٩٥ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْن عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ : **(إِذَا دُبِغَ الإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ)**. [م٣٦٦].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەباسی** (خودێ ژ وان رازی بیت) **گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ** خودێ بوو (صلى الله عليه وسلم) دگۆت: **(ئەگەر کەڤل هاتە گەمارەکرن ب راستی ئەو پاقژ بوو).**

## ١٨ باب: حكم الكلب.

## بابەت: حوکمێ سەی.

٨٩٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ : (**إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاء أَحَدِكُمْ؛ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعاً**). [خ١٧٢/ م٢٧٩]

- وفي رواية لمسلم : (**طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ؛ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، أُولاَهُنَّ بِالتُّرَابِ**).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر سەی ژ ئامانێ ئێکی ژ هەوە ڤەخوار بلا حەفت جاران بشۆت).**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: (ئامانێ ئێکی ژ هەوە یێ پاقژە ئەگەر سەی دەڤێ خۆ کرێ ئەو حەفت جاران بشۆت یا ئێکێ ژ وان ب ئاخێ بیت).**

## ١٩ ـ باب: الأذى يصيب النعل.

## بابەتی: پیساتی بگەهیتە شمکێ (پێلاڤێ).

٨٩٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ : (**إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلِهِ الْأَذَى، فَإِنَّ التُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ**). [د٣٨٥، ٣٨٦]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێکی ژ هەوە ب شمکا (پێلاڤا) خۆ پێ ل پیساتییەکێ کر ب راستی ئاخ پاقژییە بۆ وێ).**

٢٠ـ باب: حكم الهرة

**بابەتێ: حوكمێ پشیكێ**

٨٩٨ – عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ . وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ .: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ دَخَلَ، فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءاً، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الْإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ. قَالَتْ كَبْشَةُ: فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَةَ أَخِي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ)**. [د٧٥/ ت٩٢/ ن٦٨، ٣٣٩/ جه٣٦٧/ مي٧٦٣]

* صحيح.

**ژ كەبشەیا كچا كەعبێ كوڕێ مالكی، و ئەو بویكا ئەبی قەتادە بوو ل دەڤ كوڕێ وی بوو، دبێژیت: ئەبو قەتادە هاتە دەڤ وێ و وی ئاڤ بۆ دەستنڤێژ شویشتنێ كرە ئامانێ دەستڤێژ شویشتنێ، پشیكەك هات ئاڤ ژێ ڤەخوار، ئینا وی ئامان بۆ خوار كر هەتا ڤەخواری، كەبشە دبێژیت: ئەز دیتم یێ بەرێ خۆ ددەمێ، ئینا گۆت: تو حێبەتی بووی برازا من؟ من گۆت: بەلێ، ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دبێژیت: (ئەو نە یا پیسە ئەو ژ وانن یێت دهێنە دەڤ هەوە و دچن).**

٢١ـ باب البول.

**بابەتێ: میزێ.**

٨٩٩ – عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ قَالَتْ: كَانَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) قَدَحٌ مِنْ عَيْدَانٍ تَحْتَ سَرِيرِهِ، يَبُولُ فِيهِ بِاللَّيْلِ. [د٢٤/ ن٣٢]

* حسن صحيح.

**ژ ئومەیمایا كچا روقەیقایێ، (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ سلاڤێت خودێ ل سەربن ترارەك ژ دار ڤەسپێ ل بن تەختێ هەبوو شەڤێ د میزتە تێدا.**

## ٢٢ . باب: المياه

## بابەتێ: ئاڤێ

٩٠٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : (**هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ**). [د٨٣/ ت٦٩/ ن٥٩/ جه٣٨٦/ مي٧٥٦]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكی پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم ل دەریایێ سویار دبین و كێم ئاڤێ د گەل خۆ دبەین، و ئەگەر دەستنڤێژێ پێ بشۆین ئەمماینە تێنی، ئەرێ دەستنڤێژا خۆ ب ئاڤا دەریایێ بشۆین؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەو ئاڤا وێ یا پاقژە و مرییێ وێ یێ حەلالە).**

٩٠١ – عَن ابنِ عُمَرَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْمَاءِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ، فَقَالَ (ﷺ): (إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ). [د٦٣/ ت٦٧/ ن٥٢/ جه٥١٧/ مي٧٥٨].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (رضي الله عنه) گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) ژ ئاڤێ هاتە كرن ئەوا دەوار و دورندە د پتر ژ جارەكێ دهێنە سەر؟ ئینا گۆت: (ئەگەر دو جەرێت مەزن تێ هەبن پیس نابیت).**



## الفصل الثاني: الحيض

## پشکا دووێ: بێنڤێژی

### ١ . باب: ترك الحائض الصلاة والصوم.

### بابەتێ: هێلانا ژنا بێنڤێژ بۆ نڤێژ و رۆژیان

٩٠٢ - (ق) عَنْ مُعَاذَةَ: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ لِعَائِشَةَ: أَتَجْزِي إِحْدَانَا صَلاَتَهَا إِذَا طَهُرَتْ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ كُنَّا نَحِيضُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَلاَ يَأْمُرُنَا بِهِ، أَوْ قَالَتْ: فلاَ نَفْعَلُهُ. [خ٣٢١/ م٣٣٥].

- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلكِنِّي أَسْأَلُ، قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ.

**ژ موعازەیێ (رحمها الله) گۆت: ژنەکێ گۆتە عائیشایێ: ئێك ژ مە دێ نڤێژێت خۆ کەتەڤە ئەگەر پاقژ بوو؟ ئینا گۆت: ما خونە تو یا حەرووری[1]؟! ئەم د گەل پێغەمبەری (ﷺ) بێنڤێژ دبووین و فەرمانا مە پێ نە دکر یان گۆت: مە ئەو نەدکر.**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: گۆت: بۆچی ژنا بێنڤێژ رۆژییێ دگریتەڤە و نڤێژێ ناکەتەڤە؟ ئینا گۆت: خۆنە تو یا حەرووری؟ من گۆت: ئەز نە یا حەرەووریمە، بەلێ ئەز پرسیار دکەم، گۆت: ئەو بۆ مە چێ دبوو، فەرمانا مە ب گرتنەڤەیا رۆژییێ دهاتە کرن، و فەرمانا مە ب کرنەڤەیا نڤێژێ نەدهاتەکرن.**

٩٠٣ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي أَضْحَى ـ أَوْ فِطْرٍ ـ إِلَى المصَلَّى، فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ، فَقَالَ : (**يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ**). فَقُلْنَ: وَبِمَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ : (**تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ**). قُلْنَ: وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ : (**أَلَيْسَ شَهَادَةُ المَرْأَةِ**

---

(١) ئانکو ما خۆنە تو خەلکا گوندێ حەروورییێی، گوندەکە دکەڤیتە کووفە، کۆمبوونا ئێکێ یا خەوارجان تێدا هاتبوو کرن و ل ویرێ پەیمان دابوونە هەڤ، و وان دیت ژنا دکەڤیتە د بێنڤێژییێدا دێ نڤێژێت خۆ قەزا کەت، لەوا عائیشایێ وەگۆتێ.

**مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ)** ؟ قُلْنَ: بَلَى، قَالَ : **(فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ)** ، قُلْنَ: بَلَى، قَالَ : **(فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا)**. [خ٣٠٤/ م٨٠].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) جەژنا قوربانی یان یا رەمەزانێ دەرکەفتە نڤێژگەهێ و د بەر ژنانڕا بۆری و گۆت: (گەلی ژنان خێران بکەن، ب راستی من دیت هوین پتریا خەلکێ جەهنەمێنە). گۆتن: و ب چ ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (هوین زێدە لەعنەتان دکەن و قەنجییا زەلامێ خۆ ژبیر دکەن، و من نەدیتییە ژ کێم عەقل و دینان وەکی ئێك ژ هەوە بشێتە خودان عەقلان). گۆتن: کێماتییا دین و عەقلێ مە چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (ما نە شەهدەییا ژنێ هندی نیڤا یا زەلامییە)؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: (ئەڤە ژ کێماتییا عەقلێ وێیە، و ما نە ئەگەر کەفتە د بێنڤێژییێدا نە نڤێژێ دکەت نە رۆژییێ)؟ گۆتن: بەلێ: گۆت: (ئها ئەڤە ژ کێماتییا دینێ وێیە).**

## ٢ ـ باب الغسل من الحيض والنفاس

## بابەتێ: خۆشویشتن ژ بێنڤێژییێ و چلکان.

٩٠٤ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ غُسْلِهَا مِنَ المحِيضِ، فَأَمَرَهَا كَيْفَ تَغْتَسِلُ، قَالَ : **(خُذِي فِرْصَةً مِنْ مِسْكٍ، فَتَطَهَّرِي بِهَا)**. قَالَتْ: كَيْفَ أَتَطَهَّرُ؟ قَالَ : **(تَطَهَّرِي بِهَا)** ، قَالَتْ: كَيْفَ؟ قَالَ : **(سُبْحَانَ اللهِ! تَطَهَّرِي)** ، فَاجْتَبَذْتُهَا إِلَيَّ، فَقُلْتُ: تَتَبَّعِي بِهَا أَثَرَ الدَّمِ.

[خ٣١٤/ م٣٣٢].

- وفي رواية لمسلم: عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أَسْمَاءَ سَأَلَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ غُسْلِ الْمَحِيضِ؟ فَقَالَ : **(تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا، فَتَطَهَّرُ، فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكاً شَدِيداً، حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا)**. فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: وَكَيْفَ تَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَال : **(سُبْحَانَ اللهِ! تَطَهَّرِينَ بِهَا)** ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ـ كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ ـ: تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ. وَسَأَلَتْهُ عَنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ : **(تَأْخُذُ مَاءً**

**فَتَطَهَّرُ، فَتُحْسِنِ الطُّهُورَ . أَوْ تُبْلِغُ الطُّهُورَ . ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ، حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الْمَاءَ).** فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ؛ لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ژنەکێ پرسیارا سەرشویشتنا خۆ ژ بێنڤێژییێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) کر، فەرمانا وێ کر چاوا دێ خۆ شۆت، گۆت: **(پارچەکا میسکێ راکە و خۆ پێ پاقژ بکە)**، گۆت: چاوا خۆ پاقژ بکەم؟ گۆت: **(خۆ پێ پاقژ بکە)**؟ گۆت: چاوا؟ گۆت: **(پاکی و پاقژی بۆ خودێ خۆ پاقژکە)**، من کێشا دەڤ خۆ من گۆتێ دویڤ شوینواریێت خوینێ هەرە.

- و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەسمائێ پرسیارا پێغەمبەری (ﷺ) ژ سەرشویشتنا بێنڤێژییێ کر، گۆت: **(ئێك ژ هەوە بلا ئاڤ و (سابوینا سیدرا) خۆ بینیت پاشی د دەستنڤێژا خۆ بشۆت پاشی بلا ئاڤێ ل سەرێ خۆ بکەت، و پاشی بپەرخینیت هەتا ئاڤ دگەهیتە ناڤ هەمی پرچێ وێ، پاشی بلا ئاڤێ ب لەشێ خۆدا بکەت، پاشی بلا پارچەکا پەمبی یا هریا مسککری هەلگریت و خۆ پێ پاقژ بکەت)**، ئەسمائێ گۆت: چەوا خۆ پێ پاقژ کەت؟ گۆت: **(پاقژی بۆ خودێ بیت خۆ پێ پاقژ کەت)**، عائیشایێ گۆت: هەروەکی وێ چەندێ ڤەدشێریت (ب دەنگێ نزم گۆتێ) **(جهێ خوینێ پێ پاقژکە)**، و پرسیار ژ وی کر ژ سەرشویشتنا جەنابەتێ؟ گۆت: **(دێ ئاڤێ ئینیت دێ باش دەستنڤێژا خۆ شۆت یان دێ دەستنڤێژێ شۆت پاشی دێ ئاڤێ ل سەرێ خۆ کەت و پەرخینیت هەتا ئاڤ بگەهیتە ناڤ هەمی پرچێ وێ پاشی دێ ئاڤێ ل خۆ کەت)**. عائیشایێ گۆت: ژنێت ژ هەمییان چێتر ژنێت خەلکێ مەدینەییێنە.. شەرمێ ئەو نەدانە پاش ئەو د دینێ خۆدا شارەزا نەبن.

٩٠٥ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِذَا اغْتَسَلَتِ الْمَرْأَةُ مِنَ الْحَيْضِ، فَلْتُمِسَّ أَثَرَ الدَّمِ بِطِيبٍ. [مي١٢٠٢].

* إسناده صحيح.

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: ئەگەر ژنێ سەرێ خۆ ژ بێنڤێژییێ شویشت بلا شوینا خوینێ هندە بێهنخۆشییێ لێ بکەت.**

٩٠٦ - عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(إِذَا اغْتَسَلَتِ المَرْأَةُ مِنْ حَيْضِهَا نَقَضَتْ شَعْرَهَا وَغَسَلَتْهُ بِخِطْمِي وَأُشْنَان، وإِذَا اغْتَسَلَتْ مِنْ جَنَابَةٍ صَبَّتْ عَلى رَأْسِها المَاءَ وَعَصَرَتْهُ)**. [مخ/٥/١٦٩٣].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ژنێ سەرێ خۆ ژ بێنڤێژییێ شویشت بلا پرچا خۆ ڤەکەت و ب گیایێ خەتمێ[1] و ئەشنانێ[2] بشۆت و ئەگەر ژ جەنابەتێ شویشت بلا ئاڤێ ل سەرێ خۆ بکەت و پرچا خۆ بگڤێشیت).**

### ٣ . باب: الاستحاضة.

### بابەتێ: ئیستحازێ.

٩٠٧ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : **(لاَ، إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَيْسَ بِحَيْضٍ، فَإِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، ثُمَّ صَلِّي)**.

[خ٢٢٨/ م٣٣٣].

- زاد البخاري : **(ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ، حَتَّى يَجِيءَ ذَلِكَ الْوَقْتُ)**.
- وفي رواية للبخاري : **(دَعِي الصَّلاَةَ قَدْرَ الأَيَّامِ الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا)**. [خ٣٢٥].

---

(١) شینکاتییەکە بەرێ ب کار دئینا و جهێ سابوینێ دگریت، ئەڤرۆ سابوین جهێ وێیە.

(٢) ئەشنان تشتەکە دکەڤیتە سەر داربەرییێ و کاژێ و بێهنەکا خۆش یا هەی و هاریکارە تشت پاقژ ببیت ئەڤرۆ سابوین یان شامپۆ جهێ وێ دگریت.

ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: فاتیما کچا ئەبی حوبەیشی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز خوینێ دبینم و پاقژ نابم، ئەز نڤێژا بهێلم؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نە، ب راستی ئەو رهەکە و نە بێنڤێژییە، ڤێجا ئەگەر بێنڤێژییا تە هات نڤێژان بهێلە و ئەگەر چۆ و ب دویماهی هات خوینێ ژ خۆ بشۆ (سەرێ خۆ بشۆ) پاشی نڤێژێ بکە).**

- بوخاری زێدەکرییە: **(پاشی بۆ هەر نڤێژەکێ دەستنڤێژەکێ بگرە هەتا دەمێ نڤێژا د دویڤرا دهێت).**
- و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: **(تەمەت رۆژێت تو تێدا دکەڤتییە د بێنڤێژییێدا نڤێژان بهێلە پاشی سەرێ خۆ بشۆ و نڤێژێ بکە).**

٩٠٨ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدِّمَاءَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَاسْتَفْتَتْ لَهَا أُمُّ سَلَمَةَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ : **(لِتَنْظُرْ عِدَّةَ اللَّيَالِي وَالْأَيَّامِ الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا الَّذِي أَصَابَهَا، فَلْتَتْرُكِ الصَّلَاةَ قَدْرَ ذَلِكَ مِنَ الشَّهْرِ، فَإِذَا خَلَّفَتْ ذَلِكَ فَلْتَغْتَسِلْ، ثُمَّ لِتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ ثُمَّ لِتُصَلِّ).** [د٢٧٤/ ن٢٠٨/ جه٦٢٣/ مي٨٠٧].

* صحيح.

ژ ئوم سەلەمە (﵂) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ژنەکێ ل سەردەمێ پێغەمبەری (ﷺ) خوینا وێ بەردەوام دهات، ئوم سەلەمەیێ بۆ وێ پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، ئینا گۆت: **(بلا هژمارا شەڤ و رۆژێت ئەو تێدا بێنڤێژ دبوو ژ هەیڤێ خۆ بگریت بەری ئەڤە ب سەری بهێت بلا نڤێژا تەمەت وێ هەیڤێ (ئەوا ئەو تێدا دورست) بهێلیت، ڤێجا ئەگەر ئەو رۆژ (یێت بەری هینگێ دکەڤتە تێدا) بۆرین و**

**پاش خۆ هێلان، بلا سەرێ خۆ بشۆت، پاشی بلا خۆ ب جلكەكی گرێدەت[1] پاشی بلا نڤێژێ ب وی جلكی بكەت).**

٩٠٩ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ كَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : **(إِنَّ دَمَ الْحَيْضِ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَنِ الصَّلاَةِ، وَإِذَا كَانَ الْآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي)**. [د٢٨٦/ ن٢١٦، ٣٦١].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (ﷺ): هندیكە فاتیما كچا ئەبی حوبەیشییە دكەڤتە د ئیستیحازێدا (خوینا وێ بەردەوام دهات)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: (خوینا عادێ یا ئاشكەرایە یا رەشە، ئەگەر خوین ئەو بیت خۆ بگرە نڤێژێ نەكە، و ئەگەر ژ وی رەنگی دەركەڤت[2]، دەستنڤێژا خۆ بشۆ و نڤێژێ بكە).**

## ٤ ـ باب: غسل دم الحيض

## بابەتێ: شوشتنا خوینا بێنڤێژییێ

٩١٠ - (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَنَّهَا قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهَا الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ، كَيْفَ تَصْنَعُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : **(إِذَا أَصَابَ ثَوْبَ إِحْدَاكُنَّ الدَّمُ مِنَ الْحَيْضَةِ، فَلْتَقْرُصْهُ، ثُمَّ لِتَنْضَحْهُ بِمَاءٍ، ثُمَّ لِتُصَلِّي فِيهِ)**.

[خ٣٠٧ (٢٢٧)/ م٢٩١].

---

(١) جهێ خوینێ پەمبی بكەت و ب پاتەكی خۆ گرێدەت دا خوین سرك نەهێتە خوارێ، ڤێ گاڤێ حەفازێت تایبەت جهێ هندێ دگرن.

(٢) رامانا وێ ئەوە تو ژ عادێ دەركەڤتی.

**ژ ئەسمائا كچا ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەكێ پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بێژە من ئەگەر ئێكێ ژ مە خوینا بێنڤێژییێ ب جلكێ وێ كەڤت چ بكەت؟ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر خوین ژ بێنڤێژییێ ب جلكێ ئێكێ ژ هەوە كەڤت بلا ب نینۆكێ بپەرخینیت پاشی بلا ئاڤێ لێ بكەت (بشۆت) پاشی نڤێژێ پێڤە بكەت).**

٩١١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ خَوْلَةَ بِنْتَ يَسَارٍ أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ لَيْسَ لِي إِلاَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ، وَأَنَا أَحِيضُ فِيهِ، فَكَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ : (**إِذَا طَهُرْتِ فَاغْسِلِيهِ، ثُمَّ صَلِّي فِيهِ**) فَقَالَتْ: فَإِنْ لَمْ يَخْرُجِ الدَّمُ؟ قَالَ : (**يَكْفِيكِ غَسْلُ الدَّمِ، وَلاَ يَضُرُّكِ أَثَرُهُ**). [د٣٦٥].

* صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: خەولەیا كچا یەساری هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ب راستی من ژ جلكەكی پێڤەتر نینە، و ئەز تێدا دكەڤمە د بێنڤێژییێدا، پا ئەز چ بكەم؟ گۆت: (ئەگەر تو پاقژ بووی بشۆ و پێڤە نڤێژێ بكە)، ئینا گۆت: پا ئەگەر خوین ژێ نەچۆ (ئانكو شوینوار و دەعكین ما)؟ گۆت: (بەسی تەیە تو خوینێ بشۆی و شوینا وێ زیانێ ل تە ناكەت).**

## ٥ ـ باب طهارة جسم الحائض

## بابەتێ: پاقژییا لەشێ ژنا د بێنڤێژییێدا

٩١٢ - (ق) عَنْ عُرْوَةَ أَنَّهُ سُئِلَ: أَتَخْدُمُنِي الْحَائِضُ، أَوْ تَدْنُو مِنِّي الْمَرْأَةُ وَهْيَ جُنُبٌ؟ فَقَالَ عُرْوَةُ: كُلُّ ذلِكَ عَلَيَّ هَيِّنٌ، وَكُلُّ ذَلِكَ تَخْدُمُنِي، وَلَيْسَ عَلَى أَحَدٍ فِي ذَلِكَ بَأْسٌ، أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ: أَنَّهَا كَانَتْ تُرَجِّلُ ـ تَعْنِي: رَأْسَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ـ وَهِيَ حَائِضٌ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَئِذٍ مُجَاوِرٌ فِي الْمَسْجِدِ، يُدْنِي لَهَا رَأْسَهُ، وَهِيَ فِي حُجْرَتِهَا، فَتُرَجِّلُهُ وَهْيَ حَائِضٌ. [خ٢٩٦/ م٢٩٧].

**ژ عوروەیی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) پرسیار ژ وی هاتە كرن ژنا د بێنفێژییێدا خزمەتا من بكەت؟ یان ژی ژن نێزیكی من ببیت و ئەو یا ب جەنابەت؟ ئینا عوروەی گۆت: ئەڤە هەمی[1]، ل دەڤ من یا ب ساناهییە و ئەو هەمی (ژنا د بێنفێژییاندا و یا ب جەنابەت) خزمەتا من دكەت و چو تەنگاڤی و گونەهـ ب ڤێ چەندێ ل سەر كەسێ نینە، عائیشایێ گۆتە من: وێ سەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شەد كر و ئەو یا بێنفێژ بوو، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وی دەمی د ئعتیكافێدا بوو ل مزگەفتێ سەرێ خۆ بۆ وێ نێزیك دكر و ئەو د ژۆرا خۆڤە بوو ڤێجا وێ بۆ شە دكر و ئەو یا بێنڤێژ بوو.**

٩١٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَتَّكِئُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ. [خ٢٩٧/ م٣٠١].

**ژ عائیشایێ (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ب راستی پێغەمبەری (ﷺ) پالا خۆ دا كۆشا من و ئەز یا بێنڤێژ بووم و پاشی قورئان دخواند.**

٩١٤ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَشْرَبُ وَأَنَا حَائِضٌ. ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ (ﷺ). فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ. فَيَشْرَبُ، وَأَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ.

[م٣٠٠].

**ژ عائیشایێ (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من ئاڤ ڤەدخوار و ئەز یا بێنڤێژ بووم و پاشی من دداڤ پێغەمبەری (ﷺ) ڤێجا وی دەڤێ خۆددانا شوینا دەڤێ من و ڤەدخوار و من ب ددانا گۆشت ژ سەر هەستی دخوار و ئەز یا بێنڤێژ بووم و پاشی من دداڤ پێغەمبەری (ﷺ) ڤێجا وی دەڤێ خۆ ددانا جهێ دەڤێ من.**

٩١٥ - (م) عَنْ مَيْمُونَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) . قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَضْطَجِعُ مَعِي وَأَنَا حَائِضٌ، وَبَيْنِي وَبَيْنَهُ ثَوْبٌ. [م٢٩٥].

[1] **خزمەتكرنا ژنا د بێنڤێژییێدا و نێزیكبوونا ژنا ب جەنابەت.**

**ژ مەیموونەیێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل من خۆ درێژ دكر و ئەز یا بێنڤێژ بووم و د ناڤبەرا من و ویدا جلك بوو.**

٩١٦ - عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ إِذَا كَانَتْ حَائِضاً؟ قَالَتْ: كُلُّ شَيْءٍ غَيْرُ الْجِمَاعِ، قَالَ: قُلْتُ: فَمَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ مِنْهَا، إِذَا كَانَا مُحْرِمَيْنِ؟ قَالَتْ: كُلُّ شَيْءٍ غَيْرُ كَلاَمِهَا. [مي١٠٧٩].

* إسناده صحيح.

**ژ مەسروقی (رحمه الله) گۆت: من گۆتە عائیشایێ چ بۆ زەلامی ژ هەڤژینا وی یا دورستە ئەگەر یا بێنڤێژ بیت؟ گۆت: هەمی تشت ژ بلی جۆنا نڤینێ، گۆت: من گۆت پا چ بۆ نەدورستە ژێ ئەگەر هەردو د ئیحراماندا بن؟ گۆت: هەمی تشت ئاخفتنا وێ نەبیت.**

## ٦ـ باب: مدة الحيض

## بابەتێ: دەمێ بێنڤێژییێ.

٩١٧ - عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: تُمْسِكُ الْمَرْأَةُ عَنِ الصَّلاَةِ فِي حَيْضِهَا سَبْعاً، فَإِنْ طَهُرَتْ فَذَاكَ؛ وَإِلاَّ أَمْسَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعَشْرِ، فَإِنْ طَهُرَتْ فَذَاكَ، وَإِلاَّ اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتْ، وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ.

[مي٨٥٩].

* إسناده صحيح.

**ژ حەسەنی گۆت: ژن حەفت رۆژان د بێنڤێژییێدا خۆ ژ نڤێژێ ڤەدگریت، ڤێجا ئەگەر د حەفت رۆژاندا پاقژ بوو ئەو یا پاقژە و ئەگەر نە دێ د ناڤبەرا حەفت رۆژان و دەه رۆژاندا خۆ ڤەگریت ئەگەر د دەه رۆژاندا پاقژ بوو ئەو یا پاقژە، و ئەگەر نە دێ سەرێ خۆ شۆت و نڤێژێ كەت و ئەو یا د ئیستحازێدا.**

٩١٨ – عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: أَقْصَى الْحَيْضِ خَمْسَ عَشْرَةَ. [مي٨٦١].

* حسن.

**ژ عەتائی (رحمه الله) گۆت: پتریا بێنڤێژییێ پازدە رۆژن.**

٩١٩ – عَنْ مَالِك، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ أَبِي عَلْقَمَةَ، عَنْ أُمِّهِ ـ مَوْلاَةِ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ـ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النِّسَاءُ يَبْعَثْنَ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ بِالدِّرَجَةِ فِيهَا الْكُرْسُفُ، فِيهِ الصُّفْرَةُ مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ، يَسْأَلْنَهَا عَنِ الصَّلاَةِ؟ فَتَقُولُ لَهُنَّ: لاَ تَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ الْقَصَّةَ الْبَيْضَاءَ، تُرِيدُ بِذَلِكَ الطُّهْرَ مِنَ الْحَيْضَةِ.

[خ. الحيض، باب ١٩/ ط١٣٠].

**ژ مالكی (رحمه الله) ژ عەلقەمە ژ دایكا وی ئازاكریا عائیشایێ دایكا باوەریداران، وێ گۆت: ژنان پاتە دهنارتنە دەڤ عائیشایێ دایكا باوەریداران و پەمبی ب زەراتییا خوینا بێنڤێژییێڤە د ناڤدا بوو پرسیارا نڤێژێ ژێ دكرن، وێ دگۆتە وان لەزێ نەكەن هەتا هوین ئاڤا سپی دبینن، مەبەستا وێ ب ڤێ چەندێ پاقژییە ژ بێنڤێژییێ.**

٩٢٠ – عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ قَالَ: الْكُدْرَةُ وَالصُّفْرَةُ فِي أَيَّامِ الْحَيْضِ حَيْضٌ. وَكُلُّ شَيْءٍ رَأَتْهُ بَعْدَ أَيَّامِ الْحَيْضِ مِنْ دَمٍ، أَوْ كُدْرَةٍ، أَوْ صُفْرَةٍ؛ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ. [مي٨٨٧].

* إسناده صحيح.

**سوفیانی (رحمه الله) گۆت: شێلاتی و زەراتی د رۆژێت بێنڤێژییێدا بێنڤێژییە و هەر تشتێ پشتی رۆژێت د بێنڤێژییێدا ژ خوینێ و شێلیاتی و زەراتییێ ئەو ببینیت ئەو یا د ئیستحازێدا.**

## ٧ ـ باب: في اقل الطهر.

## بابەتێ: كێمترین دەمێ پاقژیا ژنێ.

٩٢١ – عَنْ سُفْيَان قَالَ: الطُّهْرُ خَمْسُ عَشْرَةَ. [مي٨٨١].

* إسناده صحيح.

**سوفیانی (رحمه الله) گۆت: پاقژییا ژنێ پازده رۆژن.**

٩٢٢ - عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَلِيٍّ تُخَاصِمُ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا، فَقَالَتْ: قَدْ حِضْتُ فِي شَهْرٍ ثَلاَثَ حِيَضٍ؟ فَقَالَ عَلِيٌّ لِشُرَيْحٍ: اقْضِ بَيْنَهُمَا، قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْتَ هَاهُنَا؟ قَالَ: اقْضِ بَيْنَهُمَا، قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْتَ هَاهُنَا؟ قَالَ: اقْضِ بَيْنَهُمَا، فَقَالَ: إِنْ جَاءَتْ مِنْ بِطَانَةِ أَهْلِهَا مِمَّنْ يُرْضَى دِينُهُ وَأَمَانَتُهُ تَزْعُمُ أَنَّهَا حَاضَتْ ثَلاَثَ حِيَضٍ، تَطْهُرُ عِنْدَ كُلِّ قُرْءٍ وَتُصَلِّي جَازَ لَهَا؛ وَإِلاَّ فَلاَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: قَالُونُ وَقَالُونُ، بِلِسَانِ الرُّومِ: أَحْسَنْتَ. [مي٨٨٣]

* إسناده صحيح.

**ژ عامرێ شەعبی (رحمه الله) گۆت: ژنەك هاتە دەڤ عەلی هەڤڕكییا زەلامێ خۆ دكر، بەردابوو. گۆت: ئەز د هەیڤەكێدا سێ جاران یا كەڤتیمە د بێنڤێژییێدا، ئینا عەلی گۆتە شورەیحی، فەرمانێ د ناڤبەرا واندا بكە، گۆت ئەی میرێ باوەریداران و تو ئەڤە ل ڤێرێیی؟! گۆت: فەرمانێ د ناڤبەرا واندا بكە، گۆت ئەی میرێ باوەریداران و تو ئەڤە ل ڤێرێیی؟! گۆت: فەرمانێ د ناڤبەرا واندا بكە، ئینا گۆت: ئەگەر ژ كەسوكارێت خۆ یێت نێزیك ژ وان یێت ژ دین و ئەمانەتێ وان رازی ئینان و گۆتن ئەو سێ بێنڤێژییان یا بێنڤێژ بووی ئەو دویماهییا هەر ژڤانەكێ یا پاقژ بووی و دێ نڤێژان كەت و بۆ وێ دورستە (ئانكو ئەو ژێ خلاس بوو) و ئەگەر ئەڤە نەچێ بوو نەخێر، ئینا عەلی گۆت: قالون، و قالون ب ئەزمانێ رۆمی ئانكو تە باش كر.**

### ٨ . باب: ماجاء في وقت النفاس.

### بابەتێ: ئەو تشتێ ل سەر دەمێ چلكان هاتی.

٩٢٣ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَتِ النُّفَسَاءُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تَقْعُدُ بَعْدَ نِفَاسِهَا أَرْبَعِينَ يَوْماً، أَوْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، وَكُنَّا نَطْلِي عَلَى وُجُوهِنَا الْوَرْسَ. تَعْنِي: مِنَ الْكَلَفِ.

[د٣١١/ ت١٣٩/ جه٦٤٨/ مي٩٩٥].

* حسن صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: ژنا چلكدار ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پشتی چلكێت خۆ چل رۆژان یان چل شەڤان دروینشتە خوارێ (ئانكو نڤێژ نەدكرن و رۆژی نەدگرتن) و مە وەرەس[1] د سەروچاڤێت خۆ ددا ژ بەر راڤێت ل سەر دورست دبوون.**

٩٢٤ – عَنِ الْحَسَنِ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ عِنْدَ الطَّلْقِ يَوْماً أَوْ يَوْمَيْنِ، فَهُوَ مِنَ النِّفَاسِ. [مي١٠٠١].

* إسناده صحيح.

**ژ حەسەنی (رحمه الله) گۆت: ئەگەر ژنێ د ژانێت بچویكبوونێدا خوین رۆژەكێ یان دو رۆژان دیت ئەو ژ چلكانە.**

٩٢٥ – عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ عَنِ النبي (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا مَضَى لِلنُّفَسَاءِ سَبْعٌ ثُمَّ رَأَتِ الطُّهْرَ فَلْتَغْتَسِلْ وَلْتُصَلِّي**). [هق١/٣٤٢].

**ژ مەعازێ كورێ جەبەلی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەگەر حەفت رۆژ ب سەر چلكدارێڤە بۆرین پاشی پاقژی دیت بلا سەرێ خۆ بشۆت و نڤێژان بكەت.**

### ٩ ـ باب: اتيان الحائض وكفارة ذلك.

### بابەتێ: چۆنا دەڤ بێنڤێژێ و كەفارەتا وێ چەندێ.

٩٢٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: (**يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ، أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ**). [د٢٦٤/ ن٢٨٨/ جه٦٤٠/ مي١١٤٦].

* صحيح.

---

(١) وەرس: گیایەكە ل یەمەنێ شین دبیت، یێ زەرە و وەكی كونجییێیە جلك پێ دهێنە بۆیاغكرن، و ژن تۆزا وێ د سەروچاڤێت خۆ ددەن.

**ژ ئیبن عەباسی (ﭭ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) د راستا ویدا یێ دچیتە دەڤ هەڤژینا خۆ و ئەو یا بێنڤێژ گۆت: (دینارەکێ[1] یان نیڤ دینارێ بکەتە خێر).**

٩٢٧ – عَنْ مُجَاهِدٍ: فِي الْحَائِضِ إِذَا طَهُرَتْ مِنَ الدَّمِ؟ لاَ يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَغْتَسِلَ. [مي١١١٧].

* إسناده صحيح.

**ژ موجاهدی د راستا ژنا د بێنڤێژییێدا گۆت: ئەگەر ژ خوینێ پاقژ بوو زەلامێ وێ ناچیتە دەڤ هەتا سەرێ خۆ دشۆت.**

٩٢٨ – عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ سُئِلاَ عَنِ الْحَائِضِ: هَلْ يُصِيبُهَا زَوْجُهَا إِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ فَقَالاَ: لاَ، حَتَّى تَغْتَسِلَ. [ط ١٢٩].

**ژ مالکی (ﭭ) گەهشتییە وی کو ب راستی پرسیار ژ سالمێ کورێ عەبدوللایی و سولەیمانێ کورێ یەساری ژ ژنا بێنڤێژ هاتە کرن، ئەرێ زەلامێ وێ بچیتە دەڤ ئەگەر پاقژ بوو بەری سەرێ خۆ بشۆت؟ گۆتن: نە هەتا سەرێ خۆ دشۆت.**



(١) مەخسەد پێ دینارێ زێرییە و نوکە دبیتە بهایێ (٤,٢٥) چوار غرام و بیست و پێنج سەنتان پێت زێری.

## الفصل الثالث: الوضوء

## پشكا سێیێ: دەستنڤێژ

### ١ ـ باب: فضل الوضوء.

### بابەتێ: خێرا دەستنڤێژێ.

٩٢٩ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا تَوَضَّأَ العَبْدُ المُسْلِمُ ـ أَوِ المُؤْمِنُ ـ فَغَسَلَ وَجْهَهُ، خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ المَاءِ ـ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ المَاءِ ـ. فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ، خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ المَاءِ ـ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ المَاءِ ـ. فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ، خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلاَهُ مَعَ المَاءِ ـ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ المَاءِ ـ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيّاً مِنَ الذُّنُوبِ)**. [م٢٤٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر بەندەیێ موسلمان، یان یێ خودان باوەر دەستنڤێژا خۆ شویشت و ناڤچاڤێت خۆ شویشتن، هەر گونەهەكا ب چاڤێ خۆ بەرێ خۆ دایییێ د گەل ئاڤێ ژ ناڤچاڤێت وی دەركەڤن، یان د گەل چپكا دویماهییێ یا ئاڤێ، و ئەگەر دەستێت خۆ شویشتن، هەر گونەهەكا ب دەستێت خۆ كرین د گەل ئاڤێ ژ دەستێت وی دەركەڤن، یان د گەل چپكا دویماهییێ یا ئاڤێ، و ئەگەر پێت خۆ شویشتن، هەر گونەهەكا ب پێت خۆ چۆیییێ، د گەل ئاڤێ دەردكەڤن، یان د گەل چپكا دویماهییێ یا ئاڤێ، هەتا ژ گونەهان پاقژ دەردكەڤیت)**.

٩٣٠ - (م) عَنْ عثمانَ رضي الله عنه قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ الله (ﷺ) عِنْدَ انْصِرَافِنَا مِنْ صَلاَتِنَا هَذِهِ ـ قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهَا العَصْرَ ـ فَقَالَ: **(مَا أَدْرِي، أُحَدِّثُكُمْ بِشَيْءٍ أَوْ أَسْكُتُ)**؟ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ الله، إِنْ كَانَ خَيْراً فَحَدِّثْنَا، وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ فَالله وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: **(مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَطَهَّرُ، فَيُتِمُّ الطُّهُورَ الَّذِي كَتَبَ الله عَلَيْهِ، فَيُصَلِّي هَذِهِ الصَّلَوَاتِ الخَمْسَ؛ إِلاَّ كَانَتْ كَفَّارَاتٍ لِمَا بَيْنَهَا)**. [م٢٣١].

ژ عوسمانی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ مە ئاخفت ل دەمێ ئەم ڤێ نڤێژێ دەركەفتین، میسعەری گۆت: ئەز دبێژم یا ئێڤاری بوو، ئینا گۆت: **(ئەز نوزانم بۆ هەوە باخڤم یان بێ دەنگ بم)؟** مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر خێر بیت بۆ باخڤە و ئەگەر وەسا نەبیت خودێ و پێغەمبەرێ وی چێتر دزانن، گۆت: **(نینە موسلمانەك دەستنڤێژا خۆ بشۆت و ئەو دەستنڤێژا خودێ ل سەر نڤیسی دورست بشۆت و ڤان پێنج نڤێژان بكەت ئەگەر بۆ نەبنە ژێبرنا گونەهێت د ناڤبەرا واندا).**

## ٢ ـ باب: لاتقبل صلاة بغير طهور.

## بابەتێ: نڤێژ بێ دەستنڤێژ ناهێتە وەرگرتن.

٩٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ مَنْ أَحْدَثَ، حَتَّى يَتَوَضَّأَ).** [خ١٣٥/ م٢٢٥].

- زاد في البخاري: قَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ: مَا الحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نڤێژا وی یێ دەستنڤێژ شكاندی ناهێتە وەرگرتن هەتا دەستنڤێژێ دشۆت).**

- **بوخاری زێدەكرییە: زەلامەكی ژ حەزرەمەوتێ گۆت: (حەدەس شكاندن) چییە ئەی ئەبو هورەیرە؟ گۆت، فسە یان ترە.**

٩٣٢ - (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ عامِرٍ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قَالَ: يُجْزِئُ أَحَدَنَا الوُضُوءُ مَا لَمْ يُحْدِثْ. [خ٢١٤].

ژ عەمرێ كورێ عامری (رضي الله عنه) ژ ئەنەسی، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) بۆ هەمی نڤێژان دەستنڤێژا خۆ دشویشت، من گۆت: و هەوە چ دكر؟ گۆت: دەستنڤێژ تێرا ئێك ژ مە هەبوو هندی نەشكێنیت.

### ٣ ـ باب: وضوء النبي (ﷺ).

### بابەت: دەستنڤێژا پێغەمبەری (ﷺ).

٩٣٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زيد: وسئل عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ فَتَوَضَّأَ لَهُمْ، فَكَفَأَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلاَثاً، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثاً، بِثَلاَثِ غَرَفَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثاً، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ بِهِمَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ. [خ١٩٢/ م٢٣٥].

ژ عەبدوللایێ كورێ زەیدی: پرسیارا دەستنڤێژا پێغەمبەری (ﷺ) ژێ هاتە كرن، ئامانەكێ ئاڤێ داخواز كر، و دەستنڤێژا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ وان شویشت: سێ جاران ئاڤ ژ ترارى ل دەستێت خۆ كر، پاشی دەستێ خۆ كرە د ئامانیدا و سێ جاران و ب سێ مستان ئاڤ د دەڤێ خۆ وەردا و دا بن دفنێت خۆ و ژ بن دفنێت خۆ دەرئێخست، پاشی دەستێت خۆ كرنە د ئامانیدا و سێ جاران ناڤچاڤێت خۆ شویشتن، پاشی دوجاران دەستێت خۆ هەتا ئەنیشكان شویشتن، پاشی دەستێ خۆ كرە تێدا و جارەكێ سەرێ خۆ ڤەمالی پێش ئینان و پاش برن، پاشی هەردو پێت خۆ هەتا گۆزەكێ شویشتن.

٩٣٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَرَّةً مَرَّةً. [خ١٥٧].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئێك جار ئێك جار دەستنڤێژ شویشت.

٩٣٥ - (خ) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ. [خ١٥٨].

**ژ عەبدوللایێ كورێ زەیدی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەری (ﷺ) دو جار دەستنڤێژ شویشت.**

٩٣٦ - (م) عَنْ سَفِينَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُغَسِّلُهُ الصَّاعُ مِنَ المَاءِ، مِنَ الجَنَابَةِ، وَيُوَضِّؤُهُ المُدُّ. [م٣٢٦].

**ژ سەفینەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) منەكا ئاڤێ سەرێ وی ژ جەنابەتێ دشویشت (ئانكو تێرا وی هەبوو) و مستەكا ئاڤێ دەستنڤێژا وی دگرت (ئانكو تێرا دكر).**

٩٣٧ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**الأُذُنَانِ مِنَ الرَّأْسِ**). [جه٤٤٣].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ زەیدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەردو گوه ژ سەرینە).**

٩٣٨ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ كَانَ يَأْخُذُ المَاءَ بِأُصْبُعَيْهِ لِأُذُنَيْهِ. [ط٦٩].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (رحمه الله) كو عەبدوللایێ كورێ عومەری ب دو تبلێت خۆ ئاڤ بۆ گوهێت خۆ دبر.**

## ٤ ـ باب اسباغ الوضوء.

## بابەتێ: دورست شویشتنا دەستنڤێژێ.

٩٣٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ؛ فَلْيَفْعَلْ)**. [خ١٣٦/ م٢٤٦].

**و ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی دێ ئوممەتا من رۆژا قیامەتێ هێنە گازیکرن و ئەو د ناڤچاڤ گەش و پێ بەلەك ژ شوینوارێت دەستنڤێژێ، ڤێجا هەر کەسێ ژ هەوە بڤێت گەشاتییا ناڤچاڤێت خۆ زێدەکەت، بلا زێدەکەت).**

٩٤٠ - (م) عَنْ سَالِمٍ ـ مَوْلَى شَدَّادٍ ـ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ يَوْمَ تُوُفِّيَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، فَدَخَلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ فَتَوَضَّأَ عِنْدَهَا، فَقَالَتْ: يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ! أَسْبِغِ الوُضُوءَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: **(وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ)**. [م٢٤٠].

**ژ سالمی ئازاکرییێ شەددای (رضي الله عنه) گۆت: ئەز چۆمە دەڤ عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا سەعدێ کورێ ئەبی وەققاسی مری، عەبدولرەحمانێ کورێ ئەبی بەکری هاتە دەڤ و دەستنڤێژا خۆ ل دەڤ وێ شویشت، ئینا گۆت: ئەی عەبدولرەحمان دەستنڤێژا خۆ دورست بشۆ ب راستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نەخۆشی و ئیزا بۆ پاشییێت پێیان بن ژ ئاگری).**

٩٤١ - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: أَنَّ رَجلاً تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: **(ارْجِعْ، فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ)**، فَرَجَعَ، ثُمَّ صَلَّى. [م٢٤٣].

ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (ﷺ) كو زەلامەكی دەستنڤێژ شویشت، ڤێجا هندی نینۆكێ ل سەر پێ خۆ هێلا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) دیت، گۆتێ: بزڤرە باش دەستنڤێژا خۆ بشۆ، ئینا زڤری و پاشی نڤێژ كر.

٩٤٢ – عَنْ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَخْبِرْنِي عَنِ الوُضُوءِ؟ قَالَ: (أَسْبِغِ الوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ، وَبَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِماً).

[د١٤٢/ ت٣٨/ ن٨٧/ جه٤٠٧/ مي٧٣٢].

* صحيح.

و ژ لەقیتێ كورێ سەبیرەی (ﷺ) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ من بەحسێ دەستنڤێژێ بكە؟ گۆت: (دەستنڤێژێ راست و دورست بشۆ، و تلێت خۆ بكە د ناڤێكدا، و زێدە ئاڤێ د دفنێت خۆ وەردە ژ بلی ئەگەر یێ ب رۆژی بی).

٩٤٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ المَازِنِيِّ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (مَا مِنْ أُمَّتِي مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَأَنَا أَعْرِفُهُ يَوْمَ القِيَامَةِ)، قَالُوا: وَكَيْفَ تَعْرِفُهُمْ يَا رَسُولَ اللهِ فِي كَثْرَةِ الخَلاَئِقِ؟ قَالَ: (أَرَأَيْتَ لَوْ دَخَلْتَ صَبْرَةً فِيهَا خَيْلٌ دُهْمٌ بُهْمٌ، وَفِيهَا فَرَسٌ أَغَرُّ مُحَجَّلٌ، أَمَا كُنْتَ تَعْرِفُهُ مِنْهَا) ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: (فَإِنَّ أُمَّتِي يَوْمَئِذٍ غُرٌّ مِنَ السُّجُودِ، مُحَجَّلُونَ مِنَ الوُضُوءِ). [حم١٧٦٩٣].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ژ عەبدوللایێ كورێ بوسرێ مازنی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كو گۆت: (نینە ئێك ژ ئوممەتا من ئەگەر ئەز وی ل رۆژا قیامەتێ نەنیاسم)، گۆتن: چاوا دێ د ناڤ بۆشاتییا خەلكیدا نیاسی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟! گۆت: (بێژە من ئەگەر تو چۆیە د ناڤ كۆمەكا هەسپاندا و هەسپێت رەشێت تاری لێ بن و هەسپەكێ ناڤچاڤ سپی و پێ بەلەك د

**نافڤدا بیت ما تو ژ وان نانیاسی)؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: (ب راستی وێ رۆژێ ئوممەتا من نافچاڤ گەشن ژ سوجەدەیان و دەست و پێ رۆنن ژ دەستنڤێژێ).**

٥ . باب: الصلوات بوضوء واحد.

**بابەتێ: کرنا نڤێژان ب دەستنڤێژەکێ.**

٩٤٤ - (م) عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ صَنَعْتَ اليَوْمَ شَيْئاً لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ؟ قَالَ: (**عَمْداً صَنَعْتُهُ يَا عُمَرُ**)!. [م٢٧٧].

**ژ بورەیدەیێ کورێ حوسەیبی (رضي الله عنه): پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا ڤەکرنا مەکەهێ هەمی نڤێژ ب دەستنڤێژەکێ کرن و ل سەر خوفکێت خۆ ڤەمالی، ئینا عومەری گۆتێ: ب راستی تە ئەڤرۆ تشتەك کر تە ئەو نەدکر؟! گۆت: (ئەی عومەر من ژ مەبەست وەکر).**

٦ . باب الذكر عقب الوضوء.

**بابەتێ: زکری د دویف دەستنڤێژێرا.**

٩٤٥ - (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: كَانَتْ عَلَيْنَا رِعَايَةُ الإِبِلِ، فَجَاءَتْ نَوْبَتِي، فَرَوَّحْتُهَا بِعَشِيٍّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَائِماً يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَأَدْرَكْتُ مِنْ قَوْلِهِ: (**مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ؛ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ**)، قَالَ: فَقُلْتُ: مَا أَجْوَدَ هَذِهِ! فَإِذَا قَائِلٌ بَيْنَ يَدَيَّ يَقُولُ: الَّتِي قَبْلَهَا أَجْوَدُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ، قَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُكَ جِئْتَ آنِفاً، قَالَ: (**مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُبْلِغُ ـ أَوْ فَيُسْبِغُ ـ الوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ؛ إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ**).

[م٢٣٤].

ژ عوقبەیێ كوڕێ عامری (رضي الله عنه) گۆت: چۆنا بەر حێشتران ل سەر مە بوو، و گەڕا من هات و من دویماهییا رۆژێ زڤراندن و ئەز گەهشتمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ پیانڤە بوو بۆ خەلكی دئاخفت ژ ئاخفتنا وی یا ئەز گەهشتیمێ: **(نینە موسلمانەك دەستنڤێژا خۆ بشۆت و راست و دورست دەستڤێژا خۆ بشۆت پاشی رابیت دو ركعەتان بكەت و ب دل و لەشڤە پێڤە گرێدای بیت ئەگەر خودێ بەحەشتێ بۆ نەنڤیسیت)**. گۆت من گۆت: ئەڤە چەندا خۆشە، من هند دیت ئێك یێ ل بەر سینگێ من دبێژیت: یا بەری وێ خۆشتر بوو، من بەرێ خۆ دایێ عومەرە، گۆت: من دیت تو ڤێ گاڤێ هاتی گۆت: **(نینە ئێك هەبیت دەستنڤێژا خۆ راست و دورست بشۆت، پاشی بێژیت: ئەز شەهدە ددەم كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤالە و موحەممەد بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە، ئەگەر هەر هەشت دەرگەهێت بەحەشتێ بۆ ڤەنەبن وی كیژك ڤیا تێڕا بچیتە د ژۆرڤە)**.

٩٤٦ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ المُتَطَهِّرِينَ؛ فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ).

[ت٥٥/ جه٤٧٠].

* صحيح.

و ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ دەستنڤێژێ بشۆت و راست و دورست بشۆت، پاشی بێژیت: ئەز شەهدە ددەم كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤالە و موحەممەد بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە، یا خودێ من ژ زێدە تەوبەداران دانە و من ژ پاقژكریان دانە هەر هەشت دەرگەهێت بەحەشتێ دێ بۆ ڤەبن وی كیژك ڤیا تێڕا بچیتە د ژۆرڤە)**.

## ٧ ـ باب: غسل اليدين عند الاستيقاظ.

## بابەتێ: شویشتنا هەردو دەستان دەمێ هشیاربوونێ.

٩٤٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ؛ فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثاً، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ). [م٢٧٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە ژ خەوا خۆ رابوو بلا دەستێ خۆ نەکەتە د ئامانیدا هەتا سێ جاران نەشۆت، ب راستی ئەو نوزانیت ب شەڤ دەستێ وی ل کیرێ بوویە).**

## ٨ ـ باب: لا يتوضأ من الشك

## بابەتێ: بۆ گۆمانێ دەستنڤێژێ ناشۆت.

٩٤٨ - (ق) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ، أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ): الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: (لاَ يَنْفَتِلْ ـ أَوْ: لا يَنْصَرِفْ ـ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً، أَوْ يَجِدَ رِيحاً). [خ١٣٧/ م٣٦١].

**ژ عەببادێ کورێ تەمیمی (رضي الله عنه) ژ مامێ خۆ وی گازندا زەلامی گەهاندە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هزر بکەت ئەو د نڤێژێدا تشتەکی دبینیت، ئینا گۆت: ئەو ناچیت هەتا دەنگەکی گوه لێ دبیت، یان بێهنەك بهێتێ.**

٩٤٩ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئاً، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ، أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَمْ لاَ؟ فَلاَ يَخْرُجَنَّ مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً، أَوْ يَجِدَ رِيحاً). [م٣٦٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە تشتەك د زكێ خۆدا دیت و ل بەر بەرزە بوو كا تشتەك ژێ دەركەفتییە یان نە، بلا ژ مزگەفتێ نەدەركەڤیت هەتا دەنگەكی دبهیسیت یان بێهنەك بكەهیتێ).**

٩ ـ باب التيمن في الطهور وغيره

**بابەتێ: كارئینانا لایێ راستێ د دەستنڤێژێدا و ژ بلی وێ ژی.**

٩٥٠ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ، وَتَرَجُّلِهِ، وَطُهُورِهِ، وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ. [خ١٦٨/ م٢٦٨].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كارئینانا رەخێ راستێ پێ خۆش بوو د هەمی كار و بارێ خۆ یێ فەردا: د دەستنڤێژ شویشتنا خۆدا و د سەرشەكرنا خۆدا و د پێلاڤ پێكرنا خۆدا.**

٩٥١ – عَنْ حَفْصَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَجْعَلُ يَمِينَهُ لِطَعَامِهِ وَشَرَابِهِ وَثِيَابِهِ، وَيَجْعَلُ شِمَالَهُ لِمَا سِوَى ذَلِكَ. [د٣٢].

* صحيح.

**و ژ حەفسایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ خۆ یێ راستێ بۆ خوارنا خۆ و ڤەخوارنا خۆ و جلكێ خۆ ب كار دئینا و یێ چەپێ بۆ تشتێت ژ بلی ڤان بوو.**

١٠ ـ باب: يتمضض من الطعام ولا يتوضأ.

**بابەتێ: دێ ئاڤێ د دەڤی وەردەت بۆ خوارنێ و دەستنڤێژێ ناشۆت.**

٩٥٢ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) شَرِبَ لَبَناً، فَمَضْمَضَ وَقَالَ: (**إِنَّ لَهُ دَسَماً**).

[خ٢١١/ م٣٥٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شیر ڤەخوار و ئاڤ د دەڤێ خۆ وەردا و گۆت: (ب راستی دوهن پێ هەی).**

٩٥٣ - (ق) عَنْ مَيْمُونَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَكَلَ عِنْدَهَا كَتِفاً، ثُمَّ صَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

[خ٢١٠/ م٣٥٦].

**ژ مەیموونەیێ (رضي الله عنها) كو پێغەمبەری (ﷺ) گۆشتی شەپویلی ل دەڤ وێ خوار پاشی نڤێژ كر و دەستنڤێژا خۆ نەشویشت.**

## ١١ ـ باب: الوضوء من لحوم الابل.

## بابەتێ: دەستنڤێژ شویشتنێ ژ گۆشتێ حێشترا.

٩٥٤ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الغَنَمِ؟ قَالَ: (**إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلاَ تَوَضأْ**). قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ**). قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**). قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ؟ قَالَ: (**لاَ**). [م٣٦٠].

**ژ جابرێ كوڕێ سەمورەی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكی پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، ئەرێ دەستنڤێژا خۆ ژ گۆشتێ پەزی بشۆم؟ گۆت: (ئەگەر تە ڤیا بشۆ و ئەگەر تە نەڤیا نەشۆ)، گۆت: ژ گوشتێ حێشترێ بشۆم؟ گۆت: (بەلێ ژ گۆشتێ حێشترێ بشۆ)، گۆت: نڤێژێ ل مەخەلا پەزی بكەم؟ گۆت: (بەلێ)، گۆت: نڤێژێ ل مەخەلا حێشترا بكەم؟ گۆت: (نەخێر)[1].**

(١) ئیمامێ نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت زانا د ڤێ پرسێدا د ژێك جودانە، پترییا وان د گەل هندێنە نەڤ حەدیسە یا مەنسوخە و دەستنڤێژ ب گۆشتێ حێشترێ ناكەڤیت، و ئەڤە گۆتنا هەرچار خەلیفەیێت راشدە و بۆچۆنا نەبو حەنیفەیە و ئیمام مالكی و شافعییە.

## ١٢ . باب: هل يتوضأ مما مست النار.

## بابەتێ: ئەرێ دەستنڤێژ ژ خوارنا ل سەر ئاگری چێ بووی دهێتە شویشتن.

٩٥٥ - (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ الحَارِثِ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَأَلَهُ عَنِ الوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ؟ فَقَالَ: لاَ، قَدْ كُنَّا زَمَانَ النَّبِيِّ (ﷺ) لاَ نَجِدُ مِثْلَ ذلِكَ مِنَ الطَّعَامِ إِلاَّ قَلِيلاً، فَإِذَا نَحْنُ وَجَدْنَاهُ لَمْ يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ؛ إِلاَّ أَكُفَّنَا وَسَوَاعِدَنَا وَأَقْدَامَنَا، ثُمَّ نُصَلِّي، وَلاَ نَتَوَضَّأُ. [خ٥٤٥٧].

**و ژ سەعیدێ كوڕێ حارسی، وی پرسیار ژ جابری كر (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ دەستنڤێژ شویشتنێ ژ خوارنا ل سەر ئاگری چێ بووی، گۆت: نە دەستنڤێژ بۆ ناهێتە گرتن، ب راستی سەردەمێ پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ خوارنە مە نەددیت كێمەك نەبیت، و ئەگەر مە دیتبا مە دخوار و مە كەفیك نەبوون لەپێت مە نەبن و زەندێت مە و پێت مە نەبن، مە پێ تبلێت خۆ پاقژ دكرن پاشی مە نڤێژ دكر و مە دەستنڤێژا خۆ نەدشویشت[١].**

٩٥٦ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ قَالَ: كَانَ آخِرَ الأَمْرَيْنِ مِنْ رَسُولِ الله (ﷺ): تَرْكُ الوُضُوءِ مِمَّا غَيَّرَت النَّارُ. [د١٩٢/ ن١٨٥].

* صحيح.

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: دویماهی فەرمان ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستنڤێژ هێلانە ژ وی یێ ئاگری گوهارتی.**

---

(١) مەرەم ئەو نینە مرۆڤ دەستێت خۆ نەشۆت بەلكی ئەڤە ل سەر كاودانی دراوەستیت، چونكی ئیسلام دینێ پاقژییێیە، بەلێ دبیت ئاڤ یا كێم بوویە و نەدیتییە و خوارنا زادێ ب ئاگری هاتییە چێكرن چو پەیوەندی ب كەڤتنا دەستنڤێژێڤە نینە لەوا نڤێژ دكرن و مە دەستنڤێژێت خۆ نەدشویشتن ب تایبەتی ئەگەر بزانین ئەڤ ئاخفتنە هەمی بەرسڤا پرسیارا ل سەر دەستنڤێژێیە.

### ١٣ . باب: نوم الجالس لا ينقض الوضوء.

### بابەتێ: نڤستنا ب‌ێ روینشتی دەستنڤێژێ ناشکێنیت.

٩٥٧ - (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يُنَاجِي رَجُلاً فِي جَانِبِ المسْجِدِ، فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ حَتَّى نَامَ القَوْمُ. [خ٦٤٢/ م٣٧٦].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: قامەتا نڤێژێ هاتە گرتن و پێغەمبەر (ﷺ) سوحبەت ل رەخەکێ مزگەفتێ د گەل زەلامەکی دکر نەرابوو نڤێژێ هەتا خەلك نڤستین.**

٩٥٨ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَنَامُ جَالِساً، ثُمَّ يُصَلِّي وَلاَ يَتَوَضَّأُ. [ط٤٢].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (رضي الله عنه) گۆت: ئیبن عومەر روینشتی دنڤست پاشی نڤێژ دکر و دەستنڤێژا خۆ نوی نەدکر.**

### ١٤ . باب السواك.

### بابەتێ: سیواکی.

٩٥٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي - أَوْ عَلَى النَّاسِ - لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلاَةٍ**). [خ٨٨٧/ م٢٥٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر من ژبەر زەحمەتچێکرنێ نەبا ل سەر ئوممەتا خۆ، یان ل سەر خەلکێ دا فەرمانا وان ب سیواکی کەم د گەل هەمی نڤێژان).**

٩٦٠ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**أَكْثَرْتُ عَلَيْكُمْ فِي السِّوَاكِ**). [خ٨٨٨].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من زێدە فەرمان ل هەوە ب سیواكی كر)[1].**

٩٦١ – (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ، بَدَأَ بِالسِّوَاكِ. [م٢٥٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دەست ب سیواكی دكر دەمێ دهاتە د مالا خۆڤە.**

## ١٥ . باب: المسح على العمامة والخفين.

## بابەتێ: ڤەمالینا ل سەر شاشكێ و خوفكان.

٩٦٢ – (ق) عَنِ المغِيْرَةِ بنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه قالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: (**أَمَعَكَ مَاءٌ**) ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ الإِدَاوَةَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا، حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: (**دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ**)، فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. [خ٥٧٩٩ (١٨٢)/ م٢٧٤].

**و ژ موغیرەیێ كوڕێ شوعبەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز شەڤەكێ ل وەغەرەكێ (غەزوا تەبووكێ بوو) د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووم (ﷺ) گۆتە من: ئاڤ د گەل تە هەیە؟ من گۆت: بەلێ، ژ دەوارێ خۆ هاتە خوارێ، و چۆ هەتا د تاریاتییا شەڤێدا بەرزە بووی، پاشی هات، من ئاڤ ژ ئامانێ پاقژكرنێ ل دەستێت وی كر، ناڤچاڤێت خۆ شویشتن، و جوبەكێ هریێ ل بەر بوو، نەشیا دەستێت خۆ ژێ دەربێخیت هەتا دەستێت خۆ ژ بنڤە ئیناینە دەرڤە، دەستێت خۆ شویشتن و مەسحا سەرێ خۆ كر، پاشی من خۆ چەماند دا خوفا وی بێخم گۆت: (بهێلە من د سەر دەستنڤێژێرا پێت كرینە پێت خۆ و خوفێت خۆ مەسح كرن).**

---

[1] یان من زێدە بۆ هەوە بەحسێ سیواكی كر یان من زێدە ژ هەوە خواست سیواكی ب كار بینن.

٩٦٣ - (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ: أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (ﷺ) يَمْسَحُ عَلَى الخُفَّيْنِ. وَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ. [خ٢٠٤ و٢٠٥].

**ژ عەمرێ كورێ ئومەییێ زومەری (ﷺ) وی پێغەمبەر (ﷺ) دیت ل سەر خوفكان مەسح دكر و گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) دیت ل سەر شاشكا خۆ مەسح دكر.**

٩٦٤ - (م) عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ أَسْأَلُهَا عَنِ المسْحِ عَلَى الخُفَّيْنِ؟ فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ)، فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ الله (ﷺ) ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ، وَيَوْماً وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ. [م٢٧٦].

**ژ شورەیحێ كورێ هانیئی (ﷺ) گۆت: ئەز هاتمە دەڤ عائیشایێ پرسیارا مەسحا خوفكان ژێ بكەم؟ گۆت: هەرە دەڤ عەلی پرسیارێ ژێ بكە ب راستی وی د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر دكرن، مە پرسیار ژ وی كر؟ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ وەغەرێ سێ رۆژ و شەڤێت وانڤە یێت دانایین و بۆ خۆجهی رۆژەك و شەڤەك.**

٩٦٥ - عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ قَالَ: رَأَيْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ الله تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ: أَقَبْلَ المائِدَةِ أَمْ بَعْدَ المائِدَةِ؟ قَالَ: مَا أَسْلَمْتُ إِلاَّ بَعْدَ المائِدَةِ. [ت٩٤].

* صحيح.

**ژ شەهرێ كورێ حەوشەبی (ﷺ) گۆت: من جەریرێ كورێ عەبدوللایی دیت: دەستنڤێژا خۆ شویشت و ل سەر خوفا خۆ مەسح كر گۆت: من پرسیارا ڤێ ژێ كر؟ گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) دیت دەستنڤێژا خۆ شویشت و ل سەر خوفا خۆ مەسح كر، من گۆتە وی ئەڤە بەری هاتنەخوارا سۆرەتا مائیدە بوو یان پشتی وێ، گۆت: ئەز پشتی سۆرەتا مائیدە یێ موسلمان بوویم.**

## ١٦ ـ باب: المسح على الجبيرة

## بابەتێ: مەسحكرنا ل سەر جهێ گرێدای

٩٦٦ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَى الْجُرْحِ عِصَابٌ، غَسَلَ مَا حَوْلَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ.

- وفي رواية: مَنْ كَانَ لَهُ جُرْحٌ مَعْصُوبٌ عَلَيْهِ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْعِصَابِ، وَيَغْسِلُ مَا حَوْلَ الْعِصَابِ.
- وفي رواية: أَنَّ إِبْهَامَ رِجْلِهِ جُرِحَتْ فَأَلْبَسَهَا مَرَارَةً وَكَانَ يَتَوَضَّأُ عَلَيْهَا.
- وفي رواية: أَنَّهُ تَوَضَّأَ وَكَفُّهُ مَعْصُوبَةٌ فَمَسَحَ عَلَيْهَا وَعَلَى الْعِصَابِ، وَغَسَلَ سِوَى ذَلِكَ. [هق/١/٢٢٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەگەر چو ل سەر برینێ نەبیت دۆرماندۆرێت وێ دشویشتن و برین نەدشویشت.**

- **و د ڤەگێرەكا دیدا: هەر كەسێ برینەكا پێچای هەبیت دێ دەستنڤێژێ شۆت و ل سەر برینا پێچای مەسح كەت و دۆرماندۆرێت وێ شۆت.**
- **و د ڤەگێرەكا دیدا: تلا بەرانی یا پێ وی بریندار بوو تەعلیشكا (پەزی) سەردا بربوو و دەستنڤێژ د سەرڕا دشویشت.**
- **و د ڤەگێرەكا دیدا: وی دەستنڤێژ شویشت و دەستێ وی یێ گرێدای بوو و ل سەر ئەوا گرێدایی مەسح كر و یا دی شویشت.**

## ١٧ ـ باب: الوضوء والغسل بفضل طهور المرءة.

## بابەتێ: دەستنڤێژ شویشتن و سەرشویشتن ژ بەرماكێ ئاڤا ژنێ.

٩٦٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: اغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي جَفْنَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِيَتَوَضَّأَ مِنْهَا ـ أَوْ يَغْتَسِلَ ـ فَقَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي كُنْتُ جُنُباً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ الْمَاءَ لاَ يُجْنِبُ**). [د٦٨/ ت٦٥/ ن٣٢٤/ جه٣٧٠/ مي٧٦١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەڤژینەکا پێغەمبەری (ﷺ) سەرێ خۆ ژ ئامانەکێ ئاڤێ شویشت، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) هات دا دەستنڤێژێ ژێ بشۆت یان سەرێ خۆ بشۆت، گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب ڕاستی ئەز یا ب جەنابەت بووم، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (ب ڕاستی ئاڤ ب جەنابەت ناکەڤیت).**

## ١٨ . باب: هل يتوضأ من مس الذكر.

## بابەتێ: ئەرێ دەستنڤێژ ب دەستکرنا نێری دهێتە گرتن؟

٩٦٨ – عَنْ بُسْرَةَ بِنْتِ صَفْوَانَ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ؛ فَلْيَتَوَضَّأْ**).

[د١٨١/ ت٨٢/ ن١٦٣/ جه٤٧٩/ مي٧٥١]

* صحيح.

**ژ بوسرەیا کچا سەفوانی (ڕەزیاللەهو عەنها) وێ گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (یێ دەستێ خۆ کرە نێرێ خۆ بلا دەستنڤێژا خۆ بشۆت).**

٩٦٩ . عن أبي أَيُّوبَ، قال: سمعت رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يقول: (**من مَسَّ فَرْجَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ**). [جه٤٨٢].

صحيح.

**ژ ئەبی ئەیووبی (ڕەزیاللەهو عەنهو) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (یێ دەستێ خۆ بکەتە شەرمگەها خۆ بلا دەستنڤێژێ بشۆت).**

٩٧٠ – عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ الحَنَفِيِّ قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى نَبِيِّ الله (ﷺ)، فَجَاءَ رَجُلٌ كَأَنَّهُ بَدَوِيٌّ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ الله! مَا تَرَى فِي مَسِّ الرَّجُلِ ذَكَرَهُ بَعْدَ مَا يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ: (**هَلْ هُوَ إِلاَّ مُضْغَةٌ مِنْهُ**) ؟ أَوْ (**بَضْعَةٌ مِنْهُ**). [د١٨٢/ ت٨٥/ ن١٦٥/ جه٤٨٣].

* صحيح.

ژ تەلقێ كورێ عەلی یێ حەنەفی (ﷺ) گۆت: ئەم هاتینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا زەلامەك هات هەروەكی كۆچەر بوو، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو چ دبێژی بۆ زەلامی دەستكەتە نێرێ خۆ پشتی دەستنڤێژ شویشتی؟ گۆت: **(ما ئەو چییە ئەگەر پارچەك نەبیت ژ وی) یان (پشكەك ژ وی).**

١٩ . باب: الوضوء من النوم.

**بابەتێ: دەستنڤێژ شویشتن ژ نڤستنێ.**

٩٧١ – عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(وِكَاءُ السَّهِ العَيْنَانِ، فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ).** [د٢٠٣/ جه٤٧٧].

* حسن.

ژ عەلییێ كورێ ئەبی تالبی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەردو چاڤ بەنكێ قوینێنە[1] ڤێجا یێ نڤست بلا دەستنڤێژێ بشۆت).**

٢٠ . باب: هل يتوضأ من القبلة.

**بابەتێ: ئەرێ دێ دەستنڤێژێ ژ ماچیكرنێ گریت.**

٩٧٢ – عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَبَّلَ بَعْضَ نِسَائِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قالَ: قُلْتُ: مَنْ هِيَ إِلاَّ أَنْتِ؟ فَضَحِكَتْ. [د١٧٩/ ت٨٦/ ن١٧٠/ جه٥٠٢]

* صحيح.

---

(١) ئانكو هشیاری پارێزەرا پاشییا مرۆڤییە هندی یێ هشیار بیت ئاگەهـ ژ خۆ هەیە و ئەگەر نڤست نەڤە بەنكێ وێ ڤەبوو و نوزانیت كا تشتەك ژێ دەركەفتییە یان نە.

ژ عوروەی (رحمه الله) ژ عائیشایێ کو پێغەمبەری (ﷺ) هندە هەڤژینێت خۆ ماچیکرن پاشی دەرکەفتە نڤێژێ و دەستنڤێژ نەشویشت، گۆت: من گۆت: ئەو کی بوو ئەگەر تو نەبی، گۆت: کرە کەنی.

٩٧٣ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قُبْلَةُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ وَجَسُّهَا بِيَدِهِ مِنَ المُلاَمَسَةِ، فَمَنْ قَبَّلَ امْرَأَتَهُ أَوْ جَسَّهَا بِيَدِهِ؛ فَعَلَيْهِ الوُضُوءُ. [ط٩٧].

* إسناده صحيح.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی دگۆت: ماچیکرنا زەلامی هەڤژینا خۆ و دەستێ خۆ (بێ ناڤبڕ) بکەتێ ژ دەستکرتنێیە، ڤێجا یێ هەڤژینا خۆ ماچی کر یان دەستێ خۆ کرێ دەستنڤێژ شویشتن ل سەر وییە.

## ٢١ . باب ماجاء في الرعاف والدم.

## بابەتێ: ئەو تشتێ د خوینرستنا دفنێ و خوینێدا هاتی.

٩٧٤ – عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا رَعَفَ انْصَرَفَ، فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَجَعَ، فَبَنَى وَلَمْ يَتَكَلَّمْ.

[ط٧٩].

* إسناده صحيح.

ژ نافعی (رحمه الله) ب ڕاستی عەبدوللایێ کوڕێ عومەری ئەگەر خوین ژ دفنا وی هاتبا دچۆ و دەستنڤێژا خۆ دشویشت پاشی دزڤری و تمام دکر و نەدئاخفت.

٩٧٥ – عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ المِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ مِنَ اللَّيْلَةِ الَّتِي طُعِنَ فِيهَا، فَأَيْقَظَ عُمَرَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَقَالَ عُمَرُ: نَعَمْ، وَلاَ حَظَّ فِي الإِسْلاَمِ لِمَنْ تَرَكَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى عُمَرُ وَجُرْحُهُ يَثْعَبُ دَماً. [ط٨٤].

* إسناده صحيح.

**ژ عوروەی (رحمه الله) كو میسوەرێ كوڕێ مەخرەمەیی گۆتێ: ئەو چۆ دەڤ عومەرێ كوڕێ خەتتابی وێ شەڤا دربەك تێدا دانایێ، ئینا عومەر بۆ نڤێژا سپێدێ هاتە هشیاركرن، گۆت: بەلێ ئەز دێ هشیاربم، و وی چو پشك و بار ژ ئیسلامێ نینن یێ نڤێژ (ژ بێ باوەری) هێلا، و عومەری نڤێژ كر و برینا وی خوین ژێ دچۆ.**



## الفصل الرابع: الغسل

## پشکا چوارێ: شویشتن

### ١ . باب: المسلم لا ينجس

### بابەتێ: موسلمان پیس نابیت

٩٧٦ - (م) عَنْ حُذَيْفَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) لَقِيَهُ وَهُوَ جُنُبٌ، فَحَادَ عَنْهُ، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ جاءَ فَقَالَ: كُنْتُ جُنُباً، قَالَ: (**إِنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ**). [م٣٧٢].

**ژ حوزەیفەی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەهشتە وی و ئەو یێ ب جەنابەت بوو، ژ بەر هندێ خۆ ژێ دا پاش، خۆ شویشت پاشی هاتە دەڤ، ئینا گۆت: ئەز یێ ب جەنابەت بووم، گۆت: ب ڕاستی موسلمان پیس نابیت.**

### ٢ . باب نوم الجنب.

### بابەتێ: نڤستا مرۆڤێ ب جەنابەت.

٩٧٧ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ، وَهُوَ جُنُبٌ، غَسَلَ فَرْجَهُ، وَتَوَضَّأَ لِلصَّلاَةِ. [خ٢٨٨ (٢٨٦)/ م٣٠٥].

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: ئەگەر پێغەمبەری (ﷺ) ڤیابا بنڤیت و ئەو یێ ب جەنابەتبا، شەرمگەها خۆ دشویشت و دەستنڤێژا خۆ بۆ نڤێژێ دشویشت.**

٩٧٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ قَالَ: اسْتَفْتَى عُمَرُ النَّبِيَّ (ﷺ): أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: (**نَعَمْ إِذَا تَوَضَّأَ**). [خ٢٨٩ (٢٨٧)/ م٣٠٦].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەری پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر، ئەرێ ئێك ژ مە بنڤیت و ئەو یێ ب جەنابەت؟ گۆت: (بەلێ ئەگەر دەستنڤێژا خۆ شویشت).**

٩٧٩ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَنَامُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَمَسَّ مَاءً.

[د٢٢٨/ ت١١٨، ١١٩/ جه٥٨١ . ٥٨٣].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دنڤست و ئەو یێ ب جەنابەت بێی دەستێ خۆ بكەتە ئاڤێ بۆ سەر شویشتنێ.**

### ٣ . باب: اذا اراد ان يعاود الجماع.

### بابەتێ: ئەگەر ڤیا بزڤریتەڤە نڤینێ.

٩٨٠ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيَتَوَضَّأْ)**. [م٣٠٨].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە چۆ دەڤ هەڤژینا خۆ و پاشی ڤیا بزڤریتەڤێڤە بلا دەستنڤێژێ بشۆت).**

### ٤ . باب: اذا التقيا الختانان.

### بابەت ئەگەر هەردو شەرمگەهـ گەهشتنە ئێك.

٩٨١ – عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ الفُتْيَا الَّتِي كَانُوا يُفْتَوْنَ أن «المَاءَ مِنَ المَاءِ» كانت رُخْصَةً رخصها رَسُولُ الله (ﷺ) فِي بدء الإِسْلاَمِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالاِغْتِسَالِ بَعْدُ. [د٢١٤/ ت١١٠/ جه٦٠٩/ مي٧٨٦].

- وفي رواية لأبي داود: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) إِنَّمَا جَعَلَ ذَلِكَ رُخْصَةً لِلنَّاسِ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ لِقِلَّةِ الثِّيَابِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالغُسْلِ، وَنَهَى عَنْ ذَلِكَ.

- ولفظ الترمذي: إِنَّمَا كَانَ «الماءُ مِنَ الماءِ» رُخْصةً فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، ثُمَّ نُهِي عنها.

* صحيح.

**ژ ئوبەیێ كوڕێ كەعبی (ﷺ) گۆت: ئەو بەرسڤا بۆ خەلكی دهاتە گۆتن كو ئاڤ ژ ئاڤێیە (ئاكو ئەگەر ئاڤا زەلامی نەهات سەر شویشتن ب ئاڤێ ل سەر نینە) دەستویرییەك بوو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستپێكا ئیسلامێ دەستویری دایە خەلكی، پاشی فەرمانا وان هاتە كرن پشتی هینگێ سەرێ خۆ بشۆن.**

- **و د ڤەگێرا ئەبو داوودیدا: (ئاڤ ژ ئاڤێیە ئانكو دڤێت ئاڤێ ببینن هەتا سەرێ خۆ بشۆن) ئەو بەس دەستویرییەك بوو د دەستپێكا ئیسلامێدا ژ بەر كێمیا جلكان، پاشی فەرمان ب سەرشویشتنێ كر و پاشڤەلێدان ژ نەسەرشویشتنێ كر.**
- **و بێژەیا ترمزی: ب ڕاستی ئاڤ ژ ئاڤێیە (ئانكو دڤێت ئاڤێ ببینن هەتا سەرێ خۆ بشۆن) بەس دەستویرییەك بوو د دەستپێكا ئیسلامێدا پاشی پاشڤەلێدان ژێ هاتە كرن.**

٩٨٢ - عَنْ عَبْدِ الله بن عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**إِذَا التَقَى الخِتَانَانِ، وَتَوَارَتِ الحَشَفَةُ؛ فَقَدْ وَجَبَ الغُسْلُ**). [جه٦١١].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هەردو شەرمگەهـ گەهشتنە ئێك و سەرك ئاڤا بوو ب ڕاستی هینگێ سەرشویشتن پێدڤی بوو).**

٥ . اذا احتلمت المرأة.

**بابەتێ: ئەگەر ژنێ وەكی خەونا زەلامی دیت.**

٩٨٣ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى رَسُولِ الله (ﷺ)، فَقَالَتْ لَهُ، وَعَائِشَةُ عِنْدَهُ: يَا رَسُولَ الله، المَرْأَةُ تَرَى مَا يَرَى الرَّجُلُ فِي المَنَامِ، فَتَرَى مِنْ نَفْسِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ مِنْ نَفْسِهِ؟

فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ؛ فَضَحْتِ النِّسَاءَ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَقَالَ لِعَائِشَةَ: (**بَلْ أَنْتِ، فَتَرِبَتْ يَمِينُكِ، نَعَمْ، فَلْتَغْتَسِلْ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ إِذَا رَأَتْ ذَاكَ**). [م٣١٠].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكى (ﷺ) دبێژیت: ئوم سەلیم هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و عائیشا ل دەڤ پێغەمبەرى بوو، گۆتێ: ئەى پێغەمبەرێ خودێ: ئەرێ ژن ژى وەكى زەلامى خەونێ دبینیت، و ئەوا زەلام دبینیت ئەو ژى دبینیت (یان ئەوا بۆ زەلامى چێ دبیت بۆ ژنێ ژى چێ دبیت؟).. عائیشا دبێژیت: من گۆتێ: وەى بۆ تە ئەڤە چ ئاخڤتنە تو دبێژى ئەى دەیكا سەلیمى تە هەتكا ژنان بر، ئینا پێغەمبەرى (ﷺ) بەرێ خۆ دا عائیشایێ و گۆتێ: (ئەى عائیشا تە خێرە، وەى بۆ تە ئەو چ ئاخڤتنە تو دكەى، بەلێ خەونێ دبینیت و هەكە وەسا دیت بلا سەرێ خۆ بشۆت).**

٦ـ باب: صفة الغسل.

## بابەتێ: چاوانییا راكرنا جەنابەتێ

٩٨٤ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الجَنَابَةِ، بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي المَاءِ، فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعْرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ، ثُمَّ يُفِيضُ المَاءَ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ. [خ٢٤٨/ م٣١٦].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) هەڤژینا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر سەرێ خۆ بۆ جەنابەتێ شویشتبا دەست پێ دكر دەستێت خۆ دشویشتن، پاشى دەستنڤێژ دشویشت هەروەكى بۆ نڤێژێ دەستنڤێژ دگرت، پاشى تلێت خۆ دكرنە د ئاڤێدا و دكرنە د ناڤ بن موییێت خۆڕا، پاشى سێ مست ب سەرێ خۆدا دكرن پاشى ئاڤ ب سەر هەمى لەش و پیستێ خۆدا دكر.**

٩٨٥ - (ق) عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الباقِرِ: أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله، هُوَ وَأَبُوهُ، وَعِنْدَهُ قَوْمٌ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الغُسْلِ؟ فَقَالَ: يَكْفِيكَ صَاعٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا يَكْفِينِي! فَقَالَ جَابِرٌ: كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَى مِنْكَ شَعْرًا وَخَيْرٌ مِنْكَ. ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ. [خ٢٥٢/ م٣٢٩].

**ژ بابێ جەعفەری، (رضي الله عنه) ئەو و بابێ خۆ ل دەڤ جابرێ کورێ عەبدوللایی بوون، و هندەك ل دەڤ وی بوون پرسیارا راکرنا جەنابەتێ ژ وی کر؟ ئینا گۆت: ساعەکا ئاڤێ تێرا تە هەیە[1]، ئینا زەلامەکی گۆت: ئەو تێرا من ناکەت، گۆت: ساعەك تێرا یێ پرچا وی ژ یا تە بۆشتر و ئەو ژ تە چێتر دکر، و پاشی پێشنڤێژییا مە ب جلکەکی کر.**

٩٨٦ - (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَتْ هِيَ وَرَسُولُ الله (ﷺ) يَغْتَسِلاَنِ فِي الإِنَاءِ الوَاحِدِ مِنَ الجَنَابَةِ. [خ٣٢٢ (٢٩٨)/ م٢٩٦].

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: وێ و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ ئێك ئامان بۆ جەنابەتی سەرێت خۆ دشویشتن.**

٩٨٧ - (م) عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) مَاءً وَسَتَرْتُهُ، فَاغْتَسَلَ. [م٣٣٧].

**ژ مەیموونەیێ (رضي الله عنها) گۆت: من ئاڤ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دانا و من پەردە دا بەر وی سەرێ خۆ شویشت.**

## ٧ - باب الغسل كل سبعة أيام.

## بابەتێ: خۆشویشتنێ هەر حەفت رۆژان.

٩٨٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِي (ﷺ) قَالَ: (**حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا، يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ**). [خ٨٩٧/ م٨٤٩].

---

(١) هەر ساعەك دبیتە (٢,٧٥٢) لیترێت ئاڤێ.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) ژ پێغەمبەری (ﷺ): (ئەركە سەر هەر موسلمانەكی هەر حەفت رۆژان رۆژەكێ تێدا سەرێ خۆ و لەشێ خۆ بشۆت).**

٨ . باب: لا يغتسل في الماء الراكد.

**بابەتێ: د ئاڤا راوەستایدا خۆشویشتن ناهێتە كرن.**

٩٨٩ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (لاَ يَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي المَاءِ الدَّائِمِ، وَهُوَ جُنُبٌ) فَقَالَ: كَيْفَ يَفْعَلُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: يَتَنَاوَلُهُ تَنَاوُلاً. [م٢٨٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە سەرێ خۆ د ئاڤا راوەستایدا نەشۆت و ئەو یێ ب جەنابەت، ئینا گۆت: پا چ بكەت ئەی ئەبا هورەیرە؟ گۆت: بلا ژێ ژێراكرن راكەت).**

٩ . باب: حكم ضفائر المغتسلة.

**بابەتێ: فەرمانا كەزییێت ئەوا سەرێ خۆ دشۆت.**

٩٩٠ - (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قالتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي، فَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الجَنَابَةِ؟ قَالَ: (لاَ، إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلاَثَ حَثَيَاتٍ، ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ المَاءَ، فَتَطْهُرِينَ). [م٣٣٠].

- وفي رواية: فَأَنْقُضُهُ لِلْحَيْضَةِ وَالجَنَابَةِ؟ فقال: (لا).

**ژ ئوم سەلەمەیێ (ﭬ) گۆت: من گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز ژنەكم كەزییێت خۆ باش گرێ ددەم، ما بۆ سەرشویشتنا جەنابەتێ ڤەكەم؟ گۆت: (نەخێر ئەو تنێ بەسی تەیە سێ مستان ل سەرێ خۆ بكەی پاشی ئاڤێ ل خۆ بكەی و هۆسا دێ پاقژ بی).**

- **و د ڤەگێرەكا دیدا: ئەرێ بۆ بێنڤێژییێ و جەنابەتێ ڤەكەم؟ گۆت: (نەخێر).**

### ١٠ . باب: النائم يرى بللا.

### بابەتێ: یێ نڤستی تەڕاتییەكێ ببینیت.

٩٩١ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ البَلَلَ، وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَماً؟ قَالَ: (**يَغْتَسِلُ**)، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدْ احْتَلَمَ، وَلاَ يَجِدُ البَلَلَ؟ قَالَ: (**لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ**).

[د٢٣٦/ ت١١٣/ جه٦١٢/ مي٧٩٢].

* حسن.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە كرن زەلام تەڕاتییەكێ ببینیت و بیرا وی ناهێت خەونەك دیتبیت؟ گۆت: (دێ سەرێ خۆ شۆت)، و ژ وی زەلامێ بزانیت خەون یا دیتی بەلێ تەڕاتییێ نەبینیت؟ گۆت: (سەرشویشتن ل سەر نینە).**

### ١١ . باب: غسل الكافر اذا اسلم.

### بابەتێ: سەرشویشتنا گاوری ئەگەر موسلمان بوو.

٩٩٢ – عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) أُرِيدُ الإِسْلاَمَ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ.

[د٣٥٥/ ت٦٠٥/ ن١٨٨].

* صحيح.

**ژ قەیسێ كوڕێ عاسمی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) من دڤیا موسلمان ببم ئینا فەرمانا من كر سەرێ خۆ ب ئاڤێ و سابوینا سیدرێ بشۆم.**

٩٩٣ – عَنْ عُثَيْمِ بْنِ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: قَدْ أَسْلَمْتُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الكُفْرِ**). يَقُولُ: احْلِقْ.

قَالَ: وأَخْبَرَنِي آخَرُ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِآخَرَ مَعَهُ: (**أَلْقِ عَنْكَ شَعْرَ الكُفْرِ وَاخْتَتِنْ**). [د٣٥٦].

ژ عوسەیمێ كورێ كولەیبی ژ بابێ خۆ، ژ باپیرێ خۆ، ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: **(موییێ گاورییێ ژ خۆ ڤەكە)**. ئانكو دبێژیت: بتراشە.
گۆت: و ئێكێ دی گۆتە من كو پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە ئێكێ دی د گەل وی: **(موییێ گاورییێ ژ خۆ ڤەكە و خۆ سونەت بكە)**.

## ١٢ ـ باب: ما جاء في دخول الحمام.

## بابەتێ: ئەو تشتێ ل سەر چۆنا د سەرشۆیێڤە.

٩٩٤ – عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَدْخُلِ الحَمَّامَ بِغَيْرِ إِزَارٍ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُدْخِلْ حَلِيلَتَهُ الحَمَّامَ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَجْلِسْ عَلَى مَائِدَةٍ يُدَارُ عَلَيْهَا الخَمْرُ**). [ت٢٨٠١/ ن٣٩٩٠].

* صحيح.

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا بێ ئیزار[1] نەچیتە د سەرشۆیێڤە و هەر كەسێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا هەڤژینا خۆ نەبەتە د سەرشۆیێڤە (هەلبەت یا گشتی) و هەر كەسێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا ل سەر سفرەكێ نەروینیت مەی لێ بهێتە گێڕان)**.

٩٩٥ – عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ الدَّرْدَاءِ تَقُولُ: خَرَجْتُ مِنَ الحَمَّامِ، فَلَقِيَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**مِنْ أَيْنَ يَا أُمَّ الدَّرْدَاءِ**) ؟ قَالَتْ: مِنَ الحَمَّامِ فَقَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا مِنِ امْرَأَةٍ تَضَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ أَحَدٍ مِنْ أُمَّهَاتِهَا؛ إِلاَّ وَهِيَ هَاتِكَةٌ كُلَّ سِتْرٍ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الرَّحْمَنِ**). [حم٢٧٠٣٨].

* حديث حسن.

---

(١) ئیزار ئەو پارچە پەڕۆكە ئەوێ زەلام دهاڤێژیتە نافتەنگا لەشێ خۆ ژ نافكێ پێدا.

ژ سەهلێ كوڕێ مەعازێ كوڕێ ئەنەسی ژ بابێ خۆ، وی گوه ل ئوم دەردائێ بوو دگۆت: ئەز ژ سەرشۆیێ دەردكەفتم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەهشتە من، ئینا گۆت: (ژ كیرێ دهێی ئەی ئوم دەرداء)؟ گۆت: ژ سەرشۆیێ، ئینا گۆت: (ئەز ب وی كەمە یێ كار و جانێ من د دەستێ ویدا نینە ژنەك جلكێت خۆ نە ل مالا ئێكێ ژ دایكێت خۆ دانیت، ئەگەر ئەو پەردا د ناڤبەرا خۆ و دلۆڤانییێدا نەدڕینیت).



## الفصل الخامس: التيمم

## پشكا پێنجێ: تەیەمموم

### ١ . باب: مشروعية التيمم

### بابەتێ: دورستییا تەیەممومێ

٩٩٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالبَيْدَاءِ ـ أَوْ بِذَاتِ الجَيْشِ ـ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ الله (ﷺ) عَلَى التِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ. فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، فَقَالُوا: أَلاَ تَرَى مَا صَنَعَتْ عائشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ الله (ﷺ) وَالنَّاسِ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ! فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ، وَرَسُولُ الله (ﷺ) وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ الله (ﷺ) وَالنَّاسَ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ! فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ مَا شَاءَ الله أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ؛ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ الله (ﷺ) عَلَى فَخِذِي، فَقَامَ رَسُولُ الله (ﷺ) حِينَ أَصْبَحَ عَلَى غيرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ الله آيَةَ التَّيَمُّمِ؛ فَتَيَمَّمُوا. فَقَالَ: أُسَيْدُ بْنُ الحُضَيْرِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ! قَالَتْ: فَبَعَثْنَا البَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَأَصَبْنَا العِقْدَ تَحْتَهُ. [خ٣٣٤/ م٣٦٧].

**عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەم ئێك ژ وەغەرێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل دەركەفتین هەتا گەهشتینە بەیدائێ یان جهێ سەربازان (دو جهن د ناڤبەرا مەكەهێ و خەیبەرێدا و گۆمان ژ ڤەگێرییە) رستكەكا من قەتیا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ما لێ بگەرییێت، و خەلك ژی د گەل مان، و ئەو ل سەر ئاڤێ نەبوون، ئینا خەلك هاتنە دەڤ ئەبوبەكرێ سەددیق و گۆتن: تو نابینی عائیشایێ چ كر؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و خەلك هێلان و نە ل سەر ئاڤێنە و ئاڤ ژی د گەل وان نینە، ئینا ئەبوبەكر هات و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرێ خۆ دانابوو سەر رانێ من و نڤست بوو، ئینا گۆت: تە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و خەلك هێلان و نە ل سەر ئاڤێنە و نە ئاڤ د گەل وانە، عائیشایێ گۆت: و ئەبوبەكری گازندە ژ من كرن و ئەو گۆت یا خودێ حەز كری بێژیت، و دەست هاڤێتێ دەستێ خۆ ل تەنشتا من دا، چ رێگری ل من نەكر ئەز بلڤلڤم ئەو نەبیت ژ بەر جهێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر چۆكێ من، ئینا دەمێ**

**بوویە سپێدە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر بێ ئاڤییێ رابوو، ئینا خودێ ئایەتا تەیەممومێ ئینا خوار، و وان تەیەمموم كر، ئینا ئوسەیدێ كورێ خزری گۆت: ئەڤە نە بەرەكەتا هەوە یا ئێكێیە ئەی مالا ئەبوبەكری، عائیشایێ گۆت: مە ئەو حێشترا ئەز ل سەر راكر مە رستك ل بن وێ دیت.**

## ٢ ـ باب: كيفية التيمم

## بابەتێ: چاوانییا تەیەممومێ.

٩٩٧ – عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ مِنَ الجُرُفِ، حَتَّى إِذَا كَانَا بِالمِرْبَدِ، نَزَلَ عَبْدُ اللهِ، فَتَيَمَّمَ صَعِيداً طَيِّباً، فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى المِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى. [ط١٢٣، ١٢٤].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: ئەو عەبدوللایێ كورێ عومەری ژ جورفێ (جهەكە سێ میلان ژ مەدینەیێ دویرە) هاتن هەتا گەهشتینە میربەدێ (جهەكە دو میلان ژ مەدینەیێ دویرە) عەبدوللا هاتە خوارێ تەیەمموم ب ئاخا پاقژ كر و ناڤچاڤ و دەستێت خۆ هەتا ئەنیشكان ڤەمالی پاشی نڤێژ كر.**

٩٩٨ – عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ التَّيَمُّمِ؟ فَأَمَرَنِي ضَرْبَةً وَاحِدَةً لِلْوَجْهِ وَالكَفَّيْنِ. [د٣٢٧، ت١٤٤/ مي٧٧٢].

* صحيح.

**ژ عەممارێ كورێ یاسری (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا تەیەممومێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر؟ ئینا فەرمانا من ب تەپەكێ ب تنێ بۆ ناڤچاڤ و لەپان كر.**

## ٣ ـ باب: هل يعيد الصلاة اذا وجد الماء.

## بابەتێ: ئەرێ دێ نڤێژێ کەتەڤە ئەگەر ئاڤ دیت.

٩٩٩ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ رَجُلاَنِ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ وَلَيْسَ مَعَهُمَا مَاءٌ، فَتَيَمَّمَا صَعِيداً طَيِّباً، فَصَلَّيَا، ثُمَّ وَجَدَا المَاءَ فِي الوَقْتِ، فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا الصَّلاَةَ وَالوُضُوءَ، وَلَمْ يُعِدِ الآخَرُ. ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ الله (ﷺ) فَذَكَرَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لِلَّذِي لَمْ يُعِدْ: (**أَصَبْتَ السُّنَّةَ، وَأَجْزَأَتْكَ صَلاَتُكَ**)، وَقَالَ لِلَّذِي تَوَضَّأَ وَأَعَادَ: (**لَكَ الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ**). [د٣٣٨، ٣٣٩/ ن٤٣١، ٤٣٢/ مي٧٧١].

* صحيح

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری، (ﷺ) گۆت: دو زەلام د وەغەرەکێدا دەرکەفتن، دەمێ نڤێژ هات و ئاڤ د گەل وان نەبوو، ب ئاخا پاقژ تەیەمموم کرن و نڤێژ کرن، پاشی د وی دەمیدا ئاڤ دیتن، ئێکی ژ وان دەستنڤێژ گرتەڤە و نڤێژ کرەڤە و یێ دی نڤێژ نەکرەڤە، پاشی هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو بۆ ڤەگێران، ئینا گۆتە وی یێ دوبارەنەکری: (تە یا دورست یا کری، و نڤێژ ل سەر تە رابوو)، و گۆتە یێ دەستنڤێژ شویشتی و نڤێژ کرییەڤە: (دو خێر بۆ تەنە).**

## ٤ ـ باب التيمم للجنابة

## بابەتێ: تەیەممومێ بۆ جەنابەتێ.

١٠٠٠ – (ق) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ الخُزَاعِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) رَأَى رَجُلاً مُعْتَزِلاً، لَمْ يُصَلِّ فِي القَوْمِ، فَقَالَ: (**يَا فُلاَنُ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ فِي القَوْمِ**) ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلاَ مَاءَ، قَالَ: (**عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ**). [خ٣٤٨ (٣٤٤)/ م٦٨٢].

**ژ عیمرانێ کورێ (حصین)ێ خوزاعی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك دیت نڤێژ د گەل خەلکی نەکر، ئینا گۆت: (ئەی فلان چ رێگری ل تە کر تو نڤێژێ د گەل خەلکی نەکەی)؟ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ ب جەنابەت کەفتیم، و ئاڤ نینە، گۆت: (هەرە ئاخێ (تەیەممومێ بکە) ئەو تێرا تە هەیە).**

١٠٠١ - عَنْ عَمْرِو بْنِ العَاصِ قَالَ: احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ، فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السُّلاَسِلِ، فَأَشْفَقْتُ إِنِ اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ، فَتَيَمَّمْتُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: **(يَا عَمْرُو، صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ)** ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي مَنَعَنِي مِنَ الاغْتِسَالِ، وَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ [النساء:٢٩]، فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَلَمْ يَقُلْ شَيْئاً. [د٣٣٤].

* صحيح.

**ژ عەمرێ كوڕێ عاسی (رضي الله عنه) گۆت: د شەڤەكا ساردا د شەڕێ (ذات السلاسل)دا ئەز ب جەنابەت كەفتم، ئەز ترسیام ئەگەر سەرێ خۆ بشۆم ژ ناڤ بچم، ئینا من تەیەمموم كر و پاشی من نڤێژا سپێدێ ل بەری هەڤالێت خۆ كر، ئینا وان ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەگێرا، گۆت: (ئەی عەمر تە نڤێژ بەری هەڤالێت خۆ كر و تو یێ ب جەنابەت)؟! ئینا من گۆتێ كا چ ئەز ژ سەرشویشتنێ ڤەگرتم، و من گۆت: من گوه لێ بوو خودێ دبێژیت: ﴿ولا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كان بِكُمْ رَحِيمًا﴾ خۆ نەكوژن ب ڕاستی خودێ ب هەوە یێ دلۆڤانە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كرە كەنی و چو نەگۆت.**

### ٥ ـ باب: هل يطلب الماء.

### بابەتێ: ئەرێ دێ ل ئاڤێ گەریێت.

١٠٠٢ - (ع) عَن عَبْد الله بنِ أحْمَد قَالَ: وَسَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: وَمَا كَانَ فِي قَرْيَةِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ بِئْرٌ، فَكُنَّا نَذْهَبُ نُبَكِّرُ عَلَى مِيلَيْنِ نَتَوَضَّأُ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الماءَ. [حم١٤١٦٦م].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەحمەدی (رحمه الله) گۆت: من گوه ل بابێ خۆ بوو دگۆت: چو بیر ل گوندێ عەبدولرەزاقی نەبوون، ڤێجا دەستپێكا ڕۆژێ ئەم دو میلان دچۆین مە دەستنڤێژ دشویشت و مە ئاڤ د گەل خۆ دبر.**

١٠٠٣ - عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ يَكُونُ فِي السَّفَرِ فَتَحْضُرُهُ الصَّلاَةُ وَالْماءُ مِنْهُ عَلَى غَلْوَةٍ أَوْ غَلْوَتَيْنِ وَنَحْوَ ذَلِكَ، ثُمَّ لاَ يَعْدِلُ إِلَيْهِ. [هق١/٢٣٣].

**ژ نافعی (ڕەحمەتێ خودێ لێ بیت) ژ ئیبن عومەری: ئەو د وەغەرێدا بوو، دا دەمێ نڤێژێ هێت و ئاڤ تەمەت هاڤێتنا تیرەكێ یان دو تیران یا ژ وی دویر بوو و وەكی وێ، پاشی لێ نەدزڤری.**

٦ ـ باب: التيمم في السفر.

**بابەتێ: تەیەممومێ د وەغەرێدا.**

١٠٠٤ – عَنْ أَبِي ذَرٍّ قال: قال رَسُول الله (ﷺ): (إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ الْمَاءَ، فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ). [د٣٣٢/ ت١٢٤/ ن٣٢١].

* صحيح.

**ژ ئەبی زەڕی (ڕەحمەتێ خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی ئاخا پاقژ پاقژكەرە بۆ موسلمانی ئەگەر ئەو دەه سالان ئاڤێ نەبینیت و ئەگەر ئاڤ دیت بلا د لەشێ خۆ بدەت، ب ڕاستی ئەو چێترە).**

٧ ـ باب: التيمم لرد السلام.

**بابەتێ: تەیممومێ بۆ سلاڤ ڤەگێرانێ.**

١٠٠٥ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَقْبَلَ رَسُولُ الله (ﷺ) مِنَ الغَائِطِ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ عِنْدَ بِئْرِ جَمَلٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ الله (ﷺ)، حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الحَائِطِ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى الحَائِطِ، ثُمَّ مَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ رَسُولُ الله (ﷺ) عَلَى الرَّجُلِ السَّلَامَ. [د٣٣١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ دەستئاڤێ دهات زەلامەك ل دەڤ بیرا جەمەل (جهەكە ل مەدینەیێ) گەهشتێ و سلاڤ كرێ، و وی سلاڤا وی نەڤەگێرا هەتا بەرێ خۆ دایە دیوارەكی دەستێت خۆ دانانە سەر دیواری و پاشی ناڤچاڤێت خۆ و دەستێت خۆ ڤەمالین پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سلاڤا وی زەلامی ڤەگێرا.**

## ٨ ـ باب: التيمم للمرض والجراح.

## بابەتێ: تەیەمموم بۆ نەساخی و برینان.

١٠٠٦ – عَنْ جَابِرٍ قَالَ: خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ، فَأَصَابَ رَجُلاً مِنَّا حَجَرٌ، فَشَجَّهُ فِي رَأْسِهِ، ثُمَّ احْتَلَمَ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ؟ فَقَالُوا: مَا نَجِدُ لَكَ رُخْصَةً، وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى المَاءِ، فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ. فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) أُخْبِرَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: **(قَتَلُوهُ، قَتَلَهُمْ اللهُ! أَلاَ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا، فَإِنَّمَا شِفَاءُ العِيِّ السُّؤَالُ؛ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِرَ ـ أَوْ يَعْصِبَ**، شَكَّ مُوسَى ـ **عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَةً، ثُمَّ يَمْسَحَ عَلَيْهَا، وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ)**. [د٣٣٦].

* حسن.

**ژ جابرى (ﷺ) گۆت: ئەم د وەغەرەكێدا دەركەفتین، بەرەك ب سەرێ زەلامەكی ژ مە كەفت، و شكاند و سەرێ وی شەق كر، و پاشی ب جەنابەت كەفت، پرسیارا هەڤالێت خۆ كر هوین دەستویرییا تەیەممومێ بۆ من دبینن؟ (ئەز تەیەممومێ بكەم و ئاڤێ ل سەرێ خۆ نەكەم) ئینا گۆتن: ئەم چو دەستویرییێ بۆ تە نابینین و تو دشێی ئاڤێ ب كار بینی، ئینا سەرێ خۆ شویشت ژ بەر هندێ مر، ڤێجا دەمێ ئەم هاتینە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئەو بۆ هاتە گۆتن، ئینا گۆت: (وان ئەو كوشت خودێ وان بكوژیت بلا پرسیار كربا دەمێ نەدزانی، ب راستی دەرمانێ نەزانینێ تنێ پرسیاركرنە، ئەو تنێ بەسی وی بوو تەیەمموم كربا و ئاڤ ل برینا خۆ رەشاندبا یان برینا خۆ ب پاتەكی گرێدابا پاشی ڤەمالیبا و لەشێ خۆ یێ دی شویشتبا).**



# الكتاب الثاني

# الأذان ومواقيت الصلاة

# كتێبا دووێ

# بانگ و دەمێت نڤێژێ

## الفصل الأول: الأذان

## پشکا ئێکێ: بانگ

### ١ ـ باب: بدء الأذان وبيان ألفاظِهِ.

### بابەتێ: دەستپێکا بانگی و دیارەکرنا پەیڤێت وی.

١٠٠٧ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ المسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا المدِينَةَ، يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلاَةَ، لَيْسَ يُنَادَى لَهَا، فَتَكَلَّمُوا يَوْماً فِي ذلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوساً مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ بُوقاً مِثْلَ قَرْنِ اليَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ: أَوَلاَ تَبْعَثُونَ رَجُلاً يُنَادِي بِالصَّلاَةِ، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (يَا بِلاَلُ، قُمْ فَنَادِ بِالصَّلاَةِ). [خ٦٠٤/ م٣٧٧].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: موسلمان دەمێ هاتینە مەدینێ کۆم دبوون و دەم بۆ نڤێژێ ڤەدگرتن. و بانگ بۆ نەدهاتە دان، رۆژەکێ ل سەر ڤێ چەندێ ئاخفتن، هندەکان گۆت: ناقووسەکێ وەکی ناقووسا فەلەیان بگرن، و هندەکان گۆت. نەخێر بووقەکێ وەکی شاخکێ جوهییان بگرن، ئینا عومەری گۆت، کا زەلامەکی بهنێرن بانگی بۆ نڤێژێ بدەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی بلال رابە بانگی بۆ نڤێژێ بدە).**

١٠٠٨ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زَيْدٍ قَالَ: لَمَّا أَمَرَ رَسُولُ الله (ﷺ) بِالنَّاقُوسِ يُعْمَلُ لِيُضْرَبَ بِهِ لِلنَّاسِ لِجَمْعِ الصَّلاَةِ، طَافَ بِي وَأَنَا نَائِمٌ رَجُلٌ يَحْمِلُ نَاقُوساً فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا عَبْدَ الله، أَتَبِيعُ النَّاقُوسَ؟ قَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ فَقُلْتُ: نَدْعُو بِهِ إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: أَفَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكَ؟ فَقُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فقالَ: تَقُولُ: الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله. حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ. الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. قَالَ: ثُمَّ اسْتَأْخَرَ عَنِّي غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ

قَالَ: وَتَقُولُ إِذَا أَقَمْتَ الصَّلاَةَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ.

فَلَمَّا أَصْبَحْتُ أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا رَأَيْتُ، فَقَالَ: (**إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللهُ، فَقُمْ مَعَ بِلاَلٍ، فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا رَأَيْتَ فَلْيُؤَذِّنْ بِهِ، فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتاً مِنْكَ**). فَقُمْتُ مَعَ بِلاَلٍ، فَجَعَلْتُ أُلْقِيهِ عَلَيْهِ وَيُؤَذِّنُ بِهِ، قَالَ: فَسَمِعَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ يَجُرُّ رِدَاءَهُ وَيَقُولُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ يَا رَسُولَ اللهِ! لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ مَا أُرِيَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَلِلَّهِ الحَمْدُ**).

[د٤٩٩/ جه٧٠٦].

■ وأخرج الترمذي بعضه، وفيه: (**فَإِنَّهُ أَنْدَى وَأَمَدُّ صَوْتاً مِنْكَ**). [ت١٨٩]،

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ زەیدی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان دای ناقووسەك بهێتە دورستکرن دا بۆ خەلکی بهێتە لێدان دا بۆ نڤێژێ کۆم ببن، و ئەز یێ نڤستی زەلامەك د دەڤ منرا هات ناقووسەك د دەستێ ویدا بوو، من گۆتێ ئەی بەندەیێ خودێ، تو وێ ناقووسێ نافرۆشی؟ گۆت: و دێ چ لێ کەی؟ من گۆت: دێ پێ گازی نڤێژێ کەین، گۆت: ئەز تشتەکێ ژ وێ باشتر نیشا تە نەدەم؟ من گۆت: بەلێ: گۆت: وی گۆت: بێژە:** (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلا الله أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلا الله أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللهِ حَيَّ على الصَّلَاةِ حَيَّ على الصَّلَاةِ حَيَّ على الْفَلَاحِ حَيَّ على الْفَلَاحِ الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إِلا الله) **پاشی خۆ ژ من ڤەهێلا بەلێ نەدویر و پاشی گۆت: ئەگەر تە قامەتا نڤێژێ گرت بێژە:** (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لَا اله إلا الله أَشْهَدُ أَنَّ

مُحَمَّدًا رسول اللّهِ حَيَّ على الصَّلَاةِ حَيَّ على الْفَلَاحِ قد قَامَتْ الصَّلَاةُ قد قَامَتْ الصَّلَاةُ الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إلا الله).

**ڤێجا دەمێ سپێدە ل من بووی، ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو تشتێ من دیتی من بۆ گۆت: (ئینا گۆت: ب ئانەهیا خودێ ئەو خەونەکا راستە، هلۆ د گەل بیلالی ئەوا تە دیتی بۆ بێژە بلا پێ بانگ بدەت ب راستی ئەو ژ تە دەنگ خۆشتر و بلندترە). ئەز د گەل بیلالی رابووم و من بۆ گۆت، وی پێ بانگ دا، گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی ئەڤە گوهـ لێ بوو و ئەو ل مالا خۆ بوو، دەرکەفت و ئەو یێ عەبایێ خۆ دخرِینیت (ئانکو لەزێ دکەت) و دبێژیت: ئەز ب وی کەمە یێ تو ب راستییێ هنارتی ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی من ژی وەکی وێ دیت یا دیتی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سوپاسی بۆ خودێ بن).**

- و (ترمذي) هندەك ژێ ڤەگێرایە و تێدا هاتییە: **(رابە د گەل بیلالی ب راستی ئەو ژ تە دەنگ خۆش و دەنگ بلندترە).**

٢ ـ باب: الأذان شفع والإقامة وتر.

**بابەتێ: بانگ جۆتە و قامەت کەتە.**

١٠٠٩ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ الأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ الله (ﷺ) مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَالإِقَامَةُ مَرَّةً مَرَّةً، غَيْرَ أَنَّهُ يَقُولُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، فَإِذَا سَمِعْنَا الإِقَامَةَ تَوَضَّأْنَا، ثُمَّ خَرَجْنَا إِلَى الصَّلاَةِ. [د٥١٠/ ن٦٢٧/ مي١٢٢٩].

* حسن.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ب راستی ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) بانگ جۆت جۆت بوو و قامەت کەت کەت بوو بەلێ بانگبێژ دێ بێژیت: دەمێ نڤێژکرنێ هات دەمێ نڤێژکرنێ هات، ڤێجا ئەگەر مە گوهـ ل قامەتێ ببا مە دەستنڤێژ دشویشتن و ئەم دەردکەفتینە مزگەفتێ.**

## ٣ ـ فضل الأَذان.

## بابەتێ: خێرا بانگی.

١٠١٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي العَتَمَةِ وَالصُّبْحِ، لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْواً** ). [خ٦١٥/ م٤٣٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر خەلکی زانیبا کا چەند خێر د بانگی و رێزا ئێکێدا هەیە و پاشی چو چارە نەدیتبان کو گەهشتبانێ ب پشك کێشانێ نەبیت، دا پشکێ بۆ کێشن، و ئەگەر زانیبان کا چ د زوی چۆنا نڤێژێدایە دا بەریکانێ بۆ کەن و ئەگەر زانیبان کا چ د نڤێژا عەیشا و سپێدێدا هەیە، داهێنێ خۆ ئەگەر ل سەر زکی هاتبانێ).**

١٠١١ - (م) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ يَحْيَى، عَنْ عَمِّهِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَهُ المؤَذِّنُ يَدْعُوهُ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**المُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقاً يَوْمَ القِيَامَةِ**). [م٣٨٧].

**ژ تەلحەیێ کورێ یەحیایی ژ مامێ خۆ گۆت: ئەز ل دەڤ موعاویەیێ کورێ ئەبو سوفیانی بووم (ﷺ) بانگبێژ هاتە دەڤ گازیکەتە نڤێژێ، ئینا گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (بانگدەر رۆژا قیامەتێ ژ هەمی مرۆڤان ستۆ درێژترن)[1].**

١٠١٢ - عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ اللهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ المُقَدَّمِ، وَالمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ بِمَدِّ صَوْتِهِ، وَيُصَدِّقُهُ مَنْ سَمِعَهُ مِنْ رَطْبٍ وَيَابِسٍ، وَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ صَلَّى مَعَهُ**). [ن٦٤٥/ جه٩٩٧].

---

**(١) مەرەم پێ پتر ژ هەمیان هیڤیا دلۆڤانییا خودێنە، لەوا پتر ژ هەمیان سەرێ وان یێ بلندە ل هیڤیا دلۆڤانییا خودێنە.**

* صحيح.

ژ بەرائێ كورێ عازبی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودێ و ملیاكەتێت وی سەلەواتان ددەنە سەر رێزێت ئێكێ**[1]**، و ب چەند چۆنا دەنگێ بانگبێژی گونەهێت وی دهێنە ژێبرن و شەهدەییێ بۆ ددەن، یێ گوە لێ ببیت ژ تەڕ و هشكان و وەكی خێرا وان یێت د گەل وی نڤێژ كرین بۆ وییە)**.

١٠١٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(الإِمَامُ ضَامِنٌ، وَالمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللَّهُمَّ! أَرْشِدِ الأَئِمَّةَ، وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ)**. [د٥١٧، ٥١٨/ ت٢٠٧].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(پێشنڤێژ كەفیلە** (نڤێژێ بێ كێماسی بكەت) **و بانگبێژ باوەرپێكرییە** (دەمی بپارێزیت و د دەمێ نڤێژێدا بانگ بدەت) **یا خودێ پێشنڤێژان راستەرێ بكە و گونەهێت بانگبێژان ژێ ببە)**.

٤ ـ باب: إجابةُ المؤذن.

**بابەتێ: بەرسڤدانا بانگبێژی.**

١٠١٤ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ المُؤَذِّنُ)**. [خ٦١١/ م٣٨٣].

ژ ئەبێ سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: **(ئەگەر هەوە گوە ل بانگی بوو، هوین ژی وەكی یا ئەو بانگبێژ دبێژیت بێژن)**.

---

(١) سەلەوات ژ خودێ، دلۆڤانییە؛ و ژ ملیاكەتان، دوعانە.

١٠١٥ - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (إِذَا قَالَ المُؤَذِّنُ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمْ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله. ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِالله. ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِالله. ثُمَّ قَالَ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ، قَالَ: الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، مِنْ قَلْبِهِ، دَخَلَ الجَنَّةَ). [م٣٨٥].

**ژ عومەرێ کوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر بانگبێژی گۆت: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) و ئێکی ژ هەوە گۆت: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) پاشی گۆت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلا الله) گۆت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلا الله) پاشی گۆت: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ) گۆت: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّهِ) پاشی گۆت: (حَيَّ على الصَّلَاةِ) گۆت: (لَا حَوْلَ ولا قُوَّةَ إلا بِاللَّهِ) پاشی گۆت: (حَيَّ على الْفَلَاحِ) گۆت: (لَا حَوْلَ ولا قُوَّةَ إلا بِاللَّهِ) پاشی گۆت: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) گۆت: (الله أَكْبَرُ الله أَكْبَرُ) پاشی گۆت: (لَا إِلَهَ إلا الله) گۆت: (لَا إِلَهَ إلا الله) و ژ دل گۆت ئەو چۆ بەحەشتێ).**

## ٥ ـ باب الدعاء عند النداء.

## بابەتێ: دوعا د دویڤ بانگیڕا.

١٠١٦ - (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَةِ، وَالصَّلاَةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ وَالفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ). [خ٦١٤].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ دەمێ گوه ل بانگی دبیت بێژیت: یا خودێ خودانێ ڤێ گازیێا تەکووز و بێ کێماسی و خودانێ ڤێ نڤێژا دهێتە کرن[1] وەسیلەیێ[1] و پلەیا تایبەت بدە موحەممەدی و بگەهینە جهێ پەسنکری[2] ئەوێ تە ژڤان پێ دایێ بەرڤانییا من ڕۆژا قیامەتێ بۆ وی بنەجە و فەر بوو).**

---

[1] یان نڤێژا هەر دێ مینیت.

١٠١٧ - (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً، صَلَّى الله عَلَيْهِ بِهَا عَشْراً، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِي الوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ الله، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِي الوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ). [م٣٨٤].

ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) وی گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەگەر هەوە گوهـ ل بانگی بوو، هوین ژی وەکی یا ئەو دبێژیت بێژن، پاشی سەلەواتان بدەنە سەر من، ب راستی هەر کەسێ سەلەواتەکێ بدەتە سەر من، خودێ دەهان ل شوینێ دێ دەتە سەر** (ئانکو دەهـ دلۆڤانییان دێ پێ بەت) **پاشی داخوازا وەسیلێ** (جهەکێ تایبەتە ژ بەحەشتێ) **بۆ من بکەن، ئەو جهەکە د بەحەشتێدا بۆ کەسێ نابیت بۆ بەندەیەکێ نەبیت ژ بەندەیێت خودێ و ئەز هیڤی دکەم ئەز ئەو بم، و هەر کەسێ داخوازا وەسیلێ بۆ من بکەت بەرڤانی و مەهدەرییا من بۆ فەر بوو).**

١٠١٨ - (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ رَسُولِ الله (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِالله رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً؛ غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ). [م٣٨٦].

ژ سەعدێ کورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ دەمێ گوهـ ل بانگدەری دبیت، بێژیت؛ ئەز شەهدە ددەم کو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤاله و موحەممەد بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە، ئەز رازیمە ب خودێ، خودان، و ب موحەممەدی پێغەمبەر، و ب ئیسلامێ ئایین. گونەهێت وی هاتنە ژێبرن).**

---

(١) جهێ تایبەت ژ بەحەشتێ.

(٢) ئەو جهێ شوکرا وی تێدا دئێتە کرن رۆژا مەهدەرا مەزن.

## ٦ ـ باب: إتخاذ المؤذنين وأذان الأعمى.

## بابەتێ: گرتنا بانگبێژان و بانگێ یێ کۆرە.

١٠١٩ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ الله (ﷺ) مُؤَذِّنَانِ: بِلاَلٌ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى.

[م٣٨٠].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو بانگبێژ هەبوون بیلال و ئیبن ئوم مەکتومێ کۆرە.**

## ٧ ـ باب: التثويب في أذان الفجر

## بابەتێ: (گۆتنا نڤێژ ژ نڤستنێ ب خێرترە) د بانگێ سپێدێدا.

١٠٢٠ - عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ قَالَ: كُنْتُ أُؤَذِّنُ لِرَسُولِ الله (ﷺ)، وَكُنْتُ أَقُولُ فِي أَذَانِ الفَجْرِ الأَوَّلِ: حَيَّ عَلَى الفَلاَحِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الله أَكْبَرُ، الله أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله.

[ن٦٤٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی مەحەزورەی (رضي الله عنه) گۆت: من بانگ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ددا و من د بانگێ ئێکێ یێ سپێدێدا دگۆت:** (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) **وەرنە سەرفەرازییێ و نڤێژ ژ نڤستنێ بخێرترە خودێ یێ مەزنە و خودێ یێ مەزنە، چو خودایێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت.**

١٠٢١ – عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ، عَنْ بِلاَلٍ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) يُؤْذِنُهُ بِصَلاَةِ الفَجْرِ، فَقِيلَ: هُوَ نَائِمٌ، فَقَالَ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، فَأُقِرَّتْ فِي تَأْذِينِ الفَجْرِ، فَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ. [جه٧١٦].

* صحيح.

**ژ سەعیدێ كوڕێ موسەییەبی (رحمه الله) ژ بیلالی (رضي الله عنه)، ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) وی بۆ نڤێژا سپێدێ ئاگەهدار بكەت، گۆتنێ ئەو یێ نڤستییە، ئینا گۆت:** (الصلاة خير من النوم الصلاة خير من النوم) **نڤێژا سپێدێ ژ خەوێ بخێرترە نڤێژا سپێدێ ژ خەوێ بخێرترە ئینا ئەو د بانگدانا سپێدێدا هاتە پەسندكرن و بانگ ل سەر ڤێ جهگیر بوو.**

٨ ـ باب: الأذان فوق المنارة.

**بابەتێ: بانگدانێ ل سەر منارێ.**

١٠٢٢ – عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ قَالَتْ: كَانَ بَيْتِي مِنْ أَطْوَلِ بَيْتٍ حَوْلَ المسْجِدِ، وَكَانَ بِلاَلٌ يُؤَذِّنُ عَلَيْهِ الفَجْرَ، فَيَأْتِي بِسَحَرٍ، فَيَجْلِسُ عَلَى البَيْتِ يَنْظُرُ إِلَى الفَجْرِ، فَإِذَا رَآهُ تَمَطَّى، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَحْمَدُكَ، وَأَسْتَعِينُكَ عَلَى قُرَيْشٍ أَنْ يُقِيمُوا دِينَكَ، قَالَتْ: ثُمَّ يُؤَذِّنُ. قَالَتْ: وَاللهِ مَا عَلِمْتُهُ كَانَ تَرَكَهَا لَيْلَةً وَاحِدَةً. تَعْنِي هَذِهِ الكَلِمَاتِ. [د٥١٩].

* حسن.

**ژ عوروەیێ كوڕێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ ژنەكا بەنی نەججار گۆت: خانییێ من ژ هەمی خانییان بلند تر بوو ژ ئەوێت دۆرماندۆری مزگەفتێ، و بیلالی بانگێ سپێدێ ل سەر بانگ ددا، ڤێجا دا بەری سپێدێ هێت و ل سەر بانی روینیتە خوار و بەرێ خۆ ددا سپێدەیێ، ڤێجا ئەگەر دیتبا، دا رابیت خۆ راست كەت و پاشی دا بێژیت: ئەی خودا ئەز پەسن و سوپاسییا تە دكەم و هاریكارییێ ژ تە ل سەر قورەیشییان دخوازم**

**ئەو موسلمان ببن و پێگرییێ ب رێورەسمێت ئیسلامێ بکەن، گۆت: پاشی بانگददا، گۆت: ئەز ب خودێ کەمە من شەڤەکێ ژی ب تنێ نەدیت ئەڤە هێلای، ئانکو ئەڤ پەیڤە.**

### ٩ ـ باب/ هل يأخذ اجرا على الأذان؟

### بابەتێ: ئەرێ دێ کرێ ل سەر بانگی وەرگریت؟

١٠٢٣ – عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي العَاصِ قالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، اجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي، فَقَالَ: **(أَنْتَ إِمَامُهُمْ، وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّناً لاَ يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْراً)**.

[د٥٣١/ ت٢٠٩/ ن٦٧١/ جه٧١٤].

* صحيح.

**ژ عوسمانێ کوڕێ عاسی (رضي الله عنه) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من بکە پێشنڤێژێ خەلکێ من، گۆت: (تو پێشنڤێژێ وانی و ل دویڤ لاوازێ وان نڤێژێ بکە و بانگدەرەکی بۆ خۆ بگرە کرێ ل سەر بانگێ خۆ نەوەرگریت).**

### ١٠ ـ باب: السنة في الأذان.

### بابەتێ: یا سونەت د بانگیدا.

١٠٢٤ – عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) بِالأَبْطَحِ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ، فَخَرَجَ بِلاَلٌ، فَأَذَّنَ فَاسْتَدَارَ فِي أَذَانِهِ، وَجَعَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ. [جه٧١١].

* صحيح.

**ژ ئەبی جوحەیفەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل ئەبتوحێ هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و د گومبەتکا سۆرڤە بوو، بیلال دەرکەفت و بانگ دا و د بانگێ خۆدا زڤری و تلێت خۆ کرنە د گوهێت خۆڕا.**

### ١١ ـ باب: الأذان لمن صلى وحده.

**بابەتێ: بانگى بۆ یێ ب تنێ نڤێژێ بكەت.**

١٠٢٥ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (يَعْجَبُ رَبُّكُمْ مِنْ رَاعِي غَنَمٍ، فِي رَأْسِ شَظِيَّةٍ بِجَبَلٍ، يُؤَذِّنُ لِلصَّلاَةِ وَيُصَلِّي، فَيَقُولُ الله عزّ وجل: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا، يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ لِلصَّلاَةَ، يَخَافُ مِنِّي، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي، وَأَدْخَلْتُهُ الجَنَّةَ). [د١٢٠٣/ ن٦٦٥].

* صحيح.

**ژ عوقبەیێ كوڕێ عامرى (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (خودایێ تە ژ شڤانەكێ پەزى ل سەر سەرێ كەڤرەكى ژ چیایەكى یێ رازییە ئەو بانگى بۆ نڤێژێ بدەت و نڤێژێ بكەت، ڤێجا خودایێ هەر ب هێز و مەزن دبێژیت: بەرێ خۆ بدەنە ڤى بەندەیێ من بانگى ددەت و نڤێژێ دكەت ژ من دترسیت ب راستى من گونەهێت وى ژێ برن و ئەو برە بەحەشتا خۆ).**

١٢ . باب: بعض الأحكام المتعلقة بالأذان.

**بابەتێ: هندە فەرمانێت ب بانگیڤە گرێدایى.**

١٠٢٦ – (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ قَالَ: أَذِّنْ أَذَاناً سَمْحاً؛ وَإِلاَّ فَاعْتَزِلْنَا.

[خ. الأذان، باب ٥].

**ژ عومەرێ كوڕێ عەبدولعەزیزى (رحمه الله) گۆت: بانگەكێ ب ساناهى بدە یان كارێ بانگدانێ بهێلە.**

١٠٢٧ – (خ) وَيُذْكَرُ أَنَّ أَقْوَاماً اخْتَلَفُوا فِي الأَذَانِ، فأَقْرَعَ بَيْنَهُم سَعْدٌ. [خ. الأذان، باب ٩].

**و دهێتە گۆتن هندە مرۆڤ ل سەر بانگى ژێك جودا بوون، ئینا سەعدى پشك هاڤێتە د ناڤبەرا واندا.**

١٠٢٨ – (خ) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ: أنهَ تَكَلَّمَ فِي أَذَانِهِ. [خ. الأذان، باب ١٠].

**ژ سولەیمانێ كوڕێ سیردی كو ئەو د بانگێ خۆدا ئاخفت.**

١٠٢٩ - (خ) عَنِ الحَسَنِ قَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَضْحَكَ وَهُوَ يُؤَذِّنُ أَوْ يُقِيمُ. [خ. الأذان، باب ١٠].

**ژ حەسەنی (ﷺ) گۆت: چو نینە بانگبێژ بكەنیت و ئەو یێ بانگی ددەت یان قامەتێ دگریت.**

١٠٣٠ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَيْسَ عَلى النِّسَاءِ أَذَانٌ وَلا إِقَامَةٌ. [هق ١/٤٠٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: نە بانگ و نە قامەت ل سەر ژنێ نینن.**

١٠٣١ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّها كانت تُؤَذِّنُ وتُقيمُ، وتَقُومُ وَسَطَهُنَّ. [هق ١/٤٠٨].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: وێ بانگ ددا و قامەت دگرت و نڤێژ بەری ژنان دكر و د نیڤا واندا رادوەستا.**



## الفصل الثاني: مواقيت الصلاة

## پشكا دووێ: دەمێت نڤێژێ

### ١ ـ باب: أوقات الصلاة الخمسة

### بابەتێ: دەمێت هەر پێنج نڤێژان.

١٠٣٢ – (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالعَصْرَ وَالشَّمسُ نَقِيَّةٌ، وَالمغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالعِشَاءَ أَحْيَاناً وَأَحْيَاناً: إِذَا رَآهُمْ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ أَبْطَؤُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ ـ كَانُوا، أَوْ ـ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ. [خ٥٦٠/ م٦٤٦].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: نڤێژا نیڤرۆ ل دەمێ رۆژ ل نیڤا عەسمانی خوارکەفت دکر، و یا ئێڤاری هێژ رۆژ یا سافی و زەر نەبووی، و یا مەغرەب دەمێ رۆژ ئاڤا دبوو، و یا عەیشا هندە جارا و هندە جارا: ئەگەر دیتبان یێت كۆم بووین لەز لێ دكر، و ئەگەر دیتبان یێت ڤەماین گیرۆ دكر. و نڤێژا سپێدێ وان یان ژی پێغەمبەری (ﷺ) د دویماهی تارياتییا سپێدێدا دكر.**

١٠٣٣ – (م) عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ عَنْ وَقْتِ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ لَهُ: (**صَلِّ مَعَنَا هَذَيْنِ**) ـ يَعْنِي: اليَوْمَيْنِ ـ فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الظُّهْرَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ العَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ بَيْضَاءُ نَقِيَّةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ المغْرِبَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ، ثمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ العِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الفَجْرَ حِينَ طَلَعَ الفَجْرُ.

فَلَمَّا أَنْ كَانَ اليَوْمُ الثَّانِي أَمَرَهُ فَأَبْرَدَ بِالظُّهْرِ، فَأَبْرَدَ بِهَا، فَأَنْعَمَ أَنْ يُبْرِدَ بِهَا، وَصَلَّى العَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، أَخَّرَهَا فَوْقَ الَّذِي كَانَ، وَصَلَّى المغْرِبَ قَبْلَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى العِشَاءِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، وَصَلَّى الفَجْرَ فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ قَالَ: (**أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ وَقْتِ الصَّلاَةِ**)؟ فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا، يَا رَسُولَ الله! قَالَ: (**وَقْتُ صَلاَتِكُمْ بَيْنَ مَا رَأَيْتُمْ**). [م٦١٣].

**ژ بورەیدەیێ کورێ حوسەیبی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: زەلامەکی پرسیارا دەمێ نڤێژان ژێ کر؟ ئینا گۆتێ: (ڤان هەردوکان ئانکو رۆژان نڤێژێ د گەل مە بکە)، ڤێجا دەمێ رۆژ ل نیڤا عەسمانی خوارکەفتی فەرمانا بیلالی کر بانگی بدەت پاشی فەرمانا وی کر قامەتا نڤێژا نیڤرۆ بگریت پاشی فەرمانا وی کر قامەتا نڤێژا ئێڤاری ئینا و رۆژ یا بلند بوو و سپی و سافی بوو ژ زەراتییێ، پاشی فەرمانا وی کر قامەتا مەغرەب ئینا دەمێ رۆژ ئاڤا بووی پاشی فەرمانا وی کر قامەتا عەیشا گرت دەمێ سۆراتی ئاڤا بووی، پاشی فەرمانا وی کر قامەتا سپێدێ گرت دەمێ سپێدە دەرکەفتی.**

**ڤێجا دەمێ بوویە رۆژا دووێ فەرمانا وی کر نیڤرۆ ئێخستە د سەرمایێدا (ئانکو هێلا هەتا کەلەژانا تەحرێ چۆیی) و باش ئێخستە د سەرمایێدا، و نڤێژا ئێڤاری کر و رۆژ هێژ یا بلدند بوو بەلێ پتر ژ رۆژا دی گێرۆ کر، و مەغرەب بەری سۆراتییا رۆژێ ئاڤا ببیت کر و نڤێژا عەیشا کر پشتی دو سێکا شەڤێ چۆی، و نڤێژا سپێدێ کر و ئێخستە د رۆناهییێدا، پاشی گۆت: (کا پرسیارکەرێ دەمێت نڤێژان)؟ زەلامی گۆت: ئەزم ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (دەمێ نڤێژێت هەوە د ناڤبەرا وێدانە یا تە دیتی).**

٢ ـ باب: فضل صلاتي الصبح والعصر.

**بابەتێ: خێرا نڤێژا سپێدێ و ئێڤاری.**

١٠٣٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ: مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ، وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الفَجْرِ وَصَلاَةِ العَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ).

[خ٥٥٥/ م٦٣٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ملیاکەت د راستا هەوەدا جهێ ئێك و دو دگرن، ملیاکەتێت شەڤێ و ملیاکەتێت رۆژێ، و نڤێژا سپێدێ و**

**ئێڤاری دگەهنە ئێك، پاشی ئەوێت ب شەڤ مابنە د گەل هەوە دێ بلند بن، خودێ دێ پرسیارا وان كەت، و ئەو ژ وان چێتر دزانیت: هەوە چاوا بەندەیێت من هێلان؟ دێ بێژن مە هێلان و وان نڤێژ دكرن و ئەم چۆینە دەڤ وان و وان نڤێژ دكرن).**

١٠٣٥ - (م) عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا**) ؛ يَعْنِي: الفَجْرَ وَالعَصْرَ. [م٦٣٤].

**ژ عیمارەیێ كورێ رووئەیبەی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) گۆت: (كەسەك ناچیتە جەهنەمێ بەری رۆژ بهەلێت و بەری ئاڤا ببیت نڤێژێ بكەت ئانكو نڤێژا سپێدێ و ئێڤاری).**

**٣ ـ باب وقت الفجر.**

**بابەتێ: دەمێ نڤێژا سپێدێ.**

١٠٣٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءُ المؤْمِنَاتِ، يَشْهَدْنَ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) صَلاَةَ الفَجْرِ، مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، ثُمَّ يَنْقَلِبْنَ إِلَى بُيُوتِهِنَّ حِينَ يَقْضِينَ الصَّلاَةَ، لاَ يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الغَلَسِ.

[خ٥٧٨، (٣٧٢)/ م٦٤٥].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: كۆمەكا ژنێت باوەریدار نڤێژا سپێدێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئامادە دبوون و پۆشییێت خۆ د خۆ وەردكرن و پاشی ڤەدگەریانەڤە مالێت خۆ دەمێ دنڤێژ دكرن و كەسێ ئەو ژ بەر تارییێ نەدنیاسین.**

١٠٣٧ - عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، عَنْ رِجَالٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**مَا أَسْفَرْتُمْ بِالفَجْرِ، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ بِالأَجْرِ**). [ن٥٤٨].

* صحيح الإسناد.

**ژ مەحموودێ كورێ لەبیدی (رضي الله عنه) ژ هندەك زەلامان ژ خەلكێ خۆ ژ ئەنساران كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هندی هوین نڤێژا سپێدێ بێخنە د زەلالییێدا خێرا وێ مەزنترە).**

## ٤ ـ باب وقت الظهر.

## بابەتێ: دەمێ نڤێژا نیڤرۆ.

١٠٣٨ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي شِدَّةِ الحَرِّ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ وَجْهَهُ مِنَ الأَرْضِ، بَسَطَ ثَوْبَهُ، فَسَجَدَ عَلَيْهِ.

[خ١٢٠٨ (٣٨٥)/ م٦٢٠].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: مە نڤێژا نیڤرۆ د كەلەژانا گەرمێدا د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دكر، و ئەگەر ئێك ژ مە نەشیابا ئەو ئەنیا خۆ دانیتە عەردی جلكێ خۆ درائێخست و سوجدە ل سەر دبر.**

١٠٣٩ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّي الظُّهْرَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ.

[م٦١٨].

**ژ جابرێ كورێ سەمورەی (رضي الله عنه) گۆتی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ رۆژ ل نیڤا عەسمانی خوار دكەفت نڤێژا نیڤرۆ دكر.**

## ٥ ـ باب: الإبراد بالظهر في شدة الحر.

## بابەتێ ساركرنا نڤێژا نیڤرۆ د كەلەژانا گەرمێدا.

١٠٤٠ - (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ النَّبِيِّ (ﷺ) الظُّهْرَ، فَقَالَ: (**أَبْرِدْ أَبْرِدْ**)، أَوْ قَالَ: (**انْتَظِرْ انْتَظِرْ**)، وَقَالَ: (**شِدَّةُ الحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الحَرُّ؛ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ**)، حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ. [خ٥٣٥/ م٦١٦].

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: بانگبێژێ پێغەمبەری (ﷺ) بانگێ نیڤرۆ دا، ئینا گۆت: (هین بكە هین بكە)[1]، یان ژی گۆت: (خۆ بگرە خۆ بگرە)، و گۆت: (دژوارییا گەرمێ ژ دژوارییا گوڕییا جەهنەمێیە)، ڤێجا ئەگەر گەرم دژوار بوو، نڤێژێ د هینكاتییێدا بكەن، هەتا مە سیبەرا گركان دیتی.**

---

[1] ئانكو بانگی بێخە د هینكاتییێدا.

## ٦ ـ باب: وقت العصر.

## بابەتێ: دەمێ نڤێژا ئێڤاری.

١٠٤١ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي العَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى العَوَالِي، فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، وَبَعْضُ العَوَالِي مِنَ المدِينَةِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَمْيَالٍ، أَوْ نَحْوِهِ. [خ٥٥٠ (٥٤٨)/ م٦٢١].

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا ئێڤاری کر و رۆژ یا بلند و سافی بوو، و ئێك دا چیتە سەرێ مەدینەیێ[1] و دا زڤریتەڤە و رۆژ هێژ یا بلند، و هندەك ژ سەرێ مەدینەیێ چوار میلان یا دویر بوو یان نێزیکتر ژ ڤێ.**

١٠٤٢ - (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ رضي الله عنه قالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) العَصْرَ، فَنَنْحَرُ جَزُوراً، فَتُقْسَمُ عَشْرَ قِسَمٍ، فَنَأْكُلُ لَحْماً نَضيجاً قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ. [خ٢٤٨٥/ م٦٢٥].

**ژ رافعێ کوڕێ خەدیجی (رضي الله عنه) گۆت: مە نڤێژا ئێڤاری د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دکر و پاشی مە حێشتر ڤەدکوشت و مە دکرە دەھ پشك و مە گۆشتێ گەهشتی (چ بژارتن چ کەلاندن) دخوار بەری رۆژ ئاڤا ببیت.**

## ٧ ـ باب: إثم من فاتته العصر.

## بابەتێ: گونها وی یێ نڤێژا ئێڤاری ژێ بچیت.

١٠٤٣ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**الَّذِي تَفُوتُهُ صَلاَةُ العَصْرِ، كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ**). [خ٥٥٢/ م٦٢٦].

**ژ ئیبن عومەری (رضي الله عنهما) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەوێ نڤێژا ئێڤاری ژێ بچیت هەروەکی وی خەلکێ خۆ و مالێ خۆ ژ دەست دایی)[2].**

---

(١) عەوالی: ئەو گوندێت سەرێ مەدینەیێ ژ لایێ نەجدێڤە، و ئەو گوند چوار میلان یان نێزیکی چوار میلان ژ مەدینەیێ د دویر بوون و ب پیڤەرێ ڤێ گاڤێ دبنە (٦،٤٣٧)کم.

(٢) یان ژێ هاتبیتە ستاندن و ئەو ب تنێ مابیت.

١٠٤٤ - (خ) عَنْ أَبِي المَلِيحِ قَالَ: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ فِي غَزْوَةٍ، فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، فَقَالَ: بَكِّرُوا بِصَلاَةِ العَصْرِ، فَإِنَّ النَّبِي (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ العَصْرِ، فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ**). [خ٥٥٣].

**ژ ئەبی مەلیحەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د غەزومیەكێدا و د رۆژەكا ب عەوردا د گەل بورەیدە بووین، ئینا گۆت: لەزێ ل نڤێژا ئێڤاری بكەن، ب راستی پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: هەر كەسێ نڤێژا ئێڤاری بهێلیت ب راستی كارێ وی پویچ بوو.**

## ٨ ـ باب: وقت المغرب.

## بابەتێ: دەمێ نڤێژا مەغرەب.

١٠٤٥ - (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي المَغْرِبَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا، وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ. [خ٥٥٩/ م٦٣٧].

**ژ رافعێ كورێ خەدیجی (رضي الله عنه) گۆت: مە نڤێژا مەغرەب د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كر و ئێك ژ مە د ڤەگەریاڤە و وی شوینا تیرا خۆ ددیت[1].**

١٠٤٦ - (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) المَغْرِبَ، إِذَا تَوَارَتْ بِالحِجَابِ. [خ٥٦١/ م٦٣٦].

**ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعی (رضي الله عنه) گۆت: مە نڤێژا مەغرەب د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دكر دەمێ رۆژ ئاڤا دبوو.**

## ٩ ـ باب: وقت العشاء.

## بابەتێ: دەمێ نڤێژا عەیشا.

١٠٤٧ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ نَحْواً مِنْ صَلاَتِكُمْ، وَكَانَ يُؤَخِّرُ العَتَمَةَ بَعْدَ صَلاَتِكُمْ شَيْئاً، وَكَانَ يُخِفُّ الصَّلاَةَ. [م٦٤٣].

**ژ جابرێ كورێ سەمورەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژێت خۆ وەكی نڤێژێت هەوە دكر و نڤێژا عەیشا پیچەكێ دویف یا هەوە دكر وی نڤێژ سڤك دكر[1].**

---

[1] ئانكو نەگەر ستێركا خۆ ل جهەكی گرتبا نەو جهـ ددیت.

١٠٤٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لأَمَرْتُهُمْ بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ، والسواك عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ**). [د٤٦/ ن٥٣٠/ جه٦٩٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر من ژ بەر زەحمەتێ نەبا ل سەر ئوممەتا خۆ، دا فەرمانا وان ب گیرۆكرنا نڤێژا عەیشا و ب سیواكی د گەل هەمی نڤێژان كەم).**

١٠ ـ باب: تدرك الصلاة بركعة.

**بابەتێ: ب ركعەتەكێ بگەهییە نڤێژا ب جەماعەت.**

١٠٤٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ؛ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ**). [خ٥٨٠/ م٦٠٧].

- وفي رواية لمسلم: (**مع الإمام**).
- وفي رواية له: (**فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ كُلَّها**).

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بگەهیتە ركعەتەكێ ژ نڤێژێ ب راستی ئەو گەهشتە نڤێژێ).**

- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: (د گەل پێشنڤێژی).**
- **و د ڤەگێرەكا دیدا یا وی: (ب راستی ئەو گەهشتە نڤێژێ هەمییێ).**

١٠٥٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً، قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ. وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ العَصْرِ، قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَ العَصْرَ**). [خ٥٧٩ (٥٥٦)/ م٦٠٨].

(١) ئانكو: سۆرەتێت درێژ ل سەر نەدخواندن.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ بگەهیت رکعەتەکێ ژ نڤێژا سپێدێ بکەت بەری رۆژ دەرکەڤیت ب راستی ئەو گەهشتە نڤێژا سپێدێ، هەر کەسێ بگەهیت رکعەتەکێ ژ نڤێژا ئێڤاری بکەت بەری رۆژ ئاڤا ببیت ب راستی ئەو گەهشتە نڤێژا ئێڤاری).**

١٠٥١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا، فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُهُ).** [ن٥٥٦/ جه١١٢٣].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ بگەهیتە رکعەتەکێ ژ نڤێژا خوتبێ یان هەر نڤێژەکا دی ب راستی نڤێژا وی تەکووز و تمام بوو).**

١٠٥٢ – عَنْ مَالِك، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلاَةِ الجُمُعَةِ رَكْعَةً؛ فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَهِيَ السُّنَّةُ. [ط٢٣٨].

**ژ مالکی (ﷺ) ژ ئیبن شهابی وی دگۆت: هەر کەسێ بگەهیتە رکعەتەکێ ژ نڤێژا خوتبێ بلا رکعەتەکا دی ژی د گەل بکەت، ئیبن شهابی گۆت: و ئەڤە سوننەتە (ئانکو ئەڤە شەریعەتە).**

## ١١ ـ باب: الأوقات المنهي عن الصلاة فيها.

## بابەتێ: ئەو دەمێت پاشڤەلێدان ژ نڤێژکرنێ تێدا هاتییە کرن.

١٠٥٣ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(لاَ صَلاَةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ العَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ).** [خ٥٨٦/ م٨٢٧].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) دگۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (پشتی نڤێژا سپێدێ نڤێژ نینە هەتا رۆژ بلند دبیت و پشتی نڤێژا ئێڤاری نڤێژ نینە هەتا رۆژ ئاڤا دبیت).**

١٠٥٤ - (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ قَالَ: ثَلاَثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ، أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ. [م٨٣١].

**ژ عوقبەیێ کورێ عامرێ جوهەنی (رضي الله عنه) دگۆت: سێ دەمان پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا مە یا کری ئەم نڤێژان تێدا بکەین، یان مرییێت خۆ تێدا ڤەشێرین: دەمێ رۆژ دهەلێت هەتا بلند ببیت و دەمێ رۆژ ل نیڤا عەسمانی رادوەستیت هەتا خوار نەکەڤیت، و دەمێ رۆژ خوار دبیت بۆ ئاڤابوونێ هەتا ئاڤا دبیت.**

### ١٢ ـ باب: ركعتان كان (ﷺ) يصليهما بعد العصر.

## بابەتێ: پێغەمبەری (ﷺ) دو رکعەت پشتی ئێڤاری دکرن.

١٠٥٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رَكْعَتَانِ، لَمْ يَكُنْ رَسُولُ الله (ﷺ) يَدَعُهُمَا سِرّاً وَلاَ عَلاَنِيَةً: رَكْعَتَانِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَرَكْعَتَانِ بَعْدَ العَصْرِ. [خ٥٩٢ (٥٩٠)/ م٨٣٥].

- وفي رواية لمسلم: عن أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ العَصْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ العَصْرِ، ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا أَوْ نَسِيَهُمَا، فَصَلاَّهُمَا بَعْدَ العَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَثْبَتَهَا.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: دو رکعەت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نە ب نهێنی و نە ب ئاشکرایی نەدهێلان دو رکعەت بەری نڤێژا سپێدێ و دو رکعەت پشتی نڤێژا ئێڤاری.**

- د ڤەگێرا موسلمیدا: ژ سەلەمەی وی پرسیار ژ عائیشایێ كر ژ وان دو ركعەتێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پشتی نڤێژا ئێڤاری دكرن؟ گۆت: وی بەری نڤێژا ئێڤاری دكرن، پاشی ژ وان دووا مژیل بوو یان ژبیر كرن ڤێجا ژ بەر هندێ پشتی ئێڤاری كرن پاشی جهگیر كرن و ئەوی ئەگەر نڤێژەك كربا جهگیر دكر[1].

## ١٣ . باب: قضاء الصلاة الفائتة.

## بابەتێ: ڤەزاكرنا نڤێژا چۆیی.

١٠٥٦ – (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِي (ﷺ) قَالَ: (مَنْ نَسِيَ صَلاَةً؛ فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ [طه:١٤]). [خ٥٩٧/ م٦٨٤].

- وفي رواية لمسلم: (.. أَو نامَ عنها..).

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ نڤێژەك ژ بیر كر بلا بكەت هەر دەمێ بیرا وی هاتێ و ژێبرنا گونەها (كەفارەتا) وێ بەس ئەوە ﴿وَأَقِمْ الصَّلَاةَ لِذِكرِي﴾[2].

- و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: (یان ژ نڤێژێ نڤست).

---

(١) ئیبن حەجەر (?) دبێژیت: ئەو ژ تایبەتمەندییێت پێغەمبەرینە (?)، و بۆ مە نەدورستە ئەم سونەتان پشتی نڤێژا ئێڤاری بكەین ژ بلی ئەگەر راتبەك یا پشتی نڤێژا نیڤرۆ ژ مە چۆبیت ژبیركرنێ یان ژی ئەگەرەك هەبیت بخوازیتە كرنا سونەتێ وەكی دەستنڤێژ نویكرنێ یان چۆنا د مزگەفتێڤە.

(٢) رامان: ڤێجا من ب تنێ بپەرێسە و نڤێژێ بكە، دا ئەز ل بیرا تە بم (یان ژی ل وەختێ بیرئینانا من (كو نڤێژە) نڤێژێ بكە.

١٠٥٧ - عَنْ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَنَامَ عَنِ الصُّبْحِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَاسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**تَنَحَّوْا عَنْ هَذَا الْمَكَانِ**)، قَالَ: ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ، ثُمَّ تَوَضَّؤُوا، وَصَلَّوْا رَكْعَتَيْ الفَجْرِ، ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، فَصَلَّى بِهِمْ صَلاَةَ الصُّبْحِ. [د٤٤٤].

* صحيح.

**ژ عەمرێ كورێ ئومەییێ زومەری، گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بووین د هندە گەشتێت ویدا، ل نڤێژا سپێدێ نڤست هەتا رۆژ دەركەفتی، ڤێجا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هشیار بوو، گۆت: (خۆ ژ ڤی جهی بدەنە پاش)، گۆت: پاشی فەرمانا بیلالی كر بانگ دا، پاشی دەستنڤێژێت خۆ گرتن، و دو ركعەتێت سونەتا سپێدێ كرن، پاشی فەرمانا بیلالی كر قامەت بۆ نڤێژێ گرت، و نڤێژا سپێدێ ل بەراهییا وان كر.**

١٤ . باب: فضل الصلاة لوقتها.

**بابەتێ: خێرا كرنا نڤێژێ د دەمێ وێدا.**

١٠٥٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ): أَيُّ العَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: (**الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا**)، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (**ثُمَّ بِرُّ الوَالِدَيْنِ**)، قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (**الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ**)، قَالَ: حدَّثَنِي بِهِنَّ، وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي. [خ٥٢٧/ م٨٥].

**و ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا پێغەمبەری (ﷺ) كر كیژ كار ل دەڤ خودێ خۆشڤیترە؟ گۆت: (نڤێژ د دەمێ وێدا)، من گۆت: پاشی كیژ؟ گۆت: (پاشی باشییا د گەل دایبابان)، من گۆت: پاشی كیژ؟ گۆت: (جیهادا د رێكا خودێدا). گۆت: ئەڤان پرسیارا ئەڤە بۆ من گۆتن، و ئەگەر من پرسیارا زێدە ژێ كربا دا بۆ من زێدە بێژیت.**

١٠٥٩ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا، أَوْ يُمِيتُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا)؟ قالَ: قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: (صَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدركْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ، فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ). [م٦٤٨].

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (دێ بێ چاوا بی دەمێ هندەك فەرماندار ل سەر سەرێ تە بن و نڤێژێ ژ دەمێ وێ یێ باشتر گیرۆ بکەن یان گیرۆ بکەن هەتا دمرینن)، گۆت: من گۆت: هینگێ تو چ فەرمان ل من دکەی؟ گۆت: (نڤێژێ د دەمێ وێدا بکە و ئەگەر تو گەهشتییە وان ژی نڤێژێ د گەل وان بکە ئەو بۆ تە سونەتە).**

١٠٦٠ - عَنْ أُمِّ فَرْوَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (الصَّلاَةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا). [د٤٢٦/ ت١٧٠].

* صحيح.

**ژ ئوم فەروەیێ (رضي الله عنها) گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە کرن کیژ کار ب خێرترە؟ گۆت: (نڤێژ د دەستپێکا دەمێ وێدا).**

١٥ ـ باب: السمر بعد العشاء.

**بابەتێ: سوحبەتا پشتی نڤێژا عەیشا.**

١٠٦١ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَسْمُرُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ فِي الأَمْرِ مِنْ أَمْرِ المسْلِمِينَ، وَأَنَا مَعَهُمَا. [ت١٦٩].

* صحيح.

**ژ عومەرێ کوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل ئەبوبەکری د راستا کارەکی ژ کارێت موسلمانان‌دا ب شەڤ دئاخفتن و ئەز د گەل وان بووم.**

## ١ ـ باب: أول المساجد في الارض.

## بابەتێ: مزگەفتا ئێكێ د عەردیدا.

١٠٦٥ - (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: (**المَسْجِدُ الحَرَامُ**)، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (**المَسْجِدُ الأَقْصَى**)، قُلْتُ: كَمْ كَانَ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: (**أَرْبَعُونَ سَنَةً، ثُمَّ أَيْنَمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلاَةُ بَعْدُ فَصَلِّهْ، فَإِنَّ الفَضْلَ فِيهِ**). [خ٣٣٦٦/ م٥٢٠].

ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: من گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ كیژ مزگەفت جارا ئێكێ د عەردیدا دانایە، گۆت: **(مزگەفتا حەرام (كەعبە))** گۆت: من گۆت: پاشی كیژك؟ گۆت: **(مزگەفتا ئەقسا (قودسێ))** من گۆت: چەند د نافبەرا واندایە؟ گۆت: **(چل سال، پاشی ل هەر جهێ نڤێژ ل تە بوو ل ویرێ نڤێژێ بكە خێر یا د وێرێدا)**.

## ٢ ـ باب: الأرض مسجد وطهور.

## بابەتێ: عەرد مزگەفت و پێ پاككەرە.

١٠٦٦ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**أُعْطِيتُ خَمْساً لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ، فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِيَ المَغَانِمُ، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى** قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً). [خ٣٣٥/ م٥٢١].

ژ جابرێ كوڕێ عەبدولایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(پێنج تشت پێت ب من هاتینە دان بۆ كەسێ بەری من ئەو نەهاتینە دان: رێكا هەیڤەكێ ب ترسێ ئەز پێ ب سەر ئێخستیم، و عەرد پێ بۆ من كریە مزگەفت و پاككەر[1] هەر كەسەك ژ ئوممەتا من**

(١) ئانكو: ئەگەر ئاڤ نەبیت ئاخ و تەیەمموم جهێ ئاڤێ دگریت، و دیسا ئەگەر پێلاڤا ئێكی بنێ وێ پێ پیس بیت د ئاخێرا بخشینیت دێ پاقژ بیت.

**نڤێژ لێ بوو بلا نڤێژێ بكەت، و دەستكەفتی بۆ من ییێت دورست بووین و بۆ كەسێ بەری من دورست نەببوون، و مەهدەر (شەفاعەت و بەرەڤانی) یا ب من هاتییە دان، و پێغەمبەر تایبەت بۆ گەلێ خۆ دهاتە هنارتن و ئەز بۆ هەمی مرۆڤان یێ هاتیمە هنارتن).**

١٠٦٧ – (م) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلاَثٍ: جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ المَلاَئِكَةِ، وَجُعِلَتْ لَنَا الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِداً، وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُوراً، إِذَا لَمْ نَجِدِ المَاءَ**). وَذَكَرَ خَصْلَةً أُخْرَى. [م٥٢٢].

**ژ حوزەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب سێ تشتان قەدرێ مە یێ ب سەر یێ خەلكیدا ئێخستی، ریزێت مە وەكی ریزێت ملیاكەتان یێت لێ كرین[1] و عەرد هەمی بۆ مە یێ كرییە مزگەفت و ئاخا وێ بۆ مە پاككەرە[2] ئەگەر ئاڤ نەدیت) و خسلەتەكا دی ژی بەحس كر.**

**٣ ـ باب: بناء المسجد النبوي الشريف.**

**بابەتێ: ئاڤكرنا مزگەفتا پێغەمبەری یا پیرۆز.**

١٠٦٨ – (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) المَدِينَةَ، فَنَزَلَ أَعْلَى المَدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى بَنِي النَّجَّارِ، فَجَاؤوا مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، وَمَلأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ، حَتَّى أَلقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلاَةُ، وَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَأَنَّهُ أَمَرَ بِبِنَاءِ المَسْجِدِ، فَأَرْسَلَ إِلَى مَلأٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ، فَقَالَ: (**يَا بَنِي النَّجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا**)، قَالُوا: لاَ وَالله

---

(١) مەبەست یێ راوەستانا مە د نڤێژێدا د ئێك ریزدا ل پشت ئیمامی.

(٢) ئانكو: ئەگەر ئاڤ نەبیت ئاخ و تەیەمموم جهێ ئاڤێ دگریت، و دیسا ئەگەر پێلاڤا ئێكی بنێ وێ یێ پیس بیت د ئاخێرا بخشینیت دێ پاقژ بیت.

لاَ نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللهِ. فَقَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ لَكُمْ: قُبُورُ المُشْرِكِينَ، وَفِيهِ خَرِبٌ، وَفِيهِ نَخْلٌ. فَأَمَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِقُبُورِ المُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، ثُمَّ بِالخَرِبِ فَسُوِّيَتْ، وَبِالنَّخْلِ فَقُطِعَ، فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ المَسْجِدِ، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ الحِجَارَةَ، وَجَعَلُوا يَنْقُلُونَ الصَّخْرَ وَهُمْ يَرْتَجِزُونَ، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) مَعَهُمْ، وَهُوَ يَقُولُ:

اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالمُهَاجِرَهْ.

[خ٤٢٨ (٢٣٤)/ م٥٢٤].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینەیێ و ل سەرێ مەدینەیێ ل تاخەکی دگۆتنێ تاخێ عەمرێ کوڕێ عەوفی هاتە خوارێ، و چواردە شەڤان ل وێرێ ما، پاشی هنارتە دویڤ بابکێ بەنی نەججار و ئەو هاتن و شیرێت وان ل سەر ملێت وان، و هەر وەکی ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمە پێغەمبەری (ﷺ) یێ ل سەر حێشترا خۆ و ئەبوبەکر یێ ل پشت وی، و بەنی نەججار دۆرماندۆرێت وی یێت پڕکرن، و هات هەتا گەهشتییە مالا ئەبی ئەیووبی و حەز دکر هەر جهێ نڤێژ لێ ببا نڤێژ کربا، و نڤێژ ل مەخەلا پەزی دکر، و فەرمان ب ئاڤاکرنا مزگەفتێ دا، و فرەێکرە دویڤ کۆمەکا بەنی نەججارڕا و گۆت: (ئەی بەنی نەججار بهایێ ڤی عەردێ خۆ بێژن و بفرۆشنە من)، گۆتن: نە ب خودێ مە بهایێ وێ ژ خودێ پێڤەتر نەڤێت، ئینا ئەنەسی گۆت: ئەو تێدا بوو یا ئەز بۆ هەوە دبێژم: گۆڕێت هەڤپشکچێکەران و کاڤلەك و هندەك دارقەسپ، ئینا فەرمان د راستا گۆڕێت هەڤپشکچێکەران دا ئینانە دەرێ، پاشی فەرمان ب کاڤلی دا هاتە دەشتکرن، پاشی ب دارقەسپان هاتنە برین، و ل قیبلا مزگەفتێ هاتنە ریزکرن، و هەردو دنگێت دەرگەهی کرنە بەر، و دەستهاڤێتنێ بەر ڤەدگوهاستن و ئەڤ مالکە ب سەلیقە دگۆت:**

**یا خودێ چو خۆشی نینن خۆشییا ئاخرەتێ نەبیت، ڤێجا ل گونەهێت پشتەڤان و مشەختان خۆش ببە.**

١٠٦٩ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى فُلاَنَةَ ـ امْرَأَةٍ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ ـ: (**أَنْ مُرِي غُلاَمَكِ النَّجَّارَ، يَعْمَلُ لِي أَعْوَاداً، أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذَا كَلَّمْتُ النَّاسَ**)، فَأَمَرَتْهُ يَعْمَلُهَا مِنْ طَرْفَاءِ الغَابَةِ، ثُمَّ جَاءَ بِهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بِهَا، فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ، فَجَلَسَ عَلَيْهِ.

[خ٢٠٩٤ (٣٧٧)/ م٥٤٤].

**ژ سەهلێ كورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هنارتە دویڤ بێڤانێڕا ژنەك بوو سەهلی ناڤێ وێ ئینا: (فەرمانا خزمەتكارێ خۆ بكە بلا هندەك داران بۆ من دورست بكەت ل سەر روینمە خوارێ دەمێ ئەز د گەل خەلكی ئاخفتم)، ئینا فەرمانا وی كر، ئەو ژ دارا تەرفائا دارستانێ چێكەت، پاشی خزمەتكاری ئینا و وێ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هنارت، ئینا فەرمان پێ دا هاتە دانان، و ئەو ل سەر روینشتە خوارێ.**

١٠٧٠ - (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ: أَنَّ المَسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَبْنِيّاً بِاللَّبِنِ، وَسَقْفُهُ الجَرِيدُ، وَعُمُدُهُ خَشَبُ النَّخْلِ، فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئاً، وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ، وَبَنَاهُ عَلَى بُنْيَانِهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، بِاللَّبِنِ وَالجَرِيدِ، وَأَعَادَ عُمُدَهُ خَشَباً، ثُمَّ غَيَّرَهُ عُثْمَانُ، فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً، وَبَنَى جِدَارَهُ بِالحِجَارَةِ المَنْقُوشَةِ وَالقَصَّةِ، وَجَعَلَ عُمُدَهُ مِنْ حِجَارَةٍ مَنْقُوشَةٍ، وَسَقَفَهُ بِالسَّاجِ.

[خ٤٤٦].

**ژ نافعی (رضي الله عنه) عەبدوللایێ كورێ عومەری گۆتە وی: مزگەفت ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب لبنێت ئاخێ ئاڤا كربوو و بانێ وێ ب بەلگێت دارقەسپان و ستوینێت وێ دارقەسپ بوون، و ئەبوبەكری چو لێ زێدە نەكر، و عومەری ل سەر زێدە كر و ل سەر بنیاتێ وێ یێ ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب لبنێت ئاخێ و بەلگێت دارقەسپان ئاڤا كر و ستوینێت دار زڤراندن، پاشی عوسمانی گوهارت و ل سەر**

**زێدە كر زێدەكرنەكا باش، و دیوارێت وێ ب بەرێت نەخشكری و گێچێ ئاڤاكرن و ستوینێت وێ كرنە بەرێت نەخشكری و بانێ وێ كرە دارێ ساجی[١].**

٤ . باب: المسجد الذي أسس على التقوى.

**بابەتێ: ئەو مزگەفتا ل سەر پارێزكارییێ هاتییە ئاڤاكرن.**

١٠٧١ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ الله (ﷺ) فِي بَيْتِ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، أَيُّ المَسْجِدَيْنِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: فَأَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصْبَاءَ فَضَرَبَ بِهِ الأَرْضَ، ثُمَّ قَالَ: (**هُوَ مَسْجِدُكُمْ هَذَا**) لِمَسْجِدِ المدينَةِ. [م١٣٩٨].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز چۆمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مالا ئێك ژ هەڤژینێت وی، ئینا من گۆتێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ كیژ مزگەفت ل سەر پارێزكارییێ هاتییە ئاڤاكرن؟ ئینا مستەكا حەسحاسی هەلگرت و هاڤێتە عەردی و پاشی د راستا مزگەفتا مەدینەیێدا گۆت: (ئەو مزگەفتا هەومیە ئەڤە).**

٥ . باب: فضل ما بين الحجرة والمنبر.

**بابەتێ: قەدرێ د ناڤبەرا مال و مینبەرێدا.**

١٠٧٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي**). [خ١١٩٦/ م١٣٩١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (د ناڤبەرا مالا من و مینبەرا مندا مێرگەك ژ مێرگێت بەحەشتێ یا هەی، و مینبەرا من یا ل سەر بركا من)[٢].**

---

(١) جوینەكا دارانە ژ هندستانێ دئینن.

(٢) مەبەسەت ئاڤا كەوسەرێیە.

١٠٧٣ – عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: **(مِنْبَرِي عَلَى تُرْعَةٍ مِنْ تُرَعِ الجَنَّةِ)** فَقُلْتُ لَهُ: مَا التُّرْعَةُ يَا أَبَا العَبَّاسِ؟ قَالَ: البَابُ. [حم٢٢٨٤١، ٢٢٨٧٤].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەبی حازمی ژ سەهلێ كوڕێ سەعدی (خودێ ژ وان رازی بیت) وی ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بوو دگۆت: (مینبەرا من یا ل سەر تورعەكێ ژ تورعەیێت بەحەشتێ)، ئینا من گۆت: و تورعە چییە ئەی بابێ عەباسی؟ گۆت: دەرگەهە.**

**٦ . باب: مسجد قباء.**

**بابەتێ: مزگەفتا قوبایێ.**

١٠٧٤ – **(ق)** عَن ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ كُلَّ سَبْتٍ، ماشِياً وَرَاكِباً. [خ١١٩٣ (١١٩١)/ م١٣٩٩].

- وفي رواية عندهما: فيصلي فيه ركعتين. [خ١١٩٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەمی شەمبییان پەیا و سوار دهاتە مزگەفتا قوبایێ.**

- **و د ڤەگێڕەكا دیدا یا هەردووان: دو ركعەت تێڤە دكرن.**

١٠٧٥ – عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(مَنْ خَرَجَ حَتَّى يَأْتِيَ هَذَا المَسْجِدَ . مَسْجِدَ قُبَاءَ . فَصَلَّى فِيهِ، كَانَ لَهُ عَدْلَ عُمْرَةٍ)**. [ن٦٩٨].

- وفي رواية: **(مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءَ، فَصَلَّى فِيهِ صَلاَةً، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ)**. [جه١٤١٢]

* صحيح.

ژ سەهلێ کورێ حەنیفی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ دەرکەڤیت هەتا دگەهیتە ڤێ مزگەفتێ مزگەفتا قوبایێ و نڤێژێ تێڤە بکەت ئەو بەرامبەر عومرەکێیە).**

- و د ڤەگێرەکێدا: **(هەر کەسێ ل مالا خۆ خۆ پاقژ بکەت و دەستنڤێژا خۆ بشۆت و پاشی بهێتە مزگەفتا قوبایێ و نڤێژەکێ تێڤە بکەت هندی خێرا عومرەکێ بۆ وییە).**

٧ ـ باب: فضل بناء المساجد.

**بابەتێ: خێرا ئاڤاکرنا مزگەفتان.**

١٠٧٦ – (ق) عَنْ عُبَيْدِ اللهِ الخَوْلاَنِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ يَقُولُ ـ عِنْدَ قَوْلِ النَّاسِ فِيهِ حِينَ بَنَى مَسْجِدَ الرَّسُولِ (ﷺ) ـ: إِنَّكُمْ أَكْثَرْتُمْ، وَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَنْ بَنَى مَسْجِداً** ـ قَالَ بُكَيْرٌ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: ـ **يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللهِ، بَنَى اللهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الجَنَّةِ).** [خ٤٥٠/ م٥٣٣]

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ عُثْمَانَ قَالَ ذَلِكَ عندما كَرِهَ النَّاسُ بِنَاءَ المسْجِدِ، وَأَحَبُّوا أَنْ يَدَعَهُ عَلَى هَيْئَتِهِ.

ژ عوبەیدوللایێ خولانی (ﷺ) وی گوه ل عوسمانێ کورێ عەفانی بوو دگۆت: دەمێ ئاخفتنا خەلکی ل سەر وی دەمێ مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) ئاڤاکری: هەوە زێدە کر، و ب راستی من یا گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بووی دگۆت: **(هەر کەسێ مزگەفتەکێ ئاڤا بکەت،** بوکەیری گۆت: ئەز هزر دکەم گۆت: **رازیبوونا خودێ پێ بخوازیت و بڤێت، خودێ دێ وەکی وێ ل بەحەشتێ بۆ ئاڤاکەت).**

■ **و د ڤەگێرا موسلمیدا: عوسمانی ئەڤە گۆت دەمێ خەلكی نەڤیایی مزگەفت بهێتە ئاڤاكرن و ڤیاین وەكی خۆ بهێلن.**

١٠٧٧ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (مَنْ بَنَى مَسْجِداً لِلَّهِ، كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ، أَوْ أَصْغَرَ، بَنَى الله لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ). [جه٧٣٨]

* صحيح.

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ مزگەفتەكێ هندی هێلینا تەیرەكێ بیت یا بچویكتر بۆ خودێ ئاڤاكەت خودێ دێ مالەكێ بۆ ل بەحەشتێ ئاڤاكەت).**

٨ ـ باب: المساجد أحب البلاد إلى الله.

**بابەتێ: مزگەفت خۆشڤیترین جهن ل دەڤ خودێ.**

١٠٧٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (أَحَبُّ البِلاَدِ إِلَى الله مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ البِلاَدِ إِلَى الله أَسْوَاقُهَا). [م٦٧١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خۆشڤیترین جه ل دەڤ خودێ مزگەفتن، و نەخۆشترین جه ل دەڤ خودێ سویكن)**[1].

---

(١) مەرەم پێ ئەو نینە بهایێ سویكێ بهێتە كێمكرن، بەلێ چونكی سویك جهێ بێئاگەهیێیە ژ زكرێ خودێ ئەڤە ئاگەهداركرنە ژ بێئاگەهیێ.

**٩ ـ باب: لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد.**

**بابەتێ: وەغەركرن بۆ سێ مزگەفتان ب تنێ دهێتە كرن.**

١٠٧٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ (ﷺ)، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى**). [خ١١٨٩/ م١٣٩٧]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(وەغەركرن ناهێتەكرن بۆ سێ مزگەفتان نەبیت: مزگەفتا ئەلحەرام (مزگەفتا كەعبەیێ) و مزگەفتا پێغەمبەری ( ) و مزگەفتا ئەقسا (قودسێ)).**

١٠٨٠ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هذَا، أَفْضَلُ مِنَ أَلفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ؛ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ**). [م١٣٩٥]

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(نڤێژەك د ڤێ مزگەفتا مندا ب خێرترە ژ هزار نڤێژان د ئێكا دیدا مزگەفتا ئەلحەرام (كەعبەیێ) نەبیت).**

١٠٨١ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِنَ أَلفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ؛ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ**). [جه١٤٠٦]

* صحيح.

ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(نڤێژەك د ڤێ مزگەفتا مندا بخێرترە ژ هزار نڤێژان د ئێكا دیدا مزگەفتا ئەلحەرام (كەعبەیێ) نەبیت، و نڤێژەك د مزگەفتا ئەلحەرامدا ب خێرترە ژ سەد هزار نڤێژان د ئێكا دیدا).**

## ١٠ ـ باب: النهي عن بناء المساجد على القبور.

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ ئاڤاكرنا مزگەفتان ل سەر گۆڕان.

١٠٨٢ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ: ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالحَبَشَةِ، فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: (إِنَّ أُولئِكَ، إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ، بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِداً، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، فَأُولئِكَ شِرَارُ الخَلْقِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ). [خ٤٢٧/ م٥٢٨]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئوم حەبیبەیێ و ئوم سەلەمەیێ بەحسێ دێرەكێ ل حەبەشە كرن دیتبوون، وێنە تێدا بوون. و ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتن: ئینا گۆت: (ب راستی وان ئەگەر مرۆڤەكێ چاك د ناڤ واندابا و مربا ل سەر گۆڕێ وی مزگەفتەك ئاڤا دكر، و ئەو رەنگە وێنە تێڤە چێ دكرن، ئەو رۆژا قیامەتێ خرابترین چێكرییێت خودێنە).**

١٠٨٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (قَاتَلَ اللهُ اليَهُودَ، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ). [خ٤٣٧/ م٥٣٠]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ جوهیان بكوژیت گۆڕێت پێغەمبەرێت خۆ كرنە مزگەفت).**

## ١١ ـ باب: المساجد في البيوت.

## بابەتێ: مزگەفت د مالانڤە.

١٠٨٤ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ ـ وَكَانَ ضَخْماً ـ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ الصَّلاَةَ مَعَكَ، فَصَنَعَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) طَعَاماً، فَدَعَاهُ إِلَى بَيْتِهِ، وَنَضَحَ لَهُ طَرَفَ حَصِيرٍ بِمَاءٍ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَكْعَتَيْنِ. [خ١١٧٩ (٦٧٠)]

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکێ ئەنساری گۆت: زەلامەکێ ژ خەلکێ مەدینەیێ ژ ئەنساران یێ ب کەلخ بوو گۆتە پێغەمبەری (ﷺ): ب راستی ئەز نەشێم نڤێژێ د گەل تە بکەم، ئینا خوارنەك بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دورست کر و داخوازکرە مالا خۆ، و لایێ حێسیلەکێ ب ئاڤێ رەشاند، ئینا دو رکعەت نڤێژ ل سەر کرن.**

١٠٨٥ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ الله (ﷺ) بِبِنَاءِ المَسَاجِدِ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ. [د٤٥٥/ ت٥٩٤/ جه٧٥٨، ٧٥٩].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان ب ئاڤاکرنا مزگەفتان ل ناڤمالان کر و بهێنە پاقژکرن و بێهنخۆشکرن.**

١٠٨٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ أَرْسَلَ إِلَى رَسُولِ الله (ﷺ): أَنْ تَعَالَ فَخُطَّ لِي مَسْجِداً فِي دَارِي أُصَلِّي فِيهِ، وَذَلِكَ بَعْدَ مَا عَمِيَ، فَجَاءَ فَفَعَلَ. [جه٧٥٥].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەرە (رضي الله عنه) زەلامەکێ خەلکێ مەدینەیێ هنارتە دویڤ پێغەمبەرێ خودێرا (ﷺ) وەرە مالا من مزگەفتەکێ بۆ من دیار بکە ئەز نڤێژا لێ بکەم، ئەڤە پشتی ئەو کۆرە بووی، ئینا ئەو (پێغەمبەر (ﷺ)) هات و ئەو کر.**

## ١٢ ـ باب: تحية المسجد.

## بابەتێ: سلاڤا مزگەفتێ.

١٠٨٧ - (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ السَّلَمِيِّ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ؛ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ**). [خ٤٤٤/ م٧١٤].

[وانظر: ١٢٣٩، ١٤٧٧].

**ژ ئەبی قەتادەیێ سەلەمی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە هاتە د مزگەفتێڤە بلا بەری روینیت خوارێ دو ركعەتان سونەت بكەت).**

## ١٣ . باب: فضل الجلوس في المسجد.

## بابەتێ: خێرا روینشتنا ل مزگەفتێ.

١٠٨٨ - (م) عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَكُنْتَ تُجَالِسُ رَسُولَ الله (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ كَثِيراً، كَانَ لاَ يَقُومُ مِنْ مُصَلاَّهُ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ الصُّبْحَ أَوِ الغَدَاةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ قَامَ، وَكَانُوا يَتَحَدَّثُونَ، فَيَأْخُذُونَ فِي أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ، فَيَضْحَكُونَ، وَيَتَبَسَّمُ. [م٦٧٠]

**ژ سیماكێ كورێ حەربی (ﷺ) گۆت: من گۆتە جابرێ كورێ سەمورەیی: ئەرێ تو ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دروینشتییە خوارێ؟ گۆت: بەلێ و گەلەك، ژ جهێ خۆ یێ نڤێژا سپێدێ تێدا كری نەرادبوو هەتا رۆژ هەلاتبا. ڤێجا ئەگەر رۆژ هەلاتبا رادبوو، و وان سوحبەت دكرن و بەحسێ نەزانینێ دكرن، ڤێجا وان دكرنە كەنی و ئەو دگرنژی.**

١٠٨٩ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**مَنْ صَلَّى الغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ الله حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ**)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ**). [ت٥٨٦]

* حسن.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ نڤێژا سپێدێ ب جەماعەت بكەت، و پاشی روینیتە خوارێ زكرێ خودێ بكەت هەتا رۆژ دهەلێت، پاشی دو ركعەتان سونەت بكەت، ئەڤە بۆ وی وەكی خێرا حەجەك و عومرەیەكێیە)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یا تمام یا تمام یا تمام).**

١٠٩٠ – عَنْ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ كَانَ فِي المَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ، فَهُوَ فِي الصَّلاَةِ**). [ن٧٣٣].

* صحيح.

**ژ سەهلێ ساعدی (ڕەزایا خودێ لێ بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (هەر کەسێ ل مزگەفتێ ل هیڤیا نڤێژێ بمینیت ئەو یێ د نڤێژێدا).**

١٠٩١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) المغْرِبَ، فَرَجَعَ مَنْ رَجَعَ، وَعَقَّبَ مَنْ عَقَّبَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُسْرِعاً، قَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، وَقَدْ حَسَرَ عَنْ رُكْبَتَيْهِ، فَقَالَ: (**أَبْشِرُوا، هَذَا رَبُّكُمْ قَدْ فَتَحَ بَاباً مِنْ أَبْوَابِ السَّمَاءِ، يُبَاهِي بِكُمُ المَلاَئِكَةَ، يَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي قَدْ قَضَوْا فَرِيضَةً، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَ أُخْرَى**). [جه٨٠١]

* صحيح.

[وانظر: ٣٣٣٠ (ورجل قلبه معلق بالمسجد).

وانظر: ١١٤٢ في انتظار الصلاة].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: مە نڤێژا مەغرەب د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، ڤێجا یێ زڤرییە مال زڤری و یێ مایە ل هیڤیا نڤێژا دی ما، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب لەز هات و بێهنا وی یا تەنگ و ب لەز بوو، و هەردو چۆکێت خۆ دەرئێخستبوون، ئینا گۆت: (مزگینی بۆ هەوە بیت ئەڤە خودایێ هەوەیە دەرگەهەک ژ دەرگەهێت عەسمانی یێ ڤەکری و شانازییێ ل دەڤ ملیاکەتێت خۆ ب هەوە دبەت، و دبێژیت: بەرێ خۆ بدەنە بەندەیێت من فەرزەکا کری و چاڤەڕێی فەرزەکا دینە)[1].**

(١) وان فەرزا مەغرەب یا کری و چاڤەڕێی فەرزا عەیشانە.

## ١٤ ـ باب: طهارة المسجد.

## بابەتێ: پاقژییا مزگەفتێ.

١٠٩٢ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي المسْجِدِ، فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ): **(دَعُوهُ، وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ ـ أَوْ ذَنُوباً مِنْ مَاءٍ ـ فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ).** [خ٢٢٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: كۆچەرە عەرەبەك رابوو میزتە مزگەفتێ[1] خەلكی ئاخفتن گۆتنێ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بهێلن، و دۆلكەكێ ئاڤێ یان سەتلەكا ئاڤێ ب سەر میزا ویداكەن، ب راستی هوین ساناهیكەر پێت هاتینە هنارتن زەحمەت ئێخ نەهاتینە هنارتن).**

١٠٩٣ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي المسْجِدِ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَامَ يَبُولُ فِي المسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ الله (ﷺ): مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(لاَ تُزْرِمُوهُ، دَعُوهُ)**، فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ. ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) دَعَاهُ، فَقَالَ لَهُ: **(إِنَّ هَذِه المَسَاجِدَ لاَ تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا البَوْلِ وَلاَ القَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ الله عزّ وجل، وَالصَّلاَةِ، وَقِرَاءَةِ القُرْآنِ)**، أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ). قَالَ: فَأَمَرَ رَجُلاً مِنَ القَوْمِ، فَجَاءَ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ، فَشَنَّهُ عَلَيْهِ. [م٢٨٥].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت د دەمەكیدا ئەم ل مزگەفتێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، كۆچەرە عەرەبەك هات، رابوو ل مزگەفتێ میزت، ئینا هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆتن: نە نە، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (میزا وی نەبڕن و بهێلن)، ژ بەر هندێ هێلان هەتا میزتی، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی كرێ، گۆتێ: (ب ڕاستی ئەڤ مزگەفتە نە جهێ تشتەكێ ژ ڤێ میزێیە و نە پیساتییێ (ئانكو: بۆ**

(١) مەرەم مزگەفتا پێغەمبەرییە (ﷺ).

**هندێ نەگونجایە) بەلێ جهێ زكرێ خودایێ هەر ب هێز و مەزنە و نڤێژێ و قورئان خواندنێیە)، یان ژی هەروەكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتی، گۆت: فەرمانا زەلامەكی ژ وی خەلكی كر دۆلكەكێ ئاڤێ ئینا و پێدا كر.**

١٠٩٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْقِلِ بْنِ مُقَرِّنٍ قَالَ: صَلَّى أَعْرَابِيٌّ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، بِهَذِهِ القِصَّةِ. قصة حديث أبي هريرة عند أبي داود. وَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**خُذُوا مَا بَالَ عَلَيْهِ مِنَ التُّرَابِ، فَأَلْقُوهُ، وَأَهْرِيقُوا عَلَى مَكَانِهِ مَاءً**). [د٣٨١].

* مرسل.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەعقیلێ كورێ موقەرِنی (رضي الله عنه) گۆت: كۆچەرە عەرەبەكی ب ڤێ سەرهاتییێ نڤێژ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كر، سەرهاتییا ئەبی هورەیرە ژ ئەبی داوودی، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەو ئاخا میزتییە ل سەر راكەن و باڤێژن و ئاڤێ ل شوینا وێ بكەن).**

## ١٥ ـ باب: نظافة المسجد.

## بابەتێ: پاكی و پاقژییا مزگەفتێ.

١٠٩٥ – (ق) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى نُخَامَةً فِي القِبْلَةِ، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ، حَتَّى رُؤِيَ فِي وَجْهِهِ، فَقَامَ فَحَكَّهُ بِيَدِهِ، فَقَالَ: (**إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلاَتِهِ، فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ. أَوْ إِنَّ رَبَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ. فَلاَ يَبْزُقَنَّ أَحَدُكُمْ قِبَلَ قِبْلَتِهِ، وَلكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمَيْهِ**)، ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ، فَبَصَقَ فِيهِ، ثُمَّ رَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: (**أَوْ يَفْعَلُ هكَذَا**). [خ٤٠٥ (٢٤١)/ م٥٥١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كلمیشەك ل راستا قیبلێ دیت، ل سەر گران بوو، هەتا ئەڤە ل سەر و چاڤان دیار بووی، رابوو ب دەستێ خۆ رەنی و گۆت: (ب راستی دەمێ ئێك ژ هەوە د نڤێژا خۆدا دراوەستیت ئەو د گەل خودایێ خۆ دئاخڤیت، و ب راستی بەرێخۆدانا قیبلێ مرۆڤی دگەهینیتە خودێ، ڤێجا كەس ژ هەوە**

**تف نەكەتە رەخێ قیبلێ، بەلێ بلا باڤێژیتە رەخێ خۆ یێ چەپێ یان بن پێت خۆ)[١].**

**پاشی رەخێ عەبایێ خۆ گرت و تفكرێ، پاشی سەرێك زڤراند (دا شوینا تفێ نەمینیت) و گۆت: (یان بلا هۆ بكەتەهە).**

١٠٩٦ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**البُزَاقُ فِي المَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا**). [خ٤١٥/ م٥٥٢].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی تفكرن ل مزگەفتێ گونەهە و ژێبرنا وێ گونەهێ بنئاخكرن و ڤەشارتنا وێیە)[٢].**

١٠٩٧ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**عُرِضَتْ عَلَيَّ أَعْمَالُ أُمَّتِي حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا، فَوَجَدْتُ فِي مَحَاسِنِ أَعْمَالِهَا: الأَذَى يُمَاطُ عَنِ الطَّرِيقِ، وَوَجَدْتُ فِي مَسَاوِئِ أَعْمَالِهَا: النُّخَاعَةَ تَكُونُ فِي المَسْجِدِ لاَ تُدْفَنُ**). [م٥٥٣].

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كار و كریارێت ئوممەتا من یێت باش و خراب نیشا من هاتنەدان، من راكرنا ئەزیەتێ ژ رێكێ، د ناڤ كار و كریارێت باشدا دیت، و من تف و بەلغەم، یا نەڤەشارتی ل مزگەفتێ د ناڤ كار و كریارێت خرابدا دیت).**

١٠٩٨ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ المَسْجِدِ، فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ، فَقَامَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَحَكَّتْهَا، وَجَعَلَتْ مَكَانَهَا خَلُوقاً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا أَحْسَنَ هَذَا**). [ن٧٢٧/ جه٧٦٢].

* صحيح.

---

(١) نەوەوی دبێژیت: فەرمان ب تفكرنێ ل رەخێ چەپێ یان بن پیان ئەگەر نە ل مزگەفتێ بیت ل مزگەفتێ تف ناكەت د كراسێ خۆدا نەبیت.

(٢) ل وی دەمی نیڤا مزگەفتێ ئاخ بوو، ڤێ گاڤێ مەحفیرن دڤێت بهێنە پاقژكرن و راكرن.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كلمیشەك ل راستا قیبلا مزگەفتێ دیت، تۆڕە بوو هەتا ناڤچاڤێت وی سۆر بووین، ئینا ژنەك ژ خەلكا مەدینەیێ رابوو رەنی و بهێنخۆشی ل جهێ وێ كر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەڤە چەند باشە).**

## ١٦ ـ باب: خدمة المسجد

## بابەتێ: خزمەتكرنا مزگەفتێ

١٠٩٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ أَسْوَدَ ـ رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً ـ كَانَ يَقُمُّ المَسْجِدَ، فَمَاتَ، وَلَمْ يَعْلَمِ النَّبِيُّ (ﷺ) بِمَوْتِهِ، فَذَكَرَهُ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: (**مَا فَعَلَ ذلِكَ الإِنْسَانُ**)؟ قَالُوا: مَاتَ يَا رَسُولَ الله! قَالَ: (**أَفَلاَ آذَنْتُمُونِي**)؟ فَقَالُوا: إِنَّهُ كَانَ كَذَا وَكَذَا ـ قِصَّتُهُ ـ قَالَ: فَحَقَرُوا شَأْنَهُ، قَالَ: (**فَدُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ**)، فَأَتَى قَبْرَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. [خ١٣٣٧ (٤٥٨)/ م٩٥٦]

- وفي رواية مسلم: ثُمَّ قَالَ: (**إِنَّ هَذِهِ القُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ الله عزّ وجل يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلاَتِي عَلَيْهِمْ**).

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: ئێكێ رەش ـ ژن بوو یان زەلام ـ مزگەفت دمالی، مر، و پێغەمبەر (ﷺ) ب مرنا وی نەزانی، ئینا رۆژەكێ بەحسێ وی كر و گۆت: (وی مرۆڤی چ كر)؟ گۆتن: یێ مری ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (بۆچی هەوە ئەز پێ ئاگەهدار نەدكرم)؟ ئینا گۆتن ئەو چیرۆكا وی یا هۆسا و هۆسا بوو، گۆت: وان كارێ وی بچویك ددانا، گۆت: (گۆڕێ وی نیشا من بدەن)، هاتە سەر گۆڕێ وی، نڤێژ ل سەر كر.**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: پاشی گۆت: (ئەڤ گۆڕە هەمی یێت تژی تاریاتی بووین ل سەر خودانێت خۆ، ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن ب نڤێژا من دێ بۆ وان رۆن كەت).**

## ١٧ ـ باب: رفع الصوت في المساجد.

## بابەتێ: بلندکرنا دەنگی ل مزگەفتێ.

١١٠٠ - (خ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنْتُ قَائِماً فِي المسْجِدِ، فَحَصَبَنِي رَجُلٌ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَقَالَ: اذْهَبْ فَأْتِنِي بِهَذَيْنِ، فَجِئْتُهُ بِهِمَا، قَالَ: مَنْ أَنْتُمَا ـ أَوْ مَنْ أَيْنَ أَنْتُمَا ـ؟ قَالا: مِنْ أَهْلِ الطَّائِفِ، قَالَ: لَوْ كُنْتُمَا مِنْ أَهْلِ البَلَدِ لأَوْجَعْتُكُمَا، تَرْفَعَانِ أَصْوَاتَكُمَا فِي مَسْجِدِ رَسُولِ الله (ﷺ)! [خ٤٧٠]

**و ژ سائیبێ کورێ یەزیدێ سەحابی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل مزگەفتێ بووم، من هند دیت زەلامەکی بەرکەك هاڤێتە من، من بەرێ خۆ دایێ عومەرێ کورێ خەتتابییە (رضي الله عنه) گۆت: هەرە وان هەردو زەلامێت هە بۆ من بینە، من ئەو ئینان، گۆتێ: هوین یێت کیرێنە؟ گۆتن: ئەم خەلکێ تائیفێینە، ئینا گۆت: ئەگەر هوین خەلکێ ڤێرێ بان، دا هەوە ئێشینم، هوین دەنگێ خۆ د مزگەفتا پێغەمبەرێ خودێڤە (ﷺ) بلند دکەن.**

## ١٨ ـ باب: النوم في المسجد.

## بابەتێ: نڤستنا ل مزگەفتێ.

١١٠١ - (ق) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ عبدِ اللهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عاصِمٍ: أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ الله (ﷺ) مُسْتَلْقِياً فِي المسْجِدِ، وَاضِعاً إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى. [خ٤٧٥/ م٢١٠٠].

[وانظر: ٣٨٤٥].

**ژ عوبادەیێ کورێ تەمیمی (رضي الله عنه) ژ مامێ خۆ عەبدوللایێ کورێ زەیدێ کورێ عاسمی: وی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ل سەر پشتێ خۆ ل مزگەفتێ درێژ کربوو و پێیەك دانابوو سەر پێیێ دی.**

## ١٩ ـ باب: لا يخرج من المسجد بعد الأَذان.

## بابەتێ: پشتی بانگی ژ مزگەفتێ نادەركەڤیت.

١١٠٢ – (م) عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ قَالَ: كُنَّا قُعُوداً فِي المسْجِدِ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَأَذَّنَ المؤَذِّنُ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ المسْجِدِ يَمْشِي، فَأَتْبَعَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ بَصَرَهُ، حَتَّى خَرَجَ مِنَ المسْجِدِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَمَّا هَذَا، فَقَدْ عَصَى أَبَا القَاسِمِ (ﷺ). [م٦٥٥].

**و ژ ئەبی شەعسائی گۆت: ئەم ل مزگەفتێ ل دەڤ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) د روینشتی بووین، بانگهەلدێری بانگ دا، زەلامەك ل مزگەفتێ رابوو چۆ، چاڤێ ئەبو هورەیرە ما لێ هەتا ژ مزگەفتێ دەركەفتی، ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: هندیكە ئەڤەیە، وی نەگوهدارییا بابێ قاسمی كر (ﷺ).**

١١٠٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ الله (ﷺ): (**إِذَا كُنْتُمْ فِي المَسْجِدِ؛ فَنُودِيَ بِالصَّلاَةِ، فَلاَ يَخْرُجْ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُصَلِّيَ**). [حم١٠٩٣٣، ١٠٩٣٤].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە كر: (ئەگەر ئێك ژ هەوە ل مزگەفتێ بیت و بانگ بۆ نڤێژێ هاتە دان بلا نەدەركەڤیت هەتا نڤێژێ دكەت).**

## ٢٠ ـ باب: لا تمنعوا إماء الله مساجد الله.

## بابەتێ: رێكێ ل بەندەیێت خودێ ـ ژنان ـ ژ مزگەفتێت خودێ نەگرن

١١٠٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ لِعُمَرَ تَشْهَدُ صَلاَةَ الصُّبْحِ وَالعِشَاءِ فِي الجَمَاعَةِ فِي المسْجِدِ، فَقِيلَ لَهَا: لِمَ تَخْرُجِينَ، وَقَدْ تَعْلَمِينَ أَنَّ عُمَرَ يَكْرَهُ ذَلِكَ وَيَغَارُ؟ قَالَتْ: وَمَا يَمْنَعُهُ أَنْ يَنْهَانِي؟ قَالَ: يَمْنَعُهُ قَوْلُ رَسُولِ الله (ﷺ): **(لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ الله مَسَاجِدَ الله)**. [خ٩٠٠ (٨٦٥)/ م٤٤٢].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەڤژینەكا عومەری نڤێژا سپێدێ و عەیشا دهاتە نڤێژا ب جەماعەت ل مزگەفتێ، گۆتنێ بۆچی تو دەردكەڤی و تو دزانی عومەری پێ نەخۆشە و دەعی دگریت؟ گۆت: چ رێگرییا وی دكەت نەهێلیت و پاشڤەلێدانا من بكەت؟ گۆت: گۆتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رێگرییا وی دكەت: (رێكێ ل بەندەیێت خودێ ـ ژنان ـ ژ مزگەفتێت خودێ نەگرن).**

١١٠٥ – (م) عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ قَالَتْ: قَالَ لَنَا رَسُولُ الله (ﷺ): **(إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ المَسْجِدَ؛ فَلاَ تَمَسَّ طِيباً)**. [م٤٤٣].

**ژ زەینەبێ هەڤژینا عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە مە: (ئەگەر ئێك ژ هەوە هاتە مزگەفتێ بلا چو بێهنخۆشییێ ل خۆ نەكەت).**

١١٠٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَقِيَتْهُ امْرَأَةٌ وَجَدَ مِنْهَا رِيحَ الطِّيبِ يَنْفَحُ، وَلِذَيْلِهَا إِعْصَارٌ، فَقَالَ: يَا أَمَةَ الجَبَّارِ! جِئْتِ مِنَ المسْجِدِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: وَلَهُ تَطَيَّبْتِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ حِبِّي أَبَا القَاسِمِ (ﷺ) يَقُولُ: **(لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ لاِمْرَأَةٍ تَطَيَّبَتْ لِهَذَا المَسْجِدِ، حَتَّى تَرْجِعَ، فَتَغْتَسِلَ غُسْلَهَا مِنَ الجَنَابَةِ)**. [د٤١٧٤/ جه٤٠٠٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: ژنەك گەهشتە وی دیت بێهنا خۆش یا ژێ دفڕیت و دەهمەنا وێ دویڤڕا تۆزێ دكەت، گۆت: ئەی بەندەیا خودایێ سەردەست و دەست بلند و نەچاركەر، تو ژ مزگەفتێ دهێی؟ گۆت: بەلێ، گۆت: و تە گولاڤ ل خۆ كرییە؟ گۆت: بەلێ، گۆت: من گوه ل خۆشڤییێ خۆ بابێ قاسمی (ﷺ) بوو دگۆت: (نڤێژا ژنەكێ قەبویل نابیت بۆ هاتنا ڤێ مزگەفتێ گولاڤێ ل خۆ بكەت هەتا دزڤریتەڤە و خۆ دشۆشت وەكی خۆشویشتنا خۆ ژ لەش پیساتییێ).**

١١٠٧ - وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ الله مَسَاجِدَ الله، وَلَكِنْ لِيَخْرُجْنَ وَهُنَّ تَفِلاَتٌ**). [د٥٦٥/ مي١٣١٥].

* حسن صحيح.

**و ژ وی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رێكێ ل بەندەیێت خودێ ـ ژنان ـ ژ مزگەفتێت خودێ نەگرن ، بەلێ بلا بۆ دەركەڤن و وان گولاڤ ل خۆ نەكربیت).**

١١٠٨ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**صَلاَةُ المَرْأَةِ فِي بَيْتِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهَا فِي حُجْرَتِهَا، وَصَلاَتُهَا فِي مَخْدَعِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهَا فِي بَيْتِهَا**). [د٥٧٠].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نڤێژا ژنێ د خانییێ وێدا بخێرترە ژ نڤێژا د حەوشا وێدا و نڤێژا وێ د ژۆرا وێ یا تایبەتدا بخێرترە ژ نڤێژا وێ د ناڤ خانییێ وێدا).**

١١٠٩ - عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**لَوْ تَرَكْنَا هَذَا البَابَ لِلنِّسَاءِ**). قَالَ نَافِعٌ: فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ ابْنُ عُمَرَ حَتَّى مَاتَ. [د٤٦٢، ٥٧١].

* صحيح.

ژ نافعی (ﷺ) ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر مە ئەڤ دەرگەهە بۆ ژنان هێلابا)**، نافع دبێژیت: ئیبن عومەر هەتا مری د وی دەرگەهیرا نەهاتە ژۆر.

## ٢١ ـ باب: دخول المسجد وما يقول عنده.

## بابەتێ: چۆنا د مزگەفتێڤە و كا دێ چ بێژن.

١١١٠ – (م) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ ـ أَوْ عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ ـ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيَقُل: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)**. [م٧١٣].

ژ ئەبی حومەیدی یان ژ ئەبی ئوسەیدی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە چۆ د مزگەفتێڤە بلا بێژیت؛ ئەی خودا دەرگەهێت دلۆڤانییا خۆ بۆ من ڤەكە، و ئەگەر دەركەفت بلا بێژیت؛ ئەی خودا ئەز داخوازا كەرەما تە ژ تە دكەم)**.

١١١١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ؛ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ؛ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ اعْصِمْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)**. [جه٧٧٣].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە چۆ د مزگەفتێڤە بلا سلاڤ بكەتە پێغەمبەری (ﷺ) و بلا بێژیت؛ ئەی خودا دەرگەهێت دلۆڤانییا خۆ بۆ من ڤەكە، و ئەگەر دەركەفت بلا سلاڤ بكەتە پێغەمبەری ( ) و بلا بێژیت؛ ئەی خودا من ژ شەیتانێ ژ دلۆڤانییێ دویرئێخستی بپارێزە)**.

١١١٢ – وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ المَسْجِدَ فَلْيُصَلِّ عَلى النَّبِيِّ (ﷺ)، وَلْيَقُلْ: اللهُمَّ أَجِرْنِي مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم**). [ك٧٤٧]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**و ژ وی (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە چۆ د مزگەفتێڤە بلا سەلەواتان بدەتە سەر پێغەمبەری ( ) و بلا بێژیت: ئەی خودا من ژ شەیتانێ ژ دلۆڤانییێ دویرئێخستی بپارێزە).**

١١١٣ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا دَخَلْتَ المَسْجِدَ أَنْ تَبْدَأَ بِرِجْلِكَ اليُمْنَى، وَإِذَا خَرَجْتَ أَنْ تَبْدَأَ بِرِجْلِكَ اليُسْرى. [ك٧٩١]

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) وی دگۆت: ژ سونەتێیە ئەگەر تو چۆیە د مزگەفتێڤە ب پێ راستێ دەست پێ بكەی، و ئەگەر دەركەفتی ب پێ چەپێ دەست پێ بكەی.**

## ٢٢ ـ باب: لا يدخل المسجد من أكل ثوماً أو بصلاً.

## بابەتێ: یێ سیر و پیڤاز خواری نەچیتە د مزگەفتێڤە.

١١١٤ – (ق) عَنْ عَطَاء أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ أَكَلَ ثُوماً، أَوْ بَصَلاً؛ فَلْيَعْتَزِلْنَا**)، أَوْ قَالَ: (**فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ**)، وَأَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحاً، فَسَأَلَ، فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ البُقُولِ، فَقَالَ: (**قَرِّبُوهَا**) إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ كَانَ مَعَهُ، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهِ أَكْلَهَا، قَالَ: (**كُلْ، فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لاَ تُنَاجِي**) [خ٨٥٥ (٨٥٤)/ م٥٦٤].

- وفي رواية عند مسلم: قَالَ: نَهَى رَسُولُ الله (ﷺ) عَنْ أَكْلِ البَصَلِ وَالكُرَّاثِ، فَغَلَبَتْنَا الحَاجَةُ، فَأَكَلْنَا مِنْهَا، فَقَالَ: (**مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ المُنْتِنَةِ، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، فَإِنَّ المَلاَئِكَةَ تَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الإِنْسُ**).

ژ عەتائی، (ﷺ) کو جابرێ کورێ عەبدوللایی گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ سیر یان پیڤاز خوار بلا ژ مە دویر بکەڤیت)**، یان گۆت: **(بلا ژ مزگەفتا مە دویر بکەڤیت، و بلا ل مالا خۆ روینیت)**، و ب راستی قازانەك بۆ پێغەمبەری ئینا شینکاتی تێدا بوو بێهن ژێ هاتێ، پرسیار کر چ تێدایە، ئینا بۆ وی گۆت کا چ شینکاتی تێدایە، گۆت: **(نێزیك بکەن)** بۆ هندە هەڤالێت وی د گەل وی بوون، ڤێجا دەمێ دیتی وی نەڤیا بخۆت گۆت: **(بخۆ ئەز ئاخفتنێ د گەل وی دکەم یێ تو ئاخفتنێ د گەل نەکەی)**.

- و د ڤەگێڕەکێدا ل دەڤ موسلمی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ خوارنا پیڤازێ و قوراڤێ کر، مە گۆت: ئەم زۆر هەوجە بووین، مە ژێ خوار، ئینا گۆت: **(هەر کەسێ ژ ڤی گیایێ گەنی خوار (سیرێ یان پیڤازێ) بلا نێزیکی مزگەفتا مە نبیت، ب راستی ملیاکەت ب وی تشتی نەخۆش دبن یێ مرۆڤ پێ نەخۆش دبن)**.

١١١٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا، وَلاَ يُؤْذِيَنَّا بِرِيحِ الثُّومِ). [م٥٦٣].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ ژ ڤی گیای (ئانکو سیرێ) خوار بلا نێزیکی مزگەفتا مە نبیت و بلا ئەزیەتا مە ب بێهنا سیرێ نەکەت)**.

١١١٦ - عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى عَنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ، وَقَالَ: (مَنْ أَكَلَهُمَا، فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا)، وَقَالَ: (إِنْ كُنْتُمْ لاَ بُدَّ آكِلِيهِمَا، فَأَمِيتُوهُمَا طَبْخاً). قَالَ: يَعْنِي: البَصَلَ وَالثُّومَ. [د٣٨٢٧].

* صحيح.

**ژ موعاویەیێ كورێ قوررەیی ژ بابێ خۆ (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدان یا ژ خوارنا ڤان هەردو گیایان كری (پیڤازێ و سیرێ) و گۆت: (یێ خوارن بلا نێزیكی مزگەفتا مە نەبیت)، و گۆت: (ئەگەر هوین هەر دێ خۆن ب لێنانێ بمرینن).**

۲۳ ـ باب: النهي عن نشد الضالة في المسجد.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ لێگەریانا تشتێ بەرزە ل مزگەفتێ.**

۱۱۱۷ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: لاَ رَدَّهَا الله عَلَيْكَ، فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا). [م٥٦٨].

■ وفي رواية: (إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ، أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ؛ فَقُولُوا: لاَ أَرْبَحَ الله تِجَارَتَكَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ ضَالَّةً فَقُولُوا: لاَ رَدَّ الله عَلَيْكَ). [ت١٣٢١/ مي١٤٤١].

[وانظر: ١١٣٤].

**و ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ گوه ل زەلامەكی بوو (ب دەنگێ بلند) د مزگەفتێڤە ل تشتەكێ بەرزە دگەڕیت، بلا بێژیت: خودێ بۆ تە نەزڤرینیت، مزگەفت بۆ ڤێ چەندێ نەهاتینە ئاڤاكرن).**

■ **و د ڤەگێرەكێدا: (ئەگەر هەوە ئێك دیت د مزگەفتێڤە دفرۆشیت یان دكڕیت، بێژنێ: خودێ فایدەی نەئێخیتە بازرگانییا تە، و ئەگەر هەوە ئێك دیت (ب دەنگێ بلند) د مزگەفتێڤە ل تشتەكێ بەرزە دگەڕیت، بێژنێ: خودێ بۆ تە نەزڤرینیت).**

۲٤ ـ باب: الصلاة في مرابض الغنم.

**بابەتێ: نڤێژ ل مەخەلێت پەزی.**

۱۱۱۸ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (صَلُّوا فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ، وَلاَ تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الإِبِلِ). [ت٣٤٨/ جه٧٦٨/ مي١٤٣١]

* صحيح.

[وانظر: ٩٥٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ل مەخەلێت پەزی نڤێژێ بكەن و ل جهێ حێشتران نڤێژێ نەكەن)**

## ٢٥ ـ باب: الصلاة في السطوح والسفينة وغيرها.

## بابەتێ: نڤێژ ل سەر بانان و گەمی و تشتێ دی.

١١١٩ - (خ) عَنِ الحَسَنِ: أنه لَمْ يَرَ بَأْساً أَنْ يُصَلَّى عَلَى الجُمْدِ وَالقَنَاطِرِ، وَإِنْ جَرَى تَحْتَهَا بَوْلٌ، أَوْ فَوْقَهَا أَوْ أَمَامَهَا، إِذَا كَانَ بَيْنَهُمَا سُتْرَةٌ.

**ژ حەسەنی (رحمه الله): وی دورست ددیت نڤێژ ل سەر رەقیاتی (یان جەمەدێ) و قەنتەرا بهێتە كرن خۆ ئەگەر میز ژی د بنرا یان د سەرا یان د بەر سینگیرا بچیت ئەگەر ناڤبرەك د ناڤبەرا واندا هەبیت.**

١١٢٠ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أنه صلَّى عَلَى سَقْفِ المسْجِدِ بِصَلاَةِ الإِمَامِ.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه): وی ل سەربانێ مزگەفتێ نڤێژ ل دویف پێشنڤێژی كر.**

١١٢١ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أنه صَلَّى عَلَى الثَّلْجِ. [خ. الصلاة، باب ١٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت): وی نڤێژ ل سەر بەفرێ كر.**

١١٢٢ - (خ) عَنْ جَابِرٍ وَأَبِي سَعِيدٍ: أنهما صلّيا فِي السَّفِينَةِ قَائِمين.

**ژ جابری و ئەبی سەعیدی (خودێ ژ وان رازی بیت): وان ژ پییانڤە نڤێژ د گەمییێدا كر.**

١١٢٣ - (خ) وَقَالَ الحَسَنُ: تُصَلِّي قَائِماً مَا لَمْ تَشُقَّ عَلَى أَصْحَابِكَ تَدُورُ مَعَهَا؛ وَإِلاَّ فَقَاعِداً.

[خ. الصلاة، باب ٢٠].

و حەسەنی (رحمه الله) گۆت: دێ نڤێژێ ژ پیانڤە كەی هندی تو زەحمەتێ بۆ هەڤالێت خۆ دورست نەكەی و دێ د گەل زڤری (بۆ راستا ڤیبلێ) و ئەگەر نە (ئانكو ئەگەر زەحمەت بۆ هەڤالێت تە دورست ببیت) دێ روینشتی كەی.

١١٢٤ - (خ) عَنْ أَنَس: أنه صَلَّى عَلَى فِرَاشِهِ. [خ. الصلاة، باب ٢٢].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه): وی نڤێژ ل سەر جهێت خۆ كر.

١١٢٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَوْنٍ: أنه صَلَّى فِي مَسْجِدٍ فِي دَارٍ يُغْلَقُ عَلَيْهِمُ البَابُ.
[خ. الصلاة، باب ٨٧].

ژ ئیبن عەونی (رحمه الله): وی نڤێژ ل مزگەفتەكا مالەكا دەرگەهـ ژێ دهێتە گرتن كر.

١١٢٦ - (خ) المسْجِد يَكُونُ فِي الطَّرِيقِ مِنْ غَيْرِ ضَرَرٍ بِالنَّاسِ، وَبِهِ قَالَ الحَسَنُ وَأَيُّوبُ وَمَالِكٌ.
[خ. الصلاة، باب ٨٦].

مزگەفت ل سەر رێكێ بیت و زیانا خەلكی نەبیت دورستە و ئەڤە گۆتنا حەسەن و ئەیووب و مالكییە.

## ٢٦ . باب: زخرفة المساجد والتباهي بها.

## بابەتێ، نەخشاندنا مزگەفتان و شانازی پێ برن.

١١٢٧ - (خ) عَنْ عُمَرَ: أنه أَمَرَ بِبِنَاءِ المسْجِدِ، وَقَالَ: أَكِنَّ النَّاسَ مِنَ المطَرِ، وَإِيَّاكَ أَنْ تُحَمِّرَ، أَوْ تُصَفِّرَ فَتَفْتِنَ النَّاسَ. [خ. الصلاة، باب ٦٢].

ژ عومەری (رضي الله عنه): وی فەرمان ب ئاڤاكرنا مزگەفتان كر و گۆت: خلكی ژ بارانێ دپارێزیت و هشیاربی سۆر نەكە یان زەر نەكە ڤێجا تو وان ب ڤێ چەندێ خەلكێ بێ ئاگەهـ بكەی.

١١٢٨ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قال: يَتَبَاهَوْنَ بِهَا، ثُمَّ لاَ يَعْمُرُونَهَا؛ إِلاَّ قَلِيلاً. [خ. الصلاة، باب ٦٢].

**ژ ئەنەسی (ﭬ): شانازییێ ب مزگەفتا دبەن پاشی ئاڤەدان ناكەن كێمەك نەبن.**

١١٢٩ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ**).
[د٤٤٩/ جه٧٣٩/ مي١٤٤٨].

- ولفظ النسائي: (**مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ**). [ن٦٨٨].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (ﭬ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قیامەت نارابیت هەتا خەلك خۆ ب مزگەفتان مەزن بزانن).**

**و بێژەیا نەسائی: ژ نیشانێت رۆژا قیامەتێ: (خەلك خۆ ب مزگەفتان مەزن بكەن).**

**٢٧ ـ باب: هل يحبس في المسجد.**

**بابەتێ: ئەرێ دێ د مزگەفتێڤە هێتە زیندانكرن؟**

١١٣٠ - (خ) عَنْ شُرَيْحٍ: أنه كَانَ يَأْمُرُ الغَرِيمَ أَنْ يُحْبَسَ إِلَى سَارِيَةِ المسْجِدِ.

[خ. الصلاة، باب ٧٦].

**ژ شورەیحی (ﭬ): وی فەرمان ددا دەیندار ب دنگێ مزگەفتێڤە بهێتە گرێدان.**

## ٢٨ . باب: الأكل في المسجد.

## بابەتێ: خوارن د مزگەفتێڤە.

١١٣١ – عَنْ عَبْد الله بْنِ الحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيّ قال: كُنَّا نَأْكُلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ الله (ﷺ) فِي المَسْجِدِ الخُبْزَ وَاللَّحْمَ. [جه٣٣٠٠].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ حارسی كورێ جەزئیێ زوبەیدی (رضي الله عنه) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مە نان و گۆشت ل مزگەفتێ دخوار.**

## ٢٩ . باب: مرور الجنب والحائض في المسجد.

## بابەتێ: بۆرینا یێ ب جنابەت و بێنڤێژێ ل مزگەفتێ.

١١٣٢ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: جَاءَ رَسُولُ الله (ﷺ) وَوُجُوهُ بُيُوتِ أَصْحَابِهِ شَارِعَةٌ فِي المَسْجِدِ، فَقَالَ: (**وَجِّهُوا هَذِهِ البُيُوتَ عَنِ المَسْجِدِ**)، ثُمَّ دَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَلَمْ يَصْنَعْ القَوْمُ شَيْئاً، رَجَاءَ أَنْ تَنْزِلَ فِيهِمْ رُخْصَةٌ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ بَعْدُ فَقَالَ: (**وَجِّهُوا هَذِهِ البُيُوتَ عَنِ المَسْجِدِ، فَإِنِّي لاَ أُحِلُّ المَسْجِدَ لِحَائِضٍ وَلاَ جُنُبٍ**). [د٢٣٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات و بەرێ خانییێت هەڤالێت وی ل سەر مزگەفتی د ڤەكری بوون، ئینا گۆت: (بەرێ ڤان مالان ژ مزگەفتێ وەرگێرن)، پاشی پێغەمبەر (ﷺ) ب ژۆر كەفت، و وی خەلكی چو نەكر هیڤیيا هندێ دەستویری بۆ وان بهێتە خوارێ، ئینا پشتی هینگێ ل وان دەركەفت و گۆت: (بەرێ وان ژ مزگەفتێ وەرگێرن، ب راستی ئەز مزگەفتێ بۆ بێنڤێژێ دورست ناكەم و بۆ یێ ب جنابەت ژی).**

١١٣٣ - عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بنِ عبدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: الجُنُبُ يَمُرُّ فِي المسْجِدِ، وَلاَ يَقْعُدُ فِيهِ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ﴾ [النساء:٤٣]. [مي١٢١٠]

* إسناده حسن.

**ژ ئەبی عوبەیدەیێ كوڕێ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (خودێ ژ وان رازی بیت): گۆت: یێ ب جنابەت دێ د مزگەفتێڕا بۆریت و تێدا نارویننیتە خوارێ، پاشی ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ﴾[1].**

### ٣٠ ـ باب: ما يكره في المساجد.

### بابەتێ: كارێ نەباش ل مزگەفتان.

١١٣٤ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) نَهَى عَنِ الشِّرَاءِ وَالبَيْعِ فِي المسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ ضَالَّةٌ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهِ شِعْرٌ، وَنَهَى عَنِ التَّحَلُّقِ قَبْلَ الصَّلاَةِ يَوْمَ الجُمُعَةِ.

[د١٠٧٩/ ت٣٢٢/ ن٧١٣/ جه٧٤٩].

* حسن.

[وانظر: ١١١٧].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ كڕین و فرۆتن و گازیكرنێ بۆ تشتێ بەرزە و گۆتنا شیعرێ د مزگەفتێڤە كری و پاشڤەلێدانا كری ژ خەلەك دورستكرنێ بەری نڤێژا خوتبێ[2].**

[1] ئانكو: دیسا دەمێ جنابەتێ ژ بلی كو هوین رێبار بن هەتا خۆ دشۆن.

(٢) ج خەلەكا زكری بیت یان یا زانینێ دا خەلك مژویلی گوهدانا خوتبێ و نڤێژا خوتبێ ببن.

## ٣١ ـ باب: المواضع المنهي عن الصلاة فيها.

## بابەتێ: ئەو جهێت پاشڤەلێدانا كرنا نڤێژێ تێدا هاتیە كرن.

١١٣٥ - (خ) عَنْ عُمَرَ: أنه رَأَى أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يُصَلِّي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقَالَ: القَبْرَ القَبْرَ. وَلَمْ يَأْمُرْهُ بِالإِعَادَةِ. [خ. الصلاة، باب ٤٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت): وی ئەنەسێ كورێ مالكی دیت نڤێژ ل دەڤ گۆڕەكی دكر ئینا گۆت: ئەو گۆڕە گۆڕە، و فەرمانا وی ب دوبارەكرنێ نەكر.**

١١٣٦ - (خ) وَيُذْكَرُ أَنَّ عَلِيّاً كَرِهَ الصَّلاَةَ بِخَسْفِ بَابِلَ. [خ. الصلاة، باب ٥٣].

**و دهێتە گۆتن عەلی (رضي الله عنه) حەز نەدكر نڤێژ ل جهێ وێرانكرنا (خەسفا) بابل بهێتە كرن.**

١١٣٧ - (خ) عَنْ عُمَرَ قال: إِنَّا لاَ نَدْخُلُ كَنَائِسَكُمْ مِنْ أَجْلِ التَّمَاثِيلِ الَّتِي فِيهَا الصُّوَرُ. [خ. الصلاة، باب ٥٤]

**ژ عومەری (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ناهێنە د دێرێت هەوەڤە ژ بەر وان پەیكەرێت و وێنە تێدا.**

١١٣٨ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ؛ إِلاَّ الحَمَّامَ وَالمَقْبَرَةَ)**. [د٤٩٢/ ت٣١٧/ جه٧٤٥/ مي١٤٣٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (عەرد هەمی مزگەفتە سەرشۆ و گۆڕستان نەبن).**

## ٣٢ ـ باب: الصلاة على الخمرة.

## بابەتێ: نڤێژ ل سەر شەملكێ.

١١٣٩ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُصَلِّي عَلَى الخُمْرَةِ(١). [ت٣٣١]

* حسن صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر شەملكێ دكر.**

١١٤٠ - وعَنه: أنه صَلَّى وَهُوَ بِالبَصْرَةِ عَلَى بِسَاطِهِ، ثُمَّ حَدَّثَ أَصْحَابَهُ أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي عَلَى بِسَاطِهِ. [جه١٠٣٠].

* صحيح.

**و ژ وی (رضي الله عنه): وی ل بەسرا نڤێژ ل سەر حێسیلكا خۆ كر پاشی گۆتە هەڤالێت خۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر حێسیلكا خۆ نڤێژ دكر.**



(١) خومرە: حێسیلەكا بچویك و كورتە جهێ مرۆڤەكییە و وەكی شەملكێیە.

الكتاب الرابع

فضل الصلاة ومقدماتها وصفتها

# کتێبا چوارێ

# بهایێ نڤێژێ و پێشی و سالۆخەتێت وێ

## الفص الأول: فضل الصلاة ومقدماتها

## پشكا ئێكێ: بهایێ نڤێژێ و پێشییێت وێ

### ١ . باب: فضل الصلاة وحكم تاركها.

### بابەتێ: بهایێ نڤێژێ و فەرمانا نڤێژنەكەری

١١٤١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَراً بِبَابِ أَحَدِكُمْ، يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْساً، مَا تَقُولُ: ذٰلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ)؟ قَالُوا: لاَ يُبْقِي مِن دَرَنِهِ شَيْئاً، قَالَ: (فَذلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الخَمْسِ، يَمْحُو الله بِهَا الخَطَايَا). [خ٥٢٨/ م٦٦٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(بێژنە من ئەگەر رویبارەك ل بەر دەرگەهێ ئێكی ژ هەوە بیت، و رۆژێ پێنج جاران خۆ پێ بشۆت، ما دێ تشتەك ژ قرێژا وی مینیت)؟** گۆتن: چو ژ قرێژا وی نامینیت، گۆت: **(هەروەسا نموونەیا پێنج نڤێژان [یا وەسایە]، خودێ پێ گونەهان ژێ دبەت).**

١١٤٢ - (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو الله بِهِ الخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ)؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ الله، قَالَ: (إِسْبَاغُ الوُضُوءِ عَلَى المَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الخُطَا إِلَى المَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ؛ فَذلِكُمُ الرِّبَاطُ). [م٢٥١]

و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز نیشا هەوە نەدەم تشتێ خودێ گونەهان پێ ژێ دبەت، و پلەیان پێ بلند دكەت؟ گۆتن: بەلێ یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: دەستنڤێژ شویشتنا دورست و بێ كێماسی د نەخۆشییاندا و زێدە پێنگاڤ هاڤێتن بۆ مزگەفتان و خۆگرتن ل هیڤیا نڤێژێ پشتی كرنا نڤێژێ، ئەڤەیە هەژی مرۆڤ خۆ بۆ ڤالا و ئاسێ بكەت ئەڤەیە هەژی مرۆڤ خۆ بۆ ڤالا و ئاسێ بكەت، نەهێلیت ب ساناهی ژ مرۆڤی بچیت).**

١١٤٣ - (م) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ العَاصِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عُثْمَانَ، فَدَعَا بِطَهُورٍ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**مَا مِنِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلاَةٌ مَكْتُوبَةٌ؛ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشُوعَهَا وَرُكُوعَهَا؛ إِلاَّ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهَا مِنَ الذُّنُوبِ، مَا لَمْ يُؤْتِ كَبِيرَةً، وَذَلِكَ الدَّهْرَ كُلَّهُ**). [م٢٢٨].

**ژ عەمرێ کوڕێ سەعیدی کوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەز ل دەڤ عوسمانی بووم ئاڤا دەستنڤێژێ داخواز کر و گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە مرۆڤەکێ موسلمان نڤێژا ل سەر نڤیسی[1] لێ ببیت و دەستنڤێژا وێ و راوەستیانا وێ یا ب ترس و رکوعا وێ بنەجە پێ راببیت ئەگەر نەبیتە ژێبرن بۆ بەری خۆ ژ گونەهان هندی گونەهەکا مەزن (کەبیرە) نەکربیت، و ئەڤە بۆ هەمی دەم و وەختانە).**

١١٤٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: (**الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ، وَالجُمُعَةُ إِلَى الجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ؛ مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ، إِذَا اجْتَنَبَ الكَبَائِرَ**). [م٢٣٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه): پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێنج نڤێژ، و خوتبە هەتا خوتبێ، و رەمەزان هەتا رەمەزانێ، گونەهـ ژێبەرن بۆ د ناڤبەرا خۆدا ئەگەر خۆ ژ گونەهێت مەزن بدەتە پاش).**

١١٤٥ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِي (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاَةِ**). [م٨٢].

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی د ناڤبەرا مرۆڤی و د ناڤبەرا هەڤپشکچێکرنێ و گاوربیێدا نەکرنا نڤێژێیە).**

---

[1] ئانکو یا فەرز.

١١٤٦ - عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ الحُصَيْبِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**العَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ**). [ت٢٦٢١/ ن٤٦٢/ جه١٠٧٩]

* صحيح.

**ژ بورەیدەیێ کورێ حوسەیبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پەیمانا د ناڤبەرا مە و واندا (مەرەم پێ دوروینە) نڤێژە، ڤێجا هەر کەسێ هێلا ب راستی ئەو گاور بوو).**

١١٤٧ - عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ الصَّلاَةُ، فَإِنْ وَجَدَ صَلاَتَهُ كَامِلَةً كُتِبَتْ لَهُ كَامِلَةً، وَإِنْ كَانَ فِيهَا نُقْصَانٌ، قَالَ الله تَعَالَى لِمَلاَئِكَتِهِ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ، فَأَكْمِلُوا لَهُ مَا نَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ، ثُمَّ الزَّكَاةُ، ثُمَّ الأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ**).
[مي١٣٩٥/ د٨٦٦/ جه١٤٢٦]

* صحيح.

**ژ تەمیمێ داری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تشتێ ئێکێ رۆژا قیامەتێ حسێبا بەندەی ل سەر دهێتە کرن نڤێژا وییە، ڤێجا ئەگەر تەکویز دەرکەفت (کێماسی تێدا نەبیت) بۆ تەکویز هاتە نڤیسین، و ئەگەر کێماسییەك د نڤێژێت وی یێت فەرزدا هەبیت، خودایێ مەزن دێ بێژیتە ملیاکەتێت خۆ: بەرێ خۆ بدەنێ ئەرێ بەندەیێ من تشتەك ژ سونەتان هەیە، پێ کێماسییا فەرزا وی تەکویز بکەن پاشی زەکات هۆسا پاشی هەمی کارێت دی کێماسییا فەرزان ب سونەتان دێ هێنە تەمامکرن).**

## ٢ . باب: استقبال القبلة.

## بابەتێ: بەرێخودانا قیبلێ

١١٤٨ - (ق) عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) صَلَّى نَحْوَ بَيْتِ المَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ . أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْراً . وَكَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الكَعْبَةِ، فَأَنْزَلَ الله: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ [البقرة:١٤٤]، فَتَوَجَّهَ نَحْوَ الكَعْبَةِ، وَقَالَ السُّفَهَاءُ مِنَ النَّاسِ، وَهُمُ اليَهُودُ: ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ﴾ [البقرة:١٤٢]، فَصَلَّى مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) رَجُلٌ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَمَا صَلَّى، فَمَرَّ عَلَى قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِي صَلاَةِ العَصْرِ، نَحْوَ بَيْتِ المَقْدِسِ، فَقَالَ: هُوَ يَشْهَدُ: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ)، وَأَنَّهُ تَوَجَّهَ نَحْوَ الكَعْبَةِ، فَتَحَرَّفَ القَوْمُ، حَتَّى تَوَجَّهُوا نَحْوَ الكَعْبَةِ.

[خ٣٩٩ (٤٠)/ م٥٢٥].

**ژ بەرائێ کورێ عازبی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ بەرەڤ قودسێڤە دکر نێزیکی شازده یان هەڤدە هەیڤان، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەز دکر بەرێ خۆ بدەتە کەعبەیێ، ئینا خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾[1] ئینا بەرێ خۆ دا کەعبەیێ و ساوێلکان ژ خەلکی و ئەو جوهی بوون گۆتن: ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ﴾[2] ئینا زەلامەکی نڤێژ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) کر و پاشی پشتی نڤێژ**

---

**(١) ئانکو: ب ڕاستی مە ددیت تە بەرێ خۆ ل عەسمانی دگێڕا ب هیڤیا هندێ بەرێ تە بێتە وەرگێڕان بۆ کەعبەیێ.**

**(٢) ئانکو: ساویلکە و نەفامێت خەلکی ژ جوهی و دوڕوییان نێزیک دێ بێژن: چ بەرێ وان ژ قیبلەیا وان، ئەوا ئەو ل سەر وەرگێڕا، د بەرسڤا واندا بێژە: ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤا هەردو یێت خودێنە، هەچییێ خودێ بڤێت دێ بەرێ وی دەتە ڕێکا ڕاست و هەق.**

**كرى دەركەفت، و د بەر هندەك ژ خەلكێ مەدینەیێ ئەنسارانڕا بۆرى د نڤێژا ئێڤاریدا بوون و بەرێ وان ل قودسێ بوو، ئینا گۆت: ئەو شەهدەیێ ددەت وى نڤێژ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر و وى بەرێ خۆ دا كەعبەیێ، ئینا وان كەسان خۆ خواركرن هەتا بەرێ خۆ داینە كەعبەیێ.**

١١٤٩ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَا النَّاسُ بِقُبَاءٍ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ، إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ قُرْآنٌ، وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الكَعْبَةَ، فَاسْتَقْبِلُوهَا، وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ، فَاسْتَدَارُوا إِلَى الكَعْبَةِ. [خ٤٠٣/ م٥٢٦].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەرى (خودێ ژ وان رازى بیت) گۆت: د دەمەكیدا خەلك ل قوبائێ د نڤێژا سپێدێدا بوون، ئێك هاتە دەڤ وان، گۆت: ب راستى پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ شەڤە قورئانا بۆ هاتییە خوارێ و فەرمانا وى هاتەكرن ئەو بەرێ خۆ بدەتە كەعبەیێ، ڤێجا هوین ژى بەرێ خۆ بدەنێ، و بەرێ وان ل شامێ بوو، ئینا زڤرین و بەرێ خۆ دانە كەعبەیێ.**

١١٥٠ – (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ المُسْلِمُ، الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللهَ فِي ذِمَّتِهِ**). [خ٣٩١].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ نڤێژا مە كر و بەرێ خۆ دا قیبلەیا مە و دەستكوژێ مە خوار ئەو ئەو موسلمانە ئەوێ ئێمناهییا خودێ و ئێمناهییا پێغەمبەرێ وى بۆ هەى، ڤێجا خیانەتا خودێ د ئێمناهییا ویدا نەكەن).**

١١٥١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا بَيْنَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ قِبْلَةٌ**). [ت٣٤٢ـ ٣٤٤/ جه١٠١١].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د نافبەرا رۆژهەلات و رۆژئافاییدا قیبلەیە).**

١١٥٢ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُصَلِّي وَهُوَ بِمَكَّةَ نَحْوَ بَيْتِ المَقْدِسِ، وَالكَعْبَةُ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَبَعْدَ مَا هَاجَرَ إِلَى المَدِينَةِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْراً، ثُمَّ صُرِفَ إِلَى الكَعْبَةِ. [حم٢٢٥٢].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مەكەهێ نڤێژ بەرەف قودسێڤە دكرن و كەعبە بەرسینگێ وی بوو و پشتی مشەخت بوویە مەدینەیێ شازدە هەیڤان پاشی بەرێ وی بۆ كەعبەیێ هاتە وەرگێران.**

**٣ ـ باب: وجوب الصلاة في الثياب.**

**بابەتێ: پێدڤییا نڤێژێ د جلكاندا.**

١١٥٣ – (ق) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ المُنْكَدِرِ قَالَ: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ. [خ٣٥٣ (٣٥٢)/ م٥١٨].

**ژ موحەممەدێ كوڕێ مونكەدیری (رضي الله عنه) گۆت: من جابرێ كوڕێ عەبدوللایی دیت نڤێژ د ئێك جلكدا دكر و گۆت: ب راستی من پێغەمبەر (ﷺ) دیت د ئێك جلكدا نڤێژ دكر.**

١١٥٤ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ سَائِلاً سَأَلَ رَسُولَ الله (ﷺ)، عَنِ الصَّلاَةِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ)؟** [خ٣٥٨/ م٥١٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) پرسیارکەرەکی پرسیارا نڤێژکرنێ د ئێك جلکدا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئەرێ ما هەوە هەمیان دو جلك هەنە.**

١١٥٥ - (ق) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ شَيْءٌ**). [خ٣٥٩/ م٥١٦]

- وفي رواية للبخاري: (**مَنْ صَلَّى فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَلْيُخَالِفْ بَيْنَ طَرَفَيْهِ**). [خ٣٦٠].

**و ژ وی گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (کەس ژ هەوە ب جلکەکی ب تنێ نڤێژ نەکەت و چو ل سەر ملێ وی نەبیت). تنێ بگریت (ئانکو ب ئیزاری تنێ) نڤێژێ نەکەت و چو ل سەر ملێ وی نەبیت).**

- **و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: (هەر کەسێ د ئێك جلکدا نڤێژ کر بلا لێفکا سەرێکڤە ببەت)[1].**

١١٥٦ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ رِجَالٌ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، عاقِدِي أُزُرِهِمْ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، كَهَيْئَةِ الصِّبْيَانِ، وَيُقَالُ لِلنِّسَاءِ: (**لاَ تَرْفَعْنَ رُؤُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوساً**). [خ٣٦٢/ م٤٤١].

**ژ سەهلێ کورێ سەعدی (ﷺ) گۆت: هندە زەلامان نڤێژ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دکرن و ئیزارێت خۆ وەکی بچویکان ل ستۆیێت خۆ گرێددان، و دگۆتە ژنان: سەرێت خۆ بلند نەکەن هەتا زەلام تمام دروینن[2].**

---

(١) دا جلك نەڤەبیت و لەشێ وی دیار بیت.

(٢) ئانکو: سەرێ خۆ ژ سوجدەیێ نەراکەن هەتا زەلام ژ سوجدەیێ نەرابن، بمینن روینشتی دا شەرمینگەها وان نەبینن.

١١٥٧ - (ع) عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: قَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: الصَّلاَةُ فِي الثَّوْبِ الوَاحِدِ سُنَّةٌ، كُنَّا نَفْعَلُهُ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ)، وَلاَ يُعَابُ عَلَيْنَا. فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: إِنَّمَا كَانَ ذَاكَ إِذْ كَانَ فِي الثِّيَابِ قِلَّةٌ، فَأَمَّا إِذْ وَسَّعَ اللهُ؛ فَالصَّلاَةُ فِي الثَّوْبَيْنِ أَزْكَى. [حم٢١٢٧٦].

* صحيح، رجاله رجال الصحيح.

**ژ ئەبی نەزرەی (رحمه الله) گۆت: ئوبەیێ كوڕێ كەعبی گۆت: نڤێژكرن د ئێك جلكدا سونەتە مە د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكر و ب كێماسی نەدگێرا، ئینا ئیبن مەسعودی گۆت: ئەڤە چونكی جلك د كێم بوون، بەلێ مادەم خودێ بەرفرەهی دایە نڤێژكرن د دو جلكاندا باشترە.**

١١٥٨ - عَنْ نَافِعٍ قَالَ: دَخَلَ ابْنُ عُمَرَ وَأَنَا أُصَلِّي فِي إِزَارٍ، فَقَالَ: أَلَمْ تُكسَ ثَوْبَيْنِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ لَوْ بَعَثْتُكَ فِي حَاجَةٍ أَكُنْتَ تَذْهَبُ هَكَذا كَمَا صَلَّيْتَ؟ قَلْتُ: لا، قَالَ: فَرَبُّكَ أَحَقُّ أَنْ تَزَيَّنَ له. [مه٧٦٦/ مخ١/٢٠٠].

* إسناد صحيح.

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عومەر ب ژۆر كەفت و من نڤێژ د ئیزارەكیدا دكر (پارچەكا جلكییە د خۆ وەردكەن) ئینا گۆت: ئەرێ دو جلك نەبوون بكەیە بەر خۆ؟ من گۆت: بەلێ، گۆت: بۆ من بێژە، ئەگەر من تو بۆ هەوجەییەكێ هنارتی ئەرێ دێ هۆسا چی وەكی تە نڤێژ كری؟ من گۆت: نەخێر، گۆت: پا خودایێ تە هێژاترە تو خۆ بۆ بخەملینی.**

١١٥٩ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَأْتَزِرْ وَلْيَرْتَدِ**).

[حب (١٧١٣)/ هق٢/٢٣٥].

* إسناد صحيح على شرطهما.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێکی ژ هەوە نڤێژ کر بلا نافتەنگا خۆ ب ئیزار کەت و سەر ملێت خۆ ژی بگریت)[1].**

## ٤ ـ باب: الصلاة في النعال

## بابەتێ: نڤێژکرنێ ب شمکانڤە.

١١٦٠ – (ق) عَنْ أَبِي مَسْلَمَةَ، سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ الأَزْدِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: أَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. [خ٣٨٦/ م٥٥٥]

**ژ ئەبی سەلەمەی سەعیدێ کورێ یەزیدێ ئەزدی گۆت: من پرسیارا ئەنەسێ کورێ مالکی کر ئەرێ پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژ ب شمکێت حۆڤە دکر؟ گۆت: بەلێ.**

١١٦١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يُصَلِّي يَوْمَ الفَتْحِ، وَوَضَعَ نَعْلَيْهِ عَنْ يَسَارِهِ. [د٦٤٨/ ن٧٧٥/ جه١٤٣١]

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ سائیبی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) ل رۆژا ڤەکرنا مەکەهێ دیت نڤێژ دکر و هەردو شمکێت خۆ دانابوونە لایێ خۆ یێ چەپێ.**

١١٦٢ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ، إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ القَوْمُ أَلقَوْا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) صَلاَتَهُ، قَالَ: (**مَا حَمَلَكُمْ عَلَى إلقَائكُمْ نِعَالَكُمْ**)؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ أَلقَيْتَ نَعْلَيْكَ، فَأَلقَيْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ):

---

**(١) نانکو: بلا پارچا بنی کو دبێژنێ ئیزار د خۆ وەرکەت و پارچا سەری کو دبێژنێ ریداء دانیتە سەر ملێت خۆ.**

(إِنَّ جِبْرِيلَ (ﷺ) أَتَانِي، فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا قَذَراً). وَقَالَ: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى المَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ؛ فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَراً أَوْ أَذًى، فَلْيَمْسَحْهُ، وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا). [د٦٥٠/ مي١٣٧٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: د دەمەكیدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل بەری هەڤالێت خۆ دكر، ئینا شمكێت خۆ ئێخستن و دانانە لایێ خۆ یێ چەپێ، ڤێجا دەمێ وان ئەڤە دیتی وان ژی شمكێت خۆ ئێخستن، ڤێجا دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژا خۆ كری گۆت: (چ وەل هەوە كر هوین شمكێت خۆ بێخن)؟ گۆتن: مە تو دیتی تە شمكێت خۆ ئێخستن ئینا مە ژی شمكێت خۆ ئێخستن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی جبریل (ﷺ) هاتە دەڤ من و گۆتە من پیساتییەك یا پێڤە و گۆت: ئەگەر ئێك ژ هەوە هاتە مزگەفتێ بلا بەرێ خۆ بدەتێ ئەگەر پیساتییەك یان ئەزیەتەك پێڤە دیت بلا ڤەمالیت و بلا نڤێژێ پێڤە بكەت).**

١١٦٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أنه أَتَى أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ فِي مَنْزِلِهِ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَقَالَ أَبُو مُوسَى: تَقَدَّمْ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَإِنَّكَ أَقْدَمُ سِنّاً وَأَعْلَمُ، قَالَ: لاَ، بَلْ تَقَدَّمْ أَنْتَ، فَإِنَّمَا أَتَيْنَاكَ فِي مَنْزِلِكَ وَمَسْجِدِكَ فَأَنْتَ أَحَقُّ، قَالَ: فَتَقَدَّمَ أَبُو مُوسَى، فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: مَا أَرَدْتَ إِلَى خَلْعِهِمَا، أَبِالوَادِي المقَدَّسِ أَنْتَ؟ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي الخُفَّيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ. [حم٤٣٩٧]

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) ئەو هاتە دەڤ ئەبو مووسایێ ئەشعەری ل مالا وی، و دەمێ نڤێژێ هات، ئینا ئەبو مووسای گۆت: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی پێشكەڤە، ب راستی تو مەزنتری و زاناتری ژی، گۆت: نەخێر تو پێشكەڤە هندی ئەمین ئەم یێت هاتینە دەڤ تە ل مالا تە و ل مزگەفتا تە، و تو مافدارتری گۆت: ئەبو مووسا**

پێشکەفت و شمکێت خۆ ئێخستن، ڤێجا دەمێ سلاڤا ملان ڤەدای گۆتێ: تە چ دڤیا ب ئێخستنا وان؟ خونە تو ل نهالا پیرۆزی؟ ب ڕاستی من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت نڤێژ ب خوفکان و ب شمکانڤە دکر.

٥ . باب: المصلي يرى النجاسة على ثوبه.

**بابەتێ: نڤێژکەر پیساتییەکێ ب جلکێ خۆڤە بینیت.**

١١٦٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أنه كَانَ إِذَا رَأَى فِي ثَوْبِهِ دَماً، وَهُوَ يُصَلِّي، وَضَعَهُ وَمَضَى فِي صَلاَتِهِ.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەگەر وی خوین ب جلکێ خۆڤە دیتبا و ئەو یێ نڤێژێ دکەت دا وی جلکی دانیت و بەردەوامی ددا نڤێژا خۆ.**

١١٦٥ - (خ) عَنِ ابْنِ المسَيَّبِ وَالشَّعْبِيِّ، قَالا: إِذَا صَلَّى وَفِي ثَوْبِهِ دَمٌ أَوْ جَنَابَةٌ، أَوْ لِغَيْرِ القِبْلَةِ، أَوْ تَيَمَّمَ: فَصَلَّى، ثُمَّ أَدْرَكَ الماءَ فِي وَقْتِهِ، لاَ يُعِيدُ. [خ. الوضوء، باب ٦٩]

**ژ کوڕێ موسەییەبی و شەعبی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: ئەگەر خوین ب جلکێ ویڤە بیت یان ئاڤا نڤینێ یان بەرێ وی نە ل قیبلێ نڤێژ کر یان تەیەمموم کر و نڤێژ کر پاشی د دەمێ خۆدا گەهشتە سەر ئاڤێ ئەو نڤێژا خۆ دوبارە ناکەت.**

٦ . باب: ثياب المرأة في الصلاة.

**بابەتێ: جلکێت ژنێ د نڤێژێدا.**

١١٦٦ - عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**لاَ يَقْبَلُ اللهُ صَلاَةَ حَائِضٍ إِلاَّ بِخِمَارٍ**).

[د٦٤١/ ت٣٧٧/ جه٦٥٥].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی گۆت: (خودێ نڤێژا چو ژنێت بالغ قەبویل ناکەت ب دەرسۆکێ نەبیت).**

١١٦٧ – عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ الأَسْوَدِ الخَوْلاَنِيِّ . وَكَانَ فِي حَجْرِ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .: أَنَّ مَيْمُونَةَ كَانَتْ تُصَلِّي فِي الدِّرْعِ وَالخِمَارِ لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ. [ط٣٢٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عوبەیدوللایێ كوڕێ ئەسوەدێ خولانی (رضي الله عنه) و ئەو ل دەڤ مەیموونەیێ بوو و ل بن چاڤدێرییا وێ بوو هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ): مەیموونەیێ نڤێژ ب كراسی و دەرسۆكێ دكر و پارچا ژێر بەژنێ (ئیزار) ل بەر نەبوو.**

**٧ ـ باب: الصلاه بپیاب النساو.**

**بابەتێ: نڤێژكرن ب جلكێت ژنان.**

١١٦٨ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لاَ يُصَلِّي فِي شُعُرِنَا، أَوْ فِي لُحُفِنَا.

[د٣٦٧، ٣٦٨، ٦٤٥/ ت٦٠٠/ ن٥٣٨١].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر جلكێ مە یێ د ناڤدا یان یێ ب سەردا نەدكر[1].**

**٨ ـ باب: ما جاء في السدل في الصلاة.**

**بابەتێ: جلك د خۆ وەركرن د نڤێژێدا.**

١١٦٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ، وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ.

[د٦٤٣/ ت٣٧٨/ مي١٤١٩].

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان یا كری ژ هندێ مرۆڤ د نڤێژێدا جلكی د خۆ وەركەت و دەستێت خۆ بێخیتە بنڤە بۆ ركوع و سوجدەیان دەرنەئێخیت[1] و زەلام دەڤێ خۆ ب تشتەكی بگریت.**

---

(١) شیعار: ئەو جلكە یێ ژن دەستپێكێ دكەتێ و دكەڤیتە سەر لەشی و لوحاف: ئەو جلكە یێ ژن ب سەر جلكێ ئێكێدا دكەتە بەر خۆ.

## ٩ ـ باب: أرحنا بالصلاة.

## بابەتێ: مە ب نڤێژێ ئارام بكە.

١١٧٠ - عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الجَعْدِ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ ـ قَالَ مِسْعَرٌ: أُرَاهُ مِنْ خُزَاعَةَ ـ: لَيْتَنِي صَلَّيْتُ فَاسْتَرَحْتُ، فَكَأَنَّهُمْ عَابُوا عَلَيْهِ ذَلِكَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**يَا بِلاَلُ! أَقِمِ الصَّلاَةَ أَرِحْنَا بِهَا**). [د٤٩٨٥].

* صحيح.

**ژ سالمێ كوڕێ ئەبی جەعدی گۆت: زەلامەكی گۆت، میسعەری گۆت: ئەز دبینم ئەو ژ خوزاعەیە: خوزی من نڤێژ كربا دا تەنابم، هەروەكی وان ئەڤە ب كێماسی بۆ زانی، ئینا گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)بوو دگۆت : (یا بیلال قامەتا نڤێژێ بگرە مە پێ تەناكە).**

## ١٠ ـ باب: متى يؤمر الغلام بالصلاة.

## بابەتێ: كەنگی دێ فەرمانا بچویكی ب نڤێژێ هێتە كرن.

١١٧١ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي المَضَاجِعِ**). [د٤٩٥].

* حسن صحيح.

**ژ عەمرێ كوڕێ شوعەیبی ژ بابێ خۆ، ژ باپیرێ خۆ، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (فەرمان و ئەمرێ بچویكێت خۆ ب كرنا نڤێژان**

---

(١) دیسا هاتییە گۆتن سیدل دەستبەردانە و نەدانیتە سەرێك یان جلك شۆڕكرنە هەتا ل عەردی دگرن یان جلكی ب سەر ملێت خۆ یێ چەپێ و راستێدا بەردەت و هەر یێ پێڤە مژویل بیت.

**بكەن و ئەو حەفت سالی، و سەرا نەكرنا نڤێژان بقوتن و ئەو دەه سالی و جهێت وان (جهێت نڤستنێ) ژێك جوداكەن).**

١١ . باب: تحريم الصلاة وتحليلها.

**بابەتێ: دەستپێك و دویماهیيا نڤێژێ.**

١١٧٢ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ).** [ت٢٣٨/ جه٢٧٦].

* صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(كلیلا نڤێژێ دەستنڤێژە و چۆنا تێدا تەكبیرە و دەركەفتن ژێ سلاڤدانە).**

١٢ . باب: فضل التكبيرة الأولى

**بابەتێ: خێرا تەكبیرا ئێكێ**

١١٧٣ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْماً فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى، كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَتَانِ: بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ، وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ).** [ت٢٤١]

* حسن.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ چل ڕۆژان نڤێژان ب جەماعەت و بگەهیتە تەكبیرا ئێكێ (ئانكو: یا ئیحرامێ) بۆ خودێ بكەت دو رزگاربوون دێ بۆ هێنە نڤیسین، رزگاربوونەك ژ ئاگری و رزگاربوونەك ژ دوڕوییاتییێ).**



## الفصل الثاني: سترة المصلي

## پشكا دووێ: نافبرا نڤێژكەری

### ١ ـ باب: سترة المصلي

### بابەتێ: نافبرا نڤێژكەری

١١٧٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ العِيدِ، أَمَرَ بِالحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ، فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الأُمَرَاءُ [خ٤٩٤/ م٥٠١]

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر رۆژا جەژنێ دەركەفتبا فەرمان ب رومەكێ دكر دا داننە بەر سینگێ وی و وی نڤێژ بۆ راستا وێ دكر و خەلك پشت وی بوون و د وەغەرێدا ژی ئەڤە دكر پاشی پشتی وی فەرمانداران ژی ئەو دكر.**

١١٧٥ – (م) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا نُصَلي وَالدَّوَابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لِرَسُولِ الله (ﷺ)، فَقَالَ: (**مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ تَكُونَ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، ثُمَّ لاَ يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ**) [م٤٩٩]

**ژ تەلحەیێ كورێ عوبەیدوللایی (ﷺ) گۆت: مە نڤێژ دكر و گیانەوەر د بەر سینگێ مەرا دبۆرین، ئینا مە ئەڤە گۆتە پێغەمبەری (ﷺ)، گۆت: (ئەگەر وەكی پاشییا كورتانێ حێشترێ[1] بەر سینگێ ئێك ژ هەوە بیت پاشی زیان ناگەهیتە وی ئەوێ د بەر سینگێ ویرا دبۆریت).**

---

(١) ئەو دارە یێ سویار پالا خۆ ددەتێ.

١١٧٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لا تُصَلُّوا خَلفَ النَّائمِ وَلاَ الْمُتَحَدِّثِ)**(١).

[د٦٩٤/ جه٩٥٩]

* ضعيف.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پشت نڤستی و ئاخفتنكەری نڤێژێ نەكەن).**

١١٧٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) صَلَّى فِي فَضَاءٍ لَيْسَ بَيْنَ يَدَيْهِ شَيْءٌ. [حم١٩٦٥].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل جهەكێ ڤەكری كر و چو تشت ل بەر سینگێ وی نەبوون.**

## ٢ ـ باب: الدنو من السترة والسواري.

## بابەتێ: نێزكبوون ژ ناڤبڕا و دنگان.

١١٧٨ – (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ الله (ﷺ) وَبَيْنَ الجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ.

[خ٤٩٦/ م٥٠٨]

* حسن لغيره.

**ژ سەهلێ كوڕێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: د ناڤبەرا جهێ نڤێژا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و دیواریدا رێكا بۆرینا گیسكەكی بوو.**

١١٧٩ – (خ) عَنْ عُمَر أنه قَالَ: المصَلُّونَ أَحَقُّ بِالسَّوَارِي مِنَ المتَحَدِّثِينَ إِلَيْهَا.

[خ. الصلاة، باب ٩٥].

---

(١) **شێخ شامی د مالپەرێ خۆدا ئەڤ فەرمووده ب وێ هەژمارێ نینایە** (١١٧٦ – (م) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ الله (ﷺ) . في غزوة تبوك . عَنْ سُتْرَةِ المصَلِّي؟ فَقَالَ: (مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ).[م٥٠٠].) **هەروەكی ڤیایە ل جهێ وێ بدانیت چونكی ئەو فەرمودا وی ئینایی یا لاوازە. ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: د خەزایا تەبوكێدا پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ ناڤبرێ نڤێژكەری هاتەكرن گۆت: وەكی پاشیا كورتانی (زینی).**

**ژ عومەری (رضي الله عنه) وی گۆت: نڤێژكەر هەژیترى دنگانە ژ ئاخفتنكەران[1].**

١١٨٠ - (خ) وعَنْهُ: أنه رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي بَيْنَ أُسْطُوَانَتَيْنِ، فَأَدْنَاهُ إِلَى سَارِيَةٍ فَقَالَ: صَلِّ إِلَيْهَا. [خ. الصلاة، باب ٩٥].

**و ژ وی (رضي الله عنه): وی زەلامەك دیت د نافبەرا دو دنگاندا نڤێژ دكر ئینا ئەو نێزیكی دنگەكی كر و گۆتێ: نڤێژێ راستا وی بكە.**

١١٨١ - عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ؛ فَلْيَدْنُ مِنْهَا، لاَ يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلاَتَهُ**). [د٦٩٥/ ن٧٤٧/ حم١٦٠٩٠].

* إسناده صحيح، رجاله رجال الشيخين.

[وانظر: ١٣٢٢ كان الصحابة يبتدرون السواري].

**ژ سەهلێ كورێ ئەبی حەسمەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە نڤێژ ل پشت نافبرەكێ كر بلا ژێ نێزیك ببیت دا شەیتان نڤێژا وی ل سەر نەبڕیت).**

## ٣ ـ باب: الاعتراض بين يدي المصلي.

## بابەتێ: خۆدرێژكرن ل بەر سینگێ نڤێژكەری.

١١٨٢ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ الله (ﷺ) وَرِجْلاَيَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، قَالَتْ: وَالبيوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ. [خ٣٨٢/ م٥١٢].

(١) پشتی نڤێژێ هندەكان پشتا خۆ ددانە دنگان و سوحبەت دكرن، عومەری گۆت: ئەوێ بڤێت دنگەی بۆ خۆ بكەتە سترە و نافبر بۆ وی پتر دكەڤیت ژ وان یێت سوحبەتێ دكەن، چونكی مزگەفت هەمی جهێ نڤێژانە.

- وفي رواية لهما: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي، وَهْيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ، عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ، اعْتِرَاضَ الجَنَازَةِ. [خ٣٨٣].
- وفي رواية لهما: أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ، فَقَالُوا: يَقْطَعُهَا: الكَلْبُ، وَالحِمَارُ، وَالمرْأَةُ، قَالَتْ: لَقَدْ جَعَلْتُمُونَا كِلاَباً! لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يُصَلِّي، وَإِنِّي لَبَيْنَهُ وَبَيْنَ القِبْلَةِ، وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيرِ، فَتَكُونُ لِي الحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَسْتَقْبِلَهُ، فَأَنْسَلُّ انْسِلاَلاً. [خ٥١١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) وێ گۆت: ئەز بەرامبەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دنڤستم و پێت من ل بەر قیبلا وی بوون، ڤێجا دەمێ دچۆ سوجدەیێ نیشان دكرە من (ب چاڤی یان ب دەستی) من پێت خۆ دكێشان، و ئەگەر رابباڤە من پێت خۆ درێژ دكرنەڤە، و وی دەمی مالان چرا تێڤە نەبوون.**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ دكر و ئەو د نافبەرا وی و قیبلا ویدا بوو ل سەر نڤینێت مالا خۆ وەكی رازاندنا تەرمی.**
- **و د ڤەگێرەكا دی یا واندا: ل دەڤ وێ بەحسێ وی تشتی هاتە كرن یێ نڤێژێ دبڕیت، ئینا گۆتن: سە، و كەر، و ژن، ئینا گۆت: هەوە ئەم كرینە سە، ب سویند من پێغەمبەر (ﷺ) دیت نڤێژ دكر و ئەز د نافبەرا وی و قیبلا ویدا بووم و ئەز ل سەر تەختی یا درێژكری بووم، دا هەوجەییەك بۆ من دورست بیت، من نەدڤیا د بەر سینگێ ویرا بێم، دا ڤەشارتی رابم.**

## ٤ . باب: حكم المرور بين يدي المصلي.

## بابەتێ: حوكمێ بۆرینا د بەر نڤێژكەریرا.

١١٨٣ - (ق) عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ، يَسْأَلُهُ: مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ الله (ﷺ) فِي المارِّ بَيْنَ يَدَيِ المصَلِّي؟ فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(لَوْ يَعْلَمُ المَارُّ بَيْنَ يَدَيِ المُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْراً لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ)**.

قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي أَقَالَ أَرْبَعِينَ يَوْماً، أَوْ شَهْراً، أَوْ سَنَةً. [خ٥١٠/ م٥٠٧]

**ژ ئەبی نەزری (رحمه الله) ژ بوسرێ كوڕێ سەعیدی، زەیدێ كوڕێ خالدی ئەو هنارتە دەڤ ئەبی جوهەیمی، پرسیارێ ژێ بكەت وی چ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بوویە د راستا بۆرینا د بەر نڤێژكەریڕا، ئەبو جوهەیمی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئەوێ د بەر سینگێ نڤێژكەریڕا دبۆریت زانیبا كا چ ل سەرە، وی خۆ چلان گرتبا چێترە بۆ وی ئەو د بەر سینگێ ویڕا ببۆریت).**

**ئەبو نەزر، دبێژیت: ئەز نوزانم گۆت: چل رۆژان یان چل هەیڤان یان چل سالان.**

١١٨٤ - (ق) عَنْ أَبِي صالِحٍ السَّمَّان قال: رَأَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ، يُصَلِّي إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَاد شابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْطٍ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَدَفَعَ أَبُو سَعِيدٍ فِي صَدْرِهِ، فَنَظَرَ الشَّابُّ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغاً إِلاَّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَعَادَ لِيَجْتَازَ، فَدَفَعَهُ أَبُو سَعِيدٍ أَشَدَّ مِنَ الأُولَى، فَنَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ، فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَدَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ خَلْفَهُ عَلَى مَرْوَانَ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَلابْنِ أَخِيكَ يَا أَبَا سَعِيدٍ؟ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ**).

[خ٥٠٩/ م٥٠٥]

**ژ ئەبی سالحێ سەممان (رحمه الله) گۆت: من ئەبو سەعیدێ خودری ل رۆژا خوتبە دیت نڤێژ ل راستا ناڤبڕەكێ دكر ئەو ژ خەلكی دپاراست، گەنجەكی ژ مالا ئەبی موعەیتی دڤیا د بەرڕا بچیت، ئینا ئەبو سەعیدی د سینگێ ویڕا پالدا، جەحێلی بەرێ خۆ دایێ چو رێك نەدیتن ئەو نەبیت د بەر ویڕا ببۆریت، ئینا ئەبو سەعید زڤری ب هێزتر ژ جارا ئێكێ ئەو پالدا، ئینا ئاخفتن گۆتنە ئەبو سەعیدی، پاشی چۆ دەڤ مەروانی و گازندە ژ ئەبی سەعیدی كر ژ بەر وێ یا وی ژێ دیتی و ئەبو سەعید د دویڤ ویڕا چۆ دەڤ مەروانی، ئینا گۆت: ئەرێ تە و برازایێ خۆ چییە ئەی ئەبا سەعید؟ گۆت: من گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بوو دگۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە نڤێژ بەرامبەر ناڤبڕەكێ كر وی ژ خەلكی بپارێزیت، و ئێكی ڤیا د بەرڕا بچیت، بلا پالدەت، ئەگەر پاشڤە نەچۆ بلا ب هێز پالدەت ب راستی هینگێ ئەو شەیتانە)[1].**

---

(١) ئانكو شەیتانە وەلێ دكەت د بەر نڤێژێڕا بچیت.

## ٥ ـ باب: ما يقطع الصلاة.

## بابەتێ: تشتێ نڤێژێ دبڕیت.

١١٨٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**يَقْطَعُ الصَّلاَةَ: المَرْأَةُ، وَالحِمَارُ، وَالكَلْبُ، وَيَقِي ذَلِكَ مِثْلُ مُؤخِرَةِ الرَّحْلِ**). [م٥١١]

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژن، و کەر، و سە، نڤێژێ دبڕن و هندی پالپشتا کورتانی ل بەر سینگێ ئێکی مرۆڤی ژ ڤێ چەندێ دپارێزیت)[1].**

١١٨٦ - عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدٍ أَنَّ عُثْمَانَ وَعَلِيّاً رضي الله عنهما قَالاَ: لاَ يَقْطَعُ صَلاَةَ المسْلِمِ شَيْءٌ، وَادْرَؤُوهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ. [هق٢/٢٧٨]

**ژ قەتادەی (ﷺ) ژ سەعیدی کو عوسمان و عەلی هەردووان گۆتن: چو تشت نڤێژا موسلمانی بەتال ناکەن و وان پالدەن و نەهێلن هندی هوین بشێن.**

١١٨٧ - عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبد اللهِ بنِ عُمر، عَنْ أَبِيهِ كَانَ يَقُولُ: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيْءٌ مِمَّا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَي المصَلّي. [ط٣٧١/ هق٢/٢٧٨]

* إسناده صحيح.

**ژ سالمێ کوڕێ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری ژ بابێ خۆ (خودێ ژ وان رازی بیت) وی دگۆت: چو تشت نڤێژێ بەتال ناکەن ژ وان تشتێت د بەر نڤێژکەریڕا دبۆرن.**

## ٦ ـ باب: ستره الإمام ستره لمن خلفه.

## بابەتێ: ناڤبڕێ ئیمامی ناڤبڕە بۆ یێت پشت وی.

١١٨٨ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: هَبَطْنَا مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) مِنْ ثَنِيَّةِ أَذَاخِرَ، فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى ـ يَعْنِي إِلَى جَدْرٍ ـ فَاتَّخَذَهُ قِبْلَةً وَنَحْنُ خَلْفَهُ، فَجَاءَتْ بَهْمَةٌ تَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَمَا زَالَ يُدَارِئُهَا حَتَّى لَصِقَ بَطْنُهُ بِالجَدْرِ، وَمَرَّتْ مِنْ وَرَائِهِ. [د٧٠٨].

* حسن صحيح.

---

(١) جمهورێ زانیایان دبێژن: رامانا (يقطع) ل ڤێرێ ئەوە نڤێژێ کێم دکەت نەکو بەتال دکەت، و دا خێرا نڤێژێ کێم نەبیت بەرێ وان دا هندێ ئەو ناڤبڕەکێ داننە پێشیا خۆ، و خودانێ کتێبێ ژی شێخ شامی د گەل ڤێ بۆچۆنێیە لەوا فەرموودەیا دویڤدا یا ژمارە: (١١٨٦ ـ ١١٨٧) ئینایە کو چو تشت نڤێژێ بەتال ناکەن.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری گۆت: مە د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دانا گەلییێ ئەزاخر[1] و دەمێ نڤێژێ هات، ئینا نڤێژ بەرامبەر دیوارێ بیستانەکی کر و دیوار ئێخستە قیبلا خۆ و ئەم ل پشت وی بووین، ئینا بەرخکەك هات دڤیا د بەر وێڕا بچیت، و وی بەردەوام پالددا هەتا زکێ وی ب دیواریڤە مایی و ئەو د پشت وێڕا چۆیی.



(١) جهەکە دکەڤیتە د ناڤبەرا مەکەهێ و مەدینەییێدا و بۆ مەکەهێ نێزیکترە.

## الفصل الثالث: صفة الصلاة

## پشكا سێیێ: چاوانییا نڤێژێ

### ١ ـ باب: صلوا كما رأيتموني أُصلي.

### بابەتێ: نڤێژێ وەسا بكەن هەروەكی هەوە ئەز دیتیم نڤێژێ دكەم.

١١٨٩ - (ق) عَنْ أَبِي حَازِمِ بْنِ دِينَارٍ: أَنَّ رِجَالاً أَتَوْا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ، وَقَدِ امْتَرَوْا فِي الْمِنْبَرِ مِمَّ عُودُهُ؟ فَسَأَلُوهُ عَنْ ذلِكَ، فَقَالَ: والله إِنِّي لأَعْرِفُ مِمَّا هُوَ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَوَّلَ يَوْمٍ وُضِعَ، وَأَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ رَسُولُ الله (ﷺ)، أَرْسَلَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِلَى فُلاَنَةَ ـ امْرَأَةٍ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ ـ: (**مُرِي غُلاَمَكِ النَّجَّارَ، أَنْ يَعْمَلَ لِي أَعْوَاداً، أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذَا كَلَّمْتُ النَّاسَ**)، فَأَمَرَتْهُ، فَعَمِلَهَا مِنْ طَرْفَاءِ الغَابَةِ، ثُمَّ جاءَ بِهَا، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ الله (ﷺ)، فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ هَاهُنَا، ثُمَّ رَأَيْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) صَلَّى عَلَيْهَا وَكَبَّرَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ نَزَلَ القَهْقَرَى، فَسَجَدَ فِي أَصْلِ المِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ، فَلَمَّا فَرَغَ، أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا صَنَعْتُ هذَا لِتَأْتَمُّوا، وَلِتَعَلَّمُوا صَلاَتِي**).

[خ٩١٧ (٣٧٧)/ م٥٤٤].

**ژ ئەبی حازمێ كوڕێ دیناری (رحمه الله) گۆت: هندە زەلام هاتنە دەڤ سەهلێ كوڕێ ساعدی و د مینبەرێدا ب جرە چۆن و ژێك جودا بوون كا ژ چ دار هاتییە دورستكرن؟ ئینا پرسیارا وی ژ ڤێ چەندێ كر، گۆت: ب خودێ كەمە ئەز دزانم ئەو ژ چییە و من ئەو رۆژا ئێكێ هاتییە دانان و رۆژا ئێكێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر روینشتییە خوارێ دیت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هنارتە دویڤ فلانێرا، ژنەك بوو سەهلی ناڤێ وێ ئینا، (فەرمانا خزمەتكارێ خۆ یێ دارتاش بكە بۆ من تەختەكی چێكەت ل سەر روینمە خوارێ ئەگەر ئەز د گەل خەلكی ئاخفتم)، ئینا فەرمانا وی كر و ئەو ژ دارا تەرفا دارستانێ[1] چێ كر، پاشی ئەو مینبەر ئینا و بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هنارت و وی فەرمان دا، ئەها ل ڤێرێ هاتە دانان پاشی من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر دیت و نڤێژ**

(١) دارەكە ل چۆلستانێ شین دبیت دبێژنێ (ئەثول). و غابە جهەكە ل سەرێ مەدینەیێ ژ لایێ شامێڤە و چاردە میلان یا ژ مەدینەیێ دویرە.

**ل سەر کر، پاشی ل سەر چۆ رکوعێ پاشی پشت و پشت هات ل بن مینبەرێ چۆ سوجدێ پاشی زڤریڤە ڤێجا دەمێ ب دویماهی هاتی بەرێ خۆ دا خەلکی و گۆت: (گەلی خەلکی ب راستی من ب تنێ ئەڤە کر دا هوین چاڤ ل من بکەن و دا فێری نڤێژا من ببن).**

١١٩٠ - عَنْ عَبْدِ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَهْلُ مَكَّةَ يَقُولُونَ: أَخَذَ ابْنُ جُرَيْجٍ الصَّلاَةَ مِنْ عَطَاءٍ، وَأَخَذَهَا عَطَاءٌ مِنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، وَأَخَذَهَا ابْنُ الزُّبَيْرِ مِنْ أَبِي بَكْرٍ، وَأَخَذَهَا أَبُو بَكْرٍ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ) مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَحْسَنَ صَلاَةً مِنِ ابْنِ جُرَيْجٍ. [حم٧٣].

**ژ عەبدولرەزاقی (رحمه الله) گۆت: خەلکێ مەکەهێ دبێژن: ئیبن جورەیجی نڤێژا ژ عەتائی وەرگرتی، و عەتائی یا ژ ئیبن زوبەیری وەرگرتی، و ئیبن زوبەیری یا ژ ئەبوبەکری وەرگرتی، و ئەبوبەکری یا ژ پێغەمبەری (ﷺ) وەرگرتی، و من کەس نەدیتییە نڤیژا وی ژ یا ئیبن جورەیجی باشتر بیت.**

**٢ ـ باب: تعليم كيفية الصلاة.**

**بابەتێ: فێرکرنا چاوانییا کرنا نڤێژێ.**

١١٩١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ المسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَرَدَّ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْهِ السَّلاَمَ، فَقَالَ: (**ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ**)، فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: (**ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ**)، ثَلاَثاً، فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ! فَمَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ، فَعَلِّمْنِي، قَالَ: (**إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعاً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِماً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِساً، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِداً، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا**) [خ٧٩٣ (٧٥٧)/ م٣٩٧]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) هاتە د مزگەفتێڤە، و زەلامەك هات و نڤێژ کر و پاشی ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و سلاڤ کرێ، پێغەمبەری (ﷺ) سلاڤ لێ ڤەگێرا و گۆت: (بزڤرە نڤێژا خۆ بکە تە نڤێژ نەکر)، زڤری نڤێژ کر، پاشی هات سلاڤ کرە پێغەمبەری (ﷺ) سلاڤ لێ ڤەگێرا و گۆت: (بزڤرە نڤێژا خۆ بکە تە نڤێژ نەکر)، هەتا سێ جاران ئەڤە کری، ئینا گۆت: ئەز ب وی کەمە یێ تو ب راستییێ هنارتی ئەز ژ ڤێ پێڤەتر چو دی نوزانم، نیشا من بدە، گۆت: (ئەگەر تو رابوویە نڤێژێ تەکبیرا ئیحرامێ بکە، پاشی ئەوا بۆ تە ساناهی دبیت ژ قورئانێ بخوینە (سۆرەتا فاتیحە) پاشی**

**هەرە ركوعێ و بمینە هەتا ئارام دبی، پاشی رابە هەتا تو راست دبی و پاشی سوجدەیێ ببە هەتا د سوجدەیێدا ئارام دبی پاشی رابە هەتا تو روینشتی ئارام دبی پاشی سوجدەیێ ببە هەتا تو د سوجدەیێدا ئارام دبی پاشی ڤێ د هەمی نڤێژا خۆدا بکە).**

١١٩٢ - (خ) عَنْ مَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ اللَّيْثِيِّ: أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (ﷺ) يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلاَتِهِ، لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِداً. [خ٨٢٣].

**ژ مالكێ كورێ حوەیریسێ لەیسی (رضي الله عنه) وی پێغەمبەر (ﷺ) دیت نڤێژ دكر ڤێجا ئەگەر د ركعەتا كتدا با نەرادبووڤە هەتا روینشتی راست ببا.**

١١٩٣ - (خ) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَذَكَرْنَا صَلاَةَ النَّبِيِّ (ﷺ).

فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ: أَنَا كُنْتُ أَحْفَظَكُمْ لِصَلاَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)،... وذكر الحديث مختصراً. [خ٨٢٨].

ونص الترمذي: قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ اعْتَدَلَ قَائِماً، وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، وَرَكَعَ، ثُمَّ اعْتَدَلَ، فَلَمْ يُصَوِّبْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُقْنِعْ وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ أَهْوَى إِلَى الأَرْضِ سَاجِداً، ثُمَّ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ جَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ، وَفَتَخَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ اليُسْرَى وَقَعَدَ عَلَيْهَا، ثُمَّ اعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ أَهْوَى سَاجِداً، ثُمَّ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ، وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ كَبَّرَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ

حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، كَمَا صَنَعَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، ثُمَّ صَنَعَ كَذَلِكَ، حَتَّى كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي تَنْقَضِي فِيهَا صَلاَتُهُ، أَخَّرَ رِجْلَهُ اليُسْرَى، وَقَعَدَ عَلَى شِقِّهِ مُتَوَرِّكاً، ثُمَّ سَلَّمَ. [ت٣٠٤]

**ژ موحەممەدێ كوڕێ عەمری (ﷺ) ژ عەتائی: ئەو د ناڤ هندەك هەڤالێت پێغەمبەریدا (ﷺ) یێ روینشتی بوو و مە بەحسێ نڤێژا پێغەمبەری (ﷺ) كر.**

**ئینا ئەبو حومەیدێ ساعدی گۆت: ئەز ژ هەوە باشتر نڤێژا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دزانم و ئەو حەدیس ب كورتی گۆت.**

**و دەقێ ڤەگێرا ترمزی: گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر رابا نڤێژێ دا راست راوەستیت و دەستێت خۆ بلند دكرن هەتا ئینابانە ڕاستا ملێت خۆ و ئەگەر ڤیابا ڕكوعێ ببەت دا دەستێت خۆ هەتا ڕاستا ملێت خۆ بلندكەت پاشی دا بێژیت (**الله أكبر**) و ركوع دبر، پاشی دراوەستا هەتا پشتا وی راستبیا و ستۆیێ خۆ نەدچەماند و بلند نەكر یێ راست بوو د گەل پشتا وی و دەستێت خۆ ددانانە سەر چۆكێت خۆ، پاشی دگۆت: (**سمع الله لمن حمده**)[1] **و دەستێت خۆ بلندكرن و راست رادوەستا هەتا هەر هەستییەك دچۆ جهێ خۆ، پاشی دادكەڤتە عەردی سوجدە دبر، پاشی دگۆت: (**الله أكبر**) پاشی دەستێت خۆ ژ تەنشتێت خۆ دویر دئێخستن، و تلێت پێت خۆ ژێكڤە دكرن، پاشی پێ چەپێ خوار دكر دروینشتە سەر، پاشی دا خۆ راستكەت هەتا هەر هەستییەك چۆبا جهێ خۆ، پاشی دا چیتە سوجدێ، پاشی دا دبێژیت: (**الله أكبر**) پاشی هەردو پێت خۆ خواركەت و روینیتە سەر، و راست روینیت هەتا هەر هەستییەك بزڤریتە جهێ خۆ، پاشی دا رابیت، پاشی هەر ئەڤە د ركعەتا دووێدا دكر و ئەگەر ژ دو ركعەتێت دووێ رادبوو تەكبیر دكر و دەستێت خۆ بلند دكرن هەت هاتبانە راستا ملێت وی، هەروەكی د دەستپێكرنا نڤێژێدا**

(١) رامان: خودێ ژ وی قەبویل كر یێ سوپاسی و پەسنا وی كر.

**کری، پاشی ئەڤە دکر هەتا دگەهشتە رکعەتا نڤێژا وی تێدا ب دویماهی دهات پاشی پێ خۆ یێ چەپێ د بنڕا بر و دا روینیتە سەر کماخێت خۆ پاشی دا سلاڤێ ڤەدەت.**

١١٩٤ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَسْتَفْتِحُ الصَّلاَةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالقِرَاءَةَ بِالحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ، وَلكِنْ بَيْنَ ذلِكَ. وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِماً، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِساً، وَكَانَ يَقُولُ، فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، التَّحِيَّةَ. وَكَانَ يَفْرُشُ رِجْلَهُ اليُسْرَى، وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ اليُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ الشَّيْطَانِ، وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ الرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ، وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلاَةَ بِالتَّسْلِيمِ. [م٤٩٨]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ب تەکبیرێ دەست پێ دکر و ب خواندنا ﴿الحمد لله رب العالمين﴾ و ئەگەر رکوع بربا ستۆیێ خۆ بلند نەدکر و نزم نەدکر بەلێ د ناڤبەرا هەردووواندا بوو، و ئەگەر سەرێ خۆ ژ رکوعێ راکربا سوجدە نەدبر هەتا راست راوەستابا، و ئەگەر ژ سوجدەیێ رابا سوجدە نەدبر هەتا راست نەروینشتبا، و هەر دو رکعەتان تەحیات دخواند و پێ خۆ یێ چەپێ رادئێخستە بن خۆ، و پێ ڕاستێ د چکلاند، و پاشڤەلێدان ژ روینشتنا شەیتانی دکر[١] و پاشڤەلێدان ژ روینشتنا دەهبەی دکر[٢] و نڤێژا خۆ ب سلاڤێ ب دویماهی دئینا.**

١١٩٥ - (م) عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري قال: إِنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) خَطَبَنَا فَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلاَتَنَا، فَقَالَ: (**إِذَا صَلَّيْتُمْ؛ فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، ثُمَّ لْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ۝٧﴾، فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ الله، فَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ**)، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ، يَسْمَعُ الله لَكُمْ، فَإِنَّ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ (ﷺ): سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، وَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ؛ فَكَبِّرُوا وَاسْجُدُوا، فَإِنَّ الإِمَامَ يَسْجُدُ**

---

**(١) روینشتنا شەیتانی ئەوە: هەردو پێت خۆ بچکلینیت و ل سەر کماخێت خۆ روینیتە د ناڤبەرا هەردوویاندا و دەستێت خۆ بدەتە بەر خۆ.**

**(٢) روینشتنا دەهبەی ئەوە: دەستێت خۆ و زەندکێت خۆ بلند نەکەت و ل عەردی رایێخیت و ب عەردیڤە نیت.**

قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ)، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا كَانَ عِنْدَ القَعْدَةِ، فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لله. السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ. السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).
[م٤٠٤]

ژ ئەبو مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: ب ڕاستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتار بۆ مە خواند شەریعەت و دینێ مە بۆ مە ئاشکەرا کر، و نڤێژا مە نیشا مە دا و گۆت: **(ئەگەر هەوە نڤێژ کر ڕێزێت خۆ ڕاست بکەن، پاشی بلا ئێك ژ هەوە ئیمامەتییا هەوە بکەت، ڤێجا ئەگەر تەکبیر کر هوین ژی تەکبیرێ بکەن، و ئەگەر گۆت** ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ **هوین بێژن ئامین[1] خودێ دێ ژ هەوە وەرگریت، و ئەگەر تەکبیر کر و رکوع بر، تەکبیرێ بکەن و رکوعێ ببەن، و ب ڕاستی ئیمام بەری هەوە رکوعێ دبەت و بەری هەوە ژێ رادبیت)**، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(و ئەو گاڤا ئەو بەری هەوە دچیت ب وێ گاڤێیە یا هوین پشتی وی رادبن[2]، و ئەگەر گۆت:** (سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ) **بێژن:** (رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ)[3] **خودێ گوهـ ل هەوە هەیە ب ڕاستی خودایێ بلند ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەرێ خۆ دبێژیت:** (سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ) **و ئەگەر تەکبیر کر و سوجدە بر هوین تەکبیرێ بکەن و هەرنە سوجدێ ب ڕاستی ئیمام بەری هەوە دچیتە سوجدەیێ و بەری هەوە ژ سوجدەیێ رادبیت)**، و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(و ئەو گاڤا ئەو بەری هەوە دچیت ب وێ گاڤێیە یا هوین پشتی وی رادبن[4]، و ئەگەر گەهشتنە ڕوینشتنا دویماهییێ**

---

(١) ئانکو: یا خودێ ژ مە وەرگرە.

(٢) ئانکو: ئەو گاڤا ئەو بەری هەوە دچیتە رکوعێ ئەو گاڤا هوین پشتی رکوعا وی رادبن جهێ وێ دگریت و هۆسا رکوعا هەوە و یا وی هندی ئێکە.

(٣) ئانکو: یا خودێ دوعایا وی قەبویل بکە یێ سوپاسی و پەسنا تە دکەت.

(٤) ئانکو: ئەو گاڤا ئەو بەری هەوە دچیتە رکوعێ ئەو گاڤا هوین پشتی رکوعا وی رادبن جهێ وێ دگریت و هۆسا رکوعا هەوە و یا وی هندی ئێکە.

**بلا ئاخفتنا ئێكی ژ هەوە یا ئێكێ: (التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لله. السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ. السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ))(1).**

١١٩٦ - عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ قالَ: قُلْتُ: لأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ الله (ﷺ) كَيْفَ يُصَلِّي؟ قَالَ: فَقَامَ رَسُولُ الله (ﷺ) فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ، فَكَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا أُذُنَيْهِ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَلَمَّا سَجَدَ وَضَعَ رَأْسَهُ بِذَلِكَ المَنْزِلِ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ، ثُمَّ جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ اليُسْرَى وَوَضَعَ يَدَهُ اليُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ اليُسْرَى، وَحَدَّ مِرْفَقَهُ الأَيْمَنَ عَلَى فَخِذِهِ اليُمْنَى، وَقَبَضَ ثِنْتَيْنِ وَحَلَّقَ حَلْقَةً، وَرَأَيْتُهُ يَقُولُ: هَكَذَا، وَحَلَّقَ بِشْرٌ الإِبْهَامَ وَالوُسْطَى وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ.

[د٧٢٦، ٩٥٧/ ت٢٩٢/ ن٨٨٨/ جه٨٦٧/ مي١٣٩٧].

هذا لفظ أبي داود.

* صحيح.

**ژ وائلێ كوڕێ حوجری گۆت: من گۆت ب ڕاستی ئەز دێ بەرێ خۆ دەمە نڤێژا پێغەمبەری (ﷺ) كا چاوا نڤێژێ دكەت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڕابوو بەرێ خۆ دا قیبلەیێ، و تەكبیر كر، و دەستێت خۆ هەتا ڕاستا هەردو گوهێت خۆ بلندكرن، پاشی ب**

---

**(١) ڕامان: مان و مەزناتی هەمی و نڤێژ و عیبادەت هەمی ( چ ب گۆتن و چ ب كریار ) و ئاخفتنا جوان و كارێت چاك و ڕاست هەمی بۆ خودێ بن. سلاڤا پێشكێشی پێغەمبەران بووی و دلۆڤانی و فەنجی و بەرەكەتێت خودێ یێت زێدە ژی ل سەر تە بن هەی پێغەمبەرۆ، و سلاڤ ل سەر مە و بەندەیێت خودێ یێت كێرهاتی بن. ئەز شەهدە دەدەم كو ب ڕاستی چو پەرستی یێت ڕاست و دورست نینن خودێ نەبیت، و ئەز شەهدە دەدەم موحەممەد ب ڕاستی بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە.**

دەستێ راستێ دەستێ خۆ یێ چەپێ گرت، ڤێجا دەمێ ڤیای رکوعێ ببەت هەروەسا دەستێت خۆ بلندکرن، پاشی پانکا دەستێت خۆ دانانە سەر چۆکێت خۆ، و دەمێ سەرێ خۆ ژ رکوعێ راکری هەردو دەست وەسا بلندکرنەڤە، و دەمێ سوجدە بری سەرێ خۆ دانا جهێ د ناڤبەرا هەردو دەستێت خۆدا، پاشی روینشت و پێ خۆ یێ چەپێ دانا بن خۆ و دەستێ خۆ یێ چەپێ دانا سەر رانێ خۆ یێ چەپێ و سەرێ دەستێ وی یێ راستێ ل سەر رانێ راستێ بوو، و دو تلێت خۆ یا ڤلیچێ و یا ب رەخڤە گەهاندنە ئێگ و گرتن، و و یا نیڤێ و یا بەرانی کرنە خەلەك، و من دیت هۆ دگۆت: ئانکو نیشان پێ دکر، و بیشری تبلا خۆ یا نیڤێ و یا بەرانی کرنە خەلەك و نیشان ب یا شەهدێ کر.

٣ ـ باب: التكبير ورفع اليدين في الافتتاح وغيره.

**بابەتێ: تەکبیر و دەستبلندکرنا د دەستپێکرنا نڤێژێ و تشتێت دیدا.**

١١٩٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) إِذَا قَامَ فِي الصَّلاَةِ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ حِينَ يُكَبِّرُ لِلرُّكُوعِ، وَيَفْعَلُ ذَلِكَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَيَقُولُ: (**سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ**)، وَلاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ.

[خ٧٣٦ (٧٣٥)/ م٣٩٠].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ئەگەر رابا نڤێژێ دەستێت خۆ هەتا راستا ملێت خۆ بلندکرن و دەمێ د چۆ رکوعێ ئەڤە دکر و دەمێ سەرێ خۆ ژ رکوعێ رادکر ئەڤە دکر و دگۆت: (سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ) و د سوجدەیێدا ئەڤە نەدکر.

١١٩٨ - (ق) عَنْ أَبِي سَلَمة: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ صَلاَةٍ مِنَ المكْتُوبَةِ وَغَيْرِهَا، فِي رَمَضَانَ وَغَيْرِهِ، فَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ يَقُولُ: رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ قَبْلَ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ يَقُولُ: الله أَكْبَرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِداً، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِين يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الجُلُوسِ فِي الاِثْنَتَيْنِ، وَيَفْعَلُ ذلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ حَتَّى يَفْرُغَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ يَقُولُ حِينَ يَنْصَرِفُ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي لأَقْرَبُكُمْ شَبَهاً بِصَلاَةِ رَسُولِ الله (ﷺ)، إِنْ كَانَتْ هذِهِ لَصَلاَتَهُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. [خ٨٠٣ (٧٨٥)/ م٣٩٢]

**ژ ئەبی سەلەمەی (رحمه الله) گۆت: ب ڕاستی ئەبو هورەیرە د هەمی نڤێژاندا یێت فەرز و یێت دیدا د ڕەمەزانێدا و دەرڤەی وێدا تەکبیر دکر، دەمێ رادبو تەکبیر دکر، پاشی دەمێ رکوع دبر تەکبیر دکر، پاشی دگۆت: (سَمِعَ الله لِمَنْ حَمِدَهُ)، پاشی بەری سوجدێ ببەت دگۆت: (رَبَّنَا وَلَكَ الحَمْدُ)، پاشی دگۆت: (الله اكبر) دەمێ دادکەفت بچیتە سوجدەیێ، پاشی دەمێ ژ سوجدەیێ رادبوو تەکبیر دکر، پاشی دەمێ سوجدە دبر تەکبیر دکر، پاشی دەمێ ژ سوجدەیێ رادبوو تەکبیر دکر، پاشی دەمێ رادبوو ژ روینشتنا هەردو سوجدەیان تەکبیر دکر، و ل هەمی رکعەتان ئەڤە دکر هەتا ژ نڤێژێ ب دویماهی دهات، پاشی دەمێ ژ نڤێژێ دەردکەفت دگۆت: ئەز ب وی کەمە یێ گیانێ من د دەستێ ویدا ئەڤ نڤێژا من ژ یا هەوە هەمیان نێزیکترە بۆ نڤێژا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و نڤێژا وی یا هۆسا بوو هەتا ژ دنیایێ دەرکەفتی.**

١١٩٩ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ. [د٧٤٣]

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ژ هەردو رکعەتان رابا تەکبیر دکر و دەستێت خۆ بلندکرن.**

## ٤ ـ باب: وضع اليدين في الصلاة.

**بابەتێ: دانانا هەردو دەستان د نڤێژێدا.**

١٢٠٠ - (خ) عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُؤمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلاَةِ. قَالَ أَبُو حَازِمٍ: لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ يَنْمِي ذلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ). [خ٧٤٠].

**ژ ئەبی حازمی (رضي الله عنه) ژ سەهلێ كورێ سەعدی گۆت: فەرمانا خەلكی دهاتە كرن ئەو دەستێ خۆ یێ راستێ داننە سەر زەندكا دەستێ چەپێ د نڤێژێدا. ئەبو حازمی گۆت: دزانم وی ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دزڤراند.**

١٢٠١ - عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَؤُمُّنَا فَيَأْخُذُ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ. [ت٢٥٢/ جه٨٠٩]

* حسن صحيح.

**ژ قەبیسەیێ كورێ هولبی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پێشنڤێژی بۆ مە دكر و دەستێ خۆ یێ چەپێ ب دەستێ خۆ یێ راستێ دگرت.**

١٢٠٢ - عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَضَعُ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ يَشُدُّ بَيْنَهُمَا عَلَى صَدْرِهِ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ. [د٧٥٩]

* صحيح مرسل.

**ژ تاووسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ خۆ یێ راستێ ددانا سەر دەستێ خۆ یێ چەپێ پاشی ل سەر سینگێ خۆ د ناڤبەرا واند دگڤاشت.**

## ٥ ـ باب: ما يقول بين تكبيرة الإحرام والقراءة.

**بابەتێ: ئەوا د ناڤبەرا تەكبیرا ئیحرامێ و خواندنێدا دهێتە گۆتن.**

١٢٠٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً. قَالَ أَحْسِبُهُ قَالَ: هُنَيَّةً. فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ الله! إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالقِرَاءَةِ، مَا تَقُولُ؟ قَالَ:

(أَقُولُ: اللَّهُمَّ! بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ، كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ! نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ! اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ).

[خ٧٤٤/ م٥٩٨]

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤبەرا تەکبیرێ و خواندنێدا راوەستیانەکێ رادوەستا، گۆت: یا ژ منڤە گۆت کێمەکێ، من گۆت: دەیك و بابێت من قوربانی تە بن ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بێدەنگییا تە د ناڤبەرا تەکبیر و خواندنێدا تو چ دبێژی؟ گۆت: **(ئەز دبێژم: یا خودێ د ناڤبەرا من و گونەهێت مندا دویر بێخە، هەروەکی تە مابەینا رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ دویرئێخستی. یا خودێ من ژ گونەهان پاقژ بکە، هەروەکی کراسێ سپی ژ قرێژێ دئێتە پاقژکرن، یا خودێ گونەهێت من ب ئاڤێ و بەفرێ و تەرگێ بشۆ).**

١٢٠٤ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، إِذْ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: اللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً، وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيراً، وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنِ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا)**؟ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(عَجِبْتُ لَهَا، فُتِحَتْ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ)**.

[م٦٠١]

قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فما تركتهنَّ منذُ سمعتُ رسولَ الله (ﷺ) يقول ذلك.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: د دەمەکیدا مە نڤێژ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دکر، زەلامەکی ژ خەلکێ گۆت: من خودایێ مەزن مەزن دانا و هەمی سوپاسی بۆ خودێ سوپاسییەکا گەلەك، پاك و پاقژی ژ هەمی کێماسییان سپێدە و**

**ئێڤاران (ئانكو هەمی دەمان) بۆ خودێ بن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كی بوو ئەڤ ئاخفتنە و ئەڤ ئاخفتنە گۆتی)؟ ئێكی ژ وی خەلكی گۆت: (ئەز بووم ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت، ئەز لێ حێبەتی بووم دەرگەهێت عەسمانی بۆ ڤەبوون).**

**ئیبن عومەر گۆت: ئەڤە من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بووی ئەو دگۆت من ئەو نەهێلاینە.**

١٢٠٥ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ قَالَ: (**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ**).[د٧٧٥/ ت٢٤٢/ ن٨٩٨/ جه٨٠٤/ مي١٢٧٥]

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری: پێغەمبەری (ﷺ) دەمێ نڤێژ دەست پێ دكر دگۆت: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ) ئەز تە ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم یا خودێ، و ب هاریكارییا تە، بەرەكەتا ناڤێت تە زێدەبوو ( هەمی خێر دبیت، پێ ناڤێ تە ئینا) و مەزناتییا تە سەركەفت و ژ بلی تە چو خودێ نینن.**

٦ ـ باب: قراءة الفاتحة في كل ركعة.

**بابەتێ: خواندنا فاتحەیێ د هەمی ركعەتاندا.**

١٢٠٦ - (ق) عَنْ عُبَادَةَ بنِ الصَّامِتِ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ**). [خ٧٥٦/ م٣٩٤]

**ژ عوبادەیێ كورێ سامتی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نڤێژ بۆ وی نینە یێ فاتیحەیێ نەخوینیت).**

١٢٠٧ - (ق) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما، كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الصَّلاَةَ: بِالحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِينَ. [خ٧٤٣/ م٣٩٩].

- زاد في رواية مسلم: لا يذكرون ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ في أول قراءة، ولا في آخرها.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) و ئەبوبەكری و عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) نڤێژ ب ﴿الحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِينَ﴾ دەست پێ دكرن.**

- و موسلمی د ڤەگێرەكێدا زێدەكرییە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ نە ل دەستپێكا خواندنێ و نە ل دویماهییا وێ نەدگۆت.

١٢٠٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ؛ فَهِيَ خِدَاجٌ) ثَلاَثاً، غَيْرُ تَمَامٍ. فَقِيلَ لأَبِي هُرَيْرَةَ: إِنَّا نَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ، فَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (قَالَ الله تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ العَبْدُ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ٢﴾، قَالَ الله تَعَالَى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ٣﴾، قَالَ الله تَعَالَى: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ٤﴾، قَالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي. وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي.، فَإِذَا قَالَ: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ٥﴾، قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ٧﴾، قَالَ: هَذَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ). [م٣٩٥]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سێ جارا گۆت: **(هەر كەسێ نڤێژەكێ بكەت فاتیحەیێ تێدا نەخوینیت ئەو یاكێمە، یا تەمام نینە)**، گۆتنە ئەبی هورەیرە: ئەرێ ئەم ل پشت ئیمامی هەر بخوینین؟ ئینا گۆت: بەلێ بۆ خۆ بخوینە، چونكی من گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بوو دگۆت: **(خودایێ مەزن دبێژیت: من نڤێژ د ناڤبەرا خۆ و بەندەیێ خۆدا یا ب نیڤی كری، و بەندەیێ من چ بخوازیت دێ دەمێ، ڤێجا ئەگەر بەندەی گۆت ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ خودێ دێ بێژیت: بەندەیێ من شوكور و سوپاسییا من كر، و ئەگەر گۆت ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ خودێ دێ بێژیت: بەندەیێ من پەسن و مەدحێت من كرن، و ئەگەر گۆت: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ خودێ دێ بێژیت: بەندەیێ من ئەز مەزن و خودان دەستهەلات دانام. و ئەگەر گۆت: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ**

**﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خودێ دێ بێژیت: ئەڤە د ناڤبەرا من و بەندەیێ مندایە، و بەندەیێ من چ بخوازیت دێ دەمێ. و ئەگەر گۆت ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ خودێ دێ بێژیت: ئەڤە بۆ بەندەیێ منە، و كا بەندەیێ من چ بخوازیت ئەز دێ دەمێ).**

١٢٠٩ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا نَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ خَلْفَ الإِمَامِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ، بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَفِي الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ. [جه٨٤٣]

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: مە د نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاریدا ل پشت ئیمامی د هەردو ركعەتێت ئێكێدا فاتیحە و سۆرەتەك دخواند، و د هەردو ركعەتێت دویماهییێدا مە فاتیحە ب تنێ دخواند.**

**٧ ـ باب: الجهر والإسرار في الصلاة.**

**بابەتێ: خواندنا ب دەنگ و بێدەنگ د نڤێژێدا.**

١٢١٠ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِيمَا أُمِرَ، وَسَكَتَ فِيمَا أُمِرَ، ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ [مريم:٦٤]، ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١].
[خ٧٧٤]

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەوا فەرمانا پێغەمبەری (ﷺ) یا پێ هاتییە كرن ب دەنگ بخوینیت ب دەنگ یا خواندی، و ئەوا فەرمانا وی پێ هاتییە كرن بێ دەنگ بیت بێدەنگ بوو ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾.**

١٢١١ - عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا فَاتَهُ شَيْءٌ مِنَ الصَّلاَةِ مَعَ الإِمَامِ فِيمَا جَهَرَ فِيهِ الإِمَامُ بِالقِرَاءَةِ، أَنَّهُ إِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ قَامَ عَبْدُ الله بْنُ عُمَرَ فَقَرَأَ لِنَفْسِهِ فِيمَا يَقْضِي وَجَهَرَ. [ط١٨١]

* إسناده صحيح.

**ژ مالكی (رحمه الله) ژ نافعی: عەبدوللایێ كوڕێ عومەری ئەگەر تشتەك ژ نڤێژێ د گەل ئیمامی ژێ چۆبا ژ وێ یا ئیمام دەنگێ خۆ پێ بلند دكەت، دەمێ ئیمامی سلاڤ ڤەددا، ئیبن عومەر رادبوو ئەوا ژێ دچۆ بۆ خۆ دخواند و ب دەنگ بلندی.**

## ٨ . باب: التأمين.

## بابەتێ: گۆتنا ئامین.

١٢١٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ المَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ).**

وَقَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقُولُ: (آمِينَ). [خ٧٨٠/ م٤١٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئیمامی گۆت ئامین هوین ژی بێژن ئامین، چونكی ب راستی یێ ئامینا وی بكەڤیتە د گەل ئامینا ملیاكەتان گونەهێت وی یێت بۆرین هەمی ژێ چۆن).**

**و ئیبن شیهابی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (ئامین).**

١٢١٣ - عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِذَا قَرَأَ: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، قَالَ: (آمِينَ)، وَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ. [د٩٣٢/ ت٢٤٨/ جه٨٥٥/ مي١٢٨٣]

- ولفظ الترمذي: وَمَدَّ بِهَا صَوْتَهُ.

* صحيح.

**ژ وائلێ كوڕێ حەجەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ خواندبا دگۆت: ئامین و دەنگێ خۆ پێ بلند دكر.**

- **و دبێژەیا ترمزیدا: و دەنگێ خۆ پێ درێژ دكر.**

## ٩ ـ باب: القراءة في صلاة الصبح.

## بابەتێ: خواندنا د نفێژا سپێدێدا.

١٢١٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَرَأَ فِي رَكْعَتَي الفَجْرِ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، وَ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾. [م٧٢٦]

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ د هەردو رکعەتێت سپێدێدا دخواندن.**

١٢١٥ - (م) عن ابْنِ عَبَّاسٍ قال: كانَ رَسولُ اللهِ (ﷺ) يَقْرَأُ في رَكْعَتَيِ الفَجْرِ: ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾[البقرة:١٣٦]، وَالَّتي في آلِ عِمْرَانَ[٦٤]: ﴿تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءِۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾. [م٧٢٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د هەردو رکعەتێت سپێدێدا ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا﴾ و ﴿تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءِۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ دخواندن.**

١٢١٦ - عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ المعَوِّذَتَيْنِ، قَالَ عُقْبَةُ: فَأَمَّنَا بِهِمَا رَسُولُ الله (ﷺ) فِي صَلاَةِ الفَجْرِ. [ن٩٥١].

* صحيح.

**ژ عوقبەیێ کورێ عامری (ﷺ) وی پرسیارا مەعوزاتان ژ پێغەمبەری (ﷺ) کر، عوقبەی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د نفێژا سپێدێدا ب وان هەردووان ئیمامەتی بەراهییا مە کر.**

١٢١٧ - عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ الله الجُهَنِيِّ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ جُهَيْنَةَ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ [الزلزلة] فِي الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا، فَلاَ أَدْرِي أَنَسِيَ رَسُولُ الله (ﷺ)، أَمْ قَرَأَ ذَلِكَ عَمْداً. [د٨١٦]

* حسن.

**ژ مەعازێ کورێ عەبدوللایێ جوهەنی: گۆت: زەلامەکی ژ جوهەینە گۆتە وی: وی گوهـ ل پێغەمبەری (ﷺ) بوو د نڤێژا سپێدێدا ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ د هەردو رکعەتاندا دخواند، ڤێجا ئەز نوزانم ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژبیر کر یان ژی ژ مەبەست وەکر.**

## ١٠ ـ باب: القراءة في الظهر والعصر.

## بابەتێ: خواندنا د نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاریدا.

١٢١٨ - (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ، بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَيُسْمِعُ الآيَةَ أَحْيَاناً، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي العَصْرِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ. [خ٧٥٩/ م٤٥١]

**ژ ئەبی قەتادەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د هەردو رکعەتێت ئێکێدا ژ نڤێژا نیڤرۆ فاتحە و دو سۆرەت دخواندن، د یا ئێکێدا درێژ دکر و د یا دووێدا کورت دکر، و هندە جاران دەنگێ خۆ ب ئایەتێ گوهـ لێ دکر، و نڤێژا ئێڤاری فاتحە و دو سۆرەت دخواندن و د یا ئێکێدا درێژ دکر، و د رکعەتا ئێکێدا د نڤێژا سپێدێدا درێژ دکر و د یا دووێدا کورت دکر.**

١٢١٩ – عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالعَصْرِ بِـ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ۝١﴾، وَ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ۝١﴾، وَنَحْوِهِمَا مِنَ السُّوَرِ. [د٨٠٥/ ت٣٠٧/ ن٩٧٨/ مي١٣٢٧]

* حسن صحيح.

**ژ جابرێ کوڕێ سەمورەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د نڤێژا نیڤرۆ و یا ئێڤارێدا ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ﴾ و ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ﴾ و وەکی وان ژ سۆرەتان دخواند.**

## ١١ ـ باب: القراءة في المغرب.

## بابەتێ: خواندنا د نڤێژا مەغرەبدا.

١٢٢٠ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أُمَّ الفَضْلِ سَمِعَتْهُ، وَهْوَ يَقَرَأُ: ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾[المرسلات]، فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ! وَاللهِ! لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقَرَاءَتِكَ هذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لآخِرُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ الله (ﷺ) يَقْرَأُ بِهَا فِي المَغْرِبِ. [خ٧٦٣/ م٤٦٢]

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) وی گۆت: ئوم فەزلی گوه ل وی بوو وی ﴿وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا﴾ دخواند، ئینا گۆت: ئەی کوڕێ من ب خودێ! خواندنا تە یا ڤێ سۆرەتێ بیرا من ئینا، ئەو دویماهی سۆرەت بوو من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بووی (ﷺ) د نڤێژا مەغرەبدا دخواند.**

١٢٢١ – (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) قَرَأَ فِي المَغْرِبِ بِـ: ﴿ٱلطُّورِ﴾.

[خ٧٦٥/ م٤٦٣]

**ژ جوبەیرێ کوڕێ موتعمی (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د نڤێژا مەغرەبدا ﴿ٱلطُّورِ﴾ دخواند.**

## ١٢ ـ باب: القراءة في العشاء.

## بابەتێ: خواندنا د نڤێژا عەیشادا.

١٢٢٢ - (ق) عَنِ البَرَاءِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ فِي سَفَرٍ، فَقَرَأَ فِي العِشَاءِ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، بِـ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾. [خ٧٦٧/ م٤٦٤]

- وزاد في رواية لهما: فَمَا سَمِعْتُ أَحَداً أَحْسَنَ صَوْتاً، أَوْ قِرَاءَةً مِنْهُ. [خ٧٥٤٦]

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) د وەغەرەکێدا بوو و د ئێك ژ دو رکعەتێت عەیشادا ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾ خواند.**

- **و د ڤەگێرەکا واندا زێدەکرییە: من کەس نەدیتییە دەنگێ وی خۆشتر یان خواندنا وی ژ یا وی باشتر.**

١٢٢٣ - عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَقْرَأُ فِي العِشَاءِ الآخِرَةِ بِـ: ﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا﴾، وَنَحْوِهَا مِنَ السُّوَرِ. [ت٣٠٩/ ن٩٨٨]

* صحيح.

**ژ بورەیدەی (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د نڤێژا عەیشادا ﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا﴾ و سۆرەتێت هندی وێ ژ سۆرەتان دخواند.**

## ١٣ ـ باب: صفة الركوع والسجود والاعتدال.

## بابەتێ: سالۆخەتا ركوع و سەجدەیێ و خۆراستكرنێ.

١٢٢٤ - (ق) عَنِ البَرَاءِ قَالَ: كَانَ رُكُوعُ النَّبِيِّ (ﷺ) وَسُجُودُهُ، وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ، مَا خَلاَ القِيَامَ وَالقُعُودَ، قَرِيباً مِنَ السَّوَاءِ. [خ٧٩٢/ م٤٧١].

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) گۆت: ركوع و سوجدەیا پێغەمبەری (ﷺ) و ناڤبەرا هەردو سوجدان و دەمێ ژ ركوعێ رادبوو دەمێ وان ژ بلی راوەستیان و روینشتنێ نێزیكی ئێك بوون.**

١٢٢٥ - (م) عَنِ البَرَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(إِذَا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفَّيْكَ وَارْفَعْ مِرْفَقَيْكَ)**. [م٤٩٤].

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر تە سوجدە بر لەپێت خۆ دانە و زەندكێت خۆ بلند بكە).**

١٢٢٦ - (م) عَنِ العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المُطَّلِبِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: **(إِذَا سَجَدَ العَبْدُ سَجَدَ مَعَهُ سَبْعَةُ أَطْرَافٍ: وَجْهُهُ، وَكَفَّاهُ، وَرُكْبَتَاهُ، وَقَدَمَاهُ)**. [م٤٩١].

**ژ عەباسێ كورێ عبدولموتتەلبی (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەگەر بەندەی سوجدە بر حەفت ئەندام د گەل وی سوجدەیێ دبەن: ناڤچاڤێت وی و هەردو دەستێت وی و هەردو چۆكێت وی و هەردو پێت وی).**

١٢٢٧ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الكَلْبِ)**. [خ٨٢٢ (٢٤١)/ م٤٩٣]

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (د سوجدەیێدا خۆ راست بكەن و كەس ژ هەوە بلا دەستێت خۆ نەرائێخیت رائێخستنا سەی)[1].**

١٢٢٨ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ ـ رَفَعَهُ ـ قَالَ: **(إِنَّ اليَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الوَجْهُ، فَإِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ فَلْيَضَعْ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ فَلْيَرْفَعْهُمَا)**. [د٨٩٢/ ن١٠٩١]

* صحيح.

---

(١) ئانكو: زەندكێت خۆ ب عەردی نەڤەنیت.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) بلندكەتە، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی هەردو دەست سوجدەیێ دبەن هەروەكی ناڤچاڤ سوجدەیێ دبەن، ڤێجا ئەگەر ئێكی ژ هەوە ناڤچاڤێت خۆ دانان بلا هەردو دەستێت خۆ ژی دانیت، و ئەگەر ناڤچاڤێت خۆ راكرن بلا هەردو دەستان ژی راكەت).**

١٢٢٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَقْرَمَ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَكُنْتُ أَرَى عُفْرَةَ إِبْطَيْهِ إِذَا سَجَدَ. [ت٢٧٤/ ن١١٠٧/ جه٨٨١].

هذا لفظ النسائي.

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ ئەفرەمی (ﷺ) گۆت: من نڤێژ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر و من سپییاتییا بنكەفشێت وی ددیت دەمێ دچۆ سوجدەیێ.**

**و ئەڤە بێژەیا نەسائییە.**

١٢٣٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ؛ فَلاَ يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ، وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ**). [د٨٤٠/ ن١٠٩٠/ مي١٣٦٠]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە چۆ سوجدەیێ بلا نەداچەمیێت هەر وەكی حێشتر دداچەمیێت و بلا هەردو دەستێت خۆ بەری چۆكێت خۆ دانیت)[1].**

١٢٣١ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ أَسْوَأَ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسْرِقُ صَلاَتَهُ**)، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَيْفَ يَسْرِقُهَا؟ قَالَ: (**لاَ يُتِمُّ رُكُوعَهَا، وَلاَ سُجُودَهَا**). [حم١١٥٣٢]

* حديث حسن.

---

(١) هەمی زانا ئێك بۆچۆنن ژ بلی ئیبن حەزمی نڤێژ یا دورستە چ دەستان بەرای دانیت چ ژی چۆكان، بەلێ جودابوون یا هەی كا كیژ باشترە دەستان بەری دانیت یان چۆكان؟ جمهورێ زانایان ژ حەنەفی و شافعی و حەنبەلییان د گەل هندێنە باشترە چۆكان بەری دەستان دانیت، و ل دەڤ مالكییان و ئەوزاعی و ئەحمەد د بۆچۆنەكێدا باشتر ئەوە دەستان بەری چۆكان دانیت و ل دەڤ من بۆچۆنا جمهوری بهێزترە.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خرابترینێ خەلكێ د دزییێدا ئەوە یێ نڤێژا خۆ ددزیت)**، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چاوا نڤێژێ ددزیت؟ گۆت: **(ركوع و سوجدەیا وێ دورست نابەت)**.

## ١٤ ـ باب: فضل السجود.

## بابەتێ: خێرا سوجدەیێ.

١٢٣٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: **(أَقْرَبُ مَا يَكُونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ)**. [م٤٨٢]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(جهێ پتری هەمیان بەندە تێدا نێزیكی خودێ ئەو دەمە ئەو تێدا د سوجدەیێدا، ڤێجا گەلەك دوعایان تێدا بكەن)**.

١٢٣٣ - (م) عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الأَسْلَمِيِّ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ)، فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوئِهِ وَحَاجَتِهِ، فَقَالَ لِي: **(سَلْ)**، فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الجَنَّةِ، قَالَ: **(أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ)** ؟ قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: **(فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ)**. [م٤٨٩].

ژ رەبیعەیێ كورێ كەعبێ ئەسلەمی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ب شەڤ دمامە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) من ئامانێ دەستنڤێژشویشتنا وی و دەستئاڤا وی بۆ دئینا، ئینا گۆتە من: **(ژ من بخوازە)**، من گۆت: ئەز داخوازا هەڤالینییا تە دكەم د بەحەشتێدا، گۆت: **(ژ بلی ڤێ)**؟ من گۆت: ئەز داخوازا هەڤالینییا تە دكەم د بەحەشتێدا، گۆت: **(ژ بلی ڤێ)**؟ من گۆت: هەر ئەوە. ئینا گۆت: **(پا هاریكارییا من ل سەر خۆ بكە ب گەلەك سوجدەیان)**.

١٢٣٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(تَأْكُلُ النَّارُ ابْنَ آدَمَ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ الله عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ)**. [جه٤٣٢٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئاگر مرۆڤی دسۆژیت جهێ سوجدەیێ ژێ نەبیت خودێ ل سەر ئاگری یێ حەرامکری ئەو جهێ سوجدەیێ بسۆژیت).**

**١٥ ـ باب: ما يقول في الركوع والسجود.**

**بابەتێ: ئەوا د رکوع و سوجدەیاندا دبێژیت.**

١٢٣٥- (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: (**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي**). يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ. [خ٨١٧ (٧٩٤)/ م٤٨٤]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زێدە د رکوع و سوجدەیا خۆدا دگۆت: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي) ئەز تە ژ هەمی کێماسییان پاك و پاقژ دکەم یا خودێ، و ب هاریکارییا تە، یا خودێ گونەهێت من ژێ ببە، ئەو وێ دکەت ئەوا د قورئانێدا فەرمانا وی پێ هاتییە کرن[1].**

١٢٣٦ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ قَالَ: فَانْتَبَهَ رَسُولُ الله (ﷺ) مِنَ اللَّيْلِ... فَذَكَرَ الحَدِيثَ قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ، قَالَ: فَرَأَيْتُهُ قَالَ فِي رُكُوعِهِ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ**)، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَحَمِدَ الله مَا شَاءَ أَنْ يَحْمَدَهُ، قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ، قَالَ: فَكَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى**)، قَالَ: ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، قَالَ: فَكَانَ يَقُولُ فِيمَا بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: (**رَبِّ! اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي وَارْفَعْنِي، وَارْزُقْنِي وَاهْدِنِي**). [حم٣٥١٤]

* حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەز ب شەڤ مامە ل دەڤ خالەتا خۆ مەیموونەیێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ب شەڤ هشیار بوو و فەرمووده گۆت، گۆت: پاشی چۆ رکوعێ گۆت: ئینا من دیت د رکوعێدا یێ دبێژیت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ العَظِيمِ) پاکی و پاقژی بۆ خودایێ من یێ مەزن بن، پاشی سەرێ خۆ بلند کر و پەسنا خودێ کر هندی**

(١) ئاماژەیە بۆ گۆتنا خودێ: ( فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ). ئانکو: خودێ ژ هەمی کێماسییان بشۆ، و سوپاسی و شوکرا خۆ بۆ دیارکە، و داخوازا لێبۆرینێ ژێ بکە.

**خودێ ڤیای پەسنا وی بكەت، گۆت: پاشی چۆ سوجدەیێ، گۆت: و وی د سوجدەیا خۆدا دگۆت: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى) پاكی و پاقژی بۆ خودایێ من یێ بلندترین، گۆت: پاشی سەرێ خۆ بلند كر، گۆت: و وی د ناڤبەرا هەردو سوجدەیاندا دگۆت: (رَبِّ! اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَاجْبُرْنِي وَارْفَعْنِي، وَارْزُقْنِي وَاهْدِنِي) یا خودێ گونەهێت من ژێ ببە، و دلۆڤانییێ ب من ببە، و كێم و كاسێت من چارەسەر بكە و بهایێ من بلند بكە و رزقێ من بدە و من راستەرێ بكە..**

١٦ . باب: النهي عن قراءة القرآن في الركوع والسجود.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ قورئان خواندنێ د ركوع و سوجدەیێدا.**

١٢٣٧ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ الله (ﷺ) السِّتَارَةَ، وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ؛ أَلاَ وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعاً أَوْ سَاجِداً، فَأَمَّا الرُّكُوعُ؛ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ عزّ وجل، وَأَمَّا السُّجُودُ؛ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ**). [م٤٧٩]

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پەردە راكر و خەلك ل پشت ئەبوبەكری رێز رێز بوون، ئینا گۆت: **(گەلی مرۆڤان ب راستی ژ مزگینییێت پێغەمبەراتییێ ژ خەونا باش و راست پێڤەتر نەمایە، موسلمان ب خۆ ببینیت یان پێڤە بهێتە دیتن، و بزانن پاشڤەلێدانا من یا هاتییە كرن ئەز قورئانێ د ركوعێدا یان د سوجدەیێدا بخوینم، ڤێجا هندی ركوعە خودایێ هەر مەزن و ب هێز تێدا مەزن بدانن، و هندی سوجدەیە خەما دوعاكرنێ تێدا بخۆن، ب راستی هەژییە ژ هەوە بهێتە قەبویلكرن).**

## ١٧ ـ باب: ما يقول إذا رفع من الركوع.

## بابەتێ: کا دێ چ بێژیت ئەگەر ژ رکوعێ رابوو.

١٢٣٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا قَالَ الإِمَامُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ المَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ**). [خ٧٩٦/ م٤٠٩]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئیمامی گۆت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) خودێ بەرسڤا وی دا، یێ شوکرا وی کر، هوین بێژن: (اللَّهُمَّ! رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ) ئەی خودا خودایێ مە سوپاسی هەمی بۆ تەیە، ب راستی یێ ئاخفتنا وی کەفتە د گەل ئاخفتنا ملیاکەتان گونەهێت وی یێت چۆیی هەمی ژێ چۆن).**

١٢٣٩ - (م) عَنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِذَا رَفَعَ ظَهْرَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَاوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءُ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ**). [م٤٧٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ ئەبی ئەوفای (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر پشتا خۆ ژ رکوعێ راکربا دگۆت: (خودێ بەرسڤا وی دا، یێ شوکرا وی کر، خودایێ مە سوپاسی هەمی بۆ تەیە، سوپاسییەکا تژی عەسمانان و تژی عەردی و تژی تشتێ تە پشتی ڤێ بڤێت).**

## ١٨ ـ باب: صفة الجلوس في الصلاة.

## بابەتێ: سالۆخەتا روینشتنێ د نڤێژێدا.

١٢٤٠ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَبدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ يَرَى عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما يَتَرَبَّعُ فِي الصَّلاَةِ إِذَا جَلَسَ، فَفَعَلْتُهُ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ، فَنَهَانِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَقَالَ: إِنَّمَا سُنَّةُ الصَّلاَةِ أَنْ تَنْصِبَ رِجْلَكَ اليُمْنَى، وَتَثْنِي اليُسْرَى، فَقُلْتُ: إِنَّكَ تَفْعَلُ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ رِجْلَيَّ لاَ تَحْمِلاَنِي.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ هەمیان رازی بیت) گۆت: من عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) دیت چارمیكێ خۆ د نڤێژێدا دكر ئەگەر روینشتبا[1] و من ژی وەكر و ئەز وی دەمی یێ بچویك بووم، ئینا عەبدوللایێ كوڕێ عومەری ئەز پاشڤەلێدام و گۆت: ب راستی سونەت بەس ئەوە تو پێ خۆ یێ راستێ بچكلینی و یێ چەپێ خواركەی رائێخی، من گۆت: پا تو وەدكەی؟ گۆت: پێت من خۆ نادەنە بەر من[2].**

١٢٤١ - (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِذَا قَعَدَ فِي الصَّلَاةِ، جَعَلَ قَدَمَهُ الْيُسْرَى بَيْنَ فَخِذِهِ وَسَاقِهِ، وَفَرَشَ قَدَمَهُ الْيُمْنَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ.

- زاد النسائي: لاَ يُجَاوِزُ بَصَرُهُ إِشَارَتَهُ. وهي عند أبي داود. [د٩٩٠]

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر د نڤێژێدا روینشتبا، پێ خۆ یێ چەپێ دبرە د ناڤبەرا رانێ خۆ و باقێ پێ خۆدا، و پێ خۆ یێ راستێ رادئێخستە بن خۆ و دەستێ خۆ یێ چەپێددانا سەر رانێ خۆ یێ چەپێ و دەستێ خۆ یێ راستێ ددانا سەر رانێ خۆ یێ راستێ و ب تلا خۆ نیشان دكر.**

- **و نەسائی زێدەكرییە: و چاڤێ وی ژ نیشانا وی نەدبۆری. و ئەڤە یا ل دەڤ ئەبو داوودی ژی.**

١٢٤٢ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ، وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الْيُمْنَى الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ، فَدَعَا بِهَا، وَيَدُهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، بَاسِطُهَا عَلَيْهَا. [م٥٨٠]

(١) **چار میك نەوە ل سەر كماخێت خۆ روینیت و پێ چەپێ ب سەر یێ راستێڤە ببەت و یێ چەپێ بن یێ راستێڤە ببەت یان بەروڤاژی و ل سەر وان روینیتە خوارێ.**

(٢) **ژ نەخۆشییێ یان ژ لاوازییێ یان ژ دانعومرییێ.**

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر د نڤێژێدا روینشتبا دەستێت خۆ ددانانە سەر چۆكێت خۆ و تلا خۆ یا ب رەخ یا بەرانیڤە بلند دكر و دوعا پێ دكر (تەحیات پێ دخواند) و دەستێ وی یێ چەپێ ل سەر چۆكێ وی یێ چەپێ بوو و یێ ڤەكری بوو.

١٩ ـ باب: التشهد.

**بابەتێ: تەحیاتێ.**

١٢٤٣ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ القُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: (**التَّحِيَّاتُ المُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لله. السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ الله الصَّالِحِينَ. أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، وأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله**). [م٤٠٣]

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تەحیات نیشا مە ددا كا چەوا سۆرەتەك ژ قورئانێ نیشا مە ددا و دگۆت: (**مان و مەزناتی هەمی و نڤێژ و عیبادەت هەمی (چ ب گۆتن، چ ب كریار) و ئاخفتنا جوان و كارێت چاك و راست هەمی بۆ خودێ بن. سلاڤا پێشكێشی پێغەمبەران بووی و دلۆڤانی و قەنجی و بەرمكەتێت خودێ بێت زێدە ژی ل سەر تە بن هەی پێغەمبەرۆ و سلاڤ ل سەر مە و بەندەیێت خودێ یێت كێرهاتی بن. ئەز شەهدە ددەم كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و ئەز شەهدە ددەم موحەممەد ب راستی پێغەمبەرێ وییە**).

١٢٤٤ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُخْفِيَ التَّشَهُّدَ. [د٩٨٦/ ت٢٩١]

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) ژ سونەتێیە تەحیات ب دەنگێ نزم بهێتە خواندن.

**٢٠ ـ باب: الصلاة على النبي (ﷺ) بعد التشهد.**

**بابەتێ: دانا سەلەواتان ل سەر پێغەمبەری (ﷺ) پشتی تەحیاتێ.**

١٢٤٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ فَقَالَ: أَلاَ أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً سَمِعْتُهَا مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَقُلْتُ: بَلَى، فَأَهْدِهَا لِي، فَقَالَ: سَأَلنَا رَسُولَ الله (ﷺ) فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ الله! كَيْفَ الصَّلاَةُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ البَيْتِ، فَإِنَّ الله قَدْ عَلَّمَنَا كَيْفَ نُسَلِّمُ عَلَيْكُمْ؟ قَالَ: (**قُولُوا: اللَّهُمَّ! صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. اللَّهُمَّ! بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كما بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ**).

[خ٣٣٧٠/ م٤٠٦].

**ژ عەبدولرەحمانێ کورێ ئەبی لەیلا (رحمه الله) گۆت: کەعبێ کورێ عوجرەی گەهشتە من، ئینا گۆت: ئەرێ ئەز دیارییەکا من ژ پێغەمبەری (ﷺ) گوه لێ بووی نەدەمە تە؟ من گۆت: بەلێ بۆ من بکە دیاری، ئینا گۆت: مە پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، ئینا مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مە زانی چاوا دێ سلاڤکینە سەر تە، بەلێ دێ چاوا سەلەواتان دەینە سەر تە؟ گۆت: (بێژن: یا خودێ سەلەواتان بدە سەر موحەممەدی و سەر مالا موحەممەدی هەروەکی تە سەلەوات داینە سەر مالا ئیبراهیمی، ب راستی تو هێژای شوکرێیی و یێ پایە بلندی، و یا خودێ موحەممەدی پیرۆز و پاک بکە و مالا موحەممەدی پیرۆز و پاک بکە هەروەکی تە مالا ئیبراهیمی پیرۆز و پاک کری، ب راستی تو هێژای شوکرێیی و یێ پایە بلندی).**

## ٢١ ـ باب: الدعاء قبل السلام.

## بابەتێ: دوعاکرن بەری سلاڤا ملان.

١٢٤٦ – (ق) عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنه: أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ الله (ﷺ): عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلاَتِي، قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً، وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ**). [خ٨٣٤/ م٢٧٠٥].

و ژ ئەبی بەکر ئەلسەدیق (رضي الله عنه) وی گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ): **دوعایەکێ نیشا من بدە ئەز د نڤێژا خۆدا بکەم، گۆت: (بێژە: یا خودێ ب راستی من گەلەك ستەم یا ل خۆ کری و کەس گونەهان ژێ نابەت تو نەبی، تو ژ دەڤ خۆ و ژ کەرەما خۆ بۆ من ژێ ببە، (ئەگەر من چو رێکێت گونەه ژێبرنێ ژی نەگرتبن و هەژی ژی نەبم) و دلۆڤانییێ ب من ببە، ب راستی تو یێ گونەه ژێبەر و دلۆڤانی).**

١٢٤٦ – م ـ (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَدْعُو: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ القَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَالِ**).

[خ١٣٧٧/ م٥٨٨].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ دوعایە دکر: **(یا خودێ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ ئیزایا گۆڕی و ژ ئیزایا جەهنەمێ و ژ بەلایا دنیایێ و مرنێ و ژ خرابییا بەلایا دەجالی).**

١٢٤٧ – وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) لِرَجُلٍ: (**مَا تَقُولُ فِي الصَّلاَةِ**) ؟ قَالَ: أَتَشَهَّدُ، ثُمَّ أَسْأَلُ الله الجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِهِ مِنَ النَّارِ، أَمَا وَالله مَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ، وَلاَ دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ، فَقَالَ: (**حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ**).

[د٧٩٢/ جه٩١٠].

وهو عند أبي داود: عن أبي صالح عن بعض أصحاب النبي (ﷺ).

* صحيح.

و ژ وی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە زەلامەکی: **(تو چ د نڤێژێدا دبێژی)؟** گۆت: ئەز تەحیاتێ دخوینم و پاشی ئەز داخوازا بەحەشتێ ژ خودێ دکەم و ئەز خۆ ب وی ژ ئاگری دپارێزم، و ئەز ب خودێ کەمە ئەز نە نمنما تە و نە یا موعازی نوزانم[١] ئینا گۆت: **(ئەم نمنمێ ل دۆر وێ دکەین)**[٢].

و ئەو ل دەڤ ئەبی داوودی: ژ ئەبی سالحی ژ هندەك هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ).

۲۲ . باب: التسليم.

**بابەتێ: سلاڤا ملان.**

١٢٤٨ - (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: كُنْتُ أَرَى رَسُولَ الله (ﷺ) يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ. [م٥٨٢]

**ژ سەعدێ کورێ ئەبی وقاسی (ﷺ) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ددیت بۆ لایێ خۆ یێ راستێ و لایێ خۆ یێ چەپێ سلاڤ دکر هەتا من سپیاتییا روییێ وی ددیت.**

١٢٤٩ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ، حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ: (**السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله**).

[د٩٩٦/ ت٢٩٥/ ن١٣٢١/ جه٩١٤]

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سلاڤا ملان ژ لایێ خۆ یێ راستێ و ژ یێ چەپێ ڤەددا و دگۆت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله).**

---

(١) ئانکو ئەو دوعایێت هوین ب دەنگێ نزم دکەن ئەز نوزانم.

(٢) ئانکو: دوعایا مە ژی هەر ئەوە.

١٢٥٠ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يُسَلِّمُ فِي الصَّلاَةِ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، يَمِيلُ إِلَى الشِّقِّ الأَيْمَنِ شَيْئاً. [ت٢٩٦/ جه٩١٩].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سلاڤەك تنێ د نڤێژێدا ڤەددا و ل راستا ناڤچاڤێت خۆ و خۆ پیچەك بۆ لایێ راستێ خوار دكر.**

**٢٣ . باب: الذكر بعد الصلاة.**

**بابەتێ: زكر پشتی نڤێژێ.**

١٢٥١ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ، حينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ المكْتُوبَةِ، كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ). وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إِذَا سَمِعْتُهُ.

[خ٨٤١/ م٥٨٣].

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: دەنگ بلندكرن ب زكری دەمێ خەلك ژ نڤێژا فەرز خلاس دبوون ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) هەبوو، و ئیبن عەباسی گۆت: دەمێ من گوه لێ دبوو من ب ڤێ دزانی ئەو ژ نڤێژێ ب دویماهی هاتن و رابوون.**

١٢٥٢ – (ق) عَنْ وَرَّادٍ ـ كَاتِبِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ـ قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ المغِيْرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فِي كِتَابٍ إِلَى مُعَاوِيَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ: **(لاَ إِلهِ إِلاَّ الله وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. اللَّهُمَّ! لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ).** [خ٨٤٤/ م٥٩٣].

**و ژ وەرادی، نڤیسەرێ موغیرەیێ كوڕێ شوعبەی، گۆت: موغیرەیێ كوڕێ شوعبەی بۆ من گۆت و من بۆ موعاویەی (رضي الله عنه) نڤیسی كو پێغەمبەری (ﷺ) پشتی هەر**

**نڤێژەكا فەرز دگۆت: (چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و هەمی مولك و سەروەری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، یا خودێ كەس نینە یا تە دا نەهێلیت (ڤەگریت) و كەس نینە بدەت یا تە ڤەگرت و نەدا، و زەنگینییا زەنگینی ل دەڤ تە مفایێ وی نادەت)**(١).

١٢٥٣ - (م) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ)، إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَتِهِ، اسْتَغْفَرَ ثَلاَثاً، وَقَالَ: (اللَّهُمَّ! أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ ذَا الجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ). [م٥٩١].

ژ سەوبانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دەمێ نڤێژا خۆ ب دویماهی دئینا سێ جاران دگۆت: (استغفر الله) و دگۆت: **(ئەز داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودێ دكەم، و دگۆت: یا خودێ تو یێ سلامەتی ژ كێماسییان و سلامەتی ژ تەیە، تو مەزنی یا خودانێ مەزناتییێ و كەرەمان).**

١٢٥٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ الله (ﷺ): (مَنْ سَبَّحَ الله فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، وَحَمِدَ الله ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، وَكَبَّرَ الله ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ المِائَةِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله وَحْدَهُ، لاَ شَرِكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ البَحْرِ). [م٥٩٧]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ د دویڤ هەر نڤێژەكێڕا سیهـ و سێ جاران خودێ ژ كێم و كاسییان پاك و پاقژ بكەت (بێژیت: سبحان الله) و سیهـ و سێ جاران شوكرا خودێ بكەت (بێژیت: الحمد لله) و سیهـ و سێ جاران خودێ مەزن بدانیت (بێژیت: الله اكبر) و تمامییا سەدێ بێژیت: ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤالە و**

(١) ئانكو: زەنگینی و دەستهەلاتا وی، وی رزگار ناكەت، كریارێت وی یێت چاك و راست نەبن.

**هەمی مولك و سەروەری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، گونەهێت وی هاتنە ژێبرن خۆ ئەگەر هندی كەفا دەریایێ بن).**

١٢٥٥ - عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ أَقْرَأَ بِالْمُعَوِّذَاتِ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ.

[د١٥٢٣/ ت٢٩٠٣/ ن١٣٣٥].

* صحيح.

**ژ عوقبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا من كر ئەز مەعوزاتان (سۆرەتا ئیخلاس و فەلەق و ناس) د دویڤ هەمی نڤێژانرا بخوینم.**

١٢٥٦ - عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَخَذَ بِيَدِهِ وَقَالَ: (**يَا مُعَاذُ! وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ، وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ**)، فَقَالَ: (**أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ! لاَ تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ تَقُولُ: اللَّهُمَّ! أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ**). [د١٥٢٢/ ن١٣٠٢].

* صحيح.

**و ژ مەعازێ كورێ جەبەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ من گرت و گۆت: (یا مەعاز، ب خودێ ئەز حەژ تە دكەم، پاشی ئەز تە شیرەت دكەم، یا مەعاز د دویڤ هەر نڤێژەكێرا نەهێلی و بێژی: یا خودێ هاریكارییا من ل سەر زكرێ خۆ و شوكرا خۆ و باش پەرستنا خۆ بكە).**

١٢٥٧ - عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الصَّلاَةِ: (**اللَّهُمَّ! لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ**). [حم١٦٨٨٩].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ موعاویەی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دەمێ ژ نڤێژێ خلاس دبوو دگۆت: (یا خودێ كەس نینە یا تە دا نەهێلیت (ڤەگریت) و كەس نینە بدەت یا تە ڤەگرت و نەدا، و زەنگینییا زەنگینی ل دەڤ تە مفایێ وی نادەت)[1].**

٢٤ . باب: الانصراف من الصلاة.

**بابەتێ: رابوون و چوون ژ نڤێژێ.**

١٢٥٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مسعودٍ قال: لاَ يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ شَيْئاً مِنْ صَلاَتِهِ، يَرَى أَنَّ حَقّاً عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ؛ إِلا عَنْ يَمِينِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِي (ﷺ) كَثِيراً يَنْصَرِفُ عَنْ يَسَارِهِ.

[خ٨٥٢/ م٧٠٧].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: كەس ژ هەوە چو ژ نڤێژا خۆ بۆ شەیتانی نەدانیت، ئەو ببینیت پێدڤییە ل سەر وی ئەو بەس بۆ لایێ راستێ تنێ ژ نڤێژێ دەركەڤیت، من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەلەك یێ دیتی بۆ لایێ چەپێ رادبوو و دچۆ.**

٢٥ . باب: الخشوع في الصلاة

**بابەتێ: ترسێ دنڤێژێدا**

١٢٥٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: **(هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هاهُنَا؟ فَوَالله! مَا يَخْفَى عَلَيَّ خُشُوعُكُمْ وَلاَ رُكُوعُكُمْ، إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي).** [خ٤١٨/ م٤٢٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هوین قیبلەیا من ڤێ دبینن؟ ئەز ب خودێ كەم ترس و ركوعا هەوە ل بەر من بەرزە نابیت و ئەز ل پشت خۆ هەوە دبینم).**

١٢٦٠ - (خ) عَنْ أَنَسٍ: كَانَ قِرَامٌ لِعَائِشَةَ، سَتَرَتْ بِهِ جَانِبَ بَيْتِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَمِيطِي عَنَّا قِرَامَكِ هذَا، فَإِنَّهُ لاَ تَزَالُ تَصَاوِيرُهُ تَعْرِضُ فِي صَلاَتِي).** [خ٣٧٤]

(١) ئانكو: زەنگینی و دەستهەلاتا وی، وی رزگار ناكەت، كریارێت وی یێت چاك و راست نەبن.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پەردەكا تەنك و رەنگین عائیشایێ هەبوو، رەخێ مالا خۆ پێ پەردە كربوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەڤێ پەردا خۆ ژ بەر مە راكە، ب راستی بەردەوام وێنەیێت وێ د نڤێژا مندا دهێنە بەر چاڤێت من).**

١٢٦١ – (خ) عَنْ عائِشَةَ قَالَتْ: سَأَلتُ رَسُولَ الله (ﷺ) عَنِ الالتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: (**هُوَ اخْتِلاَسٌ، يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِن صَلاَةِ العَبْدِ**). [خ٧٥١].

**و ژ عائیشایێ، (ﷺ) گۆت: من پرسیارا زڤرینێ د نڤێژێدا ژ پێغەمبەرێ خودێ كر (ﷺ) گۆت: (ئەو دزییەكە شەیتان ژ نڤێژا بەندەی ددزیت).**

١٢٦٢ – عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ الرَّجُلَ لَيَنْصَرِفُ وَمَا كُتِبَ لَهُ؛ إِلاَّ عُشْرُ صَلاَتِهِ، تُسْعُهَا، ثُمُنُهَا، سُبْعُهَا، سُدْسُهَا، خُمْسُهَا، رُبْعُهَا، ثُلُثُهَا، نِصْفُهَا**). [د٧٩٦].

* حسن.

**ژ عەمارێ كورێ یاسری (ﷺ) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (مرۆڤێ هەی ژ نڤێژا خۆ دەردكەڤیت و بۆ وی چو ژ نڤێژا وی نەهاتیە نڤیسین دەهێكا نڤێژا وی نەبیت، یان نەهێكا وێ یان هەشتێكا وێ یان حەفتێكا وێ یان شەشێكا وێ یان پێنجێكا وێ یان چارێكا وێ یان سێكا وێ یان نیڤا وێ).**

١٢٦٣ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ كَانَ يُصَلِّي فِي حَائِطِهِ، فَطَارَ دُبْسِيٌّ، فَطَفِقَ يَتَرَدَّدُ يَلْتَمِسُ مَخْرَجاً، فَأَعْجَبَهُ ذَلِكَ، فَجَعَلَ يُتْبِعُهُ بَصَرَهُ سَاعَةً، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى صَلاَتِهِ، فَإِذَا هُوَ لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى؟ فَقَالَ: لَقَدْ أَصَابَتْنِي فِي مَالِي هَذَا فِتْنَةٌ، فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ الله (ﷺ) فَذَكَرَ لَهُ الَّذِي أَصَابَهُ فِي حَائِطِهِ مِنَ الفِتْنَةِ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ الله! هُوَ صَدَقَةٌ لله فَضَعْهُ حَيْثُ شِئْتَ.

[ط٢٢٢/ هق٢/٣٤٩]

[وانظر: ٣٢٨٦ صلاة مودع].

